لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕینما

زنجیرە (٧٨١)

## ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب: ٤٨ یاسای دەسەڵات
- نووسینی: ڕۆبەرت گرین
- بابەت: سایکۆلۆژی دەسەڵات
- وەرگێڕانی: کارزان کاوسین
- دیزاین: فوئاد کەرکووکی
- چاپخانە: چاپخانەی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٨
- نۆبەی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (١٨٤٩)ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە

ناونیشان:

سلێمانی، نێوان گەڕەکی عوسمانی ئامین و شوقەکانی ئەمگیە پرۆژە.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)-(٠٧٥٠١١٩٩٨٤٧)

# ٤٨ یاسای دەسەڵات

## بۆچوونێکی سایکۆلۆژی بۆ داینامیکەکانی دەسەڵات

ڕۆبەرت گرین

و.لە ئینگلیزییەوە/ کارزان کاوسین

# وتەیەك

دەسەڵات پرسێکی مێژووییە کە لەگەڵ پەیدابوونی گیانەوەران و بەدیاریکراویش مرۆڤدا هاتووەتە ناو هاوکێشەکانەوە. پێناسە و چەمکی دەسەڵات کشۆکە و بەدەر لەوەی لە زانستە سیاسییەکاندا تاووتوێ کراوە، لەسەر ئەرزی واقیع ڕەهەندێکی کەسی وەردەگرێت و ڕوانگەکانیش بۆی بەم پێیە گۆڕانیان بەسەردا دێت. بە دەربڕینێکی ڕوونتر، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، سەرکەوتن بەسەر پلیکانەی دەسەڵاتدا جیاوازی هەیە. لەوانەیە کەسێك تەرکیز بکاتە سەر ئامراز؛ بەڵام یەکێکی تر سەرنج بخاتە سەر ئامانج بۆ گەیشتن بە تروپکی دەسەڵات. هەرچۆنێك بێت، دەشێ دەسەڵات لە کەلتووری کوردیدا لە سۆنگەی کەلتوورێکی خۆرهەڵاتییەوە ببینرێت کە بەهۆی ئامادەیی بەردەوامی سەرکوتنگەرییەوە، سۆزاخکەری دەسەڵات و دەسەڵاتدار بە جەلاد و دەسەڵات بەسەردا پیادەکراو بە قوربانی ببینرێن. لێرەوە برەوێکی زۆر دراوە بە بەهای بەقوربانیبوون و قێز لە سۆزاخکردنی دەسەڵات کراوەتەوە؛ هەڵبەت ئەمەش ئیشی دەسەڵاتدار بووە بۆئەوەی دەسەڵات بکرێتە ئەرکی دەستەبژێرێك و گەمەی سیاسی بۆ دەسەڵات گرتنە دەست سنووردار بکرێت. لەلایەکی تریشەوە ئەگەر بە وردی تێبینی بکرێت، دەردەکەوێت کە دەسەڵات لە گەمەی سیاسی هێنراوەتە دەرەوە و بەرگێکی تەواو ئەخلاقی بە بەردا کراوە و لەو ڕوانگەیەشەوە حوکمی باش و خراپی لەسەر دراوە. بەمەش هەموو بەهایەکی تر لە دەسەڵات و یارییەکەی داماڵراوە.

لەم کتێبەدا، وەك چۆن ڕێگە و شێوازەکانی گەیشتن بە پێگەکانی دەسەڵات لەلایەن مووسەر ڕێزەرت گرین بە نموونەوە پیشان دراوە، ئەم پیشاندانە تەنیا مۆرکێکی پۆزەتیڤی و دروستی بەسەردا نەبڕاوە، بەڵکو دیویکی تریش پیشاندراوە کە بریتییە لەوەی چۆن دەسەڵات کە بە خراپی سۆراغ بکرێت و پیادە بکرێت یان قۆرخ بکرێت، بەشێوەیەکی حەتمی کەوتن و ناڕازانی لێدەکەوێتەوە. هەروەها، ئەمە بەر لەوەی ڕێنوێنییەك بێت بەرەو دەسەڵات، هۆشیارکردنەوەیەکە بۆ خوێنەر لەمەڕ ئەوەی کە دەسەڵات تا ڕادەیەکی زۆر چۆن کار دەکات و میکانیزمەکانی چۆنە.

دواجار ئامانجی ئەم کتێبە و هەر کتێبێکی تریش بۆ بەرچاو ڕوونییە لەمەڕ ڕوانگەیەکی دیاریکراو بۆ بابەتێك نەك بۆ قەناعەتپێکردن بە ڕاستزانینی ناوەڕۆکەکەی.

کاروان کاوسێن

# ٤٨ یاسای دەسەڵات

### یاسای ژمارە ١

## هەرگیز لە گەورەکەت لێهاتووتر دەرمەکەوە

هەمیشە وەها لەوانەی سەرووی خۆت بکە بە ئاسوودەیی هەست بکەن باڵان. لە ئارەزووکردنتدا بۆ دڵخۆشکردن و کارتێکردنیان ئەوەندە لە پیشاندانی بەهرە و تواناکانتدا دوور مەڕۆ ئەگینا لەوانەیە دەستکەوتەکەت پێچەوانە بێت– ترس و نائارامی دروست بکەیت. وا بکە گەورەکانت لێهاتووتر دەربکەون لەوەی کە هەن و بەمشێوەیە تۆ دەگەیتە ترۆپکی دەسەڵات.

### یاسای ژمارە ٢

## قەت ئەوەندە زۆر متمانە بە هاوڕێکانت مەکە، فێر بە چۆن دوژمنەکانت بەکار بێنیت

ئاگادار بە لە هاوڕێکانت– ئەوان خێراتر ناپاکیت بەرانبەر دەکەن، چونکە ئەوان بە ئاسانی ئیرەییان دەجوڵێت. ئەوان بەهەمان شێوە دەبنە کەسانی ئازاردەر و زۆردار. بەڵام کار بدەرە دوژمنێکی پێشووت ئەوا لە هاوڕێیەکت بەئەمەکتر دەبێت، چونکە ئەو زیاتری لەبارەیە بۆتی بسەلمێنێت. لە ڕاستیدا دەبێ تۆ زیاتر لە هاوڕێکانت بترسیت نەک دوژمنەکانت. ئەگەر دوژمنت نییە، ڕێگەیەک بدۆزەرەوە بۆ دروستکردنیان.

## یاسای ژمارە ٣

## نیازەکانت بشارەوە

خەڵک لە ناهاوسەنگی و تاریکیدا بهێڵەرەوە بەوەی کە قەت مەبەستی پشت کردارەکانت دەرنەخەیت. ئەگەر ئەوان هیچ سەرەداوێکیان نەبێت لەمەڕ ئەوەی کە تۆ بە نیازی چیت، ئەوا ناتوانن ئامادەی بەرگری بن. بایی پێویست بەرەو پێچەوە هەڵەکە ڕێنماییان بکە، بایی پێویست بیانخەرە ناو تەمومژەوە و بەهاتنی ئەو کاتەی کە نیازەکانی تۆیان بۆ دەردەکەوێت، زۆر درەنگ بووە.

## یاسای ژمارە ٤

## هەمیشە کەمتر لەوەی پێویستە بڵێ

کاتێک تۆ هەوڵ دەدەیت بە قسەکانت کاریگەری بخەیتە سەر خەڵکی، چەندەی زۆرتر بڵێیت، ئەوەندە ئاسایتر دەردەکەویت و کەمتر زاڵ دەبیت. تەنانەت ئەگەر شتێکی سواویش بڵێیت ئەوا ڕەسەن دیار دەبێت ئەگەر تەمومژاوی و ئاڵۆزی بکەیت. خەڵکی بەهێز بە قسەی کەمتر، کاریگەری و ترس دروست دەکەن. چەندەی زۆرتر بڵێیت ئەوەندە ئەگەری زیاترە کە شتێکی گەمژانە بڵێیت.

## یاسای ژمارە ٥

## بەشی زۆری بەندە بە ناوبانگەوە- بە ژیانت پارێزگاری لەم ناوبانگە بکە

ناوبانگ بناغەی دەسەڵاتە. تەنیا لە ڕێگەی ناوبانگەوە دەتوانیت ترس دروست بکەیت و سەرکەوتوو بیت. لەگەڵ ئەوەشدا هەر کە ڕووشا ئەوا لە دۆخێکی ناسکدا دەبیت و لە هەموو لایەکەوە هێرشت دەکرێتە سەر. ناوبانگت قایم بکە. هەمیشە لەبەرانبەر هێرشە ئەگەرییەکاندا وریا بە و بەرپەستیان بکە بەر لەوەی ڕووبدەن. لەهەمان

کاتدا، فێڵبەرە دوژمنانت تێکبشکێنێت لە ڕێگەی بزر تێگەیشتنی ئاریانگیان. پاشان لەلاوە بوەستە و لێگەڕێ با ڕای گشتی هەڵیانبوەشێنێت.

## یاسای ژمارە ٦

## بەهەموو شێوازێک سەرنجی دەوروبەر ڕابکێشە

هەموو شتێک بە ڕواڵەتەکەی حوکم دەدرێت، ئەوەی کە نەبینراوە یەکسانە بە هیچ. کەواتە قەت ڕێگە مەدە لەناو حەشاماتدا ون بیت یان لەناو ئاسپاردا سەر بنێیتەوە. دەرکەوە، بە هەر باجێک بووە لەبەرچاو بە. خۆت بکە بە موگناتیسی هۆش و سەرنج لە ڕێگەی ئەوەی کە گەورەتر، ڕەنگاوڕەنگتر، ڕازئامێزتر لە حەشاماتی ئاسایی و دەستەمۆ دیار بیت.

## یاسای ٧

## وا لە ئەوانیتر بکە کارەکانت بۆ بکەن، بەڵام هەمیشە خۆت بکە بە خاوەنیان

ژیری، زانیاری و جوڵانی خەڵکی تر بەکاربهێنە بۆ خزمەتی بەرژەوەندی خۆت. هاوکارییەکی وەها کات و وزەیەکی زۆرت بۆ دەگێڕێتەوە، ئەمە پرشنگێکی بەهاداری کارایی و خێراییت دەداتێ. لە کۆتاییدا یارمەتیدەرانی تۆ بیر دەچنەوە و یادت دەکرێتەوە. قەت ئەرکێک بۆ خۆت ئەنجام مەدە کە ئەوانیتر دەتوانن بۆ تۆی ئەنجام بدەن.

## یاسای ژمارە ٨

## وا لە خەڵکی تر بکە بێنە لات، ئەگەر پێویست بوو چەشتە بەکاربهێنە

کاتێک تۆ کەسەکەی تر ناچار دەکەیت هەنگاو بنێت، تۆ ئەو کەسەیت کە کۆنترۆڵت بەدەستە. هەمیشە وا باشترە وەها لە نەیارەکەت بکەیت بێتە لات و لە پرۆسەکەدا واز لە پلانەکانی خۆی بێنێت. بە دەستکەوتی سەرەوو ئاسایی بەکێشی بکە — پاشان هێرش بەرە. تۆ کارتەکانت بەدەستەوە دەبێت.

## یاسای ژمارە ٩

## لە ڕێگەی کردارەکانت بیبەرەوە، نەک لە ڕێگەی مشتومڕەوە

هەر سەرکەوتنێکی کاتی کە تۆ پێت وایە لە ڕێگەی مشتومڕەوە بەدەستت هێناوە بە ڕاستی سەرکەوتنێکی شکست ئامێز بووە: ئەو کینە و ئیرادە خراپەی کە دەیوروژێنیت بەهێزترە و زۆرتر دەخایەنێت لە هەر گۆڕانێکی کاتیی ڕا و بۆچوون. زۆر بەهێزترە کە وا لەوانیتر بکەیت لە ڕێگەی کردارەکانتەوە کۆک بن لەگەڵ تۆدا بەبێ ئەوەی قسەیەک بکەیت. پیشان بدە نەک ڕوون بکەیتەوە.

## یاسای ١٠

## پەتا: خۆت لە کەسانی دڵتەنگ و نەگبەت بەدوور بگرە

دەشێ تۆ لە ئەنجامی نەگبەتی کەسێکی تر بمریت – حاڵەتە هەستییەکان ئەوەندەی نەخۆشی زیانبەخشن. لەوانەیە تۆ وا هەست بکەیت یارمەتی کابرایەک دەدەیت کە خەریکە نوقم دەبێ بەڵام تۆ تەنیا کارەساتەکەی خۆت قووڵتر دەکەیتەوە. هەندێ جار بەدبەختەکان نەگبەتی بەسەر خۆیان دێنن. ئەوان بەهەمان شێوە بەسەر تۆشی دێنن. لەبری ئەمە، لە دڵشاد و بەختەوەر نزیک بەرەوە.

## یاسای ژمارە ١١

## فێر بە وا لە خەڵک بکەیت بەردەوام پشتت پێ ببەستن

بۆئەوەی سەربەخۆیی خۆت بەرقەرار بکەیت، دەبێ هەمیشە پێویستیان پێت بێت و بیانەوێت. چەندەی زۆرتر پشتت پێ ببەستن، ئەوەندە ئازادیی زیاترت دەبێت. وا لە خەڵک بکە بۆ بەختەوەری و کامەرانییان پشتت پێ ببەستن و ئیتر هیچ شتێک نابێت لێی بترسیت. قەت ئەوەندەیان فێر مەکە کە بتوانن بەبێ تۆ هەنگاو بنێن.

## یاسای ژمارە ١٢

## بەخشندەیی و ڕاستگۆیی سنووردار بەکاربێنە بۆ نەرمکردنی قوربانییەکەت

جوڵەیەکی ڕاستگۆ و سەرڕاستانە، دەیان جوڵەی ناسەرڕاستانە دادەمەزرێنێت. ئاماژە دڵ ئاواڵاکانی ڕاستگۆیی و بەخشندەیی، بەرگریی تەنانەت بەگومانترین خەڵک بەلاوە دەنێت. کاتێک ڕاستگۆیی سنوورداریی تۆ دەرزێک دەخاتە زرێکەیان، دەتوانیت بەپێی خواستی بەکاریان بهێنیت. دیارییەکی هاوکات، هەمان ئامانج دەپێکێت.

## یاسای ژمارە ١٢

## کاتێک داوای یارمەتی لە خەڵک دەکەیت، لە ڕوانگەی بەرژەوەندیی خۆیان ئەمە بکە، با لەو ڕوانگەیەوەنەبێت کە بەزەییان پێتدابێتەوە یان چاکەت لەگەڵدابکەن.

ئەگەر تۆ پێویستت بەوەیە ڕوو بکەیتە هاوپەیمانێک بۆ یارمەتی، خۆت ماندوو مەکە بەوەی بیری بێنیتەوە لە ڕابردوودا چەندێک یارمەتیت داوە و چاکەت لەگەڵ کردووە. ئەو ڕێگەیەک دەدۆزێتەوە بۆ فەرامۆشکردنت. لەبری ئەمە، شتێک لەداواکەتدا یان لە هاوپەیمانیتدا لەگەڵ ئەو بخەرە ڕوو کە کەڵکی بۆ ئەو هەیە و بە بەراورد بە داواکەت زیاتر جەختی لێ بکەوە. ئەو بەشێوەیەکی ئامەزراوانە وەڵامگۆ دەبێت کاتێک دەبینێ شتێک بۆ ئەو تێدایە.

## یاسای ژمارە ١٤

## وەک هاوڕێ خۆت دەربخە، وەکو سیخوڕ کار بکە

زانین لەبارەی ڕکابەرەکانەوە گرنگە. سیخوڕ بەکاربێنە بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی گرنگ کە هەنگاوێک دەتبانە پێشەوە. لەوەش باشتر: خۆت ڕۆڵی سیخوڕ ببینە. لە

جوارە کۆمەڵایەتییە سەنگین و ڕێزنامەییەکاندا، فێر بە زانیاری سۆراغ بکەیت. پرسیاری ناڕاستەوخۆ بکە بۆ ئەوەی وا لە خەڵک بکەیت کە نیاز و خاڵی لاوازی خۆیان دەربخەن. هیچ بۆنە و حاڵەتێک نییە دەرفەتێک نەبێت بۆ سیخوڕیکردنی لێزانانە

## یاسای ژمارە ١٥

## دوژمنەکەت سەراپا تێک بشکێنە

هەموو سەرکردە مەزنەکان لە سەردەمی موساوە زانیوویانە کە دەبێ دوژمنێکی مەترسیدار بەتەواوی تێک بشکێنرێت. (هەندێ جار بە زەحمەتێکی زۆر گەیشتوونەتە ئەم ئەنجامە). ئەگەر پشکۆیەک بە گەشی بمێنێتەوە، گرنگ نییە چەندێک بە کزی داگیرساوە، سەرئەنجام ئاگرێکی لێ هەڵدەستێت. وەستان لە نیوەی ڕێگە زیانی زیاتری بەبەرەوەیە لە چاو بنبڕکردنی تەواوەتی: دوژمن چاک دەبێتەوە و بەدوای تۆڵەدا وێڵ دەبێت. لێکی بشکێنە، نەک تەنیا بە جەستە بەڵکو بە ڕۆحیش.

## یاسای ژمارە ١٦

## خۆ ونکردن بەکاربێنە بۆنەوەی ڕێز و پێزانینت زیاتر ببێت

زۆر دەرکەوتن و هاتن و چوون نرخەکە دەهێنێتە خوارەوە. چەندەی زیاتر ببینرێیت و لەبارەتەوە ببیسترێ، ئەوەندە ئاساییتر دیار دەبیت. ئەگەر تۆ هەر لە گروپێکدا ڕەگت داکوتاوە، کشانەوەی کاتی لێی وەهات لێدەکات کە قسەی زیاترت لەبارەوە بکرێت، و ئەنانەت پەسەندتر بیت. دەبێ تۆ فێر بیت چ کاتێک بڕۆیت. لە ڕێگەی دەگمەنییەوە بەها دروست بکە.

## یاسای ژمارە ١٧

## ئەوانیتر لە ترسێکی هەڵپەسێردراودا بهێڵەرەوە، کەشێکی پێشبینی نەکردن بهێنەرە کایەوە

مرۆڤەکان زیندەوەری خوون کە پێویستییەکی تێرنەکراویان هەیە بۆ بینینی ئاشنا لە کردارەکانی خەڵکی تردا. ئەگەر تۆ پێشبینیکراو بیت، ئەمە هەستێکی کۆنتڕۆڵ و زاڵبوونیان پێدەبەخشێت. باروودۆخەکە پێچەوانە بکەرەوە: بە ئەنقەست پێشبینی نەکراو بە. ڕەفتارێک کە پێدەچێت ناجێگیر بێت یان مەبەستێکی تیا نەبێ هاوسەنگییان تێکدەدات و ئەوان بەهەست لەخۆیان دەبەن تا جوڵەکانی تۆیان بۆ دەرکەوێت. ئەگەر ئەم ستراتیژییە تا ئاستێکی زۆر پەراوە بکرێت، دەتوانێ ترس و خۆف بهێنێتە کایەوە.

## یاسای ژمارە ١٨

## بۆ پارێزگاری کردن لە خوت قەڵا بونیاد مەنێ- گوشەگیری مەترسیدارە

جیهان مەترسیدارە و دوژمنان لە هەموو شوێنێکن- دەبێ هەموو کەسێک پارێزگاری لە خۆی بکات. پێدەچێت قەڵا سەلامەتترین شوێن بێت. بەڵام گوشەگیری دەتخاتە بەر مەترسی زۆرتر لەوەی کە پارێزگاریت لێ بکات. قەڵا لە زانیاریی بەنرخ دادەبڕێنێت، دەتکاتە ئامانجێکی بەرچاو و ئاسان. باشترە لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵ بیت و هاوپەیمان بدۆزیتەوە. تۆ لە ڕێگەی ئەرەبالغییەوە قەڵغان دروست دەکەیت.

## یاسای ژمارە ١٩

## بزانە مامەڵە لەگەڵ کێ دا دەکەیت- کەسی نەگونجاو بریندار مەکە

زۆر جۆری جیاوازی خەڵک لە جیهاندا هەن، و تۆ قەت ناتوانیت وابزانی ئەوە بکەیت کە هەمووان هەمان پەرچەکرداریان بەرامبەر ستراتیژەکانی تۆ دەبێت. هەندێ خەڵک هەیە

که لەگەڵ فریوبان بدەیت یان لێیان ببەیتەوە ئەوانەی ژیانیان بەدوای ترۆپکدا ڕۆژ دەمێنن ئەمانە گورگی لە پێستی مەڕدا بە ڕووبەیەوە قوربانی و ئەبارەکانت هەڵبژێرە- قەت کەسی لەگرنجار فریو مەدە یان پەیوەندی مەکە.

## یاسای ژمارە ٢٠

## خۆت بەکەسەوە پابەند مەکە

ئەو کەسە گەمژە بوو کە پەلەی کرد لە لایەنگیریدا. خۆت پابەند مەکە بە هیچ لایەنێک یان هۆزێک جگە لە خۆت. بە بەرقەرارکردنی سەربەخۆیی خۆت، دەبیتە گەورەی ئەوانیتر- یاریکردن بە خەڵک لەدژی یەکتری، وەها لێکردنیان کە شوێن تۆ بکەون.

## یاسای ژمارە ٢١

## وەك ساویلکە بنوێنە بۆئەوەی ساویلکەیەک بگریت- لە نیشانەکەت دەبەنگتر بنوێنە

کەس حەز ناکات هەست بکات لە کەسەکەی تر دەبەنگترە. بۆیە، فێڵەکە ئەوەیە کە وا لە قوربانییەکانت بکەیت هەست بکەن زیرەکن- نەک تەنیا زیرەکیش بەڵکو زیرەکتر لە تۆ. هەر کە قەناعەتیان بەمە کرد، ئەوا قەت گومانی ئەوە ناکەن کە تۆ ئەنگێزەی شاراوەت هەن.

## یاسای ژمارە ٢٢

## تاکتیکی ملدان بەکاربێنە: خاڵی لاواز وەرچەرخێنە بۆ دەسەڵات

کاتێک تۆ لاوازتریت، قەت لەپێناو شەرەفدا مەجەنگە، لەبری ئەمە ملدان هەڵبژێرە. ملدان کاتت پێدەدات بۆ هەڵسانەوە، کاتت دەدات بۆ ئەشکەنجەدان و هەراسانکردنی نەیارە براوەکەت، کات بۆ چاوەڕێبوون تا دەسەڵاتەکەی کز دەبێت. شادیی قەرکردن و

ئەکسپلۆیتیانی تۆی پێ مەبەخشە— سەرەتا مل بدە. بە ڕاگرتنی لا ڕوومەتەکەی تر، تۆ تووڕەی دەکەیت و دەیشڵەژێنیت. ملدان بکە بە ئامرازێکی دەسەڵات.

## یاسای ژمارە ٢٣

## هێزەکانت چڕ بکەرەوە

وزە و هێزەکانت پارێزکاری لێبکە بەوەی کە لە بەهێزترین بنتیاندا بە چڕی بیانهێڵیتەوە. تۆ بە دۆزینەوەی کانێکی دەوڵەمەند و قووڵتر تێیاچوونی، خەڵکی زیاترت دەست دەکەوێت نەک بەوەی کە لە کانێکی تەنکەوە بەخێرایی بچیتە سەر کانێکی تەنکی تر—هەموو کاتێک چڕی شکست بە فراوانی دەهێنێت. کاتێک تۆ بۆ سەرچاوەکانی دەسەڵات دەگەڕێیت بۆئەوەی بەرزت بکاتەوە، یەک پاڵپشتی سەرەکی بدۆزەوە، ئەو مانگا قەڵەوەی کە بۆ ماوەیەکی درێژ شیرت دەداتێ.

## یاسای ژمارە ٢٤

## ڕۆڵی دەربارییەکی پێرفێکت ببینە

دەرباریی پێرفێکت کەسێکە لە جیهانێکدا گەشە دەکات کە تیایدا هەموو شتێک لە دەوری دەسەڵات و کارزانی سیاسی دەسوڕێتەوە. ئەو لە هونەری ناڕاستەوخۆبووندا ئەسپی خۆی تاو داوە. ئەو مەرایی دەکات، مل بۆ سەرووی خۆی دەدات و بە ئەمووزارییەتریی و نەرم و نیانترین شێواز دەسەڵات بەسەر ئەوانیتردا پیادە دەکات. یاساکانی دەرباری فێر بە و پیادە بکە، ئیتر سنوور نامێنێت لەبەردەم بەرزبوونەوەت لە دەرباردا.

## یاسای ژمارە ٢٥

### خۆت دروست بکەرەوە

ئەو ڕۆڵانە قبوڵ مەکە کە کۆمەڵگە بەسەرتدا دەیسەپێنێت. لە ڕێگەی خستنەڕووی ناسنامەیەکی نوێ خۆت دروست بکەرەوە، ناسنامەیەک کە سەرنج ڕادەکێشێت و قەت دەوروبەر بێزار ناکات. گەورەی وێنەی خۆت بە نەک ئەوەی لێبگەڕێیت ئەوانیتر بۆتی پێناسە بکەن. ئامرازی درامایتیکی بخەرە ناو ئاماژە و کردارە گشتییەکانت– دەسەڵاتت زیاد دەبێت و کارەکتەرت مەزن دەردەکەوێت.

## یاسای ٢٦

### دەستەکانت بە پاکی بهێڵەرەوە

دەبێ تۆ نموونەی مەدەنییبوون و کارابوون دیار بیت؛ دەستەکانت قەت بە هەڵەکان و کردارە دزێوەکان خوڵاوی نابن. لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەوانیتر وەکو بەردەباز و چنگی پشیلە بۆ داپۆشینی تێوەگلانت، ڕواڵەتێکی وەها بێ لەکە بگرەخۆت

## یاسای ژمارە ٢٧

### یاری بکە بە پێویستیی خەڵك بۆ باوەڕهێنان، بۆ دروستکردنی هاوشێوەی شوێنکەوتووانی دینی

خەڵکی ئارەزوویەکی کاریگەریان هەیە بۆ باوەڕهێنان بە شتێک. ببە بە چەقە خاڵی ئەو ئارەزووە لە ڕێگەی خستنەڕووی دۆزێکە ئیمانێکی نوێ بۆ شوێنکەوتن. قسەکانت تەمومژاوی بەڵام پڕ بکە لە بەڵێن، جەخت لە ئامەزراویی بکەرەوە لەبەرامبەر کەڵانیەت و بیرکردنەوەی ڕووندا. هەندێ سرووت ببەخشە بە شوێنکەوتووە نوێکانت بۆ جێبەجێکردن،

ناچاریان لێبکە بەلەبری تۆ هەندێ قوربانی بکەن. لە تەوەری ئاسێنێکی ڕێکخراو و ناوازێکی مەزنداو سیستەمی باوەڕی تۆ، دەسەڵاتێکی بێ وێنەت پێ دەبەخشێت.

## یاسای ژمارە ٢٨

## بە بوێرییەوە بچۆرە ناو کردارەوە

ئەگەر تۆ لە کردارێک دڵنیا نەبیت، هەوڵی بۆ مەدە. گومانەکان و دوودڵییەکان کار دەکەنە سەر جێبەجێکردنی فەرمانی مەترسیدارە؛ باشترە بە ئازایەتییەوە بچیتە ناو کردار. هەر هەڵەیەک کە لە ڕێگەی بوێرییەوە ئەنجامی دەدەیت بە بوێریی زیاترەوە ڕاست دەکرێتەوە. هەمووان سەرسامن بە ئازا، کەس ڕێز لە دەستەمۆ ناگرێت.

## یاسای ژمارە ٢٩

## بەدرێژایی ڕێگاکە تا کۆتایی، پلان دابنێ

کۆتاییەکە هەموو شتێکە. بەدرێژایی ڕێگاکە پلان دابنێ، هەموو ئەگەرەیەک و لێکەوتەیەکی مومکین و گۆڕانێکی چارەنووس کە لەوانەیە کۆششی سەختت پێچەوانە بکاتەوە و شکۆ بداتە ئەوانیتر، لەبەرچاو بگرە. بە داڕشتنی پلان بەدرێژایی ڕێگاکە، تۆ کارتێکراو نابیت بە بارودۆخەکان و دەزانیت چ کاتێک بوەستیت. بە هێمنی چارەنووست ئاراستە بکە و یارمەتیدەر بە لە بڕیاردان لە چارەنووس لە ڕێگەی بیرکردنەوەی لەپێشدا.

## یاسای ژمارە ٣٠

## با دەستکەوتەکانت بێ هەوڵ و ماندووبوون دیاربن

دەبێ کردارەکانت سروشتی و وەها دیار بن کە بە ئاسانی جێبەجێ دەبن. دەبێ هەموو ئەو ڕەنج و ماندووبوونەی کە لێیان سەرف دەکرێت و هەروەها هەموو ئەو فێڵە زیرەکانەیەی دەخرێنەگەڕ بۆیان بشاردرێنەوە. کاتێک تۆ هەنگاو دەنێیت، بێ

مامۆوەتی و هەوڵ هەنگاو بنێ وەک بڵێی تۆ زیاتر لە بارێتیە. خۆت لەو فریوە لابدە کە دەریبخەیت چاتێک سەرسەختانە هەوڵ دەدەیت و کار دەکەیت- ئەمە تەنیا پرسیار دەوروژێنێت. فێڵ و پلیچ و پەناپەکانت لەلای کەس مەکە ئەگینا لەدژی خۆت بەکاری دێننەوە.

## یاسای ژمارە ٣١

## بژاردەکان کۆنترۆڵ بکە

## وا لەوانیتر بکە مامەڵە بەو کارتانەوە بکەن کە تۆ بەدەستتەوەن

باشترین فریوەکان ئەوانەن کە وەها دیاربن بژاردە دەدەنە کەسەکەی تر: قوربانییەکانی تۆ هەست بەوە دەکەن کە کۆنترۆڵیان بەدەستە، بەڵام بە ڕاستی بووکەڵەی دەستی تۆن. ئەو بژاردانە بخەرە بەردەم خەڵکی کە لە بەرژەوەندیی تۆ دەشکێنەوە چار هەر کامێکیان هەڵبژێرن. ناچاریان بکە لەنێوان دوو خراپەدا بچوکترینی هەڵبژێرن، کە هەردووکیشیان لە بەرژەوەندی تۆن. بە قۆچی تەنگژەیەکیان دابکە: ئەوان بوو لە هەر کوێیەک بکەن قۆچەکانیان تێیاچووە.

## یاسای ژمارە ٣٢

## بە گوێرەی فەنتازیاکانی خەڵک یاری بکە

ڕاستی زۆرجار لەبەرئەوە خۆی لێ لادەدرێت کە ترسناکە و ناخۆشە. قەت پەنا مەبە بۆ حەقیقەت و واقیع مەگەر ئەوەی کە ئامادە بیت بۆ ئەو تووڕەییەی کە لە بێهیوایی هاتنەوە سەرچاوە دەگرێت. ژیان ئەوەندە سەخت و نارەحەتە کە ئەو خەڵکەی دەتوانێت ڕۆمانسییەت بەرهەم بهێنێت یان فەنتازیا بهێنێتە ئارا وەکو پەڵە ئاوێکی لە بیاباندا، هەموان لە دەوری کۆ دەبنەوە. دەسەڵاتێکی گەورە هەیە لە خستنەکاری فەنتازیاکانی حەشامات.

## یاسای ژمارە ٣٣

### خاڵی لاوازی کەسەکە بدۆزەرەوە

هەر کەسێک خاڵێکی لاوازی کەلێنێکی لە دیواری قەڵاکەیدا هەیە. زۆربەجار ئەو لاوازییە نائەمنییەکە، هەستێکی کۆنترۆڵنەکراو یان پێویستییەکە. دەشێ ئەمە بەهەمان شێوە خۆشییەکی شاراوەی بچووک بێت. هەر چۆنێک بێت، هەر کە دۆزرایەوە، ئەمە خاڵێکی لاوازە کە دەتوانی لە بەرژەوەندیی خۆت بیگێڕیت.

## یاسای ژمارە ٣٤

### لە بەرگی خۆتدا پاشا بە: وەک پاشا ڕەفتار بکە تا وەک پاشا مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت

ئەو شێوازەی بەهۆیەوە ڕەفتار دەکەیت زۆربەجار ئەوە دیاری دەکات کە چۆن مامەڵەت لەگەڵدا دەکرێت: لەدرێژمەودادا، ئەگەر بێڕەفتار یان ئاسایی دەرکەویت، خەڵکی ڕێزت ناگرن. چونکە پاشا ڕێز لە خۆی دەگرێت و ئیلهامبەخشی هەمان هەستە لەوانیتردا. بە ڕەفتارکردنێکی شاهانە و بڕوابوون بە هێزەکانت، خۆت دەبەستیتەوە بە چارەنووسی لەسەرنانی تاج.

## یاسای ژمارە ٣٥

### وەستای کات دانان بە

قەت وا دەرمەکەوە کە پەلەتە – پەلەکردن ناپاکی لە نەبوونی کۆنترۆڵ بەسەر خۆت و کاتدا دەکات. هەمیشە بەئۆقرە دیاربە، وەک ئەوەی دەزانیت دواجار هەموو شتێکت بۆ دێت. ببە بە سیخوڕی کاتی گونجاو، بۆنی ڕۆحی کات بکە، ڕاتە ئەو تەوژمانەی بەرەو دەسەڵات دەتگوازنەوە. فێر بە بکشێیتەوە دواوە کاتێک کات هێشتا نەگەیشتووە و بە توندی لێیدەیت کاتێک بەری گرتووە.

## یاسای ژمارە ٣٦

## ئەو شتانە ڕیسوا بکە کە ناتوانیت هەتبن؛ فەرامۆشکردنیان باشترین تۆڵەیە

بە گرنگیدان بە کێشەیەکی ناچیزە، تۆ بوون و سەنگی دەدەیتێ. چەندەی سەرنج بخەیتە سەر دوژمنێک، ئەوەندە بەهێزتری دەکەیت و زۆرجار هەڵەیەکی بچوک بەهێزتر و خراپتر دەبێت کاتێک هەوڵ دەدەیت چارەسەری بکەیت. هەندێ جار باشترین شت ئەوەیە شتەکان وەک خۆیان واز لێبێنیت. ئەگەر شتێک هەبێت تۆ بتەوێ بەڵام نەتوانیت هەتبێت، بە چاوی سوک سەیری بکە. چەندەی بایەخی پێ دەربخەیت، ئەوەندە باڵاتر دیار دەبێت.

## یاسای ژمارە ٣٧

## نمایشی کاریگەر دروست بکە

وێنەی کاریگەر و ئاماژە ڕەمزییە مەزنەکان پرشنگی دەسەڵات دروست دەکەن — هەمووان وەڵامگۆ دەبن بەرانبەری. نمایش گەلێک بۆ ئەوانەی دەوروبەرت بەگەڕ بخە کە پڕ بن لە دیمەن و ڕەمزی کاریگەر کە ئامادەییت بەرز دەکاتەوە. بەهۆی کارتێکران بە ڕواڵەتەکان، کەس تێبینی ئەوە ناکات کە بە ڕاستی خەریکی چیت.

## یاسای ژمارە ٣٨

## چۆنت دەوێ وەها بیر بکەرەوە، بەڵام وەکو ئەوانیتر ڕەفتار بکە

ئەگەر تۆ نمایشێکی ڕێشتن بە دژ ئاراستەی کات بخەیتەڕوو، بیرۆکە نائەقلییەکان و شێوازە نابارەکانت پیشان بدەیت، خەڵکی پێیان وادەبێت کە تۆ تەنیا دەتەوێ سەرنجیان ڕابکێشیت و لەسەرەوەڕا لێیان بڕوانیت. ئەوان ڕێگەیەک دەدۆزنەوە تا سزات بدەن لەبەرانبەر ئەوەی وایانلێکردووی هەست بە نزمی بکەن. زۆر سەلامەتترە کە تێکەڵ

و شێوازێکی باو بەوە پێیدەبێت. تەنیا لەگەڵ هاوڕێیا بەتەمەنەکانت و لەوانەی کە بەدڵنیاییەوە ئاوازەیی تۆ ستایش دەکەن ڕەسەنایەتی خۆت دەربخە.

## یاسای ژمارە ٣٩

## ئاوەکان بشڵەقێنە

## بۆنەوەی ماسی بگریت

تووڕەیی و هەست لە ڕووی ستراتیژییەوە دژە بەرهەمهێنن. دەبێ تۆ هەمیشە هێمن و بابەتی بمێنیتەوە. بەڵام ئەگەر بتوانیت دوژمنانت تووڕە بکەیت لەکاتێکدا کە خۆت هێمنیت، ئەوا کاریگەرییەکی بڕیار لێدراو بەدەست دێنیت. دوژمنەکانت ناهاوسەنگ بکە: درزێک لە لووتبەرزییاندا بدۆزەرەوە کە بتوانیت لە ڕێگەیەوە بیانهەژێنیت و تۆ هەوسارەکە بگریتە دەست.

## یاسای ژمارە ٤٠

## ڤیز لە ژەمی خۆڕایی بکەرەوە

ئەوەی کە بە خۆڕایی پێشکەشت دەکرێت مەترسیدارە—ئەمە یان فێڵێکی تێدایە یان ئەرکێکی شاراوەی پەیوەیە. ئەو شتەی کە شایستەیە، شایستەی ئەوەیە پارەی پێبدەیت. بە دانی پارە بە شێوازی خۆت ئەوا لە سوپاسگوزاری، منەت، گوناه و فریو ڕزگار دەبیت. بەهەمان شێوە زۆرجار ئەوە ژیرانەیە کە تەواوی نرخەکە بدەیت؛ بۆ گەیشتن بە لێهاتوویەتی و تاودانی ئەسپەکەت قەمبر بوونی نییە. لەپارەکەتدا دەست بڵاو بە و دەستی پێوە مەگرە، چونکە بەخشندەیی نیشانە و موگناتیسی دەسەڵاتە.

## یاسای ٤١

## خۆت لە پێ خستنە ناو پێڵاوی کەسی گەورە بەدوور بگرە

ئەوەی کە یەکەم جار ڕوودەدات هەمیشە باشتر و ڕەسەنتر دیارە لەوەی کە دوایی دێت. ئەگەر تۆ لە کەسێکی بەناوبانگەوە بێیت یان باوانێکی بەناوبانگت هەبێ، دەبێ

توانای دەستکەوتی ئەوانت هەبێت بۆئەوەی لەوان تێپەڕێنیت. لە سێبەری ئەواندا بزر مەبە، ئەگینا لە ڕابردوویەکدا گیر دەخۆیت کە دەستکردی خۆت نییە: ناو و شوناسی خۆت بونیاد بنێ لە ڕێگەی گۆڕینی ڕێڕەوەکەوە. باوکی زاڵ لەنێو ببە، میراتەکەی بچووک بکەرەوە و بە شێوازی خۆت دەسەڵات بەدەست بێنە.

## یاسای ژمارە ٤٢

## لە شوانی بدە و مەڕەکان خۆیان بڵاو دەبن

دەشێ گێچەڵکرێت زۆرجار بگەڕێنرێتەوە بۆ تاکەکەسێکی بەهێز- بزوێنەر، کەسی خوارەوەی خۆبەزلزان و لووتبەرز، بەندی ئیرادە باشی. ئەگەر تۆ بوار بە خەڵکی وەها بدەیت مانۆڕ بکەن، ئەوانیتر دەکەونە ژێر کاریگەرییان. چاوەڕێ مەبە ئەو گێچەڵکرتنەی دەبنە هۆکاری، چەند جار زیاد بکات، هەوڵ مەدە دانوستانیان لەگەڵ بکەیت- ئەوان کەللەڕەقن. لە ڕێگەی گۆشەگیرکردن و دوورخستنەوەیان، کاریگەرییان پووچەڵ بکە. لە سەرچاوەی کێشەکە بدە و مەڕەکان بڵاو دەبن.

## یاسای ژمارە ٤٣

## کار لەسەر دڵەکان و ئەقڵەکانی ئەوانیتر بکە

زۆرداری پەرچەکردارێک دروست دەکات کە دواجار لەدژی تۆ کار دەکات. دەبێ تۆ ئەوانیتر بەکێش بکەیت بۆ ویستی جوڵان بە ئاراستەی تۆ. کەسێک کە تۆ فریوت داوە دەبێتە چنگی وەفاداری تۆ. شێوازی فریودانی ئەوانیتریش کارکردنە لەسەر سایکۆلۆژیی و لاوازیی تاکەکەسییان. کەسی بەرەنگار شل بکەرەوە بەوەی کە کار لەسەر هەستەکانیان بکەیت، یاری لەسەر ئەو شتە بکەیت کە بەلایانەوە ئازیزە و ئەو شتەش کە لێی دەترسن. ئەگەر دڵ و ئەقڵەکانی ئەوانیتر فەرامۆش بکەیت ئەوا ڕقت لێ دەگرن.

## یاسای ژمارە ٤٤

## بە کاریگەریی ئاوێنە، کەسەکە دەستەوەستان و تووڕە بکە

ئاوێنە وێنەدەرەوەی ڕاڵیە، بەڵام بەهەمان شێوەش ئامرازێکی تەواوە بۆ فریودان. کاتێك تۆ ئاوێنەی دوژمنەکەتی، کتومت ئەو شتە دەکەیت کە دەیکەن، ئەوان ناتوانن لە ستراتیژەکەت تێبگەن. کاریگەریی ئاوێنە دەیانکاتە گاڵتەجاڕ، وایانلێدەکات زێدەکاریانەوە پیشان بدەن. بە پیشاندانی ئاوێنە بە دەروونیان، بەو وەهمە فریویان دەدەیت کە تۆ لە بەهاکانی ئەواندا هاوبەشیت. بە پیشاندانی ئاوێنە بە کردارەکانیان وانەیەکیان لێ دەکەیت. کەسانێکی کەم دەتوانن بەرەنگاریی هێزی کاریگەریی ئاوێنە بکەن.

## یاسای ژمارە ٤٥

## لەسەر پێویستیی گۆڕان وتار دابدە، بەڵام قەت ڕیفۆرمی زۆر لە پڕێکدا ئەنجام مەدە

لە ئەبستراکتدا هەموو کەسێك لە پێویستی بۆ گۆڕان تێدەگات، بەڵام لە ئاستی ڕۆژ لەدوای ڕۆژدا خەڵکی زیندەوەری خوون. تازەگەریی زۆر زیانبەخشە و سەرهەڵدەکێشێت بۆ یاخیبوون. ئەگەر تۆ لە پێگەیەکی دەسەڵاتدا نوێیت، یان بێگانەیەکیت و دەتەوێ بناغەیەکی دەسەڵات بونیاد بنێیت، نمایشێکی ڕێزگرتن لە شێوازی کۆنی ئەنجامدانی شتەکان بکە. ئەگەر گۆڕان پێویست بێت، وا بکە هەست بکرێت کە باشکردنێکی نەرم و نیانی ڕابردووە

## یاسای ژمارە ٤٦

## قەت ئەوەندە کامڵ دەرمەکەوە

باشتر دەرکەوتن لەوانیتر هەمیشە مەترسیدارە، بەڵام لەهەمووی مەترسیدارتر ئەوەیە وا دەرکەویت هیچ هەڵە و کێماسیت نییە. ئیرەیی دوژمنی کپ دروست دەکات. کارێکی

زیرەکانەیە کە ئاوێنەی کەموکوڕی خۆت پیشان بدەیت و دان بە خراپە بێ زیانەکانت دابنێیت، بۆئەوەی نەرمیی بڵاوە پێنێیت و مرۆڤانەتر و دڵسۆزانەتر دەربکەویت. تەنیا خودا و مردووەکان دەتوانن بە پارێزیەتنییەوە کامڵ دیار بن.

## یاسای ژمارە ٤٧

## لەو نیشانەیە تێمەپەڕە کە ئامانجت بوو. لەسەرکەوتندا فێربە لە کوێ بوەستیت

ساتەوەختی سەرکەوتن زۆرجار گەورەترین مەترسی هەیە. لە گەرمەی سەرکەوتندا، لوتبەرزی و زیادە متمانەبەخۆبوون دەتوانن لەو ئامانجەت لابدەن کە تۆ بەدوایدا وێڵ بوویت و بە زۆر سوود وەرگرتنیش تۆ دوژمنی زۆر لەوە زیاتر پەیدا دەکەیت کە بتوانیت شکستیان پێ بهێنیت. ڕێگە مەدە سەرکەوتن لە کۆنترۆڵت بدات. هیچ جێگرەوەیەک بۆ ستراتیژ و پلاندانانی وریایانە نییە. ئامانجێک دابنێ و کاتێک پێی گەیشتیت، بوەستە.

## یاسای ژمارە ٤٨

## شێوەیەکی دیاریکراو مەگرە خۆت

بە وەرگرتنی شێوەیەک، بەهەبوونی پلانێکی دیار، خۆت بۆ هێرش واڵا دەکەیت. لەبری ئەوەی فۆرمێکی دیاریکراو بخەیتەڕووی دوژمنەکەت، بە بەردەوامی خۆت بگونجێنە و لە گۆڕاندا بە. ئەو ڕاستییە قبوڵ بکە کە هیچ شتێکی تەواو بوون دیاریکراو نییە و هیچ یاسایەک جێگیر نییە. باشترین ڕێگە بۆ پارێزگاری لەخۆت ئەوەیە شل و بێ شێوە بیت وەک ئاو. ئەت گرەو لەسەر سەقامگیریی یان سیستەمێکی درێژخایەن مەکە. هەموو شتێک دەگۆڕێت.

# پێشەکی

هەستکردن بە نەبوونی دەسەڵات بەسەر خەڵکی و ڕووداوەکاندا بەگشتی بۆ ئێمە قابیلی تەحەمول نییە– کاتێک هەست بە دەستەوستانی دەکەین، هەستیش بە دڵتەنگی دەکەین. کەس دەسەڵاتی کەمتری ناوێ، هەمووان زۆرتریان دەوێت. هەرچۆنێک بێت لە جیهانی ئەمڕۆدا زۆر مەترسیدارە وەکو چڵێسێکی دەسەڵات دەرکەویت و بە ئاشکرا دیار بێت کە هەڵپەی دەسەڵات دەکەیت. دەبێ ئێمە دادپەروەرانە و شایستە دیار بین. بۆیە دەبێ ئێمە ئالۆز بین– قابیلکەر لەگەڵ ئەوەشدا لێزان، دیموکرات و لەگەڵ ئەوەشدا لەبەوە بین،

ئەم گەمەیەی ڕووبەڕووبوونی بەردەوام زۆرتر هاوشێوەیە لەگەڵ ئەو داینامیکەی دەسەڵات کە لە جیهانی پڕ پیلانی دەرباری ئەریستۆکراتی کۆندا هەیە. بەدرێژایی مێژوو، دەربار هەمیشە لە دەوری کەسی ناو دەسەڵاتدا خۆی دروستکردووە. پاشا، شاژن، ئیمپراتۆر، سەرکردە. ئەو دەربارنامەی ئەو ماڵەیان پڕ کرد لە پێگەیەکی مەتسەت و ناسکدا بوون. ئەوان دەبووایە حورمەتی گەورەکانیان بگەن، بەڵام ئەگەر وا دیار بووایە کە ماستاو دەکەن، ئەگەر ئەوان زۆر بەئاشکرایی زمان لووسییان بکردایە، دەرباریییەکانی تری دەوریان تێبینییان دەکرد و لەدژیان هەنگاویان دەنا. بۆیە دەبووایە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی گەورە شاراوە بێت. تەنانەت دەرباریییە هەرە لێهاتووەکانی ئەم شارەوەییەش هێشتا دەبووایە خۆیان لە هاوتا دەرباریییە. تان بپارێزن کە لە هەموو ساتێکدا پیلانیان دادەنا بۆ بەلاوەنانیان

لەهەمان کاتدا وا دادەنرا دەربار نوێنەرایەتی لوتکەی شارستانیەت و جوانی بکات. جموجۆڵە دەسەڵاتخوازانە توندوتیژ یان ئاشکراکان ڕووبەڕووی مۆرە دەبوونەوە. دەربارییەکان بە هێمنی کاریان دەکرد و بە نهێنی ڕووبەڕووی هەر کەسێک دەبوونەوە کە هێزی بەکار دەهێنا. ئەمە بوو تەنگژەی دەرباری. لەکاتێکدا کە وا دەردەکەوت نموونەی کاملی جوانی و پاکی بێ، دەبووایە بەشاراوەترین شێوە لە نەیارەکانی خۆیان زیرەکتر بێ و تەگەرەیان بۆ دروست بکەن. دەرباریی سەرکەوتوو پێی بە پێی کات فێر دەبوو کە هەموو جموجۆڵەکانی بەشێوەی ناڕاستەوخۆ ئەنجام بدات، ئەگەر ئەو خەنجەری لە پشتی نەیارێک بدایە، ئەوا بە دەستکێشێکی مەخمەڵی و بە بزەیەکەوە ئەمەی دەکرد لەبری بەکارهێنانی زەبر یان ناپاکی ئاشکرا، دەرباریی کامڵ بە فریودان، جادوو، لەخشتەبردن و ستراتیژیی تەمومژاوی ئەمەی دەکرد، هەمیشە لەپێشدا پلانی چەند جوڵەیەکی دادەنا. ژیان لە دەرباردا گەمەیەکی کۆتایینەهاتوو بوو کە پێویستی بە چاودێریی بەردەوام و بیرکردنەوەی تاکتیکی هەبوو. ئەمە جەنگێکی شارستانیانە بوو.

ئەمڕۆکە ئێمە بەشێوەیەکی سەیر ڕووبەڕووی پارادۆکسێکی هاوشێوە دەبینەوە لەمەڕ دەرباری. دەبێ هەموو شتێک شارستانیانە، شایستە، دیموکراتیک و عادیلانە دیار بێت. بەڵام ئەگەر ئێمە بەشێوەیەکی بێ چەندوچوونتر پەیڕەوی لەو یاسایانە نەکەین، ئەگەر ئێمە کتومت پیادەیان بکەین، ئەوا لەلایەن ئەو کەسانەی دەوروبەرمان کە زۆر گەمژە نین تێکدەشکێنرێین. هەروەک دەرباری و دیپلۆماتی گەورەی ڕێنێسانس، نیکۆلۆ ماکیاڤیللی نووسی "هەر کەسێک هەوڵ بدات هەموو کاتێک باش بێت ئەوا لەنێو ژمارەی زۆری ئەو کەسانەی باش نین لەنێو دەچێت"

دەربار خۆی وەکو نموونەی پاکی وێنا دەکرد، بەڵام لە ژێر ڕووە بریقەدارەکەی مەنجەڵێکی هەستە تاریکەکان – چڵیسی، ئیرەیی، شەهوەت، کینە – دەکوڵا. جیهانی ئێمە لەمڕۆدا بەهەمان شێوە خۆی وەکو نموونەی دادپەروەری وێنا دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەمان ئەو هەستە دزێوانە هێشتا لەناوماندا دێن و دەچن، هەروەک چۆن تاهەتایەش هەروا دەمێنەوە. گەمەکە هەمان شتە. لە دەرەوەدا، دەبێ تۆ ڕێز لە

خواستییەکان بگریت، بەڵام لەناوەوەدا، ئەگەر گەمژەیەک نەبیت، ئەوا بەجێگایی فێر دەبی وریا نەبیت و وەھا بیت کە ناپۆلیۆن ڕێنوێنی کرد: دەستی ئاسنینت بخەرە ناو دەستکێشێکی وەناوشەییەوە (قەناعەتپێنانی کاریگەر بەڵام لەسەرخۆ). ئەگەر بەو شێوەیەی کە دەربەرییەکانی زوو ڕەفتاریان کرد، فێری هونەرەکانی ناڕاستەوخۆبوون بیت، فێر بیت بەکێش نەکەیت، جادوو بکەیت، لە هەشمە بەریت و زیرەکانە بەرەنەسی لێهاتوویی بەبارەکانت بېڕیت ئەوا دەگەیتە بەرزاییەکانی دەسەڵات. تۆ دەتوانیت و لە خەڵکی بکەیت مل بۆ ئیرادەت بدەن بەبێ ئەوەی درک بەوە بکەن چیت کردووە. ئەگەر ئەوانیش درک بەوە نەکەن چیت کردووە ئەوا ڕقیان لێت دەبیتەوە نە بەرەنگاریشت دەکەن.

بەلای هەندێ کەسەوە بیرۆکەی ئەنجامدانی گەمەکانی دەسەڵات بەشێوەی ناگایانە- گرنگ نییە چەندێک ناڕاستەوخۆش بن- خراپە و نزیوە، ناکۆمەڵایەتییە، شوێنەواری ڕابردووە. ئەوان بڕوایان وایە دەتوانن لە ڕێگەی ڕەفتارکردن بەو شێوازانەی کە پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە نییە، لە گەمەکە بچنە دەرەوە. دەبێ لەو کەسانە ئاگادار بیت، چونکە لەکاتێکدا ئەوان ڕووبەڕوو ئەو قسانە دەکەن، زۆرجار لێھاتووترین یاریکەری دەسەڵاتن. ئەوان ئەو ستراتیژییانە بەکار دێنن کە زیرەکانە پۆشپۆشی سروشتی بەکاربردنی دەکەن. بۆ نموونە، ئەم جۆرە کەسانە زۆرجار حاڵی لاوازی و بێ دەسەڵاتی خۆیان وەکو جۆرێک لە فەزیلەتی ئەخلاقی پیشان دەدەن. بەڵام بێ دەسەڵاتیی ڕاستەقینە، بەبێ هەر پاڵنەرێکی بەرژەوەندیی خۆیی، لاوازییەکەی لە هەڵلا نادات بۆ بەدەستهێنانی هاوخەمی یان ڕێز. لە ڕاستیدا پیشاندانی لاوازی ستراتیژیەکی کاریگەر، ئاڵۆز و فریودەرانەیە لە گەمەی دەسەڵاتدا.

ستراتیژیەکی تری بەناو یاری بەکەر ئەوەیە داوای یەکسانی دەکات لەهەموو بوارێکی ژیاندا. پێویستە هەمووان وەکویەک مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، جا پێگە و هێزیان هەرچۆنێک بێت. بەڵام ئەگەر، بۆ خۆلادان لە ژەهری دەسەڵات، هەوڵ بدەیت بەشێوەیەکی عادلانە و یەکسان مامەڵە لەگەڵ هەمووان‌دا بکەیت، ئەوا ڕووبەڕووی ئەو

کێشەیە دەبینەوە کە هەندێ حەڵك هەندێ شت باشتر لەوانیتر ئەنجام دەدەن مامەڵەکردنی یەکسان لەگەڵ هەمووان واتە فەرامۆشکردنی جیاوازییەکان، بەرزکردنەوەی هەڵکی کەم شارەزا و سەرکوتکردنی ئەوانەی کە بیهاتوون. جارێکی تر، رێژیەك لەوانەی بەمشێوەیە رەفتار دەکەن لە راستیدا ستراتیژییەکی تری دەسەڵات پیادە دەکەن، پاداشتەکانی حەڵك بەو شێوازەی کە دەیانەوێ دابەش دەکەنەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا رێگەیەکی جۆلادان لە گەمەکە بریتییە لە راستگۆییەکی تەواو و راشکاوی، چونکە یەکێك لە تەکنیکە سەرەکییەکانی ئەو کەسانەی سۆزداری دەسەڵات دەکەن لەخشتەبردن و نهێنیکارییە. بەڵام تەواو راستگۆ بوون بەشێوەیەکی حەتمی ئازاربەخش و نیهانەیە بۆ ژمارەیەکی یەکجار زۆری حەڵك کە هەندێکیان لەبەرانبەردا هەستت بریندار دەکەنەوە. هیچ کەسێك قسە راستەکانی تۆ بەشێوەیەکی تەواو واقیعی و بەتال لە پاڵنەری شەخسی وەرناگرێت. ئیجا ئەوان لەمەدا راست دەکەن. لە راستیدا، بەکارهێنانی راستگۆیی بە راستی ستراتیژێکی دەسەڵاتە، مەبەست لێی قەناعەتپێهێنانی خەڵکە لەمەڕ کارەکتەری خاکی، دڵپاش و نەرم و نیانی کەسەکە. ئەمە شێوەیەکی راڕیکردنە، تەنانەت فۆرمێکی شاراوەی زەبرە.

دواجار، لەوانەیە ئەو کەسانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بریکەر بێ کەشێکی ساویلکەیی دروست بکەن بۆ پارێزگاری لەخرکردنیان لەو تۆمەتەی کە گوایە بەدوای دەسەڵاتەوەن. لەگەڵ ئەوەشدا، جارێکی تر وریا بە، چونکە دەشێ دەرکەوتنی ساویلکەیی ئامرازێکی کاریگەری فریودان بێت. تەنانەت ساویلکەییەکی راستەقینە بەدەر نییە لە تەڵەی دەسەڵات. لەوانەیە منداڵ لە زۆر رووەوە ساویلکە بێ، بەڵام ئەوان بۆزجار بە پێویستبوونێکی سەپێنەیی بۆ بەدەستهێنانی کۆنترۆڵ بەسەر دەوروبەریاندا ئەمە دەکەن. منداڵ بە رادەیەکی بەرچاو بەدەست هەستی دەستەوسانی دەناڵێنن لە جیهانی پێگەیشتووانندا و ئەوان هەر ئامرازێکی بەردەست بەکار دێنن بۆ شوێنکردنەوەی خۆیان. لەوانەیە ئەو حەڵکەش کە بەشێوەیەکی راستەقینە بێگوناهن یاری دەسەڵات هەر بکەن و بۆزجار هەتا بڵێی کاریگەرن لە یارییەکەدا، چونکە ئەوان تووشی بەربەستی

تێرامان مابێ. جارێکی تر، ئەوانەی کە سایکی بەرانەت دەکەن تا کەمترین ئاست بیگرێنن.

تۆ دەتوانیت ئەم بەماو یارییەکەرانە لە ڕێگەی ئەبکس تایبەتمەندییە ئەخلاقییەکانیان، دیدارییان، دادپەروەریخوازییان بناسیتەوە. بەڵام لەمەڕئەوەی هەموومان تینووی دەسەڵاتین و تەقریبەن هەموو کردارەکانمان بۆ بەدەستهێنانییەتی، یارییەکەران تەنیا خۆڵ دەکەنە چاوەکانمانەوە، لە ڕێگەی کەشی باڵایی ئەخلاقیانەوە، هۆشمان لە یارییەکانی دەسەڵاتیان پەرت دەکەن. ئەگەر لە نزیکەوە چاودێرییان بکەیت، ئەوا لە ڕاستیدا دەبینیت کە ئەوان زۆرجار ئەوانەن کە بیرامترین لە بەکاربردنی ناڕاستەوخۆدا، ئەگەرچی هەندێکیان بەشێوەیەکی نائاگایانە پراوەی ئەمە دەکەن. تیبعا ئەوان تا ڕادەیەکی زۆر ڕقیان لە ئاشکرابوونی ئەو تاکتیکانەیە کە ڕۆژانە بەکاریدێنن

ئەگەر جیهان وەکو پاستایییەکی پیلانگێڕانی ڕەمەلاح بێت و ئێمە تیایدا گرفتار بووبین، هەوڵدان بۆ دەرچوون لە یارییەکە کەڵکی نییە. ئەمە تەنیا بێ دەسەڵاتترت دەکات و بێ دەسەڵاتی نەگبەتت دەکات. لەبری ململانێ لەدژی شتێکی حەتمی، لەبری مشتومڕکردن و هەوار و ناڵە و هەست بە گوناه کردن، زۆر باشترە شارەزایەتی لە دەسەڵاتدا پەیدا بکەیت. لە ڕاستیدا چەندەی لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەسەڵاتدا باشتر بیت، ئەوەندە هاوڕێ، خۆشەویست، مێرد، ژن و کەسێکی باشتر دەبیت. بە پەیڕەویکردن لە ڕێڕەوی دەرباریەکی کامل فێر دەبیت وا لەوانیتر بکەیت کە هەستێکی باشتریان بەرانبەر خۆیان هەبێت، ئەوەی کە ببنە سەرچاوەیەکی خۆشی بۆیان. ئەوان دوایی وابەستە دەبن بە توانکانی تۆ و ئارەزوومەندی ئامادەبیت دەبن. بە فالووی لە ٤٨ یاسای دەسەڵاتدا کە بەم کتێبەدا هاتوون، ئەوانیتر لەو ئازارە دەپارێزیت کە لە حرب مامەڵەکردن لەگەڵ دەسەڵات دێت- ئەوەی کە یاری بە ئاگر بکەیت بەبێ ئەوەی پێکهاتەکانی بزانیت. ئەگەر گەمەی دەسەڵات بێ چەندوچوون بێت، وا باشترە هونەرمەندێک بیت نەک نکوڵیکەرێک یان نێچیرێک.

فێربوونی گەمەی دەسەڵات پێویستی بە ڕێگەیەکی دیاریکراوی ڕووبەڕوو لە جیهان، ڕوانگەیەکی وەرچەرخاو هەیە. ئەمە ئەقڵ و ساڵانێک پراوەی پێویستە، چونکە لەوانە نیمە بەشی زۆری گەمەکە سروشتی بێت. هەندێ شارەزاییەتی دیاریکراو پێویستن و هەر کە تۆ ئەم شارەزاییەتیانەت بەدەست هێنا ئەوا دەتوانیت یاساکانی دەسەڵات بەشێوەیەکی ئاسانتر پیادە بکەیت

هەرە گرنگترینی ئەم شارەزاییەتییانە و بناغەی چارەنووسسازی دەسەڵات توانینیە لە توانای زاڵبوون بەسەر هەستەکانتدا. کاردانەوەیەکی هەستی بەرامبەر بارودۆخێک تاکە گەورەترین بەربەستی دەسەڵاتە، هەڵەیەکە کە باجەکەی زۆر گەورەترە لە هەر ئاسوودەییەکی کاتی کە لەوانەیە لە دەربڕینی هەستەکانت بەدەستی بهێنیت. هەستەکان ئەقڵ دادەپۆشن و ئەگەر تۆ بارودۆخەکە بە ڕوونی نەبینیت، ئەوا ناتوانیت خۆت ئامادە بکەیت و بەشێوەیەکی بالادەستانە کاردانەوە بخەیتەڕوو

تووڕەیی کارەساتبارترین کاردانەوەی هەستییە، چونکە بینایت تاریک دەکات بەهەمان شێوە کاریگەرییەکی بڵاوبووەوەی هەیە کە بێ چەندوچوون بارودۆخەکە لەبەر دەستت دەترازێنێت و مکوڕیی دوژمنەکەت زیاد دەکات. ئەگەر تۆ هەوڵ دەدەیت دوژمنێکت تێک بشکێنیت کە زیانی پێگەیاندوویت، زۆر باشترە بە ڕێگەی دۆستایەتیی ساختەوە نەک پیشاندانی تووڕەییت بیخەیتە دۆخێکی بێ ئاگاییەوە

خۆشەویستی و سۆز بەهەمان شێوە زۆر وێرانکەرن لەوەدا کە لەبەرامبەر بەرژەوەندییە خۆسەکانی ئەو کەسانەی زۆرجار کەمترین گومانت هەیە هەریەکی گەمەی دەسەڵات بن، کوێرایێت دادێنێت. تۆ ناتوانیت تووڕەیی یان خۆشەویستی کپ بکەیت، یان خۆت لە هەستکردن پێیان لابدەیت و نابێت هەوڵ بدەیت. بەڵام دەبێ وریا بیت لەبارەی ئەوەی کە چۆن دەریاندەبڕیت و لەهەمووشی گرنگتر، نابێ هەرگیز کار بکەنە سەر پلان و ستراتیژەکانت بەهیچ شێوەیەک.

ئەوەی کە پەیوەندی بە زاڵبوون بەسەر هەستەکانتەوە هەیە توانای خۆ دوورخستنەوەتە لە ساتەوەختی ئێستا و بیرکردنەوەی واقعیانەیە لەبارەی ڕابردوو و

ئاینده. وەکو جانوس، خوداوەندی دوو ڕووی ڕۆمان و پاسەوانی هەموو دەروازە و دەرگاکان، دەبێ بتوانیت لەیەک کاتدا لە هەردوو ئاقارەکە بڕوانیت، باشترە مەترسی لە هەر کونێکەوە بێت دەست و پەنجەی لەگەڵدا نەرم بکەیت. ئەمەیە ئەو ڕووخسارەی کە دەبێ بۆ خۆتی دروست بکەیت- ڕووخسارێک کە بە بەردەوامی بڕوانێتە ئاینده و ئەویتریان بڕوانێتە ڕابردوو

بۆ ئاینده، دروشمەکە بریتییە لە "تا بۆ هیچ ڕۆژێکی بێ ئاگایی" نابێ هیچ شتێک ڕێکەوتت بکات چونکە تۆ بە بەردەوامی وێنای کێشەکان دەکەیت بەر لەوەی سەرهەڵبدەن. لەبری بەسەر بردنی کاتت بە خەونبینین بە کۆتایی خۆشبەختانەی پلانەکەت، دەبێ کار لەسەر خەمڵاندنی هەموو ڕێکخستنێک و مەترسییەکی لەناکاو کە دەشێ تێیدا سەرهەڵبدات. چەندەی دوورتر بڕوانیت، چەندەی پلانی هەنگاوی زۆرتر لەپێشدا دابنێیت، ئەوەندە بەهێزتر دەبیت

ڕووخسارەکەی دیکەی جانوس بە بەردەوامی دەڕوانێتە ڕابردوو- هەرچەندە بیرەکانی بیرەکانی ڕابردوو یان داخ لە دڵ ناگرێت. ئەمە تەنیا دەسەڵاتت بەربەست دەکات. نیوەی یارییەکە فێربوونی چۆنێتی لەبیرچوونی ئەو ڕووداوانەی ڕابردووە کە دادەخورێنی و ئەقڵت لێڵ دەکەن. ئامانجی ڕاستەقینەی سەرنجدانە ڕابردوو فێرکردنی خۆتە بە بەردەوامی- تۆ دەڕوانیتە ڕابردوو بۆئەوەی لەو کەسانەوە فێر بیت کە پێش تۆ هاتن (نموونە زۆرە مێژووییەکان لەم کتێبەدا تا ڕادەیەکی بەرچاو یارمەتیدەری ئەم پرۆسەیەن) پاشان، بە ڕوانین لە ڕابردوودا، بۆ نزیکتر لە ئێستا دەڕوانیت، لە کردارەکانت و کردارەکانی دۆستەکانت دەڕوانیت. ئەمە زیندووترین قوتابخانەیە کە تۆ دەتوانیت لێیەوە فێر بیت، چونکە ئەمە لە ئەزموونی کەسییەوە دێت.

تۆ بە پشکنینی ئەو هەڵانە دەست پێدەکەیت کە لە ڕابردوودا کردووتن، ئەوانەی کە بە شێوەیەکی حەساک تۆیان خستە دواوە. تۆ لەمۆنگەی ٤٨ یاساکەی دەسەڵاتەوە شیی دەکەیتەوە و دەپەیت و سوێندێکیان لێ هەڵدەبجیت "من قەت هەڵەی وا ناکەمەوە، من قەت ناکەومەوە داوی تەڵەیەکی وەها" ئەگەر تۆ بتوانیت لەم ڕێگەیەوە

خۆت هەڵسەنگێنیت و چاودێری بکەیت، ئەوا دەتوانیت پیشاکانی رابردوو بشکێنیت— کە شارەزایەتییەکی بێ رادە بەرهەمە

دەسەڵات پێویستی بە توانای گەمەکردنە لەگەڵ رواڵەتەکاندا. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ تۆ فێر ببیت دەمامکی زۆر بپۆشیت و جانتایەکی پڕ لە فێڵی فریودەر هەڵبگریت. نابێت فریودان و ماسک کردن بە دزێو یان نائەخلاقی ببینرێت. هەموو کارلێکە مرۆییەکان لە زۆر ئاستدا پێویستیان بە فریودان هەیە و لە هەندێ رووەوە ئەوەی کە مرۆڤەکان لە ئاژەڵەکان جیا دەکاتەوە توانامانە بۆ درۆ کردن و فریودان. لە ئەفسانە یۆنانییەکاندا، لە سروودی مەهابهاراتای هیندستاندا، لە داستانی گەلگامێشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئەوە ئیمتیازێکی خوداکانە کە هونەری فریودان بەکار بێنن. پیاوێکی مەزن، بۆ نموونە ئۆدیسەس، بە تواناکەی بۆ رکابەریکردنی زیرەکی خوداکان هەڵسەنگێنرا، ئەوەی کە لە گەمەیەکی زیرەکی و فریوداندا بەشێک لە دەسەڵاتی خوداییانی دزی. فریودان هونەرێکی پێشکەوتووی شارستانییەت و کاریگەرترین چەکە لە گەمەی دەسەڵاتدا.

تۆ ناتوانیت لە فریودان سەرکەوتوو بیت ئەگەر تۆ جۆرێک لە ئاراستەی دوور لە خۆت نەگریتە بەر— ئەگەر نەتوانیت زۆر کەسی جیاواز بیت، بەوەی دەمامکێکی بپۆشیت کە رۆژەکە و ساتەوەختەکە پێویستی دەکات. بە ئاراستەیەکی وەها کشۆکەوە بۆ هەموو رواڵەتەکان، بەوەی خۆشنەوە، تۆ قورساییەکی زۆر لەدەست دەدەیت کە خەڵکی دەگەڕێنێتە دواوە. رووخسارت کشوک بکە وەکو هی ئەکتەر، کار بکە بۆ شاردنەوەی نیازەکانت بەرامبەر ئەوانیتر، پراوەی رکێشانی خەڵک بکە بۆ ناو تەڵەکان. یاریکردن بە رواڵەتەکان و وەستایەتی لە هونەرەکانی فریوداندا، لە چێژە جوانییەکانی ژیانن، ئەمانە بەهەمان شێوە پێکهاتەی سەرەکین لە بەدەستهێنانی دەسەڵاتدا.

ئەگەر فریودان کاریگەرترین چەکە لەناو پەیمانەی تۆدا، ئەوا ئۆقرەگرتن لە هەموو شتەکاندا قەڵغانی چارەنووسسازی تۆیە. ئۆقرەگرتن لە هەڵەی دەمەنگانە دەتپارێزێت وەکو رانەوین بەسەر هەستەکانتدا، ئۆقرەگرتن شارەزایەتییەکە— هەروا بەشێوەیەکی سروشتی نایەت. بەڵام هیچ شتێکی دەسەڵاتیش سروشتی نییە. دەسەڵات زیاتر

خوداوەندناسایە نەک ئەوەی کە شتێکی تر بێت لە جیهانی سروشتیدا. ئۆقرەگرتنیش فەزیلەتی بالای خوداکانە، کە هیچیان نییە جگە لە کات. هەموو شتێکی باش ڕوودەدات– گیا جارێکی تر دەڕوێت، ئەگەر کاتی پێ بدەیت و چەند هەنگاوێکی نایدە نێبیی بکەیت کەچی بێ ئۆقرەیی تەنیا ئازار پیشانت دەدات. ئەمە تەگەرەکی بنچینەییە لەبەردەم دەسەڵاتدا

دەسەڵات لە جەوهەردا نائەخلاقییە و یەکێکە لە شارەزاییتییە هەرە گرنگەکان بۆ بەدەستهێنانی، توانای بینینی ڕووداوەکانە نەک چاکە یان خراپە. دەسەڵات یارییەکە– ئەمە باشێ بۆ ئەوە دووبارە بێتەوە– و لە یارییەکاندا تۆ بە گوێرەی نیازەکانیان حوکم لەسەر نەیارەکانت نادەیت، بەڵکو بەوەی کە تۆ دەتوانیت چ ببینیت یان هەست پێ بکەیت حوکمیان لەسەر دەدەیت. چەند جار هەبووە کە نیازەکانی کەسێک مەسەلەکەی تەنیا لێڵ کردووە و داپۆشیووە! چ گرنگییەکی هەیە ئەگەر یاریکەرێکی تر، هاورێت یان ڕکابەرت، نیازی باشی هەبووبێ و لە ناخەوە بەرژەوەندیی تۆی لا مەبەست بووبێ، بەڵام بەرەنجامەکانی کردارەکەی شێواندن و پەشێوییەکی زۆری لێکەوتەوە؟ تەنیا ئەوە بۆ خەڵکی سروشتییە کە کردارەکانیان بەهەموو جۆرە پاساوێک داپۆشن، هەمیشە وایدانێن کە لە چاکە ئەمە یان ئەوەیان کردووە. دەبێ تۆ لەناوەوەڕا پێبکەنیت هەر کاتێک کە گوێبیستی ئەمە دەبیت و قەت گیرۆدەی پێوانەکردن و خەمڵاندنی نیازەکان و کردارەکانی کەسێک نابیت لە ڕێگەی ڕستێک حوکمدانی ئەخلاقییەوە کە بە ڕاستی پۆزشێکە بۆ کەڵەکەکردنی دەسەڵات.

ئەمە گەمەیەکە. نەیاری تۆ لەبەرامبەرتدا دادەنیشێت. هەردووکتان وەکو جێنتڵمان یان خاتوون دادەنیشن، چاودێری ڕێساکانی گەمەکە دەکەن و هیچ شتێک بە شەخسی لەقەڵەم نادەن. تۆ بە ستراتیژێک یاری دەکەیت و ئەوەندەی بکرێ بە هێمنییەوە چاودێری جوڵەکانی بەرەنگارت دەکەیت. لە کۆتاییدا، تۆ ستایشی بەڕێزیی ئەوانە دەکەیت کە تۆ یارییان لەگەڵدا دەکەیت زیاتر لە نیازە باش و شیرینەکەیان. چاوت ڕابهێنە

لەسەر سوزاهکردنی ئەنجامەکانی جوڵەکانیان، بارودۆخی دەرەوەیان و یا هەر شتێکی تر هۆشت پەرت دەکات.

میوەی ڕەستاییەکەی تۆ لە دەسەڵاتدا لەوەوە دێت کە نایکەیت، ئەوەی کە تۆ ڕێگە بە حوت نادەیت بەکێش بکرێیتە ناوی. بۆ ئەم شارەزاییەتییە، دەبێ تۆ فێر بیت بەر تێچوون و باجەی کە هەیانە حوکم لەسەر شتەکان بدەیت. وەک نیچە دەنووسی "هەندێ جار بەهای شتێک لەوەدا نییە کە لەگەڵیدا بەدەستی دێنیت، بەڵکو لەوەدایە کە پێی دەدەیت– واتە ئەو تێچوونەی کە لەسەری دادەنێین" لەوانەیە تۆ ئامانجەکەت بەدەست بێنیت و لەمەدا ئامانجێکی شایستەیە، بەڵام بە چ نرخێک؟ ئەم ستاندارده بەسەر هەموو شتێکدا پیادە بکە، بەوەشەوە کە ئاخۆ هاوکاری خەڵکی تر دەکەیت یان بەهانای یارمەتیدانیانەوە دەچیت. دواجار ژیان کورتە، دەرفەتەکان کەمن و تۆ تەنیا ئەوەندە وزەیەت هەیە کە پشتی پێ ببەستیت.

دەسەڵات گەمەیەکی کۆمەڵایەتییە. بۆ فێربوون و تیادا قاڵ بوونی، دەبێ توانای تاووتوێکردن و تێگەیشتن لە خەڵک پەیدا بکەیت. وەکو دەربار و بیرمەندی گەورەی سەدەی حەڤدە بەلتاسار گراسیەن دەنووسی: "زۆرێک لە خەڵک کات بە توێژینەوەی تایبەتمەندییەکانی ئاژەڵان یان گژوگیا بەسەر دەبەن، چەنێک گرنگترە کە تاووتوێی ئەو خەڵکانە بکەین کە ئیمە دەبێ لەگەڵیاندا بژین و بمرین!" بۆ ئەوەی گەورە یاریکەرێک بیت دەبێ هەمیشە گەورە دەروونناسێک بیت. دەبێ بەناو ئەو تەمەی تەپ و تۆزدا کە خەڵکی کردارەکانیان پێ دەورە دەدەن، پاڵنەرەکان بناسیتەوە و ببینیت. تێگەیشتنێک لە ئەنگێزە شاراوەکانی خەڵک تاکە گەورەترین ماریفەتە کە تۆ دەتوانیت لە بەدەستهێنانی دەسەڵاتدا هەتبێت. ئەمەئەگەرە ناکۆتاکانی فریودان، ڕەکێشکردن و بەکاربردنی واڵا دەکات.

خەڵکی هەتا بڵێی ئاڵۆزن و تۆ دەتوانیت تەمەنێک بە ئەماشاکردنیان بەسەر ببەیت بەبێ ئەوەی بەتەواوی لێیان تێبگەیت. بۆیە چەندەی بڵێی گرنگە کە ئێستا فێربوونەکەت دەست پێبکەیت. لەمەدا، دەبێ هەمان شێوە پرەنسیپێک لەبیر بێت: قەت جیاکاری

مەکە لەنێوان ئەوەی کە تاووتوێی کێ نەکەیت و متمانە بە کێ نەکەیت. قەت متمانەی تەواوەتی بە کەس مەکە و تاووتوێی هەموو کەسێك بکە، بە هاوڕێ و خۆشەویستەکانیشتەوە.

دواجار، دەبێ تۆ فێر بیت هەمیشە ڕێڕەوی ناڕاستەوخۆ بۆ دەسەڵات بگریتە بەر لێزانییەکەت داپۆشە. وەکو تۆپێکی بلیارد کە چەند جارێك بەر قەراغەکان دەکەوێت بەر لەوەی لە ئامانجەکەی بدات، دەبێ جوڵەکانت بەپلان و بە کەمترین شێوازی دیار بەرجەستە ببن. بە خۆڕاهێنانت لەسەر ناڕاستەوخۆبوون، دەتوانیت لە یاریگای مۆدێرندا گەشە بکەیت، وەکو نموونەیی لێهاتوویی دەربکەویت لەکاتێکدا کە بەکاربەرێکی بێگەپشتوو بیت.

٤٨ یاسای دەسەڵات لە کتێبێك لەسەر هونەرەکانی ناڕاستەوخۆبوون دابنێ. یاساکان لەسەر بنەمای نووسینەکانی ئەو پیاو و ژنانە نووسراون کە تاووتوێی گەمەی دەسەڵاتیان کردووە و تیایدا قاڵ بوون. ئەم نووسینانە ماوەیەکی زیاتر لە سێ هەزار ساڵ دەگرنەوە و لە شارستانیەتە تا بڵێی لێك دوورەکانی وەکو چینی دێرین و ئیتالیای ڕێنیسانس دا ئەفرێنراون. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە لە سەرەداو و بیرۆکەکاندا هاوبەشن، پێکەوە ئاماژەن بە جەوهەری ئەو دەسەڵاتەی کە هێشتا بەتەواوی بەرجەستە نەبووە. ٤٨ یاسای دەسەڵات پاڵاوتەی ئەم زیرییە کەڵەکە بووەیە، کە لە نووسینەکانی ستراتیژیستە هەرە دیارەکانی (سون تزو، کلاوسەویتز)، دەوڵەتمەدارە هەرە درەوشاوەکانی (بیسمارک، تالیراند)، دەرباریە هەرە بەناوبانگەکان (کاستیگلیون، گراسیەن)، فریودەرە ناسراوەکان (نینۆن دو لێنکلۆس، کاسانۆڤا)، و کلاوچیە هەرە کاریگەرەکان ("کوڕە زەرد" وەیل) لە مێژوودا کۆ کراوەتەوە.

یاساکان گریمانەیەکی سادەیان هەیە، هەندێ لە کردارەکان تەقریبەن هەمیشە دەسەڵاتی مرۆڤ زیاد دەکەن (پەیڕەوکردنی یاساکە)، لەکاتێکدا کە ئەوانەیتر کەمی دەکەنەوە و تەنانەت تێکیدەشکێنن (پێشێلکردنی یاساکە). ئەم پێشێلکردن و پەیڕەوییانە بە نموونەی مێژوویی شرۆڤە کراون. یاساکان کاتیان نییە و بێ چەندوچوون

دەکرێ ١٨ یاسای دەسەڵات بە چەند ڕێگەیەک بەکار بهێنرێت. بە خوێندنەوەی تەواوی کتێبەکە دەتوانیت بەشێوەیەکی گشتی لەبارەی دەسەڵاتەوە فێر ببیت هەرچەندە دەشێ ژمارەیەک لە یاساکان پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بە ژیانی تۆوە نەبێت، لەوانەیە لەکاتی خۆیدا بۆت دەرکەوێت کە هەموویان ڕادەیەک لە پەیوەندییان هەیە و ئەمەی کە لە ڕاستیدا پەیوەستن بە یەکترییەوە. بە خوێندنەوەی تەواوی بابەتەکە تۆ بە باشترین شێوە دەتوانیت کردارەکانی ڕابردووی خۆت هەڵسەنگێنیت و ئاستێکی گەورەتری کۆنترۆڵ بەسەر کاروباری ڕاستەوخۆتدا بەدەست بهێنیت. خوێندنەوەیەکی کاملی کتێبەکە ماوەیەکی زۆر پاش ئەوەی تەواوی دەکەیت لە ئیلهامبەخشی بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندنەوە دەبێت

*گومانی تیا نییە کە دەربارەکان شوێنی ڕێز و پەروەردەی باشن. ئەگەر وەها نەبووایە ئەوا شوێنی کوشتن و وێرانە دەبوون. ئەوانەی ئێستا بزە دەخەنە سەر لێوان و یەکتری لەئامێز دەگرن، پەلاماری یەکتریان دەدا و لەیەکتریان دەدا، ئەگەر شێواز و ڕەفتارەکان نەهاتنایەتە نێوانەوە*

لۆرد چیستەرفیلد، (١٦٩٤–١٧٧٣)

*هیچ شتێک سەیر نییە لەبارەی بەرخەوە کە ڕقی لە بازە، بەڵام ئەمە هۆکار نییە بۆ ڕق هەڵگرتن لە بازە گەورەکان کە ئەوان بەرخ لەناو دەبەن. کاتێکیش بەرخەکان بە گوێچکەی یەکتریدا دەچپێنن، "ئەم بازانە خراپەکارن و ئایا ئەمە مافی ئەوەمان نادات بڵێین کە دەبێ هەرچییەک پێچەوانەی باز بێت باش بێت؟" ئەم بەڵگاندنە هیچ ناتەواوییەکی تێدا نییە. هەرچەندە بازەکان تا ڕادەیەک هەتاو ئامێز نیارن و دەڵێن "هیچ شتێکمان لەلای ئەم بەرخە باشانە نییە. لە ڕاستیدا، خۆشمان دەوێن، هیچ شتێک تامی لە بەرخێکی ناسک خۆشتر نییە"* فریدریک نیچە ١٨٤٤–١٩٠٠

تاکە ئامرازی بەدەستهێنانی ئامانج لە پەیوەند بە هەڵکەوە بریتییە لە هێز و لەراسی دەڵێن هێزشەرپیستیش، بەڵام بۆ ئەمە دەبێ چارەڕێی سامال بکەین و زیان بەبوبەستی سات بە ساتەکانە.

جۆن لۆن گۆتە (١٧٤٩-١٨٣٢)

ئەو تیرەی لە کەوان دەردەچێت لەوانەیە و لەوانە نییە تاکە کەسێک بکوژێت، بەڵام ئەو ستراتیژەی لەلایەن کەسێکی زیرەوە دادەڕێت دەتوانێت تەنانەت کۆرپەی ناو منداڵدان بکوژێت. کۆتیلیا، فەیلەسوفی هیندی، سەدەی سێیەمی پێش زایین

من لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە ئەبێ بە چ ئامرازێک، بە چ فریودانێک، بە چەند هونەری جیاجیا، بە چ پیشەیەک مرۆڤ زیرەکیی خۆی تیژ دەکات بۆ فریودانی یەکێکی تر و لە ڕێگەی ئەم هیوارییانەوە جیهان جوانتر دەکرێت. فرانسیسکۆ گیتیزی، هاوسەردەم و هاوڕێی مەکیاڤیللی، سەردەمای سەدەی شانزە

پرەنسیپ بوونیان نییە، تەنیا ڕووداو هەن. یاسە و هرایە بوونیان نییە، تەنیا بارودۆخ هەن. مرۆڤی بالا ڕووداوەکان و بارودۆخەکان بەپێی دەکەوێت بۆ ئەوەی ئاراستەیان بکات. ئەگەر پرەنسیپ و یاسای چەسپاو هەبووبایە، گەلان بەو شێوەیە بەیاندەگۆڕی کە ئێمە جلەکانمان دەگۆڕین و ناشێ کەسێک چاوەڕێی ئەوەی لێ بکرێت لە سەراپای گەلێک ژیرتر بێت.

ئۆنۆرێ دو بالزاک (١٧٩٩- ١٨٥)

# یاسای ژمارە ١

# هەرگیز لە گەورەکەت لێهاتووتر دەرمەکەوە

### تۆکە

*هەمیشە وەها لەوانەی سەرووی خۆت بکە بە ئاسودەیی هەست بکەن بالای لە ئارەزووکردنتدا بۆ دڵخۆشکردن و کارتێکردنیان ئەوەندە لە پیشاندانی بەهرە و تواناکانتدا دوور مەڕۆ ئەگینا لەوانەیە دەستکەوتەکەت پێچەوانە بێت — ترس و نائارامی دروست بکەیت. وا بکە گەورەکانت لێهاتووتر دەربکەون لەوەی کە هەن و بەمشێوەیە تۆ دەگەیتە ترۆپکی دەسەڵات*

### سەرپێچی یاساکە

نیکۆلاس فوکێت، وەزیری دارایی لویسی چواردە لە ساڵانی سەرەتای حوکمڕانییەکەیدا، پیاوێکی بەخشندە بوو کە حەزی لە ئاهەنگە پڕ خەرجییەکان، ژنانی جوان و شیعر بوو، ئەو بەهەمان شێوە حەزی لە پارە بوو، چونکە ئەو شێوازێکی ژیانی دەست بڵاوانەی بەسەر دەبرد. فوکێت زیرەک بوو و پاشا زۆر پێویستی پێبوو، بۆیە کاتێک سەرۆک وەزیران جیولس مازارین لە ١٦٦١دا مرد، چاوەڕێی ئەوە دەکرد سەرۆک وەزیری نوێ وەکو شوێنگرەوەی ئەو دیاریبکرێت. لەبری ئەمە، پاشا بڕیاریدا پۆستەکە هەڵوەشێنێتەوە. ئەمە و نیشانەکانی تر وای لە فوکێت کرد گومانی ئەوە پەیدا بکات

که ئەم نرەوی نەماوە و بۆیە بڕیاریدا بە سازدانی نایابترین ئاهەنگی جیهان خۆی لای پاشا خۆشەویست بکاتەوە. ئامانجە ڕواڵەتییەکەی ئاهەنگەکە بۆ بەئاهەنگگرتنی تەواوبوونی خانووە کەشتارییەکەی فۆکێتە، ڤۆکس لو ڤیکۆمت، بەڵام کرۆکە واقیعییەکە ڕێز و پێزانین بوو بۆ پاشا، میوانی شەرەف.

خانەدانە هەرە ناسراوەکانی ئەورووپا و هەندێ لە گەورەترین ئەقڵەکانی سەردەم- لافۆنتێن، لا ڕۆچیفۆکۆڵد، مەدام دو سێڤین- ئامادەی ئاهەنگەکە بوون. مۆلیێر شانۆییەکی بۆ بۆنەکە نووسی کە تیایدا ئەو خۆی لە کۆتایی ئێوارەکەدا نواندنی ئەنجام دەدا. ئاهەنگەکە بە ئێوارەخوانێکی تێروتەسەلی فرە خواردن دەستیپێکرد کە خۆراکی خۆرهەڵاتی وەهای تیابوو پێشتر لە فەرەنسا تام نەکرابوو، هەروەها خۆراکی نوێ تیا بوو کە تایبەت بۆ شەوەکە دروستکرابوو. ژەمەکە مۆسیقای لەگەڵدابوو کە فۆکێت لەسەر شەرەفی پاشا ڕاسپاردبوو.

پاش نانی ئێوارە پیاسەیەک بەناو باخەکانی خانووەکەدا کرا. ڕەوی و فاقوورەکانی ڤۆکس لو ڤیکۆمت دەبووبە ئیلهامێک بۆ باخچەی (ڤێرسای)

فۆکێت بەشێوەیەکی شەخسی بەناو ڕیکانە گوڵەکان و دەوەنە ئەندازەییەکاندا هاوەڵی پاشای گەنجی کرد. بە گەیشتن بە کەناڵەکانی باخەکان، ئەوان نمایشێکی پەری ئاگربازیان بینی کە نواندنی شانۆییەکەی مۆلیێری بەدوادا هات. ئاهەنگەکە بەدرێژایی شەو باش بەڕێوەچوو و هەمووان کۆک بوون لەسەر ئەوەی کە بێ وێنەترین کارێکە ئامادەی بووبن.

ڕۆژی دواتر، فۆکێت لەلایەن سەرۆکی پاسەوانانی پاشا، دارتاگنان دەستگیر کرا. سێ مانگ دواتر ئەو دادگایی کرا لەبەرانبەر دزیکردن لە گەنجینەی وڵات. (لەڕاستیدا، زۆربەی ئەو دزییەی کە پێی تۆمەتبار کرابوو، بە لەبری پاشا و بە ئیزنی پاشا کردبووی) فۆکێت تاوانی خرایە مل و نێردرا بۆ گۆشەگیرترین زیندان لە فەرەنسا، لە سەرڕایی چیاکانی پایرینیس کە لەوێ دوایین بیست ساڵی تەمەنی لە بەندیخانەی تاکەکەسیدا بەسەر برد

**لێکدانەوە**

لویسی شازدە، پاشای خۆر، کابرایەکی لوتبەرز و بە دەعیە بوو کە دەیویست لە هەموو کایەکانی سیاسەتدا سەنتەری سەرنج بێت ئەو نەیتوانی ڕێگە بدات بەوەی لە دەسەڵاتی، هیچ کەسێک پێشی بدەنەوە وچ جای وەزیری داراییش. بۆ سەرکەوتن بەسەر فوکێت دا، لویس جان باپتیست کۆلبێرتی هەڵبژارد، پیاوێکی بەناوبانگ بە پیسکەیی و بە ئەنجامدانی کەم خەرجیترین ئاهەنگەکان لە پاریسدا. کۆلبێرت پەیداگیری کرد لەوەی هەر پارەیەک کە لە گەنجینەوە دەربچێت ڕاستەوخۆ بچێتە ناو دەستی لویس. لویس بە پارەکە کۆشکێکی بونیادنا، تەنانەت ناوازەتر لەوەی فوکێت– کۆشکی شکۆمەندەی ڤێرسای. ئەو هەمان ئەندازیار، هەمان ڕازێنەرەوە و هەمان دیزاینەری باخی بەکرێ گرت. لە ڤێرسای، لویس ئاهەنگی تەنانەت دەست بڵاوانەتری لەو ئاهەنگە سازدا کە فوکێت ئازادییەکەی لەسەر دانا.

با پشکنینێک بۆ بارودۆخەکە بکەین. شێوازەی ئاهەنگەکە، لەکاتێکدا فوکێت نمایش بە دوای نمایشی دەستەڕۆیی لویس، هەریەکەشیان کاریگەرتر بوو لە ویتریان، ئەو وای ئەوەی دەکرد کە ئەم کارە پیشاندانی ئەمەک و دڵسۆزییە بۆ پاشا. نەک تەنیا پێی وابوو ئاهەنگەکە دەیگەڕێنێتەوە ناو دڵی پاشا، بەڵکو پێی وابوو نمایشەکە ڕەوقی باشی، پەیوەندییەکانی و جەماوەرەکەی پیشان دەدات و ئەمە وا دەکات کەسێکی پێویست بێت بۆ پاشا و پیشانی دەدات کە سەرۆک وەزیرانێکی نایابی لێ دەردەچێت. کەچی، هەر نمایشێکی نوێ، هەر نرەیەکی ستایش کە لەلایەن میوانەکانەوە پیشانی فوکێت دەدرا، وای دەکرد لویس پێی وابێت هاوڕێکانی و ڕەعیەکانی زیاتر دەکەونە ژێر کاریگەری وەزیری دارایی نەک خودی پاشا و لە ڕاستیدا فوکێت خەریکی خستنە نمایشی سامانی و دەسەڵاتەکەی خۆی بوو. لە بری سوپاسکردنی لویسی شازدە، ئاهەنگە چڕوپڕەکەی فوکێت بە غرووری پێشاند هەڵمەتی نوێنەری ئەمەی بە کەس نەدەگەیاند– بەڵکو، ئەو

پزیشکێکی گومڕای نزیسەوە بۆ ئەوەی خۆی لە پیاوێك قوتار بكات كە من ئەوەی نیاری بێت، پاشای هەستووە دۆخێکی ناڕەحەت و ناثارامەوە

ئەمە، بەشێوەیەك لە شێوەكان، چارەنووسی هەموو ئەو كەسانەیە كە بڕوانەخۆبوونی گەورەكەیان لاواز دەكەن، ترز دەخەنە عزەت نەفسی، یان وابیندەكەن گومان لە ناڵادەستییەکەی بكات

*کاتێك ئێوارە هات، مۆکێت لە تراپکی جیهان بوو، نە هاتنی ئەو کاتەی کە ئێوارە یەکترتا گەیشتبوو، لە خواری خوارەوە بوو.*

ڤۆلتێر، ١٦٩٤–١٧٧٨

## پەیڕەوی لە پاسکە

لە سەرەتای ١٦٠٠ەکاندا، ماتمانیکاس و هەسارەناسی ئیتاڵی گالیلۆ خۆی لە پێگەیەکی هەستیاردا بینییەوە. ئەو پشتی بە بەخشندەیی فەرمانڕەوا گەورەکان بەست بۆ پاڵپشتیکردنی توێژینەوەکەی و بۆیە، وەکو هەموو زانایانی ڕێنیسانس، هەندێ جار دیاریی دەهێنان و توێژینەوەکانی پێشکەشی پشتیوانە داراییە پێشەنگەکانی سەردەمەکە دەکرد. بۆ نموونە، جارێکیان ئەو کۆمپاس (قیبلەنما)یێکی سەربازی کە خۆی داینهێنابوو پێشکەشی دۆکی (گۆنزاگە) کرد. پاشان کتێبێکی پێشکەشی بنەماڵەی مێدیسیس کرد کە تیایدا بەکارهێنانی کۆمپاسەکە ڕوونکرابووەوە. هەردوو فەرمانڕەواکە سوپاسگوزار بوون و بە ڕێگەیانەوە گالیلۆ توانی خوێندکاری زۆرتر پەیدا بکات بۆ دەرس پێ وتنیان. گرنگ نییە دۆزینەوەکە چەند مەزن بوو، پشتیوانە داراییەکانی ئەو زۆربەی جار بەشێوەی دیاری حەڵاتیان دەکرد نەك پارە. ئەمەش هۆکار بوو بۆ نائەمنییەکی بەردەوام بەدرێژایی ژیان و وابەستەیی. ئەو بیری کردەوە و وتی دەبێ ڕێگەیەکی ئاسانتر هەبێت

گالیلۆ لە ساڵی ١٦١١دا ستراتیژییەکی نوێی گەڵاڵە کرد، کاتێک ئەو مانگەکانی هورمزی دۆزییەوە لەبری دەستکردنی دۆزینەوەکە بەسەر پشتیوانە داراییەکانیدا ئەو تەلەسکۆپەی بەکاریدەهێنا بداتە یەکێکیان و کتێبێک پێشکەشی ئەویتریان بکات و بەمشێوەیە – هەروەک لە ڕابردوودا کردبووی، بڕیاریدا تەرکیز بخاتە سەر بنەماڵەی مێدیسیس. ئەو لەبەر باکە هۆکارێک بنەماڵەی مێدیسیس ی هەڵبژارد. بەماوەیەکی کورت پاش ئەوەی کۆسیمۆی یەکەم سیلسیلەی مێدیسی لە ١٥٤٠دا بونیادنابوو، هورمز، بەتواناترینی خوداکانی کردبووە سیمبولی مێدیسی – سیمبولێکی دەسەڵات کە لەسەروو سیاسەت و پارە پەیداکردنەوە بوو، سیمبولێک کە گرێ دەدرایەوە بە ڕۆمی دێرین و خوداوەندەکانی.

گالیلۆ دۆزینەوەی مانگەکانی هورمزی گۆڕی بۆ ڕووداوێکی گەردوونی وەکو ڕێزێک بۆ مەزنایەتی بنەماڵەی مێدیسی. بەماوەیەکی کورت پاش دۆزینەوەکە، ئەو ڕایگەیاند کە "ئەستێرە درەوشاوەکان (مانگەکانی هورمز) لە ئاسمانەکاندا" ڕێک لەو کاتەدا کە کۆسیمۆی دووەم تاجی لەسەرناوە خۆیان پیشانی تەلەسکۆپەکەی داوە، ئەو وتی ژمارەی مانگەکان – چوار – هاوتایە لەگەڵ ژمارەی مێدیسییەکان (کۆسیمۆی دووەم سێ برای هەبوو) و ئەمەی کە مانگەکان بە دەوری هورمزدا دەسوڕێنەوە وەک چۆن ئەم چوار کوڕە بەدەوری کۆسیمۆی یەکەمدا دەسوڕێنەوە، کە دامەزرێنەری سیلسیلەکەیە. زیاتر لەوەی ڕێکەوتێک بێت، ئەمە پیشانیدا کە ئاسمانەکان خۆیان پیشاندەری هەڵنە سەر تەختی بنەماڵەی مێدیسین. پاش ئەوەی دۆزینەوەکەی پێشکەشی مێدیسییەکان کرد، گالیلۆ ڕایسپارد نەزمێک دروست بکرێت کە هورمز بنوێنێت کە لەسەر هەورێک دانیشتووە و چوار ئەستێرە دەوری دابێت و ئەمەی پێشکەشی کۆسیمۆی دووەم کرد وەکو ڕەمزی ڕایەڵبوونەوەکەی بە ئەستێرەکانەوە.

لە ١٦١٠دا کۆسیمۆی دووەم گالیلۆی کرد بە ماتماتیکناس و فەیلەسوفی ڕەسمیی دەربار، بە موچەیەکی تەواوەوە بۆ ژیانەک. ئەمە کودەتایەکی بەمەن بوو بۆ زانای دەرووەکردن بۆ پشتیوانی داراییی بەسەرچووی

### لێکدانەوە

لەچاو مرۆڤەکاندا، گالیلۆ بە ستراتیژەکەی زیاتر لەوەی بەدەستیهێنا کە ساڵانێک بە دەریوزەکردن بیهێنایە. جەریک بوو. هۆکارەکە سادەیە: هەموو گەورەکان دەیانەوێ درەوشاوەتر لەوانیتر دەربکەون.

ئەوان گوێ نادەن بە زانست یان حەقیقەتی ئەزموونی یان دوایین داهێنان. ئەوان ئامەژ بە ناویان و شکۆیان دەدەن. گالیلۆ بە بەستنەوەی ناوی بنەماڵەکە بە هێزە گەردوونییەکان شتێ بە کردنی ئەوان بە پشتیوانی دارایی دۆزینەوەیەک یان ئامێرێکی زانستی نوێ، بێ ڕادە شکۆی بەخشییە مێدیسییەکان.

ژیناکانیش لە گۆڕانکارییە چاوەڕواننەکراوەکانی پشتیوانی و ژیانی دەربار ناموێبوردن. ئەوان زۆر حورمەتی ئەو گەورانە دەکەن کە قاسەکەیان لەبەردەستدایە و دەشێ هێزە فیکرییە گەورەکانیان هەستی ناڕازیی و ناڕەحەتی لای گەورەکە دروست بکات، وەک بڵێی تەنیا بۆ ئەوە لەوێیە پارە بدات– کارێکی دزێوی ناشەرمەنەدانە. بەرهەمهێنەری کارێکی گەورە دەیەوێ هەست بکات تەنیا دابینکەرێکی دارایی نییە. ئەو دەیەوێ ئەفرێنەر و بەهێز دەربکەوێ و بەهەمان شێوە گرینگتر بێت لەو کارەی بەناوی ئەوەوە بەرهەمهێنراوە. لەبری پەیدای نائەمنی، پێویستە شکۆی بدەیتێ. گالیلۆ بە دۆزینەوەکەی ئەحەدەی دەسەڵاتی فیکریی مێدیسییەکانی نەکرد بە واشیلیکردن بەشێوەیەک لە شێوەکان هەست بە نائەمنی بکەن. تەنیا بەوەی کە بە ناوی وشە ئەوانی دایەپاڵ ئەستێرەکان، ویلیکردن لەنێو دەربەرەکانی ئیتالیادا پرووناک ندرەوشێنەوە. ئەو خوی درەوشاوەتر لە گەورەکەی پیشان نەداء وایکرد گەورەکەی لەهەموو ئەوانیتر درەوشاوەتر دەرکەوێ.

### کلیلی دەسەڵات

هەموو ڕەهەندێکی نائەمنی و ناڕازییان هەیە. کاتێک تۆ لە جیهاندا خۆت پیشان دەدەیت و بەهرەکانت دەخەیتەڕوو ئەوا بەشێوەیەکی سروشتی هەموو جۆرەکانی کینە،

ئیرەیی و تایبەتمەندیی تری نائەمنی دەوروژێنێت. ئەمە چاوەڕێکراوە. تۆ ناتوانیت ژیان بە ئیگەراسوون لەبارەی هەستە پوچەکانی ئەوانیتر بەسەر ببەیت. لەگەڵ ئەوەشدا، لەگەڵ ئەوانەی سەرەوەی تۆدا دەبێ ڕوانگەیەکی جیاوازت هەبێت. کاتێک مەسەلەکە پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە هەیە، لەوانەیە لێهاتووتر دەرکەوتن لە گەورەکەت خەرجیی هەڵە بێت.

خۆت گەمژە مەکە پێت وابێت لە سەروەختی لویسی شازدە و مێدیچییەکانەوە پێزگار گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەوانەی پێگەی بەرز لە ژیاندا بەدەست دێنن وەکو پاشا و شاژن وەهان. ئەوان دەیانەوێ هەست بکەن لە پێگەکانیان زامنە و لە هۆشمەندی، زیرەکی و لێهاتووییدا لەوانەی دەوروبەریان باڵاترن. ئەوە مەحاڵ تێگەیشتنێکی کوشندە بەڵام باوە کە بەپیشاندان و شانازیکردن بە بەهرە و تواناکانت سۆزی گەورەکەت بەدەست دێنیت. لەوانەیە ئەو وابیشان بدات کە توانا و بەهرەکانت دەنرخێنێت، بەڵام هەر کە دەرفەتی بۆ هەڵکەوت ئەوا کەسێکی ناهۆشمەندتر، کەمتر سەرنجڕاکێش و کەمتر هەڕەشەئامێز لە شوێنت دادەنێت، وەک چۆن لویسی شازدە فۆکێتی درەوشاوەی بە کۆلبێرتی دەست و پێ سپی شوێنگرکێ پێکرد. هەروەکو لە حاڵەتی لویسیشدا، ئەو ڕاستییەکە نالێت، بەڵکو بیانوویەک دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی خۆی لە بوونی تۆ قوتار بکات.

ئەم یاسایە دوو ڕێسا دەگرێتە خۆ کە دەبێ درکیان پێ بکەیت. یەکەم، تۆ دەتوانیت بەبێ ئەوەی مەبەستت بێت لە گەورەکەت لێهاتووتر دەربکەویت، بەوەی کە خۆت بیت. گەورە هەن کە نائەمنن بەوانیتر، بەشێوەیەکی دڵتەزمەتاسا نائارامن. تۆ دەتوانیت بە شێوەیەکی سروشتی بە جاموور و بەهرەکەت لەوان لێهاتووتر دەربکەویت. ئەگەر تۆ نەتوانیت جادووەکەت بشاریتەوە ئەوا دەبێ فێر بیت خۆت لەو دێوە خۆ بەزلزانانە لادەیت، یان ڕێگەیەک بدۆزیتەوە تا نامسەقەمدنە ناشەکانت کپ بکەیت کاتێک لێیانەوە نزیکیت.

کەس ئەوەندەی ئاستۆر مانفریدی، میری فاییزا بەهرەی سروشتی نەبوو، ئەو کە فۆرتریمی میرە گەنجەکانی ئیتالیا بوو، بە بەخشندەیی و ڕۆحییەتە والاکەی، سیحری لە ڕەعیەتەکانی کردبوو.

لە سەرەتای ١٥٠٠ەکان، قەیسەر بۆرگیا گەماری فاییزای دا. کاتێک شارەکە ملیدا، هاوڵاتیان چاوەڕوانی خراپترین شتیان لە بۆرگیای دڵڕەق دەکرد کە هەرچۆنێک بێت بڕیاریدا بە شارۆچکەکە خۆش بێت: ئەو تەنیا قەڵاکەی داگیر کرد، هیچ کام لە هاوڵاتییەکانی لەسێدارە نەدا و ڕێگەیدا میر مانفریدی کە ئەو کاتە هەژدە ساڵان بوو، بە ئازادییەکی تەواوەوە لە دەربارەکەیدا بمێنێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، چەند هەفتەیەک دواتر سەربازەکان (ئاستۆر مانفریدی)یان بەرەو زیندانی ڕۆما برد. ساڵێک دواتر، لاشەکەی لە ڕووباری تیبەر هێنرایە دەرەوە کە بەردێک لە ملی ئاڵێنرابوو. بۆرگیا کردارە قێزەوەنەکەی بە جۆرە تۆمەتێکی فەوزاوی سێکسی و گەلەکۆمەکێ پاساودا، بەڵام کێشە واقیعییەکە ئەوە بوو ئەو بەرە بەوە ڕۆشتبوو کە کەسێکی ڕۆح گەورە و هەستیارە. کابرای گەنج تەنانەت بەبێ ئەوەی هەوڵیش بدات لەو بەرچاوتر بوو. بە لەبەرچاوگرتنی بەهرە سروشتییەکانی مانفریدی، تەنیا ئامادەبوونی میر وەهای لە بۆرگیا دەکرد کە کەمتر سەرنجڕاکێش و کاریزماتیک دەرکەوێت. وانەکە سادەیە. ئەگەر تۆ ناتوانیت سەرنجڕاکێشی و بالایی بەدەست خۆت نییە، دەبێ فێر بیت خۆت لە دیوەزمەکانی لوتبەرزی لادەیت. یان ئەمە بکە، یان ڕێگەیەک بدۆزەرەوە بۆ کپکردنی تایبەتمەندییە باشەکانت کاتێک لای قەیسەر بۆرگیایت

دووەم، قەت وێنای ئەوە مەکە کە لەبەرئەوەی گەورەکەت خۆشی دەوێیت ئەوا دەتوانیت هەرچییەک بکەیت کە دەتەوێ. دەکری چەندەها کتێب لەبارەی ئەوەوە بخوێنیتەوە کە کەسە دڵخوازەکان ڕەعەتیان لەسەر نامێنێت. کاتێک پێگە و مەکانەتیان بە حاشاهەڵنەگر دەبینن، کاتێک جورئەت دەکەن لە گەورەکانیان بێهەوونتر دەربکەون. لە دەرەکانی سەدەی شازدەی ژاپۆندا، پیاوێک بەناوی (سێن نو ڕیکیو) کەسێکی دڵخوازی ئیمپراتۆر هیدیۆشی بوو. ئەو هونەرمەندی سەرەکی ئاهەنگی چایی بوو، ئاهەنگێک کە

خانەدانەکان فرچکیان پێوە گرتبوو ئەو یەکێک بوو لە ڕاوێژکارە هەرە متمانەپێکراوەکانی هیدیۆشی، شوێنێکی تایبەت بەخۆی لە کۆشکدا هەبوو و لەسەراسەری ژاپۆن ڕێزیان لێدەنا. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ساڵی ١٥٩١دا، هیدیۆشی ئەوی بەگرتدا و حوکمی مەرگی بەسەردا دا. لەبەرامبەردا ریکیو خۆی کوشت. هۆکاری گۆڕانەوەی مزمی بەحتی دواتر دەرکەوت. پێدەچێت ریکیو، خوێنیاری پێشوو و ئێستای دواتری دەربار، پەیکەرێکی لەئەحتە بۆ خۆی دروستکردبێت کە شەحانەی لە پێ دەوو (نیشانەیەکی خانەدانی) و سەنگی خۆی دەرخستووە. ئەو ئەم پەیکەرەی لە گرنگترین پەرستگەدا بەناو دەروازەکانی کۆشکدا دانابوو، لەبەر دیدەی دیاری ئەندامانی بنەماڵەی شەهنە کە ڕۆژجار بەوێدا ڕەت دەبن. هیدیۆشی وای بۆ چووە کە ریکیو سنوورەکانی خۆی نازانێت. ئەو ئەوەی کە وایدانابوو هەمان مافی بەرزترین خانەدانەکانی هەیە، بۆیە چۆتەوە پێگەکەی ئەدە بە ئیمپراتۆرەوە و گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە خۆی پێگەکەی بەدەستهێناوە. ئەمە خراپ حەملاندنێکی لێبەووردراوی گرنگیی خوی بوو و ژیانی لەسەر دانا. ئەمەت بیر بێت: قەت پێگەی خۆت بێ چەندوچوون وەنا مەکە و هەر چاکەیەک کە لەگەڵت دەکرێت با قەت لە مێشکتدا نەچەسپێت.

بە ڕاستیی مەترسییەکانی دەرکەوتنی لێهاتووتر لە گەورەکەت، ئەوا دەتوانیت ئەم یاسایە بۆ بەرژەوەندی خۆت بگۆڕیت. لەپێشدا دەبێ زمان لووسی بۆ گەورەکەت بکەیت و پیاهەڵبڵێیت. زمان لووسی بەئاشکرا دەشێ کاریگەر بێت بەڵام سنووری خۆی هەیە، زۆر بەرز و ڕوونە و ئەلای دەربارییەکانی ترەوە خراپ دێنە بەرچاو. زمان لووسی شاراوە بەهێزترە. بۆ نموونە، ئەگەر تۆ لە گەورەکەت هۆشمەندتر بیت، بە پێچەوانەوە دیار بە وای لێبکە هۆشمەندتر لە تۆ دەربکەوێت. ساویلکانە ڕەفتار بکە. وا وەها دیار بێت کە تۆ پێویستت بە شارەزایی ئەو هەیە. هەڵەی بێ زیان ئەنجام بدە کە لە دوورمەودادا زیانبەخش نابن بەڵکو شانسی ئەوەت دەدەنێ داوای یارمەتی لێ بکەیت. گەورەکان زۆر حەزیان لەو داوایانەیە. گەورەیەک کە ناتوانێ بیمەکانی ئەزموونی خۆی بە تۆ ببەخشێت ئەو بەرانبەر لەبری ئەمە کینە و ئیرادەی خراپ ئاراستەی تۆ دەکات.

ئەگەر ئایدیاکانی تۆ نەفرەتەوێن لە هی گەورەکەت، ئەوا بیگەڕێنەوە بۆ ئەو، ئەمەش ئەوەندەی دەکری با ئاشکرا و لەبەرچاوی خەڵک بێت. یەکلایی بکەرەوە کە ئامۆژگاریی تۆ تەنیا لە ئامۆژگاریی ئەوەوە سەرچاوەی گرتووە

ئەگەر تۆ لە زیرەکیدا لەو زەقت دەدەیت، ئاسایە ڕۆڵی قۆشمەچییەک ببینیت، بەڵام وا لەو مەکە لەبەرانبەردا سارد و بەدمیزاج دەرکەوێت. ئەگەر پێویست دەکات گاڵتە و گەپەکەت سوک مەکە و ڕێگەکەلێک بدۆزەرەوە بۆئەوەی وابلێنکەیت وەکو سەرچاوەی سەرکەوتن و شادی دەربکەوێت. ئەگەر تۆ بەشێوەیەکی سروشتی لە گەورەکەت کۆمەڵایەتیتر و بەخشندەتریت، وریابە لەوەی ئەو هەورە نەبیت کە بەر بە تیشکدانەوەی ئەو دەگرێت بەوسیتر. دەبێ ئەو وەکو ئەو خۆرە دەرکەوێت کە هەمووان بە دەوریدا دەسوڕێنەوە، تیشکی دەسەڵات و لێهاتوویی دەدات، سەنتەری سەرنجی هەمووان بێت ئەگەر تۆ خۆت بخەیتە ناو پێگەی سەر گەرمکردنی، ئەو لەوانەیە پێشانداینکی ئامرازە سنووردارەکانت ببینە هۆی برینەوەی هەست و سۆزی. هەر هەوڵێک بۆ کارتێکردنی بە ڕەحمەت و بەخشندەییەکەت دەشی ئاکامی کارەساتی هەبێت. لە فۆکیتەوە فێر بە یان باجەکەی بدە.

بە هەموو ئەم حاڵەتانەدا ئەوە حاڵێکی لاوازی ببیە حاڵەکانی میری خوت پەردەپۆش بکەیت ئەگەر لەکۆتاییدا بەرەو دەسەڵات بچن. ئەگەر لیگەڕێیت ئەوسەر لێهاتووتر دەربکەوێن، ئەوا تۆ باڵادەست دەمێنیتەوە، لەبری ئەوەی کە قوربانی نائەمنی و ناتارامی ئەوانیتر بیت. ئەمە هەمووی لەو ڕۆژەدا ئاسان دەبێت کە تۆ بڕیار دەدەیت پێگەی بەرمی خۆت هی بهێڵیت و بچیتە پێگەیەکی بەرزتر. ئەگەر تۆ بتوانیت وا بکەیت گەورەکەت بدرەوشێتەوە لە چاوانی ئەوانیتردا تەنانەت بەشێوەیەکی زەقتریش، ئەو ئەو کاتە تۆ پەیامبەرناسیت و دەستنەخێ پلەکەت بەرز دەکرێنەوە

وێنە ئەستێرەکانی ئاسمان دەشێ تەنیا یەک جۆر لە یەک کاتدا هەبێت. قەت بەرە ڕووناکایی خۆر مەگرە یان ڕکابەرێتی لێهاتوویی خۆر مەکە، بەڵکو لەناو ئاسماندا مرز بە و ڕێگەیەک بدۆزەرەوە بۆ چڕکردنەوەی درەوشانەوەی ئەستێرەی گەورەکەت

دەسەڵات حەزت لە زیاتر درەوشانەوە لە گەورەکەت لادە. سەرەڕا باڵا بووی کپبە بروێنە، بەڵام ماڵیی ڕەعیەتێک بەسەر میرەکەیدا نەک تەنیا گەمژانەیە بەڵکو کوشندەیە ئەمە وانەیەکە کە ئەستێرەکان لە ئاسماندا فێری ئێمەی دەکەن– لەوانەیە ئەوان پەیوەندییان بە خۆرەوە هەبێت و ئەوەندەی خۆر درەوشاوە بن، بەڵام قەت لە هاوەڵێتی ئەودا دەرناکەون

(بەلتەزار گراسیان، ١٦٠١–١٦٥٨)

**پێچەوانەبوونەوە**

تۆ ناتوانیت لەمەڕ تووڕەکردنی هەر کەسێک کە ڕێکەوتی دەکەیت بێگەرد بیت، بەڵام حاڵەت هەیە تیایدا دەبێ دڵڕەق بیت. ئەگەر گەورەکەت ئەستێرەیەکی ڕوو لە ئاوابوونە، هیچ مەترسێ لەوەی کە لێهاتووتر لەو دەرکەویت. بەزەییت نەبێت– گەورەکەت هیچ ڕاڕاییەکی نەبوو لە سەرکەوتنی خۆی ساردانەیدا بەرەو لووتکە. بەهێزییەکەی پێوانە بکە. ئەگەر ئەو لاوازە، بە نهێنی کەوتنەکەی خێرا بکە. لە ساتەوەختە گرنگەکاندا پێشی بەرەوە، سەرنجڕاکێشتر بە، زیرەکتر بە. ئەگەر ئەو زۆر لاوازە و خەریکە دەکەوێت، لێگەڕێ با سروشت کاری خۆی بکات. سەرکێشی مەکە بە دەرکەوتنی درەوشاوەتر لە گەورەیەکی لاواز– لەوانەیە دڵڕەقانە یان ڕیانبەخش دیار بێت. بەڵام ئەگەر گەورەکەت هێشتا لە پێگەی خۆیدا قایمە، لەگەڵ ئەوەشدا حەزت دەناسیت کە بەتواناتری، چارەنووسی کاتەکەت بە و ئۆقرە بگرە. ئەوە ڕەوگەی سروشتی شتەکانە کە دەسەڵاتیش دواجار کز و لاواز دەبێت. گەورەکەت ڕۆژێک لە ڕۆژانە دەکەوێت و ئەگەر تۆ بە دروستی یاری بکەیت، ئەو بەو زیاتر دەژیت و ڕۆژێک دێت کە زیاتر دەدرەوشێیتەوە

یاسای ژمارە ٢

## قەت ئەوەندە زۆر متمانە بە هاوڕێکانت مەکە، فێربە چۆن دوژمنەکانت بەکار بێنیت

### حوکم

*ئاگادار بە لە هاوڕێکانت- ئەوان خێراتر ناپاکیت بەرامبەر دەکەن، چونکە ئەوان بە ئاسانی ئیرەییان دەجوڵێت. ئەوان بەهەمان شێوە دەبنە کەسانی نازدار و زۆردار. بەڵام کار بدەرە دوژمنێکی پێشووت ئەوا لە هاوڕێیەکت بەئەمەکتر دەبێت، چونکە ئەو زیاتری لەبارەدایە بۆتی بسەلمێنێت. لە ڕاستیدا دەبێ تۆ زیاتر لە هاوڕێکانت بترسیت نەک دوژمنەکانت. ئەگەر دوژمنت نیە، ڕێگەیەک بدۆزەرەوە بۆ دروستکردنیان.*

### سەرپێچی لە یاساکە

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆیەمی زاییندا، پیاوێکی گەنج بەناوی مایکڵی سێیەم دەچێ ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی لەسەرما. دایکی، ئیمپراتۆرە تیۆدۆر، دوورخرایەوە بۆ خانەی ڕاهیبەکان و خۆشەویستەکەی، تیۆکتیستۆس، کوژرابوو. ئەو کەسەی کە لە پشت گەلەکۆمەکێ بوو بۆ لەسەر تەخت لابردنی تیۆدۆرا و تاج لەسەرنانی مایکڵ، مامی مایکڵ بوو بەناوی بارداس، پیاوێکی هۆشمەند و خاوەن ئامانج. مایکڵ ئێستا ئیتر فەرمانڕەوایەکی گەنجی بێ ئەزموون بوو کە بە فریودەر، بکوژ و دەستبڵاو دەورە

درابوو. لەم کاتەی مەترسیدا، ئەو پێویستی بە کەسێك بوو کە بیتوانیایە وەکو ڕاوێژکار متمانەی پێ بکات و لێرەوە هەمووی بیری چووە سەر (باسیلیەس)، کە باشترین هاوڕێی بوو. باسیلیەس هیچ ئەزموونێکی نە لە حکومەت و نە لە سیاسەتدا نەبوو– لە ڕاستیدا، ئەو سەرۆکی گادینەکانی شاهانە بوو– بەڵام ئەو خۆشەویستی و ئەمەکی خۆی چەند جارێك سەلماندبوو.

ئەوان پێش چەند ساڵێك یەکتریان ناسیبوو، کاتێك مایکڵ سەردانی گادینەکانی دەکرد و ڕێك لەو کاتەدا ئەسپێك جڵەوەکەی شل بووەوە. باسیلیەس کە مەیتەرێکی گەنجی مەکدۆنیی گشتوکاڵی بوو ژیانی مایکڵی ڕزگار کردبوو. توانای مەیتەرەکە و بوێرییەکەی کاریگەری خستبووە سەر مایکڵ کە لەلایەن خۆیەوە دەستبەجێ باسیلیەسی لە تاریکایی کانینەکانی ڕاهێنانی ئەسپ دەرهێنابوو و لە پێگەی سەرۆکی گادینەکانی شاهانە دایناببوو. ئەو هاوڕێکەی دایە بەر لێزمەی دیاری و چاکە و ئەوان بوونە هاوڕێی دانەبڕاو. باسیلیەس نێردرایە باشترین قوتابخانە لە بیزەنتیێ و جوتیارە پێنەگەیشتووەکە بووە دەربارێکی خوێندەوار و وریا.

ئێستا مایکڵ ئیمپراتۆرێك بوو و پێویستی بە کەسێکی شاهانە بوو. دەیتوانی لە باشتر، کەسێك کە قەرزاری هەموو شتێکی بوو، متمانە بە کێ بکات بۆ پۆستی دیوانی شاهانە و ڕاوێژکاری سەرەکی؟

دەشێ باسیلیەس بۆ کارەکە ڕاهێنانی پێ بکرێت و مایکڵ وەکو درەنگ هۆشی دەویست. بە فەرامۆشکردنی ئامۆژگاریی ئەو کەسانەی کە پێشنیاری (بەردس)ی شایستەترینیان دەکرد، مایکڵ هاوڕێکەی هەڵبژارد.

باسیلیەس بەباشی فێر بوو و بەزوویی کەوتە ئامۆژگاریی ئیمپراتۆر لەهەموو بابەتەکانی دەوڵەتدا. پێدەچوو تاکە کێشە پارە بێت– باسیلیەس قەت بەشی پێویستی نەبوو. بە کەوتنە بەر شەوقی ژیانی دەرباری بیزەنتیێ ئەوی کردە کەسێکی چڵێس بۆ دەسەڵات. مایکڵ موچەکەی کردە دووقات، سەنگ و ئیمتیازی بۆ دانا و مەعشوقەکەی خۆی، ئیودێریا ئینگێرینای لێ مارە کرد. قەیل هێشتنەوەی ڕاوێژکار و

هاوڕێیەکی وەها جێی متمانە، شایەنی هەموو نرخێک بوو. بەڵام گیروگرفتی زۆرتر بە ڕێگەوە بوون. بارداس ئێستا سەرۆکی سوپا بوو و باسیلیەس مایکڵی قەناعەت پێهێنا کە ئەو کابرایە تا ملی چاوچنۆکە. بەو هیوایەی کە دەتوانێ براکەی کۆنترۆڵ بکات، بارداس گەلەکۆمەکێی کردبوو تا لەسەر تەختی شاهانە دایبنێت و دەیتوانی جارێکی تر گەلەکۆمەکێ بکات ئەمجارە بۆ ئەوەی لە مایکڵ قوتار بێت و خۆی تاجەکە لەسەر بنێت. باسیلیەس ژەهری ڕژاندە گوێچکەی باسیلیەس تاوەکو ئیمپراتۆر ڕازی بوو تا ڕاسپێرێت مامی بکوژن. لە ماوەی پێشبڕکێیەکی گەورەی ئەسپسواریدا، باسیلیەس لەناو هەشامەتدا لە بارداس نزیک بووەوە و کوشتی. زۆری پێنەچوو، باسیلیەس داوای کرد وەکو سەرۆکی سوپا بیهێنێتە شوێنی بارداس، کە لەم پۆستەدا دەیتوانی کۆنترۆڵی قەڵەمڕەوەکە بکات و یاخیگەری دامرکێنێتەوە. ئەمە بێ چەندوچوون بوو.

ئێستا دەسەڵات و سامانی باسیلیەس گەشەی کرد و چەند ساڵێک دواتر مایکڵ، لە تەنگژەی دارایی دەستبڵاویی ئەودا بوو، داوای لێکرد هەندێ لەو پارەیە بگەڕێنێتەوە کە بەدرێژایی ساڵانێک بە قەرز وەریگرتبوو. باسیلیەس ڕەتی کردەوە و مایکڵ تووشی شۆک و سەرسوڕمان بوو. سەرنجەکانی ئەوەندە چەقاوەسووانە بوون کە ئیمپراتۆر دەستبەجێ درکی بەو قوڕاوە خەستە کرد کە تێیکەوتبووە. کابرای پێشووی گالیسکە پارەیەکی زۆرتر، هاوپەیمانی زۆرتر لە سوپا و ئەنجومەنی پیراندا هەبوو و لە کۆتاییدا دەسەڵاتێکی زۆرتری لە خودی پاشا هەبوو. چەند هەفتەیەک دواتر، پاش شەوێکی خواردنەوەی زۆر، مایکڵ لە خەو بیدار بوو و سەیریکرد دەوروبەری بە سەربازان گیراوە. باسیلیەس تەماشای دەکرد لەکاتێکدا ئەوان پاشایان دایە بەر چەقۆ و کوشتیان. دواتر، پاش ئەوەی خۆی وەکو ئیمپراتۆر ڕاگەیاند، ئەسپەکەی بەدرێژایی شەقامەکانی بیزەنتیۆم هاژۆت و سەری پارەدەر و باشترین هاوڕێی پێشووی بەسەری ڕمەکەیەوە ڕاوەشاند.

**لێکدانەوە**

مایکڵی سێیەم نابندەی خۆی لەسەر ئەو سوپاسگوزارییە دانا کە پێی وابوو دەبێ باسیلیەس بەرامبەر ئەو هەستی پێبکات لەدڵنیاییەوە باسیلیەس بەباشترین شێوە حورمەتی ئەوی دەکرد، ئەو بەو سامانەی هەیبوو، بە پەروەردەکەی و پێگەکەی قەرزی ئیمپراتۆر بوو. پاشان، هەر کە دەسەڵاتی گرتە دەست، هەر شتێك پێویستی بوو وا باشتر بوو بیدات بەو، کە پەیوەندیی نێوان دوو پیاوەکەی بەهێز دەکرد. تەنیا لەو ڕۆژە چارەنووسسازەدا بوو کاتێك ئیمپراتۆر زەردەخەنە ساردەکەی لەسەر ڕوخساری باسیلیەس بینی کە درکی بە هەڵە کوشندەکەی کرد.

ئەو دێوێکی دروستکردبوو. ئەو ڕێگەی بە پیاوێك دابوو لە نزیکەوە تێبینی دەسەڵات بکات– پیاوێك کە پاشان زۆرتری ویست، کە داوای هەر شتێکی دەکرد و بەدەستی دەهێنا، کە هەستیکرد بەو کۆمەك و سەدەقەیە دەوروەی دراوە کە وەریگرتبوو و تەنیا ئەو شتەی کرد کە زۆرێك لە خەڵکی لە باروودۆخێکی وەهادا دەیانکرد، ئەوان ئەو چاکەیەی لەگەڵیاندا کراوە بیریان دەچێتەوە و وێنای ئەوە دەکەن کە بە شایستەیی خۆیان سەرکەوتوو بوون.

بە ساتەوەختی درکپێکردنی مایکڵدا، ئەو هێشتا دەیتوانی ژیانی خۆی ڕزگار بکات، بەڵام هەوڕێیەتی و خۆشەویستی هەموو پیاوێك لەمەراسەر مەرژەوەندییەکانیدا کوێر دەکات. کەس پێی بڕوا بەوە ناکات کە هەوڕێنەك بتوانێ ناپاکی بکات. مایکڵیش بەردەوام بوو لە بڕوانەکردن تا ئەو ڕۆژەی کە سەری بە سەری ڕمێکەوە هەڵواسرا

خودایە لە هاوڕێکانم بمپارێزە، خۆم ئاگام لە دوژمنەکانم دەبێت

ڤۆلتێر ١٦٩٤، ١٧٧٨

## پەیڕەوی لە یاساکە

بۆ ماوەی چەند سەدەیەک پاش کەوتنی سیلسیلەی (هان) (٢٢٢ی زایینی)، مێژووی چین هەمان ڕەوگەی کردەتا نوێبوونەوە و حوکمدارییەکانی، یەک لەدوای یەک، گرتەبەر ئەندامانی سوپا پیلانیان دادەڕشت بۆ کوشتنی یان لاوازکردنی ئیمپراتۆر، پاشان بە ژەنەراڵێکی بەهێز شوێنگۆڕکێیان پێ دەکرد. ژەنەراڵەکە سیلسیلەیەکی نوێی دەدەستە گەڕ و تاجی ئیمپراتۆری لەسەر سەری خۆی دادەنا و بۆ ڕاسکردنی مانەوەی خوی، ژەنەراڵە هاوەڵەکانی خۆی دەکوشت. لەگەڵ ئەوەشدا، چەند ساڵێک دواتر ڕەوگەکە دەستپێکردەوە. ژەنەراڵە نوێکان سەرپابەهەڵدەدا و بە نۆرەی خۆیان خۆی یان کرەکانیان تیرۆر دەکرد. ئەگەر ئیمپراتۆری چین بوویتایە ئەوا ئەبیا دەبوویت، بە پۆێنێک لە دوژمن دەورەت دەدرا— ئەم پێگەیە کەمترین تێ و هێزی هەبوو و نائەمنترین پۆست بوو لە قەڵەمڕەوەکەدا.

لە ٩٥٩ی زایینیدا، ژەنەراڵ (چاو کوانگیەن) بووە ئیمپراتۆری سونگ. ئەو مەترسییەکانی، ئەگەری ئەوەی کە لەماوەی ساڵێک یان دوواندا دەشێ دوور بخرێت دەزانی. ئەو چۆن دەیتوانی ئەو ڕەوگەیە بشکێنێت؟ بەماوەیەکی زور پاش بوون بە ئیمپراتۆر، سونگ فەرمانیدا بە خولێک بۆ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی دەستپێکردنی سیلسیلەیەکی نوێ و بانگهێشتی بەهێزترین فەرماندەکانی سوپای کرد. پاش ئەوەی ئەوان شەرابێکی زۆریان خواردبوو، هەموو پاسەوانەکان و هەموو کەسێکی تری نێردا جگە لە ژەنەراڵەکان، کە ئێستا ترسی ئەوەیان لێ نیشتبوو لەیەک کاتدا هەموویان بکوژێت. کەچی، ئەو قسەی لەگەڵدا کردن: "هەموو ڕۆژەکە بە ترس بەڕێی دەکرێت و من دڵتەنگم هەم لەسەر مێزەکەم و هەم لەناو جێگەکەدا. چونکە کێ لە ئێوە خەونی بە دانیشتنە سەر تەختی نابینێت؟ گومانم لە وەفاداریتان نییە، بەڵام ئەگەر بە ڕێکەوتێک دەست و پەیوەندەکانتان، لەپێناو سوراخکردنی سامان و پێگە، لە بەرانبەردا ڕۆبی زەردی

ئیمپراتۆری ئەمسەرتاندا سەپاندایە، چۆن دەتانتوانی ڕەتی بکەنەوە؟" ژەنەراڵەکان کە سەرخۆش بوون و ترسیان لەژیانیان هەبوو، جورئەت و وەفاداریی خۆیان ڕاگەیاند. بەڵام سونگ بیرۆکەی تری لە مێشکدا بوو: " باشترین ڕێگە بۆ بەڕێکردنی ڕۆژگار، لە ئارامی و خۆشی سامان و شەرەفدایە. ئەگەر ئێوە ئارەزوومەندن دەستبەرداری فەرماندەیی خۆتان بن، من ئامادەم مولکی باش و شوێنی جوانتان بۆ دابین بکەم کە لەوانەیە لەوێ لەگەڵ گۆرانیبێژان و کچان وەکو هاوەڵی خۆتان، چێژ ببینن"

ژەنەراڵە سەرسوڕماوەکان درکیان بەوە کرد کە لەبری ژیانێکی پڕ هەڵەزان و ململانێ، سونگ سامان و ئاسایشیان دەخاتە بەردەم. ڕۆژی دواتر، هەموو ژەنەراڵەکان نامەی وازهێنانی خۆیان پێشکەش کرد و وەکو خانەدانانی ئەو مولکە خانەنشین بوون کە سونگ پێی بەخشیبوون.

بە یەك لێدان، سونگ پۆلێك گورگی "دۆست"ی کە لەوانە بوو ناپاکی بەرانبەر بکەن، گۆڕی بۆ گروپێك بەرخی ماڵی، دوور لە دەسەڵات.

بەدرێژیی چەند ساڵێکی دواتر سونگ درێژەی بە کەمپەینەکەیدا بۆ ڕاسکردنی فەرمانڕەوایییەکەی. لە ٩٧١ی زایینیدا، پاشا لیۆی (هانی باشوور) پاش ساڵانێك لە یاخیگەری، بۆ دوجار ملی بۆ ئەودا. سونگ لیۆی تووشی سەرسوڕمان کرد کە پلەیەکی لە دەرباری ئیمپریالی پێبەخشی و بانگهێشتی کرد بۆ کۆشك تا دۆستایەتی تازەیان بە خواردنەوەی شەراب واژۆ بکەن. کاتێك پاشا لیو ئەو پەرداخەی هەڵگرت کە سونگ دەستبوویە بەردەمی، دوودڵ بوو، نەکا ژەهری تێکرابێت. هاواری لێ هەڵسا "بەدڵنیاییەوە تاوانەکانی ڕەعیەکەت شایەنی مەرگە، بەڵام لێت دەپاڕێمەوە خاوەن شکۆ بە ژیانی ڕەعیەکەت مەبوورێت. لە ڕاستیدا جورئەتی خواردنەوەی ئەم شەرابە ناکەم" ئیمپراتۆر سونگ پێکەنی، پەرداخەکەی لە لیۆ وەرگرت و خۆی خواردییەوە. ژەهری تێدا نەبوو. لەو ساتەوەختە بەدواوە، لیۆ بووە جێ متمانەترین و بەئەمەکترین هاوڕێی.

بەو سەروەختەدا، ژین دەبەش بوو بۆ چەندەها مەملەکەی بچووکتر. کاتێك (چیەن شو)، پاشای یەکێك لەو مەمەلەکەتانە شکستی پێهێنرا، وەزیرانی سونگ ئامۆژگاریی

ئیمپراتۆریان کرد تا ئەم باسییە ڕیمدانی بکات. ئەوان چەند دۆکیومێنتێکیان دەستکەوت کە دەیسەلماند ئەو هێشتا هەریکی پیلانگێڕییە بۆ کوشتنی سونگ. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێک چیەن شو هات بۆ سەردانی ئیمپراتۆر، لەبری ڕیسوابکردنی، سونگ ڕێزی لێنا. ئەو بەهەمان شێوە پاکێتێکی پێ بەخشی و بە پاشای پێشووی وت لە ڕێگەی ڕێگە نەرەو ماڵەوە، پاکێتەکە هەڵیچڕێت. چیەن شو لە گەشتی گەڕانەوەیدا پاکێتەکەی کردەوە و هەموو ئەو کاغەز و دۆکیومێنتانەی بینی کە بەڵگە بوون بۆ پیلانەکانی. ئەو درکی بەوە کرد کە سونگ ئاگاداری پلانەکانی کوشتنیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەی پێداوە بۆی دەربچێت. ئەم بەخشندەییە بووە هۆی بەدەستهێنانی دڵی چیەن شو و ئەمیش بوو بە یەکێک لە وابەستە هەرە وەفادارەکانی سونگ.

**لێکدانەوە**

بەندبکی چیمی هاوڕێ بە شەویلکە و ددانەکانی ئاژەڵێکی ترسناک دەشوبهێنێت ئەگەر وریا نەبیت، ئەوا دەتجوێ. ئیمپراتۆر سونگ ئەو شەویلکانەی دەناسی کە بیابانا ڕەت دەبوو کاتێک لەسەر تەخت دانیشت. "هاوڕێ"کانی لە سوپا وەکو گۆشت دەیانجو و ئەگەر ئەو بەشێوەیەک لە شێوەکان زیندوو بمایە، "هاوڕێ"کانی لە حکومەت بۆ نانی ئێوارە دەیانخوارد.

ئیمپراتۆر سونگ هیچ پەیوەندی بە "هاوڕێ"کانیەوە نەبوو- ئەو بە موڵکی دیاب بەرتیلی دایە ژەنەراڵە هاوەڵەکانی و دووری هێشتنیەوە. ئەمە باشترین ڕێگە بوو بۆ لاوازکردنیان نەک کوشتنیان، کە تەنیا ڕێگەی بۆ ژەنەراڵەکانی تر خۆش دەکرد تۆڵە بکەنەوە. سونگیش هیچ پەیوەندی بە وەزیرە "دۆست"ەکانەوە نەبوو. ئەوان زۆر زۆر نزیکی خواردنەوەی کوپە شەرابە ژەهراویە بەناوبانگەکەی دەبوون.

لەبری پشت بەستن بە هاوڕێکانی، سونگ دوژمنەکانی یەک لەدوای یەک بەکارهێنا، گۆڕینی بۆ ڕەعیەی یەکجار زۆر جێ متمانەتر. لەکاتێکدا کە هاوڕێ پێشبینی چاکەی زۆر و زۆرتر دەکات و لێوانلێوە لە ئیرەیی، ئەم دوژمنانەی پێشوو هیچ چاوەڕوانییەکیان

نەبوو و هەموو شتێکیان بەدەستهێنا. کەسێك کە لەپێشدا ملی لەژێر گوێڕایەڵیی دەردەهێنرێت لە ڕاستیدا پیاوێکی سوپاسگوزارە و دەچێتە ئەوسەری گۆی زەوی بۆ ئەو پیاوەی کە لێی خۆش بووە. لەکاتی خۆیدا، ئەم دوژمنانەی پێشوو بوونە جێ متمانەترین هاوڕێی سونگ.

سونگیش بۆ دوایجار توانی ڕێبازی کودەتاکان، توندوتیژی و شەڕی ناوخۆیی بشکێنێت. سیلسیلەی سونگ بۆ زیاتر لە سێسەد ساڵ حوکمی کرد.

لە وتارێکیدا کە ئەبراهام لینکۆڵن لە گەرمەی شەڕی ناوخۆدا پێشکەشی کرد، وەکو ئەو هەوتا مرۆڤانەی لە هەڵەدان ئاماژەی بە خەڵکی باشوور دا. خانمێکی بەتەمەن سەرکۆنەی کرد لەبەرامبەر ئەوەی کە بە دوژمنانی کەللەڕەق کە دەبێ تێکبشکێنرێن، ناوی نەهێناون. لینکۆڵن لە وەڵامدا وتی "بۆچی، خانم، ئەی من دوژمنانم تێکناشکێنم کاتێك دەیانکەم بە هاوڕێم؟"

## کلیلی دەسەڵات

شتێکی سروشتییە کە کار بدەیتە هاوڕێکانت کاتێك خۆت لە ڕۆژگاری تەنگەدا دەبینیتەوە. جیهان شوێنێکی سەختە و هاوڕێکانت ئەو سەختییە کەم دەکەنەوە. سەرباری ئەمەش، تۆ دەیانناسیت. بۆچی پشت بە غەریبەیەك ببەستیت کاتێك هاوڕێیەکت لێوە نزیکە؟

کێشەکە ئەوەیە کە تۆ زۆرجار ئەوەندەی خۆت دەیناسیت، هاوڕێکانت ناناسیت. هاوڕێکانت زۆرجار بۆئەوە هاوڕێ دەبن لەگەڵت تا خۆیان لە مشتومڕ بە دوور بگرن. ئەوان نابەتەمەنییە ناشیرینەکانیان دادەپۆشن بۆئەوەی یەکتری بریندار نەکەن. ئەوان با بڵێی بە دەنگی بەرزتر بە نوکتەکانی یەکتری پێدەکەنن. چونکە ڕاستگۆیی بە دەگمەن هاوڕێیەتی بەهێز دەکات، لەوانەیە تۆ قەت نەزانیت هاوڕێیەکت بە ڕاستی هەستی چۆنە. هاوڕێکانت پێت دەڵێن شیعرەکەت خۆشە، گەمەیان بە موسیقاکەت دێت، ئیرەیی بە سەلیقەت بۆ جلوبەرگ دەبەن — لەوانەیە بە ڕاستیان بێت، کەچی زۆرجار وانییە

کاتێك تۆ بڕیار دەدەیت کار بدەیتە هاوڕێیەکت، پەیتا پەیتا تایبەتمەندییەکانی ئەو تایبەتمەندیانەیت بۆ دەردەکەوێت کە شاراوەبوویەوە سەیر دەبێ، ئەوە کرداری بەزەیی تۆیە کە هاوسەنگی هەموو شتێك تێکدەدات، خەڵکی دەیانەوێت وا هەست بکەن کە شایستەی بەشی خۆیانن، وەرگرتنی چاکەیەك دەشێ ببێتە زیانێك ئەمە بەو مانایەیە کە تۆ هەڵبژێردراویت لەبەرئەوەی هاوڕێیت، مەرج نییە لەبەرئەوەی تۆ شایستەی چاکەکەیت تەقریبەن هەمیشە هەستێکی بەسوك بینین لە کار بەخشین بە هاوڕێدا هەیە کە بەشاراوەیی دووچاری دەبێ، برینەکە بە هێواشی دەردەکەوێت کەمێکی زیاتر لە راستگۆ، چەند ترووسکەیەکی کینە و ئیرەیی لێرە و لەوێ و پێش ئەوەی بزانیت ئیتر هاوڕێیەتییەکەت نامێنێ چەندەی چاکە و دیاری ببەخشیت بۆ زیندووکردنەوەی هاوڕێتییەکە، ئەوەندە کەمتر سوپاسگوزاری وەردەگریت

بێ ئەمەکی مێژوویەکی قووڵ و درێژی هەیە ئەمە بۆ ماوەی چەندین سەدە هێزەکانی دەرخستووە بەشێوەیەك کە بە ڕاستی جێی سەرسوڕمانە کە خەڵکی بەردەوامن لەوەی ئەو هێز و کاریگەرییانە فەرامۆش بکەن باشترە ئاگادار بیت ئەگەر تۆ قەت چاوەڕوانی سوپاسگوزاریی لە هاوڕێ مەکەیت، ئەوا بەدڵخۆشییەوە سەرت دەسوڕمێت کاتێك ئەوان دەیسەلمێنن کە سوپاسگوزارن،

کێشەی بەکارهێنان یان کار بەخشین بە هاوڕێکان ئەوەیە کە بەشێوەیەکی حەتمی دەسەڵاتی تۆ سنووردار دەکات هاوڕێ بە دەگمەن ئەو کەسەیە کە بەتواناترینە لە یارمەتیدانی تۆ و لە کۆتاییدا، شارەزایەتی و لێهاتوویی زۆر گرنگترن لە هەستە هاوڕێیەتییەکان، ( مایکڵی سێیەم پیاوێکی ڕێك لەسەردەمدا بوو کە ڕاستی دەکردەوە و بە زیندوویی دەیهێشتەوە، ئەو پیاوە باڕەس بوو)

هەموو بارودۆخێکی کاریگەر پێویستی بە جۆرێك لە دووریی لەنێوان کەسەکاندا هەیە تۆ هەوڵ دەدەیت کار بکەیت نەك هاوڕێ پەیدا بکەیت، هاوڕێیەتی (ڕاستەقینە یان درۆینە) تەنیا ئەو ڕاستییە ناموومژاوی دەکات، بۆیە کلیلی دەسەڵات توانای حوکمدانە بەسەر ئەوەی کێ بەباشترین شێوە دەتوانێت خزمەتی بەرژەوەندییەکانت بکات لە

هەموو ناڕەزایەتییەکانی هاوڕێیەکان بۆ هاوڕێیەتی بهێنێتەوە، بەڵام کار لەگەڵ کەسی شارەزا و لێهاتوو بکە.

لەلایەکی ترەوە، دوژمنانی تۆ کانە ئاڵتوونێکی دەست بۆ نەبراون کە پێویستە هێز بنێی بیانخەیتە کار. کاتێک تالیراند، وەزیری دەرەوەی ناپلیۆن لە ساڵی ١٨٠٧دا بۆی دەرکەوت سەرپرسەکەی فەرەنسا بەرەو وێرانە دەبات و کاتی هاتووە لێی هەڵگەڕێتەوە، لە مەترسییەکانی گەلەکۆمە لەدژی ئیمپراتۆر تێگەیشت، ئەو پێویستی بە هاوەڵێک بوو، کەسێکی جێی متمانە- دەتوانی متمانە بە چ هاوڕێیەک بکات لە پیلانێکی وەهادا؟ ئەو فۆچێ ی هەڵبژارد، سەرۆکی پۆلیسی نهێنی، کە سەرسەختترین دوژمنی بوو، پیاوێک کە تەنانەت هەوڵیدابوو ئەو تیرۆر بکات. ئەو دەیزانی کینەی پێشوویان دەرفەتێک دێنێتە کایە بۆ ئاشتبوونەوەی هەستی. ئەو دەیزانی فۆچێ چاوەڕێی هیچ لەو ناکات و لە ڕاستیدا کار دەکات بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئەم شایستەی هەڵبژاردنەکەی تالیراندە، کەسێک کە شتێکی هەیە بیسەلمێنێت ئەوا شاخەکانت بۆ دەهێنێتە جووڵە. دواجار ئەو زانی کە پەیوەندییەکەی لەگەڵ فۆچێ لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی خۆیی دەبێت و بە هەستی کەسی ژەهراوی نابێت. هەڵبژاردنەکە کامڵ دەرچوو، هەرچەندە پیلانگێڕەکان سەرکەوتوو نەبوون لە سەرنگوون کردنی ناپلیۆن، یەکێتییەکی بەهێز بەڵام ئەستەمی ئەو هاوەڵانە بەرژەوەندییەکی گەورەی لە ووڵاتەکەدا هێنایە کایە. دژایەتی بەرامبەر ئیمپراتۆر هێواش هێواش بڵاو بووەوە. لەو کاتەش بەدوا، تالیراند و فۆچێ پەیوەندییەکی کردەیی بەرهەمداریان هەبوو. هەرکاتێک کە دەتوانیت، ڕق و کینە لەگەڵ دوژمن بەلاوە بنێ و کەڵکێک لەوەدا بدۆزەرەوە کە بیخەیتە خزمەتی خۆت.

هەروەک نیکسۆن وتی، تۆ ئەو کاتە دوژمنێک تێکدەشکێنیت کە دەیکەیتە هاوڕێ. لە ١٩٧١، لەماوەی جەنگی ڤێتنامدا، هێنری کیسینجەر ئامانجی هەوڵێکی ڕفاندنی ناسەرکەوتوو بوو، پیلانێک لەئارادا بوو، کە قەشە هەڵسوڕاوە دژەجەنگە ناوبانگەکان، برایانی بێریگان، چوار قەشەی کاسۆلیکی تر و چوار راهیبە دەستیان تێدابوو. کیسینجەر بەنهێنی، بەبێ ئەوەی بە پۆلیسی نهێنی یان وەزارەتی داد بڵێت، کۆبوونەوەیەکی

بەیانیی هەمەدی لەگەڵ سێ پیلانگێڕی پاڵدەکە ڕێکخست بە ڕوونکردنەوەی بۆ میوانەکان کە بە هاتنی مارەپلستی ١٩٧٢ ڕووبەی سەربارە ئەمریکییەکان لە ڤیێتنام دەکشێنێتەوە، ئەو بەتەواوی کاریگەری خستە سەریان. ئەوان چەند ئاپەنیکی بەحەی "کیسینجەر ترقیس"یان بەو بەخشی و یەکێکیان بەدرێژایی ساڵان وەکو هاوڕێیەکی ئەو مایەوە و لە چەند بۆنەیەکدا سەردانی کرد. ئەمە نەک تەنیا پیلانێکی یەک جارە نەبوو، کیسینجەر سیاسەتێکی کاریگەری لەگەڵ ئەوانەدا داڕشت کە ناکۆک بوون لەگەڵیدا هاوکارەکانی وتیان پێدەچێت لەگەڵ دوژمنەکانتدا باشتر بێیتەوە نەک لەگەڵ هاوڕێکانتدا

ئەگەر هاوڕێمان لەدەور نەبێ، تەمەڵ دەبین. دوژمنێک کە بەدوامانەوەیە ژیریمان چڕ دەکاتەوە و بە ئەرکێز و وریایی دەمانهێڵێتەوە. کەواتە هەندێ جار را باشترە دوژمن وەک دوژمن بەکار بێنین نەک بیانکەین بە هاوڕێ یان هاوپەیمان.

ماو تسی تۆنگ ململانێی وەکو کلیلێک بینی لە دریکووبەوەیدا لە دەسەلات. لە ١٩٣٧دا، ژاپۆنییەکان چینیان داگیر کرد، شەڕی ناوخۆیان لەنێوان کۆمەنیستەکانی ماو و ناسیونالیستە دوژمنەکانیاندا پچڕاند

لە ترسی ئەوەی کە ژاپۆنییەکان ڕایاندەماڵن، هەندێ لە سەرکردە کۆمەنیستەکان پشنیاری جێهێشتنی ناسیونالیستەکانیان دەکرد تا خۆیان شەڕی ژاپۆنییەکان بکەن و کات بەکاربێنن بۆ حەسانەوەیان. ماو ڕازی نەبوو. لەوانەبە ژاپۆنییەکان نەتوانن شکست بە وڵاتێکی گەورەی وەکو چین بێنن و بۆ ماوەیەکی درێژ داگیری بکەن. هەر کە بڕۆیشتنایە، کۆمەنیستەکان دەستەوەستان دەبوون ئەگەر بۆ چەند ساڵێک شەڕیان نەکردایە و بە خراپی ئامادەیان دەبوو بۆ دەستپێکردنەوەی ململانێیان لەگەڵ ناسیونالیستەکاندا. بە ڕاستیدا شەڕکردن لەگەڵ دوژمنێکی وەکو ژاپۆنییەکان، ڕاهێنانێکی گرنگ دەبێت بۆ سوپەی پەرت وبڵاوی کۆمەنیستەکان. پلانی ماو پەیڕەو کرا و کرداری بوو. بە هاتنی ئەو کاتەی کە بۆ دوجار ژاپۆنییەکان کشانەوە، کۆمەنیستەکان ئەزموونی شەڕیان بەدەستهێنابوو کە یارمەتیدان ناسیونالیستەکان بشکێنن.

ساڵێک دواتر، سەردانکەرێکی ژاپۆنی هەوڵیدا پۆزش بۆ ماو بێنێتەوە لەبەرامبەر داگیرکردنی چین لەلایەن وڵاتەکەیەوە. ماو قسەی پێبڕی، "ئەی نابێ لەبری ئەمە من سوپاست بکەم؟" ئەو ڕوونیکردەوە و وتی، بەبێ دوژمنێکی شایستە، مرۆڤێک یان گروپێک ناتوانێت بەهێزتر ببێت

ستراتیژی ماو بۆ ململانێی بەردەوام چەند پێکهاتەیەکی سەرەکی هەیە. یەکەم، دڵنیا بە لەوەی کە لە دووڕمەودا تۆ سەرکەوتوو دەبیت. قەت شەڕێک هەڵمەبژێرە لەگەڵ کەسێک کە دڵنیا نیت شکستی پێ دێنیت، هەروەک ماو وای ژاپۆنییەکان لەکاتی جەنگدا تێکدەشکێنرێن. دووەم، ئەگەر تۆ دوژمنی ئاشکرات نیی، دەبێ هەندێ جار ئامانجێکی گونجاو بونیاد بنێیت، تەنانەت هاوڕێیەکیش بگۆڕیت بۆ دوژمنێک. ماو ئەم چەند جارێک ئەم تاکتیکەی لە سیاسەتدا بەکارهێنا. سێیەم، ئەو جۆرە دوژمنانە بەکاربێنە بۆ پێناسەکردنی دۆزەکەی خۆت بەشێوەیەکی ڕوونتر بۆ خەڵک، تەنانەت وەکو ململانێی چاکە لەدژی خراپە لەقاڵبی بدەرەوە. لە ڕاستیدا ماو هاندەری ناکۆکییەکانی چین بوو لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت و ئەمریکا. ئەو پێی وابوو بەبێ دوژمنی ڕوون و ئاشکرا، گەلەکەی هەر مانایەکی کۆمەڵایەتی چینی لەدەست دەدات. دوژمنێک کە بە ڕوونی پێناسەی هەبێت، بەڵگاندنێکی زۆر بەهێزترە لە بەرژەوەندی خۆت بە بەراورد بەو هەموو قسانەی کە دەشێ پێکیانەوە بنێیت

قەت ڕێگە مەدە ئامادەیی دوژمنەکانت تووڕە یان نیگەرانت بکەن. تۆ لەگەڵ نەیارێک یان دووانی ڕەسەندا حاڵت باشتر دەبێ وەک لەوەی کە بەراستی دوژمنە ڕاستەقینەکانت کەوتووبنە گۆشەوە. پیاوی دەسەڵاتداری پێشەواری لە ململانێ دەکات، دوژمنانی بەکاردەهێنێت بۆ پەرەدان بە ناوبانگەکەی، وەکو شەڕکەرێکی شوێن پێ قایم کە دەکرێ لە وەختی بێ متمانەییدا پشتی پێ ببەسترێت

وێنە شەوبلگەکانی بێ ئەمەکی. ئەگەر بزانیت چی ڕوودەدات کاتی پەیمانەک دەشکێنە یان دەمی شیرەوە، ئەوا لێی دوور دەبیت. لەگەڵ هاوڕێیاندا خەرەیکی وەفات نییە و ئەگەر تۆ کاریان بدەیت ئەوا بە بێ ئەمەکییەکەیان بە ڕسوایی دەتخوێن

دەسەڵات: بزانە چۆن دوژمنەکانت بۆ قازانجی خۆت بەکاردەهێنیت. دەبێ فێر ببیت شمشێر نەک بە سەرەکەی کە دەتبڕێت بەڵکو بە دەسکەکەی بگریت کە ڕێگەت دەدات بەرگری لەخۆت بکەیت. پیاوی ژیر زیاتر قازانج لە دوژمنەکانی دەکات بە بەراورد بە دەبەنگ کە لە هاوڕێکانی دەکات.

(بەلتازار گراسیەن، ١٦٠٦-١٦٥٨)

## پێچەوانەبوونەوە

هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی وا باشترە کار لەگەڵ هاوڕێیەتیدا تێکەڵ نەکرێت کات هەن تیایاندا دەشێ هاوڕێیەک بە کاریگەرییەکی زۆر زیاتر لە دوژمن بەکار بهێنرێت. بۆ نموونە، کەسێکی دەسەڵاتدار زۆرجار کارێکی دزێوی هەیە کە دەبێ بکرێت، بەڵام لەبەر دەرکەوتن بەشێوەیەکی گشتی وا پەسەندتر خەڵکی تر بۆی بکەن. زۆرجار هاوڕێ ئەمە بەباشترین شێوە دەکات، چونکە سۆزیان بۆ تۆ وایانلێدەکات ئامادەییان تێدا بێت سەرکێشی بکەن. هەروەها، ئەگەر پلانەکانی تۆ لەبەر هۆکارێک لە هۆکارەکان بە لاڕێدا بڕۆن، ئەوا دەتوانیت هاوڕێیەک وەکو بەردەبازێکی گونجاو بەکار بهێنیت. ئەم "کەوتنی دڵخواز"ە فێڵێک بوو زۆرجار پاشاکان و سەردارەکان بەکاریاندەهێنا. ئەوان دەیانهێشت کە نزیکترین هاوڕێیان بەر کەوتنەکە بکەوێت لەبەرامبەر هەڵەیەکدا کە کردوویانە، چونکە خەڵکی باوەڕ ناکەن کە ئەوان بە ئەنقەست هاوڕێیەک بۆ مەبەستێکی وەها بکەنە قوربانی. بێگومان، پاش ئەوەی ئەو کارە ماری پێدەکەیت، هاوڕێیەکەت بۆ تاهەتایە لەدەستداوە. بۆیە، وا باشترە، ڕۆڵی بەردەبازەکە بۆ کەسێک بێت کە نزیکە لێتەوە بەڵام ئەوەندەش زۆر نزیک نییە.

دوجار، کێشەی کارکردن لەگەڵ هاوڕێیان ئەوەیە کە ئەمە ئەو سنوور و دووریانە دەشێوێنێت کە ئەو کارکردنە پێویستیەتی. بەڵام ئەگەر هەردوو هاوەڵی ناو ئامادەکارییەکە بەو مەترسییانەی لەئارادا دەبن ئاگادار بن، زۆرجار دەکرێ هاوڕێیەت بە

شێوازێکی کاریگەر دەکار بکرێت، نابێ تۆ قەت لە سەرکێشییەکی وەهادا ڕووت بەدەرەوە ببێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە بەئاگا بە لە هەر میشەیەکی پەشێوی هەستیی وەکو تیرەیی و بێ ئەمەکی، هیچ شتێک لە تەڵەمرەوی دەسەڵاتدا جێگیر نییە و تەنانەت دەشێ نزیکترین هاوڕێکان بگۆڕێن بۆ خراپترین دوژمن.

بۆئەوەی دوژمنێکی باشت هەبێت، هاوڕێیەک هەڵبژێرە، ئەو دەزانێت لە کوێ بدات.

دیان دی پۆیتەرز، ١٤٩٩-١٥٦٦، مەعشوقەی هنری دووەمی فەرەنسا

هەر کاتێک کە پۆستێکی بەتاڵ دەبەخشم، سەد کەسی ناڕازی و کەسێکی بێ ئەمەک دروست دەکەم

لویسی ١٦، ١٦٣٨-١٧١٥

بێزەوە من لای خۆمەوە زیاتر لە جارێک لەسەر هەستی ئەو کەسە فریوم خواردووە کە لەهەموو زیاتر خۆشم ویستووە و کەسێک کە لەهەموو کەسێکی تر زیاتر بە خۆشەویستییەکەی دڵنیا بووم، بۆیە بڕوام وایە کە ڕاست نییە لەسەرووی هەموو ئەوانیترەوە کەسێکت، بە گوێرەی شایستەیی خۆش بوێت و حورمەتی بکەیت، بەڵام قەت متمانەی زۆر بەم تەڵەیە فریودەرانەیەی هاوڕێیەتی مەکەیت بەشێوەیەک کە هۆکارت هەبێ بۆ پەشیمانبوونەوە لێی بەکاتێکی دواتردا

بەلداسار کاستیگلیۆن ١٤٧٨-١٥٢٩

### مار، جوتیار و ماسی خۆرکە

مارێک کە ڕاوچی بەدوایەوە بوون داوای لە جوتیارێک کرد ژیانی ڕزگار بکات. بۆئەوەی لە ڕاوچییەکانی بشارێتەوە، جوتیارەکە هەڵتروشکا و لێگەڕا مارەکە لەناو ورگیدا خۆی گرموڵە بکات. بەڵام کاتێک چیتر مەترسییەکە نەمابوو و جوتیارەکە داوای لە مارەکە کرد

سه‌ر ده‌ره‌وه‌، ماره‌كه‌ ڕه‌تیكرده‌وه‌. شوێنه‌كه‌ی سه‌لامه‌ت و گه‌رم بوو. له‌ ڕێگه‌یدا به‌ره‌و ماڵه‌وه‌، جوتیاره‌كه‌ ماسی حۆركه‌كه‌ی بینی و چووه‌ لای و به‌ گوێیدا چرپاند كه‌ چی ڕوویداوه‌. ماسی حۆركه‌كه‌ پێی وت هه‌ڵتروشكێت و فشار له‌خۆی بكات بۆئه‌وه‌ی ماره‌كه‌ ده‌ربه‌ڕێنێته‌ ده‌ره‌وه‌. كاتێك ماره‌كه‌ سه‌ری هێنایه‌ ده‌ره‌وه‌، ماسی حۆركه‌كه‌ گرتی، ڕایكێشا و كوشتی. جوتیاره‌كه‌ نیگه‌رانی ئه‌وه‌ بوو كه‌ له‌وانه‌یه‌ ژه‌هری ماره‌كه‌ هێشتا له‌ناویدا بێت و ماسی حۆركه‌كه‌ پێی وت چاره‌سه‌ر بۆ ژه‌هری مار ئه‌وه‌یه‌ شه‌ش مریشكی سپی بكوڵێنیت و بیانخۆیت. جوتیاره‌كه‌ وتی "تۆ مریشكی سپیت. تۆ وه‌كو هه‌نگاوی یه‌كه‌م گونجاویت". ئه‌و ماسی حۆركه‌كه‌ی گرت، خستیه‌ ناو تووره‌كه‌یه‌ك و بردیه‌وه‌ ماڵه‌وه‌ كه‌ له‌وێ به‌ستیه‌وه‌ تا بۆ ژنه‌كه‌ی بگێڕێته‌وه‌ كه‌ چی ڕوویداوه‌. ژنه‌كه‌ی وتی "من سه‌رم له‌ تۆ سوڕماوه‌. ئاژه‌ڵێك چاكه‌ت له‌گه‌ڵ ده‌كات، له‌ خراپه‌ی ناو ورگت ڕزگارت ده‌كات، ژیانت ده‌پارێزێ، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا تۆ ده‌یگریت و باس له‌ كوشتنی ده‌كه‌یت" ژنه‌كه‌ ده‌ستبه‌جێ ماسی حۆركه‌كه‌ی به‌ردا و ئه‌ویش ڕۆی. به‌ڵام له‌ ڕێگه‌ چاوه‌كانی خۆی ده‌رهێنا

په‌ند: كاتێك تۆ ئاوێك ده‌بینیت له‌ به‌رزایی ده‌ڕژێته‌ خوار، مانای ئه‌وه‌یه‌ كه‌سێك چاكه‌یه‌ك ده‌داته‌وه‌

حه‌كایه‌تێكی ئه‌فریقی

زۆر كه‌س هه‌ن پێیان وایه‌ كه‌ ده‌بێ میرێكی زیر بوی ڕه‌حما، ڕاده‌یه‌ك له‌ دوژمنایه‌تی دروستبێت بۆئه‌وه‌ی به‌ تێكشكاندنی مه‌زنایه‌تی خۆی زیاد بكات. میره‌كان و به‌تایبه‌ت میره‌ تازه‌كان باوه‌ڕی زیاتر و كه‌ڵكی زیاتریان له‌و كه‌سانه‌ دۆزیوه‌ته‌وه‌ كه‌ له‌ سه‌ره‌تای ده‌سه‌ڵاتدا گومانیان لێكردوون، نه‌ك ئه‌وانه‌ی كه‌ له‌سه‌ره‌تادا متمانه‌یان پێكردوون. پاندۆلفۆ پیترۆشی، میری سیینا، ده‌وڵه‌ته‌كه‌ی خۆی زیاتر به‌خۆی ئه‌وانه‌وه‌ به‌ڕێوه‌ برد كه‌ گومانی پێی هه‌بوو نه‌ك ئه‌وانیتر

نیكۆلۆ مه‌كیاڤێللی ١٤٦٩–١٥٢٧

براهمیەک، شارەزای گەورە لە (ڤیدا) کە لەهەمان کاتدا بووەتە تیرهاوێژێکی گەورەش، حورمەتگوزارییەکانی پێشکەش بە هاوڕێ پاشەکەی دەکات کە ئێستا پاشایە. براهمەنەکە هاوار دەکات کاتێک پاشا دەبینێت "دەمناسیتەوە، هاوڕێتم!" پاشا بە ریسواییەوە وەڵامی دەداتەوە و پاشان دەڵێت "بەڵێ، ئێمە پێشتر هاوڕێ بووین، بەڵام هاوڕێیەتییەکەمان لەسەر ئەو دەسەڵاتە وەستابوو کە هەمانبوو. من هاوڕێت بووم، براهمی پاش، چونکە حورمەتی بە مەبەستەکەی من دەکرد. هیچ هەژارێک هاوڕێی دەوڵەمەند نییە، هیچ گەمژەیەک هاوڕێی ژیر نییە، هیچ ترسنۆکێک هاوڕێی ئازا نییە. کۆنە هاوڕێیەک— کێ پێویستی پێیەتی؟ ئەوە دوو پیاوی هاو سامان و یەکسانن لە لەدایکبووندا هاوڕێیەتی و هاوسەرێتی دەکەن، نەک دەوڵەمەندێک و هەژارێک. هاوڕێیەکی کۆن— کێ پێویستی پێیەتی؟

مەهابهاراتا، سەدەی سێیەمی پێش زایین

لە مەرەیی حزنەوە هەنگێک بگرە و سووروەکانی بەرەیی برانە

پەندێکی سۆڵ

پیاوان زیاتر ئامادەیی ئەوەیان تیایە کە پارەوی برینێک بکەنەوە نەک سوودێک، چونکە سوپاسگوزاری بارێکی قورسە و تۆڵە شیرینە

تاسیتۆس (نزیکی ٥٥–١٢٠ی زایینی)

جارێکیان وا رێکەوت کە پاشا هێرز قسەی لەگەڵ یەکێک لە دوژمنەکانیدا دەکرد کە بۆنی هەناسەی زۆر ناخۆش بوو. پاشا کە هەستێکی نیگەرانی تێدا پەیدا بوو هەر گەڕایەوە ماڵەوە بە ژنەکەی وت "ئەوە چۆنە تۆ باسی ئەم کێشەیەت بۆ نەکردووم" ژنەکەی بە سادەیی و پاکییەوە وتی "گەورەم، پێم وابوو هەموو پیاوان هەناسەیان

هەروبە" لیرەوە ڕوونە کە ئەو کیماسییانەی بە سیفەت هەستەکانەوە ئاشکرن، چەتاوەسووانە و جەستەییی، یان بە پێچەوانەوە بە تسیفەت حیهانەوە بەدیارن، زووتر بەهۆی نوژمەکانمانەوە دەیانزانین نەک هۆست و ئاشناکانمان

پلوتارک (مریکی ٤٦–١٢٠ ی زایین)

# یاسای ژمارە ٣

## نیازەکانت بشارەوە

### پوختە

خەڵک لە ناهاوسەنگی و تاریکیدا بهێڵەرەوە بەوەی کە نەت مەبەستی پشت کردارەکانت دەربخەیت. ئەگەر ئەوان هیچ سەرەداوێکیان نەبێت لەمەڕ ئەوەی کە تۆ بە نیازی چیت، ئەوا ناتوانن ئامادەی بەرگری بن. بایی پێویست بەرەو ڕێڕەوە هەڵەکە ڕێنماییان بکە، بایی پێویست بیانخەرە ناو تەمومژەوە و بەهاتنی ئەو کاتەی کە نیازەکانی تۆیان بۆ دەردەکەوێت، زۆر درەنگ بووە.

**بەشی یەکەم: کەرەستە هۆش پەرتکەرەکانی ئارەزوو و زانیاریی گومڕاکەر بەکار بێنە بۆ ئەوەی خەڵکی لە بۆنەکە دوور بخەیتەوە**

ئەگەر لە هەر خاڵێکی ئەو بەلاڕێدابردنەی کە پڕاوەی دەکەیت خەڵکی بچکترین گومانیان لە نیازەکانت هەبێت، هەموو شتێک لەدەستچووە. شانسی ئەوەیان مەدەرێ بزانن بە نیازی چیت. لە ڕێگەی بەکارهێنانی زانیاریی هەڵە بەدرێژایی ڕێگەکە لە بۆنەکە دووریان بخەرەوە. سەرراستی ساختە بەکاربێنە، ئاماژەی تەمومژاوی ئاراستە بکە، ئامرازی گومڕاکەری ئارەزوو بەکار بێنە. ئەوان کە نەتوانن ڕاستەقینە لە ساختە جیا بکەنەوە ئەوا ناتوانن ئامانجە ڕاستەقینەکەت دیاری بکەن.

## سەرپێچی لە یاساکە

بەدرێژایی چەند هەفتەیەک، نینۆن دو لێنکلۆس، بەدناوترین سۆزانی سەدەی حەڤدەهەمی فەرەنسا، بە ئۆقرەوە گوێی بۆ مارکیس دو سێڤینێ هەڵخست کە ململانێکانی لە سۆزانکردنی کۆنتێسەیەکی جوان بەڵام سەرسەخت ڕوونکردەوە. سێڤینێ لەو سەروەختەدا شەست و دوو ساڵ بوو و تا بڵێی شەرەزوو بوو لە بابەتەکانی خۆشەویستیدا. مارکیس گەنجێکی بیست و دوو ساڵان، قۆز، سەرنجڕاکێش بوو بەڵام لە ڕۆمانسیەتدا دەست و پێ سپی بوو. لەسەرەتادا نینۆن دڵخۆش بوو گوێ لە باسی هەڵەکانی مارکیس بگرێت، بەڵام لە کۆتاییدا تاقەتی چوو. ئەو کە نەیدەتوانی بەرگەی دەستەوستانی لەهیچ بوارێکدا بگرێت، بەتایبەت لە ڕاکێشانی ژنێکدا، بڕیاریدا پیاوە گەنجەکە بخاتە ژێر باڵی خۆی. سەرەتا دەبووایە تێبگات کە ئەمە جەنگە، و ئەمەی کە کۆنتێسە جوانەکە قەڵایەکە کە دەبووایە ئەو وەکو هەر زەمەڵێکی تر گەمارۆی بدات دەبووایە هەر هەنگاوێک بەوپەڕی وریایی و وردەکارییەوە پلانی بۆ دابنرێت و جێبەجێ بکرێت.

نینۆن ڕێنمایی مارکیسی کرد لەسەرەتاوە دەست پێبکاتەوە، نینۆن پێی وت کە بە کەمێک دووریی، کەشێکی هێمنانە، لە کۆنتێسە نزیک بێتەوە. جارێکی تر کە ئەو دووانە بە تەنیا دەبنەوە، ئەو وەکو هاوڕێیەک قسە بۆ کۆنتێسە دەکات نەک خۆشەویستێکی نابێتە. ئەمە بۆ گومڕاکردنی بوو. لێرەوە کۆنتێسە چیتر بایەخدانی ئەوی بە خۆی بەجدی وەرنەدەگرت – لەوانەیە ئەو تەنیا هاوڕێیەتی بەلاوە گرنگ بووبێت.

نینۆن لەپێشدا پلانی دانا. هەر کە کۆنتێسە سەری لێشێوا، کاتی ئەوە دەبێت کە ئیرەییەکی تێدا بهێنێتەکایە. لە شەوی داهاتوودا، لە بۆنەیەکی گەورەدا لە پاریس، مارکیس لەگەڵ ژنێکی گەنجی جواندا دەردەکەوت. ئەم ژنە گەنجە جوانە بەهەمان شێوە هاوڕێی جوانی هەبوو، بۆیە لە هەر کوێیەک کە کۆنتێسە مارکیسی دەبینی، لەلایەن شۆخ و شەنگترین ژنی گەنجی جوان لە پاریس دەورە درابوو. کۆنتێسە نەک تەنیا پڕاوپڕ

دەبوو بە ئیرەیی، بەڵکو مارکسی وەکو کەسێك دەبینی کە لەلایەن ئەوانیترەوە حەزی پێدەکرێت. سەخت بوو بۆ نیشێ وا لە مارکس بکات تێبگات، بەڵام ئەو بە ئۆقرەییەوە ڕوونیکردەوە کە ژنێك کە کەیفی بە پیاوێك دێت، دەیەوێ بیبینێت کە ژنانی تریش کەیفیان پێدێت. ئەمە نەك تەنیا دەستبەجێ بەهای بە پیاوەکە دەدات، بەڵکو تەناعەتێکی زۆریش دروست دەکات کە دەبێ لەژێر چنگەکان بهێنرێتە دەرەوە.

هەر کە کۆنتێنسە ئیرەیی لا دروست بوو مەلام وورژا، کاتی ئەوە دەهات کە سیحری لێ بکرێت بەپێی ڕێنماییەکانی نیشێ، مارکیس نەیدەتوانی لەو بۆنانەدا دەربکەوێت کە کۆنتێسە چاوەڕوانی دەکرد ببینێت، پاشان، لەپڕێکدا، لەو هاڵۆیانەدا دەردەکەوت کە پێشتر کەمتر بۆیان دەچوو، بەڵام کۆنتێنسە زۆر زوو بۆیان دەچوو. کۆنتێسە نەیدەتوانی پێشبینی جموجۆڵەکانی بکات. هەموو ئەمە وایلێدەکات بکەوێتە ناو پەشێوییەکی هەستییەوە کە پێشمەرجە بۆ ئەکتێشکردنێکی سەرکەوتووانە.

ئەم جموجۆڵانە جێبەجێ کران و چەند هەفتەیەکی خایاند، نیشێ بەرەوپێشچوونەکانی مارکیسی چاودێری دەکرد. لە ڕێگەی تۆڕی سیخوڕەکانییەوە، گوێبیستی ئەوە دەبووەوە کە چۆن کۆنتێسە بە دەنگێکی کەمێك بەرزتر بە گاڵتەوگەپەکانی مارکیس پێدەکەنێت، نەبایەخێکی زیاترەوە گوێ لە چیرۆکەکانی دەگرێت. هاوڕێیەکانی پێیان وت کە لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکاندا کۆنتێسە زۆرجار دەڕوانێتە مارکیس و شوێن پێیەکانی هەڵدەگرێت. نیشێ دڵنیا بووەوە لەوەی کە ژنەکە گەیمەکە کەوتۆتە ژێر جادووی مارکیس، ئێستا چەند هەفتەیەك نەوانەشە مانگێك یان دووان پێویست بوو، بەڵام ئەگەر هەمووی بە ڕێکوپێکی بڕۆیشتایە، قەڵاکە دەڕما.

چەند ڕۆژێك دواتر مارکیس لە ماڵی کۆنتێسە بوو. ئەوان بەتەنیا بوون. لەپڕێکدا ئەو پیاوێکی جیاواز بوو. ئەمجارە بە ناڕەوو و ئەنگێزەکانی خۆی دەجوڵایەوە بەت ئەوەی بە ڕێنماییەکانی نیشێ بجوڵێتەوە، ئەو دەستی کۆنتێسەی گرت و پێی وت خۆشم دەوێیت. ژنە گەنجەکە سەری سوڕما، بەرچەکردارێك کە مارکیس پێشبینی نەدەکرد. کۆنتێسە ڕێز و ئەدەبی نیشاندا، پاشان داوای لێبوردنی کرد و ڕۆیشت. لە پاشماوەی

تیۆرەکەی کۆنتێسە خۆی لە چاوانی ئەو بەدوور گرت، لەوێ مەبوو تا شەوڕشادی لێبکات چەند جارێ دواتر مارکیس سەردانی دەکرد و پێیان دەوت لە ماڵ نییە. کاتێک کۆنتێسە بۆ دواجار پێشوازی لێکردەوە، ئەو دووانە هەستێکی نامۆیان بەرامبەر یەکتری هەبوو و لەگەڵ یەکتریدا نائاسوودە بوون. جادوورەکە شکابوو

## لێکدانەوە

نینۆن دی لینکلۆس هەموو شتێکی لەبارەی هونەری خۆشەویستییەوە دەزانی. مەزنترین نووسەران، بیرمەندان و سیاسییەکانی ئەو وەختی خۆشەویستی ئەو بوون– پیاوانی وەکو لا ڕۆچفوکۆد، مۆلیێر و ریچیلۆ. دڵ بەدەستهێنان بۆ ئەو گەمەیەک بوو، کە بە لێزانییەوە پراوە دەکرا. لەگەڵ بەتەمەنداچوونیدا، ناوبانگی زیادیکرد و گرنگترین خێزانەکان لە فەرەنسا کوڕەکانیان دەنارده لای بۆئەوەی لەبارەی خۆشەویستییەوە وانەیان پێ بڵێت

نینۆن دەیزانی پیاوان و ژنان زۆر جیاوازن، بەڵام کاتێک بابەتەکە دێتە سەر یەکێشکردن هەمان هەستیان هەیە. لە قووڵایی ناخیاندا، زۆرجار هەست دەکەن بەکێش دەکرێن، بەڵام مل دەدەن چونکە ئەوان خۆشی لە هەستی ئاراستەکردن دەبینن. ئەوە خۆشییەکە کە ڕێگە خۆش بکەیت ئەویتر بە لاڕێیدا ببات بۆ وڵاتێکی نامۆ. لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو شتێک لە یەکێشکردندا بەندە بە ئاماژەدان. تۆ ناتوانیت نیازەکانت ڕاگەیەنیت یان ڕاستەوخۆ بە قسە دەریانبخەیت. لەبری ئەمە، دەبێ تۆ ئامانجەکانت لە ڕێگە لابدەیت. بۆئەوەی من بۆ ڕێنمایی تۆ بدەم دەبێ بەشێوەیەکی گونجاو سەرگەردان بکرێن. دەبێ تۆ ئاماژەکانت بخەیتەگەڕ– وا دەرخەیت کەیفت بە پیاوێک یان ژنێکی تر دێت (کەرەستەی گومڕکردن)، پاشان ئاماژەی ئەوە بگەیەنیت کە کەیفت بە ئامانجەکە دێت، پاشان سیماکی پێشان بدەیت، ئیتر بەردەوام بەمشێوەیە. ئەم ڕەوگەیە تەنیا سەرگەردانی دروست ناکات، بەڵکو شادیبەخشە

لە ڕوانگەی کۆنتێسەوە وێنای ئەم چیرۆکە بکە پاش چەند هەوڵەیەکی مارکیس، کۆنتێسە هەستیکرد مارکیس حەریکی گەمەیەکە، بەڵام گەمەکە شایەنی بوو بۆی ئەو بەیدەرانی مارکیس بەرەو کوێی ئاراستەی دەکات، چارەڕوانی هەوڵەی دواتر بوو-کۆنتێسە ئەنانەت کەیفەی بە ئیرەیی و سەرگەردانییەکەی خۆی دەکرد، چونکە هەندێ جار هەر هەستێك باشترە لە بێزاریی ئەمنیەت و ئارامی. لەوانەیە مارکس پاڵنەری شاراوەی هەبووبێ، زۆربەی پیاوان هەیانە بەڵام کۆنتێسە ئامادەیی تیابوو چاوەڕێ بکات و لەوانەبوو ئەگەر وابلیکرابا بۆ کاتێکی درێژتر چاوەڕێ بکات، ئەوەی کە مارکیس حەریکی بوو گرنگ نەبووایە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ساتەی کە مارکیس ئەو وشە کوشندەیەی گۆ کرد "خۆشەویستی"، هەموو شتێك گۆڕا. ئەمە چیتر گەمەیەك نەبوو بە هەوڵەوە، ئەمە پێشاندانێکی بەشارەزایانەی سۆز بوو. ئیارای ئەو دەرکەوت: ئەو حەریکی ڕاکێشانی دڵی کۆنتێسە بوو. ئەمە هەموو ئەو شتەی مارکیس کردبووی خستە ژێر ڕۆشناییەکی تازەوە هەموو ئەوەی کە پێشتر سیحراوی بوو ئێستا دزێو و پیلانگێڕانە دیار بوو. کۆنتێسە هەستی بە شەرمەزاری کرد و هەستیکرد بەکارهێنراوە. دەرگایەك داخرا کە جارێکی تر نەدەکرایەوە

*وەکو دزێودەرێك دەرمەکەوە، ئەگەرچی تووسە لەمڕۆدا عریودەرێك نەبێت. بە درۆی لێزانانەت لەژێر پەردپۆشی ئەوەی کە وەك لێزانی دەردەکەوێت بمێنێتەوە*

*بالتەسار گراسیەن ١٦٠١–١٦٥٨*

## پەیڕەوی لە یاساکە

لە ١٨٥دا (ئۆتو ڤۆن بیسمارك)ی گەنج کە ئەو کاتە ئەندام پەرلەمانێکی سی و پێنج ساڵان بوو لە پەرلەمانی پروسی، لە حاڵێکی وەرچەرخانی ژیانی پیشەیید بوو. پرسەکانی ڕۆژ بریتی بوون لە یەکخستنی زۆرێك لە دەوڵەتان (بە پروسیاشەوە) بەو قەوارەیەدا کە ئەڵمانیا بەسەریدا دابەش ببوو و جەنگ لەدژی نەمسە، ئەو دراوسێ

بەهێزەی لای باشوور کە هیوادار بوو ئەڵمانەکان بە لاوازی و لەژێر مەترسیدا بهێڵێتەوە، تەنانەت هەڕەشەی ئەوەی دەکرد دەستبەرداری بکات ئەگەر هاتوو هەوڵی یەکگرتن بدەن. میر ویلیام، کە لە سیلیسیاکەدا لەدوای پاشاری پروسیاوە دەهات، لەگەڵ هەڵایسانی جەنگدا بوو و پەرلەمان بۆ بڕە پارەکە هەستایە سەر پێ و ئامادە بوو پشتیگری هەر سەرکردەیەکی هێزی سەربازی بکات. ئەوانەی کە دژی جەنگ بوون بریتی بوون لە پاشای هەموکەیی، فریدریک ویلیامی چوارەم و وەزیرەکانی، کە پێیان باش بوو نەمساوییە بەهێزەکان هێور بکەنەوە.

بەدرێژایی ژیانی پیشەیی خۆی، بیسمارک پشتیوانێکی بەئەمەک و تەنانەت دڵسۆزی هێز و دەسەڵاتی پروسیا بوو. ئەو حەوتی بە یەکخستنەوەی ئەڵمان، چونکە جەنگ لەدژی نەمسا و ریسواکردنی ئەو وڵاتە دەبینی کە لەمێژ بوو ئەڵمانیای بە دابەشکراوی هێشتبووەوە. ئەو کە سەربازێکی پێشوو بوو، جەنگی بە کارێکی شکۆمەندانە دەبینی

دواجار ئەمە ئەو پیاوە بوو کە ساڵانێک دواتر دەیگوت "گەورەترین پرسەکانی سەردەم یەکلا دەبنەوە، بەڵام بە قسە و بڕیار نا، بەڵکو بە ئاسن و خوێن".

بیسمارک کە نیشتمانپەروەر و عاشقی شکۆی سوپا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە گەرمەی هەستەنی جەنگدا وتارێکی لە پەرلەمان پێشکەش کرد کە هەموو ئەوانەی گوێبیستی بوون حەپەسان. وتی "وای لە حاڵی ئەو دەوڵەتمەدارەی بەبێ پاساو شەڕ دەکات، پاساوێک کە کاتێک شەڕیش تەواو بووە هێشتا ڕەوایەتی هەیە! پاش جەنگ، هەمووتان بەشێوەیەکی جیاواز دەڕواننە ئەم پرسیارانە. ئایا ئەو کاتە بوێریی ئەوەتان دەبێت ڕوو بکەنە ئەو جوتیارەی ڕادەمێنێتە خۆڵەمێشی کێڵگەکەی، ئەو پیاوەی کە کەمئەندام بووە، ئەو باوکەی کە منداڵەکانی لەدەستداوە؟" بیسمارک نەک تەنیا بەردەوام بوو لە قسەکردن لە شێتی ئەم جەنگە، بەڵکو لەهەمووی سەیرتر، ستایشی نەمسای کرد و بەرگری لە کردارەکانی کرد. ئەمە بەدژی هەموو ئەو شتانە بوو کە داکۆکی لێ دەکرد- دەبێ ئەمە چ مانایەک بگەیەنێت؟ پەرلەمانتارەکانی تر سەریان لێشێوا، و ژمارەیەکیان

ئاراستەی دەنگی حزبان گۆڕی. دواجار پاشا و وەزیرەکانی سەرکەوتوو بوون و جەنگ بەرپەست کرا

چەند هەفتەیەک پاش وتارە بەناوەکەی بیسمارک، پاشا دوای ئەوەی سوپاسی کرد کە لەپێناو ئاشتیدا قسەی کردبوو، کردیە وەزیری کابینە. چەند ساڵێک دواتر، ئەو بووە سەرۆکی پروسیا. لەم ڕۆڵەدا، دواجار ئەو وڵاتەکەی و پاشا ئاشتیخوازەکەی بەرەو جەنگ لەدژی نەمسا ئاراستە کرد، ئیمپراتۆریەتی پێشووی تێکشکاند و دەوڵەتێکی ئەڵمانی بەهێزی بونیاد نا کە پروسیا لەسەری سەروەری بوو.

## لێکدانەوە

لەکاتی وتارەکەیدا لە ١٨٥٠، بیسمارک چەند هەڵسەنگاندنێکی کرد. یەکەم، هەستی بەوە کرد کە سوپای پروسی هاوشانی سوپاکانی ئەوروپا نییە، ئامادەیی تیا نییە بۆ جەنگ- لە ڕاستیدا لەوانەیە نەمسا بەئاسانی جەنگ بباتەوە و ئەمەش ئەنجامێکی کارەساتباری بۆ ئایندە لێدەکەوێتەوە. دووەم، ئەگەر جەنگیان بەرپابکردایە و بیسمارک پشتیوانی بکردایە، ژیانی پیشەیی بەشێوەیەکی بەرچاو دەکەوتە مەترسییەوە. پاشا و وەزیرە کۆنسێرڤاتیڤەکانی ئاشتییان دەویست، بیسمارک دەسەڵاتی دەویست. وەڵامەکە بریتی بوو لە گومڕاکردنی خەڵک لە ڕێگەی پشتگیریکردنی دۆزێک کە ڕقی لێبوو، وتنی ئەو شتانەی کە پێکەنینی پێدەهات گەر کەسێکی تر بیکردایە. هەموو وڵات کڵاوی لەسەر نرا. بەهۆی وتارەکەی بیسمارک بوو کە بوو بە وەزیر، پۆستێک کە بەخێرایی لەوەوە بوو بە سەرۆک وەزیران، دەسەڵاتی بەدەستهێنا تا سوپای پروسی بەهێز بکات و ئەو شتە بەدی بهێنێت کە لەمێژ بوو دەیویست: ڕیسواکردنی نەمسا و یەکخستنی ئەڵمانیا بەژێر ڕابەرایەتی پروسیادا.

بەدڵنیاییەوە بیسمارک یەکێک بوو لە دەوڵەتمەدارە هەرە زیرەکەکان، وەستای ستراتیژی و لەخشتەبردن بوو. لەم حاڵەتەدا کەس گومانی ئەوەی نەبرد خەریکی چییە. ئەگەر بیارە ڕاستەقینەکانی دەرخستایە، مشتومڕی لەسەر ئەوە بکردایە کە باشترە

شمشێکی چاوەڕێ نەکات و دوایی شەڕ نەکات، ئەوا مشتومڕەکەی نەدەبردەوە، چونکە زۆربەی پرۆسییەکان دەیانویست لەو سەرەوەختەدا بجەنگن و بە هەڵە پێیان وابوو سوپاکەیان لە نەمساوییەکان باڵاترە. ئەگەر ئەو پاشای بەکار بهێنایە، داوای بکردایە بکرێتە وەزیر لەبەرامبەر پشتیوانی ئاشتیدا، لەم حاڵەتەشدا سەرکەوتوو نەدەبوو. پاشا گرەنتی بە مەبەستەکەی و سەرراستییەکەی دەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا، بەوەی کە بەتەواوی ساختەچی بوو و ئامادەی گەمژەکەری ئاراستە دەکردن، هەمووانی خەڵەتاند، مەبەستەکەی شاردە و هەموو ئەو شتەی بەدەستهێنا کە دەیویست. ئەمەیە هێزی شاردنەوەی مەبەستەکانت.

## کلیلی دەسەڵات

زۆربەی خەڵکی کتێبی کراوەن. ئەوان ئەو شتە دەڵێن کە هەستی پێدەکەن، لە هەر دەرفەتێکدا بیت پێ و بۆچوونی خۆیان دەردەبڕن و بەردەوام پلان و نیازەکانیان دەردەخەن. ئەوان لەبەر چەند هۆکارێک ئەمە دەکەن. یەکەم، ئاسان و سروشتییە کە هەمیشە بتەوێ لەبارەی هەستەکانت و پلانەکانی ئایندەت بدوێیت. تەقەلایەکی دەوێ تا کۆنترۆڵی زمانت بکەیت و چاودێری ئەو شتە بکەیت کە دەریدەخەیت. دووەم، زۆر کەس پێیان وایە کە بەوەی ڕاستگۆ و کراوە بیت ئەوا دڵی خەڵکی بەدەست دێنی و سروشتی باشی خۆمان پیشان دەدەن. ئەوان تەواو فریویان خواردووە. لە واقیعدا ڕاستگۆیی ئامێرێکی کوڵە، کە زیاتر لەوەی دەبڕێت کە خوێن بێنێت. ئەگەری هەیە ڕاستگۆیی تۆ مایەی بریندارکردنی خەڵکی بێت. زۆر لێزانانەترە کە قسەکانت بگونجێنیت، ئەو قسانە بۆ خەڵک بکەیت کە دەیانەوێت گوێبیستی بن نەک حەقیقەتی درشت و ڕەقی ئەمەی کە هەست بە چی دەکەیت یان بیر لە چی دەکەیتەوە. لەوەش گرنگتر، بەوەی کە بەبێ شەرم کراوە بیت وەها خۆت دەکەیتە پێشبینیکراو و ئاشنا کە تەقریبەن ئەستەم دەبێت ڕێزت لێ بگیردرێت یان لێت بترسن و دەسەڵات ناکەوێتە دەستی کەسێک کە ناتوانێت ئەو هەستانە بجوڵێنێت.

ئەگەر تۆ ئامرازی دەسەڵاتیت، بەجیاتی ڕاستگۆیی بڵاوە پێ بکە و خۆت لە هونەری شاردنەوەی نیازەکانت ڕابهێنە. لە هونەرەکە ئەسپی خۆت تاو بدە و ئیتر بۆ هەمیشە زاڵ دەبیت. سەمای توانای شاردنەوەی نیازەکان ئەوەیە لە خەسڵەتێکی سادە لەبارەی سروشتی مرۆڤەوە پەیدا دەبێ: غەریزەی ئێمە ئەوەیە هەمیشە متمانە بە ڕواڵەتەکان دەکەین. ئێمە ناتوانین هەروا بە سانایی گومان لە واقیعی ئەو شتانە بکەین کە دەیانبینین و دەیانبیستین — بە بەردەوامی وێناکردنی ئەوەی کە ڕواڵەتەکان شتێکی تریان شاردۆتەوە ماندوومان دەکات و دەمانترسێنێ. ئەو فاکتە شاردنەوەی نیازەکانی مرۆڤ تا ڕادەیەک ئاسان دەکات. تەنیا لەپێش چاوی خەڵک شتێک بەدەستەوە بگرە کە پێدەچێ حەزت لێی بێت، ئامانجێک کە پێدەچێت هەوڵی بۆ بدەیت، ئیتر ئەوان ڕواڵەتەکان وەکو واقیعییەتێک وەردەگرن. هەر کەچاویان کەوتە سەر دانە گومڕاکەرەکە، ئەوا ناتوانن تێبینی ئەو شتە بکەن کە دەیشاریت. لە بەکێشکردندا، ئاماژەی ناکۆک ئاراستە بکە، وەکو ئارەزووکردن و بێباکبوون، و لێرەوە تۆ نەک تەنیا گومڕایان دەکەیت، بەڵکو ئارەزوویان بۆ ئەوەی ببنە خاوەنت، کڵپە دەکات.

تاکتیکێک کە زۆرجار کاریگەرە لە هێنانەکایەی بابەتی گومڕاکەر، ئەوەیە پشتگیریی ئایدیایەک یان هەستێک بکەیت کە لە ڕاستیدا دژی سۆزەکانی خۆتە (بیسمارک ئەمەی تا ڕادەیەکی کاریگەر لە ڕێبەرەکەیدا لە ١٨٥٠ بەکارهێنا). زۆربەی خەڵکی پێیان وادەبێت کە دڵت گۆڕاوە، چونکە زۆر نائاساییە باری هەستێکی هەستیارەی وەکو ڕاو بۆچوون و بەهاکان بگەیت. هەمان شت بەسەر هەر بابەتێکی گومڕاکەری ئاوەرودا پێیدە دەبێت. وا پیشانبدە شتێکت دەوێت کە لە ڕاستیدا هیچ گەیەکت پێی نایەت و ئیتر دوژمنەکانت گومڕ دەبن، لە حەسابکردنەکانیاندا هەموو جۆرە هەڵەیەک دەکەن.

بەماوەی جەنگی تاج دانانی ئیسپانیدا لە ١٧١١، دوکی مارلبۆرۆ، سەرۆکی سوپا، ویستی قەڵایەکی گرنگی فەرەنسا تێکبشکێنێت، چونکە گوزەرگایەکی گرنگی بۆ ناو فەرەنسا دەپاراست. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو زانی ئەگەر تێکیشکاندایە، فەرەنسییەکان دەرکیان پێ دەکرد چی دەوێت — بزووتنەوەی کە بە ڕێگاکەدا پێشڕەوی بکات. لەبری

ئەمە، ئەو تەنیا قەڵایەکەی گرت و بەهەندی لە سەربازەکانی پاراستی، وا دەربخست کە بۆ مەبەستێکی خۆی دەیەوێت. فەرەنسییەکان هێرشیان کردە سەر قەڵاکە و ئەوک ڕێگەیدا بیگرنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، هەر کە بەدەستیانهێنایەوە، ڕووبەڕووی ڕاستیی بۆچوون کە ئەوک لەبەر هۆکارێکی گرنگ ویستوویەتی. ئێستا کە قەڵایەکە نەمابوو، ڕێگەکە لەژێر پارێزگاریدا نەبوو و مارلبۆرۆ بە ئاسانی توانی بەرەو ناو فەرەنسا پێ بکات.

ئەم تاکتیکە بەم شێوازە بەکار بێنە: نیازەکانت بشارەوە نەک بە داخران (سەرکێشیکردنی دەرکەوتن بەشێوەیەکی نهێنی ئامێز و گومان خستنە دڵی خەڵک) بەڵکو بەشێوەی قسەکردنی ناکۆتا لەبارەی نیاز و ئامانجەکانت – بەڵام ڕاستەقینەکان نا. تۆ بە بەردێک سێ چۆلەکە دەکوژیت: تۆ بەشێوەیەکی دۆستانە، کراوە و جێی متمانە دەردەکەویت، تۆ نیازەکانت دەشاریتەوە و تۆ ڕکابەرەکانت سەرقاڵی ڕاوە قازێکی کات کوژ دەکەیت.

ئامرازێکی بەهێزی تر لە گومڕاکردنی خەڵک لە بۆن و بەرامە، سەرڕاستییەکی ساختەیە. خەڵکی بەشێوەیەکی ئاسان سەرڕاستی و ساختەچێتی تێکەڵ دەکەن. بیرت بێت – یەکەمین غەریزەیان متمانەکردنە بە ڕواڵەتەکان، و لەبەرئەوەی ڕاستگۆیی بەرز دەنرخێنن و دەیانەوێ باوەڕ بە سەرڕاستی ئەوانە بکەن کە لەدەوریانن، بە دەگمەن گومان لە تۆ دەکەن یان درک بە کردارەکەت دەکەن. بەمشێوەیە بوو (ناکۆ) (تۆمێلۆ)ی فریودا و تێکیشکاند: دەربڕینی قووڵترین هەستەکانی، سەرڕاستیی ڕواڵەتییانەی نیگەرانییەکانی لەبارەی دەنگۆی ناپاکی دێسدەمۆنا، چۆن دەکرێ تۆمێلۆ متمانەی پێنەکات؟ هەروەها بەمشێوەیە بوو کە ساختەچیی گەورە، کوڕە زەردە وەیل سەرێلکەکانی لەخشتە برد. دەرکەوتن بەشێوەیەک کە بە قووڵی باوەڕ بەو کەرەستە گومڕاکەرەکە بکات کە لەبەردەمیاندا هەڵیواسیبووە (موڵکێکی ساختە، هەوڵی فرۆشتنی ئەسپێکی پێشبڕکێ)؛ ئەو واقیعەکەی وابیندەکرد گومان لێکردنی قورس بێت. بێگومان گرنگە لەم بوارەدا زۆر دوور نەڕۆیت. سەرڕاستی ئامرازێکی فریودەرە، زیدە بڕەسۆز

دەرکەویت گومان دروست دەکەیت. وردەکار و جێ باوەڕ بە، ئەگینا تاکتیکەکەت وەک ئەو پەردەپۆشەی کرابووتە دیار دەبێت.

بڕنەرەی سەرڕاستییە ساختەکەت چەکێکی کاریگەرە بۆت لە شاردنەوەی نیازەکانت، باوەڕبوون بە سەرڕاستی و ڕاشکاوی وەکو بەهای کۆمەلایەتی گرنگ پەیڕەو بکە ئەوەندەی دەکرێ بە ئاشکرایی و لەبەردەم خەلکدا ئەمە بکە. حەتت لە هەلوێستی حزت لەسەر ئەم بابەتە بکەرەوە لەڕێگەی ئەوەی کە ناوبەناو بیرۆکەیەکی هەستیاەت دەربخەیت– هەلبەت هەرچەندە تەنیا ئەوەیان کە بە ڕاستی بێ مانا و ناپەیوەندیدارە، ئابراندی وەزیری ناپلیۆن مامۆستا بوو لە ڕاکێشانی خەلک بەرامبەر نهێنییەکەی لە ڕێگەی دەرخستنی بە ڕواڵەت نهێنییەکەوە. پاشان ئەم نهێنییە ساختەیە– بابەتی گومڕاکەر– بەهێنییەکی ڕاستەقینەی لەلایەن کەسەکەی ترەوە لێدەکەوێتەوە

بیرت بێت باشترین فریودەرەکان هەموو شتێک دەکەن کە لەتوانایاندایە بۆ داپۆشینی تایبەتمەندییە ساختەییەکەیان. ئەوان کەشێکی ڕاستگۆیی لە دەوریاندا دروست دەکەن بۆ داپۆشینی ناڕاستی لە بوارەکانی تردا. ڕاستگۆیی تەنیا گومڕاکەرێکی ترە لە کۆگای تەقەمەنییەکانیاندا

## بەشی دووەم تەمێک دروست بکە بۆ داپۆشینی کردارەکانت

*فریودان هەمیشە باشترین ستراتیژییە، بەلام باشترین فریودانەکان پێویستیان بە تەمێک هەیە بۆ پەرتکردنی هۆشی خەلک لە مەبەستی ڕاستەقینەت. ڕواڵەتی لێڵ– وەکو ڕوخسارێکی بێ گوزارشت– زۆرجار تەمێکی تەواوە کە نیازەکانت لەپشت ئاسوودەیی و ئاشنایی دەشارێتەوە. ئەگەر تۆ ساویلکەیەک بە ڕێڕەوێکی ئاشنادا ببەیت، ئەوا تێناگات کاتێک بەرەو تەلەیەک ئاراستەی دەکەیت.*

**پەیڕەوی یاساکە ۱**

لە ساڵی ١٩١٠دا، بەڕێز (سام گیزیل)ی خەڵکی شیکاگۆ پرسی گەنجینەکەی بە نرخەکەی ١ ملیۆن دۆلار فرۆشت. ئەو لە دەرچی بیمەی خانەنشینییەکە، کیرسایەوە و پرۆژە سەر مەڕیوەبردنی موڵکە زۆرەکانی، بەڵام لە ناخەوە سەری بۆ ڕۆژانی کۆنی مامەڵەکردن دەچوو. ڕۆژێکیان پیاوێکی گەنج بەناوی جورنف وەیل سەردانی نوسینگەکەی کرد، دەیویست شوقەیەك بکڕێت کە ئەو بۆ فرۆشتن دایابوو. گیزیل بەندوبەرجەکانی بۆ ڕوون کردەوە، نرخەکە ٨٠٠ دۆلار بوو، بەڵام تەنیا پێویستی بە پێشەکییەکی ٢٠ دۆلاری بوو بەشێوەی کاش. وەیل وتی ڕۆژێك دوای دەخەم، بەڵام ڕۆژی دواتر هاتەوە و وتی تەواوی ٨٠٠٠ دۆلارەکە دەدات، ئەگەر گیزیل دوو ڕۆژ چاوەڕێ بکات، تا ئەو کاتەی کە وەیل ئەو مامەڵەی پێیەوە خەریکە بە ئەنجام دەگات. تەنانەت لە بیمەی خانەنشینییەکەشیدا، برسمانێکی زیرەکی وەکو گیزیل پرسیاری ئەوەی لا دروست بوو کە وەیل چۆن دەتوانێت ئەو هەموو پارە کاشە (نزیکەی ١٥،٠٠٠ دۆلاری ئەمڕۆ) وەها بەخێرایی ئامادە بکات. پێدەچوو وەیل نامەدڵ بێت و بەخێرایی بابەتەکەی گۆڕی، بەڵام گیزیل مکوڕ بوو. دواجار، پاش ڕەماباتی بەڵێنی پارێزی، وەیل ئەو چیرۆکەی خوارەوەی بۆ گیزیل گێڕایەوە.

مامی وەیل سکرتێری پێرێك لە سیپۆسەرە دارایییە سیوبەرەکان بوو. ئەم سیپۆلمانە دەوڵەمەندانە پێش دە ساڵ کانیەیەکی ڕاویان لە میشیگان بە نرخێکی هەرزان کڕیبوو. ئەوان چەند ساڵێك بوو کانیەکەیان بەکارنەهێنابوو، بۆیە بڕیاریاندابوو بیفرۆشن و داوایان لە مامی وەیل کردبوو هەرچەندەی دەکری هەدەستی سست بۆ ساغکردنەوەی لەبەر چەند هۆکارێك- هۆکاری باش-ی خۆی، مامی وەیل چەند ساڵێك بوو شتێك لەبەرامبەر ئەو سیپۆسەرانە لەدڵ گرتبوو، ئێستر ئەمە کاتی بوو تا پێیان هەڵبڕێژێت. ئەو موڵکەکەی بە ٢٥،٠٠٠ دۆلار بە ئەڵەکەبازێك دەفرۆشت (کە ئەمە وەیل بوو بیدۆزییەوە) سیپۆسەرە دارایییەکان لەوە دەوڵەمەندتر بوون بیگەرێی ئەو نرخە کەمە بن. باشان

کابرای ئەڵەکەباز کارەکەی تەواو دەکرد و جارێکی تر موڵکەکەی دەفرۆشتەوە، ئەمجارە بە مرجە ڕاستەقینەکەی، واتە نرێکەی ١٠٠, مام، وەیل، و کەسی سێیەم قرامەکەیان لە فرۆشتنی دووەمەوە لەنێوان خۆیاندا بەش دەکرد. ئەمە هەمووی یاسایی بوو و لەبەر هۆکارێکی باشیش- سزای دادپەروەرانەی مام

گیریل بەبێ پێویست گرنیبیست بوو. ئەو ویستی ببێتە کابرای ئەڵەکەباز. وەیل نابەدڵ بوو بۆ بەشداریپێکردنی ئەو، بەڵام گیریل کوڵی نەدەدا. بیرۆکەی قارتەبکی گەورە، لەگەڵ کەمێك سەرکێشی، تامەزرۆی کردبوو. وەیل ڕوونیکردەوە کە دەبێ گیریل ٢٥٠,٠٠٠ی کاش دابنێت بۆ ئەوەی مامەڵەکە سەر بگرێت. گیریل کە ملیۆنێر بوو، وتی دەتوانێت بە چەقەنەیەك ئەو پارەیە پەیدا بکات. لە کۆتاییدا وەیل شل بووەوە و ڕازی بوو کۆبوونەوەیەك لەنێوان گیریل، مامی، و سپۆنسەرە داراییەکان لە شارۆچکەی گەیلسبێرگ، ئیلینۆی، ڕێکبخات

لە شەمەندەفەر بەرەو گەیلسبێرگ، گیریل چاوی بە مام کەوت- کەسێکی کاریگەر کە ئەو بە تامەزرۆییەوە کەوتە قسەوباسی بزنس لەگەڵیدا. وەیلیش هاوەڵێکی لەگەڵ خۆی هێنا، پیاوێکی کەمێك ورگن بەناوی جۆرج گرۆس. وەیل بۆ گیریلی ڕوونکردەوە کە ئەم خۆی ڕاهێنەرێکی یاری بۆکسینێ بووە و گرۆس یەکێك بوو لە شەڕکەرانی بەتوانای خەڵات کە ئەم ڕاهێنانی پێکردووە و داوای لە گرۆس کردووە لەگەڵیاندا بێت بۆ ئەوەی دڵنیا بێتەوە ئاخۆ شەڕکەرە مێینتا لەش و لارە ڕێکەکەی ماوە. بۆ شەڕکەرێك کە چاوەڕێ کراوە ئایندەیەکی گەشی هەبێ، گرۆس ڕواڵەتێکی سەرنجڕاکێشی نەبوو- سەری سپی ببوو و ورگی دابوو- بەڵام گیریل ئەوەندە پەرۆش بۆ مامەڵەکە کە بە ڕاستی بری بە ڕواڵەتی گۆشتنی کابرا نەدەکردەوە،

هەر کە گەیشتنە گەیلسبێرگ، وەیل و مامی چوون سپۆنسەرەکان ببینن. گیریل لە هۆڵی هۆتێلەکەدا لەگەڵ گرۆس چاوەڕوان بوو کە بەشێوەیەکی ڕەمەکی شۆرتی بۆکسینەکەی لەبەر کرد. لەکاتێکدا کە لەلاوە تەماشای دەکرد، گرۆس دەستیکرد بە وەشاندنی مشتەکۆڵە لە هەوا. گیریل کە حەماڵی ڕۆشتبوو، ئەوەی فەراموش کرد کە

کابرای بۆکسەر باش چەند خولەکێك لە پێراوە چەند بە خرابی مشتەکۆڵە دەوەشێنێ
هەرچەندە سنابلەکەی تا رادەیەکی باش راستەقینە دیار بوو سەعاتێك بولتر، وەیل و
مامی لەگەڵ سپۆنسەرەکان دەرکەوتنەوە کە گروپێکی کارگەری بەسامی پیاوان بوو،
هەموویان قاتی کەشمەیری لەبەر بوو. کۆبوونەوەکە بە باشی بەڕێوە چوو و سپۆنسەرە
داراییەکان رازی بوون لەسەر فرۆشتنی کابینەکە بە گیرێل کە هەموکە ٣٥٠ دۆلاری بە
بانکێکی لۆکاڵ دابایەوە

ئێستا کە ئەم پرسە لاوەکییە یەکلا بوو، سپۆنسەرە داراییەکان لەسەر
کورسییەکانی خۆیان دانیشتنەوە و دەستیانکرد بە نوکتەکردن لەبارەی داریی ئاسن
بەرز، ناوهێنانی "خەی پی.مۆرگان" وەك بڵێی کابرا دەیناسی. دواجار بەکێکیان تێبینی
کابرای بۆکسەری کرد لە گۆشەی ژوورەکەدا. وەیل ڕوونیکردەوە کە خەریکی چییە
کابرای سپۆنسەر وتی ئەمیش بۆکسەرێك لە گروپەکەیدا هەیە کە ئەویش هێنا. وەیل بە
دەنگی بەرز پێکەنی و وتی کە پیاوەکەی ئەم دەتوانێ بە ئاسانی پیاوەکەی ئەم
بەزێنێت. وتوێژ گەرم بوو و بوو بە مشتومڕ. لە گەرمەی قسەکاندا، وەیل تەحەددی
پیاوەکانی کرد بۆ گرەوکردن. سپۆنسەرەکان بە نامەردییەوە رازی بوو و ڕێکەوتن بۆ
ئەوەی پیاوەکەی خۆیان بۆ شەڕ لە ڕۆژی دواتردا، ئامادە بکەن.

هەر کە ئەوان ڕۆیشتن، مام، ڕێك لەبەردەم گیرێل، هاواری بەسەر وەیلدا کرد. ئەوان
بایی پێویست پارەیان پێ نییە گرەوی پێ بکەن و هەر کە سپۆنسەرەکان بەمە بزانن،
مام دەردەکرێت. وەیل پێڕۆشی بۆ هێنایەوە لەبەرامبەر ئەوەی خستوویەتە ناو ئەم
گێژاوە، بەڵام پلانێکی هەبوو. ئەو بۆکسەرەکەی تری نەش دەناسی و بە بەربلێکی
بچوک، شەڕەکەیان ڕێکدەخست. بەڵام پارەی گرەوەکە لە کوێوە دەهات؟ مام وەڵامی
دایەوە. بەبێ ئەمە، هیچ کەڵکیان نەدەبوو. دواجار گیرێل بایی پێویست قسەی سخت
لەبەرتەوەی نەدەویست بە هیچ ئیرادەیەکی خراپ عامەنەکەی بخاتە مەترسییەوە،
٢٥ دۆلارە کاشەکەی لەنەشی گرەوەکەی خۆی پێشکەش کرد. تەنانەت ئەگەر
ئەمەشی لەدەست بدایە، ئەوا پارەی زۆربوی دەهێنا و هێشتا لە فرۆشی کابینەکە

قازانجی دەکرد. مام و دوارا سوریاسمان کرد بە ١٥,٠٠٠ دۆلارەکەی خۆیان و ٣٥,٠٠٠ دۆلارەکەی گیبریل بابی پێویست پارەمان لەبەردەست دەبوو بۆ گرەوەکە. ئەو شەوارەبە، بەکاتێکدا کە گیبریل تەماشای دوو بۆکسەرەکەی دەکرد کە خەریکی پرۆڤەن، بیری بەلای ئەو قازانجەدا پلیشتبوو کە هەم لەیاری بۆکسینەکە و هەم لە فرۆشی کاسێتەکە دەیکرد.

ڕۆژی دوایی، شەڕەکە لە هۆڵی وەرزشی ئەنجام درا. وەیل سەرپەرشتی پارە کاشەکەی کرد کە لەبار حاڵەتی ئەمنی خرابووە ناو بۆکسێکی قفڵ دراو. هەموو شتێک لە ڕووی هونەرییەکە بەگوێرەی پلان بەڕێوە دەچوو. سپۆنسەرە داراییەکان حەمبار دیار بوون بەوەی کە شەڕکەرەکەیان چەند خراپ یاری دەکات. پاشان، لەپڕێکدا شەڕکەری سپۆنسەرەکان مشتەکۆڵەیەکی تونتی بە ڕووخساری گرۆسدا کێشا و بەربیدایەوە. کاتێک کەوتە سەر زەوی، خوێن لە دەمی ڕژا. ئەو کۆکی، پاشان مت بوو.

یەکێک لە سپۆنسەرە داراییەکان، کە دکتۆرێکی پیشوو بوو، فشاری خوێنی گرت، مردبوو. ملیۆنەرەکان تۆقین. دەبووایە هەمووان بڕۆنە دەرەوە بەر لەوەی پۆلیس بگات- لەوەبوو هەموویان بە کوشتن تۆمەتبار بکرێن.

گیبریل کە تۆقیبوو، بە هەڵەداوان بە هۆڵە وەرزشییەکە هاتە دەرەوە و ڕایکردەوە بۆ شیکاگۆ و ٢٥٠٠٠ دۆلاری کاشی لەدوای خۆی هێنابێت کە دڵخۆش بوو هەر لەبیر خۆی بباتەوە، چونکە ئەم ترحە بچوکە هیچ نەبوو لەچاو ئەوەی تاوانی کوشتنی بکەوێتە ئەستۆ. ئەو قەت نەیویست نە وەیل و نە هیچ کەسێکی تر ببینێتەوە.

پاش ئەوەی گیبریل ڕایکرد، گرۆس لەسەر پێیەکانی خۆی وەستا. ئەو خوێنەی بە دەمی ڕژابوو، هی تۆپێکی پڕ لە خوێنی مریشک و ئاوی گەرم بوو کە بە گوپیدا شاردبوویەوە. تەواوی ساختەکە لەلایەن وەیلەوە داڕێژرابوو کە زیاتر بە "کوڕە زەرد" ناسراوە و یەکێکە لە کلاوچییە هەرە ناسراوەکانی مێژوو. وەیل ٣٥,٠٠٠ دۆلارەکەی لەگەڵ سپۆنسەرەکان و بۆکسەرەکان (کە هەموویان هەوەڵی تەڵەکەبازی ئەو بوون) دابەش کرد- قازانجێکی بچوکی باش بوو بۆ چەند ڕۆژێکی کەمی کارکردن.

**لێکدانەوە**

کوڕە زەرد گرێزلی وەکو سارێلکەیەکی نموونەیی دانابوو بە ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی داوەکەی بۆ سپێتەوە. ئەو دەیزانی کەمەی بۆکسین تەڵەیەکی باش دەبێت بۆئەوەی گرێزل بەحێزایی و بەشێوەیەکی حەتمی لە پارەکەی جیا بکاتەوە. بەڵام سەمەمان شێوە دەیزانی کە ئەگەر بە هەوڵدان بۆ جوڵاندنی ئارەزووی گرێزل بۆ یاری بۆکسین دەست پێبکات ئەوا بەشێوەیەکی نەگبەتانە شکست دێنێ. دەبوویە ئەو نیازەکانی بشارێتەوە و سەرنجی بۆ لایەکی تر پەرت بکات، تەمێك بهێنێتە کایەوە- لەم حاڵەتەدا فرۆشتنی کابینە.

لە شەمەمەمەرەکە و لە ژووری هۆتێل، ئەقڵی گرێزل تەواو بە حسنەکەی مامەڵەکە، پارەی ئاسان، چانسی تێکەڵاوبوون لەگەڵ دەوڵەمەندان، قاڵ ببوو. ئەو تێبینی ئەوەی نەکرد کە کرۆس شێوەی لەشی تێکچووە و لەباشترین حاڵەتەدا بە ناوەڕاستی تەمەنیدایە. ئەمەیە هێزی دروستکردنی تەم. گرێزل بە قاڵبووی لەناو مامەڵەی بزنسدا، بە ئاسانی هۆشی چووە سەر یاری بۆکسینەکە، بەڵام ئەیب لەو حاڵەدا کە هەرکە درەنگ ببوو تێبینی ئەو وردەکارییە بکات کە دەیهێنایەوە هۆش خۆی. ئێستا ئیتر یارییەکە مەند بوو بە بەرنیلێکەوە نەك هەلومەرجی جەستەیی بۆکسەرەکە. گرێزل لە کۆتاییدا ئەوەندە هۆشی بە مەرگی بۆسکەرەکە پەرت ببوو کە پارەکەی بەتەواوی بیر چووبوووەوە

لە کوڕە زەردەوە فێر بە. ئاشنا، پەردەی لێڵ تەمێکی گومان و تەووە بە بێزکەیەکەوە لە نیشانەکەت نزیك بکەرەوە کە سی پێویست ئاسایی دیارە- مامەڵەیەکی بزنس، تەڵەیەکی دارایی. هۆشی سارێلکە پەرت دەبێت. گومانەکانی کپ دەبن. ئەمە ئەو کاتەیە کە تۆ مەعنەی مەرەو پڕەوی دووەم ئاراستەی دەکەیت، وانە ئەو لێزاییەی کە دەستەوستانانە بەسەریدا دەخزێت بۆ ناو تەڵەکەت

### پەیڕەوپکردنی یاساکە ؟

لە دوەڕاستەکانی ١٩٢٠ەکاندا، جەنگاوەرە بەهێزەکانی ئەسیوپیا گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە گەنجێکی خانەدان بەناوی (هەیلی سێلاسی) کە بە (راس تەفاری)یش ناسراوە، پێشیان دەدانەوە و لەو حاڵەوە دەیکە خۆی وەکو ڕێبەریان دەسەپێنێت بەوەی کە پاش چەند دەمەیەک بۆ یەکەمین جار وڵاتەکە دەکەیحات. زۆربەی ڕکابەرەکانی نەیاندەتوانی تێبگەن چۆن ئەم پیاوە سادە، هێمن و ڕەفتار ئاساییە توانیویەتی هێزەکە بگرێتە دەست. لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵی ١٩٢٧، سێلاسی توانی لە یەک کاتدا جەنگاوەرەکان کۆ بکاتەوە، بێتە ئەدیس ئەبابا بۆ ڕاگەیاندنی وەفادارییان و دانپێدانی وەکو ڕێبەر.

هەندێ پەلەیان کرد، هەندێ ڕاڕا بوون، بەڵام تەنیا یەکێکیان، وەک (دێجازماچ بالچ)ی سیدەمۆ، جورئەتی کرد بەرەنگاری سێلاسی بکات. بالچا کە زەبەلاحێک بوو، جەنگاوەرێکی هەڕەب بوو و ڕێبەرە نوێیەکەی بە لاواز و ناشایستە لەقەڵەمدا. ئەو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە پایتەخت دوور مایەوە. دواجار سێلاسی، بەشێوازی نەرم بەڵام جددی خۆی، فەرمانی بە بالچا کرد بێت. جەنگاوەرەکە بڕیاریدا ملکەچ بێت، بەڵام لە کردارەیدا ئەو لەسەرانسەر ئەو کەسەی وا دەریدەخست تاجی ئەسیوپیای لەسەر دوە هەیبکی قوستەوە. ئەو بەهێزایی خۆی دەهاتە ئەدیس ئەبابا و بە سوپایەکی ، ١ کەسی، هێزێکی دەبێ پێویست گەورە بۆ بەرگریکردن لەخۆی. لەوەش بوو تەنانەت شەڕی دارخو سارد دەدات. ئەو هێزە تۆکمەکەی لە دۆڵێکدا سێ مایل دوور لە پایتەخت جێگیر کرد، چاوەڕێی بوو، ڕێک وەک پاشایەک، دەبوایە سێلاسی بێت بۆ لای.

لە ڕاستیدا سێلاسی نوێنەری ناردن. داوای لە بالچا کرد ئامادەی خوانێک بێت لەسەر شەرەفی ئەم. بەڵام بالچا گەمژە نەبوو، ئاگاداری مێژوو بوو – ئەو دەیزانی پاشاکان و لۆردەکانی پێشووی ئەسیوپیا خوانیان وەکو تەڵە بەکارهێناوە. هەر کە ئەو بەوێ ئامادە دەبوو و سەرخۆش دەبوو، سێلاسی دەیکوشت. بۆ ئاماژەدان بە تێگەیشتنەکەی لە

ناوبژیخەکە، ئەو رازی بوو ببێتە خوانەکە، بەلام تەنیا ئەگەر بیتوانیبایە پاسەوانە کەسییەکەی بێنێت- ٦ لە باشترین سەربازەکانی، هەموویان چەکدار و ئامادە بۆ بەرگریکردن لەو و لە خۆیان. بالچا ئورۆشی سەرسوڕمان بوو کە سێلاسی بەوپەڕی ئەدەبەوە وەلامی دایەوە و وتی مایەی شەرەفە بۆی کە میوانی ئەو جەنگاوەرانە بێت.

لە ڕێگەیدا بەرەو خوانەکە، بالچا هۆشداری دایە سەربازەکانی کە سەرخۆش نەبن و وریا بن. کاتێک ئەوان گەیشتنە کۆشک، سێلاسی باشترین سەرنجڕاکێشی ئەو بوو ئەو ڕێزی لە بالچا گرت، وەها مامەلەی لەگەڵ کرد کە هەتا ملێی زۆر پێویستی بە پەرامەندی و هاوکاری هەیە. بەلام بالچا ڕەتیکردەوە بکەوێتە ژێر جادووەکە و ئەو هۆشداری دایە سێلاسی کە ئەگەر ئارەکو ئێوارە نەگەڕێتەوە بۆ کەمپەکەی ئەوا سوپاکەی فەرمانی پێیە هێرش بکاتە سەر پایتەخت. سێلاسی وەها پەرچەکرداری پیشاندا کە بەو بێ متمانەییە هەستی بریندار بووە. لەسەر نان خواردن، لەکاتی وتنی گۆرانی مەزنیدا لەسەر شەرەڤ سەرکردەکانی ئەسیوپیا، ئاماژەیدا بە ڕێگەدان بەو گۆرانییانەی ڕێز پیشاندان بۆ جەنگاوەری سیدامۆ بالچا وەهای بۆ دەچوو کە سێلاسی ریدەقی چووە و لەبەرامبەر ئەو جەنگاوەرە مەزنەدا ترسی لێ نیشتووە کە بەدەکرا زیرەکییەکەی ڕەت بدرێت. بە هەستکردن بە گۆڕانکاری، بالچا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئەم دەبێتە ئەو کەسەی بڕیار بە ڕۆژانی داهاتوو دەدات.

پاش کۆتایی دراسیوەرۆ، بالچا و سەربازەکانی دەستیانکرد بە گەڕانەوە بۆ کەمپ لە گەرمەی موتاف و سلاوی چەکدا. بە ئاوڕدانەوە لە پایتەخت بەسەر شانەکانیدا، ئەو ستراتیژی خۆی دارشت- چۆن سەربازەکانی خۆی بەمارەی چەند هەفتەیەکدا بە پایتەختدا بە سەرکەوتوویی ڕێیان دەکرد و سێلاسی لە شوێنی دادەنرا، شوێنەکەی یا زیندان دەبوو یان مەرگ. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێک بالچا هاتە شوێنی کەمپەکەی، هەستیکرد شتێک ڕوویداوە. لەو شوێنەی کە پێشتر تا چاو بڕ بکات خێمەی ڕەنگاوڕەنگ

هەبوون، ئێستا هیچ شتێك نەبوو، تەنیا دوکەڵ لە ئاگری کوژاوە هەڵدەستا. ئەمە چ جادووییەکی ئەهریمەنی بوو؟

شتایەتێك بە بالچای وت چی ڕوویداوە. لەماوەی خەوانەکەدا، سوپایەکی گەورە، بە فەرمانی هاوپەیمانێکی سێلاسی بە دزییەوە و بە لاڕێیەکدا کە ئەو نەیبینیبوو چووبووە شوێنی کامپەکەی بالچا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم سوپایە بۆ شەڕ نەهاتبوو. بە ڕاستی ئەوەی کە بالچا گوێبیستی شەڕێکی پڕ ژاوەژاو ببوو و بە پەلە بە ٦٠٠ پاسەوانەکەیەوە گەڕابووەوە، سێلاسی سەربازەکانی خۆی بە سەبەتەی ئاڵتوون و کاش سار دابوو. ئەوان چوارەوری سوپای بالچایان گرتبوو و دەستیانکردبوو بە کڕینی چەکی هەریەکەیان. ئەوانەی ڕەتیانکردبووەوە، هەڕەشەیان لێکرابوو. لەماوەی چەند سەعاتێکدا، سەراپای هێزەکەی بالچا چەك کرابوون و بەهەموو لایەکدا بڵاو ببوون.

بە هەستکردن بە مەترسییەکەی، بالچا بڕیاریدابوو بە ٦٠٠ سەربازەکەیەوە بەرەو باشوور بجوڵێت بۆ بە گرووپکردنەوە، بەڵام هەمان ئەو سوپایەی کە سەربازەکانی چەك کردبوو ڕێگەکەی گرتبوو. ڕێگەی دەرچوونی دیکە بۆ ڕێکردن بوو بەرەو پایتەخت، بەڵام سێلاسی سوپایەکی گەورەی بۆ بەرگری لێکردنی دانابوو. وەکو یارییانێکی شەترەنج، پێشبینی جوڵەکانی بالچای کردبوو و کش ماتی کردبوو. بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا، بالچا ملکەچ بوو. بۆ تۆبەکردن لە لووتبەرزی و چاوچنۆکییەکەی، ڕازی ببوو بچێتە پەرستگەیەك.

## لێکدانەوە

بەماوەی درێژی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا، کەس نەیدەتوانی بەتەواوی لێی تێبگات. ئەسیوپییەکان وەکو سەرکردەکانیان توند دەوێن، بەڵام سێلاسی کە ڕووپۆشێکی نەرم و نیان، ئاشتیخوازانەی دروستکردبوو، لەهەموویان زیاتری حەباند. ئەو کە قەت توڕە و بێ ئۆقرە نەبوو، بە بڕەی شیرین قوربانییەکانی ڕادەکێشا، بە نەرم و نیانی و سەرنجڕاکێشییەکەی، ئەوانی هێمن دەکرد هەر لەوەی هێرشیان بکاتە سەر. لە حاڵەتی

بالچاد سیلاسی باری بە هەرەر و وریایی کەسەکە دەکرد، وانە گومانەکەی لەسەر ئەوەی کە حولەکە بەلەبە کە لە ڕاستیدا وەها بوو، بەڵام ئەوەیان نەبوو کە پەیلەیی دەکرد. شیواری سیلاسی بۆ کۆکردنەوەی نوسەکانی بالچا - ڕێگەپێدانی تا پاسەوانەکەی بۆ حولەکە بچێت، سەگ و ئیمشیار بۆدانانی لەوی، وانیکردنی کە هەست بە بالادەستی بکات - ئەم و مۆزیکی جری دروستنکرد و کرداری ڕاستەقینەی لە دوورایی سی هایل دابۆخی

بیرت بێت هەستی حەرەر و بەدگومانی زۆرجار ئاسانترین ڕێگەی فریودانی، متمانەیان لەبواریکدا بەدەست بێنە و ئیتر تۆ چرە دوکەڵێکت سار داوە کە بیبابیان لە بواریکی تردا تاریک دەکات، ڕێگەت بۆ خۆش دەکات پێی درکێ بکەیت و زەربێکی کاریگەریان لێ بوەشێنیت ئامازەیەکی یارمەتیدەر یان بە ڕواڵەت ڕاستگۆیانە، یان ئەوەیان کە گورزشتە لە بالادەستی کەسەکەی تر - ئەمانە ئامرازی کاملی هۆش پەرتکردنن

ئەگەر بەرێکوپێکی ئامادە بکرێت، ئەمرمژ چەکێکی دەسەڵاتێکی گەورەیە ئەمە تۆوای بە سیلاسیی نەرم و نیاندا تا دوژمنەکەی بەتەواوی تێک بشکێنێت، مەبێ ئەقاسی تاکە فیشەکێك

*دەسەڵاتی ئاغاری (سێلاسی) بە کەم مەگرە، ئەرێەکو مشك پێی ترێکێ دەکات بەڵام فەرێلەکانی هی فیلن،*

(دوایین قسەکانی بالچای سیدامۆ پێش ئەوەی بچێتە پەرستگا)

## کلیلی دەسەڵات

ئەگەر تۆ بروات وابێت فریودەران هەڵکانی ڕەنگاوڕەنگن کە بە درۆی تیرووتەسەل و حیکایەتی درێژ گومڕات دەکەن، ئەوا بەهەڵەدا چوویت باشترین فریودەران دیوێکی بێتام و لیلێ بەکاردێنن کە هیچ سەرنجێك بەلایاندا ڕاناکێشێت ئەوان دەرلی ئامازە و قسەی سەرەڕۆیانە دەسنەجێ گومان دەوروژێنن لەبری ئەمە، ئەوان ئامانجەکانیان

دەخەنە ناو دۆخێکی ئاشنا، بۆ زیان و سواو لە مامەڵەکردنەکانی کورت ڕەوت وەیل لەگەڵ سام گیریلدا، ئەو شتەی کە ئاشنا بوو بریتی بوو لە مامەڵەیەکی بزنس. لە حاڵەتی ئەسپوپیدا، بریتی بوو لە ملکەچییەکی گومڕاکەری سیلاسی – کتومت ئەو شتەی کە پاڵچا لە جەنگاوەرێکی لاوازتر چاوەڕێی دەکرد.

هەر کە تۆ هۆشی کەسە ساریلکەکەت بە شتێکی ئاشنا کپ و هێمن کرد، ئەوان تێبینی ئەو فریودانە ناکەن کە لەپشتەوە ئەنجام دەدرێت. ئەمە لە ڕاستییەکی سادەوە دێت: خەڵکی تەنیا دەتوانن تەرکیز بکەنە سەر یەک شت لە یەک کاتدا. بە ڕاستی زۆر قورسە بۆیان ڕێدەی ئەوە بکەن کە ئەو کەسە سادە و بێ زیانەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن لەهەمان کاتدا خەریکی شتێکی تر بێت. چەندەی دوکەڵەکەت یەکڕەنگ و چڕتر بێت، ئەوەندە باشتر مەبەستەکانت دەشاردرێنەوە. لە ئامرازەکانی گومڕاکردندا کە لە بەشی یەکەم باسمان کرد، تۆ بەشێوەیەکی چالاک هۆشی خەڵک پەرت دەکەیت. لە دروستکردنی تەمومژدا، تۆ قوربانییەکانت کپ دەکەیت، بەرەو ناو تۆڕەکەت ڕایدەکێشیت. لەبەرئەوەی ئەمە زۆر هیپنۆتیکە، زۆرجار ئەمە باشترین ڕێگای شاردنەوەی نیازەکانتە

سادەترین فۆرمی چڕە دوکەڵ بریتییە لە گوزارشتی ڕوخسار. لەپشت ڕواڵەتێکی سادەی دەرەوە، دەشێ هەموو جۆرە پلانی هەموو جۆرە پەشێوییەک دابڕێژرێت، بەبێ ئەوەی پێی بزانرێت. ئەمە چەکێکە کە بەهێزترین پیاوان لە مێژوودا پراوەیان کردووە. دەڵێن کەس نەیدەتوانی ڕوخساری فرانکلین دی ڕوزڤێلت بخوێنێتەوە. بارۆن جەیمز ڕۆسچیلد بەدرێژایی تەمەنی لە پشت برە سادەکانی و سەرنجە بەهۆبراوەکانییەوە پراوەی ڕووپۆشکردنی بیرکردنەوە ڕاستەقینەکانی کرد. ستەندێل لەبارەی تالیراندەوە نووسی "ڕوخسارێکی هەبوو قەت هیچی لە بارۆمەترێک کەمتر نەبوو" هێنری کیسنجەر بە دەنگە یەکنەوەییەکەی، سەرنجە بەهۆبراوەکانی، چوونە ناو وردەکاریی بێ کۆتاوە، نەیارەکانی لە دەوری مێزی دانوستان دادەهێیراند، پاشان لەکاتێکدا کە چاوەکانیان دادەکەوت، بەپڕێکدا لیستێکی سەخت و مەرجی ئەرانانەی ئەخستە بەردەمیان بەبەرئەوەی

دەبەخشرێن، بەئاسانی ترسیان لێ دەبێت. هەروەک یەکێک لە ڕێبەرەکانی باری پزکار ڕووی دەکاتەوە "لەکاتێکدا کە یاریزانی باش دەستی لەیاریدایە بە دەگمەن ئەکتەرێک لەبری ئەمە، پڕاوەی ڕەفتارێکی سادە دەکات کە ڕێساکانی خوێندنەوەی کەم دەکاتەوە، بەیارەکانی نائومێد و سەرگەردان دەکات، ڕێگەی تەرکیزێکی زیاتر بۆ خۆی خۆش دەکات".

مووکاڵ و تەمومژ کە چەمکێکە قابیلی گۆڕینبادنە، دەشێ لە چەند ئاستێکدا پڕاوە بکرێت، هەموویان لەسەر پرەنسیپە سایکۆلۆژییەکانی هۆش پەرتکردن و ڕێگە لێ وەکردنی یاری دەکەن. یەکێک لە تەمومژە هەرە کاریگەرەکان بریتییە لە ئاماژەی *بەڕێزانە*. خەڵکی دەیانەوێت بڕوا بکەن بەوەی کە ئاماژە بەڕێزەکان ڕاستەقینەن، چونکە وەرگرتنی خۆشە. ئەوان بە دەگمەن تێبینی ئەوە دەکەن کە ئەم ئاماژانە دەشێ چەندێک فریودەر بن.

جاریکیان مامەڵەکاری هونەری، جۆزێف دوڤین ڕووبەڕووی کێشەیەکی سەخت بووەوە. ئەو ملیۆنەرەی پارەیەکی زۆری دابوو بە تابلۆکانی دوڤین پاشانی دیوای نەمابوو بۆ هەڵواسینی تابلۆ و لەکاتێکیشدا کە باجی میرات بەرزتر دەبووەوە، پێدەچوو چیتر بکڕن. چارەسەر بریتی بوو لە گەلەری نیشتمانی هونەر لە واشنتن دی.سی کە دوڤین یارمەتیدەر بوو لە دروستکردنی لە ١٩٣٧دا لە ڕێگەی ئەندرو میلۆنەوە کە کۆمەڵێیە هونەرییەکەی خۆی پێشکەش کرد. گەلەری نیشتمانی ڕووپۆشێکی کامڵ بوو بۆ دوڤین. بە ئاماژەیەک کریارەکانی خۆیان لە باج لادا، پاشانیش لەسەر دیوارەکە بۆ کڕینی نوێ دابین کرد و ژمارەی تابلۆکانیان لە بازاڕ کەم کردەوە و لێرەوە فشارێکیان لەسەرنرخەکانیان دروستکرد. هەموو ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە هەموو کۆمەک بەخشەکان ڕواڵەتی ئەوەیان پیشاندا کە کۆمەک بەخشی گشتین.

تەمومژێکی کاریگەری تر بریتییە لە ڕێسا، واتە نوێبادانی زنجیرەیەک کردار کە قوربانی فریو دەدەن تا بڕوا بێنێت بەوەی تۆ بەهەمان شێوە بەردەوام دەبیت. ڕێساکە

یاری بەسەر سایکۆلۆژیای چاوەڕوانی دەکات. ڕەفتاری ئێمە لەگەڵ ڕیساکاندا مەبایە، دی ئێمە هەر دەکەین وا بیر بکەینەوە کە ئەمایە

بە ساڵی ١٨٧٨دا ئالانکەری ئەمریکی، ماری جەی گۆد کۆمپانیایەکی دروستکرد کە مۆنۆپۆلی کۆمپانیای تەلەگرافی ویستەرن یونیەنی حستە بەر هەڕەشە. بەڕێوەبەرانی ویستەرن یونیەن بڕیاریاندا کۆمپانیای گۆد بکڕنەوە- ئەوان دەبوایە بڕەپارەیەکی زۆر خەرج بکەن، بەڵام وای بۆچوون کە حزیان لە ڕکابەرێکی هەراسانکەر قوتار کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا، چەند مانگێک دواتر گۆد جارێکی تر کەوتەوە جۆ، سکاڵای ئەوەی کرد کە بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە مامەڵەی لەگەڵدا کراوە. ئەو کۆمپانیای دووەمی خستەگەڕ بۆئەوەی ڕکابەریی لەگەڵ ویستەرن یونیەن و ئەو مولکەی تازە کڕیبوویەتی بکات. هەمان شت جارێکی تر ڕوویدایەوە. ویستەرن یونیەن ئەویشی کڕیەوە بۆئەوەی بێدەنگی بکات. بەرەو ڕێساکە بۆ جاری سێیەم شوێنی خۆی گرت، بەڵام ئێستا گۆد بو خاڵێکی لاوار چوو. ئەو بەپرێکدا ململانێیەکی توندی خستەگەڕ و کۆنترۆڵی ئەوروی ویستەرن یونیەنی گرتە دەست. ئەو ڕێسایەکی بونیاد نابوو، مثلی ئەوەی لە بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکە کردبوو کە پێیان وابێت ئامانجی گۆد ئەوەیە بە نرخێکی بەرچوو بیکڕنەوە کاتێک پارەکەیان پێدا، ئاسودە بوون و بەپاڵنوولی تێنیبی ئەوە بکەن کە لەڕاستیدا ئەو بۆ نرخی بەرزتر یاری دەکات. ڕێساکە لەوەدا بەهێزە کە کەسەکەی تر فریوی ئەوە دەخوات کە پێشبینی پێچەوانەی کردارە وەقعییەکەی تۆ دەکات

لاوازییەکی سایکۆلۆژیی تر بۆ ئەوەی تەمومژی لەسەر بونیاد بنێیت هەیە بو تێکەڵکردنی ڕواڵەت و واقیع- هەستکردن بەوەی کە ئەگەر وا دیار بێت کەسێک سەر بە گروپەکەیە، ئەو بە ڕاستی سەر بەو گروپەیە. ئەم جۆرە تێکەڵە بەرازەکە دەکاتە ڕووپۆشێکی کاریگەر. فێڵەکە سادەیە. تو بەشێوەیەکی سادە خوت تێکەڵی ئەوانەی دەوروبەرت دەکەیت. چەندەی باشتر تێکەڵ بیت، ئەوەندە کەمتر گومانبەر دەبیت لەماوەی جەنگی ساردی ١٩٥٠کان و ١٩٦٠کاندا، کە ئێستا بەناوە، گروپێکی کارمەندانی حکومی بریتانی مەبیمییان دایە سۆڤیەتەکان. ئەوان بو چەند ساڵێک پیشی ئەزانرا چونکە

لە ڕووکەشدا کەسانی شایستە بوون، قوتابخانەی مەناویانگیان تەواو کردبوو و لەگەڵ توێژی خوێندکارەکانی پێشوودا باش دەهاتنەوە. خۆتێکەڵ کردن تەمێکی گومانە و سیحری. چەندەی باشتر بیکەیت، ئەوەندە باشتر دەتوانیت نیازەکانت بشاریتەوە.

بیرت بێت: تەحەمول و سادەیی پێویست بۆ لێکردنی ڕەنگە درەوشاوەکان، بۆ دانانی دەمامکی تەمومژ. نائومێد مەبە لە پێویستیی دانانی دەمامکێکی وەها لێڵ- زۆرجار ئەوە تەمومژاوییەی تۆیە کە خەڵکی بەرەو تۆ ڕادەکێشێت و وات لێدەکات وەکو دەسەڵاتدارێک دەربکەویت.

## وێنە: پێستی مەڕ

مەڕ هەرگیز ڕیان ناگەیەنێت، مەڕ هەرگیز فریو نادات، مەڕ هەتا ملێی گێژ و دەستەمۆیە. ڕێوی بە لە خۆوەرگرتنی پێستی مەڕ دەتوانێ ڕاستەوخۆ بچێتە ناو کوخی مریشک.

دەسەڵات: ئایا تا ئێستا هیچت لەبارەی ئەو ژەنەراڵە لێهاتووە بیستووە کە بیاری وایە بە ڕاگەیاندنی پلانەکەی بۆ دوژمنەکەی قەڵایەک تووشی سەرسوڕمان بکات؟ ئامانجی خۆت بشارەوە و بەرەوپێشچوونەکەت داپۆشە. ڕووبەری دیراییەکانت دەرمەخە تا ئەو کاتەی کە ئەوان ناتوانن ڕووبەڕووی ببنەوە، تا ئەو کاتەی کە شەڕ تێپەڕیووە پێش ئەوەی جەنگ ڕابگەیەنێت سەرکەوتن بەدەست بێنە. بە کورتی، لاسایی ئەو خەڵکە شەڕانگێزە بکەرەوە کە دیراییەکانیان نەزانراون جگە لە ڕێگەی ئەو وڵاتە کاولبووەوە کە ئەوانی پیادا ڕەت بوون.

(نینۆن دو لونکلۆس ١٦٢٣-١٧٠٦)

## پێچەوانەبوونەوە

هیچ تەمومژێک، گومڕاکەرێک، سەرڕاستییەکی ساختە، یان ئامرازی تری بەلاڕێدابردن سەرکەوتوو نابێت لە شاردنەوەی نیازەکانت ئەگەر هەموکە ناوبانگێکی ڕەگداکوتاوت

نەبێت بۆ فریودانی لەکاتێکیشدا کە تۆ بەتەمەندا دەچیت و سەرکەوتن بەدەست دێنیت، پەیتا پەیتا قورستر دەبێت کە لێزانییەکەت ڕووپۆش بکەیت. هەمووان دەزانن تۆ پرارەی فریودان دەکەیت. ئەگەر بەردەوام بیت لەوەی ساویلکە بنوێنیت و سەرکێشی بەوە بکەیت کە دڕێوترین دووڕوویت، ئەوا بواری مانۆڕکردنت بەتوندی سنووردار دەکەیت. بەم حاڵەتانەدا باشترە دڵ سپی بیت، وەکو مافۆڵایەکی ڕاستگۆ دەرکەویت، یان، باشتر، ناسەرڕستێکی پەشیمان دەرکەویت. نەک تەنیا لەبەرامبەر ڕاشکاوییەکەتدا ڕێزت لێ دەنرێت، بەڵکو لەهەموویشی نامانتر و سەیرتر، دەتوانیت بەردەوام بیت لە ستراتیژەکانت.

لەکاتێکدا کە (پی.تی.بارنوم)، پاشای لەخشتەبردن، بەتەمەنداچوو، هێزی ئەوە بوو ناوبانگەکەی وەکو لەخشتەبەری گەورە قبوڵ بکات. جارێکیان ئەو ڕاوێکی گای لە نیوجێرسی ڕێکخست، لەگەڵ هیندییەکان و چەند گایەکی هاوردەکراودا بوو. ئەو وەکو شتێکی ڕاستەقینە بانگەشەی بۆ ڕاوەکە کرد، بەڵام دەرکەوت کە بەتەواوی ساختەیە و حەشامەتەکە، لەبری ئەوەی تووڕە بن و داوای پارەکەیان بکەنەوە، پێکەنینیان بە نوکتەکە هات. ئەوان دەیانزانی بارنوم هەر حەیکی فێڵ و تەڵەکەیە. ئەمەش نهێنی سەرکەوتنی ئەو بوو و ئەوان بۆ ئەمە خۆشیان دەویست. بە فێربوونی وانەیەک لەم کردارە، بارنوم چیتر هەموو ئامرازەکانی نەشاردەوە، تەنانەت فریوەکانی بە ئۆتۆبایۆگرافییەکی ئاشکرادا بڵاو کردەوە. هەروەک کیرکەگارد نووسی "جیهان دەیەوێت بەخشتە ببردرێت"

دواجار، هەرچەندە وەها زیرەکانەیە خۆشی خەڵک بە مەبەستەکانت پەرت بکەیت بەوەی بەخوێندراوە دیار بیت، پواڵەتێکی ئاشنا بەدەستەوە بدەیت. هەندێ جاریش هەیە کە ئامازەیەکی ڕەنگاوڕەنگ و ڕووی تاکتیکێکی بەلاڕێدانەری دروستە. شارلاتانە گەورەکانی سەدەی حەڤدە و هەژدەی ئەوروپا گاڵتە و گەپ و سەرگەرمییان بۆ فریودانی تەماشاکەرەکانیان بەکاردەهێنا. خەڵکی کە بە نمایشە گەورەکە شاگەشکە دەبوون، تێبینی ئەو پرسەهیەکانی شارلاتانەکانیان نەدەکرد. لێرەوە شارلاتانە ئەستێرەکە

حۆی لە داشقەیەکی ڕەش لە ناو شاردا دەردەکەوت. قۆشمەچییەکان، پێکەرەکانی سەر پەت و سەرگەرمکەرانی بەناوبانگ هاوەڵییان دەکرد، خەڵکیان بەرەو نمایشەکانی ئێکسیر و مەعجونی شارلاتی ڕادەکێشا. شارلاتییەکە وایدەکرد سەرگەرمییەکە وەکو کارێکی ڕۆژانە دیار بێت. کارەکەی ڕۆژانە لە ڕاستیدا فرۆشتنی ئەلیکسیر و مەعجونی شارلاتی بوو.

نمایش و سەرگەرمی، بە ڕووپی ئامرازی ڕووپن بۆ شاردنەوەی مبارەکانت، بەڵام ناکرێ ئەمانە بەشێوەیەکی بێ چەندوچوون بەکار بهێنرێن. خەڵکی بێتاقەت و بەگومان دەبن و سەرەنجام بە فێڵەکە دەزانن. لە ڕاستیشدا دەبووایە شارلاتییەکان لەشارۆچکەیەکەوە بەرەو شارۆچکەیەکی تر بڕۆن، پێش ئەوەی قسەی ئەوە بڵاو بێتەوە کە مەعجونەکە بێ کەڵکە و سەرگەرمییەکە فێڵێکە. لەلایەکی ترەوە، خەڵکی بەهێز بە ڕواڵەتی بەخوێندراوەوە– تالیراندەکان، ڕۆسپیلدەکان، سێلاسییەکان– دەتووانن ئەمەمان شوێند و بەدرێژایی تەمەنیان پەردەی فریوەکانیان بکەن. کردارەکەی ئەوان قەت ناژاکێت و بە دەگمەن گومان دەخاتەوە. ئەو کاتە دەبێ تەمومژی ڕەنگاوڕەنگ وریایانە بەکاربێت، واتە ئەو کاتەی کە بۆنەکە یان بۆچەکە گومحاوە

*ئەمە بەو مانایەیە کە پەرژینێک دروست بکەیت کە نواجار دەکەوێتە ژێر کاریگەریی هەرایەک یان دیمەنێکی ئاشنا، لەولەیە ستراتیژدانەر بەشێوەیەکی بەبیرار تیایدا مانۆر بکات لەکاتێکدا کە هەموو چاوەکان وەها ڕاهێنابان پێکراوە شتە ئاشنا ببینن و ئاشکراکان ببینن*

(توماس کلبەری)

## یاسای ژمارە ٤

# هەمیشە کەمتر لەوەی پێویستە بڵێ

### حوکم

*کاتێک تۆ هەوڵ دەدەیت بە قسەکانت کاریگەری بخەیتە سەر خەڵکی، چەندەی زیاتر بڵێیت، ئەوەندە ئاساییتر دەردەکەویت و کەمتر زاڵ دەبیت. تەنانەت ئەگەر شتێکی سواویش بڵێیت ئەوا ڕەسەن دیار دەبێت ئەگەر تەمومژاوی و ئاڵۆزی بکەیت. خەڵکی بەهێز بە قسەی کەمتر، کاریگەری و ترس دروست دەکەن. چەندەی زۆرتر بڵێیت ئەوەندە ئەگەری زیاترە کە شتێکی گەمژانە بڵێیت*

### سەرپێچی لە یاساکە

نۆس مارکیوس، کە بە ( کۆریۆلانوس)یش ناسراوە، پاڵەوانێکی سەربازی مەزنی ڕۆمی دێرین بوو. لە نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا زۆر شەڕی گرنگی بردەوە و چەند جارێک شاری لە کارەسات دەرباز کرد. لەبەرئەوەی ئەو بەشی زۆری کاتەی لە شەڕگە بەسەر برد، ژمارەیەکی کەمی ڕۆمانەکان بەشێوەیەکی شەخسی دەیانناسی و ئەویش دەکردە شتێکی لەبابەت کەسێتی ئەفسانەیی

ن ٤٥٥ای پێش زایینیدا، کۆریۆلانوس بڕیاریدا کە کاتی ئەوە هاتووە ناوبانگەکەی بقۆزێتەوە و بچێتە بواری سیاسەتەوە. ئەو بۆ پلەی باڵای کۆنسول بەشداری هەڵبژاردنی کرد. کاندیدەکان بۆ ئەم پۆستە وەکو نەریت وابوو گشتییان لەسەرەتای پێشبڕکێکە پێشکەش کرد و کاتێک کۆریۆلانوس هاتە بەردەم خەڵک، دەستیکرد بە پیشاندانی ژمارەیەک لەو جێ برینانەی کە بەدرێژایی حەڤدە ساڵ لەسەر جەستەی دروست ببوون بە ئەنجامی شەڕکردن لەپێناو ڕۆمدا. لەکاتێکدا کە ژمارەیەکی کەمی ناو حەشامەتەکە گوێبیستی ئەو وتارە درێژە بوون کە بەدوای ئەم پیشاندانەدا هات، ئەو جێ برینانە، کە بەڵگەی بوێری و نیشتمانپەروەری بوون، خەڵکیان بزواند و هێندەیان گریان پێدەچوو هەڵبژاردنی کۆریۆلانوس حەتمی بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێک ڕۆژی هەڵبژاردن هات، کۆریۆلانوس چووە ناو کۆبوونەوەکە لەکاتێکدا کە تەواوی ئەنجومەنی پیران و خانەدانی شاری بەدواوە بوو. خەڵکی ئاسایی کە ئەمەیان بینی، بەم نمایشە خۆبەزلزانانەیەی بەرابەرخۆبوون لە ڕۆژی هەڵبژاردنی هەراسان بوون.

پاشان کۆریۆلانوس دەستیکردەوە بە قسەکردن، بەشی زۆری قسەکانیشی بۆ هاوڵاتیە دەوڵەمەندانە بوو کە لەگەڵیدا بوون. قسەکانی ڕەق و لووتبەرزانە بوون. ئەو کە دەنگەکەی سەرکەوتنی دڵنیای دەکرد لە دەنگداندا، شانازی بە دەستکەوتەکانی جەنگەوە دەکرد، نوکتەی زبری وەهای دەکردن کە تەنیا سەرسمی چەندەکانی ڕادەکێشا، تۆمەتی توڕانەی لەدژی نەیارەکانی دەخستەوە و باسی لە هێناسی دەوڵەمەندان دەکرد بۆ ڕۆم. ئەمجارە خەڵکی گوێیان هەڵخست. نرکیان بەوە نەکردبوو کە ئەم سەربازە ئەفسانەییە هەمان شێوە فشەکەریشە.

هەواڵی دووەم وتەی کۆریۆلانوس بەخێرایی بەناو ڕۆمدا بڵاو بووەوە و خەڵکی بە ژمارەی زۆر دەرکەوتن بۆئەوەی ئەوپەڕی هەوڵ بدەن تا ئەو دەرنەچێت. پاش ئەوەی لە هەڵبژاردن شکستی هێنا، کۆریۆلانوس بە دڵشکاوی گەڕایەوە شەڕگە و سوێندی خوارد تۆڵە لەو خەڵکە ڕەشۆکییە بکاتەوە کە لەدژی دەنگیاندابوو. چەند هەفتەیەک دواتر،

گەشتیەکی گەورەی پڕ لە دانەوێڵە گەیشتە ڕۆم. ئەنجومەنی پیران ئامادە بوو ئەم جۆرگە بە بەلاش بەسەر خەڵکدا دابەش بکات، بەلام ڕێک لەو کاتەدا کە ئامادەکارییان دەکرد بۆ دەنگدان لەسەر پرسەکە، کۆریۆلانوس لە شانۆیەکە دەرکەوت و چووە سەر سەکۆی ئەنجومەن. ئەو وتی، دابەشکردنەکە کاریگەری زیانبەخشی بۆ سەر شار دەبێت بەگشتی. پێدەچوو ژمارەیەک لە سیناتۆرەکان قەناعەتیان هاتبێت و دەنگدان بۆ دابەشکردن گومانی تێکەوت. کۆریۆلانوس لەوێ نەوەستا. ئەو خودی چەمکی دیموکراسی ئیدانە کرد. ئەو پشتگیری قرتاربوون لە نوێنەرانی خەڵک–تریبیونەکان– و سپاردنی حوکمڕانی شاری بە خانەدانەکان کرد.

کاتێک دەنگوباسی دوایین قسەکانی کۆریۆلانوس گەیشتە خەڵک، توڕەییەکەیان لە سنوور تێپەڕی. تریبیونەکان نێردرانە ئەنجومەنی پیران بۆ ئەوەی داوا بکەن تا کۆریۆلانوس لەبەردەمیاندا ئامادە ببێت. ئەو ڕەتیکردەوە. ئاژاوە لەسەرانسەری شار هەڵایسا. ئەنجومەنی پیران، لە ترسی توڕەیی خەڵک، بۆ دواجار لە بەرژەوەندی دابەشکردنی دانەوێڵەکە دەنگیاندا. تریبیونەکان ئارامکران بەلام خەڵکی هێشتا داوایان دەکرد کۆریۆلانوس قسەیان بۆ بکات و داوای لێبووردن بکات. ئەگەر ئەو تۆبەی بکردایە و ڕای بووایە لەسەر ئەوەی قسەکانی بۆ خۆی هەڵگرێت، ئەوا ڕێگەی دەدرا بگەڕێتەوە بۆ شەڕگە.

کۆریۆلانوس بۆ دواجار لەبەردەم خەڵکدا دەرکەوت و ئەوانیش لە بێدەنگییەکی تەواودا گوێیان بۆ هەڵخست. ئەو لەسەرخۆ و بە نەرمی دەستیپێکرد، بەلام لەکاتێکدا کە لە قسەکانی بەردەوام بوو، زیاتر و زیاتر قسەکانی ڕەق بوون. لەگەڵ ئەوەشدا جارێکی تر دەستیکردەوە بە شکاندن' بۆنی دەنگی ڕەق بوو، دەربڕین و گوزارشتی سووکبینانە بوو. چەندەی زیاتر قسەی کرد، ئەوەندە زیاتر خەڵکی توڕە کرد. لە کۆتاییدا بە هاوار لێکردن هێنایانە خوارەوە و بێدەنگیان کرد

تریبیونەکان بیروڕایان ئاڵوگۆڕ کرد و حوکمی مەرگیان بەسەر کۆریۆلانوس دادا و فەرمانیان بە دادوەرەکان کرد کە دەستبەجێ ببەنە سەر تروپکی شاخی (تارپیان) و

پاڵی پێوە نسە خوارەوە. هەشاماتی دڵشاد پشتگیریی بڕیارەکەیان کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، حەیەدڵەکان دەستیان تێوەردا و جووڵەکە گۆڕی بۆ دووبەستنەوەی ئاسایی. کاتێک خەڵکی ترێن دەرکەوت گەورە پاڵەوانی سوپای ڕۆم قەت نەگەڕێنەوە شار، ئاهەنگیان لەسەر شەقامەکان گێڕا. لە ڕاستیدا کەس ئاهەنگێکی لەو شێوەیەی نەدیبوو، تەنانەت پاش شکستهێنانی دوژمنێکی ناپاکیش.

## لێکدانەوە

پێش ئەوەی بچێتە ناو سیاسەتەوە، ناوی کۆریۆلانوس ساسی هەبوو. دەستکەوتە سەربازییەکانی، ئەویان وەکو پیاوێکی ئازایەتییەکی مەزن پیشاند. لەبەرئەوەی هاوڵاتیان شتێکی کەمیان لەبارەیەوە دەزانی، هەموو جۆرە ئەفسانەیەک درایە پاڵ ناوەکەی. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ساتەی کە لەبەردەم هاوڵاتیانی ڕۆمدا دەرکەوت و قسەی ناو دڵی خۆی کرد، هەموو مەزنییەتی و شکۆیەکەی لەناوچوو. ئەو وەکو سەربازێکی ئاسایی شاناری کرد و قسەی کرد. ئەو خەڵکی شکاند و توڕەیی تێگرتن، وەک بڵێی هەست بە هەڕەشە و نائەمنی دەکات. لە بڕێکدا ئەو کەسە نەبوو کە خەڵک وێنەی دەکرد. جیاوازییەکەی نێوان ئەفسانە و واقیع ئەوەڵ نائومێدبەخش بوو بۆ ئەوانەی کە دەیانویست ناوەڕ بە پاڵەوانەکەیان بێنن. چەندەی کۆریۆلانوس زیاتر قسەی کرد، ئەوەندە لاوازتر دەرکەوت– کەسێک کە ناتوانێت قسەکانی کۆنترۆڵ بکات پیشانی دەدات کە ناتوانێت خۆی کۆنترۆڵ بکات و شایستەی ڕێز نییە.

ئەگەر کۆریۆلانوس کەمتر دوابایە، خەڵکی قەت هیچ پاڵنەرێکیان نەدەبوو بۆئەوەی هەست بکەن شکێنراون یان هەستیان بریندار کراوە، قەت هەستە ڕاستەقینەکەی ئەویان نەدەزانی. ئەو سەنگە نەهێزەکەی دەمایەوە، نەیڵیبیەوە نە کونسوڵ هەڵدەبژێردرا و دەیتوانی ئامانجە دژە دیموکراتییەکانی بەدی بێنێت. بەڵام زمانی مرۆڤ دڕندەیەکە کە ژمارەیەکی کەمی خەڵک دەتوانن بەسەریدا زاڵ بن؛ بە بەردەوامی قەفەسەکەی دەشکێنێت و لێی دەردەچێت و ئەگەر دەستەمۆ نەکرێت شێتگیر دەبێت و دەبێتە مایەی

هەفەت بۆت دەسەڵات ناتوانێت بەکەڵک بێت بۆ ئەوانەی کە گەنجینەی وشەیان بەفیڕۆ دەدەن

گوێچکە ماسییەکان ئەو کاتەی مانگ پڕە بەتەواوی دەکرێنەوە و کاتێک قرژاڵ دانەیەکی وەها دەبینێت بەردێک یان پارچە قەوزەیەک هەڵدەداتە ناوی و ئیتر گوێچکە ماسییەکە ناتوانێ جارێکی تر داخرێتەوە بۆیە دەبێتە ژەمە گۆشتێکی قرژاڵەکە. ئەمەیە چارەنووسی کەسێک کە زۆر دەمی دەکاتەوە و لێرەوە خۆی دەخاتە بەر بەرەیی گوێگرەکەی.

*لیۆناردۆ داڤینشی، قیبیسیا، (١٤٥٢-١٥١٩)*

## پەیڕەویکردن لە پاساکە

لە دەربەری لویسی شانزەدا، خانەدان وەزیرەکانی پاڵ و شەوریان بە باس و دیبەیتی پرسەکانی دەوڵەتەوە بەسەر دەبرد. ئەوان هاوپەیمانییان پشتیوانییان دەکرد، مشتومڕیان دەکرد هاوپەیمانییان دەبەست و دەشکاند، دیسان مشتومڕیان دەکردەوە، تا دواجار ساتەوەختە گرنگەکە دەگەیشت. دووانیان هەڵدەبژێردران بۆ نوێنەرایەتیکردنی دوو لایەنی جیاواز بەرامبەر خودی لویس کە ئەم لای خۆیەوە بڕیاری دەدا چی بکرێت. پاش ئەوەی ئەم کەسانە هەڵدەبژێردران، هەر کەسە کەمێکی تریش مشتومڕی دەکرد: دەبێ پرسەکان چۆن دەربڕدرێن؟ چ شتێک لویس بەکێش دەکات، چ شتێک هەراسانی دەکات؟ دەبێ لە چ کاتێکی ڕۆژەکەدا لێی نزیک ببینەوە و لە چ شوێنێکی کۆشکی ڤێرسای ئەمە ڕوودەدات؟ چ گوزارشتێکیان لەسەر ڕوخساریان بێت؟

دواتر، پاش ئەوەی هەموو شتێک یەکلا بووەوە، دواجار ساتەوەختی چارەنووسساز دەگەیشت. دوو پیاوەکە لە لویس نزیک دەبوونەوە – هەمیشەش بابەتێکی ناسک بوو – و کاتێک بۆ دواجار گوێی بۆ هەڵدەخستن، باسی پرسی هەبوکەییی دەکرد و بژاردەکانییان دەخستەڕوو

لویس کە گوزارشتێکی ئاڵۆز لەسەر ڕوخساری بوو، بە بێدەنگی گوێی دەگرت. لە کۆتاییدا، کاتێک هەر کامێکیان قسەکانی تەواو بکردایە و داوای بۆچوونی پاشای بکردایە، دەیڕوانییە هەردووکیان و دەیگوت، "نا نازانم چۆن دەبێ" ئینجا دەڕۆیشت

کاتێک ئەو دەگەیشتە بڕیار و کردار، وەزیرەکان و دەرباریەکان قەت گوێبیستی قسەیەکی تر لەسەر بابەتەکە نەدەبوونەوە- ئەوان، چەند هەفتەیەک دواتر تەنیا ئەنجامەکەیان دەبینی. ئەو قەت خۆی نەوەوە ماندوو نەدەکرد جارێکی تر لەسەر بابەتە ڕاوێژیان لەگەڵ بکاتەوە.

## لێکدانەوە

لویسی شازدە پیاوی چەند قسەیەک بوو. بەناوبانگترین قسەی ئەو دریژی بوو لە ("من دەوڵەتم"). لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێک لەم قسەیە جەوهەریتر و ڕەوانتر نەبوو. قسە بەدناوەکەی، "نا نازانم چۆن دەبێت" یەکێک بوو لە دەستەواژە هەرە کورتەکانی کە بەسەر هەموو شێوازەکانی داواکردندا پیادەی دەکرد

لویس هەمیشە بەم شێوازە نەبوو. کاتێک پیاوێکی گەنج بوو بە قسە و وتەی درێژ ناسرابوو و بە ڕەوانبێژییەکەی دڵخۆش بوو. کپی و بێدەنگییەکەی دواتری دەستکردی خۆی بوو و کردارێک، ماسکێک بوو کە بەکاریدەهێنا بۆ ئەوەی هەموو ئەوانەی ژێر خۆی بە ناهاوسەنگی بهێڵێتەوە. کەس نەیدەزانی هەڵوێستی چۆنە، یان پێشبینی کاردانەوەکانیان نەدەکرد. کەس نەیدەتوانی هەوڵ بدات فریوی بدات بەوەی ئەو شتە بڵێن کە ئەوان پێیان وابوو دەیەوێ گوێبیستی بێت، چونکە کەس نەیدەزانی دەیەوێ گوێی لە چی بێت. لەکاتێکدا کە قسەیان بۆ لویسی بێدەنگ دەکرد، زیاتر و زیاتریان لەبارەی خۆیانەوە ئاشکرا دەکرد، زانیارییەک کە ئەو دواتر لە دژی ئەوان و بە کاریگەرییەکی گەورە بەکاری دەهێنایەوە

لە کۆتاییدا، بێدەنگییەکەی لویس ئەوانەی دەوروبەری خۆی بە ترسیوی و لەژێر چەپۆکی خۆیدا هێشتەوە. ئەمە یەکێک بوو لە بناغەکانی دەسەڵاتەکەی. هەروەک سان

سپەرتەی نووسی "کاتێک ئەوەندەی ئەو باش نەیدەزانی کە چۆن قسەکانی، مردەکەی، تەنانەت سەرنجەکەی ساغ بکاتەوە هەموو شتێک لەویدا بەنرخ بوو چونکە ئەو جیاوازییەکانی دروستکرد و حاوەی شکۆ بە دەگمەنیی قسەکان دەهێنا بوو"

*تەنانەت بۆ وەزیرێک زیاتر بەخشەرە کە شتی کەمتر بڵێت لەوەی کە بیانکات*

*کاردینال دی ریتز (١٦١٣ - ١٦٧٩)*

## کلیلی دەسەلات

دەسەلات لە زۆر ڕووەوە گەمەیەکی ڕواڵەتکانە و کاتێک تۆ قسەی کەمتر لە پێویست دەکەیت، ئەوا بەشێوەیەکی حەتمی گەورەتر و بەهێزتر دەوەی کە هەیت دەردەکەویت بێدەنگیی تۆ، خەڵکی ناناسوودە دەکات. مرۆڤەکان ماکینەی لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەن دەبێ ئەوان بزانن بیر لە چی دەکەیتەوە. کاتێک تۆ بەشێوەیەکی وریایانە ئەو شتە کۆنترۆڵ دەکەیت کە دەریدەخەیت، ئەوا ناتوانن درز بکەنە ناو نیازەکانت یان مانای مەباکەت

بێدەنگی و وەڵامە کورتەکانی تۆ ئەوان دەخاتە حاڵەتی بەرگرییەوە و ئەوان بەشێوەیەکی بێگەران بۆ پڕکردنەوەی بێدەنگییەکە بە جۆرەها قسە کە زانیاری بەنرخ دەربارەی خۆیان و خاڵی لاوازییانەوە دەردەخات، دەمیان دەکەنەوە. ئەوان بە هەستێکی وەها وەک بڵێی گیرفانیان بڕدراوە لەگەڵ تۆدا دانیشتنەکە جێ دەهێڵن و دەچنە ماڵەوە و بیر لە یەک بە یەکی وشەکانت دەکەنەوە. ئەم بایەخدانە زیادەیە بە قسە کورتەکانی تۆ تەنیا دەسەلاتی تۆ زیاد دەکات

ئاندی وارهۆل کاتێک هونەرمەندێکی گەنج بوو وای بەشێوەیەکی گشتی ئەستەمە بە قسە وا لە خەڵکی بکەیت شتێ بکەن کە تۆ دەتەوێ بیکەن. ئەوان لە تۆ هەڵدەگەڕێنەوە، هیواکانت تێکدەدەن، لە کەللەڕەقی خۆیانەوە لاساریی بەرانبەر پیشان دەدەن

هاوڕێکانی ئەو بە هاوڕێیەکی وت "من بۆم دەرکەوتووە کە بۆ بە ڕاستی هێزێکی زیاتری هەیە کاتێک بێدەنگ دەبێت"

لە ژیانی دواتریدا، وارهۆڵ بە سەرکەوتنێکی گەورەوە ئەم ستراتیژییەی پەیڕەو کرد. گفتوگۆیەکانی پڕۆفە بوون لە بواری وتاری غەیبیدا. ئەو شتێکی تەمومژاوی و لێڵی دەوت و ئەنجامدەری گفتوگۆ پێچ و پەنای زۆری دەکرد بۆ تێگەیشتنی، وێنای ئەوەی دەکرد کە شتێکی قووڵ لەپشت ڕستە زۆرجار بێ ماناکانیەوە هەبێ. وارهۆڵ بەدەگمەن باسی کارەکەی دەکرد، وایدەکرد ئەوانیتر لێکدانەوەی بۆ بکەن. چەندەی کەمتر باسی کارەکەی بکردایە، ئەوەندە زۆرتر خەڵکی باسیان دەکرد. چەندەی زیاتریش قسەیان بکردایە، کارەکەی ئەوەندە بەهادارتر دەبوو.

ئەگەر کەمتر لەپێویست قسە بکەیت، ئەوا تۆ ڕواڵەتی مانا و دەسەڵات دروست دەکەیت. هەروەها، چەندەی کەمتر بڵێیت، ئەوا کەمتر سەرکێشی وتنی شتێکی گەمژانە، تەنانەت مەترسیدار، دەکەیت. لە ساڵی ١٨٢٥دا، تزارێکی نوێ، نیکۆلاسی یەکەم، لەسەر تەختی شاهانەی ڕووسیا دانیشت. دەستبەجێ یاخیگەرییەک بە ڕابەرایەتی ئەو لیبراڵانە هەڵگیرسا کە داوای مۆدێرنیزەکردنی وڵاتیان دەکرد – ئەمەی کە دەبێ پیشەسازییەکانی و ستروکتورە مەدەنییەکانی بگەنەوە بە ئەوروپا. بە تێکشکاندنی دڵڕەقانەی ئەم یاخیگەرییە (ڕاپەڕینی دیسەمبریست)، نیکۆلاسی یەکەم یەکێک لە ڕابەرەکانی، کۆندراتی ڕیلیف، بە مەرگ حوکم دا. لە ڕۆژی لەسێدارەدانەکەدا، ڕیلیف لەسەر سەکۆیەکە وەستا، پەتەکە لە ملی بوو. دەرچەکەی ژێر پێی کرایەوە – بەڵام هەر کە ڕیلیف هەڵواسرا پەتەکەش پچڕا و ئەو بەربووەوە سەر زەوی. لەو سەردەمەدا، ڕووداوەکانی وەکو ئەمە بە نیشانەی ئاسمانی یان ئیرادەی خودایی لەقەڵەم دەدران و ئەگەر کەسێک بەمشێوەیە ڕزگاری بووایە ئەوا دەبەخشرا. هەر کە ڕیلیف کەوتەوە سەر پێیانی، ڕوشاو و پیس بوو بەڵام هەر کە گەیشتە ئەو باوەڕەی ڕزگاری بووە، هاواری کردە جەماوەرەکە "دەبینن، لە ڕووسیا نازانن هیچ شتێک بە ڕێکوپێکی دروست بکەن، تەنانەت نازانن چۆن گوریسێکیش دروست بکەن!"

نامەبەرێك بەهیوایی بەهەواڵی شکستهێنانی لەسێدارەدانەکەوە چووە کۆشکی ڕستانە. نیکۆلاسی یەکەم بە بیستنی ئەم ڕووداوە ناتومێدبەخشە ناڕەحەت بوو لەگەڵ ئەوەشدا لێبووردنەکەی واژۆ کرد. بەڵام ئەو کاتەش تزار لە نامەبەرەکەی پرسی "ئایا ڕیلیێف پێش پەرچووەکە هیچی وت؟" نامەبەرەکە وتی "گەورەم، ئەو وتی لە ڕوسیا تەنانەت نازانن چۆن گوریسیش دروست بکەن"

تزار وتی "لەم حاڵەتەدا، با پێچەوانەکەی سەلمێنین"، و نیتر ئەو لێبووردننامەکەی دڕاند. ڕۆژی دواتر ڕیلیێف جارێکی تر هەڵواسرایەوە. ئەمجارە گوریسەکە نەپچڕا

وانەکە فێر بە: هەر کە قسە لە دەم دەرچوون، ناتوانیت بیانگەڕێنیتەوە. بیانخەرە ژێر کۆنترۆڵەوە. بەشێوەیەکی دیاریکراو لە تەنز و توانج ئاگادار بە. ئەو پەرەمەندییە کاتییەی بە تیز و توانجەکانت بەدەستی دێنیت دەکەوێتە ژێر قورسایی ئەو باجەی کە دەیدەیت

**وێنە. فاڵچییەکە لە دیلفی**

کاتێك سەردانکەران ڕاوێژیان بە فاڵچییەکە کرد، تەنها ئافرەتەکە چەند وشەیەکی ناڕوونی گۆ کرد کە پڕمانا و ڕوون دیار بوون. کەس لاری لە قسەکانی فاڵچییەکە نەکرد- ئەوان دەسەڵاتیان بەسەر ژیان و مەرگدا بەدەستەوە بوو

دەسەڵات. قەت لەپێش کەسانی پێگە نزمتر، دەست مەکە بە جوڵاندنی لێو و دانەکانت. چەندەی من بێدەنگتر بم، ئەوەندە زووتر ئەوانی تر لێو و دانەکانیان دەجوڵێنن بەکاتێکدا کە ئەوان لێو و دانەکانیان دەجوڵێنن لێرەوە دەتوانم مەبەستە ڕاستەقینەکانیان تێبگەم. ئەگەر پاشا پارنامێز نەبێ وەزیرەکان دەرفەت دەقۆزنەوە بۆ بەدەستهێنانی [illegible]

(هان فێی تزو، فەیلەسوفی چینی، سەدەی سێیەمی پێش زایین)

دەسەڵات. قەت دەست مەکە بە جوولاندنی لێوەکانت و ددانەکانت تا کەسێکی خوارەوەی تۆ ئەمە نەکات، چەندەی من زیاتر بە بێدەنگی بمێنمەوە، ئەوەندە زووتر ئەوانیتر لێوەکان و ددانەکانیان دەجوولێنن. هەر کە ئەوان لێوەکان و ددانەکانیان جوولاند، من لەرێوە دەتوانم مانا ڕاستەقینەکانیان تێبگەم. ئەگەر سەردار پاشا ڕازنامێز نەبێت، وەزیرەکان دەرفەت دەدۆزنەوە بۆ وەرگرتن و بەدەستهێنان (هان فەی تزو، فەیلەسوفی چینی، سەدەی سێیەمی پێش زایین)

## پێچەوانەبوونەوە

کات هەن تێیاندا زیرەکانە نییە بێدەنگ بیت. دەشێ بێدەنگی گومان و تەنانەت نائەمنی دروست بکات، بەتایبەت لە بەرپرس و گەورەکانتدا. دەشێ قسەیەکی ئەموموژاوی بەرامبەر ئەو لێکدانەوانە والا بکات کە چاوەڕێت نەدەکردن. ئەو کاتە دەبێ بێدەنگی و قسەی کەمتر لە پێویست بە وریاییەوە و بارودۆخی گونجاودا پراوە بکرێن. ناوبەناو ڕەها زیرەکانەترە کە لاسایی قۆشمەچییەکی دەربار بکەیتەوە کە وەک گەمژە ڕەفتار دەکات بەڵام دەشزانێت لە پاشا زیرەکترە. ئەو هەر قسە دەکات و قسە دەکات و چالاکی سەرگەرمی دەکات و کەس گومان لەوە ناکات کە ئەو لە تەنیا گەمژەیەک زیاترە.

هەروەها، دەشێ هەندێ جار قسەکان وەکو جۆرێک لە ئەموموژ بنوێنی بۆ هەر جۆرە فریودانێک کە دەشێ پراوەی بکەیت. بە گوێگرتنی گوێگرەکەت بە قسە، دەتوانیت هۆشی پارت بکەیت و جاسووی لێ بکەیت. لە ڕاستیدا چەندەی زۆرتر قسە بکەیت ئەوەندە کەمتر بەگومان دەبن لێت. قسەی زۆرتر وەکو فریو و بەکاربردنی وشە ناکرێن بەڵکو بە دەستەوەستانانە و ساویلکانە لەقەڵەم دەدرێن. ئەمە پێچەوانەی سیاسەتی بێدەنگییە کە لەلایەن نەهێزەوە دەکار دەکرێت: بە وتنی قسەی زۆرتر و خۆدەرخستنت بەشێوەیەکی لاواز و کەمتر هۆشمەند لە کەسی بەرامبەر، دەتوانیت ئاسانتر پراوەی فریودان بکەیت.

ماسکل ئارلتی سیمارپۆرۆس بەهێزی ڕەشی هۆی ئەرمۆری دەکرد، لە ساڵی ١٩٤٤دا چووە سەوبارك بۆ ئەوەی هەمەکانی بەهێلبت سەردانێکی پیستۆرانێش بەناوبانگی ٢١ی کرد. لە هۆڵی چاوەڕوانیدا ڕێکەوتی سام گۆڵدوینی کرد کە لای خۆیەوە ئامۆژگارییەکی ئەستەمی خستەڕوو و پێی وت دەبێ ئەسپی پێشبڕکێ بکڕێت لە بارەکەدا، ئارلتی چاوی بە لویس ب مایەر کەوت، کۆنە ئاشنایەك کە لێی پرسی ئاخۆ پلانەکانی بۆ ئایندە چین. ئارلتی وتی "تازە قسەم لەگەڵ سام گۆڵدوین دەکرد" مایەر قسەکانی پێ بڕی و وتی "چەندی ئەداتێ؟" ئەویش لە وەڵامدا وتی "زۆر نا" مایەر پرسی "باشە هەزار بۆ سێ هەفتە قبوڵ دەکەیت؟" ئەمجارە هیچ ڕاڕاییەك نەبوو ئارلتی وتی "بەڵێ"

(کتێبی قارەمی بچوکی قسە دەستەقەکان، کلیفتۆن فادیمان، ئێد)

جارێکیان کیسینجەر داوای ڕاپۆرتێکی کرد کە وینستۆن لۆرد چەند ڕۆژێك بوو ئیشی لەسەر دەکرد. پاش ئەوەی دای بە کیسینجەر، گەڕاندیەوە بۆی و ئەم تێبینییەی لەسەر نووسیبوو "ئایا ئەمە هەموو ئەوەیە کە لە توانای تۆدایە؟" لۆرد ڕاپۆرتەکەی داڕشتەوە، پۆلیشێکی کرد و دواجار ڕادەستی کردەوە و دیسان ڕووبەڕووی هەمان پرسیاری ڕەق بووەوە. پاش جارێکی تر داڕشتنەوەی- و جارێکی تر ڕووبەڕووی هەمان پرسیاری کیسینجەر بووەوە- لۆرد پەست بوو "بە نەفرەت بێت، بەڵێ ئەوە هەموو توانای منە" کیسینجەریش لە وەڵامدا نووسی "باشە، کەواتە پێم وایە ئەمجارە دەیخوێنمەوە"

کیسینجەر، والتەر ئیزاکسن ١٩٩٢

قسە نابەجێکانی ڕەعمەت زۆرجار ڕەگی قووڵتر دادەکوتێت لە بێدەوەرییەکانی کردارە خراپەکان. بێزلی (ئیسێکس) بە شازنە ئەلیزابێسی وت مەرجەکانت وەکو لاشەکەت چەماوەنەوە. بەڵام بەهۆی ئەم قسانەوە سەری خۆی دانا لەکاتێکدا کە یاخیبوونەکەی نەبووەهۆی ئەوەی هیچی بەسەر بێت.

سێر والتەر ڕالە (١٥٥٤ ١٦١٨)

## یاسای ژمارە ٥

# بەشی زۆری بەندە بە ناوبانگەوە- بە ژیانت پارێزگاری لێبکە

### دوکە

ناوبانگ بناغەی دەسەڵاتە. تەنیا لە ڕێگەی ناوبانگەوە دەتوانیت ترس دروست بکەیت و سەرکەوتوو بیت. لەگەڵ ئەوەشدا هەر کە بووشا ئەوا لە دۆخێکی ناسکدا دەبیت و لە هەموو لایەکەوە هێرشت دەکرێتە سەر. ناوبانگت قایم بکە، هەمیشە لەبەرانبەر هێرشە ئەگەرییەکاندا وریا بە و بەربەستیان بکە بەر لەوەی ڕووبدەن. لەهەمان کاتدا، فێربە دوژمنانت تێکبشکێنیت لە ڕێگەی دز تێخستنی ناوبانگیان. پاشان لەلاوە بوەستە و لێگەڕێ ڕای گشتی هەڵیانبواسێت

### پەیڕەویکردن لە یاساکە ١

لەماوەی جەنگی سێ مەملەکەتەکەی چیندا (٢٠٧-٢٦٥)، ژەنەراڵی مەزن چوکو لیانگ، ڕێبەرایەتی هێزەکانی مەملەکەتی (شو)ی دەکرد، سوپا گەورەکەی ئەوەو کەمپێکی دوور برد لەکاتێکدا کە ئەو لەگەڵ چەند سەربازێک لە شارۆچکەیەکی بچوکدا مایەوە. لەپڕێکدا ئێشکگرەکان بە هەواڵی ورپەیدانەوە هاتنە ژوورەوە، وتیان هێزێکی زیاتر لە ١٥٠،٠٠٠ سەرباز بە فەرماندەوایی (سیما یی) لە نزیکبوونەوەدان. تەنیا بە سەد

سەربازەوە بۆ بەرگریکردن لە خۆی، ناوبانگی چوکۆ لیانگ بێ ئومێد بوو. دواجار دوژمن ئەم سەرکردە بەناوبانگەی دەستگیر دەکرد.

بەبێ لۆمە کردنی چارەنووس یان بەفیڕۆدانی کات مەوەی کە بیر لەوە بکاتەوە چۆن بەسەریان دەداوە، لیانگ فەرمانی بە سەربازەکانیدا ئالاکانیان داگرن، دەروازەکان والا بکەن و خۆیان حەشار بدەن. پاشان ئەو خۆی لە دیارترین بەشی دیواری شارەکەدا دانیشت کە ڕۆبێکی تاویرمی لەبەردا بوو. ئەو هەندێ بخووری داگیرساند، عودەکەی ژەنی و دەستیکرد بە گۆرانی وتن. چەند خولەکێك دواتر بینی کە سوپا گەورەکە لە نزیکبوونەوەدایە، کە ڕەوەیەکی بێ کۆتای سەرباز بوو. لەکاتێکدا کە ئەو وادەریخست کە تێبینی ئەمە ناکات، بەردەوام بوو لە گۆرانی وتن و ژەنینی عودەکەی.

سوپاکە بەرووی گەیشتە دەروازەکانی شارەکە. لە پێشی پێشەوە (سیما یی) دیار بوو کە دەستبەجێ کابرای سەر دیوارەکەی ناسییەوە.

تەنانەت بەو شێوەیەش، لەکاتێکدا کە سەربازەکانی سەریان دەخورا لە ڕێگەی دەروزە والاکانەوە بچنە ناو شارۆچکە بێ پاسەوانەکە، سیما یی ڕاڕا بوو، ئەوانی کشاندە دواوە و لیانگی لەسەر دیوارەکە ئاروتۆی کرد. پاشان فەرمانی بە پاشەکشێیەکی خێرا و دەستبەجێ دا.

## لێکدانەوە

چوکۆ لیانگ بەشێوەیەکی ناو بە "ئەژدیها خەوتووەکە" دەناسرێ. جوڵەکانی ئەو لە جەنگی سێ مەملەکەتەکەدا ئەفسانەیی بوو. جارێکیان پیاوێك بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە سەرکردەیەکی ناپاکی دوژمن هاتۆتە کەمپەکەی، ئامادەیی بۆ یارمەتی و ڕابەری دەربڕیبوو. لیانگ دەستبەجێ درکی بەوە کردبوو کە ناردووەکە تەڵەیەکە. ئەم پیاوە بە درۆ فێرییەکی سوپایە و دەبێ سەری بپەڕێنرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، لەدوایین ساتدا، لەکاتێکدا کە خەریك بوو تەورەکە دادەبەزیە سەر ملی، لیانگ سەربەڕاندنەکەی وەستاند و ئامادەیی دەربڕی بۆ ئازادکردنی پیاوەکە ئەگەر ڕازی بێت ببێتە سیخوڕی دوو

پێویست ناکات بەڵام حاڵەتی هاوبەشیپێکردنی ناوبانگمان و بەخشینی نیعمەتی ناوبانگ بە کەسێکی تر دەگەیەنێ

(مۆنتانی ١٥٣٣-١٥٩٢)

## پەیڕەویکردن لە یاساکە ٢

لە ساڵی ١٨٤١دا، (پی تی بارنوم)ی گەنج هەوڵی دەدا ناوبانگی خۆی وەکو یەکەمین نمایشکەری ئەمریکی بونیاد بنێت، بڕیاریدا مۆزەخانەی ئەمریکی لە مانهەتن بکڕێت و بیکات بە شوێنێك بۆ کۆکردنەوەی کەرەستە سەیر و سەمەرەکان کە ناوبانگی زامن بکات. کێشەکە ئەوە بوو کە پارەی نەبوو. ئەو نرخەی مۆزەخانەکە داوای دەکرد ١٥,    دۆلار بوو، بەڵام بارنوم توانی پڕۆپۆزەڵێك پێکەوە بنێت کە خاوەنەکانی دامەزراوەکە بەکێش بکات ئەگەرچی ئەمە بووە هۆی ئەوەی چەند گەرەنتینامە و پشتگیرینامەیەك لە شوێنی پارەی کاش بگرنەوە. خاوەنەکان لەگەڵ بارنومدا گەیشتنە رێککەوتننامەیەکی زارەکی، بەڵام لە دوا ساتدا، شەریکە سجیبەییەکە رای خۆی گۆڕی و مۆزەخانە و کەرەستەکانی فرۆشران بە بەڕێوەبەرانی مۆزەخانەی (پیلس). بارنوم تووڕە بوو، بەڵام شەریکەکە رووبی کردەوە کە بزنس بزنسە— مۆزەخانە فرۆشرابوو بە پیلس چونکە پیلس ناوبانگی هەبوو و بارنوم نەیبوو

بارنوم دەستبەجێ بڕیاریدا کە ئەگەر ناوبانگی نەبێ تا پشتی پێ ببەستێ، تاکە رێگای ئەوە دەبوو ناوبانگی پیلس بڕووخێنێت. بەم پێیە ئەو دەستیدایە کەمپەینێکی نامەنووسین لە رۆژنامەکاندا، خاوەنەکانی بە کۆمەڵێك "بەڕێوەبەری تێکشکاوی بانك" ناوی بردن کە نازانن چۆن مۆزەخانەیەك بەڕێوە ببەن یان خەڵکی سەرگەرم بکەن. ئەو هۆشداریدایە خەڵکی لەدژی کڕینی پشکی پیلس، چونکە کڕینی مۆزەخانەیەکی تر لەلایەن کۆمپانیاکەوە دەبووە هۆی داتەپینی نرخەکەی. کەمپەینەکە کاریگەر بوو، نرخی پشکەکان دابەزی و ئەوەی کە خاوەنەکان چیتر بڕوایان نە پێکرد و ناوبانگی پیلس

نەبوو، خاوەنانی خورەخانەی ئەمریکا چوونەوە سەر مامەڵەی خۆیان و هەموو شتەکیان بە بارنوم فرۆشت.

چەند ساڵێکی پێنەچوو تا پیلس هاتەوە سەر پێکەی خۆی و بوژایەوە، و قەت ئەوەیان بیر نەچووەوە کە بارنوم کردی. بەڕێز پیلس خۆی بڕیاریدا بە دونیادنانی ناوبانگێک بۆ "سەرکەوتنی هەی مرۆ" هێرش بکاتە سەر بارنوم، بە ناونیشانی رابیستبوونی ریانو بە بەراورد بە ڕکابەرە بیسەمەکەی، بەرەوی بە پرۆگرامەکانی خورەخانەکەیدا جادووکردن (هیپنۆتیزم) یەکێک بوو لە ئامرازە بەکێشکەرە "ڕاستییەکان"ی پیلس و بۆ ماوەیەک هەشاماتێکی زۆری بەلای خۆیدا ڕاکێشا و تەواو سەرکەوتوو بوو. بۆ کاردانەوە، بارنوم بڕیاریدا، هێرش بکاتەوە سەر ناوبانگی پیلس

بارنوم ئەدایەکی جادوویی ڕکابەرانەی ڕێکخست کە تیایدا خۆی کچێکی بچکۆڵە بە ڕووکەش دەخاتە حاڵەتی بێهۆشییەوە. هەر کە کچەکە وەها دیار دەبوو کە تەواو بێهۆش بووە، بارنوم هەوڵی دەدا ئەنداماني ئامادەبوو هیپنۆتیزە بکات- بەڵام گرنگ نییە چەندێک سەخت هەوڵی دەدا، هیچ کام لە *تەماشاکەران* نەدەکەوتنە ژێر جادووەکەی و زۆرێکیان دەستیانکرد بە پێکەنین. دواجار بارنومی ئائومێد ڕایگەیاند کە بۆئەوەی بیسەلمێنێت بێهۆشیی کچە بچکۆڵەکە ڕاستییە، یەکێک لە پەنجەکانی دەقرتێنێ بێ ئەوەی خۆی پێ بزانێت. بەڵام لەکاتێکدا کە ئەو چەقۆیەکەی تیژ دەکرد، چاوەکانی کچەکە کرانەوە و ڕایکرد، ئەمەش دەبووە مایەی شادیی ئامادەبووان. ئەو ئەم کردارە و نواندنەکانی تری بۆ چەند هەفتەیەک چەندبارە دەکردەوە. بەرووبی هیچ کەسێک نمایشەکانی پیلسی بەجدی وەرنەدەگرت و ژمارەی ئامادەبووان زۆر کەمی کرد. لەماوەی چەند هەفتەیەکدا، نمایشەکە داخرا. بەدرێژایی چەند ساڵی دواتر، بارنوم ناوبانگێکی بۆ ئاریەتی و نمایشکاریی لێهاتوو دروستدا کە بەدرێژایی تەمەنی بەردەوام بوو. کەچی ناوبانگی پیلس قەت چاک نەبووەوە

## لێکدانەوە

بارنوم دوو تاکتیکی جیاوازی بەکارهێنا بۆ تێکدانی ناوبانگی پیلس. یەکەمیان سادە بوو: ئەو گومانی لەبارەی سەقامگیری و خاوەندارێتی مۆزەخانەکە پێشاندا. گومان چەکێکی بەهێزە. هەر کە تۆ پەیتا پەیتا دەنگۆیەکانت بڵاو کردەوە، نەیارەکانت لە تەنگژەیەکی کارەساتباردا دەبن. لەلایەکەوە دەتوانن نکوڵی لە دەنگۆیەکان بکەن، تەنانەت بیسەلمێنن کە تۆ ناوت زڕاندوون. بەڵام تۆزقاڵێکی گومان هەر دەمێنێت. بۆچی ئەوان وەها بە هەڵپەوە بەرگری لەخۆیان دەکەن؟ لەوانەیە دەنگۆیەکە حەقیقەتێکی تێدا بێت؟ لەلایەکی ترەوە، ئەگەر ئەوان ڕێگایەکە بگرن و فەرامۆشت بکەن، گومانەکان، بەهۆی پووچەڵ نەبوونەوە، بەهێزتریش دەبن. ئەگەر بە دروستی ئەنجام بدرێت، دەشێ تێچاندنی دەنگۆیەکان ئەوەندە تووڕەکەر و بێگەرانکەری ڕکابەرەکانت بن کە لە بەرگریکردنی خۆیاندا چەندەها هەڵە بکەن. ئەمە چەکێکی تەواوە بۆ ئەوەی کە ناوبانگیان نییە کاری تیا بکەن.

هەر کە بارنوم ناوبانگی خۆی هەبوو، دووەمین تاکتیکی نەرمی خۆی بەکار هێنا، وەک پێشاندانی هیپنۆتیزمی ساختە: ئەو ناوبانگی ڕکابەرەکانی بەگاڵتە وەرگرت. ئەمەش زۆر سەرکەوتوو بوو. هەر کە تۆ بنەمایەکی پتەوتی پێگەت هەبێت، بە سووککردنی نەیارەکەت هەم دەیخاتە هەڵوێستێکی بەرگرییەوە و هەم سەرنجێکی زۆر بەلای تۆدا ڕادەکێشێت و ناوبانگی خۆت زیاد دەکات. شکاندن و ناوزڕاندنی ڕاستەوخۆ لەم حاڵەدا زۆر توندن، و لەوانەیە زیانت پێ بگەیەنن زیاتر لەوەی یارمەتیدەرت بن. بەڵام گاڵتەپێکردن و چرپۆکی بەسەرخۆ ئاماژەی ئەوە دەگەیەنن کە تۆ هەستێکی نایابی پێویست بەهێزت هەیە لە دەنگی خۆت بۆ خۆشی بینین لە پێکەنینێکی ناش لەسەر حسابی ڕکابەرەکەت. ڕووپۆشێکی گاڵتەئامێز دەشێ بتکاتە سەرگەرمکەرێکی بێ زیان لەکاتێکدا دڕ دەخەیتە ناوبانگی ڕکابەرەکەت.

*ئاسانترە لەگەڵ ویژدانێکی خراپ هەڵبکەیت نەک لەگەڵ ناوبانگێکی خراپ*

*(فریدریک نیچە ١٨٤٤–١٩٠٠)*

## کلیلی دەسەڵات

هەڵکی دەوروبەرمان، تەنانەت نزیکترین هاوڕێیانمان، هەمیشە تا رادەیەک بە شتومەکی تەمومژاوی دەمێننەوە. کارەکتەریان پێچ و پەنای شاراوەی هەیە کە قەت دەریناخەن. دەشێ بەرانبەری خەڵکی تر مایەی هەراسانی بێت ئەگەر تۆ کاتێک بیری لێ بکەیتەوە، چونکە بە ڕاستی ئەستەمی دەکات بۆمان حوکم لەسەر خەڵکی تر بدەین. بۆیە ئێمە وامان پێباشترە ئەم فاکتە فەرامۆش بکەین و لە ڕێگەی ڕواڵەتەکانیانەوە حوکم لەسەر خەڵکی بدەین، واتە ئەو شتانەی کە لەبەرچاومان دیارترینە — جلوبەرگ، ئاماژە، قسە، کردار. لە بابەتی کۆمەڵایەتییدا، ڕواڵەتەکان پێوەری تەقریبەن هەموو حوکمدانەکانی ئێمەن و نابێ تۆ قەت گومڕای باوەڕێکی پێچەوانەی ئەمە ببیت. دەشێ ترازانێکی هەڵە، گۆڕانکارییەکی نامۆ یان کتوپڕ لە ڕواڵەتتدا کارەساتئامێز بێت.

ئەمە هۆکارە بۆ گرنگیی زۆری بەرقەرارکردنی ناوبانگێک کە دەستکردی خۆتە

ئەو ناوبانگە لە گەمەی ترسناکی ڕواڵەتەکاندا دەتپارێزێت، چاوە پشکنەرەکانی ئەوانیتر لە زانینی ئەوەی کە تۆ بە ڕاستی چۆنیت دەپەڕێنێت و ئاستێکی کۆنترۆڵت پێدەبەخشێت لە بەرانبەر چۆنیەتی حوکمی جیهان بەسەر تۆدا... پێگەیەکی بەهێز کە دەبێ تۆ تیایدا بیت. ناوبانگ هێزێکی وەک جادوویی هەیە. بە ڕەوشاندنێکی گۆچانە جادووییەکەی، دەشێ هێز و توانات دووقات زیاد بکات. دەشێ بەهەمان شێوە خەڵکیشت لێ بتەکێنێتەوە. ئەمەی کە هەمان کردار ئیهانووانە یان کارەساتبار دیار بێت دەشێ بەتەواوی بەند بێت بە ناوبانگی بکەرەکە.

لە دەرباری چینیی کۆنی مەملەکەتی (وەی)دا، پیاوێک هەبوو ناوی (می تزو هسیا) بوو کە بە ئەدەب و میهرەبانی ناوی ڕۆیشتبوو. ئەو بووە کەسە دڵخوازەکەی فەرمانڕەوا. ئەوە یاسایەک بوو لە (وەی) کە "هەر کەسێک بە نهێنی سواری عەرەبانەکەی فەرمانڕەوا ببێت ئەوا قاچی دەبڕدرێتەوە". بەڵام کاتێک دایکی (می سزو هسیا) نەخۆش کەوت، ئەسپ و عەرەبانەی شاهانەی بەکار هێنا بۆ سەردانکردنی، وا خۆی بەرخست فەرمانڕەوا

نیوسی داوە. کاتێك فەرمانڕەوا پێی زانی، وتی "می تزو هسیا چەند کەسێکی ئەرکناسە! لەپێناو دایکیدا تەنانەت بڕی چووەرە کە هەریکی ئەنجامدانی تاوانێکە کە حوکمەکەی لەدەستدانی قاچەکانیەتی!"

هاوڕێکی تر هەردووکیان لەناو باخێکدا پیاسەیان دەکرد. می تزو هسیا دەستیکرد بە خواردنی هۆخێك کە بەپێوانی ئەواری نەکات و میوەکەی تری دایە فەرمانڕەوا تا تەواوی نەکات. فەرمانڕەوا وتی "تۆ ئەوەندە منت خۆش دەوێت کە تەنانەت نامی لیکی خوت بیر چووەوە و لێکەڕاییت بەشەکەی تری هۆخەکە بخۆم!"

لەگەڵ ئەوەشدا، دوایی دەربارە هاوەڵە ئیرەییبەرەکان، بە بڵاوکردنەوەی ئەو قسەیەی کە (می تزو هسیا) لەراستیدا کەسێکی گومڕاکەر و مغرورە، سەرکەوتوو بوون لە زیان گەیاندن بە ناوبانگی. لەوێوە فەرمانڕەوا کردارەکانی لە ژێر ڕۆشناییەکی نوێدا بینی. بە توڕەییەوە بە دەربارەکانی وت "ئەو کابرایە ڕۆژێکیان لەژێر پەردەی ئەوەی کە فەرمانی منی پێیە، ئەسپ و عارەبانەکەی لێخوڕیم و جارێکی تر هۆخێکی میوە خوراوی پێدام" بۆ هەمان ئەو کردارانەی کە سیحریان لە فەرمانڕەوا کردبوو ئەو کاتەی کە کەسی دڵخوازی بوو، (می تزو هسیا) ئێستا دەبووایە بەر سزا بکەوێت. چارەنووسی قاچەکانی ئەمیاوەتیا ئەند بوو بە هێز و تینی ناوبانگەکەی

بە سەرەتادا، دەبێ تۆ کار بکەیت بۆ بونیادنانی ناوبانگێك بۆ تایبەتمەندییەکی ناوازە، جا بەخشندەیی بێت یان ڕاستگۆیی یان کارزانی. ئەم تایبەتمەندییە تۆ جیا دەکاتەوە و وا لە خەڵکی تر دەکات باسی تۆ بکەن. پاشان تۆ ئەوەندەی دەکرێت ناوبانگی خوت بە زۆرترین خەڵك دەناسێنیت (ئەگەرچی بەشێوەیەکی تەموموژاوی، ئاگادار بە لە بونیادنانی لەسەرخۆ و بە بناغەیەکی بتەو) و ئینجار تەماشا بکە لەکاتێکدا کە وەکو ئاگری دارستان بڵاو دەبێتەوە

ناوبانگێکی بتەو ئامادەبیت زیاد دەکات و زێدەڕەولە تواناکانت پێشتر دەدات بەبێ ئەوەی تۆ وزەیەکی زۆر بە خەرج بدەیت. دەشێ ئەمە هەمەمان شێوە پرشنگێك بە دەوریدا دروست بکات کە ڕێز و هەتانەت ترسیش دەبزوێنیت. لە شەڕێکدا لە بیابانی

ئەمریکای باکوور لەماوەی دووەم جەنگی جیهانیدا، ژەنەراڵی ئەڵمانی ئیروین ڕۆمیل ناوبانگی بە فریودان و مانۆڕی فریودەرانە هەبوو کە ترس و تۆقاندنی لە هەر کەسێکدا دەچواند کە ڕووبەڕووی دەبووەوە. تەنانەت کاتێک هێزەکانی لێکەوتن و کاتێک تانکە بریتانییەکان ژمارەیان لەوەی ئەو بە ڕێژەی پێنج بەرانبەر یەک زیاتر بوو، لەگەڵ هەواڵی نزیکبوونەوەی، تەواوی شارەکان چۆڵ دەبوون.

هەروەک دەڵێن، ناوبانگت بەشێوەیەکی حەتمی پێش تۆ دەکەوێت و ئەگەر زیر سرووشت، بەشێکی زۆری کارەکەت بۆ ئەنجام دەدرێت پێش ئەوەی بگەیتە شوێنەکە، یان تاکە وشەیەک گۆ بکەیت.

پێدەچێت سەرکەوتنی تۆ بەند بێت بە سەرکەوتنەکانی ڕابردووتەوە. بەشی زۆری سەرکەوتنی دیپلۆماسییەتی دووسەرە کیسنجەر بەند بوو بە ناوبانگی بۆ تەخت کردنی جیاوازییەکان. کەس نەیدەویست ئەوەندە نامەعقول دیار بێت کە کیسنجەر نەتوانێت کاریگەری لەسەر دابنێت. هەر کە ناوی کیسنجەر دەچووە ناو دانوستانەکانەوە، پەیماننامەیەکی ئاشتی وەکو شتێکی بەرجەستەبوو دیار بوو.

ناوبانگی خۆت سادە بکە و لەسەر تایبەتمەندییەکی ناوازە بونیادی بنێ. ئەم تاکە تایبەتمەندییە- بۆ نموونەی کارایی یان فریودان- دەبێتە کارتێک کە ئامادەیی تۆ ڕادەگەیەنێت و ئەوانیتر دەخاتە ژێر جادووییەکەوە.

ناوبانگ گەنجینەیەکە کە بە وریاییەوە کۆ دەکرێتەوە. بەتایبەت کاتێک کە تۆ بۆ یەکەمین جار بونیادی دەنێیت، دەبێ بە وردەکارییەوە بیپارێزیت و چاوەڕێی هەموو هێرشێک بکەیت بۆ سەری. هەر کە بتەو بوو، ڕێگە بە خۆت مەدە تووڕە ببیت یان بکەویتە حاڵەتی بەرگری بەرانبەر توانجەکانی دوژمنەکانت- ئەمە حاڵی لاوازی و نەبڕوابوونت بە ناوبانگت پیشان دەدات. لەبری ئەمە، شاربییەکە بگرە و قەت بەرانبەر بە بەرگری بەخۆکردن دەستەوەستان دیار مەبە. بەلایەکی ترەوە، هێرش بۆ سەر ناوبانگی کەسێکی تر چەکێکی کاریگەرە، بەتایبەت کاتێک تۆ دەسەڵاتێکی کەمترت لەو هەیە. ئەو شتی زۆرتری هەیە لەدەستی بدات. ئەو شتی زۆرتری هەیە لە شەڕێکی وەهادا لەدەستی بدات

و ئەو ناوبانگەی کە تۆ تا ئێستا هەتە نایکاتە بیچیرێک بۆ ئەو تا هەمان پەرچەکردار بنوێنێتەوە. بەڵام دەبێ ئەم تاکتیکە بە لێهاتووییەوە پراوە بکرێت، نابێ تۆ را دەربکەویت کە حەریکی تۆڵەیەکی ناچیزەیت. ئەگەر تۆ ریزەکانە ناوبانگی دژمنەکەت تێکەشکێنیت، ئەوا بەشێوەیەکی نەحوارواوەی خۆت تێکدەشکێنیت

تۆماس ئەدیسۆن، بەو دامێنەرە لەقەلەم درا کە کارەبای پکێف کرد، گەیشتە ئەو ناوەرەکەی کە دەبێ سیستەمێکی ئیشکەر لەسەر بنەمای تەرووی نەگۆڕ (DC) بونیاد بنرێت. کاتێک زانای سربی، نیکۆلا تێسلا وا دەرکەوت کە سەرکەوتوو بووە لە دروستکردنی سیستەمێک بەسەر بنەمای تەرووی گۆڕاو (AC)، ئەدیسۆن تورە بوو. ئەو سوور بوو لەسەر رواندنی ناوبانگی تێسلا، ئەمەش لە ڕێگەی ئەوەی کە وا لە خەڵکی بکات پێی وابێت سیستەمی (AC) لەخۆیدا ناسەلامەتە و تێسلا نابەرپرسانە پەفتاری کردووە بە ناساندنیدا.

لێرەوە، ئەو هەموو جۆرەکانی ئاژەڵی ماڵی گرت و بە تەرووی گۆڕاو کارەبای لێدان تا مردن. کاتێک ئەمە بەس نەبوو، لە ساڵی ١٨٩٠دا ئەو دەسەڵاتدارانی زیندانی ویلایەتی نیویۆرکی هاندا تا یەکەمین لەسێدارەدان بە کارەبا و بە بەکارهێنانی تەرووی گۆڕاو رێک بخەن. بەڵام تاقیکردنەوەکانی لەکارەبادانی ئەدیسۆن تەنیا لەگەڵ زیندەوەرە بچووکەکان بوو و پاڵەپەستۆیەکەی زۆر لاواز بوو و کابرا تەنیا نیوە مردوو دەبوو لەوانەیە لە دڵڕەقانەترین لەسێدارەدانی ڕێکەنراوی ویلایەتێکدا، ڕێوشوێنەکە دووبارە بکرایەتەوە

هەرچەندە، لە دوورمەودا دا، ئەوە ناوی ئەدیسۆن بوو کە زیندوو کایەوە، لەو وەختەدا کەمپەینەکەی زیانی لە ناوبانگی خۆیدا زیاتر لەوەی زیان لە ناوبانگی تێسلا بدات. ئەو کشایەوە. وانەکە سادە بوو— لە هێرشەکانتدا قەت ئەوەندە قووڵ مەڕۆ، چونکە ئەمە سەرنجی زیاتر ئاراستەی نیازی تۆڵەسەندنەوەت دەکات نەک ئاراستەی ئەو کەسەی کە تۆ ناوی دەرێنیت. کاتێک ناوبانگت تۆکمە بێت، تاکتیکی شاراوەتر بەکار بێنە، وەکو تەنز و بەپوچ گرتن، بۆ لاوازکردنی نەیارەکەت لەکاتێکدا کە تۆی وەکو

ساتێکی سەرنجڕاکێش لەفەلەمت دەدات. شێری بەتوانا یاری لەگەڵ ئەو مشکە دەکات کە لە ڕێگەکەیدا ڕەت دەبێت- هەر کاردانەوەیەکی تر زیان بە ناوبانگە تۆقێنەرەکەی دەگەیەنێت

وێنە کانێکی پڕ لە ئەڵماس و یاقوت. تۆ قووڵ هەڵدەکەنیت بۆ ڕۆ دەچیتە خوارەوە، دەیدۆزیتەوە و ئێستا سامانەکەت سەلامەتە. بە ژیانی خۆت پارێزگاری لێبکە. تالانچی و دزەکان لە هەموو لایەکەوە دەوردەدەن. لەت سامانەکەت بە تاقەتایی مەزانە و بە بەردەوامی نوێی بکەرەوە- زەمەنی شەهوەتی حشڵ کەم دەکات و لەبەرچاو ونیان دەکات

دەسەڵات. بۆیە دەبێ من هیوادار بم دەربارەکەمان سامانی ئارەوەی بە شارەزاییەتی و لێزانی بتەو بکات و ڕاستی ئەوە بکات کە هەر کاتێک پێویست بکات بچێتە شوێنێک کە غەریبەیەکی لێیە، ناوبانگێکی باش ڕێبەری دەکات. چونکە ئەو ناوبانگەی کە پێدەچێت بەند ببێت بە ڕا و بۆچوونی کەسانی زۆر، ناوەڕێکی لەبن بەهەتوری دڵنیا بە شایستەیی مرۆڤ بەرەو پێدەدات کە ئەو کاتە بە ئاسانی لە ئەقڵە ئامادەکاندا بەهێز دەبێت

(بەلداسار کاستیگلیۆن، ١٤٧٨-١٥٢٩)

## پێچەوانەبوونەوە

پێچەوانەبوونەوەیەکی مومکین نییە. ناوبانگ هەستیارە، هیچ ئاوڕدانێک بۆ ئەم یاسا نووسیان نییە. لەوانەیە، بەوەی کە باکت نەبێت بەوەی ئەوانیتر چ بیرکردنەوەیەکیان لەمەڕ تۆ هەیە، دوپەسکێک بۆ لووتبەرزی و بێ ڕێزی بەدەست بێنیت، بەڵام دەشێ ئەمە لەخۆیدا وێنەیەکی سەرنج بێت. ئۆسکار وایلد ئەمەی بۆ کەڵکێکی گەورە بۆ خۆی بەکارهێنا. لەبەرئەوەی دەبێت ئێمە لە کۆمەڵگەدا بژین و پشت ئەستوور بین بە ڕا و بۆچوونی ئەوانیتر، هیچ شتێک نییە بە فەرامۆشکردنی ناوبانگت بەدەستی بێنیت. بەوەی کە باکت بەوە نەبێت چۆن وێنا دەکرێیت، لێدەگەڕێیت ئەوانیتر بڕیار لەمە بدەن بۆ تۆ خۆت وەستای چارەنووسی خۆت و هەروەها ناوبانگت بە

## یاسای ژمارە ٦

# بەهەموو شێوازێك سەرنج ڕابكێشە

### جوکه

هەموو شتێك بە ڕواڵەتەكەی حوكم دەدرێت. ئەوەی كە نەبینراوە یەكسانە بە هیچ. كەواتە قەت ڕێگە مەدە لەناو حەشاماتدا ون ببیت یان لەناو ئاپۆرادا سەر بنێیتەوە. دەركەوە. بە هەر نرخێك بووە لەبەرچاو بە. خۆت بكە بە موگناتیسی ملكێش و سەرنج لە ڕێگەی ئەوەی كە گەورەتر، ڕەنگاوڕەنگتر، ڕازامیزتر لە حەشاماتی ئاسایی و دەستەمۆ دیار بیت.

### بەشی یەکەم: ناوت بە هەستبزوێن و ڕیسواکەر دەورە بدە

بە ڕێگەی دروستكردنی وێنەیەكی بیرنەچووەوە، تەنانەت مشتومڕئامێز سەرنج بۆ لای خۆت ڕابكێشە. بە سكاندەڵێك سەرنجەكان ببەرە سەر خۆت. هەر شتێك بكە كە وات لێدەكات سەرنجڕاكێش بێت و لەوانەی دەوروبەرت زیاتر بدرەوشێیتەوە. هیچ جیاوازییەك مەكە لەنێوان جۆرەكانی سەرنج — هەر جۆرە بەدناوییەك دەسەڵاتت دەداتێ. باشترە بەدناو ببیت و هێرشت بكرێتە سەر نەك فەرامۆش بكرێیت.

### پەیڕەویکردن لە پاشکە

(پی تی بارنوم)، نمایشکەری دیاری سەدەی نۆزدەی ئەمریکا، ژیانی پیشەیی وەکو باریدەدەری خاوەنی سیرکێك دەستپێکرد بەناوی (ئارۆن تیرنەر) لە ١٨٣٦دا، سیرکەکە لە ئاناپۆلیس، ماریلاند، وەستا بۆ ئەنجامدانی زنجیرەیەك ئەدا و نمایش. بە بەرنامەی ڕۆژی دەستپێکردنەوە، بارنوم پیاسەیەکی بە شارەکەدا کرد کە قاتێکی ڕەشی جوانی لەبەردا بوو. خەڵکی پەیتا پەیتا بەدوای کەوتن. یەکێکیان لەناو قەرەباڵغیەکەدا هاواری کرد و وتی ئەوە بەڕێز (ئیفرەیم کەی ئاڤیری)یە، پیاوێکی بەدناو کە تۆمەتی کوشتنی لەسەر لابرابوو بەڵام هێشتا زۆربەی ئەمریکییەکان دوەریان وابوو دوابارە. هەشاماتی تووڕە قاتەکەی بارنومیان دڕاند و ئامادە بوون بیکوژن. پاش چەندین تکای بێ ئاکام، بارنوم بۆ دواجار قەناعەتی پێهێنان کە بەرەو سیرکەکە دوای کەون کە لەوێ دەیتوانی شوناسەکەی پشتڕاست بکاتەوە.

هەر کە گەیشتنە ئەوێ، تیرنەری پیر حەقیقەتی کردەوە کە ئەوە هەمووی پێڕابواردنێك بوو- ئەو خوی دەنگوی ئەوەی بڵاو کردبۆوە کە بارنوم ئەو ناوەیە هەشاماتەکە بڵاوەیان لێکرد، بەڵام بارنوم، کە ڕوری نەمابوو بکوژرێت، دڵخۆش نەبوو ئەو ویستی بزانێت چ شتێك بووەتە هۆی ئەوەی بەڕێوەبەرەکەی فێڵێکی وەها بکات تیرنەر لە وەڵامدا وتی "بەڕێز بارنوم، هەمووی بۆ چاکەی خۆمان بوو، بیرت بێت، هەموو ئەوەی پێویستمانە بۆ ڕەسکردنی سەرکەوتن، بەدناوییە" لە ڕاستیشدا هەمووان لە شارەکەدا باسی نوکتەکەیان دەکرد و سێرکەکە لەو شەوەدا پڕ بوو و هەموو شەوێك لە ئەناپۆلیس مابەوە. بارنوم گەیشتبووە ئەو مروابەی وانەیەك کە ئەو فێری بوو قەت بیری ناچێتەوە

بارنوم باندێکی موسیقای لە بانکۆنەکەدا دادەنا کە بەسەر شەقامەکەدا دەیڕوانی، لەژێرەوە لافیتەیەکی گەورە لێی نوسرابوو (مۆسیقەی خۆڕایی بۆ میوانان گەس)، بینیوێرکییەکان بیریان کردەوە و ڕنیان چ بەخشندەییەکە، و ئەوان پۆل پۆل هاس

بژنەوەی گوێبیستی کۆنسێرتی جۆراوجۆر بن. بەڵام بارنوم زۆر ماندوو بوو تا جوانترین مۆسیقارەکان بدۆزێتەوە و پاش ئەوەی مۆسیقا دەستیپێکرد، بەڕووی خەڵکی دەستیانکرد بە کڕینی تکت بۆ چوون بۆ مۆزەخانەکەی کە لەوێ پێویستیان بە کەپی گوێ نەبوو بۆ خۆپاراستن لە ژاوەژاوی باندەکە و لە هەوای حەشاماتەکە

یەکێك لە کەسە سەیرەکانی بارنوم کە لە سەرانسەری وڵاتدا گەڕا (جۆیس هیس) بوو، ژنێك کە بارنوم بانگەشەی ئەوەی دەکرد تەمەنی ١٦١ ساڵ بێت و گوایەیەت کە جارێك لە جۆرێ پەرستاری جۆرج واشنتن بووبێت. پاش چەند مانگێك حەشاماتەکە پەیتا پەیتا کەم بوونەوە ، بۆیە بارنوم نامەیەکی بۆ ڕۆژنامەکان نارد، بانگەشەی ئەوەی کرد کە هێس ساختەچییەکی زیرەکە. ئەو نووسی "جۆیس هێس مرۆڤ نییە بەڵکو ماشێنە و لە ئێسقانی حوت، لاستیکی هیندی و چەندەها سپرینگ دروستکراوە" ئەوانەی کە پێشتر بەپرۆبوونە سەر بینینی و ئەوانەش کە هەنووکە بینیبوویان پارەیاندا بۆئەوەی دیسان بیبیننەوە، بۆئەوەی بزانن ئاخۆ دەنگۆی ئەمەی کە ئەو ژنە ڕۆبۆتە ڕاستە یان نا

لە ١٨٤٢دا، بارنوم کەلاکێکی کڕی کە دەنگۆی ئەوە هەبوو پەری دەریایی بێت. ئەم بوونەوەرە لە مەیمونێك دەچوو کە جەستەی لە ماسی بێت، بەڵام سەری و جەستەی بەتەواوی پێکەوە لکابوون- بە ڕاستی سەمەرەیەك بوو. پاش توێژینەوەیەك بارنوم گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە بوونەوەرەکە بەشێوەیەکی شارەزایانە لە ژاپۆن پێکەوە لکێنراوە کە لەوێ دەنگۆکە مۆمیایەکی ڕەقی دروستکرابوو

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بابەتی لە ڕۆژنامەکانی سەرانسەری وڵاتدا بڵاو کردەوە و بانگەشەی ئەوەی کرد کە پەرییەکی دەریا لە دوورگەکانی (فیجی) گیراوە. ئەو بەهەمان شێوە نەسوی لە نەخشە داتاشراوی بڵاو کردەوە کە وێنەی پەرییە دەریاییەکەیان پیشان دەدا. بە هەتی ئەو کاتەی کە ئەو نموونەکەی لە مۆزەخانەکەیدا نمایش کرد، دیبەیتێکی نیشتمانی لەسەر هەبوونی ئەم بوونەوەرە ئەفسانەییانە ورووژا. چەند مانگێك پێش کەمپەینەکەی بارنوم، کەس گرنگی بە پەرییە دەریاییەکان نەدەدا یان بە ڕاستی هیچیان لەبارەوە نەدەزانی. ئێستا هەمووان باسیان دەکرد وەك بڵێی ڕاستەقینەن. حەشاماتێکی

زۆر گەرمەری بۆ مێشی پەرییە دەریاسەکەی (فیجی) و مەسپی نسەیث لەبارەی بابەتەکەوە

چەند ساڵێک دواتر، ماریوم لەگەڵ ژەنەراڵ (تۆم تەمب) کە کورتەبالایەکی پێنج ساڵانی خەڵکی کۆنێکتیکەت بوو و ماریوم دەیگوت کوڕێکی ئینگلیزی یازدە ساڵانە و ڕاهێنراوە تا زۆر کردەی سەرنجڕاکێش بکات گەشتێکیان بە ئەوروپادا دەستپێکرد. لە مەودای ئەم گەشتەدا ناوی ماریوم ئەوەندە بووە جێی سەرنج کە شاژنە ڤیکتۆریا، ئەو نموونەیەی ئاگایی، داوای ئامادەبوونێکی تایبەتی کرد لەگەڵ ئەو و کورتەبالا بەهرەمەندەکەی لە کۆشکی بەکینگهام. لەوانەیە چاپەمەنی ئینگلیز گاڵتەی بە ماریوم کردبێت، بەڵام ڤیکتۆریا بەشێوازێکی شاهانە ئامادەی سەرگەرمییەکانی ئەو بوو و دیرە بەدوا سەنگ و ڕێزێکی تەواویان بۆ دانا.

## لێکدانەوە

ماریوم لە ڕاستیی بێچیەیی لەبارەی ڕاکێشانی سەرنج تێگەیشت. هەر کە چاوەکانی خەڵك لەسەر تۆ بوون، ئەوا تۆ ڕەوایەتییەکی تایبەتت هەیە. بەلای ماریومەوە، دروستکردنی ئارەزوومەندی واتە دروستکردنی حەشامات، هەروەك دواتر نووسی "هەموو حەشاماتێك دیوێکی پۆزەتیڤی هەیە" حەشاماتیش بەیەکەوە پەستار دەکەن ئەگەر کەسێك چیتر تەماشای ئەو دەرزەکەرە نەکات کە تۆ ڕاسپاردووە لە شەقامەکەدا بڕێك دەبینێت، ئەوا خەڵکێکی زۆرتر دەوریان دەگیرێ و دەڕۆن، ئەوی وەکو تول و تۆزی سەر کۆمەڵ کۆ دەبنەوە. پاشان، ئەگەر سوکە پاڵێکیان پێوە نرێت، ئەوا دەچنە ناو مۆزەخانەکەت یان تەماشای نمایشەکەت دەکەن. بۆ دروستکردنی حەشاماتێك دەبێ شتێکی جیاواز و سەیر بکەیت. هەر جۆرە سەیرییەك حەرمەت بە نمایشەکە دەکات، چونکە حەشامات بەشێوەیەکی موگناتیسی بەرەو شتی نائاسایی و ڕوونەکراوە ڕادەکێشرێن دەبن، هەر کە سەرنجیشیانت بەلای خۆتدا ڕاکێش کرد، قەت مەهێڵە لەدەست دەرچێت

ئەگەر بەرەو هەڵکی مر بچیت، ئەوا لەسەر حسابی تۆ دەبێت. بارنوم بەشێوەیەکی دڵڕەقانە سەرنجی سەر ڕکابەرەکانی بەلای خۆیدا دەقۆستەوە لەکاتێکدا کە دەیزانی چ کاڵایەکی بەنرخە

کەواتە لە سەرەتای دەرکەوتنتدا بەرەو لوتکە، هەموو وزەی خۆت لە ڕاکێشانی سەرنج خەرج بکە. لەسەروو هەموو شتێکەوە کوالیتی سەرنج گرنگ نییە. گرنگ نییە نمایشەکانی ئەو چەنێک بە خراپی قسەمان لەسەر دەکرا، یان هێرشەکان بۆ سەر گاڵتەکانی چەنێک کەسی بوون، بارنوم قەت ناڵە و سکاڵای نەدەکرد. ئەگەر ڕەخنەگرێکی ڕۆژنامە بەشێوەیەکی دیاریکراو نامە و تەشەری بگرتایە بارنوم، لە ڕاستیدا هەموو شتێکی دەکرد تا بانگهێشتی کابرا بکات بۆ ڕۆژێکی دەستپێکردنی نمایش و دابینکردنی باشترین شوێن بۆی. ئەو تەنانەت هێرشی بەناو خوازراوی دەکردە سەر کارەکانی خۆیی، تەنیا بۆئەوەی ناوی لەسەر ڕۆژنامەکان بێت. لە ڕوانگەی بارنومەوە، هۆش و سەرنج — جا نێگەتیڤ بێت یان پۆزەتیڤ — پێکهاتەی سەرەکی سەرکەوتنەکەیەتی. خراپترین چارەنووس لە جیهاندا بۆ کەسێک کە ئاواتەخوازی ناوبانگ، شکۆ و بێگومان دەسەڵاتە، ئەوەیە کە فەرامۆش بکرێت

*ئەگەر وا ڕێکەوێت کە دەرباریەک لە نمایشێکی گشتیی وەکو یەکبەیەکبوونەوەدا دەرگیری شەڕ بێت، ئەوا ئەتکید دەکاتەوە لەوەی کە ئەو ئەسپەی هەیەتی بەجوانی ڕازێنراوەتەوە و ڕێک کراوە، ئەمەی کە خۆی بەشێوەیەکی گونجاو پۆشاکی لەبەر کردووە و زیرەکانە و هەکیمانە دەچێتە مەیدان بۆئەوەی سەرنجی تەماشاکەران بەلای خۆیدا ڕابکێشێت*

بالداسار کاستیگلیون، ١٤٧٨–١٥٢٩

## کلیلی دەسەڵات

درەوشانەوە و دەرکەوتن زیاتر لەولەی دەوروبەرت بەهرەیەکە کە کەس لەگەڵیدا نایەتە دونیاوە. دەبێ تۆ فێر بیت سەرنج بەکێش بکەیت. پێویستە لە سەرەتای ژیانی

پیشەییندا باو و ناوبانگ بلکێنیت بە تایبەتمەندییەک، وێنەیەکەوە کە لەوانیتر جیێت دەکاتەوە. دەشێ ئەم وێنەیە شتێکی وەکو ستایلێکی جلوبەرگی پزشکێك یان نیوێکی کارەکتەرەکەت بێت کە خەڵکی دڵخۆش دەکات و دەیانهێنێتە قسە. هەر کە وێنەکە شوێنی خۆی گرت، ئەوا تۆ پاڵەوانێکت هەیە، شوێنێکت لە ئاسماندا بۆ ئەستێرەکانت هەیە.

هەڵەیەکی باوە وێنای ئەوە بکەیت کە ئەم پاڵەوانە سەیرەی تۆ نابێت جێی متمانە بێت، ئەمەی کە هێرشی بکرێتە سەر بەشێوەیەك لە شێوەکان خراپە. هیچ شتێك ناشێ بە حەقیقەتەوە دوور بێت. بۆ جۆلانەی لەوەی کە دەرکەوتەیەکی ڕاگوزەر بێت و بەدماوییەکەت بەهۆی بەدناوییەکی ترەوە داپۆشرێت، نابێت جیاوازی لەنێوان جۆرەکانی سەربیج بکەیت. لە کۆتاییدا هەموو جۆرەکان لە بەرژەوەندی تۆ دەکەونە کەڕ

دەرباری لویسی شازدە زۆر دووسەر، هونەرمەند، جوانیی مەرن و پیاوان و ژنانی بەزینەت بێ عەرشی دەگرتنەخۆ، بەڵام هیچ کەسێك ئەوەندەی دوك دو لۆزون قسەی لەبارەوە نەدەکرا. دوك کەسێکی کورتیلەی تەقریبەن قەرەم بوو و دەکەوتە بەر زۆرترین جۆری ڕەفتاری بێ ڕێزانە - ئەو لەگەڵ مەعشوقەی پاشادا خەوت و بەشێوەیەکی ئاشکرا سووکایەتی نەك تەنیا دەرباریبەکانی تر بەڵکو خودی پاشاشی کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، لویس ئەوەندە بە نائاساییبوونەکەی دوك سەرسام بوو کە تەحەمولی غیابی ئەوی لە دەربار نەدەکرد. سەیریی کارەکتەری دوك، بەکێشکەری هۆش و سەربیج بوو. هەر کە خەڵکی سەرسام بوون پێی، ئیتر چووە دڵەوە و دەیانویست بەردەوام ئامادەیی هەبێت

کۆمەڵگە تامەزرۆی کارەکتەرە نائاساییەکانە، واتە ئەو خەڵکەی لەسەروو ئاستی ستاندەردی گشتییەوەیە. کەوایە قەت لەو تایبەتمەندییانە مەترسە کە جیات دەکەنەوە و سەربیج بۆ سەرت بەکێش دەکەن. مقۆمقۆی دەربار، تەنانەت سکاندەڵ، وا باشترە هێرشت بکرێتە سەر، تەنانەت ناوت بزڕێت لەوەی کە فەرامۆش بکرێیت. هەموو پیشەکان بەم یاسایە بەڕێوە دەچن و دەبێ هەموو پرۆفیشناڵەکان کەمێك لە تایبەتمەندیی نمایشکەریان هەبێت.

ئەدیسۆن ناقبکردنەوەی سەرسوڕهێنی نیبایی ئەنجام دەدا بۆ پێشاندانی نوێبوونەوەکانی لە بواری کارەبادا. ئەو باسی داهێنانەکانی ئایندەی دەکرد کە لەو سەروەختەدا کاریگەر دەبوون – پاپۆڕ و ئەو ماکینانەی کە دەیانتوانی وێنەی بجرکردنەوە بگرن – و ئەمەی کە هیچ سیاریکی ئەفیزدانی وزەی خۆی نییە، بەڵام ئەمە وەهای لە خەڵک کرد باسی بکەن. ئەو هەموو شتێکی کرد تا دڵنیا بێت لەوەی سەرنجێکی زیاتر لە نیکۆلا تێسلای ڕکابەری بەلای خۆیدا کێش دەکات، کە لەوانەیە بە ڕاستی لێهاتووتر بووبێت لەم بەڵام ناوی زۆر کەمتر ناسراو بوو. لە ١٩١٥دا، دەنگۆی ئەوە بڵاو بووەوە کە ئێدیسۆن و تێسلا وەرگری هاوبەشی خەڵاتی نۆبڵ دەبن بۆ فیزیا. خەڵاتەکە بۆ دواجار بەخشرا بە دوو فیزیاناسی ئینگلیز. ئەمیا دوایی زانرا کە لیژنەی خەڵاتەکە بە ڕاستی بە ئەدیسۆنیان ڕاگەیاندووە، بەڵام ئەو ڕەتیکردۆتەوە خەڵات بە هاوبەشی لەگەڵ تێسلا وەربگرێت. بە هاتنی ئەو کاتە ناوبانگی ئەو پارێزراوتر بوو لە هی تێسلا، و ئەو وای پێ باشتر بوو ئەو شەرەفە ڕەت بکاتەوە نەک ڕێگە بدات هەموو سەرنجەکان کە لە ئەنجامی وەرگرتنی خەڵاتە هاوبەشەکەدا دەهات بکەوێتە سەر ڕکابەرەکەی.

ئەگەر تۆ خۆت بە پێگەیەکی نزمدا بینییەوە کە دەرفەتێکی کەمت بۆ دەبێ دەکات تا سەرنج بەکێش بکەیت، فێڵێکی کاریگەر ئەوەیە کە هێرش بکەیتە سەر دیارترین، بەناوبانگترین، بەهێزترین کەس کە بیبت شک دەبێت. کاتێک پیێترو ئارێتینو، خزمەتکارێکی لاوی سەرەتاکانی سەدەی شازدە، ویستی وەکو نووسەرێکی هۆنراوە سەرنج بەکێش بکات بڕیاریدا زنجیرەیەک قەسیدە بڵاو بکاتەوە بۆ ڕیسواکردنی پاپا و حەزەکەی بۆ فیلێکی ماڵی. هێرشەکە ئارێتینۆی بەخێرایی خستە نێو هۆش و سەرنجی خەڵک. هێرش بۆ سەر کەسێک لە پێگەیەکی دەسەڵاتدا هەمان کاریگەری دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێت بێت هێرشی لەو جۆرە بەشێوەیەکی سنووردار بەکار بێنیت پاش ئەوەی سەرنجی خەڵکت بەلای خۆتدا بەکێش کردووە، واتە کاتێک لەوانەیە کردارەکە ئیتر هێزی خۆی لەدەست بدات.

هەر کە کەوتیتە سەر ڕۆشناییەکە دەبێ لە ڕێگەی گرنجاندن و فرە ڕەنگ کردنی میتۆدی سەربنج ڕاکێشانەکەت، بە بەردەوامی نوێی بکەرەوە. ئەگەر ئەمە نەکەیت ئەوا خەڵکی بێتاقەت دەبن، بە هەست وەرناگرن و ڕوو دەکەنە ئەستێرەیەکی نوێتر. گەمەکە پێویستی بە چاودێری و ئەفرێنەریتی بەردەوام هەیە. پابلۆ پیکاسۆ قەت ڕێگەی نەدەدا شێوازی نیگارکێشانەکەی لە ئەدەدا فەرامۆش ببێت. ئەگەر ناوی ئەو بلکایە بە ستایلێکی دیاریکراوەوە ئەوا بە ئەنقەست بە زنجیرەیەک تابلۆ دەهەژاند کە چاوەڕوانەکراو بوون. ئەو بڕوای وابوو ڕا باشترە کە شتێکی دزێو و هەراسانکەر دروست بکات نەک ئەوەی ڕێگە بە تەماشاکاران بدات زۆر بە کارەکانی ئاشنا ببن. تێبگە. خەڵکی هەست بە بالاتربوون دەکەن بەرامبەر کەسێک کە کارەکانی بەلایانەوە چاوەڕوانکراوە. ئەگەر تۆ بە یاریکردن لەگەڵ چاوەڕوانییەکانیان پیشانیان بدەیت کێ بالادەستە، ئەوا هەم ڕێزیان بەدەست دێنیت و هەم هۆشی ڕاگوزەریان خلەر دەکەیت.

## زەردەواڵە و میر

زەردەواڵەیەک بەناوی (کلک دەرزی) لەمێژ بوو بەدوای کردارێکەوە بوو کە بۆ هەمیشە بەناوبانگی بکات. بۆیە ڕۆژێکیان چووە کۆشکی پاشا و دای بە میری بچکۆلەوە کە لەوێ جێگەدا بوو. میر بە هاوارێکی بەرزەوە خەبەری بووەوە. پاشا و دەربارییەکانی بە هەڵەداوان چوونە ژوورەوە بۆ ئەوەی بزانن چی ڕوویداوە. میر هاوار و ناڵەی بوو لەکاتێکدا کە زەردەواڵەکە هەر پێوەی دەدا و پێوەی دەدا. دەربارییەکان هەوڵیاندا زەردەواڵەکە بگرن و ئەوانیش یەک لەدوای یەک پێوە دەدرن. تەواوی بنەماڵەی شاهانە خۆی بە ژوورەکەدا کرد. بەزوویی هەواڵەکە بڵاو بووەوە و خەڵکی خۆیان بە کۆشک کرد. شار ژاوەژاوی بوو، هەموو کارو کاسبی وەستابوو. زەردەواڵەکە، بەر لەوەی لە دەرەنجامی تەقەلاکانیدا بمرێت، لەبەر خۆیەوە وتی "ناو بەبێ ناوبەنگ وەکو ئاگر وایە بەبێ بڵێسە. هیچ شتێک نییە وەکو ڕاکێشانی سەرنج باجەکەی هەرچییەک بێت"

حەکایەتێکی هیندی

تەنانەت ئەو کاتەش کە سکاڵا و ناڕەزایەتیم بەرامبەر دەوەستێ، بەشی خۆم لەبەرۆبانگ بەدەست دێنم

(پیەترۆ ئارێتینۆ ١٤٩٢-١٥٥٦)

## وێنە

ڕوشنایی ئەو ئەکتەرەی پێ دەبینە ناو ڕووناکایی درەوشاوەی، ئامادەییەکی سەرنجڕاکێش بەدەست دێنێت. هەموو چاوەکان لەسەر ئەون لەناو پرشنگی ڕوشنایی بەرتەسکدا، لەیەک کاتدا بڕیار تەنیا بۆ یەک ئەکتەر هەیە. هەرچییەک پێویستە بیکە بۆ ئەوەی خۆت بخەیتە بەر ئەرکیری ئەو پرشنگە. ئاماژەکانت ئەوەندە گەورە، دڵخۆشکەر و ڕق هەڵسێنن بکە کە ڕووناکایی لەسەر تۆ بمێنێتەوە لەکاتێکدا کە ئەکتەرەکانی تر لەبەر سێبەردا دەمێننەوە.

دەسەڵات ڕووناک و بیبراو بە ئەوەی کە نابینرێت وەکو ئەوە وایە نەبووبێت. ئەوە ڕووناکی بوو کە بۆ یەکەمین جار دووەمەکاری ئەوەی هەموو خەڵق بدرەوشێنێتەوە. دەرکەوتن زۆر بەتاڵایی پڕ دەکاتەوە، کیماسییەکان دادەپۆشێت و ژیانی دووەم بە هەموو شتێک دەبەخشێت. بەتایبەت کاتێک بە تایبەتمەندییەکی ڕەسەن پاڵپشتی دەکرێت

(بەلتەسار گراسیەن، ١٦٠١-١٦٥٨)

## بەشی دووەم کەشێکی ڕازئامێز دروست بکە

*لە جیهانێکدا کە بەرەبەرە زیاتر ئاشنا و ئاسایی دەبێت، هەر شتێک کە ڕازئامێز دیار بێت هۆش و سەرنج ڕادەکێشێت. قەت ڕوونی مەکەرەوە کە چی دەکەیت یان بەتەمای چیت. هەموو کارەکانت پیشان مەدە. کەشێکی ڕازئامێز ئامادەبێت زیاد*

*دەكات، ئەهەمان شێوە چاوەڕوانیش دروست دەكات– هەمووان تەماشات دەكەن تا بزانن دواتر چی ڕوودەدات. زۆر بەكار دێنە بۆ واق وڕماندن، جادووكردن و تەنانەت تۆقاندن.*

## پەیڕەویكردن لە یاسكە

لە سەرەتای ١٩٠٥دا، دەنگۆ لە سەرتاسەری پاریسدا بڵاو بوویەوە لەبارەی كچێكی خۆرهەڵاتی گەنجەوە كە لە ماڵێكی تایبەتدا سەمای دەكرد، لە پرۆپۆشێكەوە پێچرابوو كە پەیتا پەیتا لایدەبرد. ڕۆژنامەنووسێكی لۆكاڵ كە سەماكەی بینیبوو ڕاپۆرتی ئەوەی گەیاند كە "ژنێكی خۆرهەڵاتی دوور هاتۆتە ئەوروپا بۆنێكی هەتا بڵێی خۆشی لێدێت و هەموو لەشی خشڵە. هاتووە هەستی لە دەوڵەمەندیی ژیان و ڕەنگی خۆرهەڵاتی بە كۆمەڵگەی چارتێریی شارەكانی ئەوروپا بناسێنێت". بەزوویی هەمووان ناوی سەماكەرەكەیان زانی ماتا هاری.

سەرەتای ئەو ساڵە، لە زستاندا، هەندێ لە ئامادەبووانی هەڵبژاردە و بچوك لە سالۆنێك كۆ بوونەوە كە پڕ بوو لە پەیكەری هیندی و پاشماوەی تر لەكاتێكدا كە ئۆركێسترایەك مۆسیقایەكی دەژەنی كە لەژێر ئیلهامی سترانە ئایینیەكانی هیندۆس و جاڤادا بوو. پاش هێشتنەوەی ئامادەبووان لە چاوەڕوانی و بیركردنەوەدا، ماتا هاری بە پۆشاكێكی سەرسامكەرەوە لەپڕێكدا دەركەوت: ستیانێكی سپی لۆكەی داپۆشراو بە خشڵی هیندی، پشتێنی خشڵ لە كەمەر بوو كە تەنوورەكەی ڕاگرتبوو بازنەی تا ئەژنۆی لە باسكیدا بوو. پاشان ماتا هاری سەمای دەكرد، بە ستایلێك كە كەس لە فەرەنسا نەیبینیبوو، تەواوی جەستەی دەلەرییەوە وەك بڵێی لە حاڵەتی مەستیدایە. ئەو بە ئامادەبووانی شاد و سەرسامی وت كە سەماكانی گێڕانەوەی چیرۆك گەلێكن لە ئەفسانەكانی هیند و حەكایەتەكانی جاڤا. بەزوویی دەستەبژێری پاریس و باڵیۆزەكانی سەرڕەمبە دووردەستەكان، كەوتنە كێبڕكێ بۆ بانگهێشتەكان بۆ سالۆنەكە، كە لەوێ دەنگۆی ئەوە هەبوو ماتا هاری لە ڕاستیدا بە ڕووتی نمایشی سەما پیرۆزەكان دەكات

هەڵکی دەیانویست زیاتر لەبارەی ئەوەوە بزانن. ئەو بە ڕۆژنامەنووسێکی وت کە ئەم بە ڕاستیدا بە بنەچە هۆڵەندییە، بەڵام لە دوورگەی جاڤا گەورە بووە. بەهەمان شێوە باسی ئەو کاتەی دەکرد کە لە هیند بەسەری بردووە، ئەمەی کە چۆن فێری سەما پیرۆزەکانی هیندوس بووە لەوێ و چۆن زمانی هیندی "دەست ڕاست بن لە تیجەوبێکی، سواری ئەسپ ببن و بتوانن حسابی لۆگاریتمی بکەن و فەلسەفەی فەلسەفێ بکەن" بەهاری مارچی ١٩٠٥، هەرچەندە ژمارەیەکی کەمی پاریسییەکان بە ڕاستی سەمای ماتا هارییان بینیبوو، ناوی ئەو لەسەر دەمی هەمووان بوو.

لەکاتێکدا کە ماتا هاری چاوپێکەوتنی زۆرتری ئەنجام دەدان، چیرۆکی بنەچەی ئەو بە گۆڕاندبوو. ئەو لەهیندستان گەورە ببوو، داپیرەی کچی میری جاڤای بوو، لە دوورگەی سوماترا ژیابوو کە لەوێ کاتی بە "ئەسپسواری، چەک بەدەست و سەرکێشی ژیان" بەسەر بردبوو. کەس هیچ شتێکی بە دڵنیاییەوە لەبارەی ئەوەوە نەدەزانی، بەڵام ڕۆژنامەنووسان باکیان نەبوو بە گۆڕانکاری لە ژیاننامەکەیدا. ئەوان ماتا هارییان بەراورد دەکرد بە خوداوەندی هیندی، بوونەوەرێک لە پەڕەکانی بۆدلێرەوە – وێنەکەیان هەرچییەکی بویستایە لەم ژنە پڕ نامۆیەی خۆرهەڵاتدا، بیانبینیایە.

لە ئۆگەستی ١٩٠٥دا، ماتا هاری بۆ یەکەمین جار لەناو خەڵکدا نمایشی کرد.

فەرەنسییەکی زۆر بۆ بینینی ئەو لە شەوی کردنەوەدا ئاژاوەی نایەوە. ئێستا ئەو ببووە هێمایەکی کەلتووری و زۆر کەس لاساییان دەکردەوە. ڕەخنەگرێک نووسیبووی "ماتا هاری نوێنەری هەموو شیعری هیندستان، ڕۆحانییەکەی، شەهوەت ئەنگێزییەکەی، سیحرە هیپنۆتیزەکەیەتی". یەکێکی تر نووسیبووی "ئەگەر هیند ئەو گەنجینە چاوەڕواننەکراوانەی هەبێت، ئەوا هەموو پیاوانی فەرەنسی بەرەو وشکاییەکانی گانجیز کۆچ دەکەن".

ناوبانگی ماتا هاری و سەما هیندییە پیرۆزەکانی لەودیو پاریسەوە بڵاو بووەوە. ئەو بۆ بەرلین، ڤیەننا، میلان بانگهێشت کرا. بەدرێژایی چەند ساڵی دواتر ئەو لە سەرانسەری ئەورووپادا نمایشی ئەنجامدا، لەگەڵ بەرزترین ناوە کۆمەڵایەتییەکاندا تێکەڵ بوو و

سەرنجراکێشەن. بێت بێت. زۆربەی خەڵکی نەدەرەوەن، دەگرێ وەکو کتێبێکی کراوە بخوێنرێتەوە، بایەخێکی کەم دەدەن بە کۆنترۆڵکردنی قسەکانیان یان وێنەیان و بەشێوەیەکی دەستەوستان پێشبینیکراون. بەڵام بە دووڵێوون، بێدەنگوون، دوورە دەربڕینی دەستەواژەی نەمرمژاوی، کەشێکی پڕ دروست دەکەیت. ئەو کاتە خەڵکی دەوروبەرت ئەو کەشە گەورە دەکەن بەوەی بەردەوام هەوڵ دەدەن لێت تێبگەن.

هەم هونەرمەندان و هەم کلاوچییەکان لە پەیوەندی ڕیندووی نێوان ڕازنامێزیوون و حوڵاندنی نارەزوومەندی تێدەگەن. کاونت ڤیکتۆر لوستیگ، ئەرستۆکراتی کلاوچییەکان، گەمەکەی بەشێوەیەکی وەستایانە ئەنجامدا. ئەو هەمیشە ئەو شتانەی دەکردن کە جیاواز بوون یان وا دیار بوون بێ مانا بن. ئەو لە باشترین هۆتێلەکان یان لە لیموزینێکدا دەردەکەوت کە شۆفێرەکەی ژاپۆنی بوو. پێشتر کەس قەت شۆفێری ژاپۆنی نەبینیبوو، بۆیە ئەمە سەیر و نایاب دیار بوو. لوستیگ گرانبەهاترین جلی دەپۆشی، بەڵام هەمیشە لەگەڵ شتێکدا— میدالیایەک، گوڵێک، ماندیکی قۆڵ— لانی کەم بە پێوەرە باوەکان ئاسایی نەبوو. ئەمە بەشتێکی بێتام نەدەبینرا، بەڵکو وەکو شتێکی سەیر و ئاڵۆز تەماشا دەکرا. لە هۆتێلەکەدا ئەو دەبینرا کە چۆن هەموو سەرە سەعاتێک تەلەگرامی پێدەگات کە شۆفێرە ژاپۆنییەکەی بۆی دەهێنا— ئەو تەلەگرامانەی کە بێباکانە دەیدڕاندن (لە ڕاستیدا ئەمانە ساختە بوون، بەتەواوی بەتاڵ بوون). ئەو لە ژووری نان خواردندا بەتەنها دادەنیشت، خەریکی خوێندنەوەی کتێبی قەبەی سەرنجڕاکێش بوو، بەدەم هەڵکێشەوە دەخەنی و لەگەڵ ئەوەشدا بە گۆشەگیری دەمایەوە. بێگومان لەماوەی چەند ڕۆژێکدا تەواوی هۆتێلەکە پڕ دەبوو لە ئارەزوومەندی لە بەرلسەر ئەم پیاوە نامۆیەدا.

هەموو ئەم سەرنجە ڕێگەی بۆ لوستیگ خۆشکردن کە ساویلکەکان بەئاسانی بەکێش بکات. ئەوان لەبەرانبەر ئەو نهێنییەحوموونەیدا لیی دەپاڕانەوە و دەیانویست هاوەڵی بن. هەموان دەیانویست لەگەڵ ئەو ئەریستۆکراتە ڕازنامێزەدا ببینرێن. لە ئامادەیی ئەم پڕە هۆش پەرتکەرەشدا، ئەوان تێنەبینی ئەوەیان نەدەکرد کە بەکوێرایی تاڵانیان دەکرێت و گیرفانیان دەبڕدرێت.

کەشێك پڕاو دەتوانێت وەها لە کەسێکی ئاسایی بکات کە هۆشمەند و قووڵ دەربکەوێت. ئەمە وەهای لە ماتا هاری، ژنێکی پڕالەت و هۆشمەندی مام ناوەند کرد وەکو خوداوەند دەربکەوێت و سەماکەی بەشێوەیەکی خودایی ئیلهامبەخش بوو. کەشێکی پڕاو لەبارەی هونەرمەندێکەوە بەرهەمەکەی دەستپێدەکات، شتێکی سەرنجڕاکێشتر، فێڵێك کە مارسێل دوشامپ بە شێوازێکی کاریگەر پیادەی کرد. ئەمە هەمووی ئەنجامدانی زۆر ئاسانە— شتێکی کەم لەبارەی کارەکەتەوە بڵێ، هێنوکە بدە و دیقە بکە بەشێوازی بەکێشکردنەوە، تەنانەت قسەی هاودژ بکە، پاشان هەڵوەستە بکە و لێگەڕێ ئەوانیتر هەوڵ بدەن لەهەموو ئەمە تێبگەن.

خەڵکی پارانمێز ئەوانیتر دەخەنە ناو جۆرێك لە پێگەی نزمەوە— هەوڵدان بۆ لێ تێگەیشتنیان، بە رادەیەك کە ئەوان بتوانن توانای کۆنترۆڵکردنیان هەبێت، ئەوان بەهەمان شێوە ئەو ترسە ببزوێنن کە لە دەوری هەر شتێکی نادڵنیا یان نەزانراو هەیە هەموو سەرکردە مەزنەکان دەزانن کە کەشێکی پڕاو و ئامادەییەکی نۆقێنەریان بۆ دروست دەکات. بۆ نموونە، ماو تسی تۆنگ بەشێوەیەکی زیرەکانە وێنەیەکی پارانمێزی پەرە پێدا، ئەو نیگەران نەبوو لەبارەی ئەوەی کە خۆی ناجێگیر و هاودژ بێت— تەنیا هاودژیی کردارەکانی و قسەکانی بەو مانایە بوون کە ئەو هەمیشە دەستی باڵای هەیە کەس، تەنانەت ژنەکەی خۆیشی، هەستیان بەوە نەکرد کە لێی تێگەیشتوون و بۆیە ئەو نائاسایی دیار بوو. ئەمە بەهەمان شێوە بەو مانایە بوو کە خەڵکی سەرنجی بەردەوامی دەدەنێ و ئۆقرەیان لەبەر هەڵگیراوە تا جوڵە و هەنگاوی دواتری ببینن.

ئەگەر پێگەی کۆمەڵایەتی تۆ ڕێگر بێت لەوەی تۆ بەتەواوی کردارەکانت بخەیتە ناو پارەوە، پێویستە لانی کەم فێر ببیت خۆت کەمتر ڕوون و ئاشکرا بکەیت. تاوەناو، بەشێوازێك ڕەفتار بکە کە بە ئەقڵی خەڵکی تردا ناچێت. بەم شێوەیە تۆ ئەوانەی دەوروبەری خۆت دەخەیتە حاڵەتی بەرگرییەوە، ئەو جۆرە سەرنجە ڕادەکێشیت کە بەهێزت دەکات. ئەگەر بە دروستی ئەنجام بدرێت، دەشێ دروستکردنی پڕاو بەهەمان شێوە ئەو جۆرە سەرنجە بەکێش بکات کە ترس لە دوژمندا دەهێنێتە کایەوە

لەماوەی دووەم جەنگی پونیکیدا (٢١٩-٢٠٢پ.ز)، ژەنەڕاڵی گەورەی قرتاجی، ژەنەڕاڵ هانیبال لە ڕێگەیدا بەرەو ڕۆم بەختیاری دەداپەوە. هانیبال بە زیرەکی و دووفاقیبوونی ناسرابوو.

لەژێر سەرکردایەتی ئەودا، سوپای قرتاجە، هەرچەندە لەوانەی ڕۆمانەکان بچوکتر بوو، بە بەردەوامی پێش ئەوانی دەداپەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، جارێکیان، دیدەوانەکانی هانیبال هەڵەیەکی کارەساتباریان ئەنجامدا کە بووەهۆی ئەوەی سەربازەکانی بکەونە ناو دەوییەکی قامیشەڵان کە دەریا لە پشتیەوە بوو. سوپای ڕۆم ئەو ڕێڕەوە شاخاوییەیان داخست کە دەچووەوە ناوەوە و ژەنەڕاڵەکەی، فابیوس، شاگەشکە بوو- لە کۆتایی ئەو هانیباڵی خستە ناو تەڵە. بە دڵنیایی باشترین پاسەوانەکانی لەسەر ڕێڕەوەکان، ئەو کاری لەسەر پلانێک کرد بۆ تێکشکاندنی هێزەکانی هانیبال. بەڵام لە ناوەڕاستی شەودا، پاسەوانەکان دیمەنێکی ژارئامێزیان بینی. پیریکی سێڵێ ڕووناکییەکان بەرەو شاخ ڕێیان دەکرد. هەزاران و هەزاران ڕووناکی. ئەگەر ئەمە سوپای هانیبال بوو، کە لەناکاو سەدقات زیاد ببوو.

پاسەوانەکان کەوتنە مشتومڕێکی گەرم لەبارەی ئەوەی کە دەبێ ئەمە چ مانایەک بگەیەنێت: هێزی پاڵپشت لە دەریاوە؟ سەربازەکان لەوێ خۆیان حەشاردابوو؟ هیچ بوون؟ هیچ ڕوونکردنەوەیەک مانای نەبوو.

لەکاتێکدا کە ئەوان تەماشایان دەکرد، لە سەرلووتکەی شاخەکە تۆپەڵی ئاگر هاوێژران و ژاوەژاوێکی تۆقێنەر لە ژێرەوەڕا بەرز بووەوە، وەکو ئەوەی کە ملیۆنێک هۆڕن لێبدرێت. پێیان وابوو ئەمانە دێوەزمەن. پاسەوانەکان، کە ئاراترین و ژیرترین بوون لەناو سوپای ڕۆمدا، لە ترسا شوێنەکانی خۆیان چۆڵ کرد.

بەهاتنی ڕۆژی دواتر، هانیبال لە دەوییە قامیشەڵانەکە ڕێکرد. فێڵەکەی چی بوو؟ ئایا ئەو بە ڕاستی دێوەزمەی هێنابووە کایە؟ بە ڕاستیدا ئەوەی کە ئەو کردی فەرمانی کردن بوو بە هێنانی چەند بارەشە لقە دارێک کە بەستریانەوە بە قۆچەکانی هەزاران گا کە وەکو مار هەڵگر لەگەڵ سەربازەکانیدا بوون. دوایی لقەدارەکان ئاگریان تێبەردرا و

دیمەنی مەشخەڵانی سوپایەکان پشتیدا کە بەروو شاخ ڕێدەکەن. کاتێک لقە دارەکان سوتان و ئاگرەکە گەیشتە سەر پێستی گابەکان، شێتگیر بوون و هەر یەکەیان بەلایەکدا دەرپەڕین و وەکو شێت دەیاساڵاند و ئاگریان بەهەموو لای شاخەکەدا بڵاو کردەوە. کلیلی سەرکەوتنی ئەم ئامرازە مەشخەڵەکان، ئاگرەکە، یان ژاوەژاوەکان نەبوون، بەڵکو ڕاستی ئەوە بوو کە هانیبال مەتەڵێکی دروستکردبوو کە هۆش و سەرنجی پاسەوانەکانی ڕاکێشابوو و پەیتا پەیتا دەیترساندن. مەحاڵ بوو لە لوتکەی شاخەکەوە ئەم دیمەنە سەیرە ڕوون بکرێتەوە. ئەگەر پاسەوانەکان بیانتوانیایە ئەمە ڕوون بکەنەوە، ئەوا لە شوێنەکانی خۆیان دەمانەوە.

ئەگەر کەوتیتە تەڵەیەکەوە، خراپتر پەنا بە پەسێرێکەوە و لە بارودۆخێکدا لە حاڵەتی بەرگریدا بوویت، هەوڵ بدە تەقیکردنەوەیەکی سادە بکەیت. شتێک بکە کە ناکرێ بە ئاسانی ڕوون بکرێتەوە یان لێک بدرێتەوە. کردارێکی سادە هەڵبژێرە، بەڵام بەشێوازێک جێبەجێی بکە کە نەیارەکەت ناجێگیر دەکات، شێوازێک بە چەندان لێکدانەوەی مومکینەوە، کە نەیارەکەت ئەمومژاوی بکات. تەنیا پێشبینی نەکراو مەبە (هەرچەندە ئەم تاکتیکەش دەشێ سەرکەوتوو بێت). وەکو هانیبال دیمەنێک دروست بکە کە ناخوێنرێتەوە. پێدەچێ میتودێک نەبێت بۆ شێتییەکەی تۆ، نە قامبەیەک و نە هۆکارێک نەبێت، تاکە ڕوونکردنەوەیەک نەبێت. ئەگەر تۆ ئەمە بە دروستی ئەنجام بدەیت، ئەو ترس و لەرز بڵاو دەکەیتەوە و پاسەوانەکان پێگەکانیان چۆڵ دەکەن. ئەمە ناو بنێ تاکتیکی "شێتگیریی ساختەی هاملێت" چونکە هاملێت بە شێوازێکی کاریگەر لە شانۆییەکەی شەیکسپیردا بەکاریدەهێنێت، لە ڕێگەی ڕەفتارەکەیەوە کلاودیۆسی زڕ باوکی پێ دەترسێنێت. ڕازنامیز هێزەکانت گەورە و هێزت تۆقێنەرتر بەدیار دەخات.

وێنە سەمای ڕووپۆشەکان – ڕووپۆشەکان سەماکار دەشارنەوە. ئەوەی کە ئەوان پیشانی دەدەن دەبێتە هۆی هاتنەخۆش. ئەوەی کە دەیشارنەوە ئارەزوومەندی زیاد دەکات. ئەمە بە جەوهەری ڕاز.

دەسەڵات. ئەگەر تۆ دەستەجێ هێزت پاشگەزبوو، ئەوا ببەخشە، بەتایبەتی رێگای كەم لەگەڵ هەموو شتێكدا ئاوێتە مەكە و پارەكە بپێچە نەوەك دەبوویت، ئەو كاتەی كە گرنگیت دەبێت بێ رووپۆش دەكەیتەوە، زۆر راشكاو مەبە. بەهێزبوونەوە تۆ لاسایی شێوازی خوداوەند دەكەیتەوە كاتێك وا دەكەیت مرۆڤەكان سەرسام بێ و پاستر

(بالتاسار گراسیەن ١٦٠١–١٦٥٨)

## پێچەوانە بوونەوە

لە سەرەتای سەركەوتنت بەرەو لوتكە، دەبێ بەهەموو شێوەیەكی سەرنج راكێشبێت، بەڵام لەكاتێكدا كە بەرزتر دەبیتەوە دەبێ بەردەوام هێزت بگونجێنێت. لەو بەهەمان تاكتیك هەڵكی بێزار مەكە. كەشێكی پڕ جادووی بە بەرەوەیە بۆ ئەوانەی كە پێویستیان بە دروستكردنی پرشنگێكی دەسەڵات هەیە و پێویستیان بەوەیە وا بكەن تێبینی بكرێن، بەڵام دەبێ مەشێوەیەكی هاوسەنگ و رێكوپێك دیار بێت. مەثا هاری بە سەختەچێتییەكەی پێی خۆی زۆر راكێشا، هەرچەندە تۆمەتی ئەوەی كە سیحوبر بوو سڕ بوو، لەكاتی خۆیدا گریمانەیەكی مەعقول بوو چونكە هەموو دروكانی وایلێكرد جێی گومان و خراپەكار دەردەكەوێت. مەمنلە كەشی پارتمیرییەكەت بەهێوشی وەرچەرخێت بۆ ناوبانگی مریودان. دەبێ ئەو پارەی دروستی دەكەیت وەكو گەمەیەك دەركەوێت، بێ بەپاری و بێ هەرەشە بێت. ئەو حاڵەتە بپاسەرەوە كە تیایدا فجی خوت تێدەپەڕێنیت و بكشێوە

لولا مۆنتێز یەكێك بوو لە پڕاوەكارە گەورەكانی هونەری بەكێشكردنی سەرنج. ئەو لە باكگراوەندێكی ئێرلەندی چینی ناوەندەوە هات و بووە خۆشەویستی (فرانز لیچت) و پاشان مەعشوقەی راوێژكاری سیاسی پاشا لودویگی باڤاریا. كەچی لە ساڵانی دواتردا، هەستی هاوسەنگی لەدەستدا

لە لەندەن لە ١٨٥٠دا نمایشێكی (ماكبێس)ی شەیكسپیر نەمامدرا مە بەشداری گەورەترین ئەكتەری ئەو كاتە، چارلز جۆن كین. هەموو كەسێكی هاوەن پێگە لە

کۆمەڵگەی ئینگلیزدا لەری دەبوو. دەنگۆی ئەوە بڵاو بووەوە کە ئەمانەت شازنە ڤیکتۆریا و میر ئەلبێرت لەری دەبوون. ماریش ئەو سەردەمە وا پێویستی دەکرد کە هەمووان دانیشتبن بەر لەوەی شاژن بگات. بۆیە ئامادەبووان کەمێک زووتر گەیشتن، و کاتێک شاژن هاتە ناو شوێنی شاهانەی، ئەوان پەیڕەوییان لە تەقلیدی هەڵسان چەپڵەلێدان بۆی کرد. خەڵکی شاهانە چاوەڕێ بوون، پاشان چەماوەوە هەمووان دانیشتن و ڕووناکییەکان کز بوون. پاشان لە پڕێکدا، هەموو چاوەکان کەوتنە سەر شوێنێکی بەرامبەر شاژنە ڤیکتۆریا. ژنێک لە سێنەرەکانەوە دەرکەوت، کاتێکی بەرەنگر لە شاژن دانیشت. ئەوە لۆلا مۆنتێز بوو. بەو تاجێکی مرواری لەسەر قژە ڕەشەکەی و چاکەتێکی کوڵکی لەسەر شانەکانی بوو. خەڵکی واقیان وڕمابوو و بەگوێچکەی یەکتریاندا دەچپاند لەکاتێکدا کە چاکەتە پێست قاقمەکەی هێنرایە خوارەوە و تریشە وەنەوشەییەکەی دەرکەوت. لەگەڵ سوڕانی سەریان، ئامادەبووان توانیان ئەوە ببینن کە هاوسەرە پاشاییەکە بە ئەنقەست خۆیان لە ڕوانین لە شوێنەکەی لۆلا بووارد. ئەوان شوێن نموونەکەی ڤیکتۆریا کەوتن و پاشماوەی ئێوارەکە لۆلا مۆنتێز فەرامۆش کرا. پاش ئەو ئێوارەیە کە لە کۆمەڵگەی کەشخە و ڕاقیدا جورئەتی ئەوەی بەکرد لەگەڵ ئەودا ببینرێت. هەموو هێزەی موگناتیسییەکانی پێچەوانە بووەوە. خەڵکی ڕایاندەکرد تا نەیبینن. ئابڕووی لە ئینگلتەرە تەواو بوو.

قەت ڕێ مەدە چاوچنۆک دەرمەکەوە بۆ سەرنج ڕاکێشان، چونکە ئەمە ئاماژەی ناتەمنی دەدات و ناتەمنیش دەسەڵات ڕەوت دەکات. کاتێک لە حزووری پاشا یان شاژندا، یان هاوتاکانتدایت، بچەمێرەوە و بەرەو سێنەرەکان پاشەکشە بکە، قەت کێبڕکێ مەکە

## یاسای ٧

# وا لە ئەوانیتر بکە کارەکەت بۆبکەن، بەڵام هەمیشە خۆت بکە بە خاوەنی

### پوختە

*ژیری، زانیاری و جووڵانی خەڵکی تر بەکاربهێنە بۆ خزمەتی دۆزی خۆت. هاوکارییەکی وەها کات و وزەیەکی زۆرت بۆ دەگێڕێتەوە، ئەمە پڕشنگێکی بەهاداری کارایی و خێرایییت دەداتێ. لە کۆتاییدا یارمەتیدەرانی تۆ بیر دەچنەوە و یادت دەکرێتەوە. قەت ئەو شتە بۆ خۆت ئەنجام مەدە کە ئەوانیتر دەتوانن بۆ تۆی ئەنجام بدەن.*

### سەرپێچی و پەیڕەوکردنی یاساکە

لە ساڵی ١٨٨٣دا، زانایەکی سربی بەناوی نیکۆلا تێسلا بۆ لقی ئەورووپی کۆمپانیای کیشوەریی ئەدیسۆن کاری دەکرد. ئەو داهێنەرێکی لێهاتوو بوو و چارلز باچەلەر، بەڕێوەبەری کارگە و هاوڕێی کەسیی تۆماس ئەدیسۆن، ڕاێکرد تا لە ئەمریکا سەرلەنوێ سامانی خۆی بکات، نامەیەکی یەکترناسینی پێدا تا بە خودی ئەدیسۆنی بناسێنێت. بۆیە ژیانێکی ناڕەحەت و پڕ گیروگرفتی دەستپێکرد کە تاوەکو مردنی تێسلا درێژەی کێشا.

کاتێک تێسلا لە نیویۆرک چاوی بە ئەدیسۆن کەوت، داهێنەرە بەناوبانگەکە هەر لەوێ کاری دایە. تێسلا هەژدە سەعات لە ڕۆژێکدا کاری کرد، ڕێگەگەلێکی دۆزییەوە بۆ

دەشکردنی دایەمۆ بەرانییەکانی ئەدیسۆن. لە کۆتاییدا ئەو پێشنیاری کرد بەتەواوی دیزاینیان بکاتەوە. بەلای ئەدیسۆنەوە ئەمە ئەرکێکی مەزن دیار بوو کە لەوانەبوو سالانێک بخایەنێت، مەبن ناکام، بەلام ئەو بە تێسلای وت "پەنجا هەزار دۆلاری بۆ تۆ تێدایە-ئەگەر تۆ بتوانیت بیکەیت" تێسلا ڕۆژ و شەو کاری لەسەر پڕۆژەکە کرد و تەنیا دوای سالێک ڤێرژنێکی چاککراوی دایەمۆی بەرهەمهێنا، کە کۆنترۆلی ئۆتۆماتیکی هەبوو. ئەو چووە لای ئەدیسۆن بۆ ئەوەی هەواڵی بەپەلەی بداتێ و پەنجا هەزار دۆلارەکەی وەربگرێت. ئەدیسۆن چاککردنەکەی بەدڵ بوو کە لەبەرامبەریدا خۆی و کۆمپانیاکەی ئیمتیازەکەیان دەچنییەوە، بەلام کاتێک مەسەلەکە هاتە سەر پارە، بە گاڵتە سربییەکەی وت "تێسلا، تۆ لە گاڵتە و گەپی ئەمریکی ئێمە تێناگەیت!" و لەبری ئەمە پێشنیاری موچە زیادکردنی بۆ کرد.

تێسلا خووی دابووە دروستکردنی سیستەمێکی تەزووی گۆڕاو (ئەی سی)ی کارەبا، ئەدیسۆن بارەڕی بە سیستەمێکی تەزووی نەگۆڕ هەبوو (دی سی) و نەک تەنیا ڕەتیکردەوە پشتگیری توێژینەوەی تێسلا بکات بەڵکو دواتر هەموو ئەوەی لە توانایدا بوو کردی بۆ زیان گەیاندن پێی. تێسلا ڕوویکردە خاوەن سامانی گەورەی پیتسبیرگ، جۆرج وێستینهاوس کە کۆمپانیای کارەبایی خۆی بونیاد نابوو. وێستینهاوس بەتەواوی کۆمەکی دارایی توێژینەوەکەی تێسلای کرد و ڕێککەوتننامەیەکی پاداشتی بەرچاوی خستە بەردەم لە قازانجەکانی داهاتوودا. ئەو سیستەمەی تەزووی گۆڕاو کە تێسلا گەلالەی کرد هێشتا لەمڕۆدا ستانداردە- بەلام پاش ئەوەی مافی خاوەنداریتی بەناوی ئەوەوە کرا، زاناکانی تر هاتنە پێشەوە بۆ خۆ کردنە خاوەنی داهێنانەکە، بانگەشەی ئەوەیان کرد کە ئەوان بناغەکەیان بۆ ئەو دانارە. ناوی ئەو لەو تێکەڵبێکەیەدا ون بوو و خەلکی داهێنانەکەیان خستە پاڵ خودی وێستینهاوس

سالێک دواتر، وێستینهاوس کەوتەبەر تۆفەرێکی (جەی پی مۆرگان) کە وایلێکرد ئەو گرێبەستەی پاداشتی بەخشندەیە بکشێنێتەوە کە لەگەل تێسلا واژۆی کردبوو. وێستینهاوس بۆ زاناکەی ڕوونکردەوە کە کۆمپانیاکەی بەرگەی نەدەگرت ئەگەر

پادانشتەکانی بەئەواوی پێ بدایە، ئەو تێسلای رازیکرد تا ساغکردنەوەی مافەکانی داهێنانی لەبەرانبەر ٢١٦٠٠ دۆلاردا قبوڵ بکات- بێگومان بڕە پارەیەکی زۆر بوو، بەڵام بەهاکەیان زۆر کەمتر لە ١٢ ملیۆن دۆلار بوو لەو کاتەدا. کۆمەکبەخشەکانی تێسلایان لە سامان، ماڵ داهێنان و لە جەوهەردا لە ئیعتیبار بۆ گەورەترین داهێنانی ژیانی، بێبەری کردبوو.

ماوی گوگلیەمۆ مارکۆنی بۆ هەمیشە دەبەسترێتەوە بە داهێنانی ڕادیۆ. بەڵام هەڵەیەکی کەم دەزانن کە لە بەرهەمهێنانی داهێنانەکەیدا- ئەو لە سەرانسەری کەناڵی ئینگلیزدا لە ١٨٩٩ پەخشی سیگناڵی کرد- مارکۆنی ئەو مافەی داهێنانی بەکارهێنا کە تێسلا لە ١٨٩٧دا تۆماری کردبوو و کارەکەی پشت ئەستوور بوو بە توێژینەوەی تێسلا. جارێکی تر تێسلا هیچ پارە و ئیعتیبارێکی وەرنەگرت. تێسلا مۆتۆرێکی ئیندوکشن و سیستەمێکی وزەی گۆڕاوی داهێنا و ئەو "باوکی ڕاستەقینەی ڕادیۆ"یە. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کام لەم دۆزینەوانە ماوی ئەوی پێوە نییە. ئەو وەکو پیرە پیاوێک، لە هەژاریدا ژیا.

لە ساڵی ١٩١٧دا، لە ساڵانی هەژاریی دواتریدا، تێسلا پێی وترا کە میداڵی ئەدیسۆنی ئینستیتۆی ئەمریکی بۆ ئەندازیاریی کارەبا وەردەگرێت. ئەو میداڵەکەی ڕەت کردەوە وتی "ئێوە پێشنیاری ئەوە دەکەن بە میداڵێک ڕێزم بۆ دابنێن کە دەمتوانی لە بەحەی چاکەتەکەمی بدەم و بۆ کاتێکی پڕ شاناری بە بەردەم ئەندامانی ئینستیتیوتەکەتاندا ڕێ بکەم. ئێوە جەستەی مستان دەڕازاندەوە و بەردەوام دەبوون بەوەی لێگەڕێن ئەقڵ و بەرهەمە ئەفرێنەرەکان لەبرسا بمرن لەبەرئەوەی بەتەواوی داپێدانیان لەکاتێکدا ئەو ساغەیەی دابین کرد کە بەشی زۆری ئینستیتیوتەکەی ئێوەی لەسەر ڕۆنراوە"

## لێکدانەوە

زۆر کەس ئەو وەهمەی لایە کە زانست، بەو شێوەیەی کە مامەڵە لەگەڵ فاکتەکاندا دەکات، لەودیو ئەو ڕکابەرێتییە ناچیزانەوەیە کە گیروگرفت بۆ جیهان دروست دەکەن. نیکۆلا تێسلا یەکێک بوو لەوانە. ئەو بڕوای وابوو راست هیچ پەیوەندییەکی بە

سیاسەتەوە نییە و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە باکی بەناوبانگ و سامان نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێک ئەو بەتەمەنداچوو، ئەمە کارە ڕاستییەکەی ویران کرد. بەهۆی ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی بە هیچ دەزگەوەیەکی دیاریکراوەوە نەبوو، نەیتوانی هیچ وەبەرهێنەرێک بۆ ئایدیا نوێیەکانی بەکێش بکات. لەکاتێکدا کە ئەو بیری لە داهێنانە گەورەکانی ئایندە دەکردەوە، ئەوانیتر ئەو مافی داهێنانەیان بری کە ئەو هەموکە کەڵاڵەی کردبوو و شکۆمەندییەکەیان بۆ خۆیان برد.

ئەو دەیویست هەموو شتێک بەتەنیا بۆ خۆی بکات، بەڵام لە پرۆسەکەدا تەنیاخۆی داهێزرا و هەژار کەوت.

ئەدیسۆن جەمسەری پێچەوانەی تێسلا بوو. ئەو بە ڕاستی لێرەمەندێکی ڕاستی یان داهێنەرێک نەبوو. ئەو جارێکیان وتبووی پێویستی بەوە نییە ماتماتیکزانێک بێت چونکە هەمیشە دەتوانێت هۆی کەسێکی وەها بەکرێ بگرێت. ئەمە میتۆدی سەرەکی ئەدیسۆن بوو، ئەو بە ڕاستی بزنسمانێک و برەوپێدەرێک بوو، ئەو مزد و دەرفەتانەی هەبوون دەیدۆزییەوە، پاشان باشترین کەسی لە بوارەکەدا بەکرێ دەگرت تا کاری بۆ بکات. ئەگەر پێویست بووایە ئەوا دزی لە ڕکابەرەکانی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا ناوی ئەو زۆر باشتر ناسرابوو بە هی تێسلا و ناوی ئەو زۆرتر پەیوەست دەکرایەوە بە داهێنانەکان.

وانەکە دوو دیوە. یەکەم، ئیعتیباری داهێنان یان ئەفراندنێک بەقەد خودی داهێنانەکە گرنگە ئەگەر بەڵێنی گرنگتر. دەبێ تۆ ئیعتیبارەکە بۆ خوت ڕاس بکەیت و ئەوانیتر لە دزیی، یان لە کەڵک وەرگرتن لە کارە سەختەکەت بەدوور بگریت. بۆ بەدیهێنانی ئەمە دەبێ هەمیشە چاودێر و دڵڕەق بیت، ئەفراندنەکەت بە بێدەنگی بهێڵیتەوە تا ئەو کاتەی کە دەتوانیت دڵنیا بیت لەوەی هیچ سیمارکە کەچەڵێک بە سەر سەرتەوە دەوور و خول نادات. دووەم، فێر بە کەڵک لە کاری خەڵکی تر وەربگریت بۆ خزمەتکردنی زیاتری دۆزەکەت. کات گرنگە و ژیان کورتە. ئەگەر تۆ هەوڵ بدەیت بەتەنیا تەنیا هەمووی خۆت ئەنجامی بدەیت، ئەوا حاڵەت شڕ دەبێت، ورەت لەبەر دەبڕوات و دادەهێزرێیت. زۆر باشترە کە هێزەکانت پارێزگاری لێبکەیت، بار بدە سەر ئەو کارەی ئەوانیتر کردوویانە و ڕێگەیەک بدۆزەرەوە بیکەیتە هی خۆت

*هەموو کەسێک لە ناو بازرگانی و پیشەسازیدا دزی دەکات. من خۆم زۆرم دزیوە*
*بەڵام دەزانم چۆن بدزم*

*تۆماس ئەدیسۆن، ١٨٤٧–١٩٣١*

## کلیلی دەسەڵات

جیهانی دەسەڵات دینامیکی جەنگەڵی هەیە. ئەوانە هەن کە بە ڕاوکردن و کۆشش دەژین و ژمارەیەکی زۆری ئەو زیندەوەرانەش هەن (کەمتیار، سیسارکە کەچەڵ) کە لەسەر ڕاوکردنی ئەوانیتر دەژین. ئەمانەی دوایی، جۆرە کەمتر وێناکراوەکان، ناتوانن ئەو کارە بکەن کە جەوهەرییە بۆ دروستکردنی دەسەڵات. ئەوان لەگەڵ ئەوەشدا زوو تێدەگەن لەوەی کە ئەگەر تا ماوەیەکی پێویست چاوەڕێ بکەن ئەوا دەتوانن هەمیشە ئاژەڵێکی تر بدۆزنەوە بۆ ئەوەی کارەکەیان بۆ بکات. ساویلکە مەبە. لەم ساتەوەختەدا، لەکاتێکدا کە تۆ تاقەتت بە پڕۆژەیەکەوە دەپڕوکێنێت، سیسارکە کەچەڵ هەن بەسەر سەرەتا خول دەخۆن و هەوڵ دەدەن ڕێگەیەک بدۆزنەوە تا زیندوو بمێنن و تەنانەت لەسەر ئەفراندنەکەت بلەوەڕێن. کەڵکی نییە لەمبارەیەوە سکاڵا بکەیت، یان بە خەم و خەفەت خۆت بتلێنیتەوە، وەک ئەوەی نیتشە کردی. وا باشترە خۆت بپارێزیت و بچیتە ناو گەمەکەوە. هەر کە بناغەیەکی دەسەڵاتت بونیادنا، خۆت ببە بە سیسارکە کەچەڵ و کات و وزەیەکی زۆر بۆ خۆت پاشەکەوت بکە.

لەو دوو جەمسەرەی گەمەکە، دەشێ یەکێکیان بە نموونەی (فاسکۆ نونیز دی بالبوا) شرۆڤە بکرێت. بالبوا فرچکی بە شتێکەوە گرتبوو— دۆزینەوەی ئێل دۆرادۆ، شاری ئەفسانەیی سامانی زێڕ و زەبەند.

لە سەرەتاکانی سەدەی شازدەدا، پاش چەندە سەختی و گرفت و نزیکبوونەوە لە مەرگ، ئەو بەڵگەی ئیمپراتۆریەتی گەورە و دەوڵەمەندی باشووری مەکسیکی دۆزیەوە، کە دەکاتە پیرۆی ئەمڕۆ. بە گرتنی ئەم ئیمپراتۆریەتە، ئینکا، و ڕکێفکردنی ئاڵتونەکەی، خۆی دەکردە (کۆرتێس)ێکی تر. کێشەکە ئەوە بوو کە تەنانەت لەکاتێکدا

که ئەم دوورینەوەیەشی ئەنجامدابوو، دەنگۆی ئەمە لەنێو چەندەها نوزەرەوەی تر بڵاو بووەوە. ئەو لەوە تێگەیشت کە بیرۆکەی گەمەکە بریتییە لە بێدەنگ هێشتنەوەی و چاودێریکردنی وریایانەی ئەوانەی دەوروبەری. چەند ساڵێک پاش ئەوەی شوێنگەی ئیمپراتۆریەتی ئینکانی دۆزییەوە، سەربازێک لە سوپاکەی خۆی بەناوی فرانسیسکۆ پیزارۆ، بەرەنگاربوو بۆئەوەی بە تۆمەتی خیانەتی نیشتمانی سەرپەڕاندن ببێت. پیزارۆ پڕۆپا سەر دەستخستنی ئەوەی کە پێشوا ساڵانێکی زۆری بە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی بەسەر بردبوو

هەمسەرەکەی تر ئەوەی پینتەر پۆل ڕوبێنسە کە لەدرەنگانی ژیانی کاریدا، خۆی لەبەرامبەر شەپۆلێکی داواکاری بۆ تابلۆکانی نۆزییەوە. ئەو سیستەمێکی دروستکرد، لە ستۆدیۆ گەورەکەیدا ئەو دە دوانزە وێنەکێشی دامەزراند، یەکێکیان پسپۆر بوو لە پۆشاک، ئەویتر لە باکگراوندەکان و هیتر. ئەو هێڵێکی بەرهەمهێنانی بونیادنا کە تیایدا ژمارەیەکی گەورەی کانڤاس لەهەمان کاتدا کاریان لەسەر دەکرا. کاتێک کڕیارێکی گرنگ سەردانی ستۆدیۆکەی دەکرد، ڕوبێنس بۆ ماوەی ڕۆژێک وێنەکێشەکانی بەدەر دەنا. لەکاتێکدا کە کڕیار لە بالکۆنییەوە تەماشای دەکرد، ڕوبێنس بە ڕیتمێکی بێ وێنە و بە وزەیەکی باوەڕپێنەکراوەوە ئیشی دەکرد. کڕیارەکە بە سەرسامییەوە لەبەرامبەر ئەم پیاوە مەدووبەناسە کە دەیتوانی لە کاتێکی کورتدا ئیش لەسەر چەند شاکارێک بکات، شوێنەکەی جێ دەهێشت

ئەمە جەوهەری یاساکەیە: هێز بە ئەوانیتر کارەکەت بۆ بکەن لەکاتێکدا کە تۆ خاوەندارێتی دەکەیت و وا خۆت دەرخە کە دەسەڵات و هێزێکی خوداوەندئاسات هەیە ئەگەر پێت وابێت وەها گرنگە هەموو کارەکان خۆت بیکەیت، ئەو قەت دوور ڕێ ناگەیت و بەدەست چارەنووسی بالنووکان و تیسلاکانەوە دەناڵێنیت. خەڵکێکی خاوەن ئەو شارەزایی و ئەفراندنە بدۆزەرەوە کە تۆ نیتە. یان کاریان پێ بدە، لەکاتێکدا کە ناوی خۆت دەخەیتە سەروەی ناوی ئەوانەوە، یان ڕێگەیەک بدۆزەرەوە تا کارەکەیان سەنت و

بیکەیتە هی خۆت. لێرەوە ئەفسەرییی ئەوان دەبێتە هی تۆ و تۆ بە نسبەت جیهانەوە وەکو بلیمەتێك دیار دەبیت

ئەم باسە یادکردنەوەیەکی سری هەیە کە پێویستی بە بەکارهێنانی مشەخۆرانەی کاری هاوسەردەمەکانت نییە. ڕابردوو بەکاربهێنە، کە کۆگایەکی گەورەی ماریفەت و زیرەکییە ئیسحاق نیوتن ئەمەی دەوت " وەستان لەسەر شانی زەبەلاحەکان" مەبەستی ئەوە بوو کە لە ئەنجامدانی دۆزینەوەکانیدا، ئەو کاری لەسەر دەستکەوتەکانی ئەوانیتر کردبوو. ئەو دەیزانی کە بەشێکی گەورەی پرشنگی بلیمەتییەکەی، دەگەڕێتەوە بۆ توانای لێزانی بۆ زۆرترین کەڵك وەرگرتن لە فەیلەسوفەکانی زاناکانی پێشینیان، سەدەکانی ناوەڕاست و دێرین. شەیکسپیر زنجیرەی ڕووداو، کارەکتەر و تەنانەت دیالۆگی لە پلوتارك و نووسەرانی تر وەردەگرت، چونکە دەیزانی لە نووسینی سایکۆلۆژیای قووڵ و وتەی زیرانە کەس لە پلوتارکی تێنەپەڕاندووە. چەند نووسەری دواتر بە نۆرەی خۆیان شتیان لە شەیکسپیر وەرگرتووە (کۆپییان کردووە)؟

ئێمە هەموومان دەزانین ژمارەیەکی چەند کەمی سیاسییەکانی ئەمڕۆ وتارەکانی خۆیان دەنووسن. قسەکانی خۆیان تاکە دەنگێکیشیان بۆ مسۆگەر ناکات. ڕەوانبێژیی و زیرەکییان، هەرچەندێك بێت، فەرمانبەری وتاربێژێکی خەڵکی تر کارەکە دەکەن، ئەمان دەستە ماوەی، لێوی پێشنیکی ئەمە جۆرە دەسەڵاتێکە کە تۆ هەمووی هەیە. فێر بە ماریفەتی ڕابردوو بەکار بهێنیت و لێرەوە تۆ وەکو بلیمەتێك دەردەکەویت، تەنانەت ئەو کاتەش کە بە ڕاستی وەرگرێکی زیرەکیشیت

ئەو نووسەرانەی کە لە سروشتی مرۆڤدا قووڵ بوونەوە، وەستایانی دێرینی ستراتیژ، مێژوونووسانی گەمژەیی مرۆڤ، ئەو پاشا و شازنانەی کە بە خۆرسکترین شێوە فێر بوون چۆن دەست و پەنجە لەگەڵ باری قورسی دەسەڵاتدا نەرم بکەن — مەعریفەتیان تۆری کۆکراوەیە، چاوەڕێ دەکەن تا تۆ بێیت و لەسەر شانیان بوەستیت. دەکرێ زیرەکییان ببێتە زیرەکی تۆ، شارەزایەتییان ببێتە شارەزایەتی تۆ و ئەوان قەت سەرۆکەلەیان پەیدا نابێتەوە تا بە خەڵکی بڵێن تۆ بە ڕاستی چەندێك نارەسەنیت. تۆ دەتوانیت سەرسەختانە بە درێژایی ژیان

کار بکەیت، چەندەها هەڵە بکەیت، کات و وزە بەفیڕۆ بدەیت لە هەوڵی ئەوەدا کە شتەکان لە ئەزموونی خۆتەوە بکەیت. یان دەتوانیت چەند سوپایەکی پابەندبوو بخەیتە گەڕ هەروەک بیسمارک جارێکیان وتی "گەمژەکان دەڵێن لە ئەزموونەوە فێر دەبین، من پێم باشترە کەڵک لە ئەزموونی ئەوانیتر وەرگرم"

وێنە: سیسارکە کەچەڵ: لە هەموو زیندەوەرانی ناو جەنگەڵ، بە ئاسانترین شێوە پێی دەگات. کاری سەختی ئەوانیتر دەبێتە کاری ئەو. شکستی ئەوان بۆ زیندووماندنەوە دەبێتە خۆراکی ئەو. چاوێک لە سیسارکە کەچەڵ بکە- لەکاتێکدا کە تۆ لەکاری سەختدایت، ئەو بەسەر سەرتەوە دەخولێتەوە. شەڕی لەگەڵ مەکە، بچۆرە پاڵی.

دەسەڵات: شتی زۆر هەیە بۆ زانین، ژیان کورتە و ژیان نییە بەبێ مەعریفە. بۆیە ئەوە ئامرازێکی نایابە کە مەعریفەت لەهەموان بەدەست بهێنیت. لێرەوە، بە ئارەقی ناوچەوانی ئەوانیتر، ناوبانگی زۆرزانێک بەدەست دێنیت

(بالتاسار گراسیەن، ١٦٠١–١٦٥٨)

## پێچەوانەبوونەوە

کات هەن کە تێیاندا خۆ کردنە خاوەنی ئەو کارەی ئەوانیتر کردوویانە ژیرانە نییە. ئەگەر دەسەڵاتی تۆ وەکو پێویست بونیادی نەگرتووە، ئەوا وەها دیار دەبێت کە خەریکی لەسەر سەریچ و هۆشی کەسێک پاڵ بنێیت. بۆئەوەی بەکارهێنەرێکی لێهاتووی بەهرە بیت ئەوا دەبێ پێگەکەت بەهێز بێت، ئەگینا بە فریودان تۆمەتبار دەکرێیت

دڵنیابە لەوەی کە دەزانیت کاتێک ڕێگە بە خەڵکی تر دەدەیت هونەرەکەش بۆ بە نێعتیبارەکەدا خزمەت بە ئامانجەکەت دەکات. بەتایبەت گرنگە چاوچنۆک نەبیت کاتێک گەورەیەک لەسەرووی تۆوە هەیە. سەردانی مێژوویی سەرۆک ڕیچارد نیکسن بۆ کۆماری گەلی چین لە بنەڕەتدا بیرۆکەی ئەو بوو، بەڵام لەوانەبوو قەت ڕوونەدات ئەگەر لەبەر دیپلۆماسیەتی لێهاتووانەی هێنری کیسنجەر نەبووایە. لەگەڵ ئەوەشدا، لەگەڵ هەندێ کاتی خۆ بەخاوەنکردندا، کیسنجەر بەشێوەیەکی لێهاتووانە ڕێگەیدا نیکسن پشکی شێری

بەرمکەویت بە راستی ئەوەی کە حەقیقەت دوایی دەردەکەویت، وریا بوو لەوە بنگەی خوی لە کورت مەودادا بەھانە بەترسییەوە لە ڕیگەی قوزحکردنی سەرنجی گشتیەوە کیسبیجەر شارەرایانە یارییەکەی کرد. ئەو خۆی کردبووە جارەبی کاری ئەوانەی ژێر خۆی لەکاتیکدا کە بە ئەدەبەوە ئیعتباری کار و ڕەحمەتی خوی بەخشیە ئەوانی سەرەوە ئەمەیە شێوازی یارییەکە.

*بارئەرەی سەلامەت بێت، ئەگەر ڕاوچی پشت بە ئەسپەبی عەرەبانەکە ببەستێت، کەڵک لە قاچەکانی شەش ئەسپەکە وەردەگرێت و وەھا لە (وانگ لیانگ) دەکات هەوسارەکانیان بەدەستەوە بگرێت، پاشان خوی ماندوو ناکات و بەئاسانی دەسینێت پێش ئاژەڵە خێراکان بدائەوە. ئێستا بە خەیاڵی ئەوەی کە لە کەلکی عەرەبانەکە لوتار بووە، واز لە قاچ بەسوودەکانی ئەسپەکان و شارەزایەتی ولنگ لیانگ دەهێنێت و دڵخۆشە بەوەی بە دوای ئاژەڵەکاندا ڕابکات و باشان، ئەگەرچی قاچەکانی ئەوەندەی قاچەکانی (لوو چی) خێرا بوون، لەکاتی خۆیدا پێشی ئاژەڵەکانی بەدەدایەوە. لە ڕاستیدا، ئەگەر ئەسپی باش و عەرەبانەی بەھێز بەکار بھێنرێن، ئەوا تەنیا خزمەتکاری پیاو و خزمەتکاری ژن بایی پێویست باش دەبن بۆ گرتنی ئاژەڵ*

هان فێی تزو، فەیلەسوفی چینی، سەدەی سێیەمی پێش زایین

## مریشکە کوێر

*مریشکێک کە بینایی لەدەستدابوو و بە پێ پرژکە کردن لە زەوی ڕاهاتبوو بۆ گەڕان بەدوای خۆراکدا، هەرچەندە کوێر بوو هێشتا بەردەوام بوو لە پێ پرژکەکردن بەوپەڕی سەرسەختییەوە. ئەو قاچە ماندووە چ کەڵکێکی هەبوو؟ مریشکێکی تری تیژبین کە قاچە ناسکەکانی پاراستبوو قەت لای مریشکە کوێر لانەچوو و کەبەەی بە بەرهەمی مریشکە ماندووەکەی بڕ دەکرد، چونکە چەندەی مریشکە کوێرەکە پێ پرژکەی لە زەوی دەکرد و دەنکە گەنمێک دەردەکەوت، هاوەڵ تیژبینەکەی قووتی دەدا*

حەکایەتەکان، گۆتهولد لێسینگ ۱۷۲۹–۱۷۸۱

## یاسای ژمارە ٨

# وا لە خەڵکی تر بکە بێنە لات، ئەگەر پێویست بوو چەشتە بەکاربهێنە

### حوکم

*کاتێك تۆ کەسەکەی تر ناچار دەکەیت هەنگاو بنێت، تۆ ئەو کەسەیت کە کۆنترۆڵت بەدەستە. هەمیشە وا باشترە وەها لە نەیارەکەت بکەیت بێتە لات و لە پێناوەکەدا واز لە پلانەکانی خۆی بهێنێت. بە دەستکەوتنی سەروو ئاسایی بەکێشی بکە — پاشان هێرش بەرە. تۆ کارتەکانت بەدەستەوە دەبێت.*

### پێشێلکردنی یاساکە

لە کۆنگرەی ڤییەنا لە ١٨١٤دا، ڕابەرەکانی ئەورووپا کۆ بوونەوە بە چنینەوەی پاشماوەی ئەورووپای داڕماوی ناپۆلیۆن. شارەکە پڕ بوو لە شادی و ئاهەنگەکان دەوشاوەترین بوون لە یادەوەریدا. لەگەڵ ئەوەشدا، سێبەری ناپۆلیۆن خۆی بەسەر ڕێوشوێنەکانەوە بوو. لەبری ئەوەی لەسێدارە بدرێت یان دەربەدەر بکرێت، ڕەوانەی دوورگەی ئێلبا کرابوو کە زۆر لە کەناری ئیتالیا دوور نەبوو.

تەنانەت ئەو کاتەش کە لەسەر دوورگەکە بەند کرابوو، پیاوێکی دارا و ئەفرێنەری وەکو ناپۆلیۆن بۆناپەرت حاڵی هەمووانی ناجێگیر دەکرد. نەمساویەکان پیلانی ئەوەیان دانا لە ئێلبا بیکوژن، بەڵام بۆیان دەرکەوت ئەمە مەترسیدارە. ئەلێکساندەری یەکەم، تزاری

سەرلەمی ڕووسیا، بە تووڕە بوون لە کۆنگرێس شلەژانەکەی ڕیاتر کرد کاتێک بەشێکی پۆلەندە مکولیبیان کرد "ئاگادار بن، ئیمپراتۆرەکە بەرەڵا دەکەم!" ئەو هەڕەشەی کرد و هەموو زانیبیان مەبەستی ناپلیۆنە. لە هەموو ئەو دەوڵەتمەدارانەی لە ڤیەننا کۆ ببوونەوە، تەنیا تالیراند، وەزیری دەرەوەی پێشووی ناپلیۆن هێمن و ئیشاک دیار بوو وەک ئەوە وابوو کە ئەو شتێکی دەزانی ئەوانیتر نەیاندەزانی.

لەهەمان کاتدا، لە دوورگەی ئێلبا، ژیانی ناپلیۆن گاڵتەجاڕییەکی شکۆی پێشووی بوو وەکو "پاشا"ی ئێلبا، ئەو ڕێگەی پێدرابوو تا دەربارێک دروستبکات- چێشتلێنەر، کارگوزاری ڕێکخستنی پۆشاک، پیانیستی ڕەسمی و چەند دەربارییەک. هەموو ئەمە و ڕیسواکردنی ناپلیۆن دابڕاوی و پێدەچوو کاریگەریش بێت

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕەستانە، زنجیرەیەک ڕووداو ڕوویاندا زۆر سەیر و دراماتیکی بوون کە دەکرا بکرێنە شانۆییەک. ئێلبا بە کەشتییە بریتانییەکان چواردەوری گیرابوو تۆپخانەکانیان هەموو ماڵەکانی دەرچوونیان دەپێکا. لەگەڵ ئەوەشدا، بەشێوەیەک بە شێوەکان و لەبەر ڕووناکایی ڕۆژ لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ١٨١٥دا، کەشتییەک بە تۆمەتە پێوەوە ناپلیۆنیان هەڵگرت و ملیان لە دەریا نا. ئینگلیزەکان بەدوای کەوتن بەڵام کەشتییەکە لێی دەرچوو. ئەم ڕاکردنە تەقریبەن ئەستەمە بووە مایەی سەرسووڕمانی خەڵک لە سەرانسەری ئەورووپا و دەوڵەتمەدارانی لە کۆنگرەی ڤییەننا تۆقاند.

هەرچەندە وەها سەلامەتتر دەبوو کە ئەورووپا جێبهێڵێت، ناپۆلیۆن بەک ئامێ گەڕانەوە بۆ فەرەنسای هەڵبژارد. ئەو مەترسییەکانی هەنگاویان بەرەو پاریس بە سوپایەکی بچووکەوە بەپێشت، بەو هیوایەی تاجەکە بەدەست بهێنێتەوە. ستراتیژەکەی ئەو کاریگەر بوو- خەڵکی هەموو چینەکان خۆیان لە بەردەمیدا بچەبە سەر ئەژنۆ. سوپایەک لە ژێر (مارشاڵ نەی)دا لە پاریسەوە کەوتە ڕێ بۆ دەستگیرکردنی، بەڵام کاتێک سەربازەکان ڕێبەری پێشووی خۆشەویستی خۆیان بینی، هەڵوێستیان گۆڕی. ناپۆلیۆن جارێکی تر وەکو ئیمپراتۆر ڕاگەیەنرایەوە. خۆبەخشەکان پلە و پایەکانی سوپاکەیان پڕ کردەوە

سەرگەردانی وڵاتەکەی داگرت. لە پاریس، هەشامات شێتگیر بوون. ئەو پاشانەی کە شوێنگرکێی بە ناپۆلیۆن کردبوو لە وڵات رایکرد.

لەماوەی سەد ڕۆژی دواتردا، ناپلیۆن حوکمی فەرەنسای کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، بەرووبەڕوی سەرگەردانی بەڵام فەرەنسا مایەپوچ بوو، سەرچاوەکانی تەقریبەن بڕان و ناپۆلیۆن لەبەرانبەر ئەمەدا شتێکی وەهای لەدەست نەدەهات. لە شەڕی واتەرلۆ، لە مانگی شەشی ئەو ساڵەدا، ئەو بۆ دواجار بۆ تاهەتایە شکستی خوارد. ئەمجارە دوژمنەکانی وانەیەک فێر ببوون: ئەوان بۆ دوورگەی بێ فەڕی (سەینت هێلێنا) لە کەناری خۆرئاوای ئەفریقا دەربەدەریان کرد.

## لێکدانەوە

تەنیا چەند ساڵێک پاش فاکتەکانی ڕاکردنی دراماتیکیانەی ناپۆلیۆن لە ئێلبا، ئاشکرا بوو، پێش ئەوەی ئەو بڕیاری هەوڵدان بکات بۆ هەنگاوە ئازایانەکەی، سەرداسەکەرسی دەربارەکەی پێیان وتبوو ئەو لە فەرەنسا لە هەر کاتێکی تر زۆرتر ئاوبانگی هەیە و ئەمەی کە وڵاتەکە حازرێکی تر پیشوازی لێدەکاتەوە. یەکێک لەم سەرداسەکەرانە ژەنەراڵ کۆلەر بوو کە ناپۆلیۆنی قەناعەت پێهێنابوو کە ئەگەر ئەو ڕابکات، هێزەکانی ئەوروپا، بە ئینگلتەرەشەوە، دەیهێنەوە ناو دەسەڵات. ناپۆلیۆن زانیاریی مەتنی دەستکەوتبوو لەسەرەی ئەوەی کە ئینگلیز واری لێدەنێن و لەراستیدا ڕاکردنەکەی لە ناوەڕاستی پاش نیوەڕۆدا و لەبەردەم چاوە سیخوڕەکانی ئینگلیزدا ڕوویدا.

ئەوەی کە ناپلیۆن نەیدەزانی ئەوە بوو کە پیاوێک لە پشت هەموو ئەمەوە، جڵەوەکەی بەدەستەوە بوو و ئەم پیاوە وەزیرەی پێشووی، واتە تالیراند، بوو. تالیراندیش هەموو ئەوەی دەیکرد بۆ گەڕاندنەوەی ڕۆژانی شکۆمەندی نەبوو بەڵکو بۆ تێکشکاندنی ناپولیۆن بوو بۆ تاهەتایە. لەبەرچاوگرتنی چاوچنۆکیی ئیمپراتۆر کە ناسەقامگیرکەری ئەوروپا بوو، ئەو لەمێژوو لێی هەڵگەڕابووەوە. کاتێک ناپۆلیۆن بەرەو ئێلبا دوور خرایەوە، تالیراند ناڕەزایی دەربڕیبوو. ئەو پێداگری کرد لەوەی کە یا دەبێ ناپۆلیۆن بۆ شوێنێکی دوورتر

دوور خرایەوە یان ئەورووپا هەرگیز ئاشتی بەخۆیەوە نابینێت. بەڵام کەس گوێی بۆ شل نەکرد.

لەبری سەپاندنی بۆچوونی خۆی، تالیراند لچاوەڕێی کرد. ئەو بە کارکردن بەشێوەیەکی نهێنی، بۆ دراجار (کاسلەرێ و مێتەرنیک)ی وەزیرانی دەرەوەی ئینگلتەرە و نەمسای رازیکرد.

ئەم پیاوانە پێکەوە داوی ڕاکردنیان بۆ ناپلیۆن نایەوە. تەنانەت سەرەدەی کۆڵەر بۆ چیاندنی بەڵێنی شکۆمەندی بە گونجکەی کاترای دەربەدەرکراودا، بەشێک بوو لە پلانەکە. وەکو لیزانێکی یاریی وەرەقە تالیراند هەر لە پێشدا هەموو شتێکی بۆ دەرکەوت. ئەو زانی ناپلیۆن دەگەڕێتە بار ئەو دلوەی کە ئەم بۆی ناردەتەوە. ئەو بە هەمان شێوە پێشبینی ئەوەی کرد کە ناپلیۆن وڵات بەرەو جەنگ ئاراستە دەکات کە، بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی لاوازبووی فەرەنسا، دەشێ تەنیا چەند مانگێک بخایەنێت. دیپلۆماتێک لە ڤییەننا، کە تێگەیشتبوو لەوەی تالیراند لەپشت هەموو ئەمەوەیە، وتی "ئەو خانووەکەی ئاگرداوە بۆئەوەی لە ئافات ڕزگاری بکات"

*کاتێک من چەشنەم بۆ ئاسک داناوە، تەقە لە یەکەم ئاسکی مێینە ناکەم کە دێت بۆنی بکات، بەڵکو چاوەڕێ دەبم تا تەواوی پۆلە ئاسکەکە کۆ دەبەوە*

ئۆتۆ ڤۆن بیسمارک (١٨١٥–١٨٩٨)

## کلیلی دەسەڵات

ئەم ستراتیژیە چەند جار خۆی لەمێژوودا دووبارە کردۆتەوە. سەرکردەیەکی شەڕانگێز زەمینەسازیی زنجیرەیەک هەنگاوی ئارامانە دەکات کە بە بەدەستهێنانی دەسەڵاتێکی زۆر دەستپێدەکات. لەگەڵ ئەوەشدا، دەسەڵاتەکەی هێواش هێواش دەگاتە ترۆپک و بەرەوی هەموو شتێک لەدژی هەڵدەگەڕێتەوە. دوژمنە بێشومارەکانی پێکەوە یەکدەگرن. ئەو بە هەوڵی جێگیرکردنی دەسەڵاتەکەیدا، لە چوون بەم ئاقار و بەو ئاقاردا بڕست لەخۆی دەبڕێت و سەرەنجام دادەڕمێت. هۆکاری ئەم ڕەوگەیە ئەوەیە کە کەسی شەڕانگێز بە

دەگمەن لە باڵادەستیی ئەوبدانە. ئەو ناتوانێت لە یەک دوو جوڵەی بەردەمی زیاتر ببینێت، ناتوانێت بەرەنجامەکانی ئەم جوڵە یان ئەو جوڵە ئارایانەیە ببینێت. لەبەرئەوەی ئەو بە بەردەوامی ناچار دەکرێت پەرچەکردار بەرامبەر جوڵە زیادبووەکانی دوژمنەکانی و نیکەوتە پێشبینی نەکراوەکانی کردارە نێباکانەکانی خۆی بنماتەڕوو؛ وەی شەڕانگێزانەی لەدژی خۆی پێچەوانە دەبێتەوە.

لە بواری دەسەڵاتدا، دەبێ پرسیار لە خۆت بکەیت، کەڵکی ڕاکردن بۆ ئێرە و بۆ ئەوێ چییە لە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکان و شکست پێهێنانی دوژمنەدا، لەکاتێکدا کە هەست بە باڵادەستی نەکەیت؟ بۆچی دەبێ من هەمیشە پەرچەکردار بەرامبەر ڕووداوەکان پیشان بدەم لەبری ئاراستەکردنیان؟ وەڵامەکە سادەیە. بیرۆکەی تۆ لەمەڕ دەسەڵات هەڵەیە. تۆ کرداری شەڕانگێزانەت لەگەڵ کرداری کاریگەر تێکەڵ کردووە. زۆرجاریش کاریگەرترین کردار ئەوەیە لە شوێنی خۆت نەجوڵێیت، هێمن بیت و بێگەڕێیت ئەوانیتر لەبەرامبەر تەڵەکانی تۆدا دەستەوستان بن. یاری بۆ دەسەڵاتێکی دوورمەودا بکەیت نەک سەرکەوتنێکی خێرا

بیرت بێت. جەوهەری دەسەڵات توانای پاراستنی دەستپێشخەرییە، ئەوەیە وەها لەوانیتر بکەیت کاردانەوەیان بەرانبەر جوڵەکانی تۆ هەبێت، ئەوەیە نەیارەکەت و ئەوانەی دەوروبەرت لە حاڵەتی بەرگریدا بهێڵیتەوە. کاتێک تۆ وا لە خەڵکانی تر دەکەیت بێنە لات، لەناکاو تۆ دەبیتە ئەو کەسەی بارودۆخەکە کۆنترۆڵ دەکات. ئەو کەسەش کە دەتوانێ کۆنترۆڵ بکات، دەسەڵاتی هەیە. دەبێ دوو شت ڕووبدەن تا بکەویتە ناو ئەم پێگەیەوە. دەبێ تۆ خوت فێری زاڵبوون بەسەر هەستەکانتدا بکەیت و قەت نەکەویتە ژێر کاریگەریی تووڕەیی. لەهەمان کاتدا دەبێ کار لەسەر مەیلی سروشتیی خەڵک بکەیتە بۆ کاردانەوەی تووڕە و هەڵچووانە کاتێک پاڵ دەنرێن و چەشنەیان بۆ دادەنرێ. لە کۆتاییدا، دە، توانای ئەوەی وا لەوانیتر بکەیت بێنە لات چەکێکی زۆر کاریگەرترە لە هەر ئامرازێکی تری شەڕانگێزی

ماوویی ئەوە بکە کە چۆن تالیراند، وەستای هونەرە، ئەو فێڵە لاوازەی ئەنجامدا
بەکەم، ئەو پاڵنەری هەوڵدان بۆ ڕاپەڕکردنی هاوەڵە دەرلەمەدارەکانی کۆنترۆڵ کرد کە
ویستیان ناپۆلیۆن بۆ شوێنێکی دوورەدەست دەربەدەر بکەن. تەنیا ئەوە سروشتییە کە
مرۆڤی خەڵکی بە داکۆکیکردن لە کەیسەکەت ڕازی بکەیت و بە قسە ئیرادەی خۆت زاڵ
بکەیت. بەڵام ئەمە زۆرجار لەدژی تۆ دەشکێتەوە. ژمارەیەکی کەمی هاوسەردەمانی
تالیراند بڕوایان وابوو ناپۆلیۆن هێشتا هەڕەشەیەکە، بۆیە ئەگەر ورەیەکی بڕی حسابە
گەڕ لە هەوڵدان بۆ قەناعەت پێهێنانی، ئەوا تەنیا خۆی وەکو گەمژەیەک دەردەخستەڕوو
لەبری ئەمە، ئەو زمان و هەستەکانی خۆی گرت. لە هەمووشی گرنگتر، ئەو تەڵەیەکی
شیرین و بەکێشکەری بۆ ناپۆلیۆن نایەوە. ئەو حاڵی لاوازی ناپۆلیۆنی دەزانی و تا کۆتایی
کاری لەسەر کرد. کاتێک ناپۆلیۆن بۆ چەشتەکە ڕۆیشت، هیچ مەترسییەک لەوەدا نەبوو کە
ئەو سەرکەوتوو بێت و یاریبزەکە لەدژی تالیراند پێچەوانە ببێتەوە، کە لەهەمووان باشتر
دەوڵەتی بێهێز و لێبڕاوی فەرەنسای دەناسی. تەنانەت ئەگەر ناپۆلیۆن بیتوانیبایە ئەم
تەگەرانە کۆنترۆڵ بکات، ئەگەر سەرکەوتنی زۆرتر دەبوو ئەگەر بیتوانیبایە کات و شوێنی
کودەتاکەی هەڵبژێرێت. بە دانانی تەڵەیەکی گونجاو، تالیراند کات و شوێنی خستە دەستی
خۆی.

هەموومان وزەیەکی ڕۆژمان هەیە و ساتەوەختێک هەیە تیایدا وزەمان لە ترۆپکدایە
کاتێک تۆ وا لەویتر دەکەیت بێتە لات، وزە لەسەر خۆی دەمرێت، لە پرۆسەکەدا وزەی خۆی
بە فیڕۆ دەدات. لە ساڵی ۱۹۰۵دا، ڕوسیا و ژاپۆن لە جەنگدا بوون. ژاپۆنییەکان تەنیا بەم
دواییە دەستیانکرد بە مۆدێرنیزەکردنی کەشتییە جەنگییەکانیان، ڕوسەکان هێزێکی
دەریایی بەهێزتریان هەبوو، بەڵام بە بڵاوکردنەوەی زانیاریی هەڵە مارشاڵی ژاپۆنی (تۆگۆ
هەیهاچیرۆ) ڕوسەکانی ناچار کرد ئەوە بدەن تا لەنگەرگاکانیان لە دەریای باڵتیک جێ بهێڵن و
وەهایان لێکات پێیان وابێت دەتوانن زەوە کەشتییەکانی ژاپۆنییەکان بە هێرشێکی
هێزا زامالی بەرە کەشتی ڕوسی نەیتوانی بە خێراترین ڕێڕەوەدا، بگاتە ژاپۆن- بە
گەرووی (جیبرالتار) و پاشان کەنالی سوێزدا بۆ ناو ئۆقیانووسی هیندی- چونکە ئەمانە

لەلایەن بریتانییەکانەوە کۆنترۆل کرابوون و ژاپۆن هاوپەیمانێکی بریتانیا بوو. دەبووایە ئەوان بە دەوری (کەیپ ئەڤ گود هۆپ)دا بسوڕێنەوە، لە سەری باشووری ئەفریقا و زیاتر لە شەش هەزار مایلی تر بەمەنە سەر گەشتە دەریاییەکەیان. هەر کە ڕەوە کەشتییەکە لە (کەیپ) ڕەت بوو، ژاپۆنییەکان چیرۆکێکی تری ساختەیان بڵاو کردەوە. ئەوان لە دەریادا بوون تا دژە هێرشێک ئاراستە بکەنەوە. بۆیە ڕووسییەکان لە ئەنجامی وریاکردنەوەیەکی شەڕدا، کەشتیێکی تەواویان بەرەو ژاپۆن ئەنجامدا. بەهاتنی کاتی گەیشتنیان، ئەندامانی هێزی دەریاییان ماندوو، دامێزراو و شەکەت بوون، لەکاتێکدا کە ژاپۆنییەکان بە ئۆقرەوە چاوەڕێ بوون. سەربازی مەترسی بەهێزی نەبوونی ئەزموونیانەوە لە جەنگی دەریایی هۆدیرندا، ژاپۆنییەکان ڕووسیەکانیان تێکشکاند.

سوودێکی سەیری ئەدایی دوژمن تا بۆ لات بێت، بەو شێوەیەی کە ژاپۆنییەکان لەگەڵ ڕووسەکاندا بۆیان دەرکەوت، ئەوەیە کە ناچاری دەکات لە پانتایی تۆدا کار بکات. بەوەی کە لە پانتایی نەیاردا بێت، وای لێدەکات مشڵەژێت و زۆرجار کردارەکانی بە سەرگەردانی ئەنجام دەدات و هەڵە دەکات. بۆ دانوستانەکان یان کۆبوونەوەکان، هەمیشە وەک ژیرانەیە ئەوەی ئەوانیتر بدەیت بێنە پانتایی تۆوە، یان پانتایی هەڵبژاردەی تۆوە. تۆ دەزانیت چی دەکەیت، لەکاتێکدا کە ئەوان هیچ شتێکی ئاشنا نابینن و بەشێوەیەکی قووڵ کەوتوونەتە حاڵی بەرگرییەوە.

بەکاربردنی کەمەیەکی مەترسیدارە. هەر کە کەسێک گومانی ئەوە بکات بەکار دەبرێت، قورس و قورستر دەبێت کۆنترۆڵی بکەیت. بەڵام کاتێک تۆ نەیارەکەت وەها لێدەکەیت بێتە لات، وەهمی ئەوە دروست دەکەیت کە ئەو کۆنترۆڵی بارودۆخەکەی کردووە. ئەو هەست بەو ژیانە ناکات کە ڕایدەکێشێ، وەک چۆن ناپۆلیۆن وای ئەوەی دەکرد کە ئەو خۆی گەورەی جورئەتی ڕکردن و گەڕانەوەبە بۆ سەردەسەلات.

هەموو شتێک بەندە بە شیرینی چەشنەکەت. ئەگەر داوەکەت نایی پێویست سەرنجڕاکێش نێت، پەشێوبی نارەزووەکان و هەستەکانی دوژمنەکەت کوێرانی دادێت و وا دەزانێت واقیعە. چەندەی چاپیستر بی، ئەوەندە زیاتر دەکرێ هەڵسوڕێنرێن.

فیلیپۆ برونێلیچی، تەلارساز و هونەرمەندی گەورەی ڕێنسانس، پڕاوەکاری گەورەی هونەری ڕاکێشانی هەڵک بوو وەکو نیشانەیەکی دەسەڵاتی لە نوێبەکەدا تووشی چاککردنی (گومەزی سانتا ماریا دیل فیۆری) هاتبوو لە فلۆرەنس پادشتەکە گرینگ و بەهادار بوو. بەڵام کاتێک کاربەدەستان پیاوی دووەمیان بەکرێ گرت، لۆرێنزۆ گیبەرتی، بۆئەوەی لەگەڵ برونێلیچی کار بکات،بە هێمنی ڕلما ئەو دەیزانی گیبێرتی لە ڕێگەی پەیوەندییەکانییەوە کارەکەی دەستکەوتووە و ئەو هیچ لە کارەکە ناکات و نیوەی ئیمتیازەکەی پێ دەبڕێت پاشان لە سانەوەختێکی گرنگی بونیادنانەدا، برونێلیچی لە پڕێکدا تووشی نەخۆشییەکی ڕازنامێز بوو دەبووایە چیتر کار نەکات، بەڵام ئاماژەی بە کاربەدەستانی شار کرد لەمەڕ ئەوەی کە ئەوان (گیبێرتی)یان بەکرێ گرتووە کە دەبووایە بتوانێ خۆی بەتەنیا لە کارەکە بەردەوام بێت. بەرووبی ڕوون بووەوە کە گیبێرتی بێ کەڵکە و کاربەدەستان هاتن لەبەر برونێلیچی پاڕانەوە ئەو فەرامۆشی کردن، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ گیبێرتی پڕۆژەکە تەواو بکات، تا ئەو کاتەی کە لە کۆتاییدا درکیان بە کێشەکە کرد: ئەوان گیبێرتییان لەسەر کار لادا

بە پەرجوویەک، برونێلیچی لەماوەی چەند ڕۆژێکدا چاک بووەوە ئەو پێویستی نەدەکرد گەشکە بگرێت یان خۆی گێژ بکات ئەو تەنیا هونەری "را لەواسپتر مکە بنە لاث"ی بمادە کرد.

ئەگەر جارێک ئەوە بکەیتە حاڵێکی شکۆمەندی کە وا لەواسپتر بکەیت بنە لاث و تۆ سەرکەوتوو بوویت، ئەوا ئەوان لەم کارەیان بەردەوام دەبن تەنانەت پاش ئەوەی چیتر هەڵیشت بەدا

وێنە بەڵەی هەنگویاری ودێ پاوچی ودێ شوێن سچیرەکەی ناگەڕێت وردێک کە دەراسێ پاو دەکرێت تەقریبەن ئەسەمە بگەڕێرێت و ئەگەر گەمارۆ درا ڕوو دەبدەمە بەری ئەمە، پاوچی تەڵەیەک دادەنێت کە چەشتەکەی هەنگوینە ئەو خۆی ماندوو ناکات و لە گەڕان بەدوای وردچەکەدا سەرکێشی بە ژیانییەوە ناکات ئەو چەشتە دادەنێت و پاشان چاوەڕێ دەمێت

دەسەڵات جەنگاوەرە ناشەکان وەها لەوانیتر دەکەن بێنە لایان، و ناچنە لای ئەوانیتر ئەمە سەمای بەتاڵی و پڕیی ئەوانیتر و خودە. کاتێک تۆ دەی ئەیارەکانت دەدەیت بێنە لات، ئەو کاتە هێزی ئەوان هەمیشە بەتاڵە. مادامەکی تۆ ناچیتە لایان، هێزەکەی تۆ هەمیشە پڕە. بە پڕی هێزش بڕەنە سەر بەتاڵی وەکو ئەوە وایە بەرد بگرێتە هێلکە

(زانگ یو، نووسەر لەبارەی هونەری جەنگ، سەدەی یازدە)

## پێچەوانەبوونەوە

هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی سیاسەتێکی ژیرانەیە وا لەوانیتر بکەیت لە ڕێی بووی بەدوای تۆدا پرست لەخۆیان ببڕن، حالەتی پێچەوانە هەن تیایاندا لێدانی لەپڕ و توند لە دوژمن ئەوەندە مەعنەویاتی دادەبەزێنێت کە وڕەکانی دەمرن. لەبری ئەوەی وا لەوانیتر بکەیت کە بێنە لات، تۆ دەچیتە لای ئەوان، پرسەکەت دەسەپێنیت و جڵەوەکە دەگریتە دەست. هێرشی خێرا دەشێ چەکێکی نایاب بێت، چونکە ئەمە کەسێکی تر ناچار دەکات بەرچەکرداری هەبێت بەبێ کات بۆ بیرکردنەوە یان پلاندانان. بە نەبوونی کاتی بیرکردنەوە، خەڵکی هەڵەی حوکمدان دەکەن و دەکەونە حالەتی بەرگرییەوە. ئەم تاکتیکە دیوی پێچەوانەی چاوەڕوانیی و چەقستە نانەوەیە، بەڵام هەمان کرداری هەیە: تۆ وەها لە دوژمنەکەت دەکەیت وەڵامگۆی بەدوو مەرجی تۆ بێت

## یاسای ژمارە ٩

# لە ڕێگەی کردارەکانت بیبەرەوە، نەك لە ڕێگەی مشتومڕەوە

### حوکم

*هەر سەرکەوتنێکی کاتی کە تۆ پێت وایە لە ڕێگەی مشتومڕەوە بەدەستت هێناوە بە ڕاستی سەرکەوتنێکی شکست ئامێز بووە. ئەو کینە و ئیرادە خراپەی کە دەیوروژێنێت بەهێزترە و زۆرتر دەمێنێتەوە لە هەر گۆڕانێکی کاتیی ڕا و بۆچوون. زۆر بەهێزترە کە وا لە وانیتر بکەیت لە ڕێگەی کردارەکانتەوە کۆك بن لەگەڵ تۆدا بەبێ ئەوەی قسەیەك بکەیت پیشانی بدەیت، نەك ڕوونی بکەیتەوە.*

### سەرپێچی لە یاساکە

لە ١٣١ی پێش زاییندا، کونسوڵی ڕۆمانی، پوبلیوس کراسوس دیڤس موسیانوس، پاش گەمارۆدانی شارۆچکەی یۆنانیی (پێرگاموس)، بۆی دەرکەوت پێویستی بە کوڵەکەیەکی گەورەیە تا لە ڕێگەی دیوارەکانی شارۆچکەکەوە بچێتە ناوەوە. ئەو پێش چەند ڕۆژێك دوو ستوونی گەورەی کەشتی لە لەنگەرگای کەشتی لە ئەسینا بینیبوو و فەرمانیدا کە گەورەترینیانی بە خێرایی بۆ ڕەوانە بکرێت. ئەندازیاری سەربازی لە ئەسینا کە فەرمانەکەی پێ گەیشت دڵنیابوو لەوەی کە کونسوڵ بە ڕاستی بچوکترینی ستوونەکانی

دەویست ئەو بێ گوێدانە لەگەڵ ئەو سەربازانەدا کەوتە مشتومڕ کە فەرمانەکەیان هێنابوو. ئەو پێی وابوو ستوونە بچووکەکە بۆ ئەرکەکە باشترە، لە ڕاستیشدا گواستنەوەی ئاسانتر بوو

سەربازەکان هۆشداریان دایە ئەندازیارەکە و ڕیمان بەرپرسەکەیان کەسێک نییە مناقەشەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵام ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ستوونە بچووکەکە ئەکە ستوونە لەگەڵ ئەو ماکینەیە دەگونجێت کە ئەو بونیادی دەنا تا لەگەڵیدا بڕوات. ئەو هێلکاری لەدوای هێلکاری کێشا و گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە بڵێت ئەو شارەزایە و ئەوان هیچ سەرەداوێکیان نییە لەمەڕ ئەوەی باسی چی دەکەن. سەربازەکان بەرپرسەکەیان دەناسی و ناچار قەناعەتیان بە ئەندازیارەکە هێنا کە وا باشترە کە شارەزاییەتییەکەی بەلاوە بنێت و ملکەچ بێت

لەگەڵ ئەوەشدا، پاش ئەوەی ڕۆیشتن، ئەندازیارەکە کەمێکی تر زیاتر بیری لێ کردەوە لەخۆی پرسی، پەیڕەوی کردن لە فەرمانێک کەڵکی چییە کە سەردەکێشێت بۆ شکست؟ بۆیە ئەو ستوونە بچووکەکەی نارد، دڵنیا بوو لەوەی کونسول بۆی دەردەکەوێت کە چەندێک کاریگەر دەبێت و بەشێوەیەکی دادپەروەرانە پاداشتی دەکات.

کاتێک ستوونە بچووکەکە گەیشت، میوکانوس داوای ڕوونکردنەوەی لە سەربازەکانی کرد. ئەوان باسی ئەوەیان کرد کە چۆن ئەندازیارەکە بەشێوەیەکی ناکۆتا مشتومڕی کردووە لەسەر ئەوەی کە دەبێ ستوونە بچووکەکە بەن، بەڵام دوایی بەڵێنی داوە کە گەورە ببرێت. میوکانوس هەڵچوو، ئەو نەیتوانی ئەرکیر بکاتە سەر گەمارۆکە، یان گرنگی بڕینی دیوارەکە لەبەرچاو نەگرێت بەر لەوەی شارۆچکەکە هێزی پاڵپشتی پێ بگات. هەموو ئەوەی نەیتوانی بیری لێ بکاتەوە ئەندازیارە بێ ڕێزەکە بوو کە فەرمانیدا دەستبەجێ بۆی بهێنن

کاتێک پاش چەند ڕۆژێک گەیشت، ئەندازیارەکە بە خۆشحاڵییەوە جارێکی تر بۆ کونسولی ڕوونکردەوە کە بۆچی ستوونە بچووکەکەی ناردووە. ئەو هەر بەردەوام بوو لە قسەکانی و هەمان ئەو مشتومڕانەی دووبارە کردەوە کە لەگەڵ سەربازەکان کردبووی. ئەو وتی وەها زیرەکترە کە لەم بوارانەدا گوێ لە شارەزاکان بگیردرێت و ئەگەر تەنها ئەو ستوونەی ناردبووی ئاقڵی بکردایەتەوە ئەوا کونسول پەشیمان نەدەبووەوە. میوسیانوس

## پەیڕەوی لە پاشاکە

لە ساڵی ۱۵۰۲دا لە فلۆرێنس ی ئیتالیا، بلۆکێکی مەڕمەڕ لە بەشی کارەکانی کەنیسەی سەنتا ماریا دێل فیۆر دەرکەوت. پێشتر بەردێکی جوانی نایاب بوو، بەڵام پەیکەرتاشێکی نەشارەزا بە هەڵە کونێکی کردە شوێنێک کە دەبووایە قاچەکانی پەیکەرەکە بێت و تەگشتی سەقەتی کرد. پیەرۆ سۆدێرینی، پارێزگاری فلۆرێنس بیری لەوە کردبووە کە بە ڕاسپاردنی لیۆناردۆ دافینشی یان مامۆستایەکی تر بلۆکەکە ڕزگار بکات بەوەی کە کاری لەسەر بکات، بەڵام وازی لە بیرۆکەکە هێنابوو؛ چونکە هەمووان کۆک بوون لەسەر ئەوەی کە بەردەکە ئارە سەقەت بووە. بۆیە، سەربیاری ئەو پارەیەی کە لەسەری بەفیڕۆ درابوو، تۆزی لە هۆڵەکانی کەنیسە کۆ کردبووەوە.

دۆخەکە بەو شێوەیە بوو تا ئەوەی کە هەندێ لە هاوڕێیانی مایکڵ ئەنجیلۆی مەزن بڕیاریاندا نامەیەک بۆ هونەرمەند بنووسن کە ئەو کاتە لە ڕۆم دەژیا. ئەوان وتیان، تەنیا ئەو دەتوانێت شتێک لە بەردە مەڕمەڕەکە بکات کە هێشتا مادەیەکی جوانی نایاب بوو. مایکڵ ئەنجیلۆ بەرەو فلۆرێنس سەفەری کرد، پشکنینی بۆ بەردەکە کرد و گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئەو بە ڕاستی دەتوانێت پەیکەرێکی باشی لێ دابتاشێت بەوەی کە پۆزی پەیکەرەکە بەگەڵ شێوازی سەقەتکردنەکە بگونجێنێت. سۆدێرینی داکۆکی لەوە دەکرد کە ئەمە بەفیڕۆدانی کاتە – کەس ناتوانێت کارەساتێکی وەها چارە بکات – بەڵام ئەو لە دواجار ڕازی بوو بەوەی لێگەڕێ هونەرمەندەکە کاری لەسەر بکات. مایکڵ ئەنجیلۆ بڕیاریدا پەیکەری داڤید بکێشێت لەکاتێکدا کە دەستی بە قایشەکەی شاییەوەیە.

چەند هەفتەیەک دواتر، لەکاتێکدا کە مایکڵ ئەنجیلۆ دوایین کاری خۆی لەسەر پەیکەرەکە دەکرد، سۆدێرینی چووە ناو ستۆدیۆ. هەستی داوەرێکی بەخۆی بەخشی، ئاوڕوتوییەکی کارە گەورەکەی کرد و بە مایکڵ ئەنجیلۆی وت لەکاتێکدا کە ئەو پێی وایە نایابە، پێی وایە لوتی گەورەیە. مایکڵ ئەنجیلۆ بۆی دەرکەوت کە سۆدێرینی لە شوێنێک ڕاوەستاوە کە ڕێک لەژێر پەیکەرە گەورەکەدایە و گۆشەیەکی ڕوانینی دروستی نییە. ئەو

بەبێ ئەوەی قسەیەک بکات، ئاماژەیەکی دایە سۆدێربێی بۆ سەر ئەسکەلەکە دوای بکەوێت. لەگەڵ گەیشتن بە لوتی، ئەو شیفرەکە و هەروەها کەمێک تۆزی مەڕمەڕی هەڵگرت. لەکاتێکدا کە سۆدێربێی لەسەر ئەسکەلەکە تەنیا چەند پێیەک لەخوار مایکڵ ئەنجیلۆوە بوو، دەستیکرد بە کوتانی لەسەرخۆی شفرەکە و لێگەڕا ئەو تۆزەی لەسەر دەستی کۆی کردبووەوە کەم کەمە بڕژێت. لە ڕاستیدا ئەو هیچی نەکرد بۆ گۆڕینی لوتەکە، بەڵام وا دەریخست کە کاری لەسەر دەکات. پاش چەند خولەکێکی خۆبوواردن، لەلاوە وەستا، "ئێستا سەیری بکە" سۆدێربێی وەڵامی دایەوە "ئێستا باشتر کەیفم پێ دێت، تۆ وات لێکردووە ڕۆحی بەبەردا بێت".

## لێکدانەوە

مایکڵ ئەنجیلۆ دەیزانی بە گۆڕینی شێوەی لوت لەوانەیە تەواوی پەیکەرەکە تێکبدات لەگەڵ ئەوەشدا سۆدێربێی پاڵپشتێک بوو کە شانازی بە حوکمدانە حەساسییەکەی خۆیەوە دەکرد. ئیهانەکردنی پیاوێکی وەها لە ڕێگەی سەرزەنشتکردنەوە نەک تەنیا هیچی بۆ مایکڵ ئەنجیلۆ بە بەرەوە نەدەبوو بەڵکو پاداشتەکانی دواتریشی دەخستە مەترسییەوە. مایکڵ ئەنجیلۆ لەوە زیرەکتر بوو کە مناقەشە بکات. چارەسەرەکەی ئەو گۆڕینی ڕوانگەی سۆدێربێی بوو (بە مانای وشە لە لوتی پەیکەرەکە نزیکتری خستەوە) بەبێ ئەوەی وەهای لێبکات بۆی دەربکەوێت کە ئەم هۆکاری هەڵەکەیە بووە

لە دەستی ئەوەی دواتر، مایکڵ ئەنجیلۆ ڕێگەیەکی دۆزییەوە بۆ ئەوەی کاملێتی پەیکەرەکە بپارێزێت لەکاتێکدا کە وەها لە سۆدێربێی بکات پێی وابێت چاکی کردووە. ئەمەیە دەسەڵاتی دوو سەرەی مرنەوە لە ڕێگەی کردارەکانەوە نەک مناقەشەکردن. کەس هەستی بریندار ناکرێت و بیرۆکەی خۆشت دەسەلمێنیت.

لە باسایی دەسەڵاتدا، دەمی تۆ ئیتر نەک لە ڕێگەی بەرەنجامە نووزمەوداکانیان حوکم لەسەر جوڵەکانت ندەبێت. کێشەی هەوڵدان بۆ سەلماندنی نیرۆکەیەک بەدەستهێنانی سەرکەوتنێک لە ڕێگەی مشتومڕەوە ئەوەیە کە لە کۆتاییدا تۆ قەت ناتوانیت دڵنیا بیت ئەوەی چۆن کاریگەری دەخاتە سەر ئەو خەڵکەی مناقەشەیان لەگەڵ دەکەیت. لەوانەیە ئەوان بە ڕواڵەت کۆک بن لەگەڵ تۆدا، بەڵام لەباخەوە قینت لێدابگرن. یان لەوانەیە شتێک کە تۆ بێ مەبەست وتووتە ئەوانەی هەستیان بریندار بکات- وشەکان ئەو توانا شاراوەیەیان هەیە کە بە گوێرەی مزاج و ناتەمنیی کەسەکە لێکدرێنەوە. تەنانەت باشترین مشتومڕەکان سەعەیەکی بنەڕەتیان نییە، چونکە ئێمە هەموومان سەرەنجام متمانەمان بە سروشتی جۆکی وشەکان نەماوە. ئینجا ڕۆژانێک پاش هاوڕا بوون لەگەڵ کەسێک، زۆرجار بەهۆی خووی خۆمانەوە دەگەڕێینەوە سەر ڕای پێشوومان.

لەمە تێبگە: قسەکان ڕۆین. هەمووان دەزانن کە لە گەرمەی مشتومڕێکدا، ئێمە هەر شتێک دەڵێین کە لەبەرژەوەندیی دۆزەکەماندا بێت. ئێمە وتە لە کتێبی پیرۆز دەهێنینەوە، ئاماژە بە ئاماری پشتڕاستنەکراوە دەدەین. دەتوانری کێ بەو کیسە هەوایانە ڕازی بکرێت؟ کردار و پیشاندان زۆر بەهێزتر و پڕماناترن. ئەمانە لەوێن، لەبەردەم چاوەکانی ئێمە، بۆ ئەوەی ببینین-"بەڵێ، ئێستا لوتی بەبکەرەکە ڕێک دیارە". هیچ قسەیەکی بریندارکەر لەئارادا نییە، هیچ ئەگەرێکی بەهەڵە لێکدانەوە نییە. کەس ناتوانێ مشتومڕ لەسەر بەڵگەیەکی پیشاندراو بکات. هەروەک بالتاسار گراسیەن دەڵێت "ڕاستی بەشێوەیەکی گشتی دەبینرێت، بەدەگمەن دەبیسترێت".

سێر کریستۆفەر ڕێن، نوسخەیەکی ئینگلەرەی یاوی ڕینیسانس بوو. ئەو لە ڕستەکانی ماتماتیک، ئەستێرەناسی، فیزیک و فیزیۆلۆجیدا شارەزایەتی پەیدا کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا لەماوەی ژیانی پیشەیی درێژیدا وەکو بەلارساری هەرە بەناوبانگی ئینگلەرە زۆرجار بەلایەن پاڵپشتە دارایییەکانیەوە بیی دەوترا کە گۆڕانکاریی ئەستەم

ئەنجام بدات. نەت نە مناقەشەی کرد و نە هەستی بریندار کرد. ئەو بەشێوازی تر بیرۆکەکەی خۆی دەسەلماند.

لە ساڵی ١٦٨٨دا رێن بینابەی شارەوانی شاری وێستمینستەری بەشێوەیەکی نوێ دیزاین کرد. لەگەڵ ئەوەشدا سەرۆک شارەوانی ناڕازی و لە ڕاستیدا نیگەران بوو. ئەو بە (رێن)ی وت ترسی ئەوەی هەیە قاتی دووەم سەلامەت نەبێت و دەشێ هەموو بەسەر نووسینگەکەیدا لە قاتی یەکەم دابڕمێت. ئەو داوای کرد رێن دوو ستوونی بەردین دابنێت بە مەبەستی پاڵپشتی زیاتر. رێن کە ئەندازیارێکی لێهاتوو بوو، دەیزانی ئەو ستوونە زیادانە هیچ کەلکێکیان نابێت و ترسەکەی سەرۆکی شارەوانی بێ بنەمایە. بەڵام هەرچۆنێک بێت دوو ستوونەکەی دانا و سەرۆک شارەوانی سوپاسگوزار بوو. ئەوە بوو چەند ساڵێک دواتر کرێکارانی سەر ئەسکەلە بەرزەکە تێبینی ئەوەیان کرد کە ستوونەکان کەمێکیان ماوە بگەنە بنمیچەکە.

ئەوان دەبەنگ بوون. بەڵام هەردوو پیاوەکە ئەوەیان دەستکەوت کە دەیانویست. سەرۆک شارەوانی توانی پشوو بدات و (رێن) زانی کە نەوەکانی دواتر تێدەگەن لەوەی کە دیزاینە بنچینەییەکەی کاریگەر بوو و ستوونەکان پێویست نەبوون.

هێزی پیشاندانی ئایدیاکەی تۆ ئەوەیە بەرامبەرەکانت ناکەوێتە حاڵەتی بەرگرییەوە و بۆیە کراوەترن بۆ ڕازیبوون. وایان لێبکەیت بە مانای حەرفی و لەڕووی فیزیکییەوە هەست بە مەبەستەکەت بکەن بەشێوەیەکی ناکۆتا بەهێزترە لە موناقەشەکردن.

جارێکیان گێرەشێوێنێک لەناوەڕاستی وتارێکدا کە تیایدا ئیدانەی تاوانەکانی ستالینی دەکرد قسەی بە نیکیتا خرۆچۆف بڕی. گێرەشێوێنەکە وتی "تۆ هاوەڵی ستالین بوویت، بۆچی ئەو کاتە نەتوەستاند؟" خرۆچۆف لە رواڵەتدا نەیدەتوانی گێرەشێوێنەکە ببینێت و نەڕاندی "ئەوە کێ بوو ئەمەی وت؟" هیچ دەستێک بەرز نەبووەوە. کەس ماسولکەیەکی نەجوڵا. پاش چەند چرکەیەکی بێدەنگییەکی کپ، خرۆچۆف بە دەنگێکی نەرم وتی "ئێستا دەزانی بۆچی نەموەستاند" لەبری ئەوەی کە موناقەشەی ئەوە بکات کە هەر کەسێک ڕووبەڕووی ستالین دەبووەوە دەترسا، وایلێکردن هەست بکەن

ڕووبەڕووبوونەوەی سنالی چۆنە- پێشاندانەکە هەست بزوێن بوو و مشتومڕی زیاتر پێویست نەبوو

بەهێزترین ڕازیکردن دەچێتە ئەودیو کردار و دەبێتە ڕەمز. هێزی ڕەمز- ئاڵا، چیرۆکی ئەفسانەیی، مۆنومێنتێك بۆ ڕووداوێکی هەست بزوێن- ئەوەیە کە هەمووان لە تۆ تێدەگەن بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بوترێت. لە ١٩٧٥دا، کاتێك هێنری کیسینجەر لە دەوستانی نائومێدبەخشدا لەسەر گەڕانەوەی بەشێکی بیابانی سینا لەگەڵ ئیسرائیلییەکان گیرۆدە ببوو کە لە جەنگی ١٩٦٧دا پەکێلین کردبوو، ئەو لەپڕێکدا کۆبوونەوەکەی هەڵوەشاند و بڕیاریدا پیاسەیەکی بیدەمی ئەنجام بدات. ئەو سەردانێکی شوێنەواری قەڵای کۆنی (مەسادا)ی کرد کە بەلای هەموو ئیسرائیلییەکانەوە وەکو ئەو شوێنە ناسرابوو کە نیابە هەوسەد جەنگاوەری جولەکە کردەوەی خۆکوژییان لە ساڵی ٧٢ی زایین ئەنجامدا و ئامادە نەبوون خۆیان ڕادەستی سەربازانی ڕۆم بکەن کە دەورەیان دابوون. ئیسرائیلییەکان دەستبەجێ لە پەیامەکەی سەردانی کیسینجەر تێگەیشتن: ئەو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ نەوە تۆمەتباری دەکردن کە زەمینەسازیی خۆکوژیی بەکۆمەڵ دەکەن. هەرچەندە سەردانەکە لەخۆیدا بیرکردنەوەی ئەوانی نەگۆڕی، بەڵام وایلێکردن زۆر جدیتر لە هەر هۆشدارییەکی ڕاستەوخۆ بیر بکەنەوە. ڕەمزەکانی وەکو ئەمە گرنگیی هەستیی گەورەیان هەیە.

کاتێك سۆراخی دەسەڵات دەکەیت، یان هەوڵ دەدەیت بیپارێزیت، هەمیشە ڕێڕەوە ناڕاستەوخۆیەکە بگرە بەر. هەروەها بە وریاییەوە شەڕەکانت هەڵبژێرە. ئەگەر ئەوە بە دوورمەودادا گرنگ نەبێت کە کەسەکەی تر لەگەڵ تۆدا کۆك نەبێ- یان ئەگەر نەرموونی خۆیان و کات وایان لێبکات تێبگەن مەبەستت چییە- ئەوا ئەو کاتە باشترە خۆت نە پیشاندانەوە هەریك نەکەیت وەی خۆت بپارێزە و مزۆ

وێنە: هەلاجیکێن سەرەوە و خوارەوە، سەرەوە و خوارەوە، ئەمە حاڵی مشتومڕکەرەکانە. ناگەنە هیچ کوێیەك. لە هەلاجیکێن وەرە خوارەوە و مەبەستەکەتیان

"بەڵام ئەمە مەحاڵە. باشی ئیش ناکات. بە دروستی ئیشت پێ کرد؟" شەریف وتی "ڕێک ئەوەم کرد کە تۆ وتت" لوستنگ وتی "بەعیرە دەبی شتێکی هەڵەت کردبێت" مشتومڕەکە درێژەی کێشا. بەهەرحاڵ تفەنگەکە بە هێمنی نەرم بووەوە.

لوستێگ لە تاکتیکی مشتومڕەکەیدا چووە قۆناغی نوێ. ئەو کۆمەڵێک قسەی تەکنیکیی بۆ ماناکردنەوەی لەبارەی ئۆپەراسیۆنی بۆکسەکە کرد، شەریف تەواو سەرگەردان بوو کە ئێستا پەیدەچوو کەمتر لە حزی دڵنیا بێت و لە مشتومڕەکەدا کەمتر فشاری دەهێنا. لوستێگ وتی "سەیرکە، من هەر ئێستا پارەکەت دەدەمەوە. هەروەها ڕێنمایی نووسراوت دەدەمێ بەبارەی ئەوەی چۆن ئیش بە ماکینەکە بکەیت و هەروەها دێمە ئۆکلاهۆماش بۆئەوەی دڵنیا بمەوە بۆئەوەی بە دروستی کار دەکات. باشی تۆ ناتوانیت ئەمە بکەیت" شەریف بەنامەڵبەوە ڕازی بوو بۆئەوەی بەتەواوی تەنامەتی پێ ببێنێت. لوستێگ سەد دانە سەد دۆلاری دەرهێنا و دایە ئەو و پێی وت ئارام بگرە و لە شیکاگۆ کۆنا هەفتەیەکی خۆش بەسەر ببە. شەریف کە ئێستا ئارامتر و کەمتر سەرگەردان بوو، دواجار ڕۆیشت. بەدرێژایی چەند ڕۆژی دواتر لوستێگ هەموو بەیانییەک سەیری ڕۆژنامەی دەکرد. دواجار ئەو بۆی دەرکەوت سۆراخی چی دەکات. نامەیەکی کورت کە هەواڵی دەستگیرکردن، دادگایی و حوکمی شەریف ڕیچاردی بڵاو لەبەرامبەر گەیاندنی نیشینی تەزویر. لوستێگ سافەشەکەی بردبووەوە، شەریف ئەت جارێکی تر هەراسانی نەکردەوە

# یاسای ١٠

## پەتا: خۆت لە دڵتەنگ و نەگبەت دوور بگرە

### حوکم

*دەشێ تۆ لە ئەنجامی بەدبەختی کەسێکی تر بمریت- حاڵەتە هەستییەکان ئەوەندەی نەخۆشی پەتابەخشن. لەوانەیە تۆ وا هەست بکەیت یارمەتی کابرایەک دەدەیت کە خەریکە نوقم دەبێ بەڵام تۆ تەنیا کارەساتەکەی خۆت خێراتر دەکەیتەوە. هەندێ جار بەدبەختەکان نەگبەتی بەسەر خۆیان دێنن. ئەوان بەهەمان شێوە بەسەر تۆشی دێنن. لەبری ئەمە، لە دڵشاد و بەختەوەر نزیک بەرەوە*

### سەرپێچی لە یاساکە

ماری گیلبێرت کە لە لیمێریک، ئێرلەندە لە ساڵی ١٨١٨دا لەدایک بوو، لە ١٨٤٠ەکاندا هاتە پاریس بۆئەوەی وەکو سەماکار و نمایشکار سامانی خۆی پێکەوە بنێت. ماری لۆلا مۆنتێز (دایکی نە بەچە ئیسپانی بوو) ی لە خۆی نا و بانگەشەی ئەوەی کرد سەماکارێکی فلامێنکۆی خەڵکی ئیسپانیایە. بەهاتنی ١٨٤٥، لە پیشەکەیدا بەرەو خراپی دەچوو و بۆئەوەی بەرگە بگرێت بووە سۆزانییەک و سۆزانییەکی سەرکەوتوو لە پاریس

تەنیا یەک کەس توانی پیشەی سەماکاریی لۆلا نەجات بدات. ئەلێکساندەر دوجاریێر، خاوەنی ڕۆژنامەیەک کە زۆرترین تیراژی لە فەرەنسا هەبوو و هەروەها ڕەخنەگری درامای

ڕۆژنامەکە بوو. لۆلا بڕیاریدا دڵی بەدەست بهێنێت و بە چنگی بخات. ئەو بە لێکۆڵینەوە لە نووسەکانی ئەلێکساندەر، بۆی دەرکەوت کە ئەمیر بەتایبەت ئەسپسواری دەکات و "بە ڕێکەوت" بووڵتی بوو بەرووی کار گەیشتە ئەوەی هەردووکیان ئەمیر بلێت پێکەوە ئەسپسواری بکەن. چەند هەفتەیەک دواتر، لۆلا چووە شوقەکەی ئەو.

بۆ ماوەیەک ئەو دووانە پێکەوە دڵخۆش بوون. بە یارمەتی دوجاریێ، لۆلا دەستیکرد بە زیندووکردنەوەی پیشەی سەماکاریی خۆی. سەرباری سەرکێشی بەرابەر بنگە کۆمەڵایەتییەکەی، دوجاریێ بە هاوڕێکانی وت لە بەهاردا مارەی دەکات (لۆلا قەت پێی نەوتبوو کە لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا لەگەڵ ئینگلیزێک پەیوەندی کەوتووە و هێشتا لە ڕووی یاساییەوە هاوسەردارە). هەرچەندە دوجاریێ بە قووڵی عاشقی بوو، ژیانی بەرەو هەڵدێر چوو.

سامانەکەی لە بڕیندا گۆڕانی بەسەردا هات و هاوڕێ کاریگەرەکان دەستیانکرد بە دوورکەوتنەوە لێی. شەوێکیان دوجاریێ بۆ ئاهەنگێک بانگهێشت کرا کە هەندێ لە دەوڵەمەندترین کەسانی لە پاریس لێ بوون. لۆلاش ویستی بچێت بەڵام ئەو ڕێگەی نەدەدا. ئەوان یەکەمین دەمەقاڵێیان ئەنجامدا و دوجاریێ بەتەنیا چووە ئاهەنگەکە. ئەو لەوێ کە بێ ڕادە سەرخۆش بوو، بیانەی ڕەخنەگرێکی ترامای کرد بەناوی ژان باپتیست ڕۆزمۆند دو بوڤالۆن، لەوانەشە لەبەر شتێک بووبێت کە ڕەخنەگرەکە لەبارەی لۆلا وتبووی. بەیانیی دواتر بوڤالۆن بۆ شەڕێک تەحەدای کرد. بوڤالۆن یەکێک بوو لە باشترین دەمانچە تەقێنەکانی لە فەرەنسا. دوجاریێ هەوڵیدا پوزش بهێنێتەوە، بەڵام شەڕەکە ڕوویدا و ئەو تەقەی لێکرا و کوژرا. بەمشێوەیە ژیانی یەکێک لە گەنجە هەرە مژدەبەخشەکانی کۆمەڵگەی پاریس کۆتایی هات. لۆلا کە تێکشکابوو، پاریسی جێهێشت.

لە ساڵی ١٨٤٦دا لۆلا مۆنتێز لە میونیخ پەیدا بوو کە لەوێ بڕیاریدا دڵی پاشا لودڤیگی بەڤاریا داگیر بکات. بۆی دەرکەوت باشترین ڕێگە بەرەو لودڤیگ لە ڕێگەی یاریدەدەرە سەرەکییەکەیەتی، واتە کۆنت ئۆتۆ فۆن ڕیچبێرگ، پیاوێک کە زۆر کەیفی بە کچی جوان دەهات. ڕۆژێک، کاتێک کۆنت خەریکی خواردنی نانی بەیانی بوو لە کافێیەکی دەرەوە،

لۆلا کە بە ئەسپەکەی ڕێی دەکرد، "بە ڕێکەوت" لە ڕیمەکە کەوتە خوارەوە و لەبەردەم پێیەکانی ڕیچبێرگ کەوت. گوێ نەیدا بەماناوەوە چوو و سەرسام بوو. ئەو دەیلیبیدا بە لودویگی ناسیبێت.

ڕیچبێرگ ئامادەکارییەکی بۆ ئامادەبوونێک لەگەڵ پاشا کرد بۆ لۆلا، بەڵام کاتێک ئەو گەیشتە ژووری چاوەڕوانی، گوێی لە پاشا بوو دەیگوت زۆر لەوە سەرقاڵترم غەریبەیەکی تەکلیف کەر ببینم. لۆلا پاڵی بە پاسەوانەکانەوە نا و هەرچۆنێک بێت چووە ژوورەکەی. بە بڕوسەکەدا، پێشەوەی درێسەکەی بە شێوەیەک لە شێوەکان دڕا (لەوانەیە خۆی ئەمەی کردبێت، یەوانەشە یەکێک لە پاسەوانەکان) و بە دەرکەوتنی پەڕو و ئاشکرای مەمکەکانی، هەمووان و بەتایبەت پاشای تووشی سەرسوڕمان کرد. لۆلا ڕێگەی پێدرا بێتە ناو ئامادەبووانی لودویگ. بەیانی و پێنج سەعات دواتر ئەو یەکەمین نواندنی خۆی لەسەر شانۆی بافاریا دەستپێکرد. ڕەخنەکان توند بوون، بەڵام ئەمە نەبووە هۆی ئەوەی لودویگ لە ڕێکخستنی نمایشی تر بوەستێنێت.

لودویگ بە قسەی خۆی کەوتبووە ژێر "جادوو"ی لۆلا. ئەو لەگەڵ لۆلادا کاتێک لەناو خەڵک دەرکەوت کە قۆڵی لەسەر شانی بوو و پاشان لە یەکێک لە شەقامە هەرە دیارەکانی میونخ شوقەیەکی بۆ کڕی و بۆی ڕاخست. هەرچەندە ئەو وەکو کەسێکی زەریز ناسرابوو و نەدەبووە بەندەی مەیل و ئارەزووەکان، لۆلای دایە بەر لێزمەی دیارییەکان و دەستیکرد بە نووسینی شیعر بۆی. ئێستا کە لۆلا مەعشوقی دڵخوازی بوو، لە شەوورۆژێکدا لۆلا بووە خاوەنی ناوبانگ و سامان.

لۆلا بەرەبەرە هاوسەنگی لەدەستدا. ڕۆژێکیان کاتێک لە دەرەوە بە ئەسپ ڕێی دەکرد، پیرەپیاوێکی ئەسپ سوار لەپێشیەوە دەڕۆیشت. لۆلا ڕۆیشتنەکەی بەدڵ نەبوو و پێی وابوو خاو ڕێ دەکات. لەبارێکدا کە نەبوونی لێی نەیەڕێت، دەستیکرد بە لێدانی بە قامچییەکەی. جارێکی تر کە بۆ پیاسە چووبووە دەرەوە، سەگەکەی بەڕەڵا کردبوو. سەگەکە پەلاماری ڕێبوارێکیدا، بەڵام لەبری یارمەتیدانی پیاوەکە و دوورخستنەوەی سەگەکە، بە قامچی بە کابرایدا. ڕووداوی لەو شێوەیە بوونە مایەی تووڕەبوونی هاوڵاتیانی

هێمنی باڤاریا، بەڵام لودویگ پشتی لۆلای گرت و تەبابەت کردی بە هاوڵاتی باڤاریا. دەست و پێوەندەکانی پاشا هەوڵیاندا بەرلەبەر مەترسییەکانی نامەتەکە بەحەبەری بێنەوە، بەڵام ئەوانەی رەخنەیان لە لۆلا دەگرت دەستبەجێ لەکار دەرکران.

لەکاتێکدا کە ئەو باڤارییانەی پاشایان خۆش دەویست ئێستا بە ئاشکرا رقیان لێ دەبووەوە، لۆلا کرایە کۆنتێسە، کۆشکێکی نوێی بۆ خۆی بونیاد نابوو و دەستیکردبوو بە دەم تێوەردان لە سیاسەت و لەبارەی سیاسەتەوە ئامۆژگاری لودویگی دەکرد. ئەو بەهێزترین هێز بوو بە شانشینییەکەدا. کاریگەریی ئەو لە کابینەی پاشادا بەردەوام لە گەشەدا بوو و بە سوکی مامەڵەی لەگەڵ وەزیرەکانی تردا دەکرد. سەرەنجام، پەشێوی لەسەراسەری قەڵەمڕەوەکەدا هەڵایسا. ئەو سەردەمەی جارێک لە جاران شوێنێکی ئارام بوو تەقریبەن کەوتە بەر ئامانجی شەڕی ناوخۆی و خوێندکاران لە هەموو شوێنێک هوتافیان دەکێشا " لۆلا بۆ دەرەوە! "

بەهاتنی کانوونی دووەمی ١٨٤٨، لودویگ بۆ دواجار بەتوانی بەرگەی فشار بگرێت بە حەمبارییەکی زۆرەوە فەرمانی بە لۆلادا دەستبەجێ باڤاریا جێ بهێڵێت. ئەو رۆیشت، بەڵام نەک پێش ئەو کاتەی تاجەکەی دا. بۆ ماوەی پێنج هەفتەی دواتر، کینەی باڤارییەکان بەسەر مەعشوقی پێشووی پاشادا هەڵرژا. لە مانگی مارسی ئەو ساڵەدا لودویگ ناچار بە دەستبەرداربوون لە تاجەکەی کرا.

لۆلا مۆنتێز رۆیشتە ئینگلتەرە. زیاتر لە هەر شتێکی تر ئەو پێویستی بە زێر بوو و سەربازی ئەوەی کە مارەبڕاو بوو (ئەو هێشتا تەڵاقی لەو ئینگلیزە وەرنەگرتبوو کە پێنج ساڵێک هاوسەرگیری لەگەڵ کردبوو)، چاوی بڕییە جۆرج ترافورد هیلد، ئەفسەرێکی مڕدەبەخشی سوپا کە کوڕی دادوەرێکی ناسراو بوو. هەرچەندە ئەو دە ساڵ لە لولا گەنجتر بوو و دەیتوانی هاوسەرێک لەنێو جوانترین و دەوڵەمەنترین کچانی کۆمەڵگەی ئینگلیز هەڵبژێرێت، هیلد کەوتە ژێر جادووەکە. ئەوان لە ١٨٤٩دا هاوسەرگیریان کرد. لۆلا بەرووبەڕوو بە تۆمەتی دووهاوسەرگیری دەستگیر کرا، خۆی لە دادگایی قوتار کرد و ئەو و هیلد بەرەو ئیسپانیا رایانکرد. ئەوان دەمەقاڵێی ترسێن کرد و جارێکیان لۆلا چەقۆیەکی

لیڤا دراماری، هیلدی لە حۆی دوور خستەوە. پاش ئەوەی کە گەڕابەوە ئینگلتەرە، هیلد بۆی دەرکەوبی پۆستەکەی لەناو دەریادا لەدەست داوە. پاش ئەوەی لە کۆمەڵگە بەدەر کرا، بەرەو پورتوگال ڕۆیشت کە لەوێ لە هەژاریدا ژیانی بردە سەر. پاش چەند مانگێك، ژیانی کورتی لە ڕووداوێکی بەلەمەوانیدا کۆتایی هات.

ئەو کەسەی کە ئۆتۆبایۆگرافی لۆلا مۆنتێزی بلاو کردەوە، پاش چەند ساڵێك مایەپووچ بوو.

لە ١٨٥٣دا، لۆلا بەرەو کالیفۆرنیا ڕۆیشت کە لەوێ چاوی بە پیاوێك کەوت بەناوی پات هەلّ و هاوسەرگیری لەگەڵ کرد. پەیوەندییەکەیان وەکو هەموو ئەوانەیتر ڕاگوزەر بوو و ئەو (هەلّ)ی لەبەر پیاوێکی تر واز لێهێنا. ئەو ڕوویکردە مەشروب خواردنەوە و کەوتە ناو حالەتێکی قوولی خەمۆکیی کە تاوەکو مرد، واتە چوار ساڵ دواتر، درێژەی هەبوو لە بارێکدا کە هێشتا تا ڕادەیەك گەنج بوو.

بە تەمەنی چل و یەك ساڵیدا، لۆلا حل و خشڵەکەی بەلاوە نا و ڕوویکردە خودا. ئەو بە ئەمریکادا گەڕا، محازەرەی لەبارەی بابەتە دینییەکان وتەوە، حل و سەرپۆشی سپی پۆشی. ئەو دوو ساڵ دواتر، لە ١٨٦١دا مرد.

## لێکدانەوە

لۆلا مۆنتێز بە مەکر و فریوەکانی پیاوانی مەکێش دەکرد، بەلام دەسەلاتی ئەو بەسەریاندا لەسەرووی سێکسەوە بوو. لە ڕێگەی هێزی کارەکتەرەکەیەوە بوو کە عاشقەکانی لەژێر کاریگەریدا دەهێشتەوە. پیاوان بەرەو ناو گێژەڵۆکە بەهێزەکەی لول دەدران. ئەوان سەرگەردان و تووڕە دەبوون بەلام ئەو هەستە بەهێزانەی کە دەیخستەڕوو بەهەمان شێوە ئەوانی زیندووتر دەکرد.

هەروەك چۆن لە حالەتی پەتادا وەهایە، کێشەکان تەنیا پێ بە پێی تێپەڕینی کات سەرهەڵدەدەن. ناجێگیریی سروشتیی لۆلا دەچووە ژێر پێستی عاشقەکانیەوە. ئەوان خۆیان لەناو مێجهاحی کێشەکانیدا دەبینیەوە، بەلام هوگربوونی هەستیان بۆ ئەو

وانلێدەکرێن یارمەتی بدەن. ئەمە حاڵی چارەنووسساری بەختڕەشییەکە بوو- چونکە بڕوا بوو سیر بەدەکرا یارمەتی بدرێت. کێشەکانی ئەو زۆر قووڵ بوون. هەر کە عاشقەکەی بەکرناسیی لەگەڵ دەکرد، سەرگەردان دەبوو. ئەو خۆی لەناو دەمەقاڵێکانی دەبینییەوە. پەناکە دەگوازرایەوە بۆ خێزان و هاوڕێکانی، یان لە حاڵەتی لووتکەدا بۆ سەراپای وڵات. تاکە چارەسەر ئەوە دەبوو کە لێی دوور بکەوێتەوە یان بەدەست داڕمانێکی کۆتاییەوە بناڵێنی.

کارەکتەری لە جۆری پەناتامێز سنووردار نییە بە ژنان، هیچ پەیوەندی بە جێندەرەوە نییە. ئەمە لەو ماجێنگیرییە ئاوەکییە سەرچاوە دەگرێت کە لە دەرەوەیا تیشک دەداتەوە، کارەسات بەسەر خۆی دێنێت. تەقریبەن ئاراستەیەک هەیە بۆ تێکشکاندن و لەقکردن. تۆ دەتوانیت ئەمەیێک بە ئاوڕتوێکردنی بەختڕەشیاسیی کارەکتەری پەناتامێز بەسەر بەیت. بەڵام کات بە فیڕۆ مەدە- تەنیا وانەکە فێربە. کاتێک تۆ پێت وایە لە خۆری تووشکەرێکدایت، مسفەشە مەکە، هەوڵی یارمەتی مەدە، بە هاوڕێکانت مەگەیەنە، ئەگینا گرفتار دەبیت. لەدەست تووشکەرەکە ڕابکە یان بەدەست بەرەنجامەکانەوە بناڵێنە.

*بێند کاسیوس بواڵەتێکی لەڕ وبیبسی هەیە. ئەو زۆر بیر دەکاتەوە... کەسێ ئەوەندەی کاسیۆسی لەڕ ماناسم کە ئەوەندە زوو خۆمی لێ بپوێرم. پیاوانی وەک ئەو قەت لە دڵەوە ئاسوودە نابن لەکاتێکدا کە ماریکی گەورەتر لەخۆیان هەڵدەکرێن و بۆیە زۆر مەترسیدارن.*

*جولیەس قەیسەر، ویلیام شەیکسپیەر، ١٥٦٤-١٦١٦*

## کلیلی دەسەڵات

ئەو بەدبەختانەی ناو ئێمە کە بەبێ ئەوەی بەدەست خۆیان بێت بەهۆی باروبۆخەوە کەوتوون شایستەی هەموو یارمەتی و هاوسۆزییەکن کە ئێمە بتوانین پێیان بدەین. بەڵام ئەو کەسانەی تر هەن کە نە بەگەتی و بەدبەختی لەدایک نەبوون، بەڵکو بەهۆی کرداری ڕووخێنەر و کاریگەریی ناجێگیرکەر بۆ سەر ئەوانیتر بەسەر خۆیان دێنن. شتێکی مەزن دەبێت ئەگەر ئێمە بتوانین ڕزگاریان بکەین، ڕێساکانیان بگۆڕین، بەڵام زیاتر ئەوە

ڕێسکاسی حۆیانە کە سەرەنجام دێنە نارمانەوە و دەمانگۆڕن. هۆکارەکە ناسانە مرۆڤەکان بە ئاسانی دەکەونە ژێر میزاج، هەستەکان و نەبانەت شێوازەکانی بیرکردنەوەی ئەو کەسانەی کە کاتیان لەگەڵ بەسەر دەبەن.

نەبابەت کەسانی نەگبەت و ناجێگیری بێچارە کاریگەرییەکی تووشکردنی بەهێزیان هەیە چونکە کارەکتەرەکانیان و هەستەکانیان زۆر تونده. ئەوان زۆرجار وەکو قوربانی خۆیان دەخەنەڕوو، لەسەرەتادا نابینی نەگبەتییەکانیان وەکو دەستکردی خۆیان بە نامومکین لەقەڵەم دەدەن. پێش ئەوەی تۆ درک بە سروشتی ڕاستەقینەی کێشەکانیان بکەیت هەنوکە ئەو کێشانە تووشی تۆ هاتوون.

لەمە تێبگە. لە گەمەی دەسەڵاتدا، ئەو خەڵکەی تۆ پەیوەندیت لەگەڵیاندا هەیە ڕەحمەگرن. مەترسیی پەیوەندیکردن لەگەڵ تووشکەران ئەوەیە کە تۆ کات و وزەی بەنرخی خۆت بەهەوڵدان بۆ ئازادکردنی خۆت بەسەر دەبەیت. لە ڕێگەی جۆرێك لە گوناهەوە بە پەیوەندیکردن، تۆش لە چاوانی ئەوانیتردا بەدەست کێشەوە دەناڵێنیت قەت مەترسییەکانی تووشبوون بەکەم مەگرە.

زۆر جۆری تووشکەر هەن کە لێیان بەئاگا بیت، بەڵام یەکێك لە هەرە شاراوەکان بریتییە لە ئارارچێژ بەدەست نارەزامەندیی درێژخایەنەوە. کاسیۆس، پیلانگێڕ لەدژی جولیەس قەیسەر ناڕەزامەندییەکی هەبوو کە لە ئێرەییەکی قووڵەوە دەهات. ئەو نەیدەتوانی بەرگەی حزووری هیچ کەسێکی بەهرەمەندتر بگرێت. لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت قەیسەر هەستی بە داماوی ناکۆمای ئەو کابرایە کردبێت کە ئەوی لە پۆستی پرێتەری یەکەم بوارد و بەخشی بە بروتوس. کاسیوس هەر بیری کردەوە و بیری کردەوە، کینەکەی بۆ قەیسەر دەبووە بەخۆشی. بروتوس خۆی کە کۆمارییەکی دڵسۆز بوو، ڕقی لە دیکتاتۆرییەتی قەیسەر دەبۆوە و ئەگەر ئۆقرەی چاوەڕوانی هەبووایە، ئەوا پاش مردنی قەیسەر دەبووە یەکەمین پیاو لە ڕۆم و لەوانەبوو ئەو خراپەیەی کە ڕیبەر هێنابوویە کایە نەهێڵێت. بەڵام کاسیۆس تووشی کینەکەی خۆی کرد و ڕۆژانە بە حەکایەتی ئەهریمەنانەی قەیسەر گوێی دەکرد. دواجار ئەو بروتوسی بۆ پیلانگێڕییەکە بەدەستهێنا. ئەوە

سەرەتای تراژیدیایەکی گەورە بوو. دەکرا چەند بەگەتی خۆی لێ لابدرێت ئەگەر بروتوس فێری ترس بووایە لە فێری تووڕەبوون

تەنیا یەک چارەسەر بۆ تووڕەبوون هەیە: قەرەنتینە. بەڵام بەهاتنی ئەو کاتەی کە تۆ کێشەکە دەناسیتەوە زۆرجار درەنگ بووە. لۆلا مۆنتێز بە کەسایەتییە ناچارکەرەکەی کارت تێدەکات. کاسیۆس بە سروشتە متمانەبەخشەکەی و قووڵایی هەستەکانی جەدووت لێدەکات. تۆ چۆن دەتوانیت خۆت لەبەرانبەر ئابڕووبەرانی شاراوەکان بپارێزیت، وەڵامەکە لە حوکمدانی هەڵکڕایە لەسەر ئەو کاریگەرییانەی کە لەسەر جیهان هەیانە نەک لەسەر ئەو هۆکارانەی دەیدەن بەدەستەوە بۆ کێشەکانیان

دیوەکەی تری تووڕەبوون بەهەمان رادە ڕاستە و لەوانەیە ئاسانتر درک بکرێت. خەڵک هەن کە لە ڕێگەی شانسیان، سروشتی ڕەونەقداریان و هۆشمەندییان بەختەوەری بەلای خۆیاندا بەکێش دەکەن. ئەوانە سەرچاوەی خۆشین و دەبێ تۆ پەیوەندییان لەگەڵدا دروستبکەیت بۆ ئاڵوگۆڕکردنی ئەو کامەرانییانەی بەسەر خۆیانی دێنن

دەسەڵات: خەڵکی بەختەوەر بیاسەرەوە نوێنەوەی بکرێ هاوەڵێتیان بکەیت و بەگبەتەکان بیاسەرەوە بزنەوەی خۆیان لێ لابدەیت، بەگەتی زۆرجار تارانی گەمژەیە و لەنێو ئەوانەی بەدەستیەوە دەناڵێنن هیچ بەخۆشییەک لەمە بڵاوتر نییە. قەت دەرگات بەسەر کەمترین نەگبەتدا مەکەرەوە، چونکە ئەگەر ئەمە بکەیت زۆرێکی تر بە شەمەبەفەرەکەیدا هەن، .بەهۆی نەگبەتی کەسێکی ترەوە مەمرە،

بەلتاسار گراسیەن، (١٦٠١–١٦٥٨)

## پێچەوانەبوونەوە

ئەم یاسایە هیچ پێچەوانەبوونەوەیەکی بەسەردا پیادە نابێت. پیادەبوونەکەی گەردوونییە. هیچ شتێک لە پەیوەندیکردن لەگەڵ ئەوانەی تووشی بەگەتی خۆیانت دەکەن دەست ناکەوێت. تەنیا دەسەڵات و بەختی باش دەستی ئەوانە دەکەوێت کە پەیوەندی لەگەڵ بەختەوەرەکان دەکەن. ئەم یاسایە لەسەر حسابی خۆت فەرامۆش بکە

## یاسای ژمارە ١١

# فێر بە وا لە خەڵک بکەیت بەردەوام پشتت پێ ببەستن

### پوختە

*بۆئەوەی سەربەخۆیی خۆت بەرقەرار بکەیت، دەبێ هەمیشە پێویستیان پێت بێت و بیانەوێت. چەندەی زۆرتر پشتت پێ ببەستن، ئەوەندە ئازادیی زیاترت دەبێت. وا لە خەڵک بکە بۆ بەختەوەری و کامەرانییان پشتت پێ ببەستن و ئیتر هیچ شتێک نابێت لێی بترسیت. قەت ئەوەندەیان فێر مەکە کە بتوانن بەبێ تۆ هەنگاو بنێن.*

### سەرپێچی لە یاساکە

لە کاتێکی سەدەکانی ناوەڕاستدا، سەربازێکی بەکرێگیراو کە ناوی تۆمار نەکراوە، شارۆچکەی (سسد) لە پەلاماری نەیاری ڕزگار کرد. هاوڵاتیانی سیینا چۆن دەیانتوانی پاداشتی بدەنەوە؟ هیچ بڕە پارەیەک یان زێڕێک نەدەتوانرا بەراورد بکرێت بە بەهای پارێزگاری لە ئازادیی شارەکە. هاوڵاتیانی شارەکە بیریان لەوە کردەوە سەرپەرە بەکرێگیراوەکە بکەنە لۆردی شارەکە، بەڵام ئەمەش پاداشتێکی تەواو نەبوو. دواجار یەکێکیان لەبەردەم ئەنجومەن وەستا و داوای قسەیکی لەسەر ئەم بابەتە کرد و وتی "با بیکوژین و پاشان وەکو قەدیسی پاڵپشتمان بیپەرستین" ئیتر هەر ئەمەیان کرد.

کۆسێ کارماگۆلا یەکێک بوو لە ناوازترین و سەرکەوتووترین سەربەرە بەکرێگیراوەکان لە ساڵی ١٤٤٢دا، لە دەرەگای زیانیدا. کاری بۆ شاری فلۆرەنسا دەکرد کە لە گەرمەی جەنگێکی درێژدا بوو لەگەڵ میلانۆ. کۆسێ لەناکاو بانگ کرایەوە بۆ فلۆرەنسا. ئەو کە ملهوڕێکی چەلەک بوو، بە هەموو جۆرە رێز و شکۆیەک پێشوازی لێکرا. ئەو ئێوارەیە دەبووایە لەگەڵ خودی دوک لە کۆشکەکەیدا نانی ئێوارە بخوات. لە رێگەیدا بەرەو کۆشک، تێبینی ئەوەیکرد کە پاسەوانەکە بە ئاراستەیەکی جیاوازدا دەیبات. لە پردی مەماویانگی (سانتی) دەپەڕینەوە، لە پڕێکدا ئەو درکی بەوە کرد بۆ کوێی دەبەن- بۆ زیندان. ئەو بە تۆمەتێکی هەڵبەستراو حوکمدرا و رۆژی دواتر بە پیازا سان مارکۆ، لەبەردەم قەرەباڵغییەکی تۆقیوودا کە نەیاندەزانی چۆن چارەنووسی ئەو کابرایە وەها بە ئاراستەیەکی خەماکدا سوڕاوە، سەری پەڕێنرا.

### لێکدانەوە

زۆرێک لە سەربازە بەکرێگیراوەکانی ئیتالیا هەمان چارەنووسی قەدیسی پاڵپشتی سیدا و کۆسێ کارماگۆلایان بەسەر هات. ئەوان شەڕ لەبرای شەڕیان بۆ خاوەنکارەکانیان بردەوە کەچی خۆیان دەربەدەر، زیندانی کران و سەریان پەڕێنرا. کێشەکە بێ ئەمەکی نەبوو. بەڵکو ئەوە بوو کە ژمارەیەکی زۆری سەربازی بەکرێگیراوی تر هەبوو کە بەهەمان ئاست بەتوانا و ئازا بوون. ئەوان قابیلی شوێنگۆڕکێ پێکردن بوون. بە کوشتنیان هیچ شتێک لەدەست نەدەچوو. لەهەمان کاتدا، هەرە بەتەمەنەکانیان خۆیان بەهێز ببوون و پارەی زۆر و زۆرتریان لەبەرانبەر خزمەتەکانیاندا داوا دەکرد. کەواتە چەندە باشترە کە لەکۆڵیان بکەیتەوە و سەربازی گەنجتر و هەرزانتر بەکری بگریت. ئەوە بوو چارەنووسی کۆسێ کارماگۆلا کە دوایی بێ رێزانە و سەربەخۆیانە رەفتاری دەکرد. ئەو دەسەڵاتەکەی خۆی بە بێ چەندوچوون دەبینی بەبێ ئەوەی دڵنیا بێتەوە لەوەی کە بە راستی بەشێوەیەکی رەها پێویستیان پێیە یان نا.

ئەمەیە چارەنووسی (لەوانەیە بڵێین بە ئاستێکی کەمتر نووسوونتزانە)ی ئەوانەی کە وەها لەوانیتر ناکەن پشتیان پێ ببەستن. زوو یان درەنگ کەسێک دێت کە دەتوانێت بەهەمان توانا کارەکە بکات- کەسێکی کەمتر و تازەتر، هەرزانتر و بێ هەڕەشەتر

تاکە کەس نە کە دەتوانێت ئەوە بکەیت کە دەیکەیت و چارەنووسی ئەوانەی دەگرێت دەگرن وەها ببەستەوە بە چارەنووسی خۆت کە ئەوان نەتوانن خۆیانت لێ قوتار بکەن ئەگینا ڕۆژێک دێت کە بە پردی (سابیس)ی خۆتدا بپەڕێتەوە

## پەیڕەوکردن لە یاساکە

کاتێک ئۆتۆ فۆن بیسمارک لە ١٨٤٧دا بووە ئەندامی پەرلەمانی پرووسیا، تەمەنی سی و دوو ساڵان بوو و هیچ هاوپەیمان و هاوڕێیەکی نەبوو. بە سەرنجدان لە دەوروبەری، بڕیاریدا ئەو لایەنەی کە خۆی بداتە پاڵی نە لیبراڵەکان و نە کۆنسێرڤاتیفەکانی پەرلەمان نییە، نە وەزیرێکی دیاریکراو و بە دڵنیاییەوە خەڵکیش نییە. بەڵکو پاشا فرێدریک ویلیامی چوارەمە. ئەمە هەڵبژاردنێکی سەیر بوو، چونکە فریدریک لە نزمایی دەسەڵاتیدا بوو. ئەو کە پیاوێکی لاواز و پاڕ بوو، بەردەوام ملی بۆ لیبراڵەکانی پەرلەمان دەدا، لەڕاستیدا ئەو دەستەوستان بوو و دەکۆکی لە بەشی هەرە زۆری ئەو شتانە دەکرد کە بیسمارک کەیلی پێیان نەدەهات، چ لە ڕووی کەسی و چ لە ڕووی سیاسییەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بیسمارک شەو و ڕۆژ مەرایی بۆ فریدریک دەکرد. کاتێک ئەندام پەرلەمانەکانی تر هێرشیان کردە سەر پاشا لەبەرامبەر هەنگاوە پووچەکانی پاشا، تەنیا بیسمارک پشتیوانی دەکرد.

لە کۆتاییدا ، هەمووی ناکامی هەبوو لە ١٨٥١دا بیسمارک کرایە وەزیرێک لە کابینەی پاشادا. ئێستا چووە ناو کارەوە. چەندان جار زووی بۆ پاشا هێنا تا سوپا بونیاد بنێتەوە، تا پشتگیری لیبراڵەکان نەکات، تا ئەو شتە بکات کە بیسمارک خۆی دەیویست. ئەو کاری لەسەر نائەمنی فرێدریک لەبەرامبەر هاوڕاکەی دەکرد، تەحەددای دەکرد کە پشتوو بێت و بە شادرییەوە فەرمانڕەوایەتی بکات. ئینجا ئەو بەرە بەرە دەسەڵاتەکانی پاشای گەڕاندەوە تا ئەوەی کە پاشایەتی جارێکی تر بووەوە بە بەهێزترین هێز لە پرووسیادا.

کاتێک فریدریکه ١٨٦١دا مرد، ویلیامی برای تاجی لەسەر دانا. ویلیام زۆر رقی له بیسمارک بوو هیچ بیارێکی نەبوو لای خۆی بیهێڵێتەوە. بەلام ئەویش هەمان ئەو باروئۆخەی براکەی بۆ مایەوە. دوژمنان زۆر و رەبەند بوون، که دەیانویست دەسەلاتەکەی داموریێنن. له راستیدا ئەو بیری له دەستبەرداربوونی تەحت کردەوە، هەستی کرد ئەو هێز و توانایەی نییه تا دەست و پەنجە لەگەل ئەم پۆستە مەترسیدار و نائارامەدا نەرم بکات بەلام بیسمارک جارێکی تر خۆی تێوەگلاندەوە. ئەو پشتی پاشای نوێی گرت، توانای پێدا و بۆ کرداری توند و یەکلاییکەرەوە هانیدا. پاشا ئیتر پشتی بە تاکتیکە توندەکانی بیسمارک بەست بۆ بەدوورگرتنی دوژمنانی و سەربازی کەیف بەهاتنەکەی بە کابرا، بەرووبی کردی بە سەرۆک وەزیران. ئەو دووانه زۆر زوو لەسەر سیاسەت و بەرنامه دەمەقالێیان دەکرد- بیسمارک زۆر کۆنسێرڤاتیڤتر بوو- بەلام پاشا له رابەستەییەکەی خۆی تێدەگەیشت. هەر کاتێک سەرۆک وەزیران هەرەشەی دەست لەکارکێشانەوەی دەکرد، پاشا هەموو جارێک ملی بۆ دەدا. لەراستیدا ئەوە بیسمارک بوو کە سیاسەتی دەولەتی دادەڕشت.

سالانێک دواتر، کردارەکانی بیسمارک وەکو سەرۆک وەزیرانی پروسیا چەندەها دەولەتی ئەلمانی بەرەو یەکگرتن لەیەک ولاتدا ئاراستە کرد. ئێستا بیسمارک پاشای نەبەی پاشای دەدا تا خۆی وەکو ئیمپراتۆری تاج لەسەرنراوی ئەلمانیا رابگەیەنێت. لەگەل ئەوەشدا بە راستی ئەوە بیسمارک بوو کە گەیشتبووە ترۆپکی دەسەلات. وەکو پیاوی دەستە راستی ئیمپراتۆر و وەکو راوێژکاری ئیمپریالی و میری سووربچال، هەموو جلەوەکانی بەدەستەوە بوو.

### لێکدانەوە

زۆربەی سیاسییە کەنج و هاوەن تموحەکان بە پوایی له دیمەنی سیاسی ئەلمانییای ١٨٤٠ەکان هەولیان دەدا بناغەیەکی دەسەلات لەنێو ئەو کەسانەدا بونیاد بنێن کە بەشی زۆری دەسەلاتیان بەدەستەوە بوو. بیسمارک مەسەلەکەی هاوار نسی لەوانەیە چووبە

پاڵ هەرە بەهێز گەمژانە نێت. ئەوان فوتت دەدەن، وەک چۆن تورکی لیبیمبا کۆیسی کارماکۆلای فوتدا. کەس نابەت پشت پێ ببەستێت ئەگەر ئەوان هەموکە بەهێزبن. ئەگەر تۆ شوێنت هەبێت، زۆر باشترە کە بچیتە پاڵ بەرپرس یان نەرمانڕەوا لاوازەکان کە دەتوانیت پەیوەندی پشت پێ بەستنیان لەگەڵدا ببەستیت. تۆ دەبیتە هێز و توانا، خۆشمەندی و بڕبڕەی پشتیان. چ دەسەڵاتێکت بەدەست دەهێنیت! ئەگەر ئەوان خۆیان لە تۆ فوتار کرد ئەوا هەموو بنیاتەکە دادەڕمێت

ڕەرووڕەت حوکمی جیهان دەکات. خەڵکی بەدەگمەن هەنگاو دەنێن مەگەر ئەوەی کە ناچار بن ئەمە بکەن. ئەگەر تۆ هیچ پێویستییەک بۆ خۆت دروست نەکەیت، ئەوا لە یەکەم دەرفەتدا وێن دەکرێیت. لەلایەکی ترەوە، ئەگەر لە یاساکانی دەسەڵات تێبگەیت و وەها لەوانیتر بکەیت بۆ کامەرانی خۆیان پشت بە تۆ ببەستن، ئەگەر تۆ بە "ئاسن و خوێن"ی خۆت حاڵی لاوازیان بپێکبینەوە، ئەو لەبەرامبەر گەورەکاندا بەرگە دەگریت، هەروەک ئەوەی بیسمارک کردی. تۆ هەموو ئەو سوودانەی دەسەڵاتت پێ دەکات بەبێ ئەوەی ئەو دڕکانەت پێدا بچێت کە لەگەڵ بوون بە دەسەڵاتداردا دێن.

*لێرەوە مێرێکی ژیر بیر لە ڕێگاگەلێک دەکاتەوە بۆ وابەستەکردنی هەموو هاوڵاتییەک و لەژێر هەموو هەلومەرجێکدا بە دەوڵەت و خۆیەوە و پاشان ئەوان هەمیشە جێی متمانە دەبن*

*نیکۆلۆ مەکیاڤیلی ١٤٦٩-١٥٢٧*

## کلیلی دەسەڵات

دەسەڵاتی سەرەنجام بریتییە لە دەسەڵاتی ئەوەی وەها بە خەڵک بکەیت ئەوە بکات کە تۆ دەتەوێت. کاتێک تۆ دەتوانیت ئەمە بکەیت بەبێ ئەوەی زۆر لە خەڵک بکەیت یان ئازاریان بدەیت، کاتێک ئەوان بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە ئەوەت پێدەبەخشن کە ئارەزووی دەکەیت، ئەو کاتە دەسەڵاتی تۆ ڕەهەر پێبەبڕاوە. باشترین ڕێگە بۆ بەدەستهێنانی ئەم پێگەیە دروستکردنی پەیوەندیی پشت پێ بەستنە. گەورە پێویستی بە

حرمەتگوزاریەکانی تۆیە، ئەو لاوازە، نان ناتوانێت بەبێ تۆ ئیش بکات. تۆ وەها خوت بکەلاوی کارەکەی کردووە کە دەستبەرداربوون لە تۆ نەگەرەیەکی گەورەی بۆ دروست دەکات، یان لانی کەم ئەو مانایەیە کە دەبێ کاتێکی بەمرج لە ڕەهێنانی کەسێکی تردا بە فیرۆ بدرێت تا شوێنی تۆی پێ بگرێتەوە. هەر کە پەیوەستییەکی وەها بونیادنرا ئەوا تۆ دەستی بالا، توانای ئەوەت دەبێت گەورەکەت ئەو شتە بکات کە تۆ دەتەوێ

لویسی یانزە ١٤٢٣-١٤٨٣ پاشای گەورەی فەرەنسا، حاڵێکی لاوازی هەبوو بۆ ئەستێرەناسی. ئەو هەسارەناسێکی لە دەربار دامەزراندبوو کە سەرسام بوو پێی تا ئەو کاتەی کە ڕۆژێکیان کابرا پێشبینی ئەوەی کرد کە حەمی دەربار لەماوەی هەشت ڕۆژدا دەکرێت. کاتێک پێشبینییەکە ڕاست دەرچوو، لویس ترسا، بیری لەوە کردەوە کە یان ئەوەت کابرا کوشتوویەتی بۆئەوەی ڕاستبوونی پێشبینییەکەی بسەلمێنێت یان ئەوەتا ئەوەندە لە زانست قووڵ بۆتەوە کە هێز و توانای هەڕەشەیە بۆ سەر خودی لویس. لە هەر حاڵەتێکدا بێت دەبێت ئەو بکوژرێت

ئێوارەیەکیان لویس هەسارەناسەکەی بانگ کرد بۆ ژوورەکەی، کە لە بەرزایی قەڵاکە بوو، پێش ئەوەی کابرا بگات، پاشا بە حرمەتکارەکانی وت کاتێک ئەم ئاماژەیەکید ئەوا چوار پەلی هەسارەناسەکە بگرن و لە پەنجەرەکەوە هەڵیدەنە خوارەوە، کە سەدان پێ بەرز بوو لە زەوییەوە.

هەسارەناسەکە بەرووی گەیشت، بەڵام پێش ئەوەی لویس ئاماژەکە بدات، بڕیاریدا دوا پرسیار لە کابرا بکات "تۆ دەڵێیت لە هەسارەناسی تێدەگەم و چارەنووسی ئەوانیتر دەزانم، کەوایە پێم بڵێ چارەنووسی تۆ چۆن دەبێ و چەندێکی تر دەژیت"

هەسارەناسەکە لە وەڵامدا وتی "من تەنیا سێ ڕۆژ پێش تۆ دەمرم خاوەن شکۆ" پاشا قەت ئاماژەکەی نەدایە حرمەتکارەکان. ژیانی کابرا پارێزرا. پاشا تا ئەو کاتەی کە لە ژیاندا بوو نەک تەنیا پارێزگاری لە هەسارەناسەکە کرد بەڵکو بەردەوام دیاری بۆ دەهێنا و باشترین دکتۆری بۆ بانگ دەکرد. هەسارەناسەکە چەند ساڵێک دوای لویس ژیا، هێزی پێشبینییەکەی نەسەلماند بەڵام وەستایەتی خۆی لە دەسەڵاتدا سەلماند

ڕۆژێکیان هاری کۆهن، سەرۆکی کۆمپانیی کۆلۆمبیا پیکچەرز لەلایەن گروپێکی جێبەجێکارە هەمیشەکانی سەردان کرا. ساڵی ١٩٥١ بوو کاتێک کەمپەینی دژی کۆمەنیستەکان لە هۆلیوود لەلایەن لیژنەی چالاکییە نائەمریکییەکانی کۆنگریسی ئەمریکی لە گەرمەیدا بوو. جێبەجێکارەکان هەواڵێکی ناخۆشیان پێبوو: یەکێک لە کارمەندەکانیان، جۆن هاوەرد لاوسۆنی فیلمنامەنووس وەکو کۆمەنیستێک ئاشکرا کرابوو. دەبووایە ئەوان خۆیانی لێ قوتار بکەن یان ئەوەتا بە دەست کینەی لیژنەکەوە بناڵێن.

هاری کۆهن لیبراڵێکی توند نەبوو، ئەو هەمیشە کۆمارییەکی پەرگیر بوو. سیاسەتمەدارە دڵخوازەکەی، بینیتۆ موسۆلینی بوو کە جارێک لە هاوڕێان سەردانیشی کردبوو و ڕەسمەکەی لە بان سەرییەوە هەڵواسیبوو. ئەو ئەگەر ڕقی لە کەسێک بووایە پێی دەگوت "ڕۆڵە کۆمەنیست". بەڵام جێبەجێکارەکانی تووشی سەرسوڕمان کرد کاتێک وتی لاوسۆن دەرناکەم. ئەو لەبەر ئەوە لاوسۆنی نەهێشتەوە کە نووسەرێکی باش بوو- نووسەری باشی زۆر لە هۆلیوود هەبوون. لەبەر زنجیرەی پشت پێبەستن هێشتییەوە چونکە لاوسۆن نووسەری هەمدەری بۆگارت بوو و بۆگارت ئەستێرەی کۆلۆمبیا بوو. ئەگەر کۆهن لەگەڵ لاوسۆن تێکی بدایە ئەوا ئەو پەیوەندییەکی پڕ قازانجی گەورەی تێکدەدا. ئەمە زۆر بەنرختر بوو لەو پڕوپاگەندەیەی کە بەهۆی بەرەنگارییەکەی لیژنەکەوە بەسەریدەهات.

هێنری کیسینجەر بەرگەی زۆرێک لەو ڕامیارییانەی برد کە لە کۆشکی سپی نیکسۆندا ئەنجامدران نەک لەبەر ئەوەی ئەو باشترین دیپلۆمات بوو لە لای نیکسۆنەوە- دیپلۆماتکاری تریش هەبوون- و نەک لەبەر ئەوەی ئەو دوو پیاوە باش لەگەڵ یەکتریدا دەگونجان. ئەوان پێکیان هەڵنەدەکرد. نە هاوبەشیش بوون لە باوەڕ و سیاسەتیاندا. کیسینجەر لەبەر ئەوە مایەوە لە شوێنی خۆی چونکە ئەو خۆی خزاندبووە زۆر ڕووبەری ستراکتۆری سیاسی کە ویلکردنی، بەشێوەی لێدەکەوتەوە.

پێت وابێت پشت بەستنی گەورەکەت بە تۆ وادەکات لای ئەو خۆشەویست بیت. لە ڕاستیدا نەوەنەبە ئەو ڕقی لێت بێت و لێت بترسێت. بەڵام وەک ماکیاڤیلی وتی وا باشترە لێت بترسن نەک خۆشیان بوێیت. دەتوانیت ترس کۆنترۆڵ بکەیت، قەت ناتوانیت

خۆشەویستی کۆنترۆڵ بکەیت. پشت بەستن بە هەستێکی گۆڕاو و ناسکی وەکو هاوڕێیەتی تەنیا نائەمنیت پێ دەبەخشێت. باشترە وا لەوەبیتر بکەیت لە ترسی لێکەوتنەکانی بەدەستدانی تۆ پشت پێبەستن نەک لەبەر خۆشەویستی هاوەڵێتیکردنت

## دوو ئەسپەکە

دوو ئەسپ بارییان دەگواستەوە. ئەسپی پێشەوە باش دەڕۆیشت، بەڵام ئەسپەکەی دواوە تەمەڵ بوو. پیاوەکان دەستیانکرد بە گواستنەوەی باری ئەسپی دواوە بۆ سەر پشتی ئەسپەکەی پێشەوە. کاتێک هەموویان گواستەوە، ئەسپەکەی دواوە هەستی بە خۆشی ڕێکردنەکەی خۆی کرد و بە ئەسپەکەی پێشەوەی وت "ڕەحمەت بکێشە و ئارەق بڕێژە! چەندەی زۆرتر هەوڵ بدەیت، ئەوەندە زۆرتر دەبێ بیاڵێنیت" کاتێک گەیشتنە مەیخانە، خاوەنەکە وتی: "بۆچی دەبێ عەلەف بدەمە هەردووکیان لەکاتێکدا کە هەرچی بارە لەیەکێکیان بار دەکەم؟ وا باشترە هەموو خوارنەکە بدەمە یەکێکیان و سەری ئەویتریان ببڕم. لانی کەم چەرمەکەیم دەست دەکەوێت". ئیتر هەر ئەمەی کرد

*هەکایەتەکان، لیۆ تۆلستۆی ١٨٢٨– ١٩١٠*

## پێچەوانەبوونەوە

خەڵکی لاوازی وا لەخەڵک کردن کە پشت بە ئەو ببەستن ئەوەیە کە تۆش تا ئاستێک پشت بەوان دەبەستیت. بەڵام هەوڵدان بۆ چوونە پشت ئەو ئاستە بە مانای خۆقوتارکردنە لەوانەی سەروو خۆت– ئەمە بەرەنگاریکردنە بە تاقی تەنیا، پشت نەبەستن بە کەس ئەمەیە پاڵنەری قۆرخکارانەی هەی پی مۆرگان یان جۆن دی ڕۆکفیلەر– ڕامالینی هەموو ڕکابەرێتییەک و بەدەستخستنی کۆنترۆڵی تەواوەتی. ئەگەر تۆ متووانیت بڕاپ گەمارۆ بدەیت، ئەوا زۆر باشترە.

سەربەخۆییەکی وەها بەبێ باج نابێت. تۆ ناچاریت خۆت گۆشەگیر بکەیت، هۆمۆپۆلەکان زۆرجار بەئاراستەی ناوەوە پێچەوانە دەبنەوە و هێزیان لەژێر گوشاری ناوەکییدا تێکدەشکێنن. ئەمانە هەمان شێوە کینەیەکی بەهێز دەوروژێنن، وا لە نوژمانیان دەکەن یەکبگرن بۆئەوەی شەڕیان لەگەڵ بکەن. پاڵنەر بۆ کۆنترۆڵی تەواوەتی زۆرجار پووچێنەر و بێ بەرهەمە. هەر پشت بەیەکتر بەستن پاساکەیە سەربەخۆی، ئازارتەیەکی دەگمەن و زۆرجار کوشندەیە. باشترە خۆت بخەیتە پێگەیەکی پشت بەیەکتر بەستن و سۆراخکردنی ئەم یاسا گرینگە نەک پێچەوانەکەی.

## یاسای ژمارە ١٢

# بەخشندەیی و ڕاستگۆیی سنووردار بەکاربێنە بۆ شلکردنی قوربانییەکەت

### حوکم

*جوڵەیەکی ڕاستگۆ و سەرڕاستانە، دەیان جوڵەی ناسەرڕاستانە دادەپۆشێت. ئاماژە دڵ واڵاکانی ڕاستگۆیی و بەخشندەیی، بەرگریی تەنانەت بەگومانترین خەڵک بڵاوە دەنێت. کاتێک ڕاستگۆیی سنوورداری تۆ درزێک دەخاتە زرێکەیان، دەتوانیت بەپێی حەوەسی خۆت بەکاریان ببەیت. دیارییەکی هاوکات، هەمان ئامانج دەپێکێت.*

### پەیڕەوکردن لە یاساکە

لەکاتێکی ١٩٢٦دا، پیاوێکی ڕێکپۆشی کەشخە سەردانێکی (ئال کاپۆن)ی کرد کە ترسناکترین مافیای سەردەمەکەی بوو. ئەو کە بە لەهجەیەکی کیشوەری قسەی دەکرد، خۆی وەکو کۆنت ڤیکتۆر لوستیگ ناساند. ئەو بەڵێنیدا ئەگەر کاپۆن ٥٠،٠٠٠ دۆلاری پێ بدات، ئەوا دوو قات زیادی دەکات. کاپۆن پارەی زیاتر لە پێویستی هەبوو بۆ پووڵکردنی "وەبەرهێنان"، بەڵام لەسەر ئەوە ڕانەهاتبوو بڕە پارەی زۆر بداتە کەسی غەریبە. ئەو ڕاستییە کۆنت، شتێک لەبارەی کابراکە جیاواز بوو- سەنگێکی ڕەوەقدار و شێوازی ڕەفتاری- و بۆیە کاپۆن بڕیاریدا کارەکە بکات. ئەو خۆی پارەکەی ژمارد و دایە لوستیگ.

کاپۆن وتی "باشە، کۆست هەروەک وتت، دووقات زیادی مەکە، بەڵام لەماوەی شەست ڕۆژدا" لوستیگ پارەکەی برد و ڕۆیشت، خستیە ناو سندوقێکی ئەمانات لە شیکاگۆ، پاشان چووە نیویۆرک کە لەوێ چەند پیلانێکی تری پارەی لەگەڵدا بوون.

، ٥ دۆلارەکە لە سندوقی بانکدا بە دەست لێنەدراوی مایەوە. لوستیگ هیچ تەقەلایەکی نەخستەگەڕ بۆ دووقاتکردنی. دوو مانگ دواتر گەڕایەوە بۆ شیکاگۆ، پارەی سندوقەکەی برد و سەردانێکی تری کاپۆنی کرد. ئەو ڕوانییە دەم و چاوی ترش و تاڵی پاسەوانەکان، بزەیەکی بۆرش ئامێزی کرد و وتی "تکایە بەشیمانیی قووڵی من قبوڵ بفەرموو بەڕێز کاپۆن. داوای لێبووردن دەکەم کە دەڵێم پلانەکە شکستی هێنا... من شکستم هێنا".

کاپۆن بەهێواشی وەستایە سەر پێ. سەرنجێکی تووڕەی گرتە لوستیگ، مشتومڕی لەسەر ئەوە کرد کە فڕێی بداتە کام بەشەی ڕووبار. بەڵام کۆنت دەستی بۆ باخەڵی برد و ٠ ٥ دۆلارەکەی دەرهێنا و لەسەر مێزەکە دایینا. وتی "هانێ بەڕێز، ئەمە پارەکەتە، وەک خۆی. جارێکی تر داوای لێبووردن دەکەم. ئەمە زۆر مایەی شەرمەزارییە. شتەکان بەو شێوەیە بەڕێوە نەچوون کە بیرم لێدەکردەوە. حەزم دەکرد پارەکەت دووقات زیاد بکەم بۆ خۆم و بۆ تۆش -- خوا ئاگادارە پێویستم پێیەتی -- بەڵام ئیتر پلانەکە سەری نەگرت.

کاپۆن لەسەر کورسییەکەی دانیشتەوە، سەرگەردان بوو، وتی "دەزانم تۆ ساختەچیت، کۆنت. هەر ئەو کاتەی هاتییە ئێرە من چاوەڕێی سەد هەزار دۆلار یان هیچم نەدەکرد. بەڵام ئەمە، گەڕاندنەوەی پارەکەم... باشە" لەگەڵ هەڵگرتنی کڵاوەکەی و هەنگاو هەنگاو ڕۆیشتنە دەرەوەی، لوستیگ وتی "جارێکی تر داوای لێبووردن دەکەم بەڕێز کاپۆن" کاپۆن هاواری کرد "ئەی خوایە! تو ڕاستگۆیت. ئەگەر تۆ بەلەنە، هانێ ئەو پێنجە بۆیارمەتیدانت" ئەو پێنج هەزار دۆلاری لە پەنجا هەزار دۆلارەکە جیا کردەوە. کۆنت سەرسام دیار بوو، وەکو ڕێزبواندن چەمایەوە، سوپاسی کرد و بە پارەکەوە ڕۆیشت.

٥,٠٠ دۆلارەکە ئەو شتە بوو کە لوستیگ بەدرێژایی ئەو ماوەیە بەدوایەوە بوو.

**لێکدانەوە**

کۆنت ڤیکتۆر لوستیگ، پیاوێک کە بە چەند زمانێک قسەی دەکرد و شارەزای بە لیاتووس و کەلتوورییەوە دەکرد، یەکێک بوو گەورەترین ساختەچییەکانی سەردەمی مۆدێرن. ئەو بە جورئەتەکەی، نەترسانی و لەهەمووی گرنگتر ماریفەتی لەمەڕ سایکۆلۆژیای مرۆڤ ناسرابوو. ئەو دەیتوانی بە چەند جوڵەکێک هەڵسەنگێنێت، خاڵە لاوازەکەی بدۆزێتەوە و لەبەرامبەر ساویلکەکاندا وەکو ڕادار وابوو. لوستیگ دەیزانی زۆربەی پیاوان قەڵغانێکی بەرگری لەبەرامبەر کلاوچی و سەربەگوێنەکان بونیاد دەنێن کاری ساختەچی ئەوەیە ئەو قەڵغانانە دابماڵێت.

ڕێگەیەکی دڵنیا بۆ کردنی ئەمە، لە ڕێگەی کرداری بەڕواڵەت ڕاستگۆیانە و سەرڕاستانەیە. کێ گومان لە کەسێک دەکات کە دەقاودەق کردارێکی ڕاستگۆیانە دەخاتەڕوو؟ لوستیگ چەند جارێک ڕاستگۆیی هەڵبژاردەیی بەکارهێنا، بەڵام لەگەڵ کاپۆندا هەنگاوێک بەرەو پێشتر چوو. هیچ کەسێکی ئاسایی جورئەتی ئەڵەکەیەکی وەهای نەدەکرد. ئەو ساویلکەکانی خۆی لەبەر هاکیبوونی خۆیان هەڵدەبژارد، بۆ ئەو ڕواڵەتەیان کە دەیگوت دەرمانەکەت دەخوێنەوە بەبێ ئەوەی سکاڵا بکەیت. فێڵی کاپۆنت بچڕیایە ئەوا ژیست (جا هەرچەندێکی لێ مابەوە) بە ترسەوە بەسەر دەبرد. بەڵام لوستیگ تێگەیشت لەوەی کە پیاوێکی وەکو کاپۆن بە گومان لەوانیتر بەسەر دەبات، هیچ کەس لەوانەی دەوروبەری ڕاستگۆ یان بەخشندە نەبوون و هاوەڵێتیکردنی ڕۆژی گورگەکان تاقەتپڕوکێنە و تەنانەت خەمناکیشە. پیاوێکی وەکو کاپۆن ئامەرۆزی ئەوەیە کە وەرگری ئامازەیەکی ڕاستگۆیی یان بەخشندەیی بێت، هەست بەوە بکات کە هەمووان حەریکی فێڵبازی و هەڵگری مەبەستی خراپ نین.

کرداری بژاردەییانەی ڕاستگۆیی، کاپۆنی دەستەوستان کرد چونکە زۆر چاوەڕوانەکراو بوو. ساختەچییەکان کەیفی بە هەستی ناکۆکی لەمشێوەیە دێت، چونکە ئەو کەسەی دەکەوێتە ناو ئەو هەستانەوە بە ئاسانی هۆشی پەرت دەبێت و فریو دەخوات

*هەموو شتێك حزڵ‌مێتیشی هەڵدەگەڕێت کاتێك لای کەم بیشانەیەکم لە ئاسۆدا نییە. ئەو کاتە بەتاڵ و هەمساك دەبارە، من ئاموواتم لە بیاراتی راستگۆ نییەکەم. ئەوان زیانکی ماتۆمێنیبەخش بەسەردەبەن، پڕ لە بێزاری.*

کورت ئیکتور لومسنیک، ١٨٩٠-١٩٤٧

## کلیلی دەسەڵات

حەوەفەری فریودان هۆش پەرتکردنە. هۆش پەرتکردنی ئەو خەڵکەی تۆ دەتەوێ فریوی بدەیت کات و شوێنت دەداتێ تا شتێك بکەیت کە ئەوان تێبینی ناکەن. کردارێکی بەرەبی، بەخشندەیی یان راستگۆیی زۆرجار بەهێزترین فۆرمی هۆش پەرتکردنە چونکە ئەمەگومانەکانی خەڵکی تر دامێنێت. ئەمە دەیانگۆڕێت بۆ منداڵ، تامەزرۆیانە هەر جۆرە ئامۆژەیەکی بەسۆز وەدەگرن.

لە چینی کۆندا ئەمە پێی دەوترا "بەخشین بەر لە وەرگرتن" – بەخشین بۆ کەسەکەی تری فورس دەکات تێبینی وەرگرتن نەکات. ئەمە ئامرازێکە بە بەکارهێنانی کرداریی ناکۆتایە. ئەگەر بەشێوەیەکی چەقاوەسوولە شتێك لە کەسێك وەرگریت مەترسیدارە، تەنانەت بۆ کەسی دەسەڵاتداریش. قوربانییەکە پیلانی تۆڵەسەندنەوە دادەڕێژێت. بەهەمان شێوە مەترسیدارە داوای ئەو شتە بکەیت کە پێویستمانە، گرنگ نییە چەنێك مۆنەدەمانەش بێت. ئەگەر کەسەکەی تر دەستکەوت بۆ خۆی نەبینێت، ئەوا لەوانەیە رقی لە دەستکورتی تۆ ببێتەوە. فێر بە بدەیت پێش ئەوەی وەرگریت. ئەمە رەمیە حوش دەکات، لە داراکارییەکی ئاسەدە کەم دەکاتەوە، یان تەنیا هۆش پەرت بوونێك دروست دەکات. بەخشینیش زۆر شێوە دەگرێتە خۆ: دیارییەکی واقیعی، چاکەیەکی پڕ بەرەبی، پێزانینێکی "راستگۆیانە"

راستگۆیی سووردار لە یەکەمین رووبەڕووبوونەوەتدا لەگەڵ کەسێك باشترین شێوە دەکار دەکرێت. ئێمە هەموومان ریسدەرەی خۆ و پاهاتین و یەکەمین بۆچوونمان ماوەیەکی درێژ دەخایەنێت. ئەگەر لەسەرەتای پەیوەندییەکەتەوە کەسێك باوەڕی وابێت

تۆ ڕاستگۆیت زۆر دەوری تا پێچەوانەکەی قەناعەت پێ بسەلمێنیت. ئەمە بواری مانۆڕکردنت پێ دەدات.

جەی گۆد وەکو ئال کاپۆن پیاوێك بوو لەبەرامبەر هەمووان بەدگومان بوو. بەهەشتی ئەو کاتەی کە تەمەنی سی و سێ ساڵان بوو، هەروەکو مەلێن ملیۆنێر بوو، بەتایبەتیش لە ڕێگەی فریودان و زۆردارییەوە. لە دەیەکانی ١٨٦٠ەکاندا، گۆد پارەیەکی زۆری لە کۆمپانیای (ئیری ڕەیلرۆد)دا وەبەرهێنا، پاشان بۆی دەرکەوت کە بازاڕ کەوتۆتە بەر لێشاوی بڕێکی زۆری بڕوانامەی پشکی ساختە بۆ کۆمپانیاکە. ئەو سامانێکی زۆری لەدەستدا و تووشی شەرمەزارییەکی زۆر بوو.

لە گەرمەی ئەم قەیرانەدا، پیاوێك بەناوی لۆرد جۆن گۆردن-گۆردن پێشنیاری یارمەتیدانی کرد. گۆردن-گۆردن کە لۆردێکی سکۆتلەندی بوو، بە پوولەت سامانێکی بچووکی لە سکەی شەمەندەفەردا سەرمایەگوزاری کردبوو.

بە یەکگرتنی هەندێ شارەزای دەستنووس گۆردن گۆردن توانی بۆ گۆدی بسەلمێنێت ئەوانەی بەرپرس بوون لە بڕوانامە ساختەکانی پشك لە ڕاستیدا ژمارەیەك جێبەجێکاری خودی کۆمپانیای (ئیری ڕەیلرۆد) بوون. گۆد سوپاسگوزار بوو. پاشان گۆردن گۆردن پێشنیاری ئەوەی کرد کە ئەم و گۆد بچنە ناو هێزێکەوە بۆ کڕینەوەی سوودی زۆر لە کۆمپانیاکەدا. گۆد ڕازی بوو. بۆ ماوەیەك پێدەچوو پڕۆژەکە گەشە بکات. دوو پیاوەکە ئێستا هاوڕێی باش بوون و هەر کاتێك گۆردن گۆردن دەهاتە لای گۆد و داوای پارەی دەکرد بۆ کڕینی پشکی زیاتر، گۆد پێی دەدا. لە ١٨٧٣دا، گۆردن گۆردن لەپڕێکدا، هەموو پشکەکەی وێڵ کرد و سامانێکی پێکەوە نا، بەڵام بەشێوەیەکی بەرچاو بەهای پشکەکانی گۆدی کەم کردەوە. پاشان لەبەرچاوان نەما.

پاش لێکۆڵینەوە، گۆد بۆی دەرکەوت کە ناوی ڕاستەقینەی گۆردن گۆردن (جۆن کراوبیسفیلد)ە و ئەو کوڕی مێژووی بازرگانێکی دەریایی و کارگوزاری بازرگانی لەندەنە. پێش ئەو کاتە سەرەداوی زۆر هەبوون لەمەڕ ئەوەی کە گۆردن گۆردن ساختەچییە،

بەڵام کرداری ڕاستگۆیی و پشتگیری سەرەتایی ئەو وەها کاریگەرایی دامسایە کرد کە ملیۆنان دۆلاری زەرەر لێکەوت تا دەرکی بە پیلانەکە کرد

ناکە کردەیێکی ڕاستگۆیی زۆرجار بەس نییە ئەوەی کە پێویستە ناوبانگە بۆ ڕاستگۆیی، کە لەسەر زنجیرەیەک کردار بونیاد دەنرێت- بەڵام دەشێ ئەمانە تەواو بن کەڵک بن هەر کە ناوبانگ بونیاد نرا، هەروەک لە حاڵەتی تێچوونە سەرەتاییەکان- بەبیوچوونی قورسە

لە چینی کۆندا، دیوک (وو)ی چینگ بڕیاریدا کە کاتی کۆنترۆلکردنی مەملەکەتی (هو) هاتووە کە پەیتا پەیتا بەهێزتر دەبوو، بەبێ ئەوەی بە کەس بڵێت، کچەکەی لە فەرمانڕەوای (هو) مارە برێ. پاشان داوای کۆبوونەوەی ئەنجومەنی کرد و لە وەزیرەکانی پرسی "من بیر لە هەڵمەتێکی سەربازی دەکەمەوە. کام وڵاتە داگیر بکەین؟" هەروەک پێشبینی کردبوو، یەکێک لە وەزیرەکانی وتی "دەبی (هو) داگیر بکرێت" دوک تووڕە دیار بوو و وتی "هو ئێستا دەوڵەتێکی دەستەخوشکە بۆچی پێشنیاری داگیرکردنی دەکەیت؟" ئەو فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ ئەو وەزیرە دەرکرد بەبەرسەر چەقۆوەسوورییەکەیدا. فەرمانڕەوای (هو) گوێبیستی ئەمە بووەوە و بە لەبەرچاوگرتنی نیشانەی تری ڕاستگۆیی (وو) و هاوسەرگیریی لەگەڵ کچەکەیدا، هیچ وریاییەکی بۆ بەرگریکردن لەخۆی لەبەرامبەر چینگ وەرنەگرت. چەند هەفتەیەک دواتر، هێزەکانی چینگ (هو)یان پەلامار دا و وڵاتەکەیان گرت و قەت دەستبەرداری نەبوو

سەرڕاستی یەکێکە لە باشترین ڕێگاکانی دەستەوستان کردنی کەسی بەحەرەر، بەڵام ئەکە ڕێگە نییە. هەر جۆرە کردارێکی بەرپرانەی بە ڕواڵەت خۆنەویستانە بەکەڵکە. بەوانەیە باشترینی ئەمانە نریتی سب لە بەخشندەیی. خەڵکێکی کەم دەتوانن بەرامبەر دیارییەکدا بەرەنگاری بکەن، تەنانەت دیارییەک لە سەرسەختترین دوژمنەوە کە هەر بۆیە زۆرجار ڕێگەیەکی نایابیشە بۆ دەستەوستانکردنی خەڵک. دیاری منداڵی ناو دەحمان دینیتە دەرەوە و دەستبەجێ دیواری بەرگریمان لادەبات. هەرچەندە ئێمە زۆرجار لە بەر ڕۆشنایی گومان ناسیردا کردارەکانی خەڵکی تر دەبینین، بە دەگمەن بڕگەی بەکاقسانەی

بەری دەممی کە زۆرجار پاڵنەرە نهێنییەکان دەشارنەوە دیاری کەرەستەیەکی بەرفشکە بۆ شاردنەوەی جوڵەیەکی فریودەرانە

بەدرێژایی سێ هەزار ساڵی پێشوو، یۆنانییە کۆنەکان بە سەرلەسەری دەریادا گەشتیان کردووە بۆ گرتنەوەی (هێلین)ی جوان، کە لەلایەن پاریسەوە لێیان سەندرا و بۆ پووچاندنی شاری پاریس، (ترۆی) گەمارۆکە دە ساڵی خایاند، زۆر پاڵەوان مردن لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کام لەلایەن لە سەرکەوتن نزیک نەبووەوە. ڕۆژێکیان، پەیامبەر (کلاچاس) یۆنانییەکانی کۆ کردەوە

پەیامی وت "وار لە تەنگدانی ئەم دیوارانە بێن! دەبێ ڕێگەیەک، تەڵەکەیەک بدۆزینەوە ئێمە ناتوانین بە زۆر (ترۆی) بگرین. ئێمە دەبێ ستراتیژێکی زیرەکانە بەکار بێنین". پاشان ڕێبەری زیرەکی یۆنانی (ئۆدیسەس) بیرۆکەیەکی بونیادنانی ئەسپێکی تەختەی زەبەلاحی بۆ هات، سەربازان لەناوێدا خۆیان شاردبۆوە. پاشان وەکو دیارییەک پێشکەشی ترۆجانەکانی کرد (نیۆپتۆلیمەس)ی کوڕی ئەکیلیس قیزی لەم بیرۆکەیە بووەوە، ئەمە ناپیاوانە بوو. باشتر بوو هەزاران کەس لە شەڕگەدا بمرن نەک لە ڕێگەی فریودانەوە سەرکەوتن بەدەست بێنن. بەڵام کاتێک سەربازەکان ڕووبەڕووی بژاردەیەک بوونەوە لەنێوان دە ساڵی تری پیاوەتی، شەرەف و مەرگ لەلایەکەوە و سەرکەوتنی خێرا لەلایەکی ترەوە، ئەوا ئەسپەکەیان هەڵبژارد، کە دەستبەجێ دروستکرا. فێڵەکە سەرکەوتوو بوو و (ترۆی) شکستی هێنا. دیارییەک بۆ خوری یۆنانییەکان زۆر زیاتری بە بەرەوە بوو لەچاو دە ساڵی شەڕکردن.

ڕێنە، ئەسپی ترۆجان، ریوەکیی تۆ لەناو دیارییەکی نایابدا شاراوەتەوە کە نەیارەکەت ناتوانێ قبوڵی نەکات. دیوارەکان ناوەڵا، هەر کە چوو بنە ناوەوە، پەلامار بدە.

دەبێ بەزەیی سەرووردار یان بژاردەییش بەشێک بێت لە تەقەمەنی تۆ بۆ لە خشتەبردن بۆ ماوەی ساڵانێک ڕۆمە کۆنەکان شاری (فالیسکانس)یان گەمارۆ دابوو، هەمیشەش بە ناسەرکەوتوویی. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕۆژێکیان کاتێک (کامیلیوس)ی جەنەراڵی ڕۆمانی لە دەرەوەی شارەکە گەمارۆ درا، لەپڕێکدا پیاوێکی بینی بنش چەند منداڵێک کەوتوو بەرەو

ڕووی دەهاتن. پیاوەکە مامۆستایەکی فالیسکان بوو و دەرکەوت منداڵەکان کوڕان و کچانی خانەدانترین و دەوڵەمەندترین هاوڵاتیانی شارەکەن. بە بیانووی بردنە پیاسەی ئەو منداڵانە، ڕێک بەرەو لای ڕۆمانەکان بردبوونی، وەکو بارمتە پێشکەشیانی کردبوو بە هیوایی ڕازیکردنی کامیلوس، دوژمنی شارەکە.

کامیلوس منداڵەکانی بە بارمتە نەگرت. ئەو جلی لە مامۆستاکە داماڵی، دەستەکانی بە پشتەوە بەستەوە، تێلایەکی دایە هەر منداڵێک لە منداڵەکان و ڕێگەیدا لە ڕێگەی گەڕانەوەیاندا بەرەو شار هەر لێیبدەن و لێیبدەن. ئاماژەکە، کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی لەسەر فالیسکانەکان هەبوو. ئەگەر کامیلوس منداڵەکانی وەکو بارمتە بەکار بهێنایە، هەندێ کەس لە شارەکە دەنگیان بۆ ملکەچبوون دەدا. تەنانەت ئەگەر فالیسکانەکان سووربوونایە لە شەڕیش، بەرەنگارییان ئابەدڵانە دەبوو. ڕەتکردنەوەی کامیلوس لە قوستنەوەی بارودۆخەکە، بووەهۆی شکانی بەرەنگاریی فالیسکانەکان و ئەوان ملکەچ بوون. ژەنەراڵەکە هەڵاندنەکەی دروست بوو. لە هەر حاڵەتێکیشدا هیچی نەبوو لەدەستی بدات. ئەو دەیزانی پیلانی بارمتە کۆتایی بە جەنگ نەدەهێنا، لانی کەم ڕاستەوخۆ کۆتایی پێنەدەهێنا. بە وەرچەرخاندنی بارودۆخەکە، ئەو متمانە و ڕێزی دوژمنەکەی بەدەستهێنا، دەستەوەستانی کرد. بەرەیی سوودەدار زۆرجار تەنانەت کەڵەڕەقترین دوژمن دەڕەمێنێت؛ بەستانەگرتنی دڵ، ئیرادەی شەڕکردنەوە دەشکێنێت.

بیرت بێت: بە پاریزکردن بە هەستەکانی خەڵک، کردارە مەرەبەدەکرەوەکانی بەرەیی دەتوانی کاپۆیێک بکەن بە منداڵێکی دەستەمۆ. هەروەک لە هەر حاڵەتێکی ڕێککەوتنەوەی هەستیانەدا، دەبێ تەکتیکەکە بە وریاییەوە پیادە بکرێت. ئەگەر خەڵکی پێی بزانن، هەستە ناوەبەندەکانی سوپاسگوزاری و گەرم و گوڕییان دەبنە توندوتیژترین کینە و بەدگومانی. ئەگەر تۆ نەتتوانیت ئاماژەکە سەرڕاستانە و لە دڵەوە پیشان بدەیت، یاری بە ئاگر مەکە.

دەسەڵات: کاتێک دوک (هسیەن)ی چین لەسەرووبەندی بەلاماردای (یو)دا بوو، پۆلیک ئەسپی پێشکەش کردن. کاتێک ئیرلی (جیە) دیاریی هەڵگرتنە سەر (چۆ-یو)ی هەبوو،

هەرەباەی گەورەی پێ بەخشیی. لیرەوە وتەکە دەڵێت "کاتێک تۆ هەڕێکی سناندیی، دەمی مەبێت"

(هان – فەی – تزو، فەیلەسوفی چینی، سەدەی سێیەمی پێش زایین).

## پێچەوانەبوونەوە

کاتێک تۆ مێژوویەکی دریودان لە پشتتە، هیچ ئاستێکی ڕاستگۆیی، بەخشندەیی یان بەرەیی ناتەواوبێت. هەر کە خەڵکی تۆیان وەکو دریودەر بۆ دەرکەوت ڕەفتارکردنی ڕاستگۆیانەی لەناکاو جێی گومانە. لەم حاڵەتانەدا وا باشترە ناسەرڕاستانە ڕەفتار بکەیت.

کاوست لوستیگ، جارێکیان گەورەترین ساختەچێتی ژیانی ئەنجامدا، هەرێک بوو بوورجی ئیڤل بفرۆشێت بە مامەڵەکارێکی پیشەسازیی بێ ئاگا کە بڕوای وابوو حکومەت دەیخاتە مورایەدەوە بۆ ئاسەواڵەی سکراپ. مامەڵەکارەکە ئامادە بوو بۆ ڕادەستکردنی بڕێکی زۆری پارە بە لوستیگ کە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە خۆی وەکو کارمەندێکی حکومەت ناساندبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لەدوایین ساتدا ئامانجەکە گوماناوی بوو. شتێک لەبارەی لوستیگەوە هەراسانی کرد. لەو دیدارەی تیایدا ئەو هەڕێکی ڕادەستکردنی پارەکە بوو، لوستیگ هەستی بە بەدگومانی لەناکاوی ئەو کرد.

لوستیگ سەری بردە بن گوێچکەی مامەڵەکارەکە و بە دەنگێکی نرم بۆی ڕوونکردەوە کە موچەکەی چەن بووە، دارایییەکەی چەنێک خراپ بووە و هیتر. پاش چەند خولەکێک، مامەڵەکارەکە بۆی دەرکەوت کە لوستیگ داوای بەرتیل دەکات. بۆ یەکەمین جار هەستی بە سوکنایی کرد. ئیستا دەیزانی کە دەتوانێت متمانە بە لوستیگ بکات. لەبەرئەوەی هەموو کاربەدەستانی حکومەت ناسەرڕاست بوون، دەبووایە لوستیگ واقیعی بێت. پیاوەکە پێی دایە پارەکە. بە ڕەفتارکردنی بەشێوەیەکی ناسەرڕاستانە، لوستیگ واقیعی دیار بوو. لەم حاڵەتەدا ڕاستگۆیی نزاردەیی کاریگەریی پێچەوانەی دەبوو

لەکاتێکدا کە دیپلۆماتی فەرەنسی تالیراند بەتەمەندا دەچوو، ناوبانگی وەکو درۆزن و فریودەر بڵاو ببۆوە لە کۆنگرەی فییەنا (١٨١٤–١٨١٥)، ئەو چیرۆکی نایابی هەڵدەبەست و تێبینی نامومکینی دەخستەڕووی ئەو خەڵکەی کە دەیانزانی دەبێ ئەم کابرایە درۆ بکات. ناڕاستگۆییەکەی ئەو هیچ مەبەستێکی تیا نەبوو جگە لە داپۆشینی ئەو ساتەوەختانەی کە تیایدا ئەو بە ڕاستی ئەوانی فریود دەدا. ڕۆژێکیان، بۆ نموونە، لەنێو هاوڕێیاندا، تالیراند بە ڕووکارێکی سەرڕاستانەوە وتی "لە بریسدا مرۆڤ دەبێت دەستی پیشان بدات" کەس باوەڕی بە گوێچکەکانی خۆی نەکرد. کەسێک کە جارێک لە جاران لە ژیانیدا قەت کارتەکانی پیشان نەدابوو بە خەڵکی تری دەوت کارتەکانی خۆتان پیشان بدەن. تاکتیکی لەو جۆرە ئەستەمی دەکرد فریودانە ڕاستەقینەکانی تالیراند لە ساختەکانی جیا بکەنەوە. بە گرتنەخۆی ناوبانگی بۆ نامەڕاستی، توانای بۆ فریودان پاراست.

هیچ شتێک لە پاشایی دەسەڵاتدا نەگۆڕ نییە. فریودانی بەئاشکرا هەندێ جار شوێن پێیەکانی تۆ دادەپۆشێت، تەنانەت وات لێدەکات بۆ ڕاستگۆیی نەمر ناڕاستگۆییەکەت، کەسێکی پەسەند بێت

## فرانسیسکو بۆری شەڕلاتی دەرباری

فرانسیسکو گوسێپ بۆری ی خەڵکی میلان، کە لە ١٦٩٥دا مرد پێشەنگی ئەو جۆرە تایبەتەی سەرکێشیی شەرلاتانە بوو، وەکو دەرباری یان "جێنتڵمانی دەربار" خۆی دەنواند. ماوەی شکۆمەندییەکەی پاش گواستنەوە بۆ ئەمستەردام دەستپێکرد. لەوێ نازناوی (پزیشکی گەردوونی)ی لەخۆنا، گروپێکی گەورەی یاریدەدەری دانا و سواری عەرەبانەیەکی شەش ئەسپی دەبوو. نەخۆشەکان بە لێشاو بە پیریەوە دەچوون و هەندێ لە کەم ئەندامەکان خۆیان گەیاندووە ناو ئەو کورسیانەی چەند کەسێک هەڵیاندەگرت هەر لە پاریسەوە تا شوێنەکەی لە ئەمستەردام بۆری، هیچ کرێیەکی بۆ ڕاوێژەکانی وەرنەدەگرت. ئەو بڕە پارەی بۆری بەسەر هەژاراندا دابەش دەکرد و قەت

بەڕابوو کە هیچ پارەیەک وەرگریت لەکاتێکدا کە بەردەوام بوو لە ژیان بە سەرسەرییەکی وەها، لەگەڵ ئەوەشدا، وا دادەنرا ئەو بەردی فەیلەسوفی ببێت لەبڕێکدا ئەم خێرخواز و بەخشندەیە لە ئەمستەردام ون بوو پاشان دەرکەوت ئەو پارە و ئەڵماسەی بردووە کە بە ئەمانەت لای دانرابوو

هێنری شارلاتی، گریت دی فرانسیسکۆ، ١٩٣٩

## یاسای ژمارە ١٣

# کاتێک داوای یارمەتی لە خەڵک دەکەیت، لە ڕوانگەی بەرژەوەندیی خۆیان ئەمە بکە، قەت لە ڕوانگەی بەزەیی هاتنەوە یان چاکە داوایان لێ مەکە

### حوکم

ئەگەر تۆ پێویستت بەوەیە ڕوو بکەیتە هاوپەیمانێک بۆ یارمەتی، خۆت ماندوو مەکە بەوەی بیری بێنیتەوە لە ڕابردوودا چەندێک یارمەتیت داوە و چاکەت لەگەڵ کردووە. ئەو ڕێگەیەک دەدۆزێتەوە بۆ فەرامۆشکردنت. لەبری ئەمە، شتێک لەداواکەتدا یان لە هاوپەیمانیتدا لەگەڵ ئەو بخەرە ڕوو کە کەڵکی بۆ ئەو هەیە و بە بەراورد بە داواکەت زیاتر جەختی لێ بکەوە. ئەو بەشێوەیەکی تامەزرۆیانە وەڵامگۆ دەبێت کاتێک دەبینێ شتێک بۆ ئەو تێدایە

### سەرپێچی لە یاساکە

لە سەرەتای سەدەی چواردەدا، پیاوێکی گەنج بەناوی (کاستروچیۆ کاستراکانی) لە سەربازێکی ئاساییەوە پلەی بەرز بۆوە و بووە لۆردی شاری گەورەی لوکا، ئیتاڵیا. یەکێک بەهێزترین خێزانەکان لە شاردا، (پۆگیۆ)کان، ڕۆڵی سەرەکیان هەبوو لە بەرزبوونەوەی

ئەودا (کە لە ڕێگەی دڕپاکی و خوێنڕشتن مەیسەر بوو)، بەڵام پاش ئەوەی دەسەڵاتی گرتە دەست، ئەوەی ئەو هەستەیان لا پەیدا بوو کە کاستروجیو ئەمانی بیر چۆتەوە قورسایی شوحەکەی ئەو لە هەر سوپاسگوزارییەکی زیاتر بوو کە هەستی پیکرد لە ١٣٢٥دا، لەکاتێکدا کە کاستروجیو لە شوێنێکی دوور لە شەڕدابوو لەگەڵ ڕکابەری سەرەکی لوکا، فلۆرێنس، پۆگیۆکان لەگەڵ حیزبە حەسەدانەکانی تر لە شار گەلەکۆمەیان کرد بۆ خۆ قوتارکردن لەم میرە سەربەگۆیەن و چاوچنۆکە

بە هەڵپەسادنی باجبگەرییەک، پیلانگێڕیی هێنێشیان کردە سەر ئەو حاکمەی کارتوجیو لە پاش خۆی دایابوو تا حوکمی شارەکە بکات و کوشتیان ئاژاوە هەڵیسا و پشتیوانانی کاستروجیو و پشتیوانانی پۆگیۆ کەوتنە شەڕ، لەگەڵ ئەوەشدا، بە نزیکی تەنگژەکەدا ستیفانۆ دی پۆگیۆ، بەتەمەنترین ئەندامی خانەوادەکە، دەستوەردانی کرد و وەهای لە هەردوو لا کرد چەکەکانیان دابنێن

ستێفانۆ کە پیاوێکی ئاشتیخواز بوو لە پیلانگێڕییەکەدا بەشداری نەکردبوو ئەو بە خانەوادەکەی وتبوو کە ئەمە بە خوێنڕێژییەکەی بێ ئاکام کۆتایی دێت ئێستا ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی دەبێ ئەم بە لەبری خانەوادەکە بێتە ناوەوە و کاستروجیۆ پاری بکات تا گوێ لە سکاڵاکانیان بگرێت و وەڵامگۆی داواکانیان بێت ستیفانۆ بەتەمەنترین و ژیرترین ئەندامی هۆزەکە بوو و خانەوادەکەی پاری بوون لەسەر ئەوەی متمانە با دیپلۆماسییەکەی بکەن نەک بە چەکەکانیان

کاتێک هەواڵی پەیگەری گەیشتە کاستروجیو، ئەو بەپەلە گەڕایەوە لوکا لەگەڵ ئەوەشدا، بەهاتنی کاتی گەیشتنەوەی، لە ڕێگەی ستیفانۆوە شەڕ وەستابوو و ئەو لەسەرانسەر هێمنی و ئارامی شاردا نووشی سەرسوڕمان بوو سیتفانۆ دی پۆگیۆ وێنەی ئەوەی کردبوو کە کاستروجیو سوپاسی دەکات لەبەرامبەر بەشدارییەکەی لە دامرکاندنەوەی پاچبگەرییەکەدا، بۆیە سەردانێکی میری کرد ئەو وتی پاچیبووەکان لە خانەوادەکەیدا گەنج و هەڵەشەن، تینووی دەسەڵاتن لەگەڵ ئەوەشدا بێ ئەزموون ئەو بەخشندەیی پاریدووی هێنایەوە یاد کاستروجیو ئەو وتی، لەبەر هەموو ئەم هۆکارانە

میری گەورە دەبێ لە پۆگیۆکان خۆش بێت و گوێ لە سکاڵاکانیان بگرێت. وتی ئەمە تاکە شتێ دادپەروەرانەیە بکرێت، چونکە خانەوادەکە بەشێوەیەکی نادەروومەندانە چەکەکانیان داوە و هەمیشە پشتوانی ئەو بوون.

کاستروخیۆ بە ئۆقرەوە گوێی گرت. پێدەچوو ئەو ئۆرگالینکیش گوێ بگرێت بان تورە بێت و کینەی هەبێت. لەبری ئەمە، ئەو بە ستێفانۆی وت دڵنیا بێت لەوەی دادپەروەری زاڵ دەبێت و داوای لێکرد تەواوی خانەوادەکەی بێنێتە کۆشک تا قسە لەسەر خەم و نارەحەتییەکانیان بکەن و بگەنە رێککەوتنێک. لەکاتێکدا کە ئەوان ئیزنیان لە یەکتری خواست، کاستروخیۆ وتی ئەم سوپاسی خوا دەکات بۆ ئەو دەرفەتەی پێی درا تا بەرەیی و هاوسۆزی خۆی پیشان بدات. ئەو ئێوارەیە سەراپای خانەوادەی پۆگیۆ هاتنە کۆشک. کاستروخیۆ دەستبەجێ هەمووانی بەگرتدا و چەند رۆژێک دواتر هەموویان تیرباران کران، بە ستێفانۆشەوە.

## لێکدانەوە

ستێفانۆ دی پۆگیۆ بەمری هەموو ئەو کەسانەیە کە بڕوایان وایە دادپەروەری و پیرۆزی نۆرەکەیان زاڵ دەبێت، بەدڵنیاییەوە لە رابردوودا داواکانی دادپەروەری و سوپاسگوزاری ناوبەناو سەرکەوتوو بوون، بەڵام زۆر جار لێکەوتەی کارەساتباریان هەبووە، بەتایبەت لە مامەڵەکردن لەگەڵ کاستروخیۆکانی جیهاندا. ستێفانۆ دەیزانی میر لەرێگەی ناپاکی و دڵڕەقییەوە گەیشتۆتە دەسەڵات. دواجار ئەمە پیاوێک بوو کە هاوڕێیەکی نزیک و دڵسۆزی رووبەڕووی مەرگ کردبۆوە. کاتێک کاستروخیۆ پێی وتر کە هەڵەیەکی کارەساتباری کردووە بەوەی هاوڕێیەکی وەها کۆنی کوشتووە، لە وەڵامدا وتبووی ئەم دوژمنێکی نوێی کوشتووە نەک هاوڕێیەکی کۆن.

پیاوێکی وەکو کاستروخیۆ تەنها هێز و بەرژەوەندیی خۆیی دەزانی. کاتێک یاخیگەری دەستپێنکرد، بۆ کۆتاییهێنان و دانانی خۆی لە بەرەییەکەیدا، بەترسیدارترین هەنگاو دەنا. تەنانەت خاوەنکان ستێفانۆ دی پۆگیۆ ئەو هەڵە کوشندەیەی کردبوو، بەگەڵ

ئەوەشدا، ئەو هەشتا مزاردەی لەبەردەمدا بووی. ئەو دەیتوانی پارە پێشکەشی کاستروجیۆ بکات، دەیتوانی چەند بەڵێنێک بۆ ئاییندە بداتە بەردەمی، دەیتوانی پووی بکاتەوە کە پزگیۆکان هێشتا دەتوانن کاریگەرییان بۆ دەسەڵاتەکەی ئەو هەبێت، بۆ نموونە کاریگەرییان لەسەر دیارترین خانەوادەکانی پۆم و ئەو هاوسەرگیریانەی کە دەیانتوانی ئەنجامی بدەن.

لەبری ئەمە، ستێفانۆ ڕابردوو و ئەو قەرزانەی هێنایەوە یاد کە هیچ ئەرک و بەرپرسیارێتییەکی بەدەستەوە سەرشانی مرۆڤ نەبوو. تەنیا ناچار نییە سوپاسگوزار بێت، سوپاسگوزاری ئەوجار بارێکی قورسە کە ئەو بە خۆشحاڵییەوە کۆتایی پێهێنا. لەم حاڵەتەشدا کاستروجیۆ خۆی لە بەرپرسیارێتییەکانی بەرامبەر پزگیۆکان قوتار کرد بە ڕێگەی بیرکردنیان.

### پەیڕەوی لە یاساکە

لە ٤٣٣ی پێش زایینەدا، ڕێک پێش جەنگی پێلۆپۆنیزی، دوورگەی کۆرسیرا (دواتر ناوی کۆرفو) و دەوڵەتشاری کۆرینس کەوتنە سەر لێواری ململانێ. هەردوو لایەن بالیۆزیان ناردە ئەسینا بۆ هەوڵدان بۆ ڕاکێشانی ئەسینایییەکان تا ببنە لایەنگریان. مەترسییەکان گەورە بوون، چونکە هەرکەسێک ئەسینایییەکانی بەدەست بهێنایا، بە دڵنیاییەوە جەنگەکەی دەبردەوە. هەرکەسێکیش جەنگی ببردیەتەوە ئەوا بە دڵنیاییەوە نەرمیی بە لایەنی بەرانبەردا نەدەنواندەوە.

یەکەم جار کۆرسیرا قسەی کرد. بالیۆزەکەی بەوە دەستیپێکرد کە وتی پێشتر دوورگەکە قەت یارمەتیدەر نەبووە و لە ڕاستیدا خۆی لەگەڵ دوژمنانی ئەسینادا یەکخستووە. هیچ پەیوەندییەکی هاوپەیمانێتی یان سوپاسگوزاری لەنێوان کۆرسیرا و ئەسینایییەکان نەبوو. بەڵێ، بالیۆز دانی پێدانا، ئەو ئێستا بە ترس و نیگەرانیی بۆ سەلامەتی کۆرسیرا هاتبوو بۆ لای ئەسینایییەکان. تاکە شتێک کە ئەو دەیتوانی پێشکەشی بکات بریتی بوو لە هاوپەیمانێتی بەرژەوەندییە دوولایەنەییەکان. کۆرسیرا

هێزێکی دەریایی هەبوو کە لە قەبارە و بەهێزیدا لەدوای هی ئەسینایییەکانەوە بوو هاوپەیمانێتییەک لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا هێزێکی بەهێزی لێ دروست دەبوو، هێزێک کە دەیتوانی دەوڵەتی ڕکابەری سپارتا بتۆقێنێت بەدایەوە، ئەمە هەموو ئەو شتە بوو کە کۆرسیرا دەیتوانی پێشکەشی بکات.

پاشان نوێنەرەکەی کۆرینس وتارێکی بەسۆزی لێهاتووانەی پێشکەش کرد کە جیاوازییەکی توندی هەبوو لەگەڵ بۆچوونی بێئاوی وشکی کۆرسیرا. ئەو باسی هەموو ئەو شتانەی کرد کە کۆرینس لە ڕابردوو بۆ ئەسینایییەکان ئەنجامیدابوو. ئەو پرسیاری ئەوەی کرد کە بەلای هاوپەیمانەکانی تری ئەسیناوە چۆن دەبێ ئەگەر شارەکە ڕێککەوتنێک لەگەڵ دوژمنێکی پێشوودا ئەنجام بدات لەبەرامبەر ڕێککەوتنێک لەگەڵ دۆستێکی هەنوکەییدا، دۆستێک کە بە ئەمەکەوە حورمەتی بەرژەوەندیی ئەسینای گرتبوو. لەوانەیە ئەو هاوپەیمانانە ڕێکەوتنەکەیان لەگەڵ ئەسینایییەکان بشکێنن ئەگەر بزانن وەفادارییەکەیان ناڕەحێنرێت. ئەو ئاماژەی بە یاسای هێلینی و پێویستی چاکەدانەوەی کۆرینس دا لەبەرانبەر هەموو ئەو کردارە چاکانەی ئەنجامیدابوون. ئەو بۆ دواجار چووە سەر لیستێکی هەموو ئەو حورمەتگوزارییانەی کۆرینس بۆ ئەسینایییەکان ئەنجامی دابوو و گرنگی پیشاندانی سوپاسگوزاری بۆ دۆستەکان

پاش وتارەکە، ئەسینایییەکان لە ئەنجومەنێکدا مشتومڕیان لەسەر پرسەکە کرد لە خولی دووەمدا، ئەوان بە زۆرینەیەکی بەرچاو دەنگیاندا بە هاوپەیمانی لەگەڵ کۆرسیرا و بەلاوەنانی کۆرینس.

## لێکدانەوە

مێژوو بەڕێزەوە یادی ئەسینایییەکان دەکاتەوە، بەڵام ئەوان واقیعبینی پێشەنگی یۆنانی کلاسیکی لەگەڵ ئەواندا، هەموو بەلاغەت، هەموو داواکارییە هەستەییەکان لە جیهاندا، ناتوانێ لەگەڵ مشتومڕێکی پراگماتیکیدا بگونجێن، بەتایبەت مشتومڕێک کە دەسەڵاتیانی زیاتر کردووە

ئەوەی کە مانۆڕە کۆرینسییەکە درکی پێنەکرد ئەوە بوو کە ئەمڕۆکانی بۆ بەخشندەیی ڕابردووی کۆرینس بەرانبەر ئەسینایییەکان تەنیا بووە مایەی هەراسانکردنی ئەسینایییەکان، بەشێوەیەکی ئاڵۆز پرسیاری ئەوەیان لێدەکردن کە هەست بەگوناه بکەن و دەیانخستە ژێر ئەرک. ئەسینایییەکان بەباشتریان زانی بایەخێکی کەمتر بدەن بە چاکەکانی ڕابردوو هەستە دۆستانەییەکانی ڕابردوو، لەهەمان کاتدا، ئەوان زیانیان ئەگەر هاوپەیمانەکانی تریان ئەوانیان وەها بیبینێت کە بێ ئەمەکن بەرانبەر دەستبەرداربوون لە کۆرینس، هێشتا ئەگەری ئەوە هەبوو کە ئەم دەوڵەتە شارانە هێشتا پەیوەندییەکانیان بە ئەسینایییەکانەوە بپچڕێنن کە دەسەڵاتی پێشەنگ بوو لە یۆنان ئەسینایییەکان لە ڕێگەی هێزەوە حوکمی ئیمپراتۆریەتەکەیان کرد و هەر هاوپەیمانێکی یاخیگەریان ناچار کرد بگەڕێتەوە.

کاتێک خەڵکی لەنێوان قسە لەبارەی ڕابردوودا و قسەکردن لەبارەی ئایندە هەڵدەبژێرن، کەسێکی پراگماتیک هەمیشە ڕوو دەکاتە ئایندە و لەبارەی ئایندە دەدوێت و ڕابردوو لەبیر دەکات. لەکاتێکدا کە کۆرسیرائس درکی بەوە کرد، هەمیشە باشترین شت ئەوەیە کە بەشێوەیەکی پراگماتیکی لەگەڵ کەسێکی پراگماتیدا قسە بکەیت. لە کۆتاییشدا، زۆربەی خەڵکی لە ڕاستیدا پراگماتیکن— ئەوان بە دەگمەن لە دژی بەرژەوەندیی خۆیان هەنگاو دەنێن.

*ئەوە هەمیشە ڕێسایەک بووە کە دەبێ لاواز پاشکۆی بەهێز بێت و سەرباری ئەمەش، ئەوە لەبەرچاو دەگرین کە ئێمە شایستەی دەسەڵاتەکەمانین. تا ئەم ساتەوەختە ئێستاش تۆ وا بیرت دەکردەوە کە ئێمە شایەنی دەسەڵاتەکەمان بووین، بەڵام ئێستا، پاش هەڵسەنگاندنی بەرژەوەندیی خۆت، تۆ بەرەبەرە دەست دەکەیت بە قسەکردن لە سۆنگەی ڕاست و هەڵەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لەبەرچاوگرتنی لەو جۆرە قەت خەڵکی لە دەرفەتەکانی ئەو شکۆدارکردنە دوور نەخستوەتەوە کە لەلایەن هێزێکی گەورەترەوە پێشکەش کراوە*

نوێنەری ئەسینا بۆ سپارتا. جەنگی پێلۆپۆنیزی، تیوسیدید،

نزیکەی ٤٦٥–٣٩٥ پێش زایین.

## کلیلی دەسەڵات

لە گەشتەکەدا بەرەو دەسەڵات، بە بەردەوامی خۆت لە پێگەی داواکردنی یارمەتی لەو کەسانە دەبینیتەوە کە لە پێگەی بەهێزتردان. هونەرێک هەیە بۆ داواکردنی یارمەتی، هونەرێک کە بەندە بە توانای تۆ بۆ تێگەیشتنی ئەو کەسەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت و تێکەڵاوەکردنی پێویستییەکانت لەگەڵ هی ئەودا.

زۆربەی خەڵکی هەرگیز لەمەدا سەرکەوتوو نابن، چونکە ئەوان بەتەواوی لە پێویستییەکان و ئارەزووەکانی خۆیاندا گیریان خواردووە. ئەوان لەو گریمانەیەوە دەست پێدەکەن کە ئەو خەڵکەی ئەوان دەچنە لایان، بەرژەوەندییەکی خاکیانەیان لە یارمەتیدانیان هەیە. ئەوان وەها قسە دەکەن وەک بڵێی پێویستییەکانیان مایەی گرنگی ئەم خەڵکانە بوون- کە لەوانەیە نەیانتوانیبێت کەمتر بێباک بن. هەندێ جار ئەوان ئاماژە دەدەن بە پرسە گەورەکان: دۆزێکی گەورە، یان هەستە بەرجەستەکانی وەکو خۆشەویستی و ئەمەک. ئەوان پەنا بۆ وێنە گەورەکە دەبەن کاتێک واقیعییەتە رۆژانەییە سادەکان کاریگەرتر دەبن. ئەوەی کە درکی پێناکەن ئەوەیە تەنانەت بەهێزترین کەس لەناو پێویستییەکانی خۆیدا گیر دەخوات و ئەمەی کە ئەگەر تۆ پەنا بۆ بەرژەوەندی خۆی نەبەیت، لەوانەیە تۆ وەکو کەسێکی نائومێد یان لە باشترین حاڵەتدا وەکو کات بەفیڕۆدەرێک ببینێت.

لە سەدەی شانزەدا، تەبشیرییە پورتوگالییەکان بۆ ماوەی ساڵانێک هەوڵیاندا خەڵکی ژاپۆن بۆ کاسۆلیسیزم وەگەڕێنن، کەچی لەهەمان کاتدا پۆرتوگال بازرگانی نێوان ژاپۆن و ئەورووپا مۆنۆپۆڵ کردبوو. هەرچەندە تەبشیرییەکان تا رادەیەک سەرکەوتوو بوون، ئەوان قەت لەنێو دەستەبژێری فەرمانڕەوادا ئەوەندە برەویان نەکرد. بە ڕاستیدا، لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا هەوڵەکانی لەسەر وەرگەڕاندنیان بەتەواوی ببووە مایەی تووڕەکردنی ئیمپراتۆری ژاپۆن، ئاسو. کاتێک هۆڵەندییەکان بە ژمارەیەکی زۆر گەیشتنە

ژاپۆن، پاشان تامکی هاتەوە بەر ئەو بۆ شارەزایەتی تەکنیکی لە چەك و سوپاکردندا،
پێویستی بە ئەورووپییەکان بوو و ئینجا لێرەوە بۆ دواجار ئەو ئەورووپییانە پەیدا بوون کە
هیچ باکیان بە بڵاوکردنەوەی دین نەبوو – هۆڵەندییەکان تەنیا بازرگانیان دەویست
پاشان بەھیرلیی هەمکاری نا بۆ دەرکردنی پورتوگالییەکان لەو کاتە بەدوا، ئەو تەنیا
لەگەڵ هۆڵەندییە ئەقڵ پراکتیکییەکاندا مامەڵەی دەکرد.

ژاپۆن و هۆلاند بەشێوەیەکی بەرچاو کەلتووری جیاواز بوون، بەڵام هەردووکیان لە
پرسێکی گەردوونی و بنەڕەتیدا هاوبەش بوون: بەرژەوەندیی خۆیی. هەر کەسێك کە تۆ
مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت وەکو کەلتوورێکی تر وەهایە، سەرزەمینێکی نامۆ بە
رابردوویەکەوە کە هیچ پەیوەندی بەوەی تۆوە نییە. لەگەڵ ئەوەشدا تۆ دەتوانیت
جیاوازییەکانی نێوان تۆ و ئەو لە ڕێگەی ڕووکردنە بەرژەوەندییە خۆییەکەی، ببڕیت. تۆ
ماریفەتێکی بەرجەستە هەیە کە بەخشی بکەیت، تۆ سوفتەکەی پڕ دەکەیت لە ئالتون، تۆ
ڕەهای لێدەکەیت کاتێکی درێژتر و بەختەوەرتر بژیت. ئەمە زمانێکە کە هەموومان
قسەی پێدەکات و لێی تێدەگات.

هەمکارێکی کلیلی لە پرۆسەکەدا بریتییە لە تێگەیشتن لە سایکۆلۆژیای کەسەکەی تر.
ئایا ئەو لوتبەرزە؟ ئایا ئەو حەزی ناوبانگەکەی هۆیەتی یان پێگە کۆمەڵایەتییەکەی؟
ئایا ئەو دوژمنی هەن کە تۆ بتوانیت یارمەتیدەر بیت لە لەناوبردنیان؟ ئایا ئەو پارە یان
دەسەڵات دەیجولێنێت؟

کاتێك مەنگۆڵەکان لە سەدەی بیستەمدا چینیان داگیر کرد، هەڕەشەی ئەوەیان کرد
کەلتوورێك لەناوبەرن کە ماوەی زیاتر لە دوو هەزار ساڵ بەرگەی گرتبوو. سەرکردەکەیان،
جەنگیز خان، هیچ لە چین نەبینی جگە لە وڵاتێك کە لەوەڕگەی بۆ ئەسپەکانی نییە و
بڕیاریدا شوێنەکە کاول بکات، شارەکانی هەمووی تەخت بکات، چونکە "وەها باشترە
چینییەکان قڕ بکەیت و لێگەڕێیت گژوگیا سەوز ببێت" ئەوە سەربازێك، ژەنەراڵێك، یان
پاشایەك نەبوو کە چینییەکانی لە قڕکردن نەجات دا، بەڵکو پیاوێك بوو بەناوی (یەلو
چوتسای) چوتسای کە خۆی بیانییەك بوو، هەستا بە ستایشکردنی بالادەستی

کەلتووری چینییەکان. ئەو حزی کردە ڕاوێژکارێکی حی متمانەی جەنگیز خان و ڕاپێکردە ئەوەی کە ئەم سەروەت و سامانی لە شوێنەکە بەجێگ دەمات ئەگەر لەبری وێرانکردنی، تەنیا باج بخاتە سەر تاکە تاکی ئەو کەسانەی لەوێ دەژیان. خان زیری لەمەدا بینی و ئەوەی کرد کە چوتسای وتی.

کاتێک خان پاش گەمارۆیەکی درێژخایەن شاری (کایفینگ)ی گرت و بڕیاریدا دانیشتووانی کۆمەڵکوژ بکات (هەروەک لەو شارانەی تر کە بەرەنگارییان کردبوو ئەمەی کرد)، چوتسای پێی وت کە باشترین پیشەگەر و ئەندازیاران لە چین ڕایانکردووە بۆ کایفینگ و وا باشتر دەبێت کە دەکار بکرێن. کایفینگ وازی لێهێنرا. جەنگیز خان پێشتر هەرگیز بەرەییەکی وەهای پیشان نەدابوو، بەڵام ئەو کاتە بە ڕاستی بەرەیی نەبوو کە کایفینگی ڕزگار کرد. چوتسای خانی باش دەناسی. ئەو جوتیارێکی بەربەری بوو کە هیچ بایەخی بە کەلتوور نەدەدا، یان لە ڕاستیدا ماکی نەهیچ شتێک نەبوو جگە لە جەنگ و ئەنجامە کردارییەکان. چوتسای ڕوویکردە تاکە هەستێک کە کاری لەسەر پیاوێکی وەها دەکرد: چڵێسی.

بەرژەوەندیی خۆیی ئەو پاڵنەرەیە کە خەڵکی دەبزوێنێت. هەر کە وایانلێبکەیت ببینن چۆن دەتوانیت بە شێوەیەک لە شێوەکان وەڵامگۆی پێداویستییەکانیان بیت یان ئامانجەکەیان بەرەوپێش ببەیت، بەرەنگارییان بەرامبەر داواکانت بۆ یارمەتی بەشێوەیەکی جادوویی نامێنێ. لە هەر هەنگاوێک لە ڕێگەدا بەرەو بەدەستهێنانی دەسەڵات، دەبێ خۆت ڕابهێنیت بۆ بیرکردنەوە لە ناوەوەی مێشکی کەسەکەی تردا، بۆ ئەوەی پێویستییەکانیان و بەرژەوەندییەکانیان ببینیت، بۆئەوەی پەردەی هەستەکانی خۆت لاببەیت کە حەقیقەتەکە لێڵ دەکەن. ئەمجێ خۆت لەم هونەرەدا ئاو بدە و ئیتر هیچ سنوورێک نابێت لەبەردەم ئەوەی کە دەتوانیت بەدەستی بهێنیت.

وێنە ئەو گوریسەی کە دەبەستێنەوە. گوریسی بەرەیی و ئەمەکداری تەنکە و بە یەکەمین شۆک، دەپچڕێت. یارمەتییەکی وەها مەخەرە ڕوو. گوریسی بەرژەوەندیی

حزبی دوولایەنە زۆر ئاستەنووە و بە ئاسانی رەفەری پێ ناکات ئەمە بۆ سالانێک کەلکی پێ دەگەیەنێت

دەسەلات کورتترین و باشترین ڕێگە بۆ بەدەستهێنانی سامانە ئەوەیە لێبگەڕێت خەلکی بە ڕوونی ئەوە ببینن کە لە بەرژەوەندییاندایە بەرەو بەرژەوەندییەکانی تۆ بڕۆن

ژان دو لا برویەر (١٦٤٥-١٦٩٦)

**پێچەوانە بوونەوە**

هەندێ کەس ڕووکردنە بەرژەوەندیی خۆیان بە درێژ و بێ ئەدەبانە دەبینن ئەوان لە ڕاستیدا پێیان باشترە ستوولێ پرلوەی خێرخوازی، بەرەیی و دادپەروەری بکەن کە ڕێگەی خۆیانە بۆ هەستکردن بە بالایی بەسەر تۆدا کاتێک تۆ بۆ یارمەتی لێیان دەپاڕێیتەوە، جەخت لە دەسەلات و پێگەیان دەکەیتەوە ئەوان ئەوان بابی پێویست بەهێزن کە پێویستیان بەهیچ نەبێ لە تۆ جگە لە دەرفەتی هەستکردن بە بالادەستی ئەمە ئەو شەرابەیە کە ژەهراوییان دەکات ئەوان تامەزرۆی دابینکردنی داراییێ بۆ پرۆژەکەت، ناساندنت بە خەلکانی دەسەلاتدار- بێگومان بەو مەرجەی کە هەموو ئەمە بەئاشکرا و بۆ دۆزینکی باش ئەنجام بدرێت (زووجار چەندەی ئاشکراتر بێت باشترە) ئەو کاتە باشترواییت لە ڕێگەی بەرژەوەندیی خۆییانەی گومان ئامێز لە هەموو کەسێک مرێک سبتەوە هەندێ کەس ئەمە ساردی دەکاتەوە، چونکە نایانەوێ وا دیار بن کە بەم شتانە دەجولێن ئەوان پێویستیان بە دەرفەت گەلێک هەیە بۆ پیشاندانی دلی باشیان

شەرمی مەبە دەرفەتیان بدەرێ ئەمە وەک ئەوە نییە کە توکلاویان لەسەر سێنیت بەوەی کە داوای یارمەتییان لێ نکەیت- ئەمە بە ڕاستی خۆشیی ئەوانە بۆ بێدن و بسرانی ئەوەی کە دەبەخشن دەبێ تۆ جیاواری بکەیت لەنێوان خەلکانی دەسەلاتدار و برلیت چ شتێک خنوکەیان دەدات، کاتێک ئەوان چارچێوکییان لێ دەدەرێ، ڕوو مەکەرە

دیوی حەزخوازییان، کاتێک ئەوان دەیانەوێ حەزخواز و بەڕێز دیار بن، پوو مەکەرە دیوی چڵێسی و چاوچنۆکییان

زۆربەی پیاوان ئەوەندە تەواو خۆیین کە بە ڕاستی ناکیان بە هیچ شتێک نییە جگە لە خۆیان، ئەوان هەمیشە بەر لە هەر شتێک بیر لە کەیسی خۆیان دەکەنەوە و تەواوی سەرنجیان لەسەر تاکە دەربەتی ڕووکردنە هەر شتێکە کە بەشێوەیەکی شەخسی کاریگەری دەخاتە سەریان؛ ئەگەرچی قەت وەها دوورەدەستیش نەبووبێت

ئارتور شۆپنهاوەر، ١٧٨٨–١٨٦٠

## یاسای ژماره ١٤

# وەك هاوڕێ خۆت دەرخە، وەکو سیخوڕ کار بکە

### ئوکە

*زانین لەبارەی ڕکابەرەکەتەوە گرنگە، سیخوڕ بەکارێتیە بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی گرنگ کە هەنگاوێك دەتباتە پێشەوە. لەوەش باشتر، خۆت ڕۆڵی سیخوڕ ببینە. لە دیدارە کۆمەڵایەتییە سەنگین و ڕێزنامێزەکاندا، فێربە زانیاری سۆراغ بکەیت. پرسیاری ناڕاستەوخۆ بکە بۆ ئەوەی وا لە خەڵك بکەیت کە بیار و هاڵی لاوازی خۆیان دەربخەن. هیچ بۆنە و هاڵەتێك نییە دەرفەتێك نەبێت بۆ سیخوڕیکردنی لێزانانە.*

### پەیڕەوپکردن لە یاساکە

بێگومان جۆزێف دوڤین گەورەترین مامەڵەکاری هونەری سەردەمەکەی خۆی بوو- لە ١٩٠٤ەوە تا ١٩٤٠ ئەو تەقریبەن بەتەنیا مۆنۆپۆلیرەی بازاڕی ملیۆنێری کۆکردنەوەی بەرهەمی هونەریی ئەمریکای کرد. بەڵام گەمژەیەك گومڕای کرد. ئەندرو میلۆنی خاوەن کارگە. پێش ئەوەی بمرێت، دوڤین مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی میلۆن بکاتە مشتەرییەك

هاوڕێکانی دوڤین وتیان ئەمە هەوێنکی ئەستەمە. میلۆن کەسێکی تۆکمە و کپ بوو. ئەو چیرۆکانەی کە ئەو لەبارەی دوڤینی ڕۆژیلێی نەرم و بیان بیستبووی، بە ئاراستەیەکی هەڵەدا بردیان- ئەو ڕووبەکردنەوە کە ئارەزووی ناسینی کابرای نییە

لەگەڵ ئەوەشدا، دوفێن بە هاوڕێ بەکرمانەکانی وت، "نەک تەنیا میلۆن لێم دەکڕێت بەڵکو ئەسما و تەنیا لە من دەکڕێت" بۆ ماوەی ساڵانێک ئەو بەدوای نێچیرەکەیەوە بوو، فێری خووەکان، ترس و رەوق و هیوابەتەکانی کابرا دەبوو بۆ ئەم کارە، ئەو بە مەیلی هەندێ لە سنافەکانی میلۆنی حسنە لیستی مرچەی حزبەوە و زانیاری بەرچی لێ دەرەکێشان بەهاتنی ئەو کاتەی کە ئەو چووە ناو کردارەوە، ئەوەندەی ژنەکەی میلۆن، زانیاری لەبارەی میلۆنەوە هەبوو

لە ساڵی ١٩٢٩دا میلۆن سەردانی لەندەنی دەکرد و لە شوقەیەکی بەرێدا لە قاتی سێی هۆتێلی (کلاریج) دەمایەوە. دوفێن شوقەیەکی ڕێک لە خوار ئەوەی میلۆن گرت لە قاتی دووەم، ئەو ئامادەکاری ئەوەی کردبوو تا خزمەتکارەکەی ببێتە هاوڕێی خزمەتکارەکەی میلۆن و لە ڕۆژێکی چوارشەممەدا پڕابووە سەر هەنگاوەکان، خزمەتکارەکەی میلۆن بە خزمەتکارەکەی دوفێنی وت، کە ئەمیش بە دوفێنی وت، کە تۆزە پارەتی میلۆنی داوە بۆ چاکەت لەبەرکردن و داوەی کارگەکە بە ڕێگەوەیە بۆ ناو مەسعەدەکە.

خزمەتکارەکەی دوفێن بەپەلە پارەتی دوفێنی دا تا چاکەتەکەی لەبەر بکات. چەند چرکەیەک دواتر، دوفێن چووە ناو مەسعەدەکە و ئیتر میلۆنیش لەوێدا بوو. دوفێن وتی "بەڕێز میلۆن چۆنیت؟" و خۆی ناساند "من بە ڕێگاوەم بەرەو گەلەری نیشتمانی بۆ تەماشاکردنی هەندێ وێنە" چەندێک ناسروشتی بوو- ئەمە ڕێک ئەو شوێنە بوو کە میلۆن بۆی دەچوو. بەمشێوەیە دوفێن توانی هەوڵێنی نێچیرەکەی بکات بەرەو شوێنێک کە سەرکەوتنەکەی مسۆگەر دەکرد. ئەو رەوقی میلۆنی لە دەرەوە و ناوەوەدا دەزانی و لەکاتێکدا کە ئەو دوو پیاوە بەناو مۆزەخانەکەدا پیاسەیان دەکرد، بریسکانە دەوڵەمەندەکەی بە زانیاریەکەی سەرسام کرد. جارێکی تر بەشێوەیەکی تەواو ناسروشتی، پێدەچوو بە ڕادەیەکی زۆر رەوقی هاوبەشیان هەبێت

میلۆن بەشێوەیەکی هاوڕا سەرسام بوو. ئەمە ئەو دوفێنە بوو کە پێشبینی دەکرد کابرا سەرنجڕاکێش و دڵگیر بوو دیار بوو کە رەوقێکی جوانی هەیە. کاتێک گەڕانەوە بۆ

نیویۆرک، میلۆن سەردانی گەلەریە ناوازەکەی دۆنیی کرد و دڵی چووە سەر کۆبەندە هونەرییەکە. هەموو شتێک، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنی گونجاو لەو جۆرە کارانە بوون کە دەیویست کۆیان بکاتەوە. لە پاشماوەی ژیانیدا ئەو باشترین و بەهەستدەترین مشتەری دۆنی بوو.

## لێکدانەوە

پیاوێکی خاوەن ئەزموون و پێشڕکێکاری وەکو جۆزێف دۆنی هیچ شتێکی بۆ ڕێکەوت بەجێنەهێشتەوە. باشە و سکاڵاکردن کەڵکی چییە بۆ هیواخواستن بەوەی بتوانێت ئەم مشتەری و ئەو مشتەریە بەدەست بێنێت؟ ئەمە وەکو تەقەکردنە لە مراوییان بە چاوی نوقاوەوە. خوت بە کەمێك زانیاری دەوڵەمەند بکە و ئامانجەکەت دەپێکێت

میلۆن یەکێك بوو لە نێچیرە مایەکانی دۆنی، بەڵام ئەو سیخوڕی بەسەر ژمارەیەك لە ملیۆنەرەکانەوە کردبوو. بەوەی کە بەنهێنی ئەندامانی ستافی ماڵی مشتەرییەکەی بخاتە ناو لیستی موچەی خۆیەوە، دەستبەجێ دەستی گەیشتە زانیاری گرنگ لەبارەی هاتن و چوون، گۆڕانکاری زەوق و مرگە زانیاریی تری لەو بابەتەی موشیرەکەیان بۆئەوەی هەنگاوێك بهێنێتە پێشەوە. ڕکابەرێکی دۆنی کە ویستی هێندی مرێك بکاتە مشتەری، تێبینی ئەوەی کرد کە هەر کاتێك ئەو سەردانی ئەم دەوڵەمەندە نیویۆرکییەی دەکرد، دۆنیی پێش ئەم لەوێ بوو، وەك بڵێی حاسەی شەشەمی هەیە. بەلای مامەڵەکارەکانی ترەوە، پێدەچوو دۆنی لە هەموو شوێنێك بێت و هەموو شتێك بزانێت پێش ئەوەی ئەوان بیزانن. دەسەڵاتەکانی ئەو، ئەوانی سارد دەکردەوە، تا ئەو کاتەی کە زۆرێکیان دەستبەرداری ویلبوونی بەدوای ئەو مشتەرییە دەوڵەمەندانە بوون کە مامەڵەکارێکیان دەوڵەمەند دەکرد

ئەمەیە هێزی سیخوڕیکردنی لێزانانە. ئەمە وادەکات تۆ سەراپا بەهێزی بادیاریی بێت. ماریفەتی تۆ لەمەڕ کەسە ئامانجەکەت دەنوێنێ بەهەمان شێوە وادەکات سەرنجڕاکێش دیار بێت وەك چۆن وات لێدەکات پێشبینی ئارەزووەکانی بکەیت. کەس

سەرچاوەی دەسەڵاتی تۆ نابینێت و ئەوەی کە ناتوانن ببینن ناتوانن ڕووبەڕووی ببنەوە.

*فەرمانڕەواکان لە ڕێگەی سیخوڕەکانەوە دەبینن، وەکو چۆن مانگاکان لە ڕێگەی بۆنەوە، براهمینەکان لە ڕێگەی دەقە پیرۆزەکان و خەڵکی تر لە ڕێگەی چاوە ئاساییەکانیانەوە.*

*کۆتیلیا، فەیلەسوفی هیندی، سەدەی سێیەمی پێش زایین.*

## کاملی دەسەڵات

لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتدا، ئامانجی تۆ ئاستێکی کۆنترۆڵە بەسەر ڕووداوەکانی ئایندەدا. کەواتە بەشێکی ئەو کێشەیەی ڕووبەڕووی دەبیتەوە ئەوەیە کە خەڵکی هەموو بیرۆکەکانیان، هەستەکانیان و پلانەکانیانت پێ نالێن. بە کۆنترۆڵکردنی ئەوەی کە دەیڵێن، زۆرجار بەشە هەرە گرنگەکانی کارەکتەرەکەیان دەشارنەوە- خاڵە لاوازەکانیان، پاڵنەرە شاراوەکانیان، خووەکانیان. ئەنجامەکە ئەوەیە کە تۆ ناتوانیت پێشبینی جوڵەکانیان بکەیت و بە بەردەوامی لە تاریکیدایت. فێڵەکە ئەوەیە کە ڕێگەیەک بدۆزیتەوە بۆ سۆراخکردنیان، بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکان و نیازە شاراوەکانیان، بەبێ ئەوەی لێبگەڕێیت بزانن خەریکی چیت.

ئەمە ئەوەندەی کە پێت وایە، قورس نییە. پەردەیەکی دۆستانە ڕێگەت بۆ خۆش دەکات تا بە نهێنی زانیاری لەبارەی هاوڕێیان و دوژمنان وەک یەک کۆ بکەیتەوە. لێگەڕێ ئەوانیتر ڕوو بکەنە خوێندنەوەی بورجەکان یان کارتەکانی بەختیان بخوێننەوە. تۆ ئامرازی کۆنکرێتیترت لەبەردەستدان بۆ بینینی ئایندە.

باوترین ڕێگەی سیخوڕی کردن بەکارهێنانی خەڵکی ترە، بەو شێوەیەی دوفین کردی. میتۆدەکە سادەیە، بەهێزە بەڵام مەترسیدارە: بەدڵنیاییەوە تۆ زانیاری کۆ دەکەیتەوە، بەڵام کۆنترۆڵێکی کەمت هەیە بەسەر ئەو خەڵکەدا کە کارەکە دەکەن. لەوانەیە ئەوان

دەست و پێ سپیانە سحرییەکەی تۆ دەردەخەن، بان تەنانەت بەنهێنی لێت هەڵدەگەڕێنەوە. زۆر باشترە کە خۆت سیحرن بیت، وەکو هاوڕێ خۆت دەرخەیت لەکاتێکدا کە بە نهێنی زانیاری کۆ دەکەیتەوە.

سیاسەتمەداری فەرەنسی، تالیراند، یەکێك بوو لە پرلوەکارە هەرە گەورەکانی ئەم هونەرە. ئەو تواناییەکی ناسروشتی هەبوو بۆ دەرکێشانی نهێنی لە خەڵکی بە وتوێژی بەرێزەوەدا. هاوسەردەمێکی ئەو، بارۆن دو فیترۆلز، نووسی "زیری و سەنگینی لە تایبەتمەندییەکانی وتوێژی ئەو بوون. ئەو هونەری شاردنەوەی بیرۆکەکانی و مەبەستییەکانی بوو لەژێر پەردەپۆشێکی شەفاف ئەگێڕەکانیدا، ئەو وشانەی کە گوزارشت لە شتێکی زیاتر لەوە دەکەن کە دەیلێن. تەنیا ئەو کاتەی کە پێویست بوو، کەسایەتی خۆی دەهێنایە ناو قسەکانەوە". کلیلەکە لێرەدا تواناى تالیراندە بۆ سەرکوتکردنی خۆی لە وتوێژدا، بۆ هاندانی ئەوانیتر بەشێوەیەکی ناکۆتا لەبارەی خۆیانەوە قسە بکەن و بێ مەبەست نیاز و پلانەکانیان دەرخەن.

بەدرێژایی ژیانی تالیراند، خەڵکی دەیانگوت ئەو وتوێژکارێکی نایابە- لەگەڵ ئەو بە ڕاستی کەم دەگوت. ئەو قەت باسی ئایدیاکانی خۆی نەدەکرد. ئەو وەهای لەوانیتر دەکرد ئایدیاکانی خۆیان ئاشکرا بکەن. ئەو گەمەی دۆستانەی هشنەی وشەی بردی بۆ دیپلۆماتە بیانییەکان ڕێکدەخست، کۆبوونەوەی کۆمەڵایەتی ڕێکدەخست کە تیایدا ئەو بە وریاییەوە قسەکانیانی هەڵدەسەنگاند، بڕوابەخۆبوونیانی بەکێش دەکرد و زانیاری بەنرخی بۆ کارەکەی وەکو وەزیری دەرەوەی فەرەنسا کۆ دەکردەوە. لە کۆنگرەی ڤیەننا (١٨١٤-١٨١٥) ئەو سحرەی خۆی بە ڕێگەی تر ئەنجامدا. ئەو شتانەی لە دەمی خۆی دەردەچوواند کە وەکو نهێنییەك دیار بوون (لە ڕاستیشدا شتێك بوو کە خۆی هەڵیبەستبوو) پاشان چاودێری کاردانەوەی کونگرەکانی دەکرد. بۆ نموونە، لەوانەبوو بە کۆبوونەوەیەکی دیپلۆماتەکاندا بڵێت سەرچاوەیەکی جێ متمانە پێی وتووە تزاری ڕوسیا خەریکی پلاندانانە بۆ دەستگیرکردنی گەورە ژەنەراڵەکانی بە تۆمەتی ناپاکی. بە چاودێریکردنی کاردانەوەی دیپلۆماتەکانی بەرامبەر ئەم چیرۆکە هەڵبەستراوە، دەیزانی

کامەیان لەهەموویان زیاتر هێزتە جۆش لەبەرانبەر لاوازبوونی سوپای پرۆسیادا- لەوانەیە حکومەتەکانیان پلانی هەبووبێت لەسەر پرۆسیا؟ هەروەکو بارۆن فۆن سێتێن وتی، "مۆنسیۆ تالیراند فیشەکێك دەتەقێنێتە هەوا بۆ ئەوەی بزانێت کە لە پەنجەرەکە خۆی هەڵدەداتە خوارەوە".

لە هەودای کۆبوونەوە کۆمەڵایەتییەکان و دیدارە سەلامەتەکاندا، ئاگادار بە ئەمە ئەو کاتەیە کە پەرپۆشی خەڵکی دادەبەزێت بە تێپەڕاندنی کەسێتی خۆت، دەتوانێت وەهایان لێبکەیت شت دەربخەن. لیهاتوویی مەترەکە ئەوەیە کە ئەوان بایەخدانی تۆ بەوان لەگەڵ هاوڕێیەتیدا تێکەڵ دەکەن، بۆیە تۆ نەك تەنیا هێز دەبیت بەڵکو هاوپەیمان دروست دەکەیت.

لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێ تۆ بە وریاییەوە پراوەی ئەم تاکتیکە بکەیت. ئەگەر خەڵکی گومانی ئەوەیان لا دروست بێت کە تۆ لەژێر پەرپۆشی وتوێژدا نهێنییان لێ دەربێنیت ئەوان بەتوندی لێت دوور دەکەونەوە. جەخت لە دەمەتەقێی دۆستانە بکەرەوە، نەك زانیاریی بەنرخ. ناکرێ گەڕانی تۆ بەدوای جەوهەرەکانی زانیاریدا ئەوەندە ڕوون بێت، ئەگینا پرسیارە سۆراخکەرەکانی تۆ زیاتر لەبارەی خۆت و نیازەکانتەوە شت دەردەخەن نەك ئەو زانیارییەی کە هیواداریت دەستت کەوێت.

فێڵێك بۆ تاقیکردنەوە لە سیخوڕیدا لە (لا ڕاچفۆکۆلد)ەوە دێت کە دەڵێ "سەرڕاستی لە ژمارەیەکی کەمی مرۆڤەکاندا هەیە و زۆرجار زیرەکانەترینی فێڵەکانە- مرۆڤ سەر ڕاستە بۆئەوەی متمانە و نهێنییەکان بەدەربهێنێت" بە خۆدەرخستنی ئەوەی کە دڵی خۆت پیشانی ئەوی دەدەیت، بە دەربڕینێکی تر، تۆ وەهایان لێدەکەیت کە نهێنییەکانی خۆیان دەربخەن. داپێداچوونێکی ساختە بخەرە ڕوو و ئیتر ئەوان داپێدانانێکی ڕاستی دەخەنەڕوو. فێڵێکی تر لەلایەن ئارسۆر شۆپنهاوەری فەیلەسوف ناسراوەتەوە کە بە مکوڕییەوە پێشنیاری هاودژکردنی ئەو خەڵکەی کرد کە تۆ وتوێژیان لەگەڵ دەکەیت وەکو ڕێگەیەکی هەراسانکردنیان، وروژاندنی بۆئەوەی بەشێك لە کۆنترۆڵیان بەسەر قسەکانیاندا لەدەست بدەن. لە کاردانەوەی هەستیانەیاندا ئەوا هەموو

جۆرە راستییەك بەبارەی خۆیانەوە دەردەخەن، ئەو ڕستانەی کە دەتوانێت دوایی بەدژیان بەکاریان بهێنەوە

شتێکی تری سیحوریکردنی ناڕاستەوخۆ بریتییە لە تێبینیکردنی هەڵە، واتە دانانی بەڵەی بچوك کە وایانلێدەکات شت لەبارەی خۆیان دەربخەن. خەسرەوی دووەم، پاشای زیرەکی سەدەی حەوتەمی فارس، زۆر ڕێگەی خوێندنەوەی ڕەعیەکانی هەموو مەی ئەوەی گومان دوورووژێنێت. بۆ نموونە، ئەگەر تێبینی بکردایە کە دووان لە دەرباریەکانی بوونەتە دۆست، یەکێکیانی جیا دەکردەوە و دەیگوت زانیاریم هەیە کە ئەوەی تریان ناپاکە و بەمزووانە دەکوژرێت. پاشا بە دەرباریەکەی دەوت کە لە هەموان زیاتر متمانەی پێیە و دەبێ زانیارییەکە بە نهێنی بهێڵێتەوە. پاشان بە وریاییەوە چاودێری ئەو پیاوەکەی دەکرد. ئەگەر ئەو سیمایەی کە دەرباریی دووەم لە ڕەفتاریدا بەرامبەر پاشا دەگۆڕاوە، ئەوا دەگەیشتە ئەو ئەنجامەی کە دەرباریی یەکەم نهێنییەکەی دزاندووە و بەخێرایی ئەرشیفێکی دەدایە، دوایی دەیهێنایە لاوە بۆ ئەوەی دانپێدانانێك بکات "مەبەستم کوشتنی هاوڕێکەت بوو لەبەر هەندێ زانیاریی دیاریکراو کە پێم گەیشتبوو، بەڵام کاتێك بەدواداچوونم بۆ بابەتەکە کرد، بۆم دەرکەوت ڕاست نییە" ئەگەر، لەلایەکی ترەوە، دەرباریی دووەم دەستی نەکردایە بە خۆلادان لە پاشا، لاتەریك و گرژ ڕەفتاری نەکردایە، دەیزانی کە نهێنییەکە دەرنەکەوتووە. ئەو دەرباریی دووەمی لە کۆشکەکەی دوور دەخستەوە، ڕێگەی دەدا بزانێت کە تەواوی پرسەکە تەنیا تێست بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کابرا هیچی هەڵەی نەکردبوو، ئەو چیتر نەیدەتوانی متمانەی پێبکات. لەگەڵ ئەوەشدا، دەرباریی یەکەم نهێنییەکی دەرخستبوو و خەسرەو تەواوی مەملەکەتەکەی لێ قەدەغە دەکرد

ئەمە وەکو فۆرمێکی سیحوریی سەیر دێرە کە بەك زانیاریی ئەرمووی نەگو کارەکتەری کەسەکە دەردەخات. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆرجار، باشترین ڕێگەی چارەسەرکردنی کێشەکانە پێش ئەوەی سەرهەڵبدەن

بە ڕاكێشانی خەڵك بەرەو هەندێ كرداری دیاریكراو، هەت بەبارەی وەفاداری، ڕاستگۆییان و هیتر دەزانیت. ئەم جۆرەی زانیاریش زۆرجار بەرهەمترینە. كە بەم زانیارییە دەوڵەمەند بوویت، ئەوا دەتوانیت پێشبینیی كردارەكانیان بكەیت لە ئایندەدا

**وێنە:** چاوی سێیەمی سیخوڕ. لە سەرزەمینی دووچاوەكاندا، چاوی سێیەم زۆرزانییەكی خودایی پێ دەبەخشێت. تۆ دوورتر لەوانیتر دەبینیت و قووڵتر دەڕوانیتە ناوەوەیان. كەس لە بەرابەر چاوەكەدا سەلامەت نییە جگە لە تۆ

**دەسەڵات:** ئێستا، هۆكاری ئەمەی پاشایەكی لێهاتوو و ژەنەراڵێكی زیرەك هەركاتێك بجوڵێن دوژمنێك دەگرن و دەستكەوتەكانیان هی كەسانی ئاسایی تێدەپەڕێنێت، زانیاریی بەپێشینەیانە لەمەڕ باروبۆخی دوژمن. ناتوانرێ ئەم "زانیاریی پێشینە"یە لە تارماییەكان ، نە لە خوداكان، نە بە بەراوردكردنیش بە ڕووداوەكانی ڕابردوو و نە بە حەملاندنی بورجەكانیش بەدەست بهێنرێت. دەبێ لەو كەسانە بەدەست بهێنرێت كە باروبۆخی دوژمن دەزانن – لە سیخوڕەكانەوە

(سون-تزو، هونەری جەنگ، سەدەی چوارەمی پێش زایین)

## پێچەوانەبوونەوە

زانیاریی زۆر گرنگە بۆ دەسەڵات، بەڵام ڕێك وەك چۆن تۆ سیخوڕیی بەسەر خەڵكی ترەوە دەكەیت، دەبێ تۆش ئامادە بیت كە سیخوڕیت بەسەرەوە بكەن. كەوتە یەكێك لە چەكە هەرە كاریگەرەكان لە شەڕ بۆ زانیاری، دەستەبەركردنی زانیاریی ساختەیە. هەروەك وینستۆن چەرچل وتی "حەقیقەت ئەوەندە بەهادارە كە دەبێ هەمیشە دەستەیەك پاسەوانی درۆ پارێزگاری لێ بكەن" دەبێ تۆ خۆت بە پاسەوانی وەها دەورە بدەیت، بۆئەوەی حەقیقەت ڕەفەری پێ نەبرێت. بە چاندنی زانیاریی هەڵبژێردراوی دەستی خۆت، گەمەكە كۆنترۆڵ دەكەیت

لە ١٩٤٤دا، هێرشە نازییەکانی ڕۆکێت-بۆمب بۆ سەر لەندەن لەوپەڕیدا تەشەنەی سەند. زیاتر لە دوو هەزار ڤی-١ بۆمب بەسەر شارەکەدا باری و بووە هۆی کوژرانی زیاتر لە پێنج هەزار کەس و بریندابوونی ژمارەیەکی تر. بەشێوەیەک بەشێوەکان، ئەڵمانەکان بە بەردەوامی ئامانجەکانیان دەبوارد. بۆمبەکان بۆ پێکانی بریج تاوەر یان پیکادیلی بوون، بەلام زۆر کورتیان دەهێنا و لە شوێنە دانیشتووان کەمەکان دەکەوتنە خوارەوە. ئەمە لەبەر ئەوە بوو کە، لە جێگیرکردنی ئامانجەکاندا، ئەڵمانەکان پشتیان بەو سیخوڕانە بەستبوو کە لە ئینگلتەرە دایانتابوون. ئەوان نەیاندەزانی ئەم سیخوڕانە دۆزراونەتەوە و لەمەی کە لە شوێنیان، سیخوڕە دەردەستەکانی ئینگلیز زانیاریی گومڕاکەریان دەدەنێ.

بۆمبەکان هەر جارێک دوور و دوورتر لە ئامانجەکانیان دەکەوتنە خوارەوە. بەکۆتایی هاتنی کەمپەینەکە، ئەم بۆمبانە لە دێهاتە بەر مانگاکان دەکەوتن. کەواتە بە پێدانی زانیاریی هەڵە بە خەڵک، تۆ کەلکێکی زۆرت پێدەگات. لەکاتێکدا کە سیخوڕیکردن چاوی سێبەرت دەداتێ، زانیاریی گومڕاکەر چاوێکی دوژمنت بۆ دەبێتە دەرەوە.

*ئەگەر تۆ هۆکارێکت هەیە بزانەوەی گومان بکەیت کە کەسێک درۆت لەگەڵ دەکات، وەها خۆت دەربخە کە باوەڕت بە هەموو قسەکانی کردووە. ئەمە ئازایەتی دەداتێ تا بەردەوام بێت. ئەو بەجۆشتر دەبێت دەبێت لە دەربڕینەکانیدا و لە کۆتاییدا ناپاکی لە خۆی دەکات. جارێکی تر، ئەگەر تۆ هەستت کرد کەسێک هەوڵ دەدات شتێکت لێ بشارێتەوە، بەلام زۆر سەرکەوتوو نیبە، وەها خۆت دەربخە کە باوەڕی پێ ناکەیت. بەرهەڵستییەکەی تۆ دەیوروژێنێت تا بەدەکی ڕاستییەکەی دەربخات و هەموو هێزەکەی لێدەربێنێت تا کاریگەری بخاتە سەر باوەڕپێکردنەکەی تۆ.*

*ئارتور شوپنهاوەر، ١٧٨٨-* ١٨٦

## یاسای ژمارە ١٥

# دوژمنەکەت سەراپا تێک بشکێنە

### حوکم

هەموو سەرکردە مەزنەکان لە سەردەمی موسارە زانیوویانە کە دەبێ دوژمنێکی مەترسیدار بەتەواوی تێک بشکێنرێت. (هەندێ جار بە رەحمەتێکی زۆر کەیفتوویەتە ئەم ئەنجامە). ئەگەر پشکۆیەک بە گەشی بمێنێتەوە، گرنگ نییە چەندێک بە کزی داگیرسابێ، دواجار ئاگرێکی لێ هەڵدایسێت. وەستان لە نیوەی رێگە زیانی زیاتری بەهەرەوەیە لە چاو بنبڕکردنی تەواوەتی. دوژمن چاک دەبێتەوە و بەدوای تۆڵەدا وێڵ دەبێت. تێکی بشکێنە، نەک تەنیا بە جەستە بەڵکو بە رۆحیش.

### سەرپێچی لە یاساکە

هیچ رکابەرییەکی نێوان سەرکردەکان لە مێژووی چیندا ئەوەندەی ململانێی نێوان هسیانگ یو و لیو پانگ ستایش ناکرێت. ئەم دوو ژەنەراڵە ژیانی پیشەیی خۆیان بە شەڕکردن لەهەمان بەرە وەکو هاوڕێ دەستپێکرد. هسیانگ یو لە خانەدانەکان بوو، گەورە و بەهێز بوو، هارهارە، توندوتیژی و میزاج دایدەگرت، کەمێک تێگەیشتنی لاواز بوو، لەگەڵ ئەوەشدا جەنگاوەرێک بەتوانا بوو کە هەمیشە لە پێشەوەی سەربازەکانی دەجەنگا. لیو پانگ لە بنەماڵەیەکی جوتیارەوە هاتبوو. ئەو قەت سەربازێکی نموونەیی نەدەبوو و ژن و

شەڕانی پێ لە شەڕ باشتر بوو. لە ڕاستیدا ئەو لە سەمتی ناڕاستگۆکان بوو. بەڵام ئەو بیهاتوو بوو و توانای ئەوەی ناسینەوەی باشترین ستراتیژیستەکانی هەبوو، وەکو ڕاوێژکار گلی دەدانەوە و گوێبیستی ئامۆژگارییەکانیان دەبوو. ئەو لە ڕێگەی ئەم توانایانەوە لەناو سوپادا بەرزبووەوە

لە ٢٠٨ی پێش زایینەدا، پاشا (چو) سوو لەشکرێکی گەورەی ناردن بۆ گرتنی مەملەکەتی بەهێزی (چی ین). لەشکرێک لە ژێر ڕێبەرایەتی ژەنەراڵ (سونگ یی) و بە یاریدەدەریتی (هسیانگ یو) بەرەو باکوور ڕۆیشت، ئەویتر بە ڕێبەرییەتی (لیو پانگ) بەرەو (چی ین) ڕۆیشت. ئامانجەکە پایتەختی دەروشاوەی مەملەکەتەکە بوو، هسین یانگ. (هسیانگ یو)ش کە وەک هەمیشە توندوتیژ و بێ ئۆقرە بوو، نەیتوانی بەرگەی ئەو بیرۆکەیە بگرێت کە لیو پانگ پێش هەمووان بگاتە (هسین یانگ) و ئەگەری ئەوەش کە بەرپرسیارێتی فەرماندەیی تەواوی سوپا بگرێتە ئەستۆ.

لە ساتێک لە ساتەکاندا لە بەرەی باکوور، فەرماندەی هسیانگ، سونگ یی، ڕارا بوو لەوەی کە سەربازەکانی بەرامەی شەڕ بکات. هسیانگ کە تووڕە بوو، چووە ناو خێمەی (سونگ یی)، لە ناکاو لەقەڵەمیدا، سەری لێکردەوە و فەرماندەیی تاکانەیی سوپای گرتە ئەستۆ. بەبێ چاوەڕێکردنی فەرمان، ئەو بەرەی باکووری جێهێشت و ڕاستەوخۆ بەرەو (هسین یانگ) ڕێی کرد، ئەو دڵنیا بوو لەوەی کە ئەم سەرباز و ژەنەراڵێکی باشترە لە لیو، بەڵام، تەواو سەری سوڕما کە ڕکابەرەکەی، کە ڕێبەرایەتی لەشکرێکی هێزاتری بچوکتری دەکرد، توانی بەکەم کەس بگاتە (هسین یانگ). هسیانگ ڕاوێژکارێکی هەبوو بەناوی (فان تسێنگ) کە هۆشداری پێدا، "سەرۆکی ئەم گوندە، لیو پانگ، تەنیا چلێسی سامان و ژن بوو، بەڵام ئەرەنەی هاتۆتە ناو پایتەخت، سامان، شەراب، یان سێکس گومڕای نەکردووە ئەمە پیشانی دەدات کە ئەو بەرز دەڕوانێت"

فان تسێنگ، هسیانگی هاندا ڕکابەرەکەی بکوژێت بەر لەوەی زۆر درەنگ ببێت. ئەو بە ژەنەراڵی وت بانگهێشتی جوتیارە لێهاتووەکە بکات بۆ خوانێک لە کەمپەکەیان لە دەرەوەی هسین یانگ و لە گەرمەی ئاهەنگی سەمای شمشێر، سەری لێبکاتەوە

بانگهێشتەکە نێردرا. لیو کەوتە ناو تەڵەکەوە و هات بۆ خوانەکە. بەڵام هسیانگ ڕازی بوو لەوەی کە فەرمان بە ڕێکخستنی سەمای شمشێر بکات و بەهانەی ئەو کاتەی کە ئامۆژەکەی دا، لیو هەستی بە تەڵەکە کردبوو و تووانی ڕابکات. هان سینگ میری کردەوە و هاواری لێ هەڵسا بەوەی کە بنی هسیانگ تەڵەکەی لەبار بردووە، "مرۆڤ ناتوانێت لەگەڵ گەمژەیەک پلان دابنێت. لیو پانگ لەگەڵ ئەوەشدا ئیمپراتۆریەتەکەت دەدزێت و هەمووومان زیندانی دەکات".

به دیارکردن بە هەڵەکە، هسیانگ بە پەلە بەرەو هسین یانگ بەرێکەوت، ئەم جارە سوور بوو لەسەر ئەوەی سەری ڕکابەرەکەی بپەڕێنێت. لیو قەت لەوانە نەبوو شەڕ بکات کاتێک ناڕوونجەکە لەدژی دەشکایەوە و ئیتر دەستبەرداری شارەکە بوو. هسیانگ، (هسین یانگ)ی گرت، میری گەنجی (چی یی)ی کوشت و شارەکەی سووتاند. ئێستا لیو دوژمنی سەرسەختی هسیانگ بوو و ئەو بۆ ماوەی چەند مانگێک دوای کەوت، دواجار لە شارێکی دیواربەند دا گەمارۆیدا. لیو کە خۆراکی لێبڕابوو و لەشکرەکەی پەرتەوازە ببوو، تکای ئاشتی کرد.

جارێکی تر فان تسێنگ هۆشداری دایە هسیانگ "ئێستا تێکی بشکێنە! ئەگەر جارێکی تر لیکەڕێیت بڕوات، ئەوا دوایی پەشیمان دەبیتەوە". بەڵام هسیانگ بڕیاریدا بەرەیی بنوێنێت. ئەو ویستی لیو بە زیندوویی بگەڕێنێتەوە بۆ (چو) و هاوڕێی پێشووی ناچار بکات تا وەکو گەورە دانی پێدا بنێت. بەڵام فان قسەکەی ڕاست دەرچوو. لیو تووانی داوەستەکانی بۆ ملکەچبوونی وەکو ئامرازێکی خۆش پەرتکردنی مەکر بینێت و لەگەڵ لەشکرێکی بچوکدا ڕایکرد. هسیانگ، سەری سوڕما کە جارێکی تر لیکەڕا ڕکابەرەکەی بۆی دەرچێت، جارێکی تر بەدوای لیو دا ویل بوو، ئەمجارە بە گورێکی وەهاوە کە پێدەچوو شێتگیر بووبێت. لە ساتێک لە ساتەکاندا، پاش ئەوەی باوکی لیوی بە شەڕدا گرت، هسیانگ لە مەودای شەڕدا پیرە پیاوەکەی هەڵسانده سەر پێ و لەوبەر هێڵی سەربازەکانەوە هاواری کرد لیو و وتی "هەر ئێستا بەسلیم بە ئەگینا باوکت بە زیندوویی دەکوڵێنم!" لیو بە هێمنی وەڵامی دایەوە "بەڵام ئێمە برای سوێندییین. بۆیە باوکی من

لەگەڵ ئەوەشدا کە بەیتوانی ئەمە بەدی بێنێت، چارەنووسی خۆی بە کۆتا گەیاند. لیو نووشی هەمان ڕاڕایی بەدەبوو کاتێک ناڕەزوەکە پێچەوانە دەبووەوە.

ئەمە ئەو چارەنووسەیە کە ڕووبەڕووی هەموو ئێمە دەبێتەوە کاتێک هاوسۆزین لەگەڵ دوژمنانمان، کاتێک بەرەیی، یان هیوای ئاشتەوایی وامان لێدەکات پاشەکشە بکەین لە لەناوبردنیان. ئێمە تەنیا ترس و ڕقیان لە ئێمە بەهێز دەکەین. ئێمە شکستمان پێ هێناون و ئەوان ڕیسوا بوون، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە خۆراک دەدەینە ئەم مارە قین لەدڵانە کە ڕۆژێک لەر ژێان دەمانکوژن. ناکرێ دەسەڵات بەم شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. دەبێ تێکشکێنرێت، لەبنێ ببرێت، لە دەرفەتی گەڕانەوە بۆ پەیدابوونەوە بەسەر سەرمانەوە بەربەست بکرێت. ئەمە زۆر ڕاستە بۆ هاوڕێیەکی پێشوو کە بووەتە بەیرێک. ئەم یاسایە کە حوکمی دوژمنایەتییە کوشندەکان دەکات، دەڵێت: ئاشتەوایی لە دەرەوەی پرسیاردایە تەنیا یەک لایەن دەتوانێت بباتەوە و پێویستیشە بردنەوەکە سەراپاگیر بێت

لیو پانگ باش ئەم وانەیە فێر بوو. پاش شکست پێهێنانی هسیانگ یو، ئەم کوڕە جوتیارە بەردەوام بوو لەوەی ببێتە فەرماندەی باڵای لەشکرەکانی (چوو). پاش تێکشکاندنی ڕکابەری دواتری- پاشای (چوو)، سەرکردەی پێشووی خۆی- تاجی ئیمپراتۆری لەسەر نا، هەموو ئەوانەی ڕامالی کە لەسەر ڕێگاکەی بوون و وەکو یەکێک لە مەزنترین فەرمانڕەواکانی چین ناوی چووە مێژووەوە، ولە هان کاو- تسوی دامەزرێنەری سیلسیلەی (هان).

*ئەوانەی کە سۆزاجی بەدەسهێنانی شتەکان دەکەن دەبی بەرەبی پیشان بەدەن*

*کۆتیلیا، فەیلەسوفی هیندی، سەدەی سێیەمی پێش زایین*

## بەڕەوپکردن لە پاسکە

(ووچاو) کە لە ٦٢٥ی زایینیدا لەدایک بوو، کچی توکێک بوو و وەکو ژنێکی گەنجی جوانی سیحراوی ، بەم پێیە بەسرایەوە بە حەرەمی ئیمپراتۆری حەرەمی (تای تسونگ)

حەرەمە ئیمپریالییەکە شوێنێکی ترسناک بوو، پڕ بوو لە کەنیزەکی گەنج کە کێبڕکێیان دەکرد بۆ بوون بە دڵخوازی ئیمپراتۆر. جوانی و کارەکتەری بەکێشکەری (وو) بەخێرایی بووە هۆی بردنەوەی ململانێکە، بەڵام بە زانینی ئەوەی کە ئیمپراتۆریش، وەکو پیاوە دەسەڵاتدارەکانی تر ڕیندەوەری هەوەسە و دەشێ بە ئاسانی جێگۆڕکێی پێ بکرێت، چاوی بڕیە ئایندە،

(وو) بڕیاریدا سەر فریودانی کوڕە هەرزەکەی ئیمپراتۆر، کاو تسونگ، لە تاکە بژاردەیەکی مومکیندا کاتێک ئەو تووانی بەتەنیا بیدۆزێتەوە. کاتێک خەریکی میز کردن بوو، بەمشێوەیەش، کاتێک ئیمپراتۆر مرد و کاو تسونگ لەسەر تەخت دانیشت، هێشتا ئەو ژنە بەدەست ئەو چارەنووسەوە دەیناڵاند کە هەموو هاوسەرەکان و کەنیزەکانی ئیمپراتۆرێکی مردوو بە نەریت و یاسا پێیەوە بەسترابوون. بە سەری تاشراوەوە، چووە ناو پەرستگەیەک، شوێنێک کە وا دادەنرا تەواوی ژیانی تیادا بەسەر ببات. بۆ ماوەی حەوت ساڵ (وو) پیلانی ڕاکردنی دانا. بەپەیوەندیکردنی نهێنی لەگەڵ ئیمپراتۆرە نوێکەدا و هاوپەیمانیکردنی ژنەکەی، ئیمپراتۆرە، توانی فەرمانێکی شاهانەی نائاسایی بەدەست بهێنێت کە ڕێگەی پێدەدا بگەڕێتەوە بۆ کۆشک و بۆ حەرەمی شاهانە. کە گەیشتەوە ئەوێ، مەرایی بۆ ئیمپراتۆرە کرد، لەکاتێکدا کە هێشتا لەگەڵ ئیمپراتۆر دەخەوت. ئیمپراتۆرە بەرانبەر ئەمە نەیدەڕواندەوە - ئەو هێشتا دەبوویە میراتگرێک بۆ ئیمپراتۆر دابین بکات، پێگەکەی هەستیار بوو و (وو) هاوپەیمانێکی بەنرخ بوو

لە ٦٥٤ی زایینی (وو) منداڵێکی بوو. ڕۆژێکیان ئیمپراتۆرە هاتە دیدەنی و هەر کە ڕۆیشت، (وو) ساواکەی لەنێوبرد - منداڵەکەی خۆی. کاتێک کوشتنەکە ئاشکرا بوو، دەستبەجێ گومان کەوتە سەر ئیمپراتۆرە، کە پێش چەند ساتێک لە شوێنەکە بوو و کە سروشتی ئیرەییبەری بەلای هەمووانەوە ڕوون و ئاشکرا بوو. ئەمە ڕێک پلانی (وو) بوو. دوای بە ماوەیەکی کورت، ئیمپراتۆرە بە کوشتن تۆمەتبار کرا و لەسێدارە درا. (وو چاو) لە شوێنی ئەو تاجی ئیمپراتۆرەی لەسەر نرا. مێردە تازەکەی، مرچکی بە ژیانی چێژ و خۆشی

ئەوەوە گرت، بە خۆشحاڵییەوە جڵەوی حکومەتی بۆ (وو چاو) بەرد، کە بەوە بەدو وەکو ئیمپراتۆرە (وو) ناسرا.

هەرچەندە ئێستا لە پێگەی دەسەڵاتێکی بەهێزدا بوو، (وو) بە رەحمەت هەستی بە سەلامەتی دەکرد. دوژمن لەهەموو شوێنێك هەبوون. ئەو بەیدەتوانی بۆ ساتێکیش پارێزگاریی لەسەر خۆی لا ببات. لە ڕاستیدا، کاتێك ئەو تەمەنی چل و پێنج ساڵ بوو، ترسی ئەوەی لێ نیشت کە خوشکەزا گەنجە جوانەکەی ستتە دڵخوازی ئیمپراتۆر. ئەو ژنەکەی بە فرێنکی کە تێکەڵ بە خواردنەکەی کرد، ژەهراوی کرد. لە ٦٧٥دا، کوڕەکەی خۆی، کە پێدەچوو وەکو میراتگرێك بهێنرێتە پێشەوە، ژەهراوی کرا. گەورە کوڕی دوتر ـ شەرعی، بەڵام ئێستا میری جێنشین بوو ـ بە تۆمەتی هەڵبەستراو بوایی دەربەدەر کرا. کاتێکیش کە ئیمپراتۆر مرد، لە ٦٨٣دا، (وو) نیوانی و مکریت کە دوایی بە دەگومەجەو بۆ تاج ڕابگەیەنرێت. هەموو ئەمە بەو مانایە بوو کە ئەوە گەنجترین و کاریگەرترین کوڕی ئەو بوو کە دوچار بووە ئیمپراتۆر. بەم شێوەیە ئەو بەردەوام بوو لە حوکمڕانی.

بەدرێژایی پێنج ساڵی دواتر چەندەها کودەتای تر لە کۆشکدا لە ئارادا بوون. بەهاتنی ٦٨٨ کەس بەم تەحەدای (وو) نەکات. ئەو خۆی وەکو وەچەی خودایی بودا لەقەڵەم دا و بە ٦٦٩دا میواکانی بۆ دواجار هاتنە دی. ئەو ناوی ئیمپراتۆریی (پیرۆز) و (خودایی) چینی (وو) بووە ئیمپراتۆر چونکە بەمانای وشە لە سیلسیلەی (تانگ)ی پێشوو کەس نەبوو. بەشێوەیە ئەو بەشێوەیەکی تەحەدانەکرو، بۆ ماوەی دەیەیەکی ئاشتی ڕێژەیی حوکمی کرد. لە ٧٠٥ی زاییندا، لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا، ناچار کرا واز بە تەختی ئیمپراتۆری بێنێت.

## لێکدانەوە

هەموو ئەوانەی ئیمپراتۆرە (وو)یان دەناسی، سەیری ورە و هۆشمەندییان کردووە. لەو سەروەختەدا، هیچ شکۆیەك بۆ ژنێکی چاوچنۆك لە چەند ساڵێك ڕێبەر لە حەرەمی ئیمپریالیدا نەبوو، کە پاشان نەمەنێك لە پشت پەرستگانەکەوە دیواربەند دەکرا. بە

ڕاببوونی پەمتا پەمتا بەڵام بەرچاوی (وو)دا بۆ ترۆپک، قەت ساوپلکە نەبوو ئەو دەیزانی کە هەر سوورشەک، هەر لاوازییەکی کاتی، کۆتاییەکەی ڕاس دەکات ئەگەر، هەر جارێک کە لە ڕکابەرێک تووشار دەبوو و دابەبەکی تار ە دەردەکەوێت، چارەسەرەکە ئاسان بوو دەبووایە هەموویان تێکبشکێنێت یان ئەوەتا خۆی بکوژێت ئیمپراتۆرەکانی تری پێش ئەو هەمان ڕێڕەویان بەرەو لوتکە گرتبووە بەر، بەڵام (وو) کە، وەکو ژن کە مریکە ئەستەم بوو دەسەڵات بەدەست بێنێت– دەبووایە دڵڕەقتریش بێت

حوکمڕانی چل ساڵەی ئیمپراتۆرە (وو) یەکێک بوو لە درێژترین حوکمڕانییەکان لە مێژووی چیندا هەرچەندە چیرۆکی ڕابوونی خوێناوی ئەو بۆ سەر دەسەڵات باش زانراوە، لە چین ئەوە یەکێک لە حوکمڕانە هەرە کاریگەر و بەتواناکانی سەردەمەکە دادەنرێت

قەشەیەک پرسیاری لە دەوڵەتمەدار و ژەنەراڵی ئیسپانی، ڕامۆن ماریا ناڤاریز (١٨٠٠–١٨٦٨) کرد کە لە گیانەلادا بوو، "ئایا حەزناکەیت هەموو دوژمنەکانت دەبەخشیت؟" ناڤاریز لە وەڵامدا وتی "پێویست ناکات دوژمنەکانم ببەخشم، هەموویانم کوشتووە"[1]

## کلیلی دەسەڵات

ڕێکەوت نییە کە دوو چیرۆک کە شرۆڤەی ئەم یاسایە دەکەن لە چینەوە دێن مێژووی چین پڕە لە نموونەکانی ئەو دوژمنانەی کە بە زیندوویی هێڵراون گەڕاونەتەوە بۆ سەرکردنە سەر کابرای بەبەزەیی. "دوژمن تێکبشکێنە" مێرواوەریکی ستراتیژیی گرنگی سون–تزوی نووسەری (هونەری جەنگ)ی سەدەی چوارەمی پێش زایینە ئایدیاکە سادەیە دوژمنەکانت هیواخوازی خراپەت بەسەر بێت هیچ شتێک نییە ئەوان بیانەوێ جگە لە لەنێوبردنت ئەگەر لە ملململانێکانتدا لەگەڵ ئەوان، لە نیوەی ڕێگە یان تەنانەت لە سێ چارەکی ڕێگەدا بوەستیت، چ لە ئەنجامی بەزەیی هاتنەوە یان هیواخوازی یان ئاشتەواییکردن، تەنیا مکوڕتر، دڵڕەقتریان دەکەیت و ئەوان ڕۆژێک دێت تۆڵە بکەنەوە لەوانەیە ئەوان بۆ ماوەیەکی کاتی دۆستانە ڕەفتار بکەن، بەڵام ئەمە تەنیا لەبەرئەوەیە کە

تێ شکستت پێهێناون. ئەوان هیچ بژاردەیەکیان نییە جگە لەوەی کە چاوەڕوانی کاتی خۆیان بکەن.

چارەسەرەکە، بەزەبیت نابێت. دوژمنانت سەراپا تێکبشکێنە وەك چۆن ئەگەر ئەوان بۆیان بلوایە وەهایان دەکرد. سەرەنجام تاکە ئاشتییەك یان ئەمنیەتێك کە تۆ دەتوانیت هیوای بۆ بخوازیت لە دوژمنانت، لەنێوچوونیانە.

ماوسی تۆنگ، خوێنەری ڕۆژی سون- تزو و مێژووی چین بەگشتی، گرنگی ئەم یاسایەی دەزانی. لە ١٩٣٤دا، سەرکردە کۆمەنیستەکە و ٧٥,٠٠٠ سەربازی کەم چەك و تەقەمەنی بەرەو شاخە لاتەریکەکانی خۆرئاوای چین ڕایانکرد بۆ قوتار بوون لە سوپای گەورەی (چیان کای شێك) لە شتێکدا کە ئەو کاتە پەڕاوە ماوەرا ڕێکردنی درێژ.

چیانگ سوور بوو لەسەر بنبڕکردنی دوایین کۆمەنیست و دوای چەند ساڵێك ماو کەمتر لە ١٠,٠٠٠ سەربازی بەدەستەوە مابوو. لە ڕاستیدا بەهاتنی ١٩٣٧، کاتێك چین لەلایەن ژاپۆنەوە گیرا، چیانگ مەزەندەی ئەوەی کرد کە چیتر کۆمەنیستەکان هەڕەشەیەك نابن. ئەو بڕیاریدا دەستبەرداری ڕاوەدونانەکە ببێت و تەرکیز بخاتە سەر ژاپۆنییەکان. دە ساڵ دواتر کۆمەنیستەکان بایی پێویست هاتبوونەوە سەر خۆیان بۆ بەزاندنی سوپاکەی چیانگ. چیانگ زیرەیی کۆنی تێکشکاندنی دوژمنی بیر چووبۆوە. ماو بیری نەچووبووەوە. چیانگ ڕاوەدونرا تا ئەو کاتەی کە ئەو و سەراپەی سوپاکە بۆ دوورگەی تایوان ڕایانکرد. تا ئەمڕۆ هیچ شتێك لە ڕژێمەکەی لەسەر خاکی چین نەماوەتەوە.

زیرەیی پشت "تێکشکاندنی دوژمنەکەت" ئەوەندەی کتێبی پیرۆزی مەسیحییەکان کۆنە. لەوانەیە یەکەمین پیادەکاری موسا بووبێت، کە لە خوداوە فێری بوو، کاتێك دەریای سووری بۆ جوولەکان کەرت کرد پاشان لێگەڕا ئاوەکە بگەڕێتەوە جێی خۆی و بەسەر ئەو میسرییانەدا بڕژێت کە بەدوایانەوە بوون بۆئەوەی "تاکە کەسێکیان لێ نەمێنێت". کاتێك موسا بە دە فەرمانەکەوە لە شاخی سینا گەڕایەوە و بۆی دەرکەوت خەڵکەکەی گوێرەکەی ئاڵتونی دەپەرستن، دوایی تاوانکاری بە کوشتدا. ڕێك پێش ئەوەی کە بمرێت، کە دواجار خەریك بوو دەچوونە ناو خاکی بەڵێندراو، بە شوێنکەوتووانی وت

"هەمووی تێکیان بشکێنن، هیچ ڕێککەوتنێکیان لەگەڵدا مەکەن و هیچ بەزەییەکیان پیشان مەدەن"

ئامانجی سەرکەوتنی تەواوەتی بەشێکی جەنگی مۆدێرنە و لەلایەن کارل ڤۆن کلاوسویتزی فەیلەسوفی جەنگ کراوەتە یاسایەکی وەها. بە شیکردنەوەی کەمپەینەکانی ناپلیۆن، ڤۆن کلاوسویتز دەنوسێ " ئێمە بانگەشەی ئەوە دەکەین کە دەبێ تێکشکاندنی پشتەوەی هێزەکانی دوژمن هەمیشە لەبەرچاوگرتنێکی زاڵ بێت... هەر کە سەرکەوتنی گەورە بەدەست هات دەبێ قسەیەک لەسەر پشوو، پشتێی هەناسەدان نەبێت، بەڵکو تەنیا لەسەر سوراخکردن و وێڵ بەدوای دوژمن، گرتنی پایتەختەکەی، هێرشکردنە سەر یەدەگەکانی و هەر شتێکی تر هەبێت کە دەشێ یارمەتیدەر و ئاسودەبەخش بێت بۆ وڵاتەکەی" هۆکار بۆ ئەمە، ئەوەیە کە پاش جەنگ، دانوستان و دابەشبوونی خاک دێت. ئەگەر تۆ تەنیا سەرکەوتنێکی بەشەکیت بەدەستهێنا، بەشێوەیەکی حەتمی لە دانوستاندا ئەو شتە لەدەست دەدەیت کە بەهۆی جەنگەوە بەدەستت هێناوە.

چارەسەرەکە سادەیە. هیچ بژاردەیەک بۆ دوژمنانت مەهێڵەرەوە. بنبڕیان بکە و سەرزەمینەکەیان هی تۆیە. ئامانجی دەسەڵات بریتییە لە کۆنترۆڵکردنی دوژمنەکانت بەشێوەیەکی تەواوەتی، ئەوەیە وەهایان لێبکەیت بەتەواوەتی پەیڕەوی لە ئیرادەت بکەن. تۆ ناتوانیت ڕێگەی پێشتنی نیوەی ڕێگە بگریت. ئەگەر ئەوان بژاردەیان لەبەردەمدا نەبێت، ئەوا ناچار دەبن بە قسەی تۆ بکەن. ئەم یاسایە لەودیو شەڕگەشەوە پیادە دەکرێت. دانوستان مارێکی گەورەی شاراوەیە کە سەرکەوتنەکەت قوت دەدات، بۆیە هیچ شتێک مەدە دوژمنانت بۆ دانوستان، هیچ هیوایەک، یاساییەکیان مەدەیە بۆ مانۆڕکردن. ئەوان تێکشکاون و هیچی تر.

درک بەمە بکە. لە ململانێیدا بۆ دەسەڵات تۆ ڕکابەریی دەوروژێنیت و دوژمن دروست دەکەیت. خەڵکێک دەبێ کە تۆ ناتوانیت بەسەریاندا سەرکەوتوو بیت، کە گرنگ نییە چی دەبێ یان نابێ؛ هەر دوژمنی تۆ دەبن. بەڵام تووڕەیی هەر برینێکیان مەکە، بە ئەنقەست بێت یان نا، ڕق و کینەیان بە شەخسی وەرمەگرە. تەنیا ئەوە بزانە کە هیچ ئەگەرێکی

ئاشتی لەنێوان ئێوەدا نییە، بەتایبەت تا ئەو حەددەی کە تۆ لە دەسەڵاتدایت. ئەگەر بۆ ڕێگەمان بدەیت هەر بمێنێ، ئەوا بەدوای تۆڵەدا وێڵ دەبێ، وەکو چۆن شەو بەدوای ڕۆژدا وێڵە.

وتە: مارێك لەژێر پێکانتدا پلیشاوەتەوە بەڵام بە زیندوویی جێ هێڵراوە، قوت دەبێتەوە و بە ژەهرێکی زیاترەوە پێت وەدەدات. دوژمنێك کە وازی لێهێنراوە وەکو مارێکی نیوە زیندوو وایە کە چاك دەبێتەوە. کات وەها لە ژەهرەکە دەکات کاریگەرتر بێت.

دەسەڵات: لەبەرئەوەی دەبێ تێبینی ئەوە بکرێت کە دەبێ پیاوان دەست بەسەریاندا بهێنرێت یان بنبڕ بکرێن. ئەوان تۆڵەی خۆیان لەبەرامبەر برینە بچووکەکان دەکەنەوە، بەڵام بۆ برینە گەورەکان ناتوانن ئەمە بکەن. بۆیە دەبێ ئەو برینەی بەسەر کەسێکی دێنین وەها بێت کە ترسی تۆڵەکردنەوەیمان نەبێت.

(نیکۆلۆ ماکیاڤیللی، ١٤٦٩–١٥٢٧)

## پێچەوانەبوونەوە

دەبێ ئەم یاسایە زۆر بە دەگمەن فەرامۆش بکرێت، بەڵام هەندێ جار وا ڕێدەکەوێت کە باشترە ڕێگە بە دوژمنانت بدەیت خۆیان لەنێو ببەن، ئەگەر شتێکی وەها مومکین بێت، لەبری ئەوەی کە بە دەستی تۆ ئازار بچێژن. لە جەنگدا، بۆ نموونە، ژەنەراڵێکی باش دەزانێت ئەگەر ئەو هێرش بکاتە سەر سوپایەك کاتێك گەمارۆ دراوە، سەربازەکانی توندتر دەجەنگن. بۆیە هەندێ جار وا باشترە ڕێڕەوێکی ڕاکردنیان بۆ بهێڵیتەوە، بۆ دەرچوونیان. لەکاتێکدا کە ئەوان پاشەکشە دەکەن، بڕستیان لەخۆیان دەبڕن و سەرەنجام مەعنەویاتیان بە پاشەکشە دادەبەزێت زیاتر لە هەر شکستێك کە لەوانەیە لە شەڕگەدا تووشی ببن. کەوابە کاتێك تۆ دەستت کەسێکت سەری بە پەنەکەوەیە، بەڵام هیچ شانسێکی دەرچوونی نییە — دەشێ تۆ ڕێگە بدەیت خۆیان هەڵواسن. ڕێگە بدە بکەرانی لەنێوبردنی خۆیان بن. ئەنجامەکە هەمان شت دەبێت و تۆ نیوەوەندە هەستی خراپت نابێت.

لەکۆتاییدا، هەندێ جار بە تێکشکاندنی دوژمنەکەت، تۆ ئەوەندە موورەیان دەکەیت کە ئەوان سالانێک بە پیلانی تۆڵەسەندنەوە بەسەر دەبەن بەپەیمانەی ڤێرسای کاریگەرییەکی وەهای لەسەر ئەڵمانەکان هەبوو. هەندێکیان بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە کە لە دووریمەودا دا، وا باشترە هەندێ نەرمی پیشان بدەیت. کێشەکە ئەوەیە کە، نەرمیی تۆ سەرکێشییەکی تر دەگرێتە خۆ- لەوانەیە ئەمە دوژمن بەهێز بکات، کە هێشتا حەزی مات داوە، بەڵام ئێستا پاشماوەکی تێشکردنی هەیە. تەقریبەن هەمیشە وەها زیرەکترە کە دوژمنەکەت تێک بشکێنیت، بەڵام هەروا بە ساناییی جارێکی تر تێکیابشکێنەوە

## یاسای ژمارە ١٦

# خۆونکردن بەکاربێنە بۆئەوەی ڕێز و پێزانینت زیاتر ببێت

### دۆکە

*زۆر دەرکەوتن و هاتن و چوون نرخەکە دەهێنێتە خوارەوە. چەندەی زیاتر ببینرێیت و لەبارەتەوە ببیستن، ئەوەندە ئاساییتر دیار دەبیت. ئەگەر تۆ هەنوکە لە گروپێکدا ڕەگت داکوتاوە، کشانەوەی کاتی لێی وەهات لێدەکات کە قسەی زیاترت لەبارەوە بکرێت و تەنانەت پەسەندتر بیت. دەبێ تۆ فێر بیت چ کاتێک بڕۆیت. لە ڕێگەی دەگمەنییەوە بەها دروست بکە*

### سەرپێچی و پەیڕەوی لە یاساکە

سێر گویلۆم دی بالون شاعیرێک بوو کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە باشووری فەرەنسا دەهات و دەچوو، لە قەڵایەکەوە دەچووە قەڵایەکی تر، شیعری دەگوت و سوارچاکێکی بێزمیکتی دەنواند. لە قەڵای جافیاک چاوی بە خانمێکی جوانی ماڵەکە کەوت و کەوتە داوی عەشقەوە، ناوی مادام گوێلێلما دی جافیاک بوو. ئەو گۆرانییەکانی بۆ ئەو وت، شیعری بۆیا هەڵگوت، شەترەنجی لەگەڵ کرد و پەیتا پەیتا ئەویش بە نۆرەی خۆی عاشقی بوو. گوێلۆم هاوڕێیەکی هەبوو بەناوی سێر پیەر دی بارجاک کە لەگەڵیدا سەفەری دەکرد و

شکۆبەکەی لەدەستداوە، ئەو نەک تەنیا چیتر لە پلانەکەی دڵنیا نەبوو، بەڵکو چیتر بە نامەکەشی دڵنیا نەبوو

دوجار، پاش چەند مانگێکی بەدەستی هەواڵ لە گونتەوە، گوللێلما وای زانی ئەو چیتر نامەبەری نەناردن و ئەمیش دەستیکرد بە بیرکردنەوە- لەوانەیە پەستت بووبێت؟ لەوانەشە پلانەکە بەرامبەر کاری خۆی کردبێت؟ ئەگەر وەها بێت زۆر باشترە. ئەو چیتر چاوەڕوان نەدەبوو- کاتی ئاشتەوایی هاتبوو. بۆیە ئەو باشترین ڕۆبی کردە بەر خۆی، ئەسپەکەی بە خێراترین شێوە زین کرد، کڵاوخودەیەکی نایابی لەسەرنا و بەرەو هالاند کەوتە ڕێ

بە بیستنی ئەوەی کە عاشقەکەی گەڕاوەتەوە، گوللێلما بە هەڵەداوان ڕۆیشت بۆ بینینی، لەبەردەمیدا چۆکی دادا، ڕووپۆشەکەی لادا تا ماچی بکات و پاڕایەوە بۆ لێخۆشبوون لەبەرامبەر هەرچییەک کە بووبێتە هۆی توڕەبوونی. وێنای سەرگەردانی و نائومێدییەکەی بکە- پلانەکەی زۆر بەخراپی شکستی هێنابوو. ئەو توڕە نەبوو، ئەو قەت توڕە نەبوو، ئەو تەنێ فرۆلێر ڕۆچووبووە ناو خۆشەویستییەوە و پیاوەکەش قەت ئەزموونی خۆشی ئاشتبوونەوەی پاش دەمەقاڵێی نەدەکرد. ئێستا کە وەها ئەوی بینی و هێشتا دەستەوەستان بوو لە تامکردنی ئەو خۆشییە، بڕیاریدا جارێکی تر هەوڵ بدات. بە قسەی ڕەق پالیبا و ئاماژەی هەڕەشە ئامێزی بەشێدا. جام ڕۆیشت، ئەمجارە سوێندی خوارد قەت جارێکی تر نەیبینێتەوە

نەیانی دوای شاعیرەکە پەشیمان بووە لەوەی کردبووی. ئەو گەڕایەوە بۆ هالاند، بەڵام جام پێشوازی لێ نەکرد و فەرمانی بە خزمەتکارەکانی دا دووری بخەنەوە. گریلوم ڕایکرد. کە چووە ناو ژوورەکەی کەوت و دەستیکرد بە گریان. ئەو هەڵەیەکی گەورەی کردبوو. بەدرێژایی ساڵی دواتر، بەهۆی ئەوەی نەیتوانی جامەکەی ببینێت، وشووێنکی هەمناکی ئەزموون کرد کە کە تەنیا خۆشەویستی گڕ دەدا. ئەو یەکێک لە قەسیدە هەرە جوانەکانی نووسی، "گۆرانی من بەدەم بیرکردنەوە بۆ بەرەیی ڕۆدەچێت" و ئەو نامەی ڕووی بۆ گوللێلما ناردن و ڕووی کردەوە چی کردووە، و بۆ لێخۆشبوون پاڕایەوە

ماڵی ئەمە، خاتو گوێلینا بە هێمانەوەیادی گۆرانییە جوانەکەی ئەو، فۆرمەکەی و شارەزامەندییەکەی لە سەماکردن و پەروەردەکردنی ماردا، هەستی بە نامەڕوایییەک کرد بۆ گەڕانەوەی. وەکو سزایەک بۆ دڵڕەقییەکەی، فەرمانی پێدا مینۆکی پەنجە بۆنەی دەستی ڕاستی دەربچێت و لەگەڵ قەسیدەیەکدا بۆی بنێرێت کە تیایدا باسی نەگبەتییەکانی بکات.

ئەو بە قسەی خاتونی کرد. دواجار گوێلۆم توانی ئاشی هەستی سەرەنجام بکات- ئاشتەواییەک کە ئەمەش لە هی پەیەری هاوبەش تێپەڕی کرد.

## لێکدانەوە

بە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی خۆشییەکانی ئاشتبوونەوە، گوێلۆم دی مالۆن بەبێ مەبەست حەقیقەتی یاسای ونبوون و ئامادەبوونی ئەزموون کرد. لە سەرەتای پەیوەندییەکی سۆزیدا، دەبێ تۆ ئامادەبوونت لەچاوی ئەویتردا جێ بکەیتەوە. ئەگەر تۆ زوو خۆت ون بکەیت ئەوا لەوانەیە بیر بچیتەوە. بەڵام هەر کە هەستەکانی خۆشەویستەکەت دەرگیر بوون، و هەستی خۆشەویستی بەرجەستە بوو، ونبوون گڕ دەدات و دەهێنێتە جۆش. بەدەستەوە نەدانی هۆکار بۆ ونبوونت ئەمانەت جۆشێکی زیاتری بەدوادێ. کەسەکەی تر وابیردەکات کە ئەو لەهەڵەدایە. لەکاتێکدا کە تۆ دووریت، ڕێنای خۆشەویستەکە باڵ دەگرێت و خەیاڵێکی وەحۆش هاتوو ئەویا خۆشەویستی بەهێزتر دەکات. بە پێچەوانەوە، چەندەی گوێلینا سزادانی گوێلۆمی کرد، ئەوەندە کەمتر خۆشی ویست- ئەو ئامادەییەکی زۆر بوو، زۆر ئاسان دەبینرا، هیچ بۆشاییەکی بۆ وێنا و خەیاڵەکەی ئەو نەهێشتەوە، بۆیە هەستەکانی ئەو دەمرکان. کاتێک بۆ دواجار خاتو چیتر نامەیەکی نەناردن، ئەو توانی جارێکی تر هەناسەیەک هەڵمژێت و بگەڕێتەوە بۆ سەر پلانەکە

پێدەچێت ئەو شتەی دەکشێتەوە، ئەوەی کە دەمێنێتە دەگمەن، لەپڕێکدا شایستەی ڕێز و پێزانینمان بێت. ئەوەی کە زۆر دەمێنێتەوە، پڕمان دەکات لە ئامادەبوونی، وامان لێدەکات بە سوک بیبینین. لە سەدەکانی ئارەپەرستی، خانمان بە بەردەوامی سوارچاکەکانیان دەخستە ژێر تاقیکردنەوەی خۆشەویستی، بە گەشتی سەخت و درێژ

ڕەوانەیان دەکردن- هەموویشی بۆ دروستکردنی ڕیساپەکی وسبوون و ئامادەبوون لەراستیدا، ئەگەر گوپلێم هەر لەسەرەتاوە جامەکەی جی بەهێشتایە، لەرامەبور ناچار بووایە دووری بخاتەوە و خۆی وسووسیك دروست بکات

*وسبوون سلوزە لاوەکییەکان کەم دەکاتەوە و سلوزە گەورەکان گڕ دەدات، وەك چۆن با مۆمێك دەکوژێنێتەوە و ئاگرێك دابگیرسێنێت*

*لا ڕۆشفۆکۆڵد*، ١٦١٣–١٦٨٠

## پەیڕەویکردن لە یاساکە

بۆ ماوەی چەند سەدەیەك ئاشوورییەکان بە مشتەکوڵەی ئاسنین حوکمی بەشی سەرووی ئاسیایان کرد. لە سەدەی هەشتەمی پێش زایینیدا، خەڵکی میدیا (کەئێستا لە باکووری خۆرئاوای ئێران نیشتەجێن) بەدژیان هەڵگەڕانەوە و دوجار ئازاد بوون. ئێستە کە میدیەکان دەبووایە حکومەتێکی نوێ بونیاد بنێن. ئەوان کە سوور بوون لەسەر هە جۆرە فۆرمێکی ئاکرەوی، ڕەتیانکردەوە دەسەڵاتی کۆتایی بدەنە تاکە کەسێك یان پاشایەتی بونیاد بنێن. لەگەڵ ئەوەشدا، بەبێ سەرکردەیەك، وڵاتەکە بەرووبی دەکەوتە ناو ئاژاوە و بۆ چەند مەملەکەتێك پارچەپارچە دەبوو کە تیایدا گوند لە دژی گوند دەجەنگا

لە گوندێکی وەهادا پیاوێك دەژیا بەناوی دیۆسیس کە لە ڕێگەی مامەڵەی دادپەروەرانە و توانای هەڵبژاردنی دکۆکییەکان ناویکی بۆ خۆی دروستکرد

ئەو زۆر بە سەرکەوتوویی ئەمەی کرد کە هەر ململانێیەکی یاسایی بەرووبی دەکەوتە لای ئەو، و دەسەڵاتی ئەو زیادیکرد. لە سەرانسەری سەرزەمینەکە، یاسا سوك بوو- دادوەران گەندەڵ بوون و کەس چیتر کەسەکانی سپاردەی دادگا نەدەکرد، لەبری ئەمە پەنای دەبردە بەر توندوتیژی. کاتێك هەواڵی ژیریی دیۆسیس بڵاو بووەوە و دەنگۆی ئەوە پەیدا بوو کە کەسێکە لەو نابێت، گەندەڵ نابێ و بێلایەنە، گوندەکانی میدی بە لێشاو ڕوویان تێکرد بۆ هەڵبژاردنی هەموو جۆرە کەیسێك. بەرووبی ئەو بووە تاکە نێوانگیری دادپەروەری لەسەرزەمینەکەدا

بە دوای ئەوەدا دەسەڵاتیدا، دیۆسیس لەبەرئەوە بڕیاریدا نابێ پێویستی کاری خۆی کردبوو

ئەو چیدی لەسەر کورسی دادوەری دانەدەنیشێت، چیتر گوێی لە سکاڵاکان نەگرت، چونکە

دادگاییەکانی بێزار بوو و بوو، گوندو گوندی هەڵمەتی. سکاڵای ئەوەی کرد کە کاتێکی

ئەوەندە بە دەست و پەنجە نەرمکردنی بە کێشەکانی خەڵکی تر بەسەر دەبات کە ئیش و

کاری خۆی فەرامۆش کردووە، ئەو خاوەنشتی بوو وڵاتەکە جارێکی تر کەوتەوە ناو ئاژاوە

و بەشێوەی لەگەڵ گشتیەوەی لەبری بتوانگیرێکی بەهێزی وەکو دیۆسیس، ئاژاوە پەرەی

سەند و یاسا پێشێل بوو. میدییەکان کۆبوونەوەیەکی هەموو گوندەکانیان ئەنجامدا بۆ

ئەوەی بڕیار چۆن لەو ئەنگژەیە خۆیان قوتار بکەن. سەرۆک هۆزێک وتی "ئێمە ناتوانین

لەژێر ئەم هەلومەرجەدا لەم وڵاتەدا بژین. با یەکێک لەنێو خۆماندا هەڵبژێرین حوکم بکات

بۆئەوەی بتوانین لەژێر حکومەتێکی ڕێکوپێکدا بژین، نەک ئەوەی لەم پەشێوییەدا ماڵ و

حاڵمان بەتەواوی لەدەست بدەین"

بەمشێوەیە، سەرباری هەموو ئەوەی میدییەکان لەژێر تەگرەوی ئاشوورییەکاندا

بەدەستییەوە دەیانناڵاند، بڕیاریاندا پاشایەتییەک بونیاد بنێن و پاشایەت دیاری بکەن

هەڵبەت ئەو پیاوەش کە دەیانویست حوکم بکات دیۆسیسی دادپەروەر بوو. ئەو قایلکردنی

قورس نەبوو، چونکە چیتر نەیدەویست خۆی تێکەڵی شەڕ و کێشەی نێوخۆیی گوندەکان

بکات. بەڵام میدییەکان پاڕانەوە- نەبێ ئەو وڵاتەکەوتووە ناو دۆزەخێکی بێ یاساییەوە،

دیۆسیس بۆ دواجار ڕازی بوو

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەهەمان شێوە مەرجێکی سەپاند. کۆشکێکی گەورەی بۆ بونیاد

دەنرێ، پاسەوانی بۆ دادەنران و شارێکی پایتەختی بۆ بونیاد دەنرا کە بتوانێ لێیەوە

حوکم بکات. هەموو ئەمە کرا و دیۆسیس لە کۆشکەکەیدا جێگیر بوو. لە سەنتەری

پایتەختدا، کۆشکەکە بە دیوار دەورە درابوو و بەتەواوی لە خەڵکی ئاسایی دابڕابوو

پاشان دیۆسیس مەرجەکانی حوکمی خۆی خستەڕوو. داواکردنی بینینی قەدەغەبە

پەیوەندی لەگەڵ پاشا تەنها لە ڕێگەی نامەبەرەکانەوە مومکین بوو. کەس لە دەرەوەی

خاوانە نەیدەتوانی لە هەفتەی جارێك زیاتر بیبینێت و ئەمەش تەنها بە مۆڵەت وەرگرتن دەبوو

دیۆسیس بۆ ماوەی پەنجاوسێ ساڵ حوکمی کرد، ئیمپراتۆریەتی میدی فراوانکرد و بناغەی بۆ ئیمپراتۆریەتی دواتری فارس لەژێر فەرمانڕەوایی (کورەش)ی نەوەی نەوەکەی دانا. بەماوەی حوکمڕانی دیۆسیسدا، ڕێزی خەڵك بۆ ئەو پەیتا پەیتا گۆڕا بۆ شێوەیەکی پەرستن. بە بڕوای ئەوان، ئەو تەنیا مرۆڤێك نەبوو بەڵکو کوڕی خودا بوو

## لێکدانەوە

دیۆسیس پیاوێکی ئەوجێکی گەورە بوو. ئەو زوو بڕیاریدا لەسەر ئەوەی کە وڵاتەکە پێویستی بە فەرمانڕەوایەکی بەهێزترەیە و ئەو پیاوی ئیشەکەیە.

لە وڵاتێکدا کە ئاژاوەی ئانارشی لێیدابوو، بەهێزترین پیاو دادوەر و نێوانگیرەکە بوو بۆیە دیۆسیس کارەکەی خۆی بەوە دەستپێکرد کە ناوبانگی وەکو پیاوێکی دادپەروەری بێ هاوتا دروست بکات

لە لوتکەی دەسەڵاتدا وەکو دادوەر، دیۆسیس درکی بە حەقیقەتی یاسای ونبوون و ئامادەبوون کرد. بە حورمەتکردنی خەڵکێکی زۆر کە دەهاتنە لای، ئەو بووە کەسێکی بەرچاو و ئەو ڕێزەی لەدەستدابوو کە پێشتر بەدەستیهێنابوو. خەڵکی حورمەتگرتنەکەیان بە بێ چەندوچوون دەبینی. تاکە ڕێگەی بەدەستهێنانەوەی ئەو ڕێز و دەسەڵاتەی دەیویست ئەوە بوو بەتەواوی پاشەکشێ بکات و بیگەڕێ میدییەکان تامی ئەوە بچێژن کە بەبێ ئەو ژیان چۆنە. وەك ئەوەی پێشبینی کرد، ئەوان هاتن و لێی پاڕانەوە تا بێت حوکمیان بکات.

هەر کە دیۆسیس حەقیقەتی ئەم یاسای دوورییەوە، بە ڕێکوپێکترین شێوە پیادەی کرد لەو کۆشکەدا کە خەڵکی بۆیان بونیاد نابوو، کەس نەیدەتوانی بیبینێت جگە لە چەند دەرباریەك و ئەویش تەنیا بە دەگمەن. هەروەك هیرۆدۆتس دەنووسێت "مەترسی ئەوە هەبوو کە ئەگەر ئەوان زوو زوو بیبینن، لەوانە بوو ئیرەیی و کینەی لێبکەونەوە و پیلانی

بەدواوا دەهات. ئەگەر کەس نەیبینیبایە، ئەفسانەکە وەها لێکدەدرایەوە کە بوونەوەرێکی جیاواز نییە لە کەسانی ئاسایی."

*بیاوێک بە دەرویشی وت "بۆچی زۆر زوو نایبینم؟" دەرویش لە وەڵامدا وتی: "لەبەرئەوەی (بۆچی نایبێتە دیدەنیم؟) لە گوێیدا خۆشتر دەزرینگێتەوە لە (بۆچی نەیسان هاتوویتەوە؟)"*

*مەولا جامی، لە کاروانی هەوەکانی تیدریس شاه، ١٩٦٨ وەرگێڕاوە.*

## کلیلی دەسەڵات

هەموو شتێک لە جیهاندا بەندە بە غیاب و ئامادەیی. ئامادەییەکی بەهێز دەسەڵات و سەرنجی بەلای تۆدا ڕادەکێشێت– تۆ زۆرتر لەوانەی دەوروبەرت دەدرەوشێیتەوە. بەڵام بە شێوەیەکی حەتمی حاڵێک دێت کە تیایدا ئامادەبوونێکی زۆر کاریگەرییەکی پێچەوانە دروست دەکات. چەندەی زۆرتر ببیرێیت و لەبارەتەوە بیبیسترێت، ئەوەندە بەهاکەت دادەبەزێت. تۆ دەبیتە خوویەک. گرنگ نییە چەندێک سەرسەختانە هەوڵ دەدەیت جیاواز، ئاڵۆز بیت، بەبێ ئەوەی بزانیت بۆچی، خەڵکی کەم و کەمتر ڕێزت دەگرن. لە ساتەوەختی دروستدا دەبێ فێر بیت خۆت بکشێنیتەوە پێش ئەوەی ئەوان بەشێوەیەکی نائاگایانە وێڵت بکەن. ئەمە گەمەیەکی چاوشارکێیە.

ڕاستیی ئەم یاسایە دەشێ زۆر بەئاسانی لە بوارەکانی خۆشەویستی و سەرنجڕاکێشکردن پیادە بکرێت. لە قۆناغە سەرەتاییەکانی پەیوەندییەکی سۆزداریدا، بوونی خۆشەویست خەیاڵی تۆ خۆش دەدات، خۆرێک لە پرشنگ بەدەوریدا دێیتە کایەوە. بەڵام ئەم پرشنگە نامێنێت کاتێک تۆ زۆری لەبارەوە دەزانیت– کاتێک وێنای تۆ جیتر بواری بۆ خولیا نییە. مەعشوقەکە دەبێتە کەسێک وەکو هەر کەسێکی تر، کەسێک کە ئامادەبوونەکەی بەئاسایی و بێ چەندوچوون دەبینرێت. هەربۆیە سۆزلییەرەسی سەدەی حەفدەهەم نینۆن دی

لیمکلوس بەردەوام ڕێنمایی فریوتامبری هستۆنە ڕوو لەمەڕ جۆدرینەوە لە مەعشوق. ئەو دەڵێت "خۆشەویستی قەت لەبرسا نامرێت، بەڵکو زۆرجار لە پەدمەرسیدا دەمرێت"

ئەو ساتەی کە تۆ ڕێگە بەخۆت دەدەیت وەکو هەر کەسێکی تر مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت، زۆر درەنگە– تۆ قوت دراویت و هەرس کراویت. بۆ ڕێگرتن لەمە پێویستە ئامادەبوونی خۆت لە کەسەکەی تر بدزیت. لە ڕێگەی مەڕەشەلێکردنیان بە ئەگەری ئەوەی بۆ هەتاهەتایە تۆ لەدەست دەدەن ڕێزگرتنیان بەسەردا بسەپێنە. ڕێسایەکی ونبوون و ئامادەبوونەوە دروست کە.

کاتێک تۆ دەمریت، هەموو شتێك لەبارەی تۆوە جیاواز دیارە، تۆ بە پرشنگێکی هێزای ڕێز دەورە دەدرێیت، خەڵکی ڕەخنەکانی تۆ، مشتومڕەکان لەگەڵ تۆدا دێنەوە یاد و پڕ دەبن لە پەشیمانی و گوناه. ئەوان بیری ئامادەبوونێك دەکەن کە قەت ناگەڕێتەوە. بەڵام پێویست ناکات تۆ چارەڕێ بیت تا دەمریت: بەوەی کە بۆ ماوەیەك بەتەواوی پاشەکشێ بکەیت، جۆرێك لە مەرگ پێش مردن دروست دەکەیت. کاتێکیش کە دەگەڕێیتەوە، وەك ئەوە وایە کە تۆ لە مردن گەڕابیتەوە– کەشێکی زیندووبوونەوە دادەپۆشێت و خەڵکی بە گەڕانەوەت دەگەشێنەوە. بەمشێوەیەیە کە دیۆسیس خۆی کرد بە پاشا

ڕێنە: خۆر، تەنیا بە ونبوونی دەدرکێنرێت. چەندەی ڕۆژانی باران درێژتر بن، خۆر ئەوەندە دڵگیرتر دەبێت. بەڵام ڕۆژانی گەرمەی زۆر و خۆرەتاو نارەحەتکەرن. فێربە خۆت بە نەموەزاوی بهێڵیتەوە و وەها لە خەڵکی بکەیت داوای گەڕانەوەت بکەن

یاسای دەگمەنی بەسەر شارەزاییەکانی خۆتدا پیادە بکە. ئەو شتەی پێشکەشی جیهانی دەکەیت بیکە بە دەگمەن و دەستنەکەوتوو و لێرەوە دەستبەجێ بەهاکەی زیاد دەکەیت

هەمیشە ساتەوەختێك دێت کە تیایدا ئەوانەی لە دەسەڵاتدان کاتێکی زیاتر دەمێنەوە ئێمە لێیان بێزار دەبین، ڕێزمان بۆیان نامێنێت، لە کەسانی ئاسایی جیاوازتر نایانبینین کە وەك ئەوەیە بڵێین خراپتر دەیانبینین، چونکە ئێمە بەشێوەیەکی حەتمی پێگەی هەنوکەییان لە چاوی خۆماندا بە پێگەی پێشوو بەراورد دەکەین. هونەرێك هەیە لەوەدا کە

**پێچەوانەبوونەوە**

ئەم یاسایە تەنیا ئەو کاتە پیادە دەبێت کە ئاستێکی دیاریکراوی دەسەڵات بەدەستهێنراوە، پێویستیی کشانەوە تەنیا پاش ئەو کاتە بێت کە تۆ ئامادەیی خۆت بونیاد ناوە، زۆر زوو هێزت زیاد ناکەیت، بەڵکو بیر دەچیتەوە. کاتێک تۆ بۆ یەکەمجار دەچیتە سەر شانۆی جیهان، وێنەیەک دروست بکە کە قابیلی دەستەوایە، قابیلی بەرهەمهێنانەوەیە و لەهەموو شوێنێک دەبینرێت. تا ئەو کاتەی کە ئەم پێگەیە بەدەست دەهێنرێت، ونبوون مەترسیدارە — لەبری باوەشێنکردنی ئاگر، دەیکوژێنێتەوە

بەهەمان شێوە، لە خۆشەویستی و سەکێشکردندا، ونبوون تەنیا ئەو کاتە کاریگەرە کە تۆ ئەویتر بە وێنەکەت دەورە داوە، لەلایەن ئەوەوە لە هەموو شوێنێک دەبینرێیت. دەبێ هەموو شتێک ئامادەیی تۆ بیر خۆشەویستەکەت بخەنەوە بونەوەی کاتێک تۆ دوورکەوتنەوە هەڵدەبژێریت، خۆشەویستەکەت هەمیشە بیرت لە تۆ بکاتەوە، بە چاوی ئەقڵی هەمیشە تۆ ببینێت

بیرت بێت: لە سەرەتادا، حزت دەگمەن مەکە بەڵکو بەردەوام ئامادەییت هەبێت، تەنیا ئەوەی کە دەبینرێ و ستایش دەکرێت، لە ونبووندا بیری دەکرێت

## یاسای ژمارە ١٧

# ئەوانیتر لە ترسێكی هەڵپەسێردراودا بهێڵەرەوە: كەشێكی پێشبینی نەكردن بهێنەرەكایەوە

### حوكم

*مرۆڤەكان ڕێبەدەرەری خوون، كە پێویستییەكی تێربەكراویان هەیە بۆ بینینی ئاشنا لە كردارەكانی خەڵكی تردا. ئەگەر تۆ پێشبینیكراو بیت، ئەمە هەستێكی كۆنترۆڵ و ڕاڵبوونیان پێدەبەخشێت. بارودۆخەكە پێچەوانە بكەرەوە: بە ئەنقەست پێشبینی نەكراو بە. ڕەفتارێك كە پێدەچێت ناجێگیر بێت یان مەبەستێكی تیا لەبێ، هاوسەنگییان تێكدەدات و ئەوان بێهێز لەخۆیان دەبن تا هۆڵەكانی تۆیان بۆ دەركەوێت. ئەگەر ئەم ستراتیژییە تا ئاستێكی زۆر پەرەوە بكرێت، دەتوانێ ترس و خۆف بهێنێتە كایەوە.*

### پەیڕەوكردن لە یاساكە

لە مایسی ١٩٧٢دا، پاڵەوانی شەترەنجی ڕووس سپاسكی بەشێوەیەكی شڵەژاو چاوەڕێی (بۆبی فیشەر)ی ڕكابەری بوو لە ڕەیكجاڤیك، ئایسلەندە. ئەو دوو پیاوە بڕیار بوو بۆ پاڵەوانێتی جیهانی شەترەنج بەیەك بگەن، بەڵام فیشەر لەكاتی خۆیدا نەگەیشتبوو و یارییەكە ڕاگیرابوو. فیشەر كێشەی هەبوو لەگەڵ قەبارەی پارەی خەڵاتەكە، كێشەی

شێوازی دابەشکردنی پارەکە، کێشەکانی لۆجیستیکی ڕاگرتنی یارییەکە لە ئاسمەندە بەرامبە ئەو لە هەر ساتێکدا بکشێتەوە،

سپاسکی هەوڵیدا ئۆقرە بگرێت بەڕێوەبەرە ڕوسییەکانی هەستیان کرد فیشەر گاڵتەی پێدەکات و پێی وت دوور کەوێتەوە، بەڵام سپاسکی ئەم یارییەی دەویست ئەو دەیزانی دەتوانێ فیشەر شکست پێ بێنێت و هیچ شتێك گەورەترین سەرکەوتنی ژیانی لێ تێکنەدەدا. سپاسکی بە هاوەڵێکی وت "کەواتە پێدەچێت هەموو کارەکەی ئێمە بە هیچ بە ئەنجام بگات بەڵام ئێمە دەتوانین چی بکەین؟ ئەمە جوڵەکەی ئەوە ئەگەر ئەو بێت، ئێمە یاری دەکەین ئەگەر نەیەت، یاری ناکەین پیاوێك کە ئارەزووی ئەنجامدانی خۆکوژییە دەستپێشخەرییەکەی لەبەردەمدایە"

فیشەر بۆ دواجار گەیشتە ڕەیکجاڤیك، بەڵام کێشەکان و هەڕەشەی ئیلغاکردنەوە، بەردەوام بوو ئەو کەیفی بە هۆڵەکە نەدەهات کە قەرار وابوو یارییەکەی تێدا بەڕێوە بچێت، ئەو ڕەخنەی لە ڕووناکی دەگرت، ئەو سکاڵای لەبارەی ژاوەژاوی کامێراکان هەموو، ئەو ئەمانەت ڕقی لە کورسییەکان بوو کە ئەو و سپاسکی لەسەری دادەنیشتن. ئێستا یەکێتی سۆڤێت دەستپێشخەرییەکەی کرد و هەڕەشەی کشاندنەوەی یاریزانەکەی خۆیی کرد.

پێدەچوو هەوڵی هێرودەکە کاری کردبێت. پاش ئەو هەموو هەفتانەی چاوەڕوانی، ناوسەتانی ماکۆتا و توڕەکەر، فیشەر ڕازی بوو یاری بکات. هەموان ئاهێکیان مانەوە بەر، بەتایبەت سپاسکی. بەڵام لە ڕۆژی یەکترناسینە ڕەسمییەکە، فیشەر زۆر درەنگ گەیشت و ئەو ڕۆژەی کاتێك "یاریی سەدەکە" خەریك بوو دەست پێبکات، جارێکی تر درەنگ بوو بەگوێ ئەوەشدا، ئەمجارە، بەرەنجامەکان کارەساتبار دەبوون. ئەگەر ئەو زۆر درەنگ پەیدا بووبە ئەوا لە یەکەمین یاری مێبەری دەکرا چی ڕوویدەدا؟ ئایا یارییەکە جۆرێك لە گەمەی ئەقڵی بوو؟ بەلای ماموستا گەورە کۆ بووەوەکان و بەلای سپاسکیشەوە وا دیار بوو کە ئەم کوڕە گەنجەی بروکلین حالەتێکی حەساسی شڵەژاوی هەبێت. لە سەعات ٩ ٥ دا فیشەر پەیدا بوو، ڕێك چولەکێك پێش ئەوەی یارییەکە ئیلغا بکرێتەوە.

نابوەکانی فیشەر مەعنەویاتی نەیارەکەی بەتەواوی دابەزاندبوو. لە کۆتایی گەمەکەدا، فیشەر بڕیاریدا بە سەر پێ و بۆی دەرچوو و لەکاتێکدا بە مشتەکۆڵە ئەیدا لە لەپی دەستی خۆی، هاواری دەکردە هاوەڵەکانی: "من بە هێزێکی زۆرەوە تێکی دەشکێنم!"

لە گەمەکانی دواتردا فیشەر ئەو جوڵانەی ئەنجامدا کە پێشتر کەس لێی نەدیبوو، ئەو جوڵانەی کە ستایلی ئەو نەبوون. ئێستا سپاسکی دەستیکرد بە هەڵە کردن. پاش دۆڕاندنی گەمەی شەشەم، دەستیکرد بە گریان. مامۆستایەکی گەورە وتی "پاش ئەمە، دەبێ سپاسکی پرسیار لەخۆی بکات ئاخۆ گەڕانەوە بۆ ڕووسیا سەلامەتە" پاش گەمەی هەشتەم سپاسکی پێی وابوو دەزانێ چی ڕوودەدات. بۆیە فیشەر خەریکی هیپنۆتیزەکردنی ئەوە، ئەو بڕیاریدا چاو نەبڕێتە چاوانی فیشەر. کەچی هەر دۆڕا

پاش گەمەی چواردەم ئەو داوای کۆنفرانسی ستافی کرد و ڕایگەیاند "هەوڵێک لەئارادایە بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەقڵ" ئەو بیری لەوە کردەوە ئاخۆ ئەو شەربەتی پرتەقاڵەی ئەوان خواردیانەوە لەسەر مێزی شەترەنج دەرمانی تێکرابێت. لەوانەیە تۆزی کیمیاویان پژاندبێتە هەوا. دواجار سپاسکی بە ئاشکرا قسەی کرد، تیمی فیشەری تۆمەتبار کرد بە دانانی شتێک لەناو کورسییەکاندا، کە ئەقڵی سپاسکی گۆڕیبوو. (کەی جی بی) کەوتە حاڵەتی ئامادەباشییەوە. بۆریس سپاسکی خەریکی شەرمەزارکردنی یەکێتی سۆڤیەتە!

کورسییەکان لێک هەڵکرانەوە و تیشکی ئێکسیان لێدرا. کیمیاناسێک هیچ نائاسایی تیایاندا نەدۆزییەوە. بە ڕاستیدا تاکە شتێک کە کەسێک لە شوێنێک بیدۆزێتەوە بریتی بوو لە دوو مێشوولەی مردوو لە گلۆپێکدا. سپاسکی سکاڵای کرد لەوەی کە شتی دێتە پێش چاوی. ئەو هەوڵیدا لە یاریکردن بەردەوام بێت، بەڵام ئەقڵی شێوابوو. نەیدەتوانی بەردەوام بێت. لە ٢ی سێپتێمبەردا، وازی هێنا. هەرچەندە هێشتا تا ڕادەیەک گەنج بوو، لەو شکستەی قەت هەڵنەستایەوە.

### لێکدانەوە

لە گەمەکانی نێوان فیشەر و سپاسکی دا، فیشەر ماڵئاوایی نەکردبوو. سپاسکی توانایەکی نائاسایی هەبوو بۆ خوێندنەوەی ستراتیژی نەیارەکەی و بەکارهێنانی لەدژی ئەو کە بە ترۆفە و جوگۆنجین بوو، ئەو هێرشانەی بونیاد دەنا کە نەک لە حەوت جوڵە بەڵکو لە حەفتا جوڵەدا شکستی بە بەرامبەر دەهێنا. ئەو هەر جارێک کە یارییان دەکرد شکستی بە فیشەر دەهێنا چونکە ئەو زۆر زیاتری لە پێشبینیدا دەبینی و لەبەرئەوەی ئەو دەروونناسێکی لێهاتوو بوو کە قەت کۆنترۆڵی لەدەست نەدەدا. مامۆستایەک وتی "ئەو نەک تەنیا سۆراخی باشترین جوڵە دەکات. ئەو سۆراخی ئەو جوڵەیە دەکات کە بەرامبەر هەراسان دەکات".

لەگەڵ ئەوەشدا، دواجار فیشەر تێگەیشت کە ئەمە یەکێکە لە کلیلەکان بۆ سەرکەوتنی سپاسکی. ئەو یاری لەسەر پێشبینی تۆ کرد، لە یاری خۆیدا تووی شکست پێهێنا. هەموو ئەو شتەی فیشەر بۆ یاریی پاڵەوانێتییەکە کردی هەوڵێک بوو بۆ هێنانەوەی دەستپێشخەری لەلای خۆیەوە و هێشتنەوەی سپاسکی بە ناهاوسەنگی.

ئاشکرایە کە چەرەپوایی ناکۆتا کاریگەریی هەبوو لەسەر دەروونی سپاسکی لەهەمووشی بەهێزتر، هەڵە بەئەنقەستەکانی فیشەر و نەبوونی ستراتیژێکی پەیڕەو لە پرسیارەوە، بوون. لە ڕاستیدا، ئەو هەموو شتێکی دەکرد کە لەتوانایدا بوو بە بزێوەی ڕێسا کۆنەکانی ڕێز نەکات، ئەگەرچی ئەمە بە مانای لەدەستدانی یەکەمین گەمە و بینەری بوون بێت لە دووەمیان.

سپاسکی بە هێمنی و ئارامییەکەی ناسرابوو، بەڵام بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا، نەیتوانی لە نەیارەکەی تێبگات. ئەو لەسەرخۆ داڕما، تا ئەوەی کە لەکۆتاییدا ئەو، ئەو کەسە بوو کە وا پێدەچوو شێت بووبێت.

شەترەنج جەوهەری چڕکراوەی ژیان دەگرێتە خۆ یەکەم، چونکە بۆئەوەی ببەیتەوە دەبێ بێ ڕادە بەئۆقرە و دووربین بیت و دووەم، لەبەرئەوەی گەمەکە لەسەر ڕێساکان بونیاد دەنرێت، سەراپای زنجیرەی ئەو جوڵانەی کە پێشتر یارییان پێ کراوە و جارێکی تر یارییان پێدەکرێتەوە، بە گۆڕانکارییەکی بچوکەوە لە هەر یارییەکدا بەیاری تۆ ئەو ڕێسایانە فێر دەکاتەوە کە تۆ یارییان پێدەکەیت و بەکارییان دێنێت بۆ هەوڵدان بۆ پێشبینی کردنی جوڵەکانی تۆ بەوەی کە ڕێگەی هیچ شتێکی پێشبینیکراو خۆش نەکەیت ت ستراتیژی خۆی لەسەر بنیات بنێت، هەتوانێکی گەورەیە بۆ تۆ. لە شەترەنجدا، هەروەکو لە ژیانیشدا وایە، کاتێک خەڵکی ناتوانن دراس تۆ خەریکی چیت، بە حاڵەتێکی ترسدا دەمێنەوە — چارەپولی، نادڵنیایی، سەرگەردان

*ژیان لە دەرباردا، گەمەیەکی جدیی هەمیشەیی شەترەنجە کە وامان لەسەر پێویست دەکات تا هێلکارییەکەمان بکێشین، پلانێک دابنێین و پەیڕەوی بکەین، ئەوەی نەیارەکەمان بەربەست بکەین. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ جار وا باشترە کە سەرکێشی بکەین و بەترسیدارترین و پێشبینی نەکراوترین جوڵە بکەین.*

*ژان دی لا برویەر،* ١٦٤٥–١٦٩٦

## کلیلی دەسەڵات

هیچ شتێک ئەوەندەی شتی لەناکاو و پێشبینی نەکراو تۆقێنەر نییە. هەربۆیە ڕەمیی لەرزەکان و زریانەکان ئەوەندە دەمانترسێنن. ئێمە نازانین چ کاتێک پەیدا دەبن. پاش ئەوەی یەکێکیان ڕوویدا، ئێمە لە ترس و خوفدا دەمێنینەوە بۆ دانەیەکی تر. بە ئاستێکی کەمتر، ئەمە ئەو کاریگەرییەیە کە ڕەفتاری پێشبینی نەکراوی مرۆڤ لەسەر ئێمەی هەیە

گیانەوەران بە ڕێساگەلی دیاریکراو ڕەفتار دەکەن هەربۆیە ئێمە دەتوانین ڕاویان بکەین و بیانکوژین. تەنیا مرۆڤە کە توانای ئەوەی هەیە بەشێوەیەکی ئاگایانە ڕەفتارەکەی وەرچەرخێنێت، بۆئەوەی تورسایی ڕوتین و خوو کۆنترۆڵ بکات. لەگەڵ ئەوەشدا زۆرەی مرۆڤەکان درک بەم هێزە ناکەن. ئەوان ئاسودەیی ڕۆتینیان بەلاوە

بەسەبدەبرە ئامۆژگاریی ملدان بۆ سروشتی ئەو گەمانەوەردەی کە چەندین جار گرداوە بی
چەسرچوونەکان چەندبارە دەکاتەوە. ئەمانە وەها دەکەن چونکە پێویستی بە تەقەلا و
هەول نییە، و نەهەرتەوەی ئەوان ئەهەلە پیمان وایە ئەگەر ئەوانیتر بشلەژێن، ئەوا ئەتەنیا
دەمێنینەوە. نمکە کەسی خاوەن دەسەلات جۆرێك لە ترس دەچەسپێنن لە رێگای بە
ئەنقەست ناجێگیرکردنی ئەوانەی دەوروبەری بۆئەوەی دەستپێشخەرییەکە لەدەستی
خۆیدا بهێڵێتەوە. پێویستە تۆ هەندێ جار بەبێ ئاگادار کردنەوە گۆڕان بوەشێنیت،
بۆئەوەی وەها لەوانیتر بکەیت ملەرزن کاتێك بە کەمترین رادە پێشبینی دەکەن. ئەمە
ئامرازێکە کە کەسی دەسەلاتدار بۆ ماوەی چەند سەدەیەك بەکاری هێناوە.

فلیپۆ ماریا، دوایین دوکەکانی (ڤیکۆنتی)ی میلان لە سەدەی پانزەهەمی ئیتالیادا،
بەشێوەیەکی ئاگایانە پێچەوانەی ئەو شتانەی دەکرد کە هەمووان لێیان چاوەڕێ دەکرد
بۆ نموونە، لەوانەبوو لە پڕێکا بایەخ و سەرنجی تەواو بخاتە سەر دەرباریيەك و پاشان، هەر
کە کابرا چاوەڕێی تەرفیعێکی دەکرد بۆ پۆستێکی بەرزتر، لەپڕێکا بە سوکترین شێوە
مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد. بەهۆی سەرلێشێواوییەوە لەوانەبوو پیاوەکە دەربار جێ بهێڵێت،
کاتێك دیوك لەپڕێکدا بانگی دەکردەوە و جارێکی تر جاردەستیدەکرد بە مامەڵەکردن
بەشێوەیەکی باش لەگەڵیدا. دەرباریيەکە کە دیسان سەرگەردان دەبووەوە بیری لەوە
دەکردەوە ئاخۆ گریمانەکەی لەمەڕ ئەوەی کە تەرفیع وەردەگرێت بەلای دیوکەوە بوون
بووەوە و ئاخۆ بیر لەم پرسە بریندارکەر نابێت، و دەستیدەکرد بە رەفتارکردن
بەشێوەیەک کە چیتر چاوەڕێی شەرەفێکی وەها نەکات. دیوکیش لەبەرامبەر نەبوونی
نموخدا سەرکۆنەی دەکرد و دووری دەخستەوە.

نهێنی مامەڵەکردن لەگەڵ فلیپۆ سادە بوو. تۆ ئەتوانی ئەوە ببینی کە دەزانێت چی
دەوێت. هەوڵ مەدە پێشبینی ئەوە بکەیت چ شتێك دلخۆشی دەکات. قەت ئیرادەی خۆی
مەسەپێنە، تەنیا مل بۆ ئیرادەی ئەو بدە. پاشان چاوەڕێ بە و بزانە چی ڕوودەدات. لە
گەرمەی ئەو ناداڵنیایی و سەرلێشێواوییەی دروستیکرد، دیوك بالادەست بوو،
بەحەدانەکراو و لە ئارامیدا بوو.

بەشێکی بەکرێبێتی زۆرجار شتێکی ماموستا و گەورەیە، بەڵام کەمێ ئەمانیش دەتوانێت بە رادەیەکی کاریگەر بەکاری بهێنێ. ئەگەر تۆ خۆت وەها ببینیەوە کە دەوروبەرت فەرمانگ بووە یان چوار دەورت گیراوە، زنجیرەیەک جوڵە بخەرە ڕوو دوژمنەکانت ئەوەندە سەرگەردان دەبن کە پاشەکشە دەکەن یان هەڵەیەکی تاکتیکی دەکەن.

لە بەهاری ١٨٦٢، لەماوەی جەنگی ناوخۆی ئەمریکادا، ژەنەراڵ ستۆنوێڵ جاکسن و هێزێکی ٤٦٠٠ سەربازی کۆنفیدرات لە دۆڵی شێناندۆ هێزەکانی یەکگرتنیان ئازار دەدات کە گەورەتر بوون. لەهەمان کاتدا، لە شوێنێکی زۆر دوورتردا، ژەنەراڵ جۆرج برینتن مکلێلان، کە پێشڕەوایەتی هێزێکی ٩٠٠٠ سەربازی یەکگرتنی دەکرد لە واشنتنەوە بەرەو باشوور ڕێی دەکرد بۆ گەمارۆدانی ریچمۆند، ڤێرجینیا، واتە پایتەختی کۆنفیدەرات. بەکاتێ کە هەفتەکانی کەمپەینەکە تێپەڕین، جاکسن بە بەردەوامی سەربازەکانی بەرەو دەرەوەی دۆڵی شێناندۆ ئاراستە دەکرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ ئەوێ.

جوڵەکانی ئەو بێ مانا بوون. ئایا ئەو ئامادەکاری دەکرد بۆ یارمەتیدانی بەرگریی ریچمۆند؟ ئایا ئەو بەرەو واشنتن ڕێی دەکرد. ئایا ئەو بەرەو باکوور دەجوڵا بۆ مانەوەی پەشێوی لەوێ؟ بۆچی هێزە بچووکەکەی بەشێوەی بازنەیی دەجوڵان؟

جوڵە ڕوونەکراوەکانی جاکسن وەهای لە ژەنەراڵەکانی یەکگرتن کرد ڕێکردن بەرەو ریچمۆند دوا بخەن لەکاتێکدا کە ئەوان چاوەڕێی ئەوە بوون بزانن ئەو مەتەڵەی چییە لەهەمان کاتدا، باشوور توانی هێزی پاڵپشتی بنێرێتە ناو شارۆچکەکە. جاکسن ئەم تاکتیکە چەند جارێک بەکارهێنا کاتێک ڕووبەڕووی هێزە هەرە گەورەکان دەبووە. دەیگوت "هەمیشە جادوو لە دوژمن بکە، گومڕای بکە و تووشی سەرسوڕمانی بکە، ئەگەر دەکرێ، " ئەم تاکتیکانە هەمیشە سەرکەوتوو دەبن و لێرەوە لەشکرێکی بچوک دەشێ لەشکرێکی گەورە تێکبشکێنێ."

ئەم یاسایە تەنها نەبێ بەسەر جەنگ بەڵکو بەسەر ماوودۆخەکانی ڕۆژانەشدا پەیدا دەبێت. خەڵکی هەمیشە هەوڵ دەدەن ئەنگیزەکانی پشت کردارەکانت بدۆزنەوە بەکاری

ببن بۆ پێشبینی تۆ لەبری جوڵەیەکی تەواو پێشبینی نەکراو بکە و ئیتر تۆ دەیانخەیتە حاڵەتی بەرگرییەوە. لەبەرئەوەی ئەوان لە تۆ تێناگەن، ئەوان شڵەژاون و لە دۆخێکی وەهادان کە تۆ بە ئاسانی دەتوانیت بیانترسێنیت.

هاوڕێکیان پابلۆ پیکاسۆ وتی "باشترین خەمڵاندن نەبوونی خەمڵاندنە. هەر کە تۆ ئاستێکی دیاریکراوی پێزانینت بەدەستهێنا، ئەوانیتر بەگشتی دەزانن کاتێک تۆ شتێک دەکەیت ئەوا لەبەر هۆکارێکی هۆشمەندانەیە. بۆیە بە ڕاستی گەمژانەیە جوڵەکانت لە پێشدا زۆر بە وریایی دابڕێژیت. وا باشترە تۆ بەشێوەیەکی ڕەمەکی ڕەفتار بکەیت"

بۆ ماوەیەک، پیکاسۆ لەگەڵ مامەڵەکاری هونەر، پۆل ڕۆزەنبێرگ، کاری کرد. لەسەرەتادا ئەو بوارێکی زۆری بۆ ڕەخساند لە مامەڵەکردن لەگەڵ تابلۆکانیدا، پاشان ڕۆژێکیان، لەبەر هۆکارێکی نادیار بە بیارەکەی وت چیتر هیچ بەرهەمێکی تری نادات بۆ فرۆشتن. هەروەک پیکاسۆ ڕوونی کردەوە، "ڕۆزەنبێرگ چل و هەشت سەعاتی دواتری بە هەوڵدان بەسەر برد بۆ زانینی هۆکارەکە. ئایا من شتەم بۆ مامەڵەکارێکی تر هەڵدەگرت؟ من بەردەوام بووم لە کارکردن و خەوتن و ڕۆزەنبێرگ کاتەکەی بە بیرکردنەوە لە هۆکارەکە بەسەر دەبرد. پاش دوو ڕۆژ گەڕایەوە، شڵەژاو بوو، وتی، هاوڕێی بەڕێز دواجار تۆ من ڕەت ناکەیتەوە ئەگەر من ئەم بڕە پارەیە (ڕەقەمێکی گەورەی وت) بۆ ئەو تابلۆیانەت بخەمەڕوو نەک ئەو نرخەی کە من ڕاهاتبووم لەدانان لەسەر تابلۆکانت؟"

پێشبینی نەکردن نەک تەنیا چەکێکی تۆقاندن. بەلاوەنانی ڕێساکانت بە سەر بنەمایەکی ڕۆژانە دەبێتە هۆی شێوانێک لە دەوری تۆ و بایەخپێدانێک دروست دەکەن، خەڵکی باست دەکەن، ئەو ئەنگێزە و ڕوونکردنەوانە دەهێننە بەر باس کە هیچ پەیوەندییان بە حەقیقەتەکەوە نییە، بەڵام ئەمە بە بەردەوامی تۆ لە مێشکی ئەواندا دەهێڵێتەوە. لە کۆتاییدا، چەندەی تۆ گۆڕاو و پێشبینی نەکراو دیاربیت، ئەوەندە ڕێز و پێزانینی زۆرتر مسۆگەر دەکەیت. تەنیا کەسانی بەشێوەیەکی کوشندە لاوەکی، بەشێوازێکی پێشبینیکراو ڕەفتار دەکەن.

وینەی تۆمان دانەک کە ناتوانریت پێشبینی بکرێت. وەرچەرخانی لەپڕی بارۆمیتەر، گۆڕانی پووسەکراوە لە ئاراستە و گڕدا. هیچ بەرگریەک نییە. تۆمان تۆمێن و سەرگەردانی دادەچێنێت

دەسەڵات: فەرمانڕەوای ژیشبیر ئەوەندە ژاریانیزە کە پێدەچێت لە هیچ گریەک نەگیرسێتەوە، ئەوەندە پووسەکراوە کە کەس ناتوانێت سۆزێکی بکات. ئەو لە سەرەوە بەناگردارا پشوو دەدات و وەزیرەکانیشی لەژێرەوە دەلەرزن

(هان فەی تزو، فەیلەسوفی چینی، سەدەی سێیەمی پێش زایین)

## پێچەوانەبوونەوە

دەشێ هەندێجار پێشبینیکراوبوون لە بەرژەوەندی تۆ بشکێتەوە: بە دروستکردنی وێنایەک کە خەڵکی پێی ئاشنا و ئاسودە بن، دەتوانیت لای لایەیان بۆ بکەیت و خەویان پیا بکەوێت. ئەوان بە گوێرەی نەریتێک لەپێشدا ئامادەکراوەکانیان بەرامبەری تۆوە، هەموو شتێکیان ئامادە کردووە. تۆ دەتوانیت بە چەند شێوازێک ئەمە بەکار بهێنیت. یەکەم، ئەمە تەمێک دروست دەکات، پەردەیەکی ئاسودەبەخش کە لە پشتیەوە تۆ دەتوانیت کرداری فریودەرانە جێبەجێ بکەیت. دووەم، ئەمە ڕێت بۆ خۆش دەکات تا تۆ لە حاڵەتی دەگمەندا شتێکی تەواو پێچەوانەی وێناکە بکەیت، دیارەکەت ئەوەندە قووڵ بشڵەژێنیت کە بکەوێتە سەر زەوی، بەبێ ئەوەی پاڵی پێوە بنێیت.

لە ١٩٧٤دا هەوڵدرا تا محەمەد عەلی و جۆرج فۆرمان ڕووبەڕووی یەک بن بۆ پاڵەوانێتی مشتەکۆڵەی کێشی قورسی جیهان. هەمووان دەیانزانی چی ڕوودەدات. جۆرج فۆرمانی گەورە هەوڵ دەدا بە مشتەکۆڵەیەکی بەردانەوە بوەشێنێت، لەکاتێکدا کە عەلی بەدەوریدا سەما دەکات و بڕستی لەبەر دەبڕێت. ئەوە شێوازی عەلی بوو بۆ شەڕکردن، وێناکەی ئەو بوو و دە ساڵێک دەبوو ئەو وێنایەی نەگۆڕیبوو. بەڵام لەم حاڵەتەدا پێدەچوو بڕوارێک بۆ فۆرمان بڕەخسێنێت. ئەو مشتەکۆڵەیەکی توندی وەشاندبوو و ئەگەر

چاوەڕێ نەبوو، ئەوا بوو بان مرەنگ دەبووایە عەلی بۆی بێت. عەلی، ستراتیژیستی گەورە بلاّی مری هەبوون. لە کۆنفرانسی ڕۆژنامەوانیدا پێش ئەوەی شەڕە گەورەکە دەست پێبکات، وەعدی ساریەتی ستایلەکەی بگۆڕێت و یەک مشتەکۆڵەی توند بوەشێنێت. کەس، بەتایبەت فۆرمان، بۆ ساتێکیش بڕوایان پێ نەدەکرد. ئەو پلانە خۆکوژییە دەبوو لەلایەن عەلییەوە. ئەو وەکو جاری جاران ڕۆڵی کۆمیدییەکی دەگێڕا. پاشان، پێش شەڕەکە، ڕاهێنەرەکەی عەلی گوریسەکانی دەوری ڕینگەکەی شل کردەوە، شتێک کە ڕاهێنەرەکە دەیکرد ئەگەر ڕۆژلیبارەکە نیازی بووایە مشتەکۆڵە توندەکە بوەشێنێت. بەلاّم کەس بڕوای بەم تەڵەکەیە نەکرد. دەمێ ئەمە داوێک بووبێت.

هەمووان تووشی سەرسوڕمان بوون کە عەلی ڕێک ئەو شتەی کرد کە وتبووی. لەکاتێکدا کە فۆرمان چاوەڕێی دەکرد بەدەوریدا سەما بکات، عەلی ڕێک چووە لای ڕاستی و مشتەکۆڵەی توندی وەشاند. ئەو بەتەواوی لە ستراتیژی نەیارەکەی پەست بوو. لەکاتێکدا کە سەرکەوتن نەبوو، فۆرمان پەستی لە خۆی بڕی، نەک پەرەی بەدوای عەلیدا وێل بێت بەڵکو بەوەی کە شێتانە مشتەکۆڵە بوەشێنێت و بەردەوام دژەمشتەکۆڵەی بەرکەوێتەوە. لە کۆتاییدا، عەلی لەلای ڕاستەوە مشتەکۆڵەیەکی بەرنامەوەی وەشاند و فۆرمانی بەردایەوە. خووی ویناکردنی ئەوەی کە ڕەفتاری کەسێک لەگەڵ ڕیساکانی پێشووی دەگونجێت ئەوەندە بەهێزە کە تەنانەت ڕاگەیاندنی عەلی لەمەڕ گۆڕینی ستراتیژ سەس نەبوو بۆ ئەوەی لەقی بکات. فۆرمان کەوتە ناو تەڵەیەکەوە – ئەو تەڵەیەی کە پێی وترابوو پێشبینی بکات.

ئاگادارکردنەوە: هەندێ جار دەشێ پێشبینی نەکران لەدژی تۆ بشکێنەوە، بەتایبەت ئەگەر تۆ لە پێگەیەکی پاشکۆدا بیت. هەندێ جار هەن کە باشترە لێگەڕێنێت خەڵکی لە دەوری تۆ هەست بە ئاسودەیی و جێگیری بکەن نەک ئەوەی هەراسانیان بکەیت. پێشبینی نەکرانی زۆر وەکو نیشانەیەکی سستی و بڕیارنەدان دەبینرێت، یان نەخۆشی یا کێشەیەکی دەروونی وێنا دەکرێت. ڕیساکان بەهێزن و تۆ دەتوانیت بە سەرلێشێواندنی بیانترسێنیت. دەبێ هێزێکی وەها تەنیا بەشێوەیەکی حەکیمانە بەکار بهێنرێت.

## یاسای ژمارە ١٨

# بۆ پارێزگاری کردن لە خۆت قەڵا بونیاد مەنێ-گۆشەگیری مەترسیدارە

### ناوکە

*جیهان مەترسیدارە و دوژمنان لە هەموو شوێنێکن- دەبێ هەموو کەسێک پارێزگاری لە خۆی بکات. پێدەچێت قەڵا سەلامەتترین شوێن بێت، بەڵام گۆشەگیری دەتخاتە بەر مەترسی زۆرتر لەوەی کە پارێزگاریت لێ بکات. قەڵا لە زانیاریی بەنرخ دادەبڕێنێت، دەتکاتە ئامانجێکی بەرچاو و ئاسان. باشترە لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵ بێت و هاوپەیمان بدۆزیتەوە. تۆ لەڕێگەی فەرەبالغییەوە قەڵغان دروست دەکەیت*

### سەرپێچی لە یاساکە

چین شی هوانگ تی، یەکەمین ئیمپراتۆری چین (٢٢١-٢١٠ی پێش زایین) بەهێزترین پیاوی سەردەمی خۆی بوو. ئیمپراتۆریەتەکەی ئەو گەورەتر و بەهێزتر بوو لەوەی ئەلێکساندەری مەزن. ئەو هەموو مەملەکەتەکانی دەوری مەملەکەتەکەی (چی ین)ی خۆی گرتبوو و لەقەڵەمڕەوێکی گەورەدا بەناوی چین یەکیخستبوون. بەڵام لە دوایین ساڵەکانی ژیانیدا، بەدەگمەن دەبینرا

ئیمپراتۆر لە نایابترین کۆشکدا لە پایتەختی (هسیەن یانگ) دەژیا. کۆشکەکە ٢٧٠ ژوورەی هەبوو، کە هەموویان بە ڕێڕەوی ژێرزەویی نهێنی گرێ درابوونەوە، ڕێگەی بۆ

ئیمپراتۆر حەزی دەکرد لە کۆشکەکە دەرچێت بەبێ ئەوەی کەس بیبینێت. ئەو هەر شەوێک لە ژوورێکی جیاواز دەخەوت و هەر کەسێک کە بە رێکەوت چاوی بکەوتایەتە سەر ئەو دەستەیەی سەری دەپەڕێنرا. تەنیا چەند پیاوێک شوێنەکەیان دەزانی و ئەگەر ئەوان بە هەر کەسێکیان بوتایە، ئەوانیش دەکوژران.

یەکەمین ئیمپراتۆر ئەوەندە لەپەیوەندیکردن بە مرۆڤەوە دوورکەوتبوو کە کاتێک دەبوایە کۆشک جێ بێڵێت بە دزییەوە دەردەچوو، بە وریاییەوە خۆی دەگۆڕی. لە گەشتێکی وەهادا لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، لەپڕێکدا مرد. لاشەکەی بە عەرەبانەی ئیمپراتۆر گەڕێنرایەوە بۆ پایتەخت لەگەڵ عەرەبانەیەک کە پڕکرابوو لە ماسی سوێرکراو کە لەپشتیەوە راکێشرا بۆئەوەی بۆنی پیسی لاشەکە بشارێتەوە- کەس ئاگاداری مردنی ئەو نەبوو. ئەو تەنیا کرد، دوور لە ژن، خێزان، هاوڕێ و دەربارییەکانی و تەنیا وەزیرێک و چەند دەست و پێوەندێک هاوەڵێتیان کرد.

## لێکدانەوە

شیە هوەنگ تی وەکو پاشای (چین) دەستیپێکرد، جەنگاوەرێکی بێ ترس بە ئەرجێکی بێسنوورەوە. دروەمەرانی سەردەمەکە وەکو پیاوێک بە "لوتی زەردەواڵە، چاوی دوور ئاسا، دەنگی چەقەڵ و دڵی پڵنگ یان گورگ" وەسفیان دەکرد. ئەو هەندێ جار دەبتوانی بەزەیی هەبێت، بەڵام زۆربەی جار ئەو "بەبێ سوودڵی مرۆڤی قوت دەدا" لە رێگەی فێڵبازی و توندوتیژییەوە بوو کە ئەو ناوچەکانی دەوری ناوچەکەی خۆی گرت و (چین)ی دروستکرد، بەمەوە و کەلتوورێکی لە میچەوە جێ کرد. ئەو سیستەمی دەرەمەکی هەڵوەشاند و بۆئەوەی چارێکی لەئەندامانی زۆری خەنەوادە پاشایەتییەکان بێت کە بە مەملەکەتە زۆرەکانی قەڵەمڕەوەکدا بڵاو ببوون، , ١٢ایانی بۆ پایتەخت گواستەوە کە لەوێ دەربارییە هەرە گرنگەکانی لە کۆشکی گەورەی (هسیەن یانگ)دا نیشتەجێ کرد. ئەو دیواری زۆری لەسەر سنوورەکان بونیادنا و کردی بە داوی گەورەی

چبی ئەو باساکانی وڵات، رەمای رووسیی، تەنانەت قەیری ویلی عەرەبانەکانی سنادەرایر کرد

لەگەڵ ئەوەشدا وەکو بەشێك لەم پرۆسەیەی یەکەمین ئیمپراتۆر رووسیەکان و وانەکانی کۆنفۆشیوس وانە ئەو فەیلەسوفەی ئایدیاکانی لەمەڕ ژیانی ئەخلاقی هەنوکە تەفرینەی بووبە دینێك لە کەلتووری چیندا، قەدەغە کرد. بە فەرمانی شی هوانگ تی، هەزاران کتێبی پەیوەند بە کۆنفۆشیوس سووتێنران و هەر کەسێك وتەی کۆنفۆشیوسی بهێنایەتەوە سەری دەپەڕێنرا. ئەمە دوژمنی زۆری بۆ ئیمپراتۆر دروستکرد و ئەو بەردەوام ترسی لێ دەنیشت، تەنانەت تووشی پارانۆیا بوو. ژمارەی سەر پەراسەکان زیادیکرد. رووسەرێکی هاوچەرخ، هان فەی تزو، دەڵێت "چی بێ بۆ ماوەی چوار جیل سەرکەوتوو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە ترس و شڵەژانی بەردەوامی ویرانبوونیدا دەژیا".

لەکاتێکدا کە ئیمپراتۆر قووڵ و قووڵتر بۆ ناو کۆشك دەکشایەوە بۆ پارێزکاریکردنی لەخۆی، هێواش هێواش کۆنترۆڵی بەسەر قەڵەمڕەوەکەدا لەدەستدا. دەست و پێوەند و وەزیرەکان سیاسەتیان بەبێ پرسی ئەو دادەڕشت یان تەنانەت بەبێ ئەوەی ئاگای لێ بێت. ئەوان بەهەمان شێوە پیلانیشیان لەدژی دەگێڕا. لە کۆتاییدا، ئەو تەنیا بەناو ئیمپراتۆر بوو و ئەوەندە گۆشەگیر ببوو کە بە ئەستەم کەسێك دەیزانی مردووە یان ماوە. لەوانەیە ئەو لەلایەن هەمان ئەو وەزیرە پیلانگێڕانەوە ژەهرخوارد کرابێت کە هانیاندا گۆشەگیر ببێت

ئەمەیە گۆشەگیری لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت. بکشێوە بۆ ناو قەڵایەك و ئیتر تۆ پەیوەندی لەگەڵ سەرچاوەکانی دەسەڵاتت لەدەست دەدەیت. تۆ گوێچکەت بۆ ئەو شتەی لە دەوروبەرت ڕوودەدات و هەستی هاوسەنگیت لەدەست دەدەیت. لەبری ئەوەی کە سەلامەتتر بیت، خۆت لەو جۆرە مەعریفەیە دادەبڕیت کە ژیانت پێوە بەندە. قەت خۆت ئەوەندە دوور دەمەبڕینە بەجۆرێك کە نەزانیت لەدەوروبەرت چی ڕوودەدات، بەو پیلانانەشەوە کە لەدژت دەگێڕدرێن.

## پەیڕەوی لە پاشاکە

لویسی چواردە کۆشکی ڤێرسای و دەوروبەری لە ١٦٦٠ەکاندا بۆ خۆی بونیادنا و ئەمە وەکو هیچ کام لە کۆشکە شاهانەییەکانی تر نەبوو لەجیهاندا. هەروەك لە پوورەیەکی هەنگ، هەموو شتێك لە دەوری کەسی شاهانە دەسوڕایەوە. ئەو لە ژیانیدا ئەو دەسەڵاتانە دەورە درابوو کە شوێنەکانیان لە ئەنجامی ئەوەی خۆی بۆ ئەرکان کرابوو، ڕێکخراوەکەیان بەند بوو بە پلەکەیان. ژووری خەوتنی پاشا سەنتەری کۆشکەکەی گرتبوو و جێی سەرنجی هەموو کەسێك بوو. هەموو بەیانییەك پاشا لەم ژوورەدا بە سروتێك سڵاوی لێدەکرا

لە هەشتی بەیانیدا، یەکەمین بەردەستی پیاوی پاشا، کە لە خوارەوەی پێخەفی شاهانە دەخەوت، خاوەن شکۆی بەئاگا دەهێنا. پاشان کارەکەرەکان دەرگایان دەکردەوە و ڕێگەیان بۆ ئەوانە دەکردەوە کە دەبووایە لە سروتەکەدا بەشدار بن. هەرکەسی هاتنە ژوورەوەیان ڕێکوپێك بوو: سەرەتا کوڕە ناشەرعییەکان و نەوەکانی پاشا دەهاتن، پاشان میرە هاوخوێنەکان و دواتر پزیشکەکەی و نەشتەرگەرەکەی دەهاتن. پاشان ئەفسەرە پلە بەرزەکانی پۆشاك، خوێنەری ڕەسمی پاشا و ئەوانەی بەرپرس بوون لە سەرگەرمکردنی پاشا دەهاتن. دواتر کاربەدەستی جیاجیای حکومی دەهاتن یەك لەدوای یەك بەپێی پلەکانیان. ئینجا ئەوانە دەهاتن کە بەپێی بانگهێشتنامەی تایبەت بەشداریی سروتەکەیان دەکرد. بەهاتنی کۆتایی مەراسیمەکە، ژوورەکە پڕ دەبوو لە زیاتر لە سەد بەشداری شاهانە و سەردانکەر

ڕۆژەکە ڕێکدەخرا بۆ ئەوەی هەموو وزەی کۆشك ئاراستەی پاشا بکرێت و لە ڕێگەی ئەوەوە ڕەت ببێت. لویس بە بەردەوامی دەربار و کاربەدەستی لا بوون، هەموویان داوای ئامۆژگاری و حوکمی ئەویان دەکرد. بەرامبەر هەموو پرسیارەکانیشیان زۆرجار وەڵامەکەی ئەمە بوو: "با بزانین چۆن دەبێت"

هەروەك سان سیمۆن دەنووسێت "ئەگەر ئەو ڕووی نەکردایەتە کەسێك، پرسیارێکی لێ بکردایە، بێبیبیەکی ناگرینگی نەسنابەتەڕوو، چاوانی هەموو ئامادەبووان دەکەوتە سەر ئەو کەسە. ئەمە جیاوازیەك بوو کە قسەی لەبارەوە دەکرا و شکۆی زیاد دەکرد" ئەگەری نهێنی پارێزی لە کۆشکدا نەبوو، تەنانەت بۆ پاشاش- هەموو ژوورێك رایەڵ بوو بە ژوورێکی ترەوە و هەموو ڕاڕەوێك بە ژووری گەورەترەوە گرێ دەدرایەوە کە تیایاندا[1] گروپەکانی خانەدانان بە بەردەوامی کۆ دەبوونەوە. کردارەکانی هەمووان پەیوەست بوو بەیەکترییەوە و هیچ شتێك و هیچ کەسێك بە نادیاری ڕەت نەدەبوو. ئەو هەستی بریندار دەبوو ئەگەر سەرنجێترینی خانەدانەکان بە بەردەوامی لە دەربار ژیانی بەسەر نەبردبایە و ئەوانەی کە قەت خۆیان دەرنەدەخست یان بە دەگمەن خۆیان پیشان دەدا، کەوتی پێنەدەهاتن. ئەگەر یەکێك لەمانە ئارەزووی شتێکی بکردایە، پاشا بە سەربەرزییەوە دەیگوت: "من نایناسم" و ئەم حوکمدانە قابیلی پێچەوانەبوونەوە نەبوو

## لێکدانەوە

لویسی شازدە لە کۆتایی شەڕی ناوخۆی جەنگاکدا هاتە سەر دەسەڵات. خانەدانی دەستپێشخەری بەرەنی جەنگ بوون کە بە قووڵی ڕقیان لە دەسەڵاتی گەشەکردووی پاشا بوو و نامەڕێزی پێزانی دەرەبەگایەتی بوون، کاتێك لوردەکان خۆیان حوکمی زەوییەکانی خۆیان دەکرد و پاشا دەسەڵاتێکی کەمی بەسەریاندا[1] هەبوو. خانەدانان جەنگی ناوخۆیان دۆڕاندبوو، بەڵام ئەوان وەکو حەلکێکی داخ لە دڵی سەربەگوێ مانەوە

بوبیانبانی فێرسای زۆر زیاتر بوو لە تەنەی مەنحەلامی پاشایەکی جێژ و خۆشی دۆست. ئەمە بۆ کردارێکی گرنگ بوو. پاشا تۆڕانی چاوێك و گوێچکەیەك لەسەر هەر کەسێك و هەر شتێکی دەوروبەری ڕاخستبوو. ئەوانەی پێزێك لە بوژان خەنەدانی سەربەرز بوون بچووك کرابوونەوە بۆ کۆمەڵێکی دەمەقاڵێکەر لەسەر مافی نارمەنیدانی پاشا بۆ پۆشینی پۆپەکەی لە بەیانیاندا. لێرەدا ئەگەری ئاسەنەمەندپەریی لەئارادا نەبوو- ئەگەر گۆشەگیری نەبوو. لویسی شازدە زوو زوو درکی بەو ڕاستییە کرد کە زۆر مەترسیدارە بۆ

باش خۆی گۆشەگیر بکات، لە خانەیدا، پیلان وەکو قارچکێکی باش باران هەڵدەتۆقن، دوژمنکاری لە چەند بانگدا بەرهەستە دەست و پاشگەری هەڵدابسێت پێش ئەوەی کاتی کاردانەوەی هەبێت بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەمە، کۆمەڵایەتیبوون و کرانەوە نەک تەنیا دەمی هاوبیری دەڵێکو دەبێت رێکبخرێن و ئاراستە بکرێن

ئەم هەلومەرجە لە فێرسیای بە درێژایی حوکمی لویس درێژەی کێشا، کە ماوەیەکی ئاشتی و هێمنی رێژەیی بوو لەسەرانسەری ئەو کاتەدا، دەرفەتێکی بەبێ ئەوەی لویس گریسستی بێت بەکەوتە سەر زەوی.

*هەڵوەت بەترسدارە بۆ ئاقڵ بەبێ ئەوەی بۆ ئەزیلەت پەسەند بێت، دەبێت بڵێت کە سروشتی تەنیا بەتەنیاییەوە لە بیمەتدایە، لەوانەشە لە رەهەندا بێت و دووریش نییە شێت بێت*

*دکتۆر سامویل جۆنسن، ١٧٠٩–١٧٨٤*

## کلیلی دەسەڵات

مەکیاڤیللی بەڵگەی ئەوە دێنێتەوە کە بە مانایەکی تەواو سەربازی، قەڵا بەشێوەیەکی بێ چەندوچوون هەڵەیە ئەمە دەبێتە رەمزی گۆشەگیریی دەسەڵات و ئامانجێکی ئاسانە بۆ دوژمنانی بوساسەرەکانی قەڵا کە بۆ بەرگریکردن لە تۆ دیزاین کراوە، لە راستیدا لە یارمەتی دادەبڕێنێت و لە کشۆکبوونت دەدات لەوانەیە وەها دیار بێت کە قابیلی گرتن نییە، بەڵام هەر کە تۆ تیایدا گۆشەگیر بوویت، هەمووان دەزانن لە کوێیت و پێویست ناکات گەمارۆیەک سەرکەوتوو بێت بۆئەوەی قەڵاکەت بکۆڕێت بۆ زیندان بە پاشتاییە بچوک و سنووربەندەکانی، قەڵا بەهەمان شێوە زیندە ماسکە بەرانبەر ئافات و نەخۆشییە درمەکان بەمانایەکی ستراتیژی، گۆشەگیریی قەڵا هیچ پارێزگارییەک دابین ناکات و لەراستیدا کێشەی زۆرتر دروست دەکات لە چارەسەرکردنیان

لەبەرئەوەی مرۆڤەکان بە سروشت زیندەوەرن، دەسەڵات بەندە بە تێکەڵبوون و کارلێکی کۆمەڵایەتی. بۆئەوەی خۆت بەهێز بکەیت دەبێت خۆت لە سەنتەری شتەکاندا

دابیبێت، هەروەك لویسی شازدە لە کۆشکی ڤێرسای ئەمەی کرد. دەبێ هەموو چالاکییەك لە دەوری تۆ بسوڕێتەوە و دەبێ تۆ بەئاگا بیت لە هەموو ئەو شتەی لەسەر شەقام ڕوودەدات و هەر کەسێك کە دەشێ جەریکی پیلانگێڕی بێت لەدژی تۆ. مەترسی بۆ زۆربەی خەڵکی ئەو کاتە پەیدا دەبێت کە هەست بە هەڕەشە دەکەن. لە کاتی وەهادا ئەوان پاشەکشێ دەکەن و خۆیان لە جۆرە قەڵایەکدا گرموڵە دەکەن بۆئەوەی ئاسایشی تێدا بدۆزنەوە. لە کردارێکی وەهادا، ئەوان بۆ زانیاری پشت بە ناوەی بچووکتر و بچووکتر دەبەستن و ڕوانگەیان بۆ ڕووداوەکانی دەوریان لەدەست دەدەن. ئەوان توانای مانۆڕکردن لەدەست دەدەن و بە ئاسانی دەبنە ئامانج و گۆشەگیرییان دەیانکات بە پارانۆید. هەروەك لە جەنگ و زۆربەی گەمەکانی ستراتیژدا، زۆرجار گۆشەگیریی بە پێشت شکست و مەرگەوە دێت.

لە ساتەوەختەکانی نادڵنیایی و مەترسیدا، پێویستە تۆ ڕووبەڕووی ئەو ئارەزووە بیتەوە تا نەچیتە ناوەوە. لەبری ئەمە، خۆت تێکەڵاو بکە، سۆراخی هاوپەیمانە کۆنەکان بکە و هاوپەیمانی نوێ دروست بکە، خۆت بخەرە ناو بازنەی جیاوازترەوە. ئەمە فێڵی خەڵکە بەدەسەڵاتەکانی چەندەها سەدە بووە.

دەوڵەتمەداری ڕۆمانی، سیسرۆ لە خانەوادەیەکی خانەدانی خوارەوە لەدایك بوو و دەرفەتێکی کەمی دەسەڵاتی هەبوو تا ئەو کاتەی توانی شوێنێك بۆ خۆی لەنێو ئەریستۆکراتەکاندا بکاتەوە کە کۆنترۆڵی شارەکەیان کردبوو. ئەو لێهاتووانە سەرکەوتنی بەدەست هێنا، هەموو ئەوانەی کاریگەرییان هەبوو ناسیبوویەوە و بۆی دەرکەوت کە ئەوان بەیەکترییەوە بەندن. ئەو لەهەموو شوێنێك تێکەڵاو بوو، هەمووانی ناسی و تۆڕێکی وەها گەورەی پەیوەندی هەبوو کە لێرەدا دوژمنێك بە ئاسانی بە هاوپەیمانێکی پارسەنگ دەدرایەوە.

دەوڵەتمەداری فەرەنسی تالیراند بەهەمان شێوە یارییەکەی ئەنجام دەدا. هەرچەندە ئەو لە خێزانە ئەریستۆکراتە هەرە بەناوبانگەکانی فەرەنسا بوو، وەهایکرد کە هەمیشە لەپەیوەندیدا بمێنێتەوە لەگەڵ ئەوەی کە لە شەقامەکانی پاریسدا ڕوودەدا، ڕێگەی بۆ

خۆش دەکرد بۆ پیشبینی گۆڕانکارییەکان و کێشەکان بکات. تەنانەت ئەو خولقییەکی دیاریکراوی لە مێکەلاموون لەگەڵ ئاوانکارەکانی سەر سینەر نەسی کە رسیاری بەنرخیان بۆ دابین دەکرد. هەر جارێک کە لەبیرانێک، گواستنەوەیەکی دەسەڵات لەئارادا بووایە- کۆمپانیی سەرپەرەشتیاری، کەوتنی ناپۆلیۆن، وارهیبانی لویسی هەژدە – ئەو دەیتوانی بەرگە بگرێت و تەنانەت گەشە بکات؛ چونکە ئەو قەت لە بارەیەکی بچووکدا خۆی قەتیس نەدەکرد بەڵکو هەمیشە پەیوەندی لەگەڵ سیستەمی نوێدا دروست دەکرد

لەبەرئەوەی مرۆڤەکان بوونەوەری کۆمەڵایەتین، سەرەنجام ئەو هونەرە کۆمەڵایەتییانەی کە ئامادەبوونمان دڵگیر دەکەن دەشێ تەنیا لە رێگەی دەرکەوتنی بەردەوام و تێکەڵبوونەوە پەرەوە بکرێن. چەندەی تۆ زۆرتر لە پەیوەندیدا بیت لەگەڵ ئەوانیتردا، ئەوەندە جوانتر و ئارامتر دەبیت. کەچی گۆشەگیری، نامۆیی لە ئاماژەکانی تۆدا بەرهەم دێنێت و سەردەکێشێت بۆ گۆشەگیریی زیاتر لەکاتێکدا خەڵکی بەرە بەرە خۆت لێ لادەدەن

لە ١٥٤٥دا دوک کۆسیمۆ ا دی میدیسی گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە بۆ رامکردنی ئەمریی ناوەکەی، راسپێرێت تا نەخش و نیگار لەسەر دیوارەکانی ژووری سەرەکیی کەنیسەی سان لورێنزۆ لە فلۆرێنس دروست بکەن. رو نیگارکێشی مەزن هەبوون تا لەناویاند هەڵبژێرێت و لەکۆتاییدا ئەو جاکۆپۆ دا پۆنتۆرمۆی هەڵبژارد. یەکەمین بڕیاری ئەوە بوو ژوورەکە بە عارێ دابخات. ئەو نەیویست کەس دروستکردنی ئەم شاکارە ببینێت یان ئایدیاکانی بدزێت. ئەو خۆی لە مایکل ئەنجێلۆ چالاکتر بوو. کاتێ، هەندێ گەنج هەر لە خۆتێهەڵقورتاندنەوە خزیانکرد بە ژوورەکەدا، جاکۆپۆ تەنانەت زیاتر دایپۆشی

پۆنتۆرمۆ سەنجی ژوورەکەی بە دیمەنی کتێبی پیرۆز بەخشاند. خەلق، ئادەم و حەوا، کەشتی نوح و هیتر. بە سەرەوەی ناوەراستی دیوارەکە وێنەی مەسیحی کێشا کە خەریکی راستکردنەوەی مردووان بوو لە رۆژی دواییدا. هونەرمەندەکە بۆ ماوەی یازدە

سال کاری لە ژوورەکەدا کرد، بە دەگمەن جێی دەهێشت، چونکە ئەو فۆبیایەکی بەرامبەر پەیوەندیکردن لەگەڵ مرۆڤدا لا دروست ببوو و دەترسا ئاپندەکانی بدرێن.

پۆستۆرمۆ کۆچی دوایی کرد بەر لەوەی دیمەن و وێنەکان تەواو بکات و هیچیشیان بەمانەوە بەڵام نووسەری گەورەی ڕۆمێنسی، ڤاساری، هاوڕێی پۆستۆرمۆ کە بە ماوەیەکی کورت پاش مردنی هونەرمەندەکە دیمەنەکانی بینی، وەسفێک لەو کارانە جێهێشت ناهاوسەنگییەکی تەواو لەئارادا بوو. چەند دیمەنێک لەگەڵ چەند دیمەنێکی تر یەکتر دەهاتنەوە، فیگەرێک لە چیرۆکێکدا لەگەڵ دامەیەکی تردا هاوبەش بوو. پۆستۆرمۆ درێژکی گرتبوو بە وردەکارییەوە بەڵام پەهەندە گشتییەکەی فەرامۆش کردبوو. ڤاساری لە کۆتایی وەسفەکەیدا نووسیبووی، ئەگەر ئەو بەردەوام بووایە "پێم وایە شێت دەبووم و لەم نیگارانەدا گرفتار دەبووم، هەروەک چۆن پێم وایە لە ماوەی پانزە ساڵی کاتی جاکۆپۆدا، ئەو خۆی و هەر کەسێکی تری گرفتار کرد بیبینیان". لەبری ئەوەی کارەکەی سیتەمۆی بەرزراگرتنی ژیانی پیشەیی، کارەکە دووەمۆی بڕیکرسی.

ئەم دیمەن و نیگارانە هاوتای سیراوی کاریگەرییەکانی نابیان بوو لەسەر ئەقڵی مرۆڤ. نابوونی هاوسەنگی، درێژکگرتن بە وردەکاریی تێکەڵ بە نەتوانینی بینینی وێنە گەورەکە، جۆرێک لە درێژیی ڕێڕەوی کە چیتر پەیوەندی ناکات ئاشکرایە کە گۆشەگیری بۆ هونەرەکانی ئەفراندن ئەوەندەی بۆ هونەرە کۆمەڵایەتییەکان کوشندەیە. شەیکسپیەر بەناوبانگترین نووسەرە لە مێژوودا چونکە، وەکو درامانیست بۆ شانۆی گلۆب، خۆی بۆ هەشامات والا کرد، کارەکەی دەستە بەردەستی خەڵک کرنگ بیبە ئاستی جوبنسیان و زەوقیان چۆن بوو. ئەو هونەرمەندانەی کە خۆیان دەناسیننە بەر قەڵاکانیان، هاوسەنگی لەدەست دەدەن، کارەکەیان تەنیا پەیوەندی و بەرکەوتنی لەگەڵ بازنە بچوکەکەیاندا دەبێت هونەرێکی وەها بە داخراوی و بێ هێزی دەمێنێتەوە

لە کۆتاییدا، لەسەرئەوەی دەسەڵات دروستکراوی مرۆڤە، بەشێوەیەکی حەتمی بە گرێناکت لەگەڵ خەڵکی تردا زیاد دەکات لەبری گەرشە بار ئەملیەتی قەڵا، بەم شێوەیە جیهان ببینە ئەمە وەکو ڤیرسای-یەکی گەورەیە لەناویدا کە هەموو ژوورێک پەیوەندی

لەگەڵ ژوورەکەی مرد بەرقەرار دەکات. پێویستە تۆ واڵا بیت، هەروەها بۆ ناو و بۆ دەرەوەی ناوچە جیاجیاکان بچیت و بێیت و لەگەڵ جۆرە جیاوازەکاندا تێکەڵ ببیت. ئەو جۆرە جوڵان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە لە پیلانگێڕەکان دەتپارێزێت کە ناتوانن هەستییەکان لەبەرامبەر تۆ و دوژمنەکانتدا بپارێزن، کە ناتوانن تۆ لە هاوپەیمانەکانت دابڕێنن.

**وێنە:** قەڵا لە سەری سەرەوەی گردەکە، قەڵا دەبێتە ڕەمزی هەموو ئەو شتەی کە جێی ڕقە لە دەسەڵات و هێزدا. هاوڵاتییانی شار بۆ یەکەمین دوژمن کە دێت ناپاکیت بەرانبەر ئەنجام دەدەن. گەر لە پەیوەندیکردن و زانیاری دابڕێیت، قەڵاکە بەئاسانی دەکەوێت.

**دەسەڵات:** هێزێکی باش و زیرەک کە ئارەزوومەندی بەرقەرارکردنی ئەو کارەکتەرە و خۆسووڕگرتنە لە پێدانی دەرفەت بە کوڕەکانی تا ببنە سەرکوتکەر، ئەت قەڵا بوونیت نییە، نۆنەوەی شووراو پشت بە ئیرادەی باشی ڕەعیەکانیان ببەستن نەک بە بەهێزیی قەڵاکان.

(نیکۆلۆ ماکیاڤیللی، ١٤٦٩–١٥٢٧)

### پێچەوانەبوونەوە

بە دەگمەن شتێکی ڕاست و دڵنیاوە کە گۆشەگیری هەڵبژێریت. بەبێ بەئاگابوون لەوەی بە سەر شەقامەکان ڕوودەدات، ناتوانیت خۆت بپارێزیت. تاکە شتێک کە پەیوەندیی مرۆیی بەردەوام ناتوانێت ڕەعییەساری بکات، بیرکردنەوەیە. دەشێ فشارسایی گوشاری کۆمەڵگە بۆ گوێجان و بەدووری دووری لە خەڵکی بڕەوە، بیرکردنەوەی ڕوون لەبارەی ئەوەی کە لەدەوری دەگوزەرێ ئاسان بکات. کەواتە، وەکو پەنایەکی کاتی، دەشێ دابڕان یارمەتیدەرت بێ بۆ بەدەستهێنانی ڕوانگەیەکی دروست زۆرێک لە بیرمەندانی جددی لە زینداندا پێگەیشتوون کە تیایاندا هیچمان نییە بیکەین

جگە لە بیرکردنەوە ماکیاڤیللی تەنیا ئەو کاتە توانی کتێبی (میر) بنووسێت کە خۆی لە ئاڵۆزی و گۆشەگیریدا بینییەوە لە کێڵگەیەکدا کە دوور بوو لە پیلانە سیاسییەکانی فلۆرێنس

لەگەڵ ئەوەشدا مەترسییەکە ئەوەیە کە ئەم جۆرە گۆشەگیرییە هەموو جۆرە بیرۆکەیەکی نامۆ و سەیر دەخاتەوە. لەوانەیە بۆ ڕوانگەیەکی دروست بۆ وێنە گەورەکە بەدەست بێنیت، بەڵام هەستکردن بە بچوکی و سنووربەندبوونی خۆت لەدەست دەدەیت. هەروەها، چەندەی گۆشەگیرتر بیت، ئەوەندە قورستر دەبێت لە گۆشەگیرییەکەت بێیتە دەرەوە کاتێك هەڵیدەبژێریت– ئەمە بە نوولاییدا لمێکی بەرمدا دەتباتە خوارەوە بەبێ ئەوەی تێبینی بکەیت. ئەگەر تۆ پێویستت بە بیرکردنەوە بێت ئەوا تەنیا وەکو دوا پەنا گۆشەگیری هەڵبژێرە و تەنیا بە بڕی کەمیش. وریا بە بۆئەوەی ڕێگەی گەڕانەوەت بۆ ناو کۆمەڵگە بە کراوەیی بهێڵیتەوە.

## یاسای ژمارە ١٩

# بزانە مامەڵە لەگەڵ کێدا دەکەیت- کەسی نەگونجاو بریندار مەکە

### حوکم

*زۆر جۆری جیاواری خەڵک لە جیهاندا هەن، و تۆ قەت ناتوانیت وێنای ئەوە بکەیت کە هەموان هەمان پەرچەکرداریان بەرامبەر ستراتیژەکانی تۆ دەبێت. هەندێ خەڵک هەیە کە ئەگەر فریویان بدەیت یان لێیان بدەیتەوە تەواوی ژیانیان بەدوای تۆڵەدا وێل دەبن ئەمانە گورگن لە پێستی مەڕدا. بە وریاییەوە قوربانی و نەیارەکانت هەڵبژێرە- قەت کەسی نەگونجاو فریو مەدە یان بریندار مەکە.*

### نەیارەکان، کەمژەکان و قوربانییەکان

لە ڕابوردوو بەرەو دەسەڵات پێکەوتنی بڕێک لە جۆری نەیار، کەمژە و قوربانی دەکەیت. بەرزترین فۆرمی هونەری دەسەڵات توانای جیاکردنەوەی گورگەکانە لە بەرخەکان، ڕێوییەکان لە کەروێشکەکان، هەڵۆکان لە سیسارکە کەچەڵەکان. ئەگەر تۆ ئەم جیاکارییە بە باشی بکەیت، ئەوا سەرکەوتوو دەبیت بەبێ ئەوەی پێویست بکات زۆری لە هەر کەسێک بکەیت. بەڵام ئەگەر کوێرانە مامەڵە لەگەڵ هەر کەسێکدا بکەیت کە دێتە ڕێگەت، ئەوا ژیانێکی بەردەوام پڕ لە خەمەت دەبێت، لەوانەیە بڵێی زۆریش ناژی. توانیی ناسینەوەی خەڵک و ڕەفتارکردنە بەم پێیە، گرنگە. ئەوەی لە خوارەوە

نەك پێنج جۆری هەرە مەترسیدار و سەختی ئامانجەکانی لە جەنگەڵدا، ئەو شێوەیەی کە لەلایەن هونەرمەندان– ساختەچی و بە پێچەوانەوە– ی رابردوو ناسراونەتەوە

لوتبەرز و حەز بەگەورە زان. هەرچەندە لەوانەیە لە سەرەتادا بیشاریتەوە، شانازیی هەستپێکراوی ئەم کەسە زۆر مەترسیدارە. هەر ئیهانەیەکی هەست پێکراو سەر دەکێشێت بۆ تۆڵەی توندوتیژیی بەرچاو. لەوانەیە تۆ بە خۆت بڵێیت "بەڵام من لە ئاهەنگێکدا تەنیا ئەوەم وت و ئەمەم وت کە تیایدا هەموان سەرخۆش بوون." ئەمە گرنگ نییە. هیچ ساغییەك لەپشت رێدە پەرچەرکردارەکەیەوە نییە، بۆیە کاتت بە هەوڵدان بۆ لێ تێگەیشتنی بە فیڕۆ مەدە. ئەگەر لە هەر ساتێکدا لە مامەڵەکردنت لەگەڵ کەسێکدا هەست بە لوتبەرزییەکی زێدە هەستیارانە دەکەیت، رابکە. هەرچییەك کە تۆ بەر هیوای بۆ دەخوازیت، شایەنی نییە.

مرۆڤی بێ پادە ناتەس (دڵناسوودە). ئەم کەسە پەیوەندی هەیە بە جۆری لوتبەرز و لەخۆبایی، بەڵام کەمتر توندوتیژ و دیاریکردنی قورسە. بەدبەختی ناسکە، هەست بە خۆکردنی نائاسوودەیە و ئەگەر هەست بکات فریو دراوە یان هێرشی کراوەتە سەر، ئاڕەکەی دێتەجۆش. ئەو برگە برگە پەلامارت دەدات کە ئامەتایە دەمەمەبێ تا نێبینی دەکەیت. ئەگەر تۆ کەسێکی وەها فریو بدەی ئازار بدە، بۆ ماوەیەکی درێژ دوور بە. زۆر لە دەوری مەمێنەوە ئەگینا پارو پارو لە جەستەت دەکاتەوە تا دەمریت

حەسودی گومانای. جۆرێکی تر لەو جۆرانەی سەرەوەیە، ئەمە جۆرێك ستالینی دەهانووە تەو، ئەو شتە دەبینێت کە – زۆرجاریش خراپتر– دەیەوێ لە خەڵکی تردا بیبینێت و وێنەی ئەوە دەکات کە هەموان بەدوویەوەن. حەسودی گومانای لە راستیدا لە سیانەکەی تر کەمتر مەترسیدارە. بەشێوەیەکی رستەوخۆ ناهاوسەنگە، ئەو شتانە بۆ فریودان، وەك چۆن خودی ستالین بە بەردەوامی فریو دەدرا. باری لەسەر سروشتە گومانرییەکەی بکە بۆ ئەوەی وایلێبکەیت لە خەڵکی تر هەڵگەڕێتەوە. بەڵام ئەگەر تۆ ببیتە ئامانجی گومانەکانی، وریا بە

ماری بادەوەر بەهێز. ئەگەر ئازاری پێگەیشت یان فریو درا، ئەم کابرایە لە ڕواڵەتدا دوورەیی پیشان دادات، ئەو دەمەملێنێت و چاوەڕێ دەبێت. پاشان، کاتێک ئەو لە پمگەیەکدایە کە بارودۆخەکە ئارەزوو بکاتەوە، بە ڕیزەکییەکی خوێن ساردانە تۆڵە دەکاتەوە. ئەم کابرایە بە خەملاندن و ڕیزەکییەکەی لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا ناسەوە. ئەو زۆرجار سارد و بێ هەستە. دووجار لەم مارە وریا بە و ئەگەر تۆ بەشێوەیەک لە شێوەکان بریندارت کرد، یا بەتەواوی تێکی بشکێنە یان لەبەرچاوی دووری بخەرەوە.

کەسی سادە، حاکی و زۆرجار ناهۆشمەند. ئەها، گوێکانت قوڵاخ دەبن کاتێک قورەتییەکی وەها بەکێشکەر بەدی دەکەیت. بەڵام ئەم کەسە فریودەسی زۆر سەختترە لەوەی کە وێنای دەکەیت. باوەڕهێنان بە تەڵەکەیەک زۆرجار هۆشمەندی و وێنای پێویستە- هەستێکی پاداشتی مومکین. کەسی سادە چەشتەکە نابات چونکە نایناسێتەوە. ئەو، ئەوەندە بێ ئاگایە. مەترسی ئەم کەسە ئەوە نییە کە ئازارت دەدات یان بەدوای تۆڵەوەیە، بەڵکو تەنیا ئەوەیە کە کات، وزە، سەرچاوەکان و ئەندەت ئەسروستیت بەفیڕۆ دەدات لە هەوڵی ئەوەدا کە فریوی بدەیت. تێستێکی بیشانەیەک بکە- نوکتەیەک، چیرۆکێک. ئەگەر کاردانەوەکەی تەواو حەرفی بوو، ئەمە ئەو جۆرەیە کە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت. بەردەوام بە، بەڵام تۆبالی خۆت لە ئەستۆی خۆت

### سەرپێچی لە یاساکە

### سەرپێچی ١

لە سەرەتاکانی سەدەی سیازەدا، موحەممەد، شای خوارەزم، پاش چەندین جەنگ توانی ئیمپراتۆرییەتێکی زەبەلاح بونیاد بنێت، کە لەخۆرئاواوە بۆ تورکیای ئەمڕۆ و باشووری ئەفغانستان دەکشا. سەنتەری ئیمپراتۆرییەتەکە، پایتەختی ئاسیای گەورە،

سەمەرقەند بوو. شا سوپایەکی ڕاهێنراو و بەهێزی هەبوو و دەیتوانی ٢٠٠،٠٠٠ جەنگاوەر لەماوەی چەند ڕۆژێکدا ساز بدات.

لە ١٢١٩دا موحەممەد پێشوازی لە نێردەی سەردانێکی خۆرهەڵات کرد بەناوی جەنگیز خان. نێردەکە پێکهاتبوو لە هەموو جۆرە دیارییەک بۆ موحەممەدی مەزن، کە نیشانەی باشترین کاڵاکان بوو لە ئیمپراتۆریەتی مەنگۆلی بچوک بەڵام گەشەکردووی مەنگۆل. جەنگیز خان دەیویست ڕێڕەوی ئاوریشم ڕووەو ئەوروپا بکاتەوە و پێشنیاری ئەوەی کرد کە لەگەڵ موحەممەد دا هاوبەش بێت لەکاتێکدا کە بەڵێنی ئاشتی دەدا لەنێوان دوو ئیمپراتۆریەتەکەدا.

موحەممەد ئەم تازەپێگەیشتووەی لە خۆرهەڵاتەوە نەدەناسی، کە بە بۆچوونی ئەو بێ ڕادە لوتبەرز بوو کە هەوڵیدا وەکو هاوتایەک قسە لەگەڵ ئەم بکات کە ڕوون و ئاشکرا لەو باڵاتر بوو. ئەو پێشنیارەکەی خانی فەرامۆش کرد. خان جارێکی تر هەوڵیدایەوە ئەمجارە کاروانێکی سەد حوشتری پڕ لە خشڵی دەگمەنی نارد کە لە چین تاڵانی کردبوو. پێش ئەوەی کاروانەکە بگاتە موحەممەد، ئینالچیک، حاکمی هەرێمێکی هاوسنووری سەمەرقەند خۆی دەستی بەسەردا گرت و سەرکردەکانی ئیعدام کرد.

جەنگیز خان دڵنیا بوو لەوەی کە ئەم هەڵەیە- ئەمەی کە ئینالچیک بەبێ ڕەزامەندی موحەممەد ئەمەی کردووە. دیسان جارێکی تر وەفدێکی تری بۆ موحەممەد نارد، پێداگری لە ئۆفەرەکەی کرد و داوای کرد حاکم سزا بدرێت. ئەمجارە موحەممەد خۆی یەکێک لە نێردراوەکانی سەر بڕی و دووانەکەی تری بە سەری تاشراوەوە ناردەوە- ئیهانەیەکی ترسناک لە کۆدی شەرەفی مەنگۆلدا. خان نامەیەکی بۆ شا نارد "تۆ جەنگت هەڵبژاردووە. چی دەبێ با ببێ و ئەوەی کە دەبێ نایزانین، تەنیا خودا دەزانێت". پاش ناردنی هێزەکانی لە ١٢٢٠دا، ئەو هێرشی کردە سەر ناوچەکەی ئینالچیک کە تێیدا پایتەختی گرت، حاکمەکەی دەستگیر کرد و فەرمانیدا لە ڕێگەی ڕژاندنی زیوی تواوەوە بەسەر چاوەکانی و گوێچکەکانیدا ئیعدام بکرێت.

بەدرێژایی ساڵی دواتر، خان ڕێبەرایەتی زنجیرەیەک کەمپەینی شێوە گەریلایی کرد بەدژی سوپای زۆر گەورەتری شا. ستراتیژەکەی ئەو لەو سەروەختەدا سەراپا تازە بوو– سەربازەکانی توانییان بە سواری ئەسپ زۆر خێرا بجوڵێن و شارەزای هونەری تیرهاوێژی بوون لەکاتێکدا کە لەسەر ئەسپ بوون. خێرایی و گشتگیریی هێزەکانی ڕێگەخۆشکەر بوون بۆی تا موحەممەد لە سۆنگەی شارەکانی و ئاراستەی جوڵەکانی هەڵبخەڵەتێنێت. دواتر ئەو توانی لەپێشدا چواردەوری سەمەرقەند بگرێت، پاشان بیگرێت. موحەممەد ڕایکرد و ساڵێک دواتر مرد، ئیمپراتۆریەتە زەبەلاحەکەی تێکشکا. جەنگیزخان تاکە گەورەی سەمەرقەند، ڕێڕەوی ئاوریشم و زۆربەی باکووری ئاسیا بوو.

## لێکدانەوە

قەت وابدامەنێ ئەو کەسەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت لە تۆ کەمتر یان لاوازترە، هەندێ کە لە پەلاماردا خاون، کە لەوەیە وات لێبکەن بە هەڵە حوکم لەسەر ئەستووریی پێستیان بدەیت و بیگەران نەبیت لە ئیهانەکردنیان. بەڵام ئەگەر شەرەفیان بریندار بکەیت و لە عیزەت نەفسیان بدەیت، بە توندوتیژییەک وەڵامت دەدەنەوە کە لەناکاو و پەرگیرانە دیارە بە بەراورد بە هێواشیی ئۆقرەبوونیان. ئەگەر تۆ دەتەوێ خەڵکی ڕەت بکەیتەوە، وا باشترە بە ئەدەب و بە ڕێزەوە ئەمە بکەیت، ئەگەرچی هەست بکەیت داوایەکە چەماوەسووانەیە یان پێشنیارەکەیان پووچە. قەت بە شێوەیەکەوە ڕەتیان مەکەرەوە تا ئەو کاتەی کە باشتر دەیانناسیت، ئەگینا لەوانەیە دەست و پەنجە لەگەڵ جەنگیزخانێکدا نەرم بکەیت.

## سەرپێچی ٢

لە دەیەکانی ١٩١٠یەکاندا، هەندێ لە باشترین کلاوچییەکان لە ئەمریکا ئەڵقەیەکی ساختەچییەکانیان لە (دینڤەر)ی کۆلۆرادۆ پێکهێنا. لە مانگەکانی زستاندا ئەوان بە

ویلایەتەکانی باکووردا بلاو دەبووینەوە، پەرەمان بە بازرگانییەکەمان دەدا. لە ١٩٢٠دا، جۆ فوری، سەرکردەی ئەڵقەکە لەبەکساس کاری دەکرد، سەدان هەزار دۆلاری بە گەمە ساختە کلاسیکەکان دەبردەوە. لە (فۆرت ویرس)، چاوی بە ساویلکەیەک کەوت بەناوی (جەی فرانک نۆرفلید)، کاراسک کە کاراسکی گەورەی مەسور. نۆرفلیت کەوتە داوی ساختەییەکەوە. بەو قەناعەتەی کە سامانێکی بۆ دێت، هەمانە بانکییەکەی لە ٤٥،٠٠٠ دۆلار بەتاڵ کرد کە هەبوو و رادەستی فوری و هاوەڵەکانی کرد. چەند رۆژێک دواتر ئەوان "میوان"ەکەیان بەخشی بەو کە دەرکەوت چەند تاک دۆلارییەکن و بە دەوری یەکێکیان لە پارچە کاغەز وەرپێچراون.

فوری و پیاوەکانی پێشتر سەدان تەڵەکەی وەهایان ئەنجام دابوو و زۆرجار ساویلکەکە ئەوەندە شەرمەزار دەبوو بە خۆشباوەڕییەکەی که نە بێدەنگی پەندی وەردەگرت و دۆڕانەکەی قبوڵ دەکرد. بەڵام نۆرفلیت وەکو ساویلکەکانی تر نەبوو. ئەو جۆرە پۆلیس کە پێیان وت هیچیان لەدەست نایەت. نۆرفلیت بە لێکۆڵەرەکانی وت "کەواتە من خۆم دەچم بە شوێن ئەو کەسانەدا. من خۆم دەیانگرم ئەگەر تەواوی ژیانم لەسەر دابنێت". ژنەکەی حەوی گاراجەکەی گرتە دەست لەکاتێکدا کە نۆرفلیت سەرانسەری وڵاتی تەی دەکرد و بەدوای ئەو کەسانەی تردا دەگەڕا کە کەوتبوونە داوی هەمان گەمەوە. ساویلکەیەکی تری لەو جۆرە پەیدا بوو و هەردووکیان پێکەوە یەکێک لەو ساختەچییانەیان لە سان فرانسیسکۆ ناسییەوە و توانیان قۆڵبەستی بکەن. کابرا خۆکوژی ئەنجامدا لەبری ئەوەی کە ئامادە بێت ڕووبەڕووی زیندانی تاهەتایی ببێتەوە.

نۆرفلیت لە ڕێکردن بەردەوام بوو. ئەو یەکێکی تری لە ساختەچییەکان لە مۆنتانا دۆزییەوە، وەکو گوێرەکە بە گوریس بەستیەوە و بەناو شەقامە قوڕاوییەکاندا بەرەو زیندانی شار ڕایکێشا. ئەو بەک بەتیا بە سەرانسەری وڵاتدا گەڕا بەڵکو چووە ئینگلتەرە، کەنەدا و مەکسیک. بۆئەوەی جۆ فوری و بەهەمان شێوە دەلیو بی سپێنسەری دەستەڕاستی بدۆزێتەوە. پاش دۆزینەوەی سپێنسەر لە مۆنتریال، نۆرفلیت بە

خەفەتەکانی دوای نەکەوت، سیبیسەر رابکرد بەڵام کارانەکە لە شێتی خۆی بەردەوام و ئەویش لە شاری سۆلت لەیک دەستگیر کرد

نورفلیت خۆی لە هاکنسۆنفیل، فلۆریدا شاردبۆوە و لە ئەکساس حەتی هێشت تا رووبەڕووی دادگا بکرێتەوە بەڵام ئەو لەوێ نەدەوەستا؛ لە ڕێگەکەیدا بەرەو دیفەر بەردەوام بوو، سوور بوو لەسەر شکاندنی تەواوی ئەلقەکە نەک تەنیا بڕێکی زۆر لە پارە بەڵکو ساڵێکی تری ژیانیشی لە گەڕان بە سەر برد تا توولی هەموو سەرکردەکانی ئەلقەکە بخاتە پشت شیشەکانی زیندانەوە. تەنانەت هەندێ لەوانەی دەستگیری دەکردن ئەوەندە لێی ترسابوون کە ئەوانیش خۆیاندا بەدەستەوە،

پاش چەند ساڵێک لە سۆراغکردن، نۆرفلیت خۆی بەئەنیی گەورەترین کۆمپانیای ساختەچییەکانی تێکشکاند. هەوڵەکە بووە هۆی مایەپووچ بوون و تێکدانی هاوسەرێتییەکەی، بەڵام وەکو کابرایەکی بەقەناعەت مرد

## لێکدانەوە

زۆربەی پیاوان پیسوایی تۆڵەبڕین و کڵاو لەسەر نان بە هەستێکی سەرشۆڕییەوە قبوڵ دەکەن. ئەوان وانەیەک فێر دەبن، بەوە دەزانن کە شتێک نییە بەناوی ژەمی بەلاش و زۆرجاریش لەبەرامبەر چلێسیی بۆ پارەی ئاسان، دەکەون. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێکیان ڕەنجی دەکەنەوە دەرمانەکەیان وەربگرن. لەبری تێڕامان لە چاوچنۆکی و هۆش ناوەڕیی خۆیان، خۆیان وەها دەبینن کە قوربانیی سەراپا بێگوناهن.

لەوانەیە پیاولی وەکو ئەمە تێکۆشەری دادپەروەری و ڕاستگۆیی بن، بەڵام ئەمانە لە ڕاستیدا بەشێوەیەکی نامەعقول ماناسۆدەن پێ ڕاپووارەن، کڵاو لەسەرنان، گومەمان لەخۆیان چالاک کردووە و ئەوان دەستەوەستان لە چاککردنەوەی زامەکە. ئایا دەرمانی هاوسەرێتییەکەی و ساڵانێک فەرکردنی پارە و ژیانێکی بەخۆش لە هێزتێلەکانی ئەوەی دەهێنا بولەی شەرمەزاریی قوڵتران بکاتەوە؟ بەلای نۆرفلیتەکانی جیهانەوە، زاڵبوون بەسەر شەرمەزارییەکەماندا هەموو نرخێک دەهێنێت

هەموو خەڵك ڕەهەندێكی نائاسوودەیی و نائەمنییان هەیە و زۆرجار ناشتوانن ڕێگە بۆ فریودانی ساویلكەیەك یاریكردنە بە حاڵەكانی نائاسوودەیی. بەلام لە پاشایی دەسەلاتدا، هەموو شتێك پەیوەندی هەیە بە ئاستەوە و ئەو كەسەی خۆی بڕیار دەدات نائەمنتر بێت لە كەسێكی ئاسایی، مەترسی گەورە دەخاتە ڕوو. ئاگادار بە: ئەگەر تۆ پیاوەی هەر جۆرە فێڵ و تەڵەكەبازییەك بكەیت، باش تاوتوێی بشانەكەت بكە. نائەمنیی و نەهسیەتی هەندێ خەڵك ناتوانێ مەرگەی بچووكترین بریندارێ ناگرێت. ئەگەر زانیت مامەڵە لەگەڵ جۆرێكی وەهادا دەكەیت، سەرەتا تیستیان بكە- بۆنموونە، نوكتەیەكی نەرم و نیانیان لەسەر بكە. كەسی ئاسودە پێدەكەنێت، كەسێكی بە ئاشكرا نائەمن و نائاسودە وەها كاردانەوە پیشان دەدات وەك بڵێی سووكایەتی پێ كراوە. ئەگەر گومانی ئەوەت لا دروست بوو كە لەگەڵ ئەم جۆرەدا مامەڵە دەكەیت، قوربانییەكی تر بدۆزەرەوە.

### سەرپێچی ٣

لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین، (چونگ ئێرە) میری (چی یی) (جیمی ئەمڕۆ) ناچاری دەربەدەری كرا. ئەو بەشێوەیەكی خاكی ژیا- تەنانەت، هەندێ جار لە هەژاریشدا ژیا- چاوەڕێی ئەو كاتە بوو كە بتوانێ بگەڕێتەوە ماڵەوە و ژیانی میرانەی دەست پێبكاتەوە. جارێكیان كە لە ویلایەتی چینگ دەپەڕییەوە، كە لەوێ فەرمانڕەواكە نەیدەزانی كێیە، بە ڕەقی مامەڵەی لەگەڵدا كرد. (شو چان)ی وەزیری فەرمانڕەواكە ئەمەی بینی و وتی "ئەم پیاوە میرێكی شایستەیە. دەكری جەنابتان بە ڕێزێكی زۆرەوە مامەڵەی لەگەڵدا بكەن و بیخەنە ژێر بەرپرسیارێتییەكەوە!" بەلام فەرمانڕەواكە تەنیا دەیتوانی پێگەی نزمی میرەكە ببینێت، ئامۆژگارییەكەی فەرامۆش كرد و جارێكی تر سووكایەتی میرەكەی كردەوە. شو چان جارێكی تر هۆشداری دایە گەورەكەی، وتی "ئەگەر جەنابتان ناتوانن بە ڕێزەوە مامەڵە لەگەڵ چونگ ئێرەدا بكەن، دەبێ بیكوژن، بۆ ئەوەی ڕێگە لە كارەساتێكی ئاییندە بگیرێت." فەرمانڕەوا هەر گاڵتەی پێدەهات.

ساڵێك دواتر بۆ دوو جار میر تووشی نەگەڕێتەوە ماڵەوە و بارودۆخەکەی بەشێوەیەکی بەرچاو گۆڕابوو. ئەو بیری نەچوو کە لەماوەی هەژارییەکەیدا کێ لەگەڵیدا میهرەبان بووە و کێ لەگەڵیدا ڕەق بووە. ئەوەی کە هەر هیچ بیری نەچووبووەوە، مامەڵەی هەرزەبڕەوی چینگ بوو. لە یەکەمین دەرفەتیدا لەشکرێکی گەورەی پێکەوە نا و بەرەو چینگ کەوتە ڕێ، هەشت شاری گرت، مەملەکەتەکەی وێران کرد و هەرزەبڕەواکەی دەربەدەر کرد

**لێکدانەوە**

تۆ قەت ناتوانیت دڵنیا بیت لەوەی مامەڵە لەگەڵ کێدا دەکەیت. کەسێك کە گرنگی و دەرەتێنێکی کەمی لەمڕۆدا هەیە، دەشێ سبەی کەسێکی خاوەن دەسەڵات بێت. ئێمە لە ژیاندا زۆر شتمان بیر دەچێتەوە، بەڵام بە دەگمەن ئیهانە لەبیر دەکەین.

هەرزەبڕەوی چینگ چۆن بیزانیایە میر چونگ ئێرە بە جۆرێ زیرەك، وردەکار و چاوچنۆکە، مارێکە یادەوەرییەکی درێژی هەیە؟ بە ڕاستی هیچ ڕێگەیەك نەبوو تا بزانێت– بەڵام لەبەرئەوەی هیچ ڕێگەیەك نەبوو، وا باشتر بوو شتێکی مەترسیدار ئەنجام نەدات و چارەی نەبێت تا بزانێ. هیچ شتێك نییە بە ئیهانەکردنی ناپێویستی کەسێك بەدەست بێت. پاڵنەری هەست بریندارکردن بەلاوەنێ، ئەگەرچی کەسەکەی تر لاواز دیار بێت. ئەو ڕەزایەتمەندییەی بەمە دروست دەبێت هیچ نییە بە بەراورد بەو مەترسییەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ڕێگەی دەسەڵاتدا دەبێت

**سەرپێچی ٤**

١٩٢ ساڵێکی زۆر خراپ بووە بۆ مامەڵەکارانی بورسەی ئەمریکا. کڕیارە گەورەکان– بەوەی میوداڵەکانی سەدەی پێشوو– دەگەیشتنە ئەوەی کە وەکو مێژوو بەرەو نەمان دەچوون و هیچ میلیۆنێرێکی نوێ پەیدا نەبوون تا شوێنیان بگرنەوە. شتەکان ئەوەندە خراپ بوون کە ژمارەیەك لە مامەڵەکارە گەورەکان بڕیاریاندا دەرامەتەکانیان یەکبخەن،

"سەر سکەم" موقبی بۆ فۆزەی ڕوون کردەوە کە بەرهەمهێنراوەکانی ناو پەڕتووکەکان ئەو بابلۆیانە پیشان دەدەن کە ئەمان هیوادار بوون پێی بفرۆشن. دواجار فۆزە بێگەیشت ئەو وتی "بەڵام بەڕێزان، من چیم داوە لە وێنە ڕەسمەکان لەکاتێکدا کە ئەوانەی لەم پەڕتووکانەدا هەن ئەوەندە جوانن؟"

## لێکدانەوە

حوریف موقبی شانازی بەخۆیەوە دەکرد لە لەپێشدا خوێندنەوەی قوربانییەکان و مشتەرییەکانیدا، حاڵە لاوازەکانیان و تایبەتمەندییەکانی ڕەوقیانی بۆ دەردەکەوت ئەمەت پێش ئەوەی بیانناسێت. ئەو لە بەکارهێنانی ئەم تاکتیکەدا لەسەر هێنری فۆزە نائومێد بوو. چەند مانگێکی پێچوو تا لەو خراپ حوکمدانەی بێتەوە سەر سکە، هەم لەلایەنی دەروونی و هەم لەلایەنی داراییەوە. فۆزە لە جۆری کەسێکی خاکی و سادە بوو کە قابیلی هەڵخەڵەتاندن نەبوو. ئەو بەرجەستەبووی کەسێک بوو کە وشەکانی بەمانا حەرفییەکەی وەردەگرت و وێنایەکی پێویستی نەبوو بۆ فریودان. لەو کاتە بەدواوە، دوقبی وەکانی خۆی ئاڕاستە کرد بۆ میلۆنەکان و مۆزەخانەکانی جیهان– پیاوانی بەبێ پێویست زیرەک بۆ ئەوەی بکەونە ناو تەڵەکانییەوە.

## کلیلی دەسەڵات

توانای پێوانەکردنی خەڵک و زانینی ئەوەی کە مامەڵە لەگەڵ کێدا دەکەیت گرنگترین شارەزاییە لە کۆکردنەوە و پاراستنی دەسەڵاتدا. بەبێ ئەمە تۆ کوێریت. نەک تەنیا تۆ خەڵکی بەگوناهاو بریندار دەکەیت، بەڵکو تۆ جۆرە هەڵەکان هەڵدەبژێریت بۆ ئەوەی ئیشیان لەسەر بکەیت و پێت وایە مەرایی خەڵکێک دەکەیت لەکاتێکدا کە بە ڕاستی دەیانشکێنیت. پێش هەر هەنگاوێک، پێشانەکەت بەبارە ئیحتیمالییەکەت هەڵسەنگێنە ئەگینا کات بەفیڕۆ دەدەیت و هەڵە دەکەیت. لاوازییەکانی خەڵک، دیوەکانی شانازی و

یانەمسییان بخوێنەرەوە. نارەوە و دەرەوەیان بناسە پێش ئەوەی تەنانەت بڕیار بدەیت تاخۆ مامەڵەیان لەگەڵ بکەیت یان نا.

دوو قسەی کۆتایی وریابوون. یەکەم، لە جوکردن و پێویستکردنی نەیارەکەتدا، قەت پشت بە غەریزەکانت مەبەستە. تۆ گەورەترین هەڵە دەکەیت ئەگەر پشت ئەستوور بیت بە پێوەری وەها نادرێک. هیچ شتێک ناتوانێت شوێنی کۆکردنەوەی مەعریفەی کۆنکرێتی بگرێتەوە. بۆ ناوەیەک نەیارەکەت بخوێنەرەوە و سیخوڕی بەسەردەوە بکە، ئەمە لە دووڕمەودادا کەڵکی دەبێت.

دووەم، قەت متمانە بە ڕواڵەتەکان مەکە. هەر کەسێک کە دڵی ماری هەیە دەتوانێت سەیشی بەزەیی بکات بۆ داپۆشینی. کەسێک کە لە ڕووکەشدا توندە زۆرجار لەناوەوەڕا ترسنۆکێکە. فێر بە ئەودیوی ڕووکارەکان و هاوبژییەکانیان ببینیت. قەت متمانە مەکە بەو فیگەرەی کە خەڵکی لەخۆیەتی پیشان دەدەن – ئەمە ئەوڵو متمانەپێنەکراوە.

وێنە: ڕاوچی. ئەو هەمان تەڵەی پێویستی بۆ گورگێک نانێتەوە. ئەو چەشنە لە شوێنێک دانانێت کە کەس بەلایدا نەڕوات. ئەو بەتەواوی نێچیرەکەی، خوورەکانی و دیوە شوێنەکانی دەناسێت و بەو پێیە ڕاوی دەکات.

دەسەڵات: قەناعەت بکە کە، کەسی نێچیرە و ناگرنگ بوونیان نییە، دەشێ هەندێ جار هەر ئەوانە دەسەڵاتێکیان هەبێت بەکەڵکی تۆ بێت کە ئەم کەڵکە بوونی نابێ ئەگەر تۆ جارێک لە جاران بریندارییان بکەیت. زۆر جاران هەڵەکان بیر دەچنەوە، بەڵام بریندارکردن قەت بیر ناچێتەوە. نەفسیەتمان هەمیشە بیری دەمێنێت.

(لۆرد چێستەرفیلد، ١٦٩٤–١٧٧٣)

## پێچەوانەکردنەوە

چاکەیەکی مومکین دەشێت لە نەزانی لەمەڕ ئەواستەرەوە بێت؟ فێر بە لە نەرجەکانەوە شتێرەکان نەناسێتەوە. ئەگینا ناجەکەی بدە. پەیڕەوی لەم یاسایە بکە لەوپەڕیدا، پێچەوانەبوونەوەی نییە.

# یاسای ژمارە ٢٠

## خۆت بەکەسەوە پابەند مەکە

### حوکم

ئەو کەسە گەمژە بووکە پەلەی کرد لە لایەنگیریدا. خۆت پابەند مەکە بەهیچ لایەنێك یان دۆزێك جگە لە خۆت. بە بەرقەرارکردنی سەربەخۆیی خۆت، دەبیتە گەورەی ئەوانیتر - یاریکردن بە خەڵك لەدژی یەکتری، وەها لێکردنیان کە شوێنی تۆ بکەون.

بەشی ١: خۆت پابەند مەکە بە کەسەوە، بەڵام با هەمووان مەرایيت بۆ بکەن

ئەگەر تۆ ڕێگە خۆش نەکەیت بۆ خەڵکی تا هەست بکەن خاوەنی تۆن، بە هەر رادەیەك بێت، هەموو دەسەڵاتێك بەسەریاندا لەدەست دەدەیت. بە پابەندنەبوون بە هۆگرییەکانت، ئەوا ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دەدەن بەدەستت بهێنن. لاتەریك بە و ئیتر تۆ ئەو دەسەڵاتە بەدەست دێنیت کە لە گرنگیدان و ئارەزووی ناتومێدانەیانەوە دێت. ڕۆڵی شاژنی پاکیزە ببینە: هیوایان بدەرێ بەڵام هەت تێرتیان مەکە

### پەیڕەویکردن لە یاساکە

کاتێك شاژنە ئەلیزابێسی یەکەم لە ١٥٥٨دا هاتە سەر تەختی شاهانەی ئینگلتەرە، زۆر شت هەبوو بکرێت بۆ دۆزینەوەی مێردێك بۆی. پرسەکە لە پەرلەمان مشتومڕی لەسەر کرا و بابەتێکی سەرەکی ڕووبێژەکان بوو لەنێو ئینگلیزەکانی هەموو چینەکاندا. ئەوان

زۆرجار ناکۆک بوون لەسەر ئەوەی دەبێ شاژن شوو بە کێ بکات، بەڵام هەمووان پێیان وابوو دەبێ ئەو چەندەی دەکرێ زوو شوو بکات، چونکە دەبێ بۆ هەر شاژنێک، پاشایەک هەبێت و دەبێ میراتگر بۆ مەمەکەتەکە بخاتەوە. مشتومڕەکان بۆ ماوەی ساڵانێک گەرم و گوڕ بوون. لەهەمان کاتدا قۆزترین و شیاوترین رکوزتییەکان لە قەڵەمڕەوەکەدا– سێر ڕۆبەرت دوبلی، ئێرلی سەسیکس، سێر والتەر ڕاله– کێبڕکێیان بوو بۆ دەستی ئەلیزابێس. ئەو، ئەوانی سارد نەدەکردەوە، بەڵام پێنەدەچوو بەلەشی بێت و ئاماژەکانی لەمەڕ ئەوەی کە کام پیاوە دەشێ دڵخوازی بێت، زۆرجار هاودژ و ناکۆک بوون. لە ساڵی ١٥٦٦دا، پەرلەکان رەفدێکی بۆ لای ئەلیزابێس نارد و داوای هاوسەرگیری بکات پێش ئەوەی ئەوەندە پیر بێت کە نەتوانێ وەچە بخاتەوە. ئەو مشتومڕی نەکرد، بە رەفدەکەشی نائومێد کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر وەک پاکیزەیەک مایەوە.

ئەو گەمە ناسکەی ئیلیزابێس لەگەڵ داخوازیکەرانیدا کردی، بەبا پەیت ئەوی کرد بە بابەتی چەندەها فەنتازیای سێکسی و بابەتی پەرستنێکی ئایینی. سیمون فۆرمەنی پزیشکی دەربار، یاداشتەکانی بەکارهێنا بۆ وەسفکردنی خەونی بەژنکردنی ئەلیزابێس وێنەکێشەکان ئەویان وەک دایانا و خودارەندەکانی تر ویناکرد. ئێدمۆند سپێنسەر و ئەوانیتر هۆنراوەی پیاهەڵوتنیان بۆ شاژنی پاکیزە نووسی. ئەو وەکو "ئیمپراتۆرەی جیهان" ئاماژەی پێکرا، ئەو "پاکیزە ڕەوشتبەرزە"ی کە حوکمی جیهان دەکات و ئەستێرەکانی دەهێنێتە حوڵە. لە وتوێژێکدا لەگەڵ ئەو، داخوازیکەرە مێرسەکانی، گوزارشتی سێکسی ئارەزوومەندیان بەکاردەهێنا، جۆرنەتێک کە ئەلیزابێس لای نەبوو لێیان ئەو هەموو ئەو شتەی لەتوانایدابوو کرد بۆ ئەوەی ئارەزوومەندییان ببزوێنێ و لەهەمان کاتدا دوور لەخۆیان بیانهێڵێتەوە.

لە سەرتاسەری ئەورووپادا، پاشا و میرەکان دەیانزانی کە هاوسەرگیرییەک لەگەڵ ئەلیزابێس دەشێ کۆتایی بە هاوپەیمانییەت بھێنێ لەنێوان ئینگلتەرە و هەر وڵاتێکی تردا. پاشای ئیسپانیا داوای کرد، وەک چۆن میری سوید و دیوکی نەمسا داوای کرد، ئەو بە ڕێزەوە هەموانی ڕەت کردەوە.

پرسی دیپلۆماسی گەورەی ڕۆژگاری ئەلیزابێس ڕووبەڕووی یاخیبگەری ڕەوییە ترمەکانی فلاندەرز و هۆڵەندییەکان بووەوە کە ئەو کاتە بەشێك بوون لە حاوەندارێتی ئیسپانیا. دەبوایە ئینگلتەرە هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئیسپانیا بشکاندایە و فەرەنسای وەکو هاوپەیمانی سەرەکی لە کیشوەرەکەدا هەڵبژاردایە و لەوێوە هانی سەربەخۆیی فلاندەرزەکان و هۆڵەندییەکانی بدایە؟ بەهاتنی ۱٥٧٠، وا پێدەچوو هاوپەیمانییەك لەگەڵ فەرەنسا زیرەکانەترین هەنگاوی ئینگلتەرە بێت. فەرەنسا دوو پیاوی شەریعی لە خوێنی خانەدانەکان هەبوو، دوکەکانی ئانجۆ و ئالێنچۆن، برایانی پاشای فەرەنسا. ئایا هیچ کامیان هاوسەرگیری لەگەڵ ئەلیزابێس دەکرد؟ هەردووکیان حاڵی بەهێزیان هەبوو و ئەلیزابێس هیوای هەردووکیانی بە زیندوویی هێشتەوە. پرسەکە بۆ ساڵانێك درێژەی هەبوو. دوکی ئانجۆ چەند سەردانێکی بۆ ئینگلتەرە ئەنجامدا، ئەلیزابێس بە ئاشکرا ماچ کرد، تەنانەت بە ناوی ماردارلە بانگی کرد، ئەوەندە دیار بوو کە وەڵامگۆی سۆزەکانی بێت. لەهەمان کاتدا، لەکاتێکدا کە ئەو لەگەڵ دوو براکەدا گفت و لفتی هەبوو، پەیماننامەیەك واژۆ کرا کە ئاشتیی لەنێوان فەرەنسا و ئینگلتەرەدا هێنایە کایەوە. بەهاتنی ۱٥٨٢، ئەلیزابێس هەستیکرد کە دەتوانێ پەیوەندییە ڕۆمانسییەکە بپچڕێنێت بەتایبەت لە حاڵەتی دوکی ئانجۆدا، بە ئاسوودەییەوە ئەمەی کرد. لەپێناو دیپلۆماسیدا ئەو ڕێگەی بەخۆیدابوو تا لەلایەن پیاوێکەوە مەرایی بکرێت کە ئەو نەیدەتوانی بەرگەی ئامادەبوونەکەی بگرێت و لەڕووی جەستەییەوە بە دزێو دەیبینی. هەر کە ئاشتی نێوان فەرەنسا و ئینگلتەرە مسۆگەر بوو، ئەو هەتا توانی بە ئەدەبەوە دوکە زمان لووسەکەی ڕەت کردەوە

بەهاتنی ئەو کاتە ئەلیزابێس زۆر لەوە بەتەمەنتر بوو منداڵ بخاتەوە. ئەو بەم پێیە توانی بەشی دواتری ژیانی بەو شێوەیەی دەیویست بەسەر بات و وەکو ژنی پاکیزە کۆچی دوایی کرد. ئەو هیچ میراتگرێکی ڕاستەوخۆی لەدوای خۆی جێ نەهێشت، بەڵام لەماوەیەکی ئاشتی و چالاکیی کەلتووریی بێ پێشینەدا حوکمی کرد

## لێکدانەوە

ئەلیزابێس پاساوێکی باشی هەبوو بۆئەوەی هاوسەرگیری نەکات. ئەو شاهەتی هەڵەکانی ماری شاژنی سکۆتلەندە بوو کە ئامۆزای بوو. بەهۆی بەرەنگارییان بەرامبەر بیرۆکەی فەرمانڕەواییکردنیان لەلایەن ژنێکەوە، سکۆتلەندییەکان چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد ماری هاوسەرگیری بکات و هاوسەرگیرییەکەی ژیرانە نەبێت. هاوسەرگیری لەگەڵ بیانییدا نەخوازراو بوو، مەیل بۆ ماڵێکی خانەدانی دیاریکراو دەرگای پێکەوەژیانییەکی ئەساکی دەرکردەوە. لە کۆتاییدا، ماری لۆرد دارنلی هەڵبژارد کە کاسۆلیک بوو. لەم کردارەیدا، ئەو کینەی پرۆتێستانتەکانی سکۆتلەندە و پەشێوی ناکۆتای دروواند.

ئەلیزابێس دەیزانی هاوسەرگیری زۆرجار دەتوانێ سەر بکێشێت بۆ کۆتاییهاتنی بە فەرمانڕەوای مێینە؛ بە هاوسەرگیری و پابەندبوون بە هاوپەیمانێتییەک لەگەڵ لایەنێک یان وڵاتێک، شاژن دەگلێتە ناو ئەو ململانێیانەی کە لە هەڵبژاردنی خۆی نین، ئەو ململانێیانەی کە دەشێ بۆ دواجار ئەو سەرکوت بکەن یان بەرەو جەنگێکی بێ ئاکام ببەن.

هەروەها، مێردەکە دەبێتە فەرمانڕەوای دیفاکتۆ و زۆرجار هەوڵ دەدات ژنەکەی کە شاژنە، وێڵ بکات، هەروەک دارنلی هەوڵیدا خۆی لە ماری قوتار بکات. ئەلیزابێس باش پەندی لە وانەکە وەرگرت. ئەو وەکو فەرمانڕەوا دوو ئامانجی هەبوو. خۆلادان لە هاوسەرگیری و خۆلادان لە جەنگ. ئەو توانی ئەم ئامانجانە لە ڕێگەی خستنەڕووی ئەگەری هاوسەرگیری بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانێتی، توانی ئەو ئامانجانە لێکبدات. ئەو ساتەوەختەی کە ئەو پابەند بوو بە هەر ئاکە داخوازیکەرێک ئەو سامانەوەختە دەبوو کە دەسەڵاتی بەدەست دەدا. دەمتوانە ئەو ڕاز و ئارەزوو دروست بکات و قەت هیواکانی کەس وێڵ نەکات و قەتیش مل نەدات.

بەدرێژایی گەمەی گفت و لفت خوشی و کشانەوە کە نەمەبیکی جانەدە، ئەلیزابێس بەسەر وڵات و هەر پیاوێکیشدا زاڵ بوو کە دەیویست بەدەستی بێنێت. وەکو سەنتەری

مەنجەڵەکە وەربدەیت، ماندوو و ناڕەزووومەندیی دروستبێت، خەڵکی بە ئەگەری ئەوەی تۆ بەدەست نیزمی مەکێش دەکەیت. پاشان دەبێ تۆ ناوبەناو مل بۆ ئەرکێو و سەرنجدان بدەیت – بەڵام قەت ئەوەندە دوور مەڕۆ.

سەرباز و دەوڵەتمەداری یۆنانی (ئالسیبیادیس) ئەم یارییەی بە باشی ئەنجامدا. ئەوە ئالسیبیادیس کە ئیلهامبەخش و پشتیوانی ڕەوەکێشی جەنگی گەورەی ئەسینایییەکان بوو کە (سیسیلی)یان لە ٤١٤ی پێش زایین داگیر کرد. کاتێک ئەسینایییە نێردەی بەرەکان گەڕانەوە ماڵەوە، هەوڵیاندا بیهێننە خوارەوە بە تۆمەتبارکردنی بە بە تۆمەتی ساختە، ئەو چووە پاڵ دوژمن، سپارتاکان، لەبری ڕووبەڕووبوونەوەی دادگایی لە زێدی خۆی. پاشان پاش ئەوەی ئەسینایییەکان لە (سیراکیوس) شکستیان پێهێنرا، ئەو سپارتای جێهێشت و چووە وڵاتی فارس، ئەگەرچی دەسەڵاتی سپارتا ئێستا لە زیادبووندا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێستا هەم ئەسینایییەکان و هەم سپارتاکان ئالسیبیادیسیان دەدواند بەهۆی کاریگەرییەکەیەوە لەسەر فارسەکان و فارسەکان ڕێزیان بەرامبەر دەنواند بەهۆی دەسەڵاتەکەیەوە بەسەر ئەسینایییەکان و سپارتاکاندا. ئەو بەڵێنی بە هەموو لایەنەکاندا بەڵام پابەندی هیچیان نەبوو و لە کۆتاییدا هەموو کارتەکانی بەدەستەوە بوو.

ئەگەر تۆ حەزت بە کاریگەری و دەسەڵاتەوە دەبێ، تەکتیکی ئالسیبیادیس تاقی بکەرەوە، خۆت بخەرە نێوان هێزە ڕکابەرەکان. بە بەڵێنی یارمەتیت لایەنێک بەکێش بکە، لایەنەکەی تر هەمیشە دەیەوێ هەنگاوێک زیاتر لە دوژمنەکەی بچنە پێش، ئەویش شوێنی تۆ دەکەوێت. لەکاتێکدا کە هەر لایەنێک لە لایەنەکان کێبڕکێ لەسەر هۆش و سەرنجی تۆ دەکەن، تۆ دەستبەجێ وەکو کەسێکی خاوەن کاریگەری و سەنگ دەردەکەوێت. دەسەڵاتێکی زۆرتر دێتە بەر دەستت بە بەراورد بەو حاڵەی کە تۆ بەجیابوونی پابەند بوویتایە بە لایەنێکەوە. بۆ ئەوەی ئەسپی جووت بەم تاکتیکە بدەیت پێویستە لەناوەوەدا ئازاد بیت لە تێوەگلانە هەستییەکان و لە

دەسەڵاتگرتنەدەستدا هەموو ئەوانەی دەوروبەرت وەکو بوکەڵە ببینیت. تۆ ناتوانیت ڕێگە بە خۆت بدەیت ببیتە حورمەتگار بۆ هیچ دوورێك.

لە گەرمەی هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکەی ١٩٦٨ی ئەمریکادا، هێنری کیسینجەر پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەگەڵ تیمی ریچارد نیکسۆن ئەنجامدا. کیسینجەر هاوپەیمان بوو لەگەڵ نیلسۆن ڕۆکفێلەر، کە بەشێوەیەکی ناسەرکەوتووانە سۆراخی پاڵاوتنی کۆماری کرد. ئێستا کیسینجەر پێشنیاری کرد زانیاریی ناوەکی لەبارەی دانوستانەکانی ئاشتی لە ڤێتنام بخاتە بەردەم کەمپی نیکسۆن، کە ئەو کاتە لە پاریس لەئارادا بوو. ئەو پیاوێکی لە تیمی دانوستاندا هەبوو کە لەبارەی دوایین بەرەوپێشچوونەکان ئاگاداری دەکردەوە. تیمی نیکسۆن بە خۆشحاڵییەوە ئەم ئۆفەرەی قبوڵ کرد.

لەهەمان کاتدا، کیسینجەر لە پاڵێوراوی دیموکراتەکان، هوبێرت هومفێری نزیک دەکەوتەوە و پێشنیاری یارمەتیدانی کرد. کەسانی نزیك لە هومفێری داوای زانیاریی ناوەکییان لەبارەی نیکسۆن لێکرد و ئەویش حستیەڕوو. کیسینجەر بە کەسانی نزیك لە هومفێری وت: "برالی، من ساڵانێك بوو ڕقم لە نیکسۆن بووە". لە ڕاستیدا ئەو گرنگی بەهیچ کام لەلایەکان نەدەدا. ئەوەی کە بە ڕاستی دەیویست بەدەستیهێنا: بەڵێنی پۆستێکی بەرزی کابینەکە هەم لە نیکسۆن و هەم لە هومفێری. هەر کەسێکیان هەڵبژاردنی ببردایەتەوە، پۆستەکەی کیسینجەر مسۆگەر بوو.

بێگومان، براوەکە نیکسۆن بوو. کیسینجەر بەم پێیە پۆستەکەی لە کابینەکەی ئەو بەدەستهێنا. تەنانەت ئەو وریا بوو لەوەی قەت وەکو پیاوی نیسکۆن دەربکەوێت. کاتێك نیکسۆن لە ١٩٧٢دا هەڵبژێردرایەوە، پیاوانی زۆر لەو بەئەمەکتر بۆ نیکسۆن لەسەر کار لابران. کیسینجەر هەمیشە تاکە کاربەدەستی بەرزی نیکسۆن بوو کە لە سکاندڵی وەتەرگەیت تووشاری نەبوو و لە کابینەی سەرۆکی دواتر، جیراڵد فۆردیشدا خزمەتی کرد. بە هێشتنەوەی کەمێك دووریی، لەسەردەمە پەشێوەکاندا بەرگەی گرت.

ئەو کەسانەی ئەم ستراتیژە بەکار دێنن، زۆرجار تێبینی دیاردەیەکی سەیر دەکەن: ئەو خەڵکەی بەپەلە دەپڕژێنە سەر پشتیوانی ئەوانی، ڕێزێکی کەم لە پرۆسەکەد

بەدەست دێنن؛ چونکە پارمەتییەکەی مەئاسایی بەدەست دەھێنێت، لەکاتێکدا کە ئەوانەی ھەڵوەستە دەکەن، خۆیان بە دەورەدراو بە تێکاکار دەبیننەوە.

کاتێک پیکاسۆ، پاش ساڵانی سەرەتای ھەژاری، بووە سەرکەوتووترین ھونەرمەند لە جیھاندا، خۆی پابەند نەکرد بەم مامەڵەکار یان ئەو مامەڵەکارەوە، ھەرچەندە ئەوان ئێستا لە ھەموو لایەکەوە بە ئۆفەری سەرنجڕاکێش و بەڵێنی گەورە دەوریان دابوو. لەبری ئەمە، ئەو وا خۆی دەرخست کە بایەخ بە خزمەتگوزارییەکانیان نادات. ئەم تەکنیکە ئەوانی شێتگیر کرد و لەکاتێکدا کە بۆ بەدەستھێنانی لە ململانێدا بوون، نرخەکانی ئەو بەرز دەبووەوە. کاتێک ھێنری کیسینجەر، وەکو وەزیری دەرەوە ویستی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتدا پەیوەندییەکان ئاسایی بکاتەوە، ھیچ سازشێک یان ئاماژەی ئاشتەوایی بەدەستەوە نەدا، بەڵکو لەبری ئەمە گفتوگۆی لەگەڵ چیندا ئەوالند. ئەمە بووەھۆی تووڕە بوون و ھەروەھا ترسانی سۆڤیێتییەکان– ئەوان ھەرگیز لەڕووی سیاسییەوە گۆشەگیر ببوون و لە گۆشەگیریی زیاتر دەترسان ئەگەر ئەمریکا و چین لێک نزیک ببوونەیەوە. ھەنگاوەکەی کیسینجەر ئەوان بەرەو مێزی دانوستان ئاراستە کرد. تەکنیکەکە بە یەکێشکردندا ھاوتەریبێکی ھەیە: ستێندال دەڵێت، کاتێک تۆ دەتەوێ ژنێک بەکێش بکەیت، یەکەم جار مەرایی خوشکەکەی بکە.

لاتەریک بە و خەڵکی خۆیان بە پێتەوە دێن. ئەمە دەبێتە تەحەددییەک بۆیان تا سۆزی تۆ بەدەست بێنن. تا ئەو جێیەی کە لاسایی شاژنی پاکیزە دەکەنەوە و ھیراکانیان دەگەشێنیتەوە، تۆ وەکو موگناتیسێکی هۆش، سەرنج و ئارەزوو دەمێنیتەوە.

**وێنە:** شاژنی پاکیزە. سەبەتەری هۆش، ئارەزوو و پەرستش. بەوەی کە ملی بۆ ئاگە دخوازیکەرێک نەدا. شاژنی پاکیزە وایلێکردن لە دەور و خولیدا بێن و بچن وەکو ھەسارەکان، بێ ئەوەی بتوانن لە مەدارەکەی دەرچن و نە بشتوانن لەوە زیاتر لێی نزیک ببنەوە.

دەسەڵات: خۆت پابەند مەکە بە هیچ کەسێک یان هیچ شتێک، چونکە ئەمە دەتکات کۆیلە، کۆیلەی هەموو کەسێک. لەسەرووی هەموو شتێکەوە، خۆت لە پابەندبوون و کۆت و بەندەکان لادە- ئەمانە ئامرازی کەسێکی ترن بۆ ئەوەی بتخەنە ناو دەسەڵاتی خۆیەوە

(بالتازار گراسیەن، ١٦٠١-١٦٥٨)

## بەشی ٢ پابەند مەبە بە هیچ کەسێکەوە- خۆت تێکەڵ مەکە

*ڕێگە مە خەڵک مەدە ڕاتکێشنە ناو شەڕ و دەمەقاڵێ ناچیزەکانیان. ئارەزوومەند و پشتیوان دیار بە، بەڵام ڕێگەیەک بدۆزەرەوە بۆ ئەوەی بێلایەن بمێنیتەوە. ڕێگە بەوانیتر بدە شەڕەکە بکەن لەکاتێکدا کە تۆ دوور بوەستە، تەماشا بکە و چاوەڕێ بە. کاتێک لایەنە شەڕکەرەکان ماش بن و ماندوو بوون ئەوا ئێستر پێگەیشتوون بۆنەوەی لێیان هەڵبژێریت. لە ڕاستیدا تۆ دەتوانیت ئەوە بکەیتە پراوەیەک کە دەمەقاڵێ لەنێوان خەڵکی تردا بوروژێنیت و پاشان پێشنیاری نێوانگیری بکەیت، وەکو نێوانگیرێک دەسەڵات بەدەست بێنیت.*

## پەیڕەوکردن لە یاساکە

لە سەدەی پانزەدا، بەهێزترین دەوڵەتشارەکان لە ئیتاڵیا- ڤینیسیا، فلۆرێنس، ڕۆم و میلان- خۆیان لە دەمەقاڵێیەکی بەردەوامدا بینییەوە. فەرەنسا و ئیسپانیا کە بەسەر سەریانەوە وەستابوون، ئامادەبوون هەرچییەک بیتوانن لە هێزە لاوازبووەکانی ئیتاڵیا بەدەستی بێنن. ئەوەشی کە لە ناوەڕاستدا گیری خواردبوو دەوڵەتی بچوکی (مانتوا) بوو لەلایەن دوکی گەنج، جیانفرانسیسکۆ گۆنزاگا، فەرمانڕەوایی دەکرا. مانتوا لەڕووی ستراتیژییەوە کەوتبووە باکووری ئیتاڵیا و پێدەچوو تەنها پەیوەندی بە کاتەوە هەبێت

پێش ئەوەی یەکێك لە هێزەکانی فەوتی بدات و چیتر وەکو مەملەکەتێکی سەربەخۆ بوونی نەمێنێت

گۆنزاگا جەنگاوەرێکی توند و فەرمانڕەوایەکی لێهاتوو بوو و بووە زەنەراڵێکی بەکرێگیراو بۆ هەر لایەنێك کە باشترین پارەی پێبدایە. لە ساڵی ١٤٩٠دا، هاوسەرگیری لەگەڵ ئیزابێلا دێستی کرد، کچی فەرمانڕەوای قەڵەمڕەوی دوکی (فێرار). لەبەرئەوەی ئەو ئێستا بەشی هەرە زۆری کاتەکەی دوور لە مانتوا بەسەر دەبرد، ئیزابێلا وای بە مێردا هات کە ئەو لەبری ئەم فەرمانڕەوایی بکات

یەکەمین تێبینی ڕاستەقینەی ئیزابێلا وەکو فەرمانڕەوا لە ١٤٩٨دا بوو کاتێك پاشا لویسی دوازدەهەمی فەرەنسا خەریکی ئامادەکردنی سوپا بوو بۆ هێرشکردنە سەر میلان. لە بەرگی فریودەرانەی هەمیشەییاندا، دەوڵەتانی ئیتالیا دەستبەجێ بەدوای ڕێکەوتنێکدا گەڕان بۆ قازانجکردن لە تەنگەرەکانی میلان. پاپا ئەلێکساندەری شەشەم بەڵێنیدا تێکەڵ نەبێت، لەوێوە سەربەستی تەواوی دایە فەرەنسییەکان. ڤینیسییەکانیش ئاماژەی ئەوەیاندا کە یارمەتی میلان نادەن— و لەبەرانبەر ئەمەدا، ئەوان هیوای ئەوەیان هەبوو فەرەنسییەکان (مانتوا)یان بدەنێ. فەرمانڕەوای میلان، لۆدۆڤیکۆ سفۆرزا، لەپڕێکدا خۆی بەتەنیا و دەست لێبەربراو بینییەوە. ئەو ڕوویکردە ئیزابێلا دێستی، یەکێك لە هاوڕێ هەرە نزیکەکانی (هەروەها دەنگۆی ئەوەش هەبوو مەعشوقی بێت) و لێی پاڕایەوە تا دوکی گۆنزاگا ڕازی بکات تا یارمەتی بدات. ئیزابێلا هەوڵیدا، بەڵام مێردەکەی ڕازی نەبوو، چونکە دۆزی (سفۆرزا)ی بە نائومێدبەخش بینی. بۆیە، لە ١٤٩٩دا، لویس هەڵیکوتایە سەر میلان و بە ئاسانی گرتی

ئێستا ئیزابێلا ڕووبەڕووی تەنگژەیەك دەبووەوە: ئەگەر تۆ لەگەڵ لۆدۆڤیکۆ بەئەمەك بووایە، فەرەنسییەکان لەدژی هەنگاویان دەنا. بەڵام ئەگەر لەبری ئەمە، خۆی لەگەڵ فەرەنسا ڕێك بخستایە، لە شوێنی نزیکی ئیتالیا دوژمنی بۆ خوی پەیدا دەکرد، بە (مانتوا)شەوە کە لویس دوواجار لێی کشایەوە. ئەگەر تۆ یارمەتی بووی نەکردایەتە ڤینیسیا بێ یان ڕۆم بە ئاسانی (مانتوا)یان لە ژێر ڕووپۆشی یارمەتی ئەودا قوت

دەن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەبووایە شتێك بكات. پاشای بەتوانای فەرەنسا لە ڕێگەوە چارەیری كرد. ئەو بڕیاریدا دۆستایەتی بكات، وەك چۆن پێش ئەم دۆستایەتی لودۆڤیسۆ سفۆرزای كردبوو. بە دیاریی سەمەرەكانیش، نامەی زیرانە و ئەگەری هاوەڵێتیكردنی، چونكە ئیزابێلا زیرەك بوو بە جوانی و سیحرە دایانەكەی ناسراوبوو

له ١٥١٥دا لویس بانگهێشتی ئیزابێلای كرد بۆ ئاهەنگێكی گەورە لە میلان بۆ ستایشكردنی سەركەوتنەكەی. لیوناردۆ داڤینچی شێرێكی میكانیكی گەورەی بۆ بۆنەكە دروستكرد، كاتێك شێرەكە دەمی كردەوە، گوڵی لیلی فرێنش لە دەمی هاتە دەرەوە، كە ڕەمزی ئەمەكدارێتی فەرەنسا بوو. لە ئاهەنگەكەدا، ئیزابێلا یەكێك لە دیزاینە جوانەكانی پۆشی (ئەو گەورەترین دۆڵابی جلوبەرگی هەبوو) و هەر بەو شێوەیەی كە هیوای دەخواست، سیحری لە لویس كرد كە هەموو خانمەكانی تری فەرامۆش كرد و هەوڵیدا بكەوێتە ژێر سەرنجی. ئیزابێلا بەزوویی بووە هەوەڵی بەردەوامی ئەو و لەبەرامبەر هاوڕێیەتییەكەیدا ئەو پەیمانیدا پارێزگاری لە سەربەخۆیی مانتوا بكات لە ڤێنیسیا

لەكاتێكدا كە مەترسییەك نەما، دانەیەكی تر كە بێگەرانكەرتر بوو سەریهەڵدا، ئەمجارە لەباشوورەوە و لە شێوەی قەیسەر (بۆرگیا)دا. لە سەرەتای ١٥٠٠ەوە، بۆرگیا بەشێوەیەكی بەردەوام بەرەو باكوور ڕێی دەكرد، بەناوی پاپا ئەلێكساندەری باوكییەوە، هەموو ئەو مەملەكەتە بچوكانەی قووت دەدا كە لە ڕێگەیدابوون. ئیزابێلا بەتەواوی لە قەیسەر تێگەیشت. ئەو نە دەكرا متمانەی پێبكرێت نە بەشێوەیەك لە شێوەكان ئیهانە بكرێت. دەبووایە ئەو مەرایی بۆ بكرێت و لە دوور بهێڵرێتەوە. ئیزابێلا دەستیكرد بە ناردنی دیاری بۆی– بازەكان، سەگی حەلات، بۆن، و دەیان ماسك، كە دەیزانی ئەو هەمیشە لەكاتی هاموشۆ بە شەقامەكانی ڕۆمدا دەیپۆشیی. ئەو نامەبەری بە سڵاو و ئەحواڵپرسی گەرم و گوڕەوە ناردن (هەرچەندە ئەم نامەبەرانەش وەكو سیخوڕ كاریان كرد). لە ساتێك لە ساتەكاندا قەیسەر پرسی ئاخۆ دەتوانێت هەندێ سەربەر لە (مانتوا) حەنگیر بكات، ئیزابێلا بە ئەدەبەوە لە داواكە ساردی كردەوە، چونكە باش دەیزانی هەر كە سەربازەكان لە شارەكە جێگیر كران، قەت ناڕۆن

ئەمانەت لەکاتێکدا کە ئیزابێلا جادووی لە قەیسەر دەکرد، هەموو کەسی دەوری خۆی ئاگادار کردەوە لەوەی وریا بن قسەیەکی تووند لەبارەی نەکەن، چونکە ئەو سیحرەی لەهەموو شوێنێك هەبوو بچوکترین پاساوی بۆ داگیرکردنی بەکار دەهێنا. کاتێك ئیزابێلا ساڵێکی هەبوو، داوای لە قەیسەر کرد ببێتە باوکی باوەڕێگراوی. ئەمەش ئەو ئەگەری هەوسەرگیریی نێوان خانەوادەکەی خۆی و ئەوی هێنایە بەر باس. بەشێوەیەك لە شێوەکان هەموو ئەمە کاریگەر بوو، چونکە هەرچەندە لە شوێنی تر هەموو شتێکی سەر ڕێگاکەی زەوتکرد، (مانتوا)ی وازلێهێنا.

لە ١٥٠٣دا، باوکی قەیسەر، ئەلێکزاندەر، کرد و چەند ساڵێك دواتر پاپای نوێ جولیەسی دووەم چووە جەنگەوە بۆ کردنەوەی سەربازانی فەرەنسی لە ئیتاڵیا. کاتێك فەرمانڕەوای فێرارا – ئالفۆنسۆ، برای ئیزابێلا – لایەنگیری فەرەنسییەکانی کرد، جولیەس بڕیاریدا هێرش بکات و ڕیسوای بکات. جارێکی تر ئیزابێلا خۆی لە ناوەڕاستدا بینییەوە پاپ لەلایەکەوە، فەرەنسییەکان و براکەی لەلایەکی ترەوە. ئەو جورئەتی کرد کە لەگەڵ هیچ کامێکیاندا خۆی ڕێکنەخات، بەڵام ئیهانەکردنی هەر کامێکیشیان کارەساتبار دەبوو. جارێکی تر، ئەو گەمەیەکی دووفاقیانەی کرد کە تیایدا ئەسپی خۆی تاو دابوو. لەلایەکەوە بە گوێرەگوێی مێردەی وتبوو بۆ پاپا شەڕ بکات، کە دەیزانی ئەو زۆر تووند شەڕ ناکات. لەلایەکی ترەوە ڕێگەی بە سەربازانی فەرەنسیدا بە مانتوا دا ڕەت بن بۆئەوەی بێنە هانای (فێرارا). لەکاتێکدا کە ئەو بە ئاشکرا سکاڵای ئەوەی دەکرد کە فەرەنسییەکان خاکەکەی ئەمیان "داگیر" کردووە، بە نهێنی زانیاریی بەنرخی پێدەدان بۆئەوەی داگیرکردنەکە بۆ جولیەس مومکین بکات، ئەمانەت وەها پیشاندا کە فەرەنسییەکان خەریکی تاڵانکردنی (مانتوا)ن. جارێکی تر ئەمەش کاریگەر بوو. پاپا بەتەنیا (مانتوا)ی جێهێشت.

لە ١٥١٢دا، پاش گەمارۆیەکی درێژخایەن، جولیەس شکستی بە فێرارا هێنا و سەربازانی فەرەنسی کشانەوە. پاپا کە بەهۆی تەقەڵاکەوە برستی لەبەر بڕابوو پاش

چەند مانگێک مرد . بە مردنی پاپ، سوپای مونتەکەناسای ئەسپەکان و دەمەقاڵی ماچیرەکان هۆبان چەسپاندە کردەوە

گۆڕانکارییەکی زۆر لەماوەی حوکمی ئیزابێلادا لە ئیتالیا ڕوویدا. قەیسەر بۆرگیا هات و ڕۆیشت، قیبیسیا ئیمپراتۆرییەتەکەی لەدەستدا، میلان داگیرکرا، فلۆرێنس بەرەو ئاوابوون چوو و ڕۆم لەلایەن ئیمپراتۆری هابسبورگ، چارلزی پێنج تالان کرا. بەدرێژایی هەموو ئەمە، (مانتوا)ی بچوک نەک ئەنیا مەرگەی گرت بەڵکو ژیایەوە. سامانەکەی و سەروەرییەکەی بۆ ماوەی سەدەیەک پاش مەرگی ئیزابێلا لە ١٥٣٩دا، بە تێکەیی دەمایەوە

## لێکدانەوە

ئیزابێلا دیست بە ڕووبیەکی سەرسوڕهێنەوە لە ماروئۆجی سیاسی ئیتالیا تێگەیشت. کاتێک تۆ لایەنگیری هەر هێزێکی مەیدانەکە دەکەیت، کارت لەکار ترازاوە. بەهێزەکەیان بەسەرتدا واڵ دەمێنێت و لاوازەکە بەهەشت لەبەر دەبڕێت. هەر هاوپەیمانێتییەکی نوێ سەر دەکێشێت بۆ دوژمنێکی نوێ و ئەم سوڕە ململانێی زۆرتر دەورووژێنێت، هێزەکانی تر ڕادەکێشرێنە ناوەوە، تا ئەو کاتەی کە تۆ چیتر ناتوانیت خۆت قوتار بکەیت. دواجار دەشێ تۆ بەهێزی بڕست لێبراو بڕوخێیت.

ئیزابێلا ئەنیا لەسەر ئەو ڕێڕەوە مەملەکەتەکەی ئاراستە کرد کە سەلامەت بوو. ئەو ڕێگەی بەهێزی نەدەدا لە ڕێگەی ئەمەک و وەفاداری بۆ دوک یان پاشا سەری بە فەتارەت بچێت. بە هەوڵێشی دەدا ئەو ململانێیە بوەستێنێت کە لە دەوروبەری هەڵدەبەست- ک ئەنیا ڕایدەکێشایە ناوی. لە هەر حاڵەتێکیشدا ململانێکە لە بەرژەوەندی ئەو بوو. ئەگەر لایەنە جیاجیاکان تا مردن دەجەنگان و لە پرۆسەکەدا هێزیان تیا نەدەما، ئەوان بە ڕێگەیەکدا نەبوون کە مانتوا قوت بدەن. سەرچاوەی هێزی ئیزابێلا توانای زیرەکانەی بوو بۆ ئەوەی وا دیار بێت کە بایەخ بە کێشەکانی هەر یەک لەلایەنەکان دەدات و

بەرژەوەندییەکانمان ڕەچاو دەکات، لەکاتێکدا کە بە ڕاستی بە هیچ کەسێکەوە پابەند نەبوو جگە لە خۆی و مەملەکەتەکەی

کاتێك تۆ پێ دەنێیتە ناو شەڕێکەوە کە لە هەڵبژاردنی خۆت نییە، هەموو دەستپێشخەرییەك لەدەست دەدەیت بەرژەوەندییەکانی شەڕکەران دەبنە بەرژەوەندییەکانی تۆ. تۆ دەبیتە ئامرازیان. فێر بە خۆت کۆنترۆڵ بکەیت، مەیلی سروشتیت بۆ لایەنگیری و چوونە ناو شەڕ کۆت بکەیت. دۆستانە و سەرنجڕاکێش بە بۆ هەرکام لە لایەنە شەڕکەرەکان، پاشان لەکاتێکدا کە پێکدا دەدەن بکشێوە. ئەوان لە هەر شەڕێکدا لاوازتر دەبن، لەکاتێکدا کە تۆ لەگەڵ هەر شەڕێکدا کە خۆتی لێ لادەدەیت، بەهێزتر دەبیت

## کیلی دەسەڵات

بۆئەوەی لە گەمەی دەسەڵاتدا سەرکەوتوو بیت، دەبێت لە هەستەکاندا ئەسپی خۆت تاو بدەیت. بەڵام تەنانەت ئەگەر لە بەدەستهێنانی خۆکۆنترۆڵکردنێکی وەهادا سەرکەوتوو بیت، هێشتا ناتوانیت مێزاجی ئەوانەی دەوروبەریت کۆنترۆڵ بکەیت. ئەمەش مەترسییەکی گەورە دەخاتەڕوو. زۆربەی خەڵك لە گێژاوی هەستەکاندا کار ڕەفتار دەکەن، بە بەردەوامی کاردانەوە پیشان دەدەن، دەمەقاڵێ و ململانێ دەوروژێنن. ئۆتۆنۆمی و خۆکۆنترۆڵکردنت تەنیا هەڵچوونیان دەکات. ئەوان هەوڵ دەدەن ڕاتکێشنە ناو گێژەنەکە، لێت دەپاڕێنەوە لە شەڕە ناکۆتاکانیاندا لایەنگیری بکەیت و هەڵوێستت هەبێت یان ئاشتیان بۆ بەرقەرار بکەیت. ئەگەر تۆ وەڵامگۆی بکا هەستییەکانیان بیت، ئەوا پەیتا پەیتا خۆت دەردەکەویت کە کات و ئەقڵت بە کێشەکانیان ڕکێف کراوە. ڕێگە مەدە سۆز و بەزەییت قورحت بکەن. تۆ قەت ناتوانیت ئەم گەمەیە ببەیتەوە، ملمڵانێکان تەنیا چەندقات زیاد دەکەن.

لەلایەکی ترەوە، تۆ ناتوانیت بەتەواوی لەلاوە بوەستیت، چونکە ئەمە ئیهانەیەکی بێپێویستی لێدەکەوێتەوە. بۆئەوەی گەمەکە بە ڕێکوپێکی بکەیت، دەبێ وەك دیاری

سەر کە گرنگی بە کێشەکانی خەڵک نەدەدەیت، تەنانەت هەندێ جار وا دیار بێت کە لایەنگیریی دەکەیت. بەڵام لەکاتێکدا کە بۆ ئامانجی ڕواڵەتییەکەی پشتگیری پێیان دەدەیت، دەبێ وریای ناوەوەت بپارێزیت لە ڕێگەی دوورەپەرێز هێشتنەوەی دەستەکانت. گرنگ نییە خەڵکی چەندێک سەرسەختانە هەوڵ دەدەن ڕاتکێشنە ناوەوە بۆ پشتگیری، ئەت گرنگی بە کێشەکان و کاروبارەکان و دەمەقاڵێیە ناچیزەکانیان مەدە بە پووکەش نەبێت. تیایاندا بە ڕواڵەتێکی هاوسۆزانەوە گوێیان لێ بگرە، تەنانەت ڕۆڵی کەسی سەرخەراکێش ببینە- بەڵام لەناوەوەدا هەم لە پاشا دۆستەکان و هەم لە بورگیا دڵنیانەبێنەکراوەکان دوور بکەوە. بە ڕەتکردنەوەی پابەندبوون و لێرەوە بەرقەرارکردنی سەربەخۆیی خۆت دەستپێشخەرییەکە دەپارێزیت: جوڵەکانی تۆ پەیوەندیدار دەبن بە هەڵبژاردنی خۆتەوە، نەک بەرپەرچەکردارە بەرگریکارەکان لە بەرانبەر بێنە و بەردەی ئەوانەی لەدەوروبەرتن

دەشێ هاوی لە هەڵبژاردنی چەکەکانتدا خۆی چەکێک بێت، بەتایبەت ئەگەر تۆ ڕێگە بدەیت خەڵکی تر لە شەڕکردندا بڕست لەخۆیان ببڕن، پاشان کەڵک لە بێهێزی لێبڕانەکەیان وەرگرە. لە چینی دێریندا، مەملەکەتی چینی جارێک لە جاران مەملەکەتی (هسینگ)ی داگیر کرد. (هوان)، فەرمانڕەوای ناوچەیەکی نزیک، بیری لەوە کردەوە کە دەبێ پەلە بکات بۆ بەرگریکردن لە (هسینگ)، بەڵام ڕاوێژکارەکەی ئامۆژگاری کرد چاوەڕێ بێت. وتی "هسینگ هێشتا ماوەیەتی بڕوخێت و چین هێشتا بڕستی لێ نەبڕاوە، ئەگەر چین بڕستی لەبەر نەبڕێت، ئێمە ناتوانین زۆر کاریگەر بین. سەرباری ئەمەش، شایستەیی پشتگیریکردن لە دەوڵەتێک کە لە مەترسیدایە ئەوەندەی مەزنیەتی دەوڵەتێک کە لە گیانەلادایە، گەورە نییە" بەڵگاندنەکەی ڕاوێژکار کەڵکی هەبوو و وەک ئەوەی پێشبینی کردبوو، دوایی هوان شکۆی ڕزگارکردنی (هسینگ) بە لێواری وێرانبوون و پاشان گرتن و بێبەریکردنی چینی بەدەستهێنا. ئەو لە دەرەوەی شەڕ مایەوە تا ئەو کاتەی کە ئەو هێزانەی نێوەی گلابوون هێزیان لەیەکتری بڕیبوو، لە حاڵێکدا کە تێکەڵبوونی بە ناوبژیەکە سەلامەت بوو

ئەمەیە ڕەمپیەخۆشبوون بەهۆی خۆدووورگرتنی لە شەڕ کاتی خۆ ڕێکخستنت بۆ کەڵک وەرگرتن لە باروودۆخ کاتێک لایەنێك هەربکە دەدۆڕێت تۆ بەهەمان شێوە دەتوانیت گەمە هەمگاوێك بەرەو پێش ببەیت، لە ڕێگەی بەڵێنی پشتیوانیکردنی هەردوو لایەنەکە لە ململانێیەکدا لەکاتێکدا کە هەریکی مانۆڕکردنی بۆنەوەی ئەو کەسەی کە لە پێشدا لە ململانێکە دێتە دەرەوە تۆ بیت

لە شۆڕشی جولای ١٨٣٠ی فەرەنسادا، پاش سێ ڕۆژ لە پەشێوی، ئالیماندی دەولەتمەدار، کە ئێستا بەتەمەنداچووبوو، لەبەردەم پەنجەرە پاریسییەکەیدا دانیشتبوو، گوێی بۆ زەنگەکان هەڵخستبوو کە ئاماژەی تەواوبوونی پەشێوییەکانیان دەدا. پاش ڕووکردنە یاریدەدەرێك، وتی، "ئای، زەنگەکان! ئێمە دەبیەینەوە" یاریدەدەرەکە پرسی "(ئێمە) کێیە میری من؟". تالیراند بە ئاماژەکردن بۆ کابرا تا بێدەنگ بێت، وتی "یەك قسە مەکە! سبەی پێت دەڵێم (ئێمە) کێین". ئەو دەیزانی تەنها گەمژەکان پەلە لە باروودۆخێك دەکەن- واتە بە پابەندبوونی زۆر خێرا، قابیلیەتی مانۆڕکردنت لەدەست دەدەیت. هەروەها خەڵکی ڕێزی کەمترت دەگرن. ئەوان پێیان وایە، لەوانەیە سبەی پابەندی یەکێکی تر، دۆزێکی جیاواز ببیت چونکە تۆ بەئاسانی بۆ ئەمەیان خۆتدا بەدەستەوە. سامانی باش خوداییەکی گۆڕاوە و زۆرجار لەلایەنێکەوە دەچێتە لای لایەنێکی تر. پابەندبوون بە لایەنێکەوە لە کەڵکی کات و خۆشیی چارەڕێبوون بێبەشت دەکات. ئەوانیتر دەکەونە ناو خۆشەویستی لەگەڵ ئەم یان ئەو گروپە، بەڵام تۆ پەلە مەکە، ئەقڵت لەدەست مەدە.

لە کۆتاییدا، حاڵەت هەن سامانیدا زیرەکترین شت ئەوەیە هەموو نمایشێکی پشتیوانی بەلاوە بنێیت و لەبری ئەمە سەربەخۆیی و پشت بەخۆبەستنت ڕابگەیەنیت. نەمشی ئەریستۆکراتانەی سەربەخۆیی بەشێوەیەکی دیاریکراو بۆ ئەو کەسانە گرنگە کە پێویستیان بە بەدەستهێنانی ڕێزە. جورج واشنتن لە کارەکەیدا بۆ دروستکردنی کۆماری ئەمریکای گەنج لەسەر ڕەوییەکی نەو، بەمەی ڕاپی وەکو سەرۆك، واشنتن خۆی لە فریوی هاوپەیمانێتیکردن لەگەڵ فەرەنسا یان ئینگلتەرە بووارد، سەرباری هەموو فشار

لەسەری بۆ ئەم کارە. ئەو دەیویست وڵات لە ڕێگەی سەربەخۆییەکەیەوە ڕێزی جیهانی بەدەست بهێنێت. هەرچەندە ڕەنگ بوو پەیماننامەیەک لەگەڵ فەرەنسادا لە کورت مەودا دا پارمەتیدەر بێت، دەیزانی لە دوورمەودا دا وەها کاریگەرترە کە ئۆتۆنۆمی وڵات بونیاد بنرێت، دەبووایە ئەورووپا ئەمریکا وەکو هێزێکی هاوتا ببینێت

بیرت بێت تۆ وزەیەکی زۆر و کاتێکی زۆرت هەیە. هەر سامێکی بەفیڕۆدراو لە کاروباری ئەوانیتر، دەتوانێ تۆ دادەخورێنێت. لەوانەیە تۆ ترسی ئەوەت هەبێت کە خەڵکی بە ترسنۆک ئیدانەت دەکەن، بەڵام لە کۆتاییدا، بە بەرقەرارکردنی سەربەخۆییت و متمانە بەخۆکردنت ڕێز و شوێنی زیاتر لە پێگەیەکی دەسەڵاتدا بەدەست دێنێت کە لێیەوە دەتوانیت بە دەستپێشخەریی خۆت یارمەتی ئەوانیتر بدەیت

**وێنە:** دەوەنێک، لە دارستاندا، دەوەنێک دەناڵێنێتە دەوەنێکی تر، بە دڕکەکانییەوە دەناڵێنێتە دراوسێکەی؛ بە هێواشی دڕە دەکاتە ناو قەڵەمڕەوە قایمەکەی. تەنیا ئەوەی کە دوورایی خۆی دەپارێزێت و جودا هەڵدەکەوێت دەتوانێت گەشە بکات و بەسەر دەوەنەکەدا سەرز بێتەوە

**دەسەڵات:** بە بونیادنەر لەقەڵەمی بدە کە تەگلێیتە ناو ململانێیەک لەوەی کە شەڕێک ببەیتەوە و لە شوێنێک کە هەموکە گەمژەیەکی تێکەڵبوو بە ململانێ ئامادەیی هەیە، زیر بە هەبێت بە دووان

بالتازار گراسیە، (١٦٠١–١٦٥٨)

## پێچەوانەبوونەوە

هەردوو بەشەکەی ئەم یاسایە لەدژی تۆ هەڵدەگەڕێتەوە ئەگەر تۆ بە هەمەی وەربگریت. ئەو گەمەیەی لێرەدا دەخرێتە ڕوو ناسک و فورسە. ئەگەر تۆ دژی بە چەند لایەنێک لەدژی یەکتری بکەیت، ئەوا بە مانۆڕەکە دەرانی و گاڵتەکۆمەت لێدەکەن. ئەگەر تۆ ژمارەی ئەو داخوازیکەرانەت زیاد بکەیت کە لە چاوەڕوانیەکی درێژخایەندن، ئەوا

نەك ئارەزوو بەڵكو بێ متمانەیی دەورووژێنێت. خەڵكی پەنتا پەنتا ئارەزوومەندی لەبەرامبەر تۆدا لەدەست دەدەن. لەكۆتاییدا لەوانەیە تۆ بە شێوەیەكی بێبەبەك كە پابەند بێت بە لایەنێكەوە- ئەگەر تەنیا لەسەر ڕواڵەتیش بێت، بۆئەوەی بسەلمێنێت توانای هۆگربوونت هەیە.

تەمانەت ئەو كاتەش، كلیلەكە بەرقەراركردنی سەربەخۆیی ماوەوەت دەبێت- ئەمەی كە خۆت لە تێوەگلانی هەستیت بەدوور دەگریت. بڕێژەی قسە لەسەرەكراوی توانای جێهێشتن لەسەر ساتەوەختێكدا بپارێزە و ئارامیی خۆت بگەڕێنەرەوە ئەگەر ئەو لایەنەی تۆ خۆت لەگەڵدا پێكخستووە بەرەو ناڕەوا دەچێت. ئەو هاوڕێیانەی كە دروستت كردن لەهاوڕێكدا كە مەرایبیت بۆ دەكرا، شوێنی زۆرت دەدەمێ بۆ ئەوەی بۆی دەچێت كاتێك لە ئۆتۆمبیلەكە خۆت فڕێ دەدەیت.

## یاسای ژمارە ٢١

# وەك ساوێلكە بنوێنە بۆئەوەی ساوێلكەیەك بگریت-لە نیشانەكەت دەبەنگتر بنوێنە

### دۆكە

*كەس حەز ناكات هەست بكات لە كەسەكەی تر دەبەنگترە  بۆیە، فێڵەكە ئەوەیە كە وا لە قوربانییەكانت بكەیت هەست بكەن زیرەكن-نەك تەنیا زیرەكیش بەڵكو زیرەكتر لە تۆ. هەر كە قەناعەتیان بەمە كرد، ئەوا قەت گومانی ئەوە ناكەن كە تۆ ئەنگێزەی شاراوەت هەن.*

### پەیڕەوكردن لە یاساكە

لە زستانی ١٨٧٢دا، سپۆنسەری دارایی ئەمریكی، ئاسبوری هاربێندینگ سەردانی لەندەنی دەكرد كاتێك نامەیەكی پێگەیشت  كانێكی ئەڵماس لە خۆرئاوای ئەمریكا دۆزراوەتەوە. نامەكە لە سەرچاوەیەكی جێی متمانەوە هات- ویلیام ڕالستۆن، خاوەنی بانكی كالیفۆرنیا- لەگەڵ ئەوەشدا هاربێندینگ ئەمەی بە بێزاربوونێك وێنا كرد، كە لەوانەیە لە دۆزینەوەكانی ئەو دوایییەی كانە ئەڵماسە گەورەكانی ئەفریقای باشوورەوە سەرچاوەی گرتبێت. ڕاستە، كاتێك ڕاپۆرت لەبارەی دۆزینەوەی ئاڵتوون لە خۆرئاوای ئەمریكا بڵاو بووبەوە، هەمووان بەگومان بوون، و ئەمانەش ڕاست دەرچوون. بەڵام

کابیکی ئەڵماس لە خۆرئاوا! هارپیندینگ نامەکەی پیشانی هاوەڵەکەیدا: پارتی بۆسچیلد، کە یەکێك بوو لە دەوڵەمەندەکانی جیهان و پێی وت دەبێ ئەمە بێ ڕاسووردن مێت لەگەڵ ئەوەشدا، ئاریۆی لە وەڵامدا وتی "ئەوەندەش زۆر دڵنیا مەبە لەبارەیەوە ئەمریکا وڵاتێکی زۆر گەورەیە هەموکە بە زۆر سوپرایز جیهانی دەوڵەمەند کردووە لەوانەیە هیتریشی لە هەگبەدا بێ" هارپیندینگ دەستبەجێ سواری یەکەمین کەشتی بوو بەرەو ئەمریکا.

کاتێك هارپیندینگ گەیشتە سان فرانسیسکۆ، جۆش و خرۆشێك هاتە ئاراوە کە وەبیرهێنەرەوەی پەڕینی (تای ئاڵتوون)ی دەرمکانی ١٨٤٠ەکان بوو. دوو دۆزەرەوە بەناوی فیلیپ ئارنۆڵد و جۆن سلاك ئەو کەسانە بوون کانی ئەڵماسیان دۆزیبووەوە. ئەوان شوینەکەیان لە ویۆمینگ ئاشکرا نەکردبوو بەڵکو پێش چەند هەفتەیەك شارەزایەکی کانی بەناوبانگیان بە ڕێپەوێکی بارەبیدا بردبوو بۆئەوەی نەتوانێت بە شوێنەکە بزانێت، هەر کە گەیشتە ئەوێ، شارەزاکە تەماشای کردبوو کە کێ هەڵکۆڵەکان دەستیان کردووە بە هەڵکۆڵین. لە سان فرانسیسکۆ شارەزاکە خشڵەکانی بۆ چەندەها خشڵفرۆش بردبوو، کە یەکێکیان خەمڵاندنی ١٥ ملیۆن دۆلاری بۆ کردبوون

هارپیندینگ و ڕالستۆن ئێستا پرسیاریان لە ئارنۆڵد و سلاك کرد بۆ هاوەڵیتیکردنیان بۆ نیویۆرك کە لەوێ چارلس تیفانی خشڵفرۆش خەمڵاندنە بنچینەییەکانی پشتڕاست دەکردەوە. دۆزەرەوەکان بە نارەحەت وەڵامیان دایەوە- ئەوان بۆیی تەڵەیەکیان کرد- چۆن دەتوانن باوەڕ بەم شارییانە بکەن؟ چ دەبێت ئەگەر تیفانی و سپۆنسەرە داراییەکان تەواویان تەواوی کانەکە بدزن؟ ڕالستۆن هەوڵیدا ترسەکانیان بڕەوێنێتەوە بەوەی کە ١٠٠,٠٠٠ دۆلاریان داني و ٣ دۆلاری تریان لەکاتێکی تردا بدرێتێ کان هەڵکۆڵەکان ڕازی بوون.

گروپە بچوکەکە بەرەو نیویۆرك سەفەری کرد کە لەوێ کۆبوونەوەیەك لە ماڵی سامویل ئێل.بارلۆ ئەنجامدرا. ئەریستۆکراتەکانی شار لەوێ بوون- ژەنەراڵ جۆرج برینتۆن مکلێلان، فەرماندەی هێزەکانی یەکگرتن لە شەڕی ناوخۆ، ژەنەراڵ بینجامین

مەتلەر، هۆرەس گریلی، نووسەری ڕۆژنامەی نیویۆرک تریبیون، هارپێندینگ، ڕالستۆن و تیفەنی. مەبیا سلاك و ئاربولد لەوێ نەبوون— وەکو گەشتیاری ناو شار، بڕیاریاندابوو بچنە تیدەنی شوێنە گەشتیارییەکان.

کاتێك تیفانی ڕایگەیاند کە خشڵەکان ڕاستین و شایەنی سامانێکن، سپۆنسەرە داراییەکان بە زەحمەت توانییان جۆش و خرۆشی خۆیان کۆنترۆڵ بکەن. ئەوان نامەیان بۆ ڕۆسچیلد و بریسمانەکانی تر نارد بۆئەوەی هەواڵی کانە ئەڵماسەکەیان پێدەن و بانگهێشتیان بکەن بۆ هاوبەشیکردن لە وەبەرهێنانەکەدا. لەهەمان کاتدا، ئەوان بە دۆزەرەوەکانیان وت کە تێستێکی تریان دەوێت؛ ئەوان سوور بوون لەسەر ئەوەی کە شارەزایەکی کان کە خۆیان هەڵیدەبژێرن، هاوەڵێتی سلاك و ئاربولد بکات بۆ شوێنەکە بۆ پشتڕاستکردنەوەی سامانەکەی. دۆزەرەوەکان بەنابەدڵییەوە ڕازی بوون. لەهەمان کاتدا، ئەوان وتیان دەبێ بگەڕێنەوە بۆ سان فرانسیسکۆ. ئەو خشڵانەی کە تیفانی پشکنیبووی، لای هارپێندینگ جێیان هێشت بۆ هەڵگرتنی.

چەند هەفتەیەك دواتر، پیاوێك بەناوی لویس جانین، ناسراوترین شارەزای کان لە وڵاتدا، چاوی بە دۆزەرەوەکان کەوت لە سان فرانسیسکۆ. جانین هەر بە سروشت بەدگومان بوو کە سوور بوو لەسەر ئەوەی دڵنیا ببێتەوە کە کانەکە ساختە نییە. ئەو کەسەی هاوەڵێتی جانینی دەکرد هارپێندینگ و ژمارەیەك سپۆنسەری دارایی تر بوون. هەرچی پەیوەندی بە شارەزایەکەی پێشووەوە هەیە، دۆزەرەوەکان تیمەکەیان بەناو ڕێگەیەکی دۆڵی ئاڵۆزدا ڕێنوێنی کرد کە پەیوەند بە شوێنەکانیان بەتەواوی سەریان لێ شێواندبوو. پاش گەیشتنە شوێنەکە، سپۆنسەرە داراییەکان بە سەرسوڕمانەوە دەیانڕوانی لەکاتێکدا کە جانین خەریکی کۆڵینکاری شوێنەکە بوو، گردەکانی پان دەکردەوە، تەپۆڵکەکانی سەرەوژێر دەکرد و زمرد، ڕوبی، یاقوت و لەهەمووشی زۆرتر، ئەڵماسی دەدۆزییەوە. هەڵکەندنەکە هەشت ڕۆژی خایاند و بە هاتنی کۆتاییەکە، جانین قەناعەتی هات. ئەو بە وەبەرهێنەرەکانی وت کە ئێستا خاوەنی دەوڵەمەندترین کێڵگەن لە مێژووی

کاتەکاندا بەوانی وت "بە سەد کەس و ماکینەیەکی ڕێکوپێکەوە، گەرەنتی ئەوە دەدەم
کە هەموو سێ ڕۆژێک بایی یەک ملیۆن دۆلار لە ئەڵماسەکان بێنم"

پاش گەڕانەوە بۆ سان فرانسیسکۆ، ڕالستۆن، هارپێندینگ و هاوەڵانیان بەخێرایی
هەنگاویان نا بۆ پێکهێنانی کۆمپانیایەکی ١٠ ملیۆن دۆلاری وەبەرهێنەرانی تایبەت
لەگەڵ ئەوەشدا، یەکەم جار دەبووایە خۆیان لە ئارنۆلد و سلاک قوتار بکەن. ئەمە بە
مانای شاردنەوەی خۆش و خرۆشەکەمان بوو- بە دڵنیاییەوە نەیاندەویست بەهای
ڕاستەقینەی کێڵگەکە دەربخەن، بۆیە وەکو بێ ئاگا خۆیان نیشاندا، ئەوان بە
دۆزەرەوەکانیان وت، کێ چوزانێ خاین لەسەر حەقە، لەوانەیە کانەکە ئەوەندەش
دەوڵەمەند نەبێت کە ئێمە بیرمان لێ دەکردەوە. ئەمە دۆزەرەوەکانی تووڕە کرد،
سپۆنسەرە داراییەکان، لە هەوڵی تاکتیکێکی جیاوازدا، بە دوو پیاوەکەیان وت ئەگەر
سوور بن لەسەر هەبوونی پشک لە کانەکەدا، ئەوا لە کۆتاییدا لەلایەن بریسمەن و
وەبەرهێنەرە بانەخلاقییەکان قوڵیان دەبڕدرێت کە کۆمپانیاکە بەڕێوە دەبەن. ئەوان
وتیان باشترە ئەو ٠٠ ، ٧ دۆلارە بەن کە هەنوکە خراوەتە بەردەمیان- کە بڕە
پارەیەکی زۆر بوو لەو کاتەدا- و واز لە چاوچنۆکی بێنن. پێدەچوو دۆزەرەوەکان لەمە
بیگەن و دواجار ڕازی بوون پارەکە بەن، لەبەرامبەردا وازی ماف خاوەنداریتی بۆ
سپۆنسەرە داراییەکان بکەن بەشەکانیان بۆ جێ بهێڵن.

هەواڵی کانەکە وەکو ئاگری بن کا بڵاو بووەوە. دۆزەرەوەکان بە سەرسەری
وایومینگ دا هاتن و چوون. لە هەمان کاتدا، هارپێندینگ و گرووپەکە دەستیانکرد بە
خەرجکردنی ئەو ملیۆنان دۆلارەی کە لە وەبەرهێنەران کۆیان کردبووەوە، کەل و پەلی
گرێ، باشترین پێداویستی ماڵ دروستیان بەکرێ گرت و ئۆفیسی ئامادەکراویان لە نیویۆرک و
سان فرانسیسکۆ دانا

چەند هەفتەیەک دواتر، لە یەکەمین گەشتی گەڕانەوەیان بۆ شوێنەکە، بە
حەقیقەتێکی ڕەقیان زانی. ئاکە ئەڵماسێک یان یاقووتێک نەدەدۆزرایەوە. هەمووی ساختە

بوو. ئەوان دارمار، هاریسمپیک بەشێوەیەکی ناریزانە دەوڵەمەندترین پیاوانی جیهانی بۆ ناو گەورەترین تەڵەی سەدە بەکێش کرد.

ئارنۆڵد و سلاک منلە کاریگەرەکەیان لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەندازیارێکی ساختە یان بەرسڵەی بە شێوازی بەکارهێنا. هەموو شارەزایەکان ڕاستەقینە بوون، هەموویان بەشێوەیەکی سەرڕاستانە بڕوایان بە هەبوونی کان و بەهای خشڵەکان هەبوو. ئەوەی کە ئەوس لە خشتە برد، هەمووی هیچ نەبوو جگە لە خودی ئارنۆڵد و سلاک. پێدەچوو دوو پیاوەکە ئەوەندە ساویلکە، ناشی و دێهاتی دیار بوون کە هیچ کەسێک بۆ ساتێکیش بڕوای وەها نەبوو توانای ساختەچێتییەکی بوێرانەیان هەبێت. دوورەوەکان تەنیا پەیڕەوییان لە یاسایەک کرد: گەمژەتر دیار بوون لە نیشانەکەیان.

لۆجیستیکی ساختەچێتییەکە زۆر سادە بوو. چەند مانگێک پێش ئەوەی ئارنۆڵد و سلاک "دۆزینەوە"ی کانی ئەڵماسەکە ڕابگەیەنن، بەرەو ئەورووپا سەفەریان کرد کە لەوێ هەندێ خشڵیان بە نرخی ١٢٠٠٠ دۆلار کڕی (بەشێک لەو پارەیەی کە لە ڕۆژانی کرێکاریی کانی ئاڵتوون پاشەکەوتیان کردبوو). پاشان ئەوان "کان"ەکەیان بەم خشڵانە داچاند کە یەکەم شارەزای کۆڵێنکاری کرد و هێنایە سان فرانسیسکۆ. ئەو خشڵ و مۆشلەیەی کە ئەم مەردانەیان هەڵسەنگاندبوو، بەخودی تفانیشەوە، گەوهەروە بەر ئەیەکە و بە ڕادەیەکی زۆر زێدە خەمڵاندنی بۆ بەهاکەیان کردبوو. پاشان ڕاستن ١٠٠٠٠ دۆلاری وەکو سیکیوریتی دایە دوورەوەکان و پاش گەشتەکەیان بۆ نیویۆرک دەستبەجێ چوونە ئەمستەردام کە لەوێ چەند تورەکەیەک خشڵی نەبڕدراویان کڕی، پێش ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ سان فرانسیسکۆ. جاری دووەم ئەوان خشڵەکەیان بە کانەکە وەرکرد، خشڵێکی زۆرتر دۆزرایەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، کاریگەریتی پیلانەکە بەند نەبوو بە هێڵی ئەم نابەتە بەڵکو بەند بوو بەو فاکتەی کە ئارنۆڵد و سلاک بەشێوەیەکی نایاب ڕۆڵی خۆیان گێڕا. لە گەشتەکەیاندا بۆ نیویۆرک، کە لەوێ لەگەڵ ملیونەرەکان و دەرسمانەکاندا تێکەڵ بوون، ئەوان وێنەی کەسانی دێهاتییان دە خۆیەدا، پانتۆڵ و چاکەتی یەک دوو سایز بچووکتریان لەبەردا بوو و

وەها رەفتاریان دەکرد کە ئەوەی لە شاری گەورەدا دەیبینین بە چاوی خۆیان نەوەیی پێناکەن. کەس بڕوای وانەبوو کە ئەم لادێیە سادانە نموونەی ناسەرڕاستترین و نائەخلاقیترین سپۆسەری دارایی سەردەمەکە لە حەشتە بەن. کاتێکیش هاریپێدینگ، ڕالستۆن و تەباتەت ڕۆسچیلد بروبی کانەکەیان قبوڵ کرد، هەر کەسێک گومانی نەوە نەبووایە هۆشمەندیی سەرکەوتووترین بزنسمانەکانی جیهانی دەخستە ژێر پرسیارەوە.

لە کۆتاییدا، ناوبانگی هاریپێدینگ تێکچوو و قەت چاک نەبووەوە. ڕۆسچیلد پەندی وەرگرت و قەت نەکەوتە داوی تەڵەکەیەکی ترەوە. سلاک پارەکەی برد و لەبەرچاو ون بوو و قەت نەدۆزرایەوە. ئارنۆڵد چووەوە ماڵەکەی خۆی لە کێنتەکی. دواجار، فرۆشی لە ماڵەکانی کۆلێکاری کان ڕەوا بوو. کڕیاران ماشترین ئامۆژگارییان وەرگرتبوو و ئەگەر کانەکە ئەڵماسی لەسەر نەبڕایە، کێشەی خۆیان بوو. ئارنۆڵد بەشی زۆری پارەکەی بەکارهێنا بۆ کێڵگەکەی و کردنەوەی بانکێکی تایبەت بەخۆی.

## کاڵبیلی دەسەڵات

ئەو هەستەی کە کەسێکی تر هۆشمەندترە لە ئێمە قابیلی تەحەمول نییە. ئێمە زۆرجار هەوڵ دەدەین بە شێوازی جیاواز پاساوی بدەین. "ئەو تەنیا زانیاری بێو کتێبی هەیە، لەکاتێکدا کە من زانیاریی ڕاستەقینەم هەیە." "باوانی ئەو پارەیان داوە تا خوێندنی باش بەدەست بێنێت. ئەگەر باوانی منیش ئەوەندە پارەیان هەبوویە، ئەگەر منیش لە پێگەیەکی وەهادا بوومایە..." "ئەو ئەوەندەش زیرەک نییە کە پێی وایە." هەروەها "لەوانەیە ئەو باشتر لە من بزانێت بەرپرسیارەکەی خۆی بزانێت، بەڵام لەودیو ئەمە، ئەو بەهیچ شێوەیەک زیرەک نییە. تەنانەت ئەینشتاینیش لە دەرەوەی فیزیا هیچی نەدەزانی."

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە بیرۆکەی هۆشمەندی بۆ شانازیی مرۆڤ چەندێک گرنگە، شتێکی گرنگە کە قەت بەمەڵە تیهانەی هێزی ئەقڵی کەسێک نەکەین. ئەمە گوناهێکی بێ چەندوچونە. بەڵام ئەگەر بتوانیت وا بکەیت ئەم یاسایە لەبەرژەوەندی خۆت کار

وردەکە بخوێنێتەوە. هەر کە مەرەکەبەکە وشک بووە، سمارکی دڵشاد بە سەرسوڕمانەوە وتی "ماشەڵڵا، قەت بەمدەتوانی بڕوا بەوە بکەم کە دیپلۆماتێکی بەمستوای دەدۆزمەوە کە ئەو دۆکیومێنتە واژۆ نەکات!".

چینییەکان قسەیەکیان هەیە " خۆگۆڕین وەک قاز بۆ کوشتنی پڵنگ" ئەمە ئاماژەیە بە تەکنیکی کۆنی ڕاوکردن کە تیایدا ڕاوچی وەک بەراز خۆی شاردەکات و لاسایی دەکاتەوە. پڵنگی بەهێز پێی وایە بەرازێک نێتە ڕێگەی و لێدەگەڕێ نزیک بێتەوە، چاوەڕێی ژەمێکی ئاسان دەکات، بەڵام ئەوە ڕاوچییەکەیە کە بە دەم بە پێکەنینەوە دوایین ڕاو دەکات

خۆ گۆڕین لە شێوەی قاز بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنێ کاریگەری بەسەر ئەوانە هەیە کە وەکو پڵنگ لوتبەرز و زێدە لەخۆڕازین، چەندەی پێیان وابێت بەنێچیرکردنی تۆ ئاسانە، ئەوەندە باروودۆخەکە لە بەرژەوەندی تۆ پێچەوانە دەبێتەوە. ئەم فێڵە بەهەمان شێوە بەکەڵکە ئەگەر تۆ تموحت هەبێت لەگەڵ ئەوەشدا حوت لە نرمایی هەڕەمەکە ببینەوە کەمتر لەخۆت هۆشمەند دەرکەوێت، تەنانەت کەمێک دەبەنگیش دیار بێت، خۆگۆڕینێکی کامڵە، وەکو بەرازێکی بێ زیان دەرکەوە و بەم شێوەیە کەس نەوەر ناکات کە تۆ ئامنجی مەترسیدارت هەن. لەوانەیە ئەوان تەنانەت لەوانەیە تەرفیعێکت بدەن؛ چونکە ئەوەندە دڵگیر و ملکەچ دیاریت. کلاودیەس بەر لەوەی ببێتە ئیمپراتۆری ڕۆم و میری فەرەنسا کە دوایی بوو بە لویسی سیانزە، ئەم تاکتیکەیان بەکارهێنا کاتێک ئەوانەی سەروو خۆیان گومانی ئەوەیان لا پەیدا بوو کە لەوانەیە خەریکی پیلان بن بۆ تەخت و تاج. ئەوان بە منداڵی وەکو گەمژە کاتێک گەنج بوون، وازیان پێهێنرا. کە کاتی ئەوە هات گورزی خۆیان بکەن و شکۆمەندانە و لێبڕاوانە ڕەفتار بکەن، هەموویان تووشی شۆک کرد

هۆشمەندی تایبەتمەندییەکی ڕوونە کە بە ناچیرەی نگرێت، بەڵام بۆچی لەوێدا بوەستێت؟ سەلیقە و فوڵتیی لە پلەیەکی نزیکدان لە ئەراووی لوتبەرزی. وەها لە

هەڵگر نەکە هەست بکەن لە تۆ قوڵبینتری و لەبەرەوە دەستەوەستان دەبن. هەروەک ئاریوند و سلاک لەمەیان وابوو، کەشێکی ساویلکەیی دەتوانێ کارگەریی بێ وێنەی هەبێت

**وێنە:** گیانەوەری (ئۆپۆسەم) ئۆپۆسەم گیانەوەرێکە هەندێ جار خۆی بە مردوو نیشان دەدات. زۆربە زۆر گیانەوەری درندە وازی لێدێنن. کێ دەتوانێ باوەڕ بەوە بکات گیانەوەرێکی وەها بچکۆلە، شلەژاو و سادە بتوانێ فێڵێکی وەهای هەبێت؟

**دەسەڵات:** فێری ئەوە بە چۆن گەمژەیی بەکار بێنیت. ژیرترین مرۆڤ هەندێ جار ئەم کارتە بەکار دێنێت. هەندێ حاڵەت هەن تیایاندا مەزنترین ئاستی زیرەکی بریتییە لە بەرامبەر- نابێ ئەوڕۆ بیت بەڵکو بتوانیت یاری پێ بکەیت. شتێکی زۆر باش نییە لەنێو گەمژاندا ژیر بیت و لەنێو شێتاندا ساغ بیت. ئەو کەسەی کە خۆی وەک گەمژە دەنوێنێت، گەمژە نییە. باشترین ڕێگە بۆ ئەوەی بە باشترین شێوە پێشوازیت لێ بکرێت ئەوەیە کە خۆت لە پێستی دەبەنگترین گیانەوەراندا بشاریتەوە

(بالتازار گراسیەن، ١٦٠١-١٦٥٨)

## پێچەوانەبوونەوە

دەرخستنی سروشتی خۆت بەدەگمەن کەڵکی هەیە. دەبێ تۆ خووی ئەوە پەیدا بکەیت کە لە هەموو حاڵەتەکاندا بە کەم بیگیریت. ئەگەر خەڵکی نەبێ مەبەست ڕاستییەکە بزانن- ئەمەی کە تۆ بە ڕاستی زۆر زیرەکتری لەوەی کە دیاریت- زۆر جار گرنگیت پێ نادەن لەبەرامبەر ئەوەدا کە تۆ وریا نەبوویت بەک لەبەرئەوەی نمایشی زیرەکانەت دەکرد. بێگومان لە سەرەتای سەرکەوتنتدا بەرەو ترۆپک، ناکرێ ئەوەندە گەمژانە ڕەفتار بکەیت. لەوانەیە بتەوێ بەشێوەیەک لە شێوەکان، بەرپرسەکەت بزانێ کە تۆ زیرەکتریت لە کێبڕکێکارەکانی دەوروبەرت. لەگەڵ ئەوەشدا، لەکاتێکدا کە بە پەیژەکەدا سەر دەکەویت، دەبێ بە ڕادەیەک لە ڕادەکان هەوڵ بدەیت زیرەکییەکەت بەلاوە بنێیت

لەگەڵ ئەوەشدا، دۆخێک هەیە تیایدا پێچەوانەکەی کاریگەرە. کاتێک تۆ دەتوانیت فریودەرێک بە نمایشێکی زیرەکانەی داپۆشیت. ئەگەر تۆ وەها دیار بیت کە دەسەڵات و ماریفەتت هەیە، خەڵکی باوەڕ بەوە دەکەن کە دەیڵێیت. دەشێ ئەمە زۆر بەکەڵک بێت لە هێنانەدەرەوەت لە گرفتاری.

جارێکیان مامەڵەکاری هونەری، جۆزێف دوفین، ئامادەی ئاهەنگێک بوو لە نیویۆرک لە ماڵی بەرسمانێک کە ئەم دواییە تابلۆیەکی (دورەر)ی بە نرخێکی زۆر بەرز فرۆشتبوو. لەنێو میوانەکاندا ڕەخنەگرێکی هونەری گەنج هەبوو کە پێدەچوو زێدە پڕ ماریفەت و بڕوابەخۆ بێت. بە مەبەستی سەرسامکردنی ئەم پیاوە، کچی بەرسمانەکە تابلۆکەی (دورەر)ی پیشاندا کە هێشتا هەڵنەواسرابوو. ڕەخنەگرەکە بۆ کاتێک تێڕوانینی کرد، پاشان بۆ دوابجار وتی "دەزانیت، ئەم دورەرە ڕاست بێت". ئەو شوێن ژنە گەنجەکە کەوت لەکاتێکدا کە بەپەلە چوو بە باوکی بڵێت کابرا چی وتووە و گوێی هەڵخست لەکاتێکدا کە بەرسمانەکە، بە ناجێگیرییەکی تەواوەوە، ڕوویکردە دوفین بۆ دڵنیا کردنەوە. دوفین پێکەنی و وتی "چەند پێکەنینارییە. دەزانیت گەنجۆ، دەزانیت لانی کەم بیست شارەزای تر لێرە و لە ئەوروپاش تێکەوتوون و تووشیانە ئەم تابلۆیە ڕەسەن نییە؟ ئێستاش تۆ هەمان هەڵەت ئەنجامدا". تۆنە دڵنیاکەی و کەشی دەسەڵاتگەرییەی بووە هۆی ترسانی مەرەسییەکان کە بۆ هەڵەی گەنجەکە پێرشیان هێنایەوە.

دوفین دەیزانی بازاڕی هونەر پڕ لە ساختە و زۆرێک لە تابلۆکان بە هەڵە دەدرانە پاڵ مامۆستا کۆنەکان. ئەو، ئەوپەڕی هەوڵی خۆیدا تا ڕاستەقینە لە ساختە جیا بکاتەوە، بەڵام لە ئامەزرێییەکەیدا بۆ فرۆشتن، زۆرجار لەبارەی ڕەسەنێتی تابلۆیەک زیدەڕۆیی دەکرد. ئەوەی کە بەلایەوە گرنگ بوو، ئەوە بوو کە کڕیارەکە بڕوای وابێت (دورەر)ێکی کڕیووە و دوفین خۆی لەبارەی "شارەزایەتییەکەی" قەناعەتی بە هەمووان دەهێنا، ئەمەش بە کەشێکی دەسەڵاتی نابە لێپرسراو ئەمشێوەیە، گرنگە بتوانیت وەک پرۆفیسۆر خۆت دەربخەیت کاتێک پێویستە و قەت لەپێناو خۆیدا تێڕوسکی وەها ئەسەپێنیت.

## یاسای ژمارە ٢٢

# تاکتیکی ملدان بەکاربێنە: خاڵی لاوازوەرچەرخێنە بۆ دەسەڵات

### حوکم

*کاتێک تۆ لاوازتریت، قەت لەپێناو شەرەفدا مەجەنگە، لەبری ئەمە ملدان هەڵبژێرە. ملدان کاتت پێدەدات بۆ هەڵسانەوە، کاتت دەداتێ بۆ ئەشکەنجەدان و هەراسانکردنی بەیارە براوەکەت، کات بۆ چاوەڕێبوون تا دەسەڵاتەکەی کز دەبێت. شادیی شەڕکردن و شکستپێهێنانی تۆی پێ مەبەخشە – سەرەتا مل بدە. بە ڕاگرتنی لا ڕوومەتەکەی تر، تۆ تووڕەی دەکەیت و دەیشڵەژێنیت. ملدان بکە بە ئامرازێکی دەسەڵات*

### پەیڕەویکردن لە یاساکە

دوورگەی (میلۆس) لە ڕووی ستراتیژییەوە کەوتۆتە چەقی مێدیتەرانە. لە سەردەمی کلاسیکدا، شاری ئەسینا بەسەر ناوچە کەناری و ئاوییەکانی دەوری یۆناندا زاڵ بوو، بەڵام سپارتە، لە (پیلۆپۆنیز) کۆلۆنایزەری سەرەتایی (میلۆس) بوو. لەماوەی جەنگی پێلۆپۆنیزدا، میلۆسییەکان ڕەتیان کردەوە حزبی لەگەڵ ئەسینایەکاندا ڕێک بخەن و بەرامبەر دایکە سپارتا ئەمەگدار مانەوە. لە ٤١٦ی پێش زاییندا، ئەسینایەکان هەڵمەتێکیان لەدژی میلۆس ڕێکخست. لەگەڵ ئەوەشدا، پێش بەگەڕخستنی هێزێکی

چەند ڕۆژێك دواتر ئەسپاسەکان مێلۆسیان داگیر کرد. مێلانییەکان بە سەربەرزییەوە جەنگان، ئەسەت بەبێ سپارتاکان کە بەهانایانەوە بچوون. چەند هەوڵێکی هاباند پێش ئەوەی ئەسپانییەکان بتوانن دەوری شارەکەیان بگرن، بەڵام مێلانییەکان بۆ دواجار ملیاندا. ئەسپنییەکان هیچ کاتیان بەفیڕۆ نەدا- ئەوان هەموو ئەو پیاوانەی ئەمەی سەربازییان لەناو برد کە بەردەستیان کەوت، ئەوان ژن و منداڵەکانیان وەك کۆیلە فرۆشت و ئەوان دوورگەکەیان بە کۆلۆنیستەکانی خۆیان پڕ کردەوە. تەنها چەند مێلانییەك زیندوو مانەوە

لێکدانەوە

ئەسپانییەکان گەلێکی نا بلێی کرداری بوون لە مێژوودا و کرداریترین مشتومڕیان لەگەڵ مێلانییەکان ئەنجامدا: کاتێك تۆ لاوازتریت، هیچ شتێك بە شەڕی بێ کەڵك بەدەست نایەت. کەس بەهانای لاوازەوە نایەت- بەم کردارە ئەوان تەنیا خۆیان دەخستە مەترسییەوە. لاوازەکان بەتەنیان و دەبێ مل بدەن. شەڕکردن هیچت بۆ دەستەبەر ناکات جگە لە شەهیدبوون و لە پرۆسەکەدا خەڵکێکی زۆر کە باوەڕیان بە دۆزەکەی تۆ نییە دەمرن.

خاڵی لاواز گوناه نییە و دەشێ تەمامەت ببێتە حاڵێکی هێز ئەگەر تۆ بزانیت دەرکەویت چۆن بە دروستی کاری لەسەر بکەیت. ئەگەر مێلانییەکان هەر لەسەرەتاوە ملیان بدایە، ئەوا دەیانتوانی بەشێوازێکی ناڕاستەوخۆ ڕیان بە ئەسپانییەکان بگەیەنن یان دەیانتوانی ئەوە لە هاوپەیمانییەکە بەدەست بێنن کە دەیانویست و پاشان لێی بهاسێنەوە دەر کاتێك ئەسپانییەکان خۆیان لاواز دەبوون، وەك چۆن لە ڕاستیدا چەند ساڵێك دواتر ڕوویدا. چارەنووس دەگۆڕێت و زۆرجار بەهێز دادەڕمێت. ملدان هێزێکی گەورەی لەمەردایە. ئارامکردنەوەی دوژمن لە لەخۆبایبوونەکەیدا کاتت دەداتی بۆ هەڵسانەوە، بۆ سکۆڵکردن، کات بۆ بولەکردنەوە. مەت ئەو کاتە مەکە بە قوربانی ئاڵوگۆڕ بۆ شەرەف لە شەڕێکدا کە تۆ ناتوانیت بیبەیتەوە

خەڵکی لاواز قەت ڕێگە نادەن کاتێک پێویستە ئەمە بکەن

کاردینال دی ڕێتز، ١٦١٣-١٦٧٩

## پەیڕەویکردن لە یاسا

لەکاتێکی ١٩٢٠ەکاندا نووسەری ئەڵمانی بێرتۆلت برێشت بووە هەڵگەڕاوەیەک بۆ دۆزی کۆمەنیزم. لەو کاتە بەدوا لە شانۆییەکانی، وتارەکانی و قەسیدەکانیدا گۆڕی شۆڕشگێڕانە ڕەنگیدایەوە و ئەو هەگشتی هەوڵیدا ئەوەندەی دەکرێت لێدوانە ئایدۆلۆژییەکانیدا ڕوون بێت. کاتێک هیتلەر لە ئەڵمانیا هاتە سەر حوکم، برێشت و هاوەڵە کۆمەنیستەکانی بوونە نیشانە. ئەو هاوڕێی زۆری لە ئەمریکا هەبوون— ئەو ئەمریکیانەی هاوسۆز بوون لەگەڵ هاوڕەکانیدا، هەروەها ئەو ڕۆشنبیرە ئەڵمانیانەی کە هیتلەریان جێ هێشتبوو. بەم پێیە، لە ١٩٤١دا برێشت بەرەو ئەمریکا کۆچی کرد و بڕیاریدا لە لۆس ئەنجلس بگیرسێتەوە کە لەوێ هیوادار بوو بژێوییەک لە بزنسی فیلمدا پەیدا بکات.

بە درێژایی چەند ساڵی دواتر برێشت هەندێ فیلمنامەی نووسی کە تۆنێکی دژە کەپیتالیستی پێوە دیار بوو، ئەو لە هۆلیوود سەرکەوتنێکی وەهای بەدەست نەهێنا، بۆیە ١٩٤٧دا لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگ بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ ئەوروپا. لەگەڵ ئەوەشدا، هەمان ساڵ لیژنەی چالاکیانە نائەمریکییەکانی کۆنگریسی ئەمریکا لێکۆڵینەوەی لە دزەکردنی کۆمەنیستی بۆ ناو هۆلیوود دەستپێکرد. ئەم لیژنەیە دەستیکرد بە کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی برێشت کە بە ئاشکرا مارکسیزمی پەیڕەو کردبوو و لە ١٩ی سێپتێمبەری ١٩٤٧دا، تەنیا مانگێک پێش ئەوەی پلانی دەرچوون لە ئەمریکا دابڕێژێت، ئاگادارییەکی بەدەست گەیشت بۆ ئەوەی بەبەردەم کۆمیتەکەدا ئامادە بێت. سەرباری برێشت، ژمارەیەک لە نووسەر، بەرهەمهێنەر و بەڕێوەبەری تر ئاگادار کرانەوە بۆئەوەی ئامادە بن و ئەم گروپە دوایی بە هۆلیوود ١٩ ناسرا

پێش چوون بۆ واشنتن، هۆلیوود ١٩ کۆبوونەوە بۆئەوەی پلانێک دابنێن. ڕوانگەکەیان ڕوانگەیەکی ڕووبەڕووبوونەوە دەبوو. لەبری وەڵامدانەوەی پرسیارەکان لەبارەی

ئەندامێتییان، بەڵام هەمووی ئەندامێتییان لە حزبی کۆمەنیستدا، ئەو لیبراڵانەمان ئامادە
دەکرد کە ئەمانە، بەهەمان دەسەڵاتی لیژنەکەیان دەکرد و بەڵگەی ئەوەیان دەهێنایەوە
کە چالاکییەکانیان بە دەستووریە. بەڵام ئەگەرچی ئەم ستراتیژە بەهای زیندانیکردنی
بوو، تیۆرەکانیان برەو پێدەدا

برێشت رێزی هەموو ئەو پرسی کەڵکی چیە وەک شەهید بمێنێت و کەمێک هاوسۆزی
گشتی بەدەست بێنێ ئەگەر بە پرۆسەکەدا ئەوان توانای پێشکەشکردنی شانۆییەکانیان
و فرۆشتنی فیلمنامەکانیان بۆ ساڵانی دواتر لەدەستدا؟ ئەو دڵنیا بوو بەوەی کە ئەمان
لەهەموو ئەندامانی لیژنەکە هۆشمەندتر بوون. بۆچی خۆیان بۆ ئاستی نەیارەکانیان نزم
بکەنەوە بەوەی کە مشتومڕیان لەگەڵ بکەن؟ بۆچی لە کۆمیتەکە زیرەکتر نەبن بەوەی
کە و دەرفەتی ملیان داوە لەکاتێکدا بەنهێنی گاڵتەیان پێبکەن؟ هۆڵیوود ١٩ بە
ئەدەبەوە گوێی بۆ برێشت هەڵخست، بەڵام بڕیاریدا دەست بە پلانەکەوە بگرێت و
لێبگەڕێت برێشت بە ڕێگەی خۆیدا بڕوات

بۆ جار لیژنەکە لە ٣٠ ئۆکتۆبەردا برێشتی بانگ کرد. ئەوان پێشبینی ئەوەیان دەکرد
برێشت هەمان ئەو شتە بکات کە ئەندامانی هۆڵیوود ١٩ کردیان لە کاتی گەواهیدانیان
لەبەردەم کۆمیتەکەدا مشتومڕکردن، ڕەتکردنەوەی وەڵامدانەوەی پرسیارەکان،
تەحەداکردنی مافی کۆمیتەکە بۆ ئەنجامدانی جەلەسەی گوێگرتن، تۆمەتبارکردن، هاوارکردن و
تیهامەکردن. لەگەڵ ئەوەشدا، سەریان سوڕما کاتێک برێشت وێنەی نەرم و نیانی بوو. ئەو
قەنیکی لەبەر بوو (شتێک کە بەدەگمەن دەیکرد) جگەرەیەکی کێشا (ئەو بیستبووی کە
سەرۆکی کۆمیتەکە جگەرەکێشە)، بە ئەدەبەوە وەڵامی پرسیارەکانیانی دایەوە و
بەگشتی ڕێزی لە دەسەڵاتەکەیان گرت

بە پێچەوانەی شایەتەکانی ترەوە، برێشت وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوە کە ئاخۆ
ئەندامی حزبی کۆمەنیستە یان نا: وتی ئەندام نیم، کە ڕاستیش بوو. ئەندامێکی
کۆمیتەکە پرسی "ئایا ڕاستە تۆ ژمارەیەک شانۆنامەی شۆڕشگێڕیت نووسیووە؟"
برێشت زۆر شانۆنامەی بە پەیامی کۆمەنیستانەی ئاشکراوە نووسیبوو، بەڵام لە وەڵامدا

وتی "من ژمارەیەک قەسیدە و گۆرانی و شانۆنامەم لە شەڕ لەدژی هیتلەر نوسیوون و بێگومان دەشێ ئەمانە بە شۆڕشگێڕانە لەقەڵەم بدرێن، چونکە هەڵمەت من لەگەڵ ڕووخانی حکومەتەکە بووم" ئەم قسەیە هیچ بەرهەڵستییەکی بەرامبەر پێشان نەدرا

ئینگلیزییەکەی برێشت باش بوو، بەڵام بەدرێژایی گەواهیدانەکە وەرگێڕێکی بەکارهێنا، تاکتیکێک کە ڕێگەی بۆ خۆش کرد تا گەمەی ئاڵۆز بە زمان ئەنجام بدات کاتێک ئەندامانی لیژنەکە مەیلی کۆمەنستییان لە دێڕەکانی چاپە ئینگلیزییەکەی قەسیدەکانیدا بەدی دەکرد، ئەو دێڕەکانی بە زمانی ئەڵمانی بۆ وەرگێڕەکە دووبارە دەکردەوە کە پاشان بێسان وەریدەگێڕایەوە و بەشێوەیەک لە شێوەکان بێ زیان دەردەکەوتن. لە ساتێک لە ساتەکانیدا ئەندامێکی لیژنەکە یەکێک لە قەسیدە شۆڕشگێڕییەکانی برێشتی بە دەنگی بەرز بە ئینگلیزی خوێندەوە و لێی پرسی ئاخۆ ئەو نوسیوویەتی. لە وەڵامدا وتی "نەخێر، من قەسیدەیەکی ئەڵمانیم نوسیووە کە زۆر لەمە جیاوازە". وەڵامە تەمومژاوییەکانی نووسەرەکە ئەندامانی لیژنەکەی تووشی سەرسوڕمان کرد، بەڵام ئەدەب و ڕێزەکەی و شێوازی مامەڵەی بۆ دەسەڵاتەکەیان، توڕەبوونی ئەوانی ئەستەم کرد.

تەنیا سەعاتێک پاش پرسیارکردن، ئەندامانی کۆمیتەکە تەواو بوون. سەرۆکی کۆمیتەکە وتی "زۆر سوپاس، تۆ نموونەیەکی باشی بە بەراورد بە گەواهیدەرەکانی تر" نەک تەنیا ئازادیان کرد، بەڵکو پێشنیاریان کرد یارمەتیدەری بێ ئەگەر هەر کێشەیەکی لەگەڵ کاربەدەستانی کۆچبەریتی هەبوو کە لەوانەیە لەبەر هۆکاری خۆیان دەستگیری بکەن. ڕۆژی دواتر، برێشت ئەمریکای جێهێشت و قەت نەگەڕایەوە.

### لێکدانەوە

ئاراستەی پەیوەندیپێوەبوونەوەی هۆلیوود ۱۹ بووەهۆی دروستکردنی هاوسۆزییەکی زۆر و سالانی دواتر لە ڕای گشتیدا جۆرێک لە بێگوناهییان بە بەردا. بەڵام بەهەمان شێوە ئاریان بڕی و سالانێکی بەرجی کاری پڕ قازانجیان لەدەستدا. کەچی برێشت کەمەی خۆی

بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆتر بەرامبەر ڕژێمەکە دەربڕی. ئەوە نەبوو کە باوەڕەکانی خۆی بگۆڕێت یان سازشی لەسەر بنەماکانی بکردبێت، بەڵکو لەماوەی کورتی شەپەپیدانەکەیدا، بالادەست بوو کاتێک وا خۆی دەرخست مل دەدات لەکاتێکدا کە بەدرێژایی ئەو هەموو کاتە بە وەڵامی بەنورمزاوی کۆمینەکەی بە درۆی ڕاستەوخۆ سەرگەردان کردبوو کە ئەوان پیمان وەردەگرت چونکە کەرشووبە مار مەتەڵ و گەمەی وشەوە. لە کۆتاییدا ئەو ئازادیی بەردەوامیدان بە مووسیقە شۆڕشگێڕییەکەی پاراست (وەکو هاودژێکی ئارارچەشتی ڕیمدن یان دەستبەسەری لە ئەمریکا)، تەنانەت لەکاتێکیشدا کە بە نهێنی گاڵتەی بە ڕژێمەکە و دەسەڵاتەکەی دەکرد.

ئەوەت لەبیر بێت ئەو خەڵکەی نمایشی دەسەڵاتیان دەکەن بە تاکتیکی ملدان بە ئاسانی فریو دەخۆن. نیشانەی ڕواڵەتییانەی ملدانت وایانلێدەکات هەست بە گرنگی بکەن، ڕەزامەندن و ئاسوودەن بەوەی کە تۆ ڕێزیان دەگریت، ئەوان ئاسانتر دەبنە ئامانج بۆ بێزهێرشی دوایی یان بۆ ئەو جۆرە ڕیسواکردنە ناڕاستەوخۆیەی کە برێشت بەکاریهێنا. بە پێوانەکردنی دەسەڵاتەکەت پێی بە پێی کات، قەت مانۆڕی دوورمەودا مەکەرە قوربانی شکۆمەندییە کورتخایەنەکانی شەهادەت.

*کاتێک لۆردی مەزن گوزەر دەکات، جوتیاری ژیر لە ناخی دڵیەوە سەر دادەنوێنێت و بە بێدەنگییەوە تڕێک دەکەنێت*

**پەندێکی ئەسیوپی**

ئەوەی کە لە مەڵمەڕەی دەسەڵاتدا دەمانخاتە ناو گێژوگرفتەوە زۆرجار ڕێدە کاردانەوەمانە بەرامبەر جوڵەکانی دوژمنان و ڕکابەرەکانمان. ئەو ڕێدەکاردانەوەیە ئەو کێشانە دروست دەکات کە ئەگەر ئەقڵانیتر بووینایە ئەوا خۆمان لێ لادەدا. ئەمە بەهەمان شێوە کاریگەرییەکی چەند جارەیی دەبێت، چونکە ئەو کاتە دوژمنیش ڕێدە کاردانەوەی دەبێت وەک چۆن ئەسپاییەکان لەسەرانسەر مێلانییەکاندا هەیانبوو کاردانەوە هەمیشە بەکەمی غەریزەمانە، ئەمە شەڕلێگرتنە بەرامبەر شەڕلێگرتنێکی تر

بەڵام جارێکی تر کە کەسێک پاڵت پێوە دەنێ و تۆش خۆت لە پەرچەکرداریکدا دەبینییەوە، ئەمە ناقی بکەرەوە، نەرمەنگاری یان کاردانەوەت نەبێت، بەڵکو مل بدە، لا پووەنەکەی ترت ڕابگرە. تۆ بۆت دەردەکەوێت کە زۆرجار ئەمە ڕەفتاریان ئاسایی دەکاتەوە— ئەوان چاوەڕوانی ئەوەیان کردووە، یان ئەمانەت ویستوویانە بە هێزەوە کاردانەوە پیشان بدەن و بۆیە ئەوان دەستەوەستان دەبن و لەبەرانبەر نەبوونی بەرەنگاریتدا سەریان دەسوڕمێت. بە ملدان، تۆ بارودۆخەکە کۆنترۆڵ دەکەیت، چونکە ملدانی تۆ بەشێکە لە پلانێکی گەورەتر بۆ دروستکردنی ئەو باوەڕە لایان کە تۆیان شکست پێهێناوە

لە ٤٧٣ی پێش زایین لە چینی کۆندا، پاشا (گۆجیان)ی یو، لە شەڕی (فوجیاو)دا تووشی شکستێکی گەورە بوو لەبەرانبەر فەرمانڕەوای (وو)دا. گۆجیان ویستی ڕابکات، بەڵام ڕاوێژکارێکی هەبوو کە پێی وت مل بدات و خۆی بخاتە خزمەت فەرمانڕەوای (وو)، بێگەیەک کە ئەو لێیەوە دەیتوانی تاووتوێی ئەو پیاوە بکات و پیلانی تۆڵەسەندنەوە دابڕێژێت. بە بڕیاردان بە پەیڕەوکردنی ئەم ئامۆژگارییە، گۆجیان هەموو سامانەکەی دایە فەرمانڕەواکە و چوو وەکو نزمترین خزمەتکار لە گەورەکانی داگیرکەرەکەیدا کار بکات بۆ ماوەی سێ ساڵ بەبەردەم فەرمانڕەواکەدا خۆی سادە نواند کە ئەویش دوایی لە ئەمەکدارێتییەکەی دڵنیا بوو و ڕێگەیدا بگەڕێتەوە ماڵەوە. لەماوەوەڕا، گۆجیان ئەو سێ ساڵە بە کۆ کردنەوەی زانیاری و دانانی پیلانی تۆڵە بەسەر برد. کاتێک وشکی و قاتییەک پووی لە (وو) کرد و مەملەکەتەکە بەهۆی پەشێویی ناوخۆییەوە لاواز کرا، ئەو سوپایەکی ئامادە کرد، داگیری کرد و بە ئاسانی سەرکەوتوو بوو. ئەوەیە دەسەڵاتی پشت ملدان: ئەمە کات و کشوکێت دەداتێ تا پیلانی دژەلێدانێکی کاولکەر دابڕێژێت ئەگەر گۆجیان ڕایکردایە، ئەم دەرفەتەی لەدەست دەدا

کاتێک لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە ناوگاس دەرەکی بۆ هەڕەشەکردن لە سەربەخۆیی ژاپۆن دەستیپێکرد، ژاپۆنییەکان مشتومڕیان لەسەر ئەوە کرد ئەخۆ چۆن شکست بە بیانییەکان بهێنرێت. وەزیرێک بەناوی (هۆتا ماسایۆشی) یادداشتێکی لە

١٨٥٧دا نووسی کە دوو ساڵی دوای وو کاریگەری هەستە سەر سیاسەتی ژاپۆنی "ئێوە
مر قەناعەتم وایە کە دەبێ سیاسەتی ئێمە هاوپەیمانی دۆستانە بگرێتە خۆ، بۆ ناردنی
کەشتی بۆ وڵاتانی بیانی لە هەموو شوێنێک و ئەنجامدانی بازرگانی، لاساییکردنەوەی
بیانییەکان لەو شوێنەدا کە لە باشترین حاڵەتدان و لەوێوە چاککردنی کەماسییەکانمان،
پەرەدان بە توانای نیشتمانیمان و تەواوکردنی خۆپڕچەککردنمان و لێرەوە پەیتا پەیتا
کارتێکردنی بیانییەکان تا ئەو کاتەی کە لە کۆتاییدا هەموو وڵاتانی جیهان لە بەرەکەتی
هێمنی تەواوی ئێمە تێدەگەن و هەژموونمان لە سەرانسەری جیهاندا پێی دەزانرێت". ئەمە
پێداگرتنێکی بەهاتووانەی یاسانە ملدان بەکاربێنە بۆ بەدەستگەیشتن بە دوژمنەکەت
شێوازەکانی بزانە، پەیتا پەیتا لێی نزیکە، لە دەرەوەڕا خۆت لەگەڵ نەریتەکانیدا
بگونجێنە، بەڵام لەناوەوەڕا کەلتووری خۆت بەرقەرار بکە لە کۆتاییدا تۆ سەرکەوتوو
دەبیت، چونکە هەرچەندە ئەو بە لاواز و نەرم دەتبینێت و هیچ وریاییەکت لەدژ
وەرناگرێت، تۆ کات بەکاردەهێنیت و پێی دەگەیتەوە و لێشی پەت دەبیت. ئەم فۆرمە
نەرمە کاریگەرەی داگیرکردن زۆرجار باشترینە چونکە دوژمن هیچی نییە کاردانەوەی
لەبەرامبەردا بنوێنێت، خۆی بۆ ئامادە بکات یان بەرەنگاری بکات. ئەگەر ژاپۆن بە
زەبری هێز بەرەنگاریی خۆرئاوای بکردایە، لەوانەبوو ڕووبەڕووی داگیرکارییەکی
کاولکارانە ببێتەوە کە بۆ هەمیشە کەلتوورەکەی وەردەچەرخاند

دەشێ ملدان بەهەمان شێوە ڕێگەیەکی گاڵتەکردن بە دوژمنەکانت بخاتەڕوو،
ڕێگەیەکی ئاراستەکردنەوەی دەسەڵاتیان لەدژیان، هەروەک ئەوەی بۆ بریشت ڕوویدا
ڕۆمانەکەی میلان کوندێرا (نوکتە) لەسەر بنەمای ئەزموونەکانی نووسەر لە کەمپی
سزادانی چیکسلۆڤاکیا، چیرۆکی ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن پاسەوانانی زیندان
پێشبڕکێیەکیان ئەنجامدا، پاسەوانەکان لەدژی زیندانییەکان بۆ پاسەوانەکان، ئەمە
دەرفەتێک بوو بۆ پیشاندانی باڵایی جەستەیی زیندانییەکان دەیانزانی کە ئەوان
چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکرێت بدۆڕێن، بۆیە ئەوان لە شێوازی خۆیان دەرچوون-
لاساییکردنەوەی زیدەڕەوانە لە ماندووبوون، ڕاکردنی چەند یاردێک و بەرییوونەوە،

ڕەنگدانی خاو و هێمن لەکاتێکدا کە پاسەوانەکان بە خێرایی لە پێشتەوە ڕایاندەکرد بە جۆرە تاو پێشبڕکێکەوە و دڕاندنی، ئەوان بەشێوەیەکی ملکەچکەرانە پاسەوانەکانیان دەور کردبوو، بەلام "ڕیندەملکەچی"ی ئەوان حاڵەتێکی گاڵتەجاڕانەی هێنابووە کایەوە بەشێوەیەک کە ماروزوخەکەی شێواند. ڕیندەملکەچی خۆبەدەستەوەدان – لێرەدا ڕێگەیەک بوو بۆ پیشاندانی باڵایی بەشێوازێکی پێچەوانە بەرەنگاری، ڕیندانییەکانی دەخستە دۆ سوورێکی توندوتیژی، ئەمانی بۆ ئاستی پاسەوانەکان نەرم دەکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕیندە ملکەچبوون بەرانبەر پاسەوانەکان، ئەوانی پووچ پیشاندا، لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی بەشێوەیەکی ڕاست سزای ڕیندانییەکان بدەن کە ڕێک ئەوەیان کرد کە داوایان لێکرابوو.

دەسەڵات هەمیشە لە گۆڕاندایە – چونکە گەمەکە بە سروشتی خۆی شلۆقە و بنیاتیەکی ململانێی بەردەوامە، ئەوانەی دەسەڵاتیان هەیە بەفریبەن هەمیشە خۆیان لە جوڵەیەکی لێژبووبەوەدا دەبیننەوە. ئەگەر تۆ بەشێوەیەکی کاتی خۆت بە لاوازبوو ببینیت، تاکتیکی ملکەچبوون پیرۆزێکتە بۆ خاوێکی تر خۆپەروەردەکردنەوەت – ئەمە نامەجی تۆ پووپوش دەکات. ئەم فێری ئۆقرەگرتن و خۆکۆنترۆڵکردن و شەرەبەتییەکانت دەکات لە یارییەکەدا و دەتخاتە باشترین پێگەی مومکین بۆ کەڵک وەرگرتن لە خلیسکانی لەپڕی سەرکوتکەرەکەت. ئەگەر تۆ ڕابکەیت یان شەڕ بکەیتەوە، لە دوور مەودادا ناتوانیت بیبەیتەوە. ئەگەر مل بدەیتە ئەوا تەفریبەن هەمیشە لە کۆتاییدا سەرکەوتوو دەبیت.

**وێنە:** درەختی بەڕوو ئەو بەڕووەی بەرەنگاریی با دەکات، لقەکانی یەک بە یەک لەدەست دەدات و لەکاتێکدا کە هیچی نامێنێت بیپارێزێت، بەدارەکە بۆ دواجار دەشکێت. ئەو دار بەڕووەی دەچەمێتەوە ژیانی درێژترە، بنەکەی گەشە دەکات، دەکشێت، ڕەگەکانی قووڵتر دەچنە خوارەوە و توکمەتر دەبێت.

**دەسەڵات:** تر ئەوەت بیستووە کە دەڵێت، چاو لەبەرانبەر چاو و ددان لەبەرانبەر ددان. بەلام من پێت دەڵێم، بەرەنگاریی ئەهریمەن مەکە. بەڵکو هەر کەسێک زللەیەکت

لەلای ڕاستت دەدات لاکەی دیکەشی بۆ ڕاگرە. ئەگەر هەر کەسێک لای یاسا سکالات لێبکات و چاکەتەکەت بسات، با باڵاپۆشەکەشت ببات. هەر کەسێکیش ناچارت بکات مایلێک ڕێ بکەیت، دوو مایلی لەگەڵ برۆ

(عیسای مەسیح)

## پێچەوانەبوونەوە

کەڵکی ملکەچبوون، ڕزگارکردنی زیانە بۆ کاتێکی دواتر کاتێک تۆ دەتوانیت پێی خۆت قایم بکەیت. ئەمە کتومت جۆلادانە لە شەهادەت کە کەسێک مل دەدات، بەڵام کاتی تر هەن تیایاندا دوژمن سازش ناکات و پێدەچێت شەهادەت تاکە ڕێگەی دەرچوون بێت. سەرباری ئەمەش، ئەگەر تۆ ئامادەبیت مردنت قبوڵبێت، لەوانەیە ئەوانیتر دەسەڵات و ئیلهام لە نموونەی تۆ وەرگرن

لەگەڵ ئەوەشدا، شەهادەت، پێچەوانەبوونەوەی ملکەچبوون، تاکتیکێکی بەشێو و نادەقاودەقە و وەکو شەڕانگێزییەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە توندوتیژانەیە. بۆ هەموو شەهیدێکی بەناوبانگ هەزارانی تر هەن کە نە ئیلهامبەخشی دین بوون نە یاخیگەری، بۆیە ئەگەر شەهادەت جارێک لە جاران دەسەڵاتێکی دیاریکراوت پێ بدات، بەشێوەیەکی پێشبینی نەکراو ئەمە دەکات. لەوەش گرنگتر، تۆ بوونت نابێت تا چێژی لەو دەسەڵاتە ببینیت، بەو شێوەیەی کە هەیە. دواجاریش شتێکی خۆپەرستانە و لوتبەرزانە لە شەهادەت هەیە، وەک بڵێی ئەو کەسانە هەستیان کردووە ئەوانەی شوێنیان کەوتوون گرنگییەکی کەمتریان لە شکۆمەندی ئەمان هەیە

کاتێک دەسەڵات جێت دەهێڵێت، باشترین شت ئەوەیە پێچەوانەبوونەوەی یاساکە فەرامۆش بکەیت و واز لە شەهادەت بێنە. دواجار بارودۆخەکە لەبەرژەوەندیی خۆت دەشکێتەوە، و دەبێ تۆ زیندوو بمێنیت تا بیبینیت

## یاسای ژمارە ٢٣

# هێزەکانت چڕ بکەرەوە

### دۆکە

وزە و هێزەکانت پارێزگاری لێبکە بەوەی کە لە بەهێزترین پێتیاندا بە چڕی بیانهێڵیتەوە. تۆ بە دۆزینەوەی کانێکی دەوڵەمەند و قووڵتر تێراچوونی، خشڵی زیاترت دەست دەکەوێت نەک بەوەی کە لە کانێکی تەنکەوە بەهێرایی دەچینە سەر کانێکی تەنکی تر-هەمیشە کاتێک چڕی شکست بە فراوانی دێنێت. کاتێک تۆ بۆ سەرچاوەکانی دەسەڵات دەگەڕێیت بۆئەوەی بەروت بکاتەوە، یەک پاڵپشتی سەرەکی بدۆزەوە، ئەو مانگا قەڵەوەی کە بۆ ماوەیەکی درێژ شیرت دەداتێ.

### سەرپێچی لە یاساکە

لە چین لە سەرەتاکانی سەدەی شەشەمدا، مەملەکەتی (وو) هەنگاو لەگەڵ ناوچە دەگۆڕییەکانی دراوسێ، مەملەکەتی ناوەڕاست، هەڵایساند (وو) هێزێکی بووکەشە بوو، بەڵام مێژوو و شارستانییەتی مەملەکەتی ناوەڕاست ی نەبوو، بۆ ماوەی چەند سەدەیەک سەنتەری کەلتووری چین بوو بە شکست پێهێنانی مەملەکەتی ناوەڕاست، پاشای (وو) دەستنەچێ پێگەکەی بەرز دەبووەوە

جەنگ بە گوڕێکی زۆر و چەند سەرکەوتنێکەوە دەستپێبکرد، بەڵام بەرەوپێی کپ بووەوە. سەرکەوتنی لەمەڕەیەکدا لەشکرەکانی (وو)ی لە بەرەمەکی تردا لاواز دەکرد. ڕاوێژکار و وەزیری سەرەکی پاشا، (وو ترو هسبو) هۆشداری دا لەمەڕ ئەوەی کە دەوڵەتی دراوسێی (یوە) لە باشوور، تیمێی کێشەکانی مەملەکەتی (وو) دەکات و پلانی داگیرکاری هەیە. پاشا تەنیا پێکەنینی بەم بیگەڕانیانە دەهات. سەرکەوتنێکی تری بەدەست هێنابە ئەوا مەملەکەتی ناوەڕاستی مەزن هی خۆی دەبوو.

لە ساڵی ٤٩٤دا، وو ترو هسبا کوڕەکەی ناردە مەملەکەتی (چی) بۆ مەبەستی پارێزگاری بەم کوڕە، ئاماژەیەکی دایە پاشا لەمەڕ ئەوەی کە ئەو جەنگی بەلاوە پەسەند نییە و باوەڕی وایە چاوچنۆکیی خۆپەرستانەی پاشا سەردەکێشێت بۆ ڕووخانی (وو). پاشا، دوای ئەوەی هەستیکرد ناپاکی لێکراوە، ڕەحمەی بە وەزیرەکەی گرت و تۆمەتباری کرد بە بێ ئەمەکی و لە توڕەییدا فەرمانی پێدا خۆی بکوژێت. (وو ترو هسبو) پەیڕەوی لە پاشاکەی کرد، بەڵام پێش ئەوەی چەقۆ لە سنگی هەڵچەقێنێت، هاواری کرد "ئەی پاشا، چاوەکانم دەربێنە و بە دەروازەی (وو) هەڵیانواسە، بۆئەوەی هاتنە ناوەوەی سەرکەوتووانەی (یوە) ببینم".

بەو شێوەیەی (وو ترو هسبو) پێشبینی کردبوو، لەماوەی چەند ساڵێکدا سوپایەکی (یوە) بەزۆر دەروازەی (وو)دا ڕەت بوو لەکاتێکدا کە بەربەرییەکان دەوری کۆشکیان گرت، پاشا دوایین قسەی وەزیری بیر کەوتەوە- و هەستیکرد چۆن دەربڕاوەکانی کابرای مردوو ڕیسوابەتییەکەی ئەم دەبینن. بەهۆی ئەوەی نەیتوانی بەرگەی شەرمەزارییەکەی بگرێت، پاشا خۆی کوشت، "ڕووخساری خۆی داپۆشی بۆئەوەی سەرزەنشتی پڕ لۆمەی وەزیرەکەی لە دنیاکەی تردا نەبینێت"

### لێکدانەوە

چیرۆکی (وو) نموونەی هەموو ئەو ئیمپراتۆریەتانەیە کە بەهۆی قاچ درێژ کردن ڕووخاون. ئەم ئیمپراتۆریەتانە بەهۆی هەستنەوون بە سەرکەوتن و بەخۆشکەوتن بە

چارچێوکی، بە ئاستی نامۆ فراوان دەبێ و ڕووبەڕووی پووچانێک دەبنەوە کە سەراپاگیرە. ئەمەش بوو بەسەر ئەسپانییەکان هات کە چاویان بڕییە نووکەی نووکەدەستی (سیسیلی) و دواجار ئیمپراتۆریەتەکەی لەدەستدا. پلانەکان سنوورەکانی ئیمپراتۆریەتەکەیان کشاند بۆ گرتنەخۆی ڕەوییە فراوانەکان، لەمەشدا لاوازیی خۆیان و دەولەتی داگیرکارییان لەلایەن هێزێکی تری بەربەرییەوە زیاد کرد

بەلای چینییەکانەوە، چارەنوسی مەملەکەتی (وو) وانەیەکی بەپەتییە لەبارەی ئەوەی کە چی ڕوودەدات کاتێک تۆ لەپێناو دەستکەوتنی هەوکەیێدا هێزەکانت لەچەند بەرەیەکەوە بلاو دەکەیتەوە، بینایی بۆ مەترسییە دوورەکان لەدەست دەدەیت (سون تزو) دەلێت "ئەگەر تۆ لە مەترسیدا نەبیت ئەوا شەڕ مەکە". ئەوە تەقریبەن یاسایەکی فیزیکییە: هەر شتێک لەدەرەوە قەبارەی خۆیەوە هەلئاوسا بەشێوەیەکی حەتمی دادەڕمێت. مایکێ نەقلی لە ئامانجێکەوە بەرەو ئامانجێکی تر بجولێت، ئەوەی کە چڕ بووەتەوە، تەبایە و ڕایەلە بە ڕابردوویەوە، دەسەلاتی هەیە. ئەوەی کە وێ بوو، داپەش بوو و ئاوسا، دەڕزێت و دەکەوێتە سەر زەوی. چەندەی گەورەتر بئاوسێت، توندتر دەکەوێت

## پەیڕەویکردن لە یاساکە

خانەوادەی بانکیی ڕۆسچیلد سەرەتایەکی سادەی لە ئۆردوگای جوولەکەی فرانکفورت، ئەلمانیا هەبوو. یاسا توندەکانی شارەکە بۆ جوولەکەی تەسک کرد تا لەگەل دەرەوەی ئۆردوگاکەدا تێکەل بن، بەلام جوولەکان ئەمەیان گۆڕیبوو بۆ هەڕیفەتێک- وایلێکردن پشت بەخۆیان ببەستن و بەمەرزۆ بن بۆ پاریزگاری لە کەلتوورەکانیان بە هەر نرخێک بێت. (مەیەر ئامشێل)، یەکەمین ئەندامەی ڕۆسچیلدەکان کە لە دەرەکانی سەدەی هەژدەدا لە ڕێگەی بیدانی قەرزەوە سامانی کەلەکە کرد، بەباشی لەو دەسەلاتە تێگەیشت کە لەم جۆرە چڕکردنەوە و هەماهەنگکردنە دەبێ

یەکەم، مایەر ئامشێل خۆی لەگەڵ خانەوادەیەکدا یەکخست، واتە میرە بەهێزەکانی (بۆرن ئۆند بێکساس) لەبری بڵاوکردنەوەی خزمەتگوزارییەکانی؛ خۆی کردە بانکداری سەرەکیی ئەم میرانە. دووەم، ئەو بەرپرسیارێتی هیچ بەشێکی بزنسەکەی بە بێگانەکان نەسپارد، تەنیا منداڵەکان و خزمە نزیکەکانی بەکارهێنا. چەندەی خێزانەکە یەکگرتوو و بەیەکەوە پەیوەست بوو، ئەوەندە بەهێزتر دەبوو. سێیەم، پێنج کوڕەکەی مایەر ئامشێل بوونە بەڕێوەبەری بزنسەکە. کاتێکیش مایەر ئامشێل لە ١٨١٢دا مرد، رەتی کردەوە ناوی میراتگرێکی سەرپەرەیی بنێت، لەبری ئەمە، هەموو کوڕەکانی دانا بۆ بەردەوامی پێدان بە نەریتی خێزانی بۆئەوەی بە یەکگرتوویی بمێننەوە بەرەنگاری مەترسییەکانی پەرتەوازەیی و دزەکردنی بێگانە بکەن.

کاتێک کوڕەکانی مایەر ئامشێل بزنسی خێزانەکەیان کۆنترۆڵ کرد، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە کلیلی سامان لە ئاستێکی فراواندا بریتییە لە زامنکردنی شوێنپێ لە داراییەکانی ئەورووپادا بە گشتی، نەک خۆبەستنەوە بە وڵاتێک یان میرێک. لەو پێنج برایە، ناسان هەنوکە دوکانێک لە لەندەن کردبۆوە. لە ١٨١٣دا، جەیمز چووە پاریس. ئامشێل لە فرانکفۆرت مایەوە، سالۆمۆن خۆی لە فیەننا جێگیر کرد و کارل ی گەنج چووە نیپان لەبارێکدا کە هەر یەک لە قەڵەمڕەوەکانی کاریگەری دابەشکران، ئەوان توانیان دەستی خۆیان لە بازاڕە داراییەکانی ئەورووپا گیر بکەن.

### لێکدانەوە

رۆسچیلدەکان لەسەردەمێکی نامۆدا هاتنە دنیاوە. ئەوان لە شوێنێکەوە هاتن کە چەند سەدەیەک بوو نەگۆڕابوو، بەڵام لەسەردەمێکدا ژیان کە شۆڕشی پیشەسازی، شۆڕشی فەرەنسی و زنجیرەیەکی ناکۆتای ناجێگیرییەکانی لێکەوتەوە. رۆسچیلد رابردووی نە زیندوویی هێشتەوە، بەرگەی رێساکانی بڵاوبوونەوەی سەردەمەکەی گرت و یاسای چڕبوونەوەی پەیڕەو کرد.

کەس لە جەیمز ڕۆسچیلد باشتر نوێنەرایەتی ئەمە ناکات، ئەو کوڕەی کە لە پاریس خۆی بونیاد نا. لە تەمەنیدا، جەیمز شایەتی شکستی ناپلیۆن، گەڕانەوەی پاشایەتی بۆربۆن، پاشایەتی بۆرجوازیی (ئۆرلیەن)، گەڕانەوەی کۆمار و دواجار تاج لەسەرنانی ناپلیۆنی سێیەم بوو. بەدرێژایی ئەم هەموو پەشێوییە، فاشیۆن و ستایلە دەرەسییەکان بە ڕیتمێکی بێ وچان گۆڕانیان بەسەردا هات. بەبێ ئەوەی وەکو پاشەوارێکی ڕابردوو دیار بێت، جەیمس خانەوادەکەی ئاراستە کرد وەک بڵێی گوێدە هووەکە لەناو ناخیاندا لەژیان بەردەوام بوو. ئەو هێز و تەبایی ناوەکیی هێزەکەی پاراست. چڕکردنەوە بناغەی هێز، سامان و سەقامگیریی ڕۆسچیلدەکان بوو.

*باشترین ستراتیژ هەمیشە ئەوەیە زۆر بەهێز بێت، سەرەتا بەشێوەیەکی گشتی، پاشان لە خاڵێکی یەکلاییکەرەوەدا... یاسایەکی باڵاتر و سادەتری ستراتیژ وەکو هێزە چڕکراوەکان بوونی نییە بە کورتی، یەکەمین پرەنسیپ ئەمەیە بەوپەڕی چڕکردنەوەوە هەنگاو بنێ*

*(لەبارەی جەنگەوە، کارل ڤۆن کلاوسویتز ١٧٨٠-١٨٣١)*

## کاڵای دەسەڵات

جیهان لە ڕێگەی دابەشبوونێکی گەورە و گەورەترەوە دەر ئافەت کەوتووە—لەناو وڵاتان، گروپە سیاسییەکان، خانەوادەکان و تەنانەت تاکەکاندا. ئێمە هەموومان لە دۆخێکی پەرت و بڵاوبوونی تەواوەتیدایین، بە زەحمەت دەتوانین هۆشمان بە یەک ئاقاردا ئاراستە بکەین تا بە هەزار ئاقاردا پەکێش نەکرێین. ئاستی ململانێی جیهانی مۆدێرن لە هەموو کاتێکی تر زیاترە و ئێمە تێکەڵی بیروباوەڕی زیادی خۆمان کردووە

چارەسەرەکە بریتییە لە فۆرمێکی کشانەوە بۆ ناو خۆمان، بۆ ڕابردوو، بۆ فۆرمە چڕترەکانی بیر و کردار. هەروەک شۆپنهاوەر دەنووسێت "بیر ئەندازەی چڕییە، نەک ئەندازەی فراوانی" ناپلیۆن بە بەهای چڕکردنەوەی هێزەکانی لە لاوازترین خاڵی دوژمن دەزانی— ئەمە نهێنیی سەرکەوتنەکەی بوو لە شەڕگەدا. بەڵام توانای ئیرادە ڕەوشی

بەسەر هەمان بەروکە سەرچاوەی گرنگ بوو بان ئامانجی، بەرکیری تەواو بۆ سەر ئامانج و بەکارهێنانی ئەم تایبەتمەندییانە لەسەر هەڵکی کەم ئەرکیر، هەڵکی ناو تۆڕی هۆش پەروەردە – تیژبێکی وەها هەمیشە بیشانەی خوی دەدۆزێتەوە و دوژمن سەرنگون دەکات.

کارلوفا سەرکەوتنی لەژیاندا گەڕاندەوە بۆ توانای لە ئەرکیر کردنە سەر تاکە ئامانجێك و کارلەسەرکردنی تا ئەو کاتەی ناکامی دەبێت. ئەوە توانای بوو لەوەدا کە تەواو خۆی بەر ژنی ئارەزووی دەکردن بسپێرێت کە ئەوی کردە کەسێکی تەواو نەکێشکەر بۆ ئەو هەمتە و مانگانەی کە یەکێك لەم ژنانە لە دەوروبەری دەژیا، بیری بە کەسی تر نەدەکردەوە. کاتێك ئەو بە تۆمەتی ناپاکی لە کۆشکی دوك بە ڤینیسیا زیندانی کرا، زیندانێك کە کەس نەیتوانیبوو لێی ڕابکات، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هۆشی خۆی بەسەر تاك ئامانجی ڕاکردن چڕ کردەوە. گۆڕانکارییەکی زۆرەکان، کە بەو مانایە بوو چەند مانگێکی هەڵکەندن هیچ ئەنجامێکی نەدەبوو، ئەوی سارد نەکردەوە. ئەو مکوڕ بوو و دواجار ڕایکرد. ئەو دوایی نووسیبووی "من هەمیشە بڕوام وابووە کە کاتێك کەسێك شتێك لەکەڵەی دەدات بیکات، کاتێکیش بەشێوەیەکی تەواو خۆی بەو پلانەوە قاڵ دەکات، دەبێ سەرکەوتوو بێت، جا تەگەرەکان هەرچییەك بن. ئەو کەسە دەبێتە بەڕێوەی ئەمریم یان پاپا".

ئەرکیر بکەرە سەر تاکە ئامانجێك، تاکە ئەرکێك و بە ناکامی بگەیەنە. لە جیهانی دەسەڵاتدا تۆ بە بەردەوامی پێویستت بە یارمەتی ئەوانیترە، زۆرجاریش ئەو کەسەی کە لە تۆ بەهێزترن. گەمژە لە کەسێکەوە دەچێتە لای کەسێکی تر، بەو بڕوایەی کە خۆی بڵاو کردەوە بەرگە دەگرێت. ئەوە کرۆکی یاسای ئەرکیرە کە لە ڕێگەی خۆ جێگیرکردنت لەسەر سەرچاوەیەکی گونجاوی دەسەڵات، بەشێکی زۆری وزە دەگێڕێتەوە و دەسەڵاتێکی زۆر بەدەست دێنیت. نیکۆلا تێسلای زانا بەو بڕوایەی کە بەوەی خزمەتی تاکە دەسەڵاتدارێك نەکات بەشێوەیەك لە شێوەکان سەربەخۆیی خوی دەپارێزێت، خۆی وێران کرد. ئەو تەنانەت (جەی.پی.مۆرگان)ی ڕەت کردەوە کە گرێبەستێکی دەوڵەمەندی خستە بەردەمی

هەموو نووسەر و وێنەکێشە هونەرییەکانی ڕێنیسانس لەگەڵ ئەم کێشەیەدا ململانێیان بوو، لەهەموویشیان زیاتر پیترۆ ئارێتینۆ بەدرێژایی ژیانی، ئارێتینۆ بەدەست ڕیسوایی ڕاریکردنی ئەم میر و ئەو میرەوە ناڵاندی. دواجار، ئیتر بەس بوو بۆی و بڕیاریدا بوو بەکانە مەرایی کردن بۆ چارلسی پێنجەم، بەڵێنی حورمەتگوزارییەکانی قەڵەمە کاریگەرەکەی بە ئیمپراتۆر دا. دواجار ئەو ئازادییەی بۆ دەرکەوت کە لە هۆگربوون بە تاکە سەرچاوەی دەسەڵات دەهات. مایکل ئەنجیلۆ ئەم ئازادییەی لای پاپا جولیەسی بوو، گالیلۆ لای مێدیسییەکان بەدی کرد. لەکۆتاییدا تاکە پاڵپشتێک ستایشی ئەمەکداری تۆ دەکات و پشت بە حورمەتگوزارییەکانت دەبەستێت. لەبووژمەوەدا، گەورە خزمەتی بەندە دەکات.

**وێنە:** تیر. تۆ ناتوانیت بە تیرێک دوو نیشانە بپێکیت. ئەگەر بیرکردنەوەکانت گومڕا بووبن ئەوا دڵی دوژمن ناپێکیت. ئەقڵ و تیر دەبێ یەک بن. تەنیا بە تەرکیزێکی تەواوی ئەقڵی و فیزیکییەوە دەتوانیت ئامانج بپێکیت و دڵ بدڕێت.

**دەسەڵات:** زیاتر بایەخ بدە بە چڕی نەک فراوانی. کاملبوون لەو چۆنایەتییەدایە نەک لە بڕدا. بانتایی بەتەنیا ناچێتە سەروو ئاستی هام ناوەندەوە و ئەوە نەگبەتی کەسانی خاوەن ئارەزوومەندیی فراوانە کە لەکاتێکدا کە دەیانەوێ پەنجە بخەنە ناو هەموو کێکێکەوە، پەنجەیەکیان لەهیچ کامێکیاندا نییە. چڕی، بەرجەستەیی داتی دەکات و ئاکام مسۆگەر دەکات.

(بالتاسار گراسیەن، ١٦٠١-١٦٥٨)

## پێچەوانەبوونەوە

لە تەرکیزکردندا مەترسی و ئەو ساتانەش هەن کەتیایدا بڵاوبوونەوە حوڵەی تاکتیکی گونجاوە. بە شەڕ کردن لەدژی ناسیونالیستەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی چین، ماو سی تونگ و کۆمەنیستەکان جەنگێکی درێژخایەنیان لە چەند بەرەیەکەوە ئەنجامدا و ڕێی پێگەییاندن و بۆسە نانەوە چەکی سەرەکییان بوو. بڵاوبوونەوە زۆرجار بۆ لایەنە

لاوەکە گۆمەوە. لە ڕاستیدا پرەنسیپێکی گرنگی جەنگی گەریلایشە. کاتێک لەگەڵ دوژمنێکی بەهێزتردا دەجەنگێت، چڕکردنەوەی هێزەکانت تەنیا دەتکاتە ئامانجێکی ئاسانتر - وا باشترە بە ڕووبەرەکەدا بڵاو ببیتەوە و دوژمنەکەت بە سەختی بەدیکردنت نائومێد بکەیت.

خۆبەستنەوەت بە تاکە سەرچاوەیەکی دەسەڵات مەترسییەکی بەرجەستەی هەیە: ئەگەر ئەو کەسە بمرێت، بڕوات یان لە پێگە بکەوێت، تۆ ئازار دەچێژیت. ئەمە بەسەر قەیسەر بۆرگیا هات کە دەسەڵاتی خۆی لە باوکی، واتە پاپا ئەلێکساندەری چوارەم وەرگرت. ئەوە پاپا بوو سوپای دایە قەیسەر بۆ شەڕکردن بەناوییەوە. کاتێک لەپڕێکدا مرد (لەوانەشە بەهۆی ژەهرەوە)، قەیسەر ئەوەندەی مردوویەک سەنگی هەبوو. ئەو بەدرێژایی ساڵانێک دوژمنی زۆری دروستکردبوون و ئێستا چەتری پارێزگاریی باوکی نەمابوو. لەو حاڵەتانەدا کە لەوانەیە تۆ پێویستت بە پارێزگاری بێت، زۆرجار وەها ژیرانەترە کە خۆت بە چەند سەرچاوەیەکەوە ببەستیتەوە. جوڵەیەکی وەها بەتایبەت لەو ماوەیەی پەشێوی گەورە و گۆڕانکاری توندوتیژانەدا، کردارییە، یان کاتێک دوژمنان زۆرن. چەندەی حورمەتی پاڵپشت و دەسەڵاتداری زۆرتر بکەیت، ئەوەندە کەمتر سەرکێشی دەکەیت ئەگەر یەکێکیان لە دەسەڵات بکەوێت. تەنانەت ئەگەر تۆ تەرکیز بکەیتە سەر تاکە سەرچاوەیەکی دەسەڵات، ئەوا هێشتا دەبێ پراوەی وریایی بکەیت و ئامادەی ئەو ڕۆژە بیت کە گەورەکەت یان پاڵپشتە دارایییەکەت چیتر لەوێ نییە یارمەتیت بدات.

دوجار لەوانەیە زۆر تەرکیزکردنە سەر تاکە ئامانجێک دەشێ بتکاتە کەسێکی تەحەمولنەکراو، بەتایبەت لە هونەرەکاندا. وێنەکێشی ڕێنیسانس، پاولۆ ئوچێلۆ ئەوەندە خرچکی گرتبوو بە گۆشە نیگاوە کە تابلۆکانی بێ گیان و ڕووکەش دیار بوون. لەکاتێکدا کە لیۆناردۆ داڤینچی خۆی دابووە هەموو شتێک: تەلارسازی، وێنەکێشان، جەنگ، پەیکەرتاشی، میکانیک، بڵاوبووبەوە سەرچاوەی دەسەڵاتەکەی بوو. بەڵام بلیمەتییەکی وەها دەگمەنە و ئێمەیانان لە چڕکردنەوەی تواناکانماندا باشترین.

## یاسای ژمارە ٢٤

# ڕۆڵی دەرباریيەکی پێرفێکت ببینە

### حوکم

دەرباریی پێرفێکت کەسێکە لە جیهانێکدا گەشە دەکات کە تیایدا هەموو شتێک لە دەوری دەسەڵات و کارزانی سیاسی دەسوڕێتەوە. ئەو لە هونەری ناڕاستەوخۆبووندا ئەسپی خۆی تاو داوە، ئەو مەرایی دەکات، مل بۆ سەرووی خۆی دەدات و بە تەموژاویترین و نەرم و میانترین شێواز دەسەڵات بەسەر ئەوانیتردا پیادە دەکات. یاساکانی دەرباری فێربە و پیادە بکە، ئیتر سنوور نامێنێت لەبەردەم بەرزبوونەوەت لە دەرباردا

### کۆمەڵگەی دەربار

ئەوە فاکتێکی سروشتی مرۆڤە کە ستراکتوری کۆمەڵگەی دەربار لەدەوری دەسەڵات خۆی پێکدێنێت. لە ڕابردوودا، دەربار لە دەوری فەرمانڕەوا دەخولایەوە و زۆر کرداری هەبوون: سەرباری دڵخۆش هێشتنەوەی فەرمانڕەوا، شێوازێکی تۆکمەکردنی هەرەمی پاشا، خانەدان و چینەکانی سەرەوە بوو و بۆ نەپاشکۆ و نزیک هێشتنەوەی خانەدانان بوو لە فەرمانڕەوا بۆئەوەی بتوانێت چاوێکی لەسەریان بێت. دەربار بەزۆر ڕێگەوە

حورمەتی دەسەڵات دەکات، بەڵام لەهەمووی زیاتر فەرمانڕەوا شکۆمەند دەکات
جیهانێکی بچووککراوەی بۆ دابین دەکات کە دەبێ کۆشش بکات بۆ دڵشادکردنی

دەرباری بوون گەمەیەکی ترسناک بوو. گەشتبارێکی عەرەبی سەدەی نۆزدە بۆ کۆشکی دارفور، کە ئێستا سودانە، دەڵێت دەبووایە دەرباریەکان لەوێ دەبووایە هەرچییەک کە سوڵتان دەیکرد ئەوانیش بیکەن. ئەگەر ئەو بریندار بووایە، ئەوانیش دەبووایە تووشی هەمان برین بن، ئەگەر ئەو لەکاتی ڕاودا لە ئەسپەکەی بەربووبایەتەوە ئەوانیش بەر دەبوونەوە. لاساییکردنەوەی لەو جۆرە لە دەربارەکانی سەرانسەری جیهان دەرکەوتووە. لەهەموو پڕ گیروگرفتتر مەترسیی دڵتەنگ کردنی فەرمانڕەوا بووە- جوڵەیەکی هەڵە مەرگ یان دەربەدەری لێکەوتۆتەوە. دەبووایە دەرباریی سەرکەوتوو بەسەر پەتێکدا بڕوات، دڵخۆشکەر بێت بەڵام زۆریش نا، پەیڕەوی بکات بەڵام بەشێوەیەک لە شێوەکان خۆی لە دەرباریەکانی تر جیا بکاتەوە، لەکاتێکدا کە هەرگیز ئەوەندە خۆی جیا نەکاتەوە کە هەستی نائاسوودەیی بە فەرمانڕەوا ببەخشێت.

دەرباریە گەورەکان بەدرێژایی مێژوو ئەسپی خۆیان لە زانستی بەکاربردنی خەڵک تاو داوە. ئەوان وەها لە پاشا دەکەن هەست بە پاشایەتییەکی زیاتر بکات. ئەوان وەها لە هەموو کەسێکی تر دەکەن لە دەسەڵاتیان بترسێت. ئەوان جادووگەری ڕواڵەتن، دەزانن کە زۆربەی شتەکان لە دەربار لەسەر بنەمای ئەوەی کە چۆن دیارن حوکمیان لەسەر دەدرێت. دەرباریە گەورەکان بەڕێز و بە ئەدەبن، شەڕەنگێزییەکەیان داپۆشراو و ناڕاستەوخۆیە. ئەوان کە مامۆستای قسەن، قەت لە پێویست زیاتر نالێن، پوختترین ناوەڕۆک لە مەرایییەک یان ئیهانەیەکی شاراوە وەردەگرن. ئەوان وەستای خۆشین- خەڵکی دەیانەوێت لێیانەوە نزیک بن چونکە دەزانن چۆن دڵ خۆش بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا نە مەستوو دەکەن نە خۆشیان ڕسوا دەکەن. دەرباریە نەریەکان دەبنە دڵخوازی پاشا، سوودەکانی ئەو پێگەیەیان دەچنەوە. ئەوان زۆرجار لە فەرمانڕەواش بەهێزتر دەبن، چونکە ئەوان لە کەڵەکەکردنی کاریگەریدا جادووگەرن.

زۆر کەس لەمڕۆدا زیاتر دەربار وەکو پاشماوەی رابردوو، تارەرووەکی مێژوویی، رەت دەکەنەوە. ئەوان، بە گوێرەی ماکیاڤیللی، پێیان وایە "وەک ئەوەیە کە ئاسمان، خۆر، تۆخمەکان و مرۆڤەکان سیستەمی جوڵە و دەسەڵاتیان گۆڕیبوو و جیاوازن بە بەراورد بە سەردەمانی کۆن" لەوانەیە چیتر پاشاپاسی خۆر نەناراوا بەس بەڵام هێشتا زۆرێک لە خەڵکی هەن کە پێیان وایە خۆر بەدەوریاندا دەسوڕێنەوە. لەوانەیە دەرەوەی شاهانە زۆر تا کەم ون بووبێت، یان لانی کەم هێزی لەدەستدابێت، بەڵام دەربار و دەربارییەکان هێشتا هەن چونکە هێشتا دەسەڵات هەیە. دەرباریەک چیتر بە دەگمەن داوای لێدەکرێت لە ئەسپەکەی بەر بێتە خوارەوە، بەڵام ئەو یاسایانەی حوکمی سیاسەتی دەربار دەکەن وەکو یاساکانی دەسەڵات ناگۆڕان. کەواتە شتی زۆر هەیە لە دەربارییە گەورەکان فێری ببی، چ ئەوانەی ئێستا و چ ئەوانەی رابردوو.

## یاساکانی سیاسەتی دەربار

خۆت لە خۆدەرخستن بپارێزە. قەت زیرەکی نییە لەبارەی خۆت زۆربڵێیی بکەیت یان سەرنجێکی زۆر بەلای کردەوەکانت ڕاکێش بکەیت. چەندەی زووتر لەبارەی کردەوەکانت قسە بکەیت ئەوەندە زیاتر گومان دروست دەکەیت. تۆ بەهەمان شێوە بڕێکی پێویست ئیرەیی لەنێو هاوەڵانتدا دەوروژێنیت کە سیتەمۆی ناپاکی و چەقۆ لەپشتدان. وریابە، لە هەموو کات وریاتر، لە هەڵدانی دەستکەوتەکانی خۆت و هەمیشە کەمتر لەبارەی خۆت بدوێ بە بەراورد بە خەڵکی تر. خاکیبوون بەشێوەیەکی گشتی شتێکی پەسەندە.

پڕاوەی هێمنی بکە. قەت وا خۆت دەرمەخە کە سەرسەختانە کار دەکەیت. دەبێ بەهرەکەت وا دیار بێت کە زۆر سروشتییە، بەشێوەیەک کە وا لە خەڵکی بکات تۆ بە پەسەن ببینن نەک وەک کەسێکی ماندوو لە کارکردندا. تەنانەت کاتێک شتێکیش کە ئارەقکردنەوەیەکی زۆری دەوێت، وا پیشانی بدە کە بەقەڵای ناوێت. خەڵکی وایان پێ باشترە خوێن و رەنجی تۆ نەبینن کە شێوەیەکی تری خۆدەرخستنە. وەها بۆ ئەوان باشترە سەرسام ببن لەوەی کە تۆ چۆنێک شکۆمەندانە دەستکەوتەکانت

نەدەستهێناوە نە بەراورد نەوەی سەرسام بی کە بۆچی ئەوەندە کار و پەنجی پێویست
بووە

لە سەرپێیکردندا دەستپێوەگر بە لەوانەیە وا دیار بێت کە بەرپرسەکانت بایی
پێویست سەرایيان پێ نادات، سریکی زۆری شتی ناشیش نەمای نامێنێت بەهەمان شێوە
گرمان لەسەر هەلوەلّتدا دروست دەکات هیر ئاراستەرەو سەرایی بکەیت– بەوەی کە لە
هاوبەشیکردنی خۆت کەم بکەیتەوە، بۆ نموونە، ئەوەی کە وا بکەیت گەورەکەت باشتر
دەرکەوێت

رەمیەمساری نکە دەرکەویت هاودژییەك هەیە تۆ ناتووانیت زۆر چەقارەسروانە
خۆت دەربخەیت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت وا بکەیت بەرچاو بیت. لە دەرباری لویسی
چواردەدا، هەر کەسێك پاشا بڕیاری بدایە سەیری نکات ئەوا دەستبەجێ لە هەرەمی
دەربارا بەرز دەبووە تۆ هیچ دەرفەتێکی بەرزبوونەوەت نابێت ئەگەر فەرمانڕەوا لە
رەلکاوی دەربارییەکاندا نەتبینێت، ئەم ئەرکە پێویستی بە هونەرێکی زۆر هەیە، ئەمە
زۆرجار پەیوەندی هەیە بەوەی، بەمانای وشە، ببینرێیت کەواتە، سەرنج بدەرە پواڵەتی
جەستەییت و ڕێگەیەك بدۆزەرەوە بۆ دروستکردنی ستایل و وێنەیەکی جیاواز

ستایل و رەست نەگونجەی ئەو کەسە بگرە کە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت باوەڕێکی
ساختە بە یەکسانی– واتە ئەو میزۆکەیەی کە قسەکردن و ڕەفتارکردن بەهەمان شێوازی
هەموو کەسێك، گرینگ نییە پلە و پایەیان چیبە، دەتکاتە نموونەی شارستانییەت–
هەڵەیەکی گەورەیە ئەوانەی خوار خۆت وەکو شێوەیەکی خۆسوککردن دەیبینن، کە
هەروایە، و ئەوانەی سەروو خۆت هەستیان بریندار دەبێت، هەرچەندە لەوانە نییە قبوڵی
نکەن ئەمە درۆکردن نییە، ئەمە نواندنە، و نواندن هونەرە، نەك دیارییەك لەلایەن
خوداوە هونەرەکە فێربە ئەمە بەهەمان شێوە بۆ چەندەها کەلتووری جیاواز ڕاستە کە
لە دەرباری مۆنێزیدا هەن قەت وایدامەنێ پێوەری ڕەفتار و حوکمدانی تۆ گەردوونین
نەبوونیی خۆگونجاندن لەگەڵ کەلتوورێکی تردا نەك نەسا ترۆپکی بەربەربرمە، بەڵکو
دەتخاتە دۆخێکی لاوازیەوە

قەت هەڵگری هەواڵی خراپ مەبە. پاشا ئەو پەیامبەرە دەکوژێت کە هەڵگری هەواڵی خراپە. ئەمە قسەیەکی سواوە بەڵام ڕاستییەکی تێدایە. دەبێ تۆ کۆشش نەکەیت و ئەگەر پێویست نەکات درۆ نەکەیت بەلایەندا بەهێت بۆئەوەی دڵنیا بیتەوە لەوەی کۆباڵی هەڵگرتنی هەواڵی خراپ دەکەوێتە ئەستۆی هاوەڵێکت، نەک تۆ. تەنیا هەواڵی باش بێنە و ئیتر ئەم شێوازەی تۆ دەبێتە مایەی دڵخۆشی گەورەکەت

قەت دۆستایەتی و پەیوەندیی خۆمانەیی لەگەڵ گەورەکەتدا بەرجەستە مەکە. ئەو نایەوێ هاوڕێیەکی دەست و پێوەندی بێت، ئەو دەست و پێوەندێکی دەوێت. قەت بە شێوەیەکی دۆستانە و ئاسان لێی نزیک مەکەوە، یان وەها ڕەفتار مەکە وەک بڵێی لە پەیوەندییەکی باشدایت– ئەمە مافی ئەوە. ئەگەر ئەو بیەوێ لەم ئاستەدا مامەڵەت لەگەڵ بکات، دۆستایەتییەکی وریایانە پەیڕەو بکە. ئەگینا بە ئاراستەیەکی پێچەوانە ڕەفتار بکە، و دووراییی نێوانسان بە ڕوونی بپارێزە بکە.

قەت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕەخنە لە کەسانی سەروو خۆت مەگرە. لەوانەیە ئەمە پێوە دیار بێت، بەڵام زۆرجار هەیە جۆرێک لە ڕەخنە پێویستە– ئەگەر هیچ نەڵێیت یان هیچ ئامۆژگارییەک نەخەیتەڕوو، ئەوا مەترسیی تر بەڕووی خۆتدا دەکەیتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێ فێر بیت ئەوەندەی دەکرێ بە ئەدەبەوە و بە ناڕاستەوخۆیانە ئامۆژگاری و ڕەخنەکەت ئاراستە بکەیت. دووجار یان سێ جار بیر بکەرەوە، پێش ئەوەی پێت وابێت ئەم قسانەت ناڕاستەوخۆیانە ئاراستە کردووە.

سووربە لە داواکردنی چاکە لەوانەی سەرووی خۆت. هیچ شتێک ئەوەندەی ڕەتکردنەوەی داواکاریی کەسێک، بەرپرس هەراسان ناکات. ئەمە هەستی گوناه و کینە دەبزوێنێت. ئەوەندەی دەکرێ دەگمەن داوای شت بکە و بزانە کەی دەبێ بوەستیت لەبری ئەوەی کە خۆت بکەیتە سواڵکەر، هەمیشە باشتر وایە چاکەکانت بەدەست بهێنیت، بۆئەوەی فەرمانڕەوا بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە پێیانت بدات. لەهەمووی گرنگتر بەلەبری کەسێکی تر داوای چاکەیەک مەکە، چ جای ئەوەی ئەو چاکەیە بۆ دۆستێک بێت.

ئەم نوکتە لەسەر پوڵەت یان ڕەوق مەکە. زێرییەکی ڕسەدوو یان گوتارێکی گاڵتە و گەپ بە نابەئەمەدسە هەوەڵەرسەکانی بۆ دەرباریەیەکی ماش و کات هەی تیانادا، ستامووی و ڕەشۆکبووی گومەدار و کاریگەری. بەڵام خۆت لە هەر جۆرە نوکتەیەک لەبارەی پوڵەتەکان و ڕەوق بپووێرە. ئەمانە زوو موازی زۆر هەستیاری، بەتایبەت بۆ ئەوانەی سەرووی خۆت. بەنامەت ناقیشیان مەکەرەوە کاتێک لێیەوە نووویت. ئەگەر وا بکەیت ئەوا گۆڕی خۆت هەڵدەکەنیت

مەبە بە بەدگومانێکی دەربار. سەرسامی خۆت بۆ کاری باشی ئەوانیتر دەربڕە ئەگەر بە بەردەوامیی ڕەخنە لە هاوتاکانت یان ئەوانەی خوار خۆت بگریت ئەوا بەشێک لەو ڕەخنەیە بەر خوت دەکەوێتەوە، وەکو هەورێکی ڕەش بەسەر سەرتەوە دەبێت بۆ هەر کوێیەک بچیت. خەڵکی لەبەرانبەر هەر تواجێکی بەدگومانانە مڕ دەبەوە و تۆ هەرلسانیان دەکەیت. بە دەربڕینی حاکیترین سەرسامی بۆ دەستکەوتەکانی خەڵکی تر، تۆ بەشێوەیەکی ناکۆک ئاسا سەرنجیان بەلای خۆتدا ڕادەکیشیت. توانای دەربڕینی سەرسامی و وەها دیاربوون کە هەبەستنە، بەهرەیەکی دەگمەن و پوولەمردنە، بەڵام هێشتا بەری دەرحێنرێت

خوێی بە. ئاوێنە داهێنانێکی بێ وێنەیە. بەبێ ئاوێنە تۆ گومانی گەورەت بەدژی جوانی و ئەتەکێت ئەنجام دەدان. تۆ بەهەمان شێوە بۆ کردارەکانت پێویستت بە ئاوێنە هەیە. دەشێ ئەمە هەندێ جار لە خەڵکی مرەوە بێت کە پێت دەڵێن چی لە تۆدا دەبینن، بەڵام ئەمە جێی متمانەترین سەرچاوە نییە. دەبێ تۆ ئاوێنە بیت، ئەقڵت ڕابێنت بەوەی هەوڵ بدەیت خۆت بەو شێوەیە ببینیت کە ئەوانیتر دەتبینن. ئایا تۆ زۆر مستوجیانە ڕەفتار دەکەیت؟ ئایا سەرسەختانە هەوڵ دەدەیت بوئەوەی بەرانبەر قەناعەت پێ بێنیت؟ ئایا زۆر تمووی سەرنجڕاکێشان دناریت، بیروکەی ئەوە دەدەیت بەدەستەوە کە بەرەو بەدەی دەڕۆیت؟ چاودێری خۆت بە و بەمشێوەیە خۆت لە شەتلە لە هەڵە و کیمیامی قونار دەکەیت

له هەستەکانت شارەزا بە. وەکو ئەکتەرێك لە شانۆییەکی گەورەدا، دەبێ فێر بیت
لەگەڵ فەرمان پێکردندا و کاتێکیش کە گونجاوە بگریت و پێبکەنیت. دەبێ بتوانیت
هەڵسووکەوتی بکەیت بۆ ئەوەی پەیوەندی تووڕەیی و ناڕەزایییەکەت بکەیت و بۆ ئەوەی
متمانەت و یاری بخوێنیت. دەبێ تۆ مامۆستای ڕەفتاری خۆت بیت. ئەگەر هەر
دەکەیت پێی بڵێ درۆکردن، بەڵام ئەگەر پێت باش نییە یارییەکە بکەیت و هەمیشە
ڕاستگۆ و ڕاشکاو بیت، سکاڵا مەکە کاتێك ئەوانیتر بە لووتبەرز و فێڵەبازت ناوت دێنن

لەگەڵ ڕۆحی سەردەمدا بگونجێ. ڕەفتارێکی کەمێ سەردەمی ڕابردوو دەشێ کاریگەر
بێت، ئەگەر تۆ ماوەیەکی لانی کەم بیست ساڵ لەمەوپێش هەڵبژێریت. پۆشینی پۆشاکی
پێش دە ساڵ گەمژانەیە ئەگەر تۆ ڕۆڵی قۆشمەچیی دەربار نەبینیت. دەبێ ڕۆحیەتی تۆ
و شێوازی بیرکردنەوەت لەگەڵ سەردەمەکەدا بێتەوە، ئەگەرچی سەردەمەکە ناکۆکیش
بێ لەگەڵ مەعقولیەتی تۆدا. زۆر بە ئاراستەی پێشەوە بیر بکەرەوە، و بەمشێوەیە کەس
بێت تێناگات. قەت بیرۆکەیەکی باش نییە لەم بوارەدا زۆر لەوانیتر جیاببیتەوە. تۆ لانی
کەم لە باشتری حاڵەتدایت ئەگەر لاسایی ڕۆحیەتی سەردەمەکە بکەیتەوە

سەرچاوەیەکی خۆشی بە. ئەمە گرینگە. ئەمە یاسایەکی ڕووی سروشتی مرۆڤە کە
ئێمە لە هەر شتێك ڕادەکەین کە ناخۆش و نادڵگیرە، لەکاتێکدا کە دڵگیری و بەڵێنی
شادی، وەك پەپوولە لە ئاگر، نزیکمان دەکەنەوە. خۆت بکە بە ئاگرەکە و ئیتر بەرەو
سەرەوە بەرز دەبیتەوە. لەبەرئەوەی بە پێچەوانەوە ژیان زۆر پڕە لە ناخۆشی و خۆشی
ئەوەندە دەگمەنە، تۆ وەکو خۆراك و خواردنەوە پێویست دەبیت. لەوانەیە ئەمە ڕووی
دار بێت، بەڵام ئەوەی کە ڕووی دووچار هەراڵۆش دەکرێت پێی ستایش ناکرێت. ئەمەش
چەند ئاستێکی هەیە. هەموو کەسێك ناتوانێت ڕۆڵی کەسی دڵخواز ببینێت، چونکە
هەموو کەسێك تایبەتمەندیی سەرنجڕاکێشی و ژیری نییە، بەڵام ئێمە هەموومان
دەتوانین تایبەتمەندییە ناشرینەکانمان کۆنتڕۆڵ بکەین و هەر کاتێك پێویست بکات
دایپۆشین

ئەو پیاوەی دەربار دەناسێت مامۆستای ئاماژەکانی، چاوەکانی و ڕوخساریەتی. ئەو کەسێکی قووڵە، پەی پێنەبراوە. ئەو بزا خراپەکان دەشارێتەوە، بە ڕووشەکانی بزەی دێت، هەرلەسەرووی کۆنتڕۆڵ دەکات، سۆزەکانی دادەپۆشێت، لەگەڵ دڵیدا نایەتەوە، لەدژی هەستەکان و کردارەکانی دەجوڵێتەوە

ژان دی لا برویەر ١٦٤٥-١٦٩٦

## چەند دیمەنێکی ژیانی دەربار کردارە نموونەییەکان و هەڵە کوشندەکان

دیمەنی ١

ئەلێکساندەری مەزن، والێکی گەورەی مێدیتەرانە و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و هیندستان، ئەرستۆ مامۆستای بوو و بەدرێژایی ژیانی کورتی، خۆتەرخانکەری فەلسەفە و وانەکانی مامۆستاکەی بوو. جارێکیان سکاڵای ئەوەی لای ئەرستۆ کرد کە لەموەی هەڵمەتە درێژخایەنەکانیدا کەس نەبووە مشتومڕی بابەتە فەلسەفییەکانی لەگەڵدا بکات. ئەرستۆ وتی لە گەشتەکانی دواتریدا کالیستینی لەگەڵ خۆید بیبات، کە قوتابی پێشووی ئەرستۆ و فەیلەسوفێکی مژدەبەخش بوو.

ئەرستۆ شارەزاییەتییەکانی (بوون بەدەرباری) بە کالیستینی وتبووەوە، بەڵام کابرای گەنج لەژێرەوە ڕقی لەم شارەزاییەتییانە بوو. ئەو بڕوای بە فەلسەفەی بێگەرد، بە وشە بێ دیکۆرەکان، بە وەی حەقیقەتی ڕووت هەبوو. بە بۆچوونی کالیستینی، ئەگەر ئەلێکساندەر ئەوەندە حەزی لە فێربوون بێت، ئەوا ڕقی لە کەسێک نابێت کە لە ئەقڵی خۆیەوە قسە بکات. لە یەکێک لە هەڵمەتە گەورەکانی ئەلێکساندەردا، کالیستینی چەند جارێک قسەی ئەقڵی خۆی کرد و ئەلێکساندەر فەرمانی مردنی بەسەردا سەپاند.

## لێکدانەوە

لە دەرباردا، ڕاستگۆیی گەمەی گەمژەیە. لەب ئەوەندە خۆت مە گرینگ مەزانە کە مەوات واتە گەورەکەت بایەخ بە ڕەحمەکەت لەو دەدات، ها چەندیکیش ڕاست بێ

## دیمەنی دووەم

لە سەرەتای سیسیلەی (هان)ەوە لە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر، توێژەرە چینییەکان ژمارەیەک نووسینیان کۆ کردۆتەوە بەناوی (٢١ مێژوو) کە بایۆگرافییەکی ڕەسمیی هەر بنەماڵەیەک لە بنەماڵەکانی (هان)ە، کە چیرۆک، ئامار، سەرژمێری و ڕۆژمێری هەنگ دەگرێتە خۆ. هەر مێژوویەک بەهەمان شێوە بەشێک دەگرێتە خۆ بەناوی "ڕووداوە نائاساییەکان" و لێرەدا، لەنێو لیستەکانی بومەلەرزە و لافاوەکاندا، هەندێ جار لەپڕێکدا وەسف و نیشانەی نامۆی وەکو مەڕی دووسەر، فارێک کە پاشەوپاش دەفڕێت، ئەو ئەستێرەیەی لەپڕێکدا لە بەشی جیاجیای ئاسمان دەردەکەوێ و هیتر هەن. دەشێ بومەلەرزەکان لە سۆنگەی مێژووییەوە پشتڕاست بکرێنەوە، بەڵام دیوەزمەکان و دیاردە سروشتییە سەیرەکان بەشێوەیەکی ڕوون بە مەبەست دانراون و هەمیشە بە گروپ ڕوویانداوە. دەشێ ئەمە چ مانایەکی هەبێت؟

ئیمپراتۆریەتی چینی بە زیاتر لە پیاوێک دادەنرا — ئەو هێزی سروشت بوو. مەملەکەتەکەی سەنتەری گەردوون بوو و هەموو شتێک لە دەوری ئەو دەسوڕایەوە. ئەو بەرجەستەکەری کامڵیی جیهان بوو. ڕەحمەگرتن لەو یان هەر کردارێک لە کردارەکانی وەک ڕەحمەگرتن بوو لە سیستەمی خودایی. هیچ وەزیرێک یان دەرباریەک حورمەتی ئەوەی نەبوو تەنانەت بە قسەیەکی ئاگادارکەرەوە لە ئیمپراتۆر نزیک بێتەوە. بەڵام ئیمپراتۆرەکان قابیلی هەڵە بوون و مەملەکەتەکان بە ڕادەیەکی زۆر بەدەست هەڵەکانیانەوە دەیاننالاند. داتانی دیمەنی دیاردە نامۆیەکان لەناو ڕۆژمێری دەربارا

تاکە ڕێگەی ئاگادارکردنەوەیان بوو. ئیمپراتۆر لەبارەی فاری فریو ەخشێوەی پاشەڕیاش و مانگ لە دەرەوەی مەدار دەیخوێندەوە و ترکی ەوە دەکرد کە ئەو ئاگادار دەکرێنەوە، کردارەکانی ئەو ناهاوسەنگکەری گەردوون بوون و پێویستیان بە گۆڕین بوو.

## لێکدانەوە

مەلای دەربارییە چینییەکانەوە، کێشەی چۆنێتی پێدانی ئامۆژگاری بە ئیمپراتۆر پرسێکی گرنگ بوو. بەدرێژایی ساڵان، هەزارانیان دووچاری مردن بوونەوە لە هەوڵیاندا بۆ هۆشداری یان ئامۆژگاریدان بە گەورەکانیان. بۆئەوەی ڕەخنەکانیان بەشێوەیەکی سەلامەت ئاراستە بکەن، دەبووایە ناڕاستەوخۆ قسە بکەن - لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ئەوان زۆر ناڕاستەوخۆ بووبایە ئەوا پشتگوێ دەخران. ئەستێرەناسەکان، ڕێگەچارەی ئەوان بوو: کەسێك وەکو سەرچاوەی ڕەخنە جیا دەکەنەوە، ئامۆژگارییەکە بکە بە ناکەسی، بەڵام لێگەڕێ ئیمپراتۆر قورسایی پاروەزەکە بزانێت.

گەورەکەی تۆ چیتر سەنتەری گەردوون نییە، بەڵکو هێشتا وەها وێنا دەکات هەموو شتێك لە دەوری ئەو دەسوڕێتەوە. کاتێك تۆ ڕەخنەی لێدەگرێت، ئەو کەسە ڕەخنەگرەکە دەبینێت، نەك خودی ڕەخنەکە. وەکو دەربارییە چینییەکان، دەبێ تۆ ڕێگەیەك بۆ ونبوون لەپشت ورپاکردنەوەکەوە بدۆزیتەوە. ڕەمز و میتۆدی تری ناڕاستەوخۆ بەکار بێنە بۆ کێشانی وێنەی ئەو کێشانەی کە پەیدا دەبن، بەبێ ئەوەی ملی خۆت بدەیتە بەر خەنجەر

## دیمەنی ٣

لە سەرەتاکانی ژیانی پیشەییدا، ئەلارسازی فەرەنسی جولس مانسارت هەمدێ پارەی وەرگرت بۆنەوەی هەمدێ کاری زیادەی دیزاین بۆ کۆشکی ڤێرسای بکات بۆ پاشا لویسی شانزە بکات. بۆ هەر دیزاینێك ئەو پلانەکانی هێلکاری دەکات، خۆی دڵنیا دەکاتەوە

لەوەی کە بە پێی ڕیسایەکانی لویس دەبێ، پاشان ئەو پێشکەشی حاوەن شکۆیان دەکات.

سەیت سیمۆنی دەربار وەسفی تەکنیکی مانسارتی کردووە لە مامەڵەکردن لەگەڵ پاشادا " شارەزاییەتییە دیاریکراوەکەی بریتی بوو لەوەی ئەو پلانانە پیشانی پاشا بدات کە بە مەبەست هێنێکی ناتەواویان تێدابوو، زۆرجار مامەڵەکردنی لەگەڵ باخچەکاندا گرتبووە خۆ کە لە پسپۆڕیی مانسارت نەبوون. پاشا، بەو شێوەیەی کە مانسارت پێشبینی دەکرد، کتومت پەنجەی دەخستە سەر کێشەکە و پێشنیاری ئەوەی دەکرد چۆن چارەی بکات، خەڵێک کە تیایدا مانسارت بە سەرسوڕمانەوە بۆ هەمووانی باس دەکرد کە قەت کێشەیەکی نەبینیوە کە پاشا ئەوەندە لێزانانە دۆزیبێتەوە و چارەسەری کردووە. ئەو سەرسامی زۆری خۆی دەردەبڕی، دلی بەوەدا دەنا کە ئەو لە تەک پاشادا جگە لە قوتابییەک چیتر نییە". لە تەمەنی سی ساڵیدا، پاش چەندان جار بەکارهێنانی ئەم میتۆدانە، مانسارت پاداشتێکی شاهانەی سەنگینی وەرگرت" هەرچەندە ئەو لە بەراورد بە دیزایبەرە فەرەنسییەکانی تر کەمتر بەهرەمەند و بەئەزموون بوو، بەرپرسیارێتی فراوانکردنی ڤێرسای لە ئەستۆ گرت. ئەو لەو کاتە بەدوا تەلارساری پاشا بوو

لێکدانەوە

کە گەنج بوو، مانسارت ئەوەی بینیبوو کە چەند پیشەگەری شاهانەی خزمەتکاری لویسی شانرە پۆستەکانیان لەدەستدابوو، نەک لەبەرئەوەی بەهرەمەند نەبوون بەڵکو لەبەرئەوەی هەڵەیەکی کۆمەڵایەتی قورسیان ئەنجامدابوو. ئەو هەڵەکەی نەدەکردەوە. مانسارت هەمیشە کۆششی دەکرد تا وا بکات لویس هەستێکی باشتری لەبارەی خۆیەوە هەبێت، تا ئەوەندەی دەکرێ بەئاشکرا غووری پاشا تێر بکات.

قەت ڕێمای ئەوە مەکە کە شارەزایەتی و بەهرە هەموو شتێکن. لە دەربارد، هونەری دەرباری زۆر گرینگترە لە بەهرەکەی. قەت ئەوەندە کاتێکی زۆر بە توێژینەوەکەت بەسەر

مەبە کە لیهاتوویە کۆمەڵایەتییەکانی لەبیر بکەیت گەورەترین لیهاتوویش توانای ئەوەیە کە وا لە گەورەکەت بکەیت بەهرەمەندتر لەوانەی دەوروبەری دەرکەوێت

دیمەنی ٤

حان بابیبست ئیزابی بیووە وێنەکێشی ڕەسمی دەرباری ناپۆلیۆن لەماوەی کۆنگرەی نەمسادا لە ١٨١٤، پاش ئەوەی ناپۆلیۆن شکستی هێنا، لە دوورگەی ئیلب ڕەمدانی کرابوو بەشدارانی ئەم کۆبوونەوانە کە بڕیاریان لە چارەنووسی ئەورووپا دەدا، ئیزابی–یان بانگهێشت کرد تا لە تابلۆیەکی مەزندا ڕووداوە مێژووییەکان بکاتە یادگارییەکی بەمر

کاتێک ئیزابی گەیشتە ڤیەننا، تالیراند، دانوستانکاری فەرەنسییەکان، سەردانێکی هونەرمەندەکەی کرد بەلەبەرچاوگرتنی ڕۆڵەکەی لە بەرەوپێشچوونەکانی دەوڵەمەندارەکە ڕوونیکردەوە، چاوەڕێی ئەوەی دەکرد لە تابلۆکەدا سەنتەری ڕووداوەکان بێت، ئیزابی بە ڕێزەوە ڕازی بوو چەند ڕۆژێک دواتر دوکی ویلنگتۆن، دانوستانکاری سەرەکی ئینگلیزەکان، بەهەمان شێوە چووە لای ئیزابی و هەمان شتی وت کە تالیراند وتی ئیزابی هەمیشە بەڕێز ڕازی بوو بەوەی کە دوکی مەزن لەڕاستیدا دەبێ سەنتەری مەربج بێت

پاش گەڕانەوەی بۆ شوقەکەی، ئیزابی بیری لە تەنگژەکەی کردەوە ئەگەر ئەو هەر کام لە پیاوەکانی مستایەتە سەنتەری شانۆیەکە ئەوا ئەوسەبوو درزێکی دیپلۆماسی دروست بکات و هەموو جۆرە کسەبەك بووروژێنێت لەسەروەختێکدا کە ئاشتی و تەبایی گرنگ بوون

کاتێک دواجار تابلۆیەکە پەردەی لەسەر لادرا، هەم تالیراند و هەم ویلنگتۆن هەستیان بە ڕێز و ڕێزلێنان کرد و ڕەزامەند بوون بەرهەمەکە هۆڵێکی گەورە پیشان دەدات کە پڕە لە دیپلۆمات و سیاسی لەسەرانسەری ئەورووپادا لەلایەکەوە دوکی ویلینگتۆن دێتە

ژوورەوە و هەموو چاوەکان لەسەر ئەون، ئەو سەنتەری سەرنجە لە ناوەڕاستی تاڵۆکەشدا تالیراند دانیشتووە

## لێکدانەوە

زۆرجار تووسە گەورەت ڕەزامەند بکەیت، بەڵام ڕەزامەندکردنی دوو گەورە لە یەک کاتدا بلیمەتی دەربارییەکی مەرمی پێویستە. ئەنگزەی وەها لە ژیانی دەربارییەکدا زۆر زۆر پەیدا دەبن بە سەرنج حسنەسەر یەکێک لە گەورەکانت، ئەویتر پێی ناخۆش دەبێت دەبێ تۆ ڕێگەیەک بدۆزیتەوە بۆ دەرچوون لەم دووتانە بە سەلامەتی پێویستە گەورەکانت ئیمتیازی خۆیان بەدەست بێنی، تەت بەشێوەیەکی ئەنقەست کیەی گەورەیەکت بە دڵخۆشکردنی ئەویتریان مەڕووژێنە.

## دیمەنی ٥

جۆرج برومێل، کە بەهەمان شێوە بە (بۆ برومێل) ناسراوە، لەدرەنگانی ١٧٠٠کاندا بە دەرکەوتنی بێ ڕادە شوازەی، بە بەرەوەدارکردنی قولاپی پێڵاو (بەڕوویی لەلایەن هەموو شێک پۆشەکانی تر لاسایی کرایەوە) و ڕێگەی زیرەکانەی لە بەکارهێنانی وشەکاندا نیشانەیەکی گەورەی تۆمار کرد. خانووەکەی لە لەندەن شوێنێکی ڕاقی بوو لە شاردا و برومێل لە بابەتی فاشندا دەسەڵاتێک بوو. ئەگەر ڕقی لە پێڵاوێک بووایە، ئەوا تۆ دەستبەجێ خۆت لێ موتار دەکرد و هەرچییەک ئەو بیپۆشیایە تۆش دەتپۆشی. ئەو لە مۆبەری بەستنی کراڤاتد لێهاتوو بوو. دەوترێ لۆرد بایرۆن چەند شەوێکی لەبەردەم ئاوێنەدا بەسەر بردووە لە هەوڵی ئەوەدا کە بزانێ نهێنی بە پشت گرێ خوانەکانی کراڤاتەکەی برومێل چییە

یەکێک لە سەرسامە هەرە گەورەکانی برومێل، میری وەیلز بوو کە وەکو گەنجێکی کەشخە خۆی دەردەخست. پاش هۆگربوونی بە دەرباری میر (و وەرگرتنی

خانەنشینییەکی شاهانە)، بڕۆمینی بەڕوویی ئەوەندە لە دەسەڵاتی خۆی دڵنیا بوو کە دەستیکرد بە نوکتەکردن لەبارەی کێشی میر، بە سەعاتی بیگ بێن ئاماژەی بە خانەخوێکەی دەدا لەبەرئەوەی قەڵەوی تایبەتمەندییەکی گرنگی کەسی شیکپۆشە، ئەمە ڕەخنەیەکی ڕووخێنەر بوو. جارێکیان لەسەر نانی ئێوارە، کاتێک خزمەتگوزارییەکە خاو بوو، بڕۆمینی بە میری وت، "زەنگێک لێبدە، بیگ بێن" میر زەنگی لێدا، بەڵام کاتێک خزمەتگوزارەکە گەیشت، میر فەرمانی پێدا دەرگا پیشانی بڕۆمینی بدات و قەت نەهێڵێت بێتەوە.

سەرباری ئەوەی کە ببووە کەسێکی نەویستراو بەلای میرەوە، بڕۆمینی بەردەوام بوو لەوەی بەهەمان لوتبەرزییەوە مامەڵە لەگەڵ هەموو ئەوانەی دەوروبەری بکات. بەبێ پاڵپشتی میری وەبیر، ئەو کەوتە ناو قەرز و قوڵێکی ڕۆژەوە، بەڵام هەر بەردەوام بوو لە ڕەفتارە ناقۆڵاکانی و هەموان بەڕوویی دەستبەرداری بوون. ئەو لە هەژارییەکی تا بڵێی خەمناک، تەنیا و شێت مرد.

قسەخۆشیی ڕەخنەیی بۆ بڕۆمینی یەکێک بوو لەو تایبەتمەندییانەی کە ئەوی بەلای میری وەبلزەوە خۆشەویست کرد. بەڵام تەنانەت ئەویش کە دڵخۆشەری زەوق و فاشن بوو، نەیتوانی بە نوکتەبازی لەسەر ڕواڵەتی میر بۆی دەرچێت، بەتایبەت لەبارەی ڕەخساریەوە. قەت نوکتە لەسەر قەڵەوی کەسێک مەکە، تەنانەت بەشێوەی ئاراستەرخۆش– و بەتایبەت کاتێک ئەو گەورەی تۆیە. خانەی هەژاراسی مێژوو پڕە لەو کەسانەی ئەو جۆرە نوکتانەیان لەسەر حسابی گەورەکانیان کردووە.

## دیمەنی ٦

پاپا ئوربانی هەشتەم ڕیسێی لەبەرابەر شارەرایەتییەکانیدا بە نووسینی شیعر بادی بکریتەوە کە بەداخەوە لە باشترین حاڵەتدا مام ناوەند بوو. لە ١٦٢٩دا، دوک فرانسیسکۆ دێست، بە زانین لەبارەی خودەرخستنە ئەدەبییەکانی پاپا، فولڤو تێستی وەکو باڵیۆز بۆ ڤاتیکان نارد. یەکێک لە نامەکانی تێستی بۆ دوک دەریدەخات کە بۆچی ئەم

هەڵبژێردراوە "هەر کە مشتومڕ تەواو بوو، ئەژنۆم دادان بۆ ئەوەی بڕۆم، بەڵام ئەدامەتیان ئاماژەیەکیان دا و چوونە ژوورێکی تر کەتیایدا دەمەوێت و پاش گەیشتنە بیریکی بچوک دەستە کاغەزێکی هێنا و لێرەوە، بە ڕووکردنە من بەبیرەیەکەوە، وتی "دەمانەوێ بەڕێزتان گوێ بۆ دارشتنەکانی ئێمە هەڵخەن" و لە ڕاستیدا ئەو دوو قەسیدەی پیندارێ خوێندەوە، یەکێکیان لە ستایشی پیرۆزترین فریشتە و ئەوێتر بەبارەی کۆنتێسە ماتیلد".

ئێمە دەزانین ئێستش کتومت چۆن بیری لەم قەسیدە درێژانە کردۆتەوە، چونکە مەترسیدار دەبوو بۆی ئەگەر ڕای خۆی ئازادانە دەربڕیبایە، تەنانەت بە نامەیەکیش بەڵام ئەو دەنووسێ "من بە گرتنە بەری میزاجەکە، بە ستایشی پێویست قسەم لەسەر هەر بڕێک لە دێڕەکان کردووە و پاش داچڕینی بێی ئەدامەتیان لەبەرامبەر ئەو بێشەنە ئاساییەی بەرەیی (خوێندنەوەی شیعر)، ڕۆیشتم" چەند هەفتەیەک دواتر، کاتێک دراک خۆی سەرەدانی پاپای کرد، پرژایە سەر وتنەوەی تەواوی تیرە شیعرییەکانی قەسیدەکەی پەپا و بابی پێویست ستایشی کرد کە پاپا "ئەوەندە دڵشاد بوو پێدەچوو ئەقڵی لەدەست بدات".

### لێکدانەوە

لە بابەتەکانی زەوق تەت ناتووانیت لەبەرامبەر گەورەکەتدا ئەوەندە ملکەچ بیت ڕەوق یەکێکە لە بەشە هەرە دڕکاوییەکانی ئەفس. ئەت ڕەوقی گەورەکەت مەحەرە زۆر پرسارەوە– قەسیدەکەی بابابە، جبەکەی شبکە، و ڕەفتارەکەی نموونەیە بۆ هەمووان

### دیمەنی ٧

پاش نیوەڕۆیەک لە چیمی دێرین، (چان) فەرمانڕەوی هان لە ٢٥٨دوە تۆ ٢٢٣ی پێش زایین، سەرخۆش بوو و لە باخچەکانی کۆشک حەوی پیا کەوت پارێزەری تاجی

دەربەدەر، کە شاکە ئەرکی مریشک بوو لە چاودێریکردنی پێنجەی سەرێ، بە باخچەکاندا گەڕەری کرد و گەورەکەی بینی کە بەبێ گۆشت خەوتووە، لەبەرئەوەی سەرما دایدەهات، پارێزەری تاج کۆتەکەی بەسەر فەرمانڕەوادا دا و ڕۆیشت

کاتێک (چاو) هەمەری بزوە و بینی گۆشتی پێدا دراوە، پرسیاری لە دەست و پێوەندەکانی کرد "کێ پۆشاکی زیادەی بەسەر مندا داوە؟" ئەوان وتیان "پارێزەری تاج" فەرمانڕەوا دەستبەجێ بانگی پارێزەری ڕەسمی کۆتەکەی کرد و فەرمانیدا بە سزادانی لەبەرلەمەر فەرامۆشکردنی ئەرکەکانی هەروەها فەرمانیدا پارێزەری تاج سەری ببەڕێنرێت

**لێکدانەوە**

ئەت سنوورەکانی حۆت مەبەزێنە ئەوە بکە کە پێت سپێردراوە، تواناکانت بە باشترین شێوە پیادە بکە و قەت لەوە زیاتر مەڕۆ ئەگەر پێت وابێت بە کردنی زیاتر ئەرا کارێکی باشتر دەکەیت، هەڵەیەکی گەورە دەکەیت هەرگیز باش نییە وەها دیار بێت زۆر سەرسەختانە کار دەکەیت- وەک ئەوە وایە کە هەندێ کەموکوڕی داپۆشیت، بەجێگەیاندنی ئەرکێك کە داوت لێنەکراوە تەنیا هەڵە گوماناوی دەکات ئەگەر تۆ پارێزەرێکی تاج بیت، پارێزەری تاج بە ورەی زیادەت هەلگرە بۆ ئەو کاتەی کە لە دەربار بێت

**دیمەنی ٨**

پۆژنکیان، مۆ سەرگەرمی، وێنەکێشی ڕێنیسانس فرا فیلیپۆ لیپی (١٤٠٦-١٤٦٩) و هەندێ لە هاوڕێیان بە بەلەمێکی بچووک چوونە دەرباوانی لە ئانکۆنا لەوێ لەلایەن دوو کەشتیی مەغریبییەوە دەستگیر کران کە لەوێوە بە کۆت و زنجیر بەرەو (ماربارێ)

بردیاس و لەوێ وەکو کۆیلە فرۆشران. بۆ ماوەی هەژدە مانگ، فیلیپۆ ڕەنجێکی زۆری کێشا و هیچ هیوایەکی گەڕانەوەی بۆ ئیتالیا نەبوو.

لە چەند ڕۆژەیەکدا فیلیپۆ ئەو پیاوەی بینی کە کڕیبووی و پزیشکان بڕیاریان دا بەکارهێنانی هەڵوێزی سکێچێکی بکێشێت. لەکاتێکدا کە هێشتا زنجیر و کۆتی پێوەبوو، دیوارێکی سپی دۆزییەوە کە هاوشێوەیەکی تەواوی خاوەنە مەغریبییەکەی لەسەر کێشا بە جلوبەرگی مەغریبییەوە. خاوەنەکە بەرووی گرێبستی ئەمە بووەوە، لەبەرئەوەی پێشتر لەم شوێنانەدا هیچ کەسێك شارەزاییەتییەکی وەهای لە وێنەکێشاندا نەبوو، ئەمە وەکو پەرجوویەك، دیارییەك لەلایەن خوداوە بوو. نیگارەکە ئەوەندە خاوەنەکەی دڵخۆش کرد کە دەستبەجێ ئازادی بە فیلیپۆ بەخشی و بە دەرباریی خۆی دایمەزراند. هەموو گەورە پیاوان لە کەناری باربارێ دەهاتن بۆ بینینی پورترێتە ڕەنگاوڕەنگەکانی فرا فیلیپۆ و لەکۆتاییدا، لە سوپاسگوزاریی بۆ ئەو شەرەفەی پەمطێوەیە بەسەریهات، خاوەنەکە، فیلیپۆی هونەرمەندی بە سەلامەتی گەڕاندەوە بۆ ئیتالیا.

**لێکدانەوە**

ئێمە کە ڕەنج بۆ هەڵکی تر دەکێشین هەموومان بەشێوەیەك لە شێوەکان لەلایەن چەتەکانەوە دەستگیر کراوین و بە کۆیلە فرۆشراوین. بەڵام وەکو فرا فیلیپۆ (ئەگەرچی بە ئاستێکی کەمتر)، زۆربەمان هونەرێك و توانای کردنی شتێکی باشتر لەوانیترمان هەیە. دیارییەکی بەهرەکانت بە گەورەکەت ببەخشە و ئیتر بەسەر دەرباریەکانی تردا بەرز دەبیتەوە. بیگەڕێ با ئیستمارەکە بەر حزی بکەوێ ئەگەر پێویست دەکات، ئەمە تەنیا کاتی دەمێنێ. ئەو وەکو بەردەمارێك بەکاربێنە، وەکو ڕێگەیەکی پیشاندانی بەهرەی خۆت و دواجار کڕینەوەی ئازادیی خۆت لە بەندایەتی.

**دیمەنی ٩**

ئالفۆنسۆی یەکەمی ئاراگۆن هاوڕێکیان خزمەتکارێکی هەبوو کە بە پاشای وت شەوی پێشتر خەونێکی بینیبوو. ئالفۆنسۆ دیارییەکی چاک، ئەسپ و پۆشاکی دابوویە ئالفۆنسۆ کە پیاوێکی سادەدڵی بەخشندە بوو، کەچی گەیشتە ئەو بڕوایەی شتێکی سەرگەرمکەر دەبێت کە ئەم خەونە بکاتە ڕاستی و دەستبەجێ کتومت ئەو دیارییانەی دایە خزمەتکارەکە

ماوەیەکی کەم دواتر، هەمان خزمەتکار بە ئالفۆنسۆی ڕاگەیاند کە خەونێکی تریشی بینیوە و لەخەویدا ئالفۆنسۆ گەنجینەیەکی سکەی ئالتونی داوەتێ. پاشا بزەیەکی کرد و وتی "ئیتر بەدوا بڕوات بە خەونان نەبێ، دزێ".

**<u>لێکدانەوە</u>**

لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ یەکەمین خەونی خزمەتکارەکە، ئالفۆنسۆ هەر زاڵ بوو. بە بەرجەستەکردنی خەونەکە، دەسەڵاتێکی خوداناسای بۆ خۆی بەدەستهێنا، ئەگەرچی بەشێوەیەکی نەرم و نیان و گاڵتەئامێز. لە خەونی دووەمدا، هەموو ڕواڵەتی جادوویی لەنێو چوو، ئەمەیان هیچ نەبوو جگە لە گەمەیەکی ساختەچییانەی تری لەلایەن خزمەتکارەکەوە. ئەت داوای زۆر مەکە، پاشان بزانە چ کاتێک دەبێ بوەستێت، بەخشینی ئیمتیازی گەورەیە– ئەمەی کە چ کاتێک وچ شتێکی ویست ببەخشێت و ئەمەش بەبێ نەدان ئەنجام نادات. دەرفەتی ئەوەی مەدەرێ داواکانت ڕەت بکاتەوە. وا باشترە لە ڕێگەی شایستەییەوە چاکە و دەستکەوتەکان ببەیتەوە بۆ ئەوەی ببەخشرێن بەبێ ئەوەی داوایان بکەیت

## دیمەنی ١٠

جەی ئێم.دەبلیو. تێرنەری گەورە نیگارکێشی دیمەنەکان (١٧٧٥-١٨٥١) بەوە ناسرابوو کە ڕەنگی بەکاردەهێنان کە ئەو بە لێهاتوویی و درەوشاوەییەوە دەکاری دەکردن. ڕەنگ لە تابلۆکانیدا زۆر کاریگەر بوو، لە ڕاستیدا، هونەرمەندەکانی تر قەت نەیاندەویست کارەکانی ئەو لە تەنیشت ئەوەی ئەمان هەڵبواسرێن. بەشێوەیەکی حەتمی هەموو شتێکی دەوروبەری تاریک و لێڵ دەکرد.

سێر تۆماس لۆرێنسی وێنەکێش جارێکیان دەرفەتی ئەوەی پێدرا شاکارەکەی تێرنەر بەناوی (کۆلۆن) ببینێت کە لە پێشانگەیەکدا لەنێوان دوو بەرهەمی خۆیدا هەڵواسرابوون. لۆرێنس بە دڵتەنگییەوە سکاڵای لە خاوەنی گەلەرییەکە کرد کە ئەویش هیچ دڵنەواییەکی پێ نەبەخشی: دواجار، دەبوایە تابلۆکانی کەسێک لە تەنیشت ئەوەی تێرنەر هەڵبواسرێن. بەڵام تێرنەر گوێبیستی سکاڵاکەی لۆرێنس بوو و پێش ئەوەی پێشانگاکە بکرێتەوە، تۆنی ئاسمانی زێڕینی درەوشاوەی لە (کۆلۆن)دا کەم کردەوە، وایکرد ئەوەندەی ڕەنگەکانی ناو کارەکەی لۆرێنس تەڵخ بکا. هاوڕێیەکی تێرنەر کە تابلۆکەی بینی بە نیگایەکی خەمناکەوە لە هونەرمەند نزیک کەوتەوە "ئەوە چیت لە تابلۆکەت کردووە!" تێرنەر بە وەڵامدا وتی "ڕاستییەکەی، لۆرێنسی داماو ئەوەندە دڵتەنگ بوو و ئەمە تەنیا فڕێمێکی کاربۆنە و دوای پێشانگاکە لێدەبێتەوە"

## لێکدانەوە

زۆرێک لە شڵەژانەکانی دەرباری پەیوەندی هەیە بە دەسەڵاتدارەوە کە زۆربەی مەترسییەکانی دەکەوێتە لا. لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەیە وێنای ئەوە بکەین کە گەورە تاکە کەسە بڕیار لە چارەنووست دەدات. هاوتاکان و پاشکۆکانی تۆ بەهەمان شێوە بەشێکی دەبڕوون. دەربار تێکەڵەیەکە لە کینە، ترس و ئیرەیی مەهێنن دەبێ تۆ هەمووان ئارام

بکەنەوە کە لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئازارت بدەن، کینە و ئیرەییان بەلاوە نێن و بەیارییان ئاراستەی خەڵکی تر بکە.

ئیرەیی کە دەرباریبەکی بەرهەستە بوو، دەبێرانی سامان و ناوبانگی بەندە بە هاوت بیکارکینەکانی و هەروەها مامەڵەکار و پاڵپشتە دارایییەکانی. چەند کەسی مەزن بەهۆی ئیرەیی هاوکارەکانیانەوە کەوتوون! وا باشترە بەشێوەیەکی کاتی زیرەکی و لێهاتووی خۆت لێڵ بکەیت نەك ئەوەی بکەویتە بەر شمیر و تیری ئیرەیی.

## دیمەنی پانزە

وینستۆن چەرچل هونەرمەندێکی لابەلا بوو و پاش دووەم جەنگی جیهانی، تابلۆکانی بوونە کەرەستەی کۆکەرەوە هونەرییەکان. بڵاوکەرەوەی ئەمریکی هێنری لوس، دامەزرێنەری (تایم) و (لایف)، یەکێك لە تابلۆکانی سروشتی چەرچلی لە ئۆفیسە تایبەتەکەی لە نیویۆرك هەڵواسی.

لە گەشتێکدا بەناو ئەمریکادا، چەرچل لە ئۆفیسەکەی سەردانی لوسی کرد و ئەو دووانە پێکەوە سەیری تابلۆکەیان کرد. بڵاوکەرەوەکە وتی "ئەمە تابلۆیەکی باشە، بەڵام پێم وایە شتێکی لە پێشەوە پێویستە- مەڕێك، بۆ نموونە". لوس تووشی سەرسوڕمان بوو کاتێك سکرتێرەکەی چەرچل ڕۆژی دواتر تەلەفۆنی بۆ بڵاوکەرەوەکە کرد و پێی وت تابلۆکە بنێرێتەوە بۆ ئینگلتەرە. لوس ئەمەی کرد، ترسی ئەوەی لێ نیشت کە لەوانەیە هەستی سەرۆك وەزیرانی پێشووی بریندار کردبێت. کەچی، پاش چەند ڕۆژێك، تابلۆکە گەڕێنرایەوە بەڵام کەمێك دەستکاری کرابوو. ئێستا تاقە مەڕێك لە پێشەوە بە هێمنی خەریکی لەوەڕ بوو.

## لێکدانەوە

لەناوەندگدا، چەرچل زۆر لە سەرووی لوسەوە بوو، بەڵام بەدڵنیاییەوە لوس دەسەڵاتدار بوو، بۆیە نە ویستی یەکسانییەکی بچوك بکەوێ لەنێوانیاندا. لەگەڵ ئەوەشدا، چەرچل چ

ترسێکی لە بڵاوکەرەوەیەکی ئەمریکی هەبوو؟ بۆچی مل بۆ ڕەحمەی کەسێکی لابەلا بدات؟

دەربار– لەم حاڵەتەدا سەراپای جیهانی دیپلۆماتەکان و دەوڵەتمەدارانی نێودەوڵەتی و بەهەمان شێوە ئەو ڕۆژنامەنووسانەی کە مامەڵەیان دەکەن– شوێنێکی پشت بەیەکتر بەستنە. شتێکی نازیرانەیە ڕەوقی خەڵکی دەسەڵاتدار بریندار بکەیت، ئەگەرچی ئەوان لەژێر تۆوە بن یان لەگەڵ تۆدا یەکسان بن. ئەگەر کەسێکی وەکو چەرچل بتوانێت ڕەحمەکانی پیاوێکی وەکو لوس فوت بدات، خۆی وەکو دەرباریەکی بێ هاوتا دەسەلمێنێت (لەوانەیە ڕاستکردنەوەی بۆ ئابلۆیەک گوزارشت بێت لەوەی کە ئابلۆکە دەلالەتی کردووە لە دەبەزینێکیش، بەڵام ئەمەی بەشێوەیەکی ئەوەندە نەمرمزاوی ئەنجامدا کە لوس هیچ درکی پێ نەکرد) لاسایی چەرچل بکەرەوە بچووە ناو پێستی مارەوە هەمیشە شتێکی بەسوودە کە وەکو دەرباریەکی بەرمەتپەدەر باری بکەیت، تەنانەت ئەو کاتەش کە تۆ لە حرمەتی گەورەیەکدا بیت.

## کەمەی ئاسکی دەرباری هوشداریەك

تالیراند دەرباریەکی بەئەزموون بوو، بەتایبەت لە خزمەتکردنی ناپلیۆنی گەورەیدا. کاتێك ئەو دوو پیاوە بۆ یەکەمین جار یەکتریان ناسی، ناپۆلیۆن جارێکیان وتی " من ڕۆژێك لەو ڕۆژانە بۆ نانی نیوەڕۆ دێمە ماڵتان" تالیراند ماڵەکەی لە (ئۆتیل) بوو، لە دەوروبەری پاریس، وەزیر لە وەڵامدا وتی "دەبێ من دڵشاد بم، ژەنەراڵی من، شمعا لەبەرئەوەی ماڵی من لە بوا دی بۆلۆن نزیکە، تۆ دەتوانیت بە تەقاندنی چەند فیشەکێك لە پاش نیوەڕۆدا خۆت سەرگەرم بکەیت".

ناپۆلیۆن وتی " من حەزم لە تەقەکردن نییە، بەڵام حەزم لە ڕاوکردنە. ئایا هیچ بەرازی کێوی لە بوا دی بۆلۆن هەن؟" ناپولیۆن لە کۆرسیکاوە هات کە بەوێ ڕاوە بەرازی کێوی وەرزشێکی گەورە بوو. بە پرسیارکردن لەمەڕ ئەوەی ئاخۆ لە پارکی پاریس بەرازی کێوی هەن، ئەو خۆی وەکو کەسێکی دێهاتی و بگرە زۆر سادە پیشان دا

لەگەڵ ئەوەشدا، تالیراند پیاوێکی بەتوانای بەرەنگاربوونەوەی پیاوانی بەڕێوەبەر دەکات کە ئێستا لە سیاسەتدا مامۆستای بوو، ئەگەرچی لە خوێن و خانەدانیدا وەها نەبوو، چونکە تالیراند لە خانەوادەیەکی ئەرستۆکراتی کۆنەوە دەهات. پاشان لەسەرلەسەر پرسیارەکەی ناپلیۆن، وەڵامەکەی ئەمە بوو "زۆر کەمن، جەنەراڵی من، بەڵام دەتوانم بڵێم تۆ دانەیەک هەر دەدۆزیتەوە"

وا ڕێکەوت کە ناپلیۆن ڕۆژێ دواتر لە حەوتی بەیانیدا دەگاتە ماڵی تالیراند و بەیانییەکەی لەوێ بەسەر دەبات. پلاوە بەڕاو لە پاش نیوەڕۆدا ئەنجام دەدرا. بەدرێژایی بەیانییەکە، ژەنەراڵی بەجۆش هاتوو جگە لە باسی ڕاوەبەراز هیچ شتێکی تری لەسەر زار نەبوو. لەهەمان کاتدا، تالیراند بەنهێنی خزمەتکارەکانی ڕاسپاردبوو بچنە بازاڕ، دوو بەرازی ڕەشە بەرازی قەڵەو بکڕن و بیبەنە پارکی گەورە.

پاش نانی نیوەڕۆ، ڕاوچییەکان و سەگەکانیان بەرەو بوا دی بۆڵۆن ڕۆیشتن. بە ئاماژەیەکی نهێنی لە تالیراندەوە، خزمەتکارەکان یەکێک لە بەرازەکانیان بەرەڵا کرد. ناپلیۆن بە شاگەشکەییەوە بازیدایە سەر ئەسپەکەی هاواری کرد "بەرازێک دەبینم" تالیراند لەدواوە مایەوە. نزیکەی نیوسەعاتی غاردانی ئەسپی بەناو پارکەکەدا پێچوو تا دواجار "بەرازە کێوییەکە" گیرا. هەرچۆنێک بێت، لە ساتەوەختی سەرکەوتندا، ناپلیۆن یەکێک لە یارمەتیدەرانی هاتە لای کە دەیزانی لەوانەیە ئاژەڵەکە بەرازەکێوی نەبێت و ترسی ئەوەی لێ نیشت کە ژەنەراڵ هەست بە ڕیسوایی بکات کاتێک چیرۆکەکە ئاشکرا بێت. ئەو بە ناپلیۆنی وت "گەورەم، بێگومان تۆ درک بەوە دەکەیت کە ئەمە بەراز نییە بەڵکو بەرازەکێوییە"

پاش ئەوەی لە تووڕەییدا هەڵچوو، ناپلیۆن دەستبەجێ بە غار بەرەو لای ماڵی تالیراند ڕۆیشت. بەدرێژایی ڕێگاکە ئەوەی لە مێشکدا بوو کە لەوانەیە بکەوێتە بەر زۆر نوکتە و تەقینەوە بەسەر تالیراند دا تەنیا ڕیسواتری دەکات. وا باشتر دەبێت کە بە هەستێکی گاڵتەوگەپی باشەوە خۆی نیشان بدات. لەگەڵ ئەوەشدا، نانەدڵییەکەی باش نەشاردەوە

تالیراند بڕیاریدا هەوڵ بدات بەقسەتی مریمداریووی ژمەران مارێژ بکات. ئەو بە ناپۆلیۆنی وت جارێ بەگەڕێینەوە بۆ پاریس- دەبێ جارێکی تر بچینەوە بۆ ڕاو لە پارکەکەدا لەوێ کەرویشکی زۆر هەبوون و ڕاوکردنیان سەرگەرمییەکی دڵخوازانە بوو بۆ لویسی شازدە، تالیراند ئەمانەت پێشنیاری ئەوەی کرد ناپۆلیۆن ئەو سێتە چەکە بەکاربێنێت کە جارێك لە جاران هی خودی لویس بووە بە مەرایی و ڕمان لوسییەکی زۆرەوە، جارێکی تر ناپۆلیۆنی ڕازیکرد بچینە ڕاو

هەمامەت لە دەرەنگانی پاش نیوەڕۆدا چوونە پارك. بەدرێژایی ڕێگاکە، ناپۆلیۆن بە تالیراندی وت "من لویسی شازدە نیم، بەدڵنیاییەوە ناقە کەرویشکێکیش ناکوژم" لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پاش نیوەڕۆیە، پڕ بوو لە کەرویشك ناپۆلیۆن لانی کەم پەنجا دانەی کوشت و میزاجی لە تووڕەییەوە گۆڕا بۆ ئاسودەیی. لەکۆتایی ئەقامدنی شێتەنەی سلیپەیەکدا، هەمان یاریدەدەر لێی نزیك کەوتەوە و بە گوێچکەیدا چپاند، "ڕاستیت دەوێ گەورەم، هەرچەنە ئەو بڕوایەم لا دروست دەبێت کە ئەمانە کەرویشکی کێوی نین وی بۆ دەچم تالیراندی ساختەچی جارێکی تر پێمان ڕابوێرێت" (پارمەتیدەرەکە ڕاستی دەکرد لە ڕاستیدا تالیراند دە دوسرە کەرویشکی کڕیبوون و لە بوادی بۆلۆن بەرەڵای کردبوون)

ناپۆلیۆن دەستبەجێ سواری ئەسپەکەی بوو و ڕاست و ڕەوان گەڕایەوە بۆ پاریس دوایی هەڕەشەی لە تالیراند کرد، هۆشداری دایە کە بە یەك کەس بەڵێت چی ڕوویداوە، ئەگەر سێتە گاڵتەجاڕی پاریس، ئەوا دەبێ باجێکی قورس بدات

چەند مانگێکی پێچوو تا ناپۆلیۆم توانی جارێکی تر متمانە بە تالیراند بکاتەوە و قەت جارێکی تر لەبەرامبەر ڕیسواکردنەکەیدا بەشێوەیەکی تەواوەتی لێی خۆش نەبوو

**لێکدانەوە**

دەربەرییەکان وەکو سیحرباز وەهان. ئەوان بەشێوەیەکی هزیودەرانە یاری بە ڕواڵەت دەکەن، تەنیا ئەوە پیشانی دەوروبەریان دەدەن کە حەزیان دەیانەوێ ببینن بەر

# یاسای ژمارە ٢٥

## خۆت دروست بکەرەوە

### حوکم

*ئەو ڕۆڵانە قبوڵ مەکە کە کۆمەڵگە بەسەرتدا دەیسەپێنێت. لە ڕێگەی خستنەڕووی شوناسێکی نوێ خۆت دروست بکەرەوە، شوناسێک کە سەرنج ڕادەکێشێت و قەت دەوروبەر بێزار ناکات. گەورەی وێنەی خۆت بە نەک ئەوەی لێبگەڕێیت ئەوانیتر بۆتی پێناسە بکەن. ئامرازی دراماتیکی بخەرە ناو ئاماژە و کردارە گشتییەکانت- دەسەڵاتت زیاد دەبێت و کارەکتەرت مەزن دەردەکەوێت.*

### پەیڕەوی لە یاساکە I

جولیەس قەیسەر لە ٦٥ ی پێش زاییندا یەکەمین نیشانەی گرنگی بەدیار خست کاتێک پۆستی (ئیدایل)ی وەرگرت، کە بەرپرس بوو لە دابەشکردنی دانەوێڵە و گەمە گشتییەکان. ئەو بە ڕێکخستنی زنجیرەیەک لە نمایشی ھاوکات و جوان ئامادەکراو ھاتە بەرچاوی خەڵک- ڕاوی ئاژەڵی کێوی، نمایشە شمشێربازییە سەرەڕۆییەکان، ڕۆژانبارییە شانۆییەکان. لە چەند بۆنەیەکدا، ئەو لە گیرفانی خۆی پارەی نمایشەکانی دەدا. بەلای کەسێکی ئاساییەوە، جولیەس قەیسەر بێ چەندوچوون بەسترابەوە بەم ڕووداوە دڵگیرانە لەکاتێکدا کە ئەو ھێواش ھێواش دەستیکرد بە بەدەستھێنانی پۆستی کونسوڵ،

بەوداریەکەی لەسەر حەشاماندا بووە مایەی دەسەڵاتەکەی. ئەو وەکو نمایشکاری گشتیی مەزن وێنەیەکی لەخۆی دروستکردبوو.

لە ٤٩ی پێش زایینیدا، ڕۆم لە لێواری شەڕێکی ناوخۆدا بوو لەنێوان سەرکردە ڕکابەرەکان، قەیسەر و پۆمپی. لە تریۆپکی تەنگژەکاندا، قەیسەر، کە فرچکی بە سەنەیەوە گرتبوو، ئامادەی نمایشێکی شانۆیی بوو و پاشان بە نوقمبوون لە بیرکردنەوەدا، گەڕایەوە بۆ کەمپەکەی لە ڕوبیکۆن ئەو ڕووبارەی کە ئیتاڵیا لە گۆل جیا دەکاتەوە و لە تاریکاییدا هات و چوو. گەڕانەوەی سوپاکەی بۆ ئیتالیا لەوبەر ڕوبیکۆنەوە بەمانای دەستپێکردنی جەنگ بوو لەگەڵ پۆمپی دا.

قەیسەر لەبەردەم ستافەکەیدا مشتومڕی لەسەر هەر دوو لایەکە کرد، چەند بژاردەیەکی پیشاندا وەکو ئەکتەرێکی لەسەر ستەیج، دواجار، بزنەوەی ورتەورتەکەی بەکۆتا بگەیەنێت، ئاماژەی بە بەرواڵەت حێوێکی بیگریابەدا کە لە لێواری ڕووبارەکە وەستابوو– سەربازێکی باڵابەرز زورنای لێدەدا، پاشان بەسەر پردی ڕوبیکۆندا پەڕییەوە– و ڕایگەیاند "لێگەڕێ با ئەمە وەکو نیشانەیەک لە خوداکانەوە قبوڵ بکەین و بڕۆینە ئەو شوێنەی ئەوان پێشگویی دەکەن، لە تۆڵەکردنەوە لە دوژمنانی دووڕوو. تازە بڕیارە و دراوە". هەموو ئەمەی بەشێوەیەکی ئاگادارکەرەوە و دراماتیکی وت و ئاماژەی بە ڕووبارەکەدا و چاوی بڕیبووە چاوی ژەنەراڵەکانی. ئەو دەیزانی ئەم ژەنەراڵانە لە پشتگیرییاندا دڵنیا نین، بەڵام وتاربێژییەکەی بە هەستێکی درامایی سانەوەختەکەوە و پێویستی قۆستنەوەی کات کاری تێکردن. وتارێکی ستابل ئامێزی تر ئەو کاریگەرییەی نەدەبوو. ژەنەراڵەکان بەدەم بۆرەکەیەوە چوون، قەیسەر و سوپاکەی لە ڕوبیکۆن پەڕینەوە و بەهاتنی ساڵی دواتر پۆمپییان ڕاماڵیبوو و قەیسەریان کردبووە دیکتاتۆری ڕۆم.

لە جەنگدا، قەیسەر هەمیشە بە گوڕوتینەوە وەکو کەمی پیشەنگ یاری دەکرد. ئەو ئەوەندەی هەرییەک لە سەربازەکانی سوارچاکێکی لێهاتوو بوو و لە بوێری و مکوڕیدا شانازی پێشڕەویکردنی ئەوانی پێبڕا. ئەو بە بڕتاوێکی گەورەوە چووە ناو شەڕ و

سەربازەکانی ئەویان لە گەرمەی شەڕدا دەبینی کە دەبووە هۆی ماندابیان و هەمیشە هۆی دەھستە سەمتەرەوە، ڕەمزێکی خوداناسای هێز و مۆدێلێك بوو بۆ ئەوان تا شوێنی بکەون. لە هەموو لەشکرەکانی ڕۆم، قیسەر دڵسۆزترینیان بوو. سەربازەکانی ئەو، وەکو ئەو هەڵکە ئاساییەی دەچوونە نمایشەکانی، لەگەڵیدا و لەگەڵ نزرەکەیدا بیبوونە یەك

پاش شکست پێهێنانی پۆمپی، ئاستی نمایشەکان زیادیکرد. هیچی وەك ئەمانە پێشتر لە ڕۆم نەبینرابوون. پێشبڕکێی داشقە زیاتر سەرسوڕهێنتر بوو، شەڕە شمشێر دراماتیکتر بوو، لەکاتێکدا کە قەیسەر شەڕی ئامردن لەنێو خانەدانانی ڕۆمی هەڵایساند. ئەو شەڕی دەریایی لاسایی لەسەر دەریاچەیەکی دەستکرد ڕێکخست. شانۆییەکان لەهەموو لایەکی ڕۆم نمایش کران. شانۆییەکی گەورەی نوێ بونیادنرا کە بەشێوەیەکی دراماتیکی بەرەو خورەوەی شاخی تارپیان شۆڕ دەبووەوە. خەڵکی لە هەموو لایەکی ئیمپراتۆرییەتەکەوە بە لێشاو بەرەو ئەم بۆنامە دەچوو، ڕێگاکانی ڕۆم پڕ بوو لە خێمەی سەردانکەران. لە ٤٥ی پێش زایینیشدا، قەیسەر بە ئەوقێتکردنی چوونی بۆ ناو شار بە مەبەستی هەبوونی گەورەترین کاریگەری و سەرسامکردن، پاش ئەنجامدانی هەڵمەتە میسرییەکەی، کلیۆپاترای گەڕاندەوەی بۆ ڕۆم و تەبامەت نمایشی گشتی کرابەمانی ساردان.

ئەم بۆنانە لە ئامرازی هۆش پەرتکردنی کۆمەڵی خەڵك زیاتر موون. ئەمانە مەشێوەیەکی دراماتیکی پەرەیان بە هەستی گشتی ئەرسەر کارەکتەری قەسەر دا و وەهەیبلیکرد زور گەورە دەریکەوێت. قەیسەر ماموستای وێنە گشتیی خۆی بوو، کە بۆ هەمیشە لێی بەئاگا بوو. کاتێك ئەو لەبەردەم جەماوەر دەرکەوت، ڕۆبێکی مۆری سەرنجڕاکێشی لەبەرموو. ئەو لەسەر سنەیج کەس پشتی نەدەدایەوە. ئەو بەشێوەیەکی بەدناو لەبەرانبەر ڕواڵەتی خۆیدا دەمارگیر موو- دەوترێت ئەو ناکە هۆکارەی وایدەکرد خۆشی لە پیرلیبانی لەلایەن سنەت و خەڵك سیمیت ئەوە موو کە لەو بۆنانەدا دەیتوانی تاجە گەڵای غار لەسەر بنێت و کەچەڵییەکەی بشارێتەوە. قەیسەر ونارێتژێکی وەستا بوو. ئەو دەیزانی چۆن بە وتنی کەم شتی زور بلێت، غەریزەی ئەو سانەی هەموو کە بۆ گەورەترین کاریگەری کۆتایی بە وتارێك بهێنێت. ئەو قەت شکستی نەهێنا لەوەی

سووڕپرایز هێنانە ناو دەرکەوتنە گشتییەکانەوە- ڕاگەیاندنێکی سەرسامکەر کە تاسەتەسەسییە درامایەکەی زیاد دەکرد

قەیسەر کە بە ڕادەیەکی زۆر لەنێو خەڵکی ڕۆمدا ناسرابوو، ڕکابەرەکانی گێنە و ترسێکی زۆریان بەرانبەری هەبوو. لە ناوەڕاستی مانگی مارسدا- لە ٤٤ی پێش زایین، گرووپێکی پیلانگێڕان بە ڕابەرایەتی برووتوس و کاسیوس لە سێنات دەوریاندا و کوشتیان. تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا هەستی درامایی خۆی پاراستبوو. بەشی سەرەوەی کراسەکەی بەرەو سەر ڕووخساری ڕاکێشا و گرێی ئەدا بەرەی بەشی خوارەوەی پۆشاکەکەی بۆئەوەی بە داپۆشراوی و شایستەیی بمرێت. بە گوێرەی سویتۆنیەسی مێژوونووسی ڕۆم، دوایین قسەکانی بۆ برووتوسی گۆڕە هاوڕێی، کە خەریک بوو دووەمین خەنجەری لێبدات، بە زمانی یۆنانی بوو و وەک ئەوە وابوو پرۆڤە بۆ کۆتایی شانۆییەک بکات: "تۆش، منداڵەکەم؟"

## لێکدانەوە

شانۆی ڕۆمانی بۆمەیەک بوو بۆ جەماوەر، ئەمڕۆکە قەرەباڵغییەکی زۆر پێڵی تێدەکات. ئامادەبووان بە کۆمیدیا و تراژیدیا بەهێزەکان کارتێکراو دەبن. پێدەچوو شێوە لە فۆرمە درامایە چڕکراوەکەیدا جەوهەری ژیان بگرێتەخۆ. وەکو سروتێکی ئایینی، کاریگەرییەکی جێگای بەهێزی لەسەر مرۆڤی ئاسایی هەبوو

لەوانەیە جولیەس قەیسەر یەکەمین کەسایەتی گشتی بووبێت لە پەیوەستیی ڕیشەیی نێوان دەسەڵات و شانۆ تێبگات. ئەمەش بەهۆی هەستکردنی خۆیەوە بوو بە دراماوە ئەو، بە کردنی خۆی بە ئەکتەر و دەرهێنەر لەسەر شانۆی جیهانی، ئەم بابەتانەی چڕکردەوە. ئەو بێژەکانی وەها دەربڕی وەک بڵێی بەشێوەی سکریپت بۆی نووسراون. ئەو وەک ئەوەی بەناو بینەراندا هەنگاو بنێت، ئاماژەی دەدا و بەناو حەشاماتدا دەڕۆیشت. ئەو سووڕپرایزی دەخستە ناو شانۆییەکانی، درامای لەناو وتارەکانیدا جێدەکردەوە و لە دەرکەوتنە گشتییەکانیدا ڕەنگیدەدایەوە. ئاماژەکانی ئەو بۆ مرۆڤی

ئاسایی بایی ئەوەندە فراوان نوون، کە دەستبەجێ کاریان تێبکات. ئەو بەشێوەیەکی بەرچاو برەوی پەیدا کرد.

قەیسەر نووە سەرمەشقێک بۆ هەموو سەرکردەکان و کەسانی دەسەڵات. وەکو ئەو، دەبێ تۆیش فێر بیت لە ڕێگەی تەکنیکە درامایەکانی وەکو سوورپرایز، هەڵپەساردن، دروستکردنی هاوسۆزی و هاوشێوەکردنی ڕەمزی، کردارەکانت فراوان بکەیت. هەروەها وەکو ئەو دەبێ بە بەردەوامی لە بینەرانت بەئاگا بیت– لەسەر ئەوەی چ شتێک شادیان دەکات و چ شتێک بێتاقەتیان دەکات. دەبێ تۆ زەمینەسازی بکەیت بۆ خۆت بخەیتە سەنتەرەوە، سەرنج و هۆش بەکێش بکەیت و قەت بەهیچ شێوەیەک لەسەر شانۆ پیشت مەدەنەوە

## پەیڕەویکردن لە یاساکە ٢

لە ساڵی ١٨٣١دا، ژنێکی گەنج بەناوی ئۆرۆر دوپین دودێڤانت لە ماوچەکانی دەوروبەر مێرد و خێزانەکەی خۆی جێهێشت و چووە پاریس. ئەو دەیویست ببێتە نووسەر، پێی وابوو هاوسەرێتی لە زیندان خراپترە چونکە نە کاتی بۆ دەهێشتەوە و نە ئازادی بۆئەوەی سۆراغی هیوایەتەکەی بکات. لە پاریس سەربەخۆیی خۆی ڕاگیر دەکرد و بە نووسین بژێوی خۆی پەیدا دەکرد.

بەماوەیەکی کەم پاش ئەوەی گەیشتە پایتەخت، دەبووایە ڕووبەڕووی هەندێ واقیعیەتی سەخت ببێتەوە. بۆئەوەی هەر ئاستێکی سەربەستیت هەبێت لە پاریس دەبووایە پارەت هەبێت. بۆ ژنێک، پارە تەنیا لە لەشفرۆشی یان هاوسەرێتییەوە دەهات. هیچ ژنێک نەگەیشتبووە ئەو ڕادەیەی کە بە نووسین پارە پەیدا بکات. ژنانی وەکو هیوایەت خەریکی نووسین بوون، لەلایەن مێردەکانیانەوە پاڵپشتییان دەکرا یان لە ڕێگەی میراتەوە دەژیان. لە ڕاستیدا کاتێک دودێڤانت بۆ یەکەمین جار نووسینەکەی پیشانی نووسەرێکدا، پێی وت "خاتوو، دەبێ تۆ منداڵ دروست بکەیت، نەک خەریکی ئەدەبیات بیت"

ئاشکرایە کە دودێڤانت هاتبووە پاریس تا ئەستەم ناڵی بکاتەوە هەرچۆنێک بێت، لە کۆتاییدا ستراتیژێکی گەڵاڵە کرد بۆ کردنی ئەو شتەی هیچ شتێک تا ئەو کاتە نەیکردبوو— ستراتیژێک بۆ خۆدروستکردنەوەی بەشێوەیەکی تەواوەتی، دەستەبەرەی وێنەیەکی گشتی لە دەستکردی خۆی. نووسەرانی ژنی پێش ئەو خرابوونە ناو قاڵبی ڕۆڵێکی جار بەدەستەوە کە هی هونەرمەندێکی مەرە دوو بوو بەڕێزی بۆ ژنانی تر دەینووسی، دودێڤانت گەیشتە ئەو بڕوایەی ئەگەر قەرار وابە ئەم ڕۆڵێک بسەپێنێت، ئەوا گەمەیەک دەهامەگەر ئەو ڕۆڵی پیاوێک دەبیست

لە ١٨٣٢دا، ماگەزینەوەیەک یەکەمین ڕۆمانی گەورەی دودێڤانتی قبوڵ کرد بەناوی (ئەنەمانا) ئەو بڕیاریداوو بەناوی خوازراوەوە (جۆرج ساند) بڵاوی بکاتەوە و هەموو پاریس وایانزانی ئەم نووسەرە مونبە کاریگەرە نێرینەیە. دودێڤانت هەندێ جار جلوبەرگی پیاوانی دەپۆشی پێش ئەوەی "جۆرج ساند" دروست بکات (ئەو هەمیشە شێرت و پانتۆڵی پیاوانی بە ئاسودەبەخشتر دەبینی). ئێستا وەکو کەسایەتییەکی گشتی، ڕێدەڕۆیی لە وێنەکەی خۆیدا کرد، ئەو کۆتی درێژی پیاوانی لەبەر کرد، کڵاوی خڕلەمێشی کردە سەری، پوتی قورسی کردنە پێیەکانی و کراڤاتی بۆ یەخەکانی دا، ئەو سیگاری کێشا و لە وتوێژەکاندا وەکو پیاو قسەی دەکرد و نەدەترسا لەوەی کە وتوێژەکە بقۆڕێنێتەوە یان وشەی نالەبار بەکار بێنێت

ئەم نووسەرە "مێینە/نێرینە" سەیرە کاری لە خەڵک کرد. بە پێچەوانەی نووسەرە ژنەکانی تریشەوە، ساند خۆی وەک کەسێکی پەسەند لەناو پێڕی هونەرمەندانی نێرینە بینییەوە. ئەو لەگەڵیاندا دەیخواردەوە و جگەرەی دەکێشا. تەنانەت پەیوەندی سۆزداری لەگەڵ هونەرمەندانی بەناوبانگی ئەوروپا— موسێت، لیزت، چۆپین. ئەوەمدا ئەو بوو کە یەکێتی دەکردن و دوایش وازی لێدەهێنان— ئەو بەو سەرکێشییەوە بەردەوام بوو

ئەوانەی کە بەباشی ساندیان دەناسی، بەباشی لەوە تێگەیشتن کە کەسایەتییە نێرینەیەکەی لە چاوی ڕاکەری گشتییان دەپاراست لە دەرەوە، ئەو خۆشییەکی زۆری

لەو ڕۆڵگێڕانە بێبێ، لە ماڵەوە و لە سەحنەیش وەك مێینە مایەوە. ئەو بەهەمان شێوە درکی بەوە کرد کە دەشێ کارەکتەری "جۆرج ساند" بکەنت یان پێشبینیکراو بێت و لە هۆڵادان لەمە ناوبەناو ئەو کارەکتەرەی وەردەچەرخاند کە دروستیکردبوو و لەبری پەیوەندیی سۆزداری لەگەڵ پیاوانی ناسراو، خۆی تێکەڵ بە سیاسەت دەکرد، پشتگیری خۆپیشاندانەکانی دەکرد و دەبووە ئیلهامبەخشی باخیبووە خوێندکارییەکان. کەس سنووری بەسەر ئەو کارەکتەرەدا نەدەسەپاند کە خۆی دروستیکردبوو. ماوەیەکی زۆر پاش ئەوەی مرد و پاش ئەوەی زۆربەی خەڵکی چیتر ڕۆمانەکانی ئەویان نەدەخوێندەوە، تایبەتمەندیی شانۆیی ئەو کارەکتەرە هێشتا کاریگەر و ئیلهامبەخش بوو.

## لێکدانەوە

بەدرێژایی ژیانی گشتی ساند، ئاشنایان و هونەرمەندانی تر کە کاتێکیان لە هاوەڵێتی ئەودا بەسەر بردبوو کە لە جووری پیاوێکدان. بەڵام لە بڵاوکراوەکانیدا و بەلای نزیکترین هاوڕێکانییەوە، وەکو گوستاف فلوبیر، ئەو دڵنیا بەوەی ئارەزووی ئەوەی نییە پیاو بێت، بەڵکو لەپێناو قبوڵکردنی گشتیدا ئەو ڕۆڵەی دەبینی. ئەوەی کە ئەو بە ڕاستی دەیویست بریتی بوو لە هێزی دیاریکردنی کارەکتەری خۆی. ئەو، ئەو سنوورانەی ڕەتکردەوە کە کۆمەڵگە بۆی دانابوو. ئەو هێزی خۆی بەدەست نەدەهێنا، بەوەی کە خۆی بێت، بەڵکو لەبری ئەمە، ئەو کەسایەتییەی دروستکرد کە بتوانێ بە بەردەوامی لەگەڵ ئارەزووەکانیدا بگونجێت، کەسایەتییەك کە بەکێشکەری هۆش و سەرنج بوو و ئامادەیی بەو دەبەخشی.

لەمە تێبگە: جیهان دەیەوێ ڕۆڵێکت لە ژیاندا پێ ببەخشێت. هەر کە تۆش ئەو ڕۆڵەت قبووڵ کرد ئەوا لەناو چوویت. هێزی تۆ سنووردارە بەو بڕە بچووکەی تەرخان کراوە بۆ ئەو ڕۆڵەی هەڵتبژاردووە یان ناچار کراویت لە ئەستۆی بگریت. لەلایەکی ترەوە ئەکتەر، گەلێك ڕۆڵ دەبینێت. خۆشی لەو دەسەڵاتە زۆرە بەدەستە بێنە و ئەگەر لەودیو ترە بێت، لانی کەم شوناسێکی نوێ دروست بکە، شوناسێك کە دەستکردی خۆتە، شوناسێك

که لەلایەن جیهانی پڕ نەرەیی و کەمئامێزەوە سنووری بۆ دانەنراوە ئەم کردارەی بەرەنگاری (پرۆمیتمان)ە دەتکاتە بەرپرس لە بوونی خۆت

هونەرمەندییەکەت کتومت لەبەرئەوە لە جیهانی دەرەوە دەتپارێزێت چونکە "تۆ" هەست ئەمە بۆشاییەکە ئەیکەیتە بەرت و دڵدەکەیت پێویست ناکات تۆ بە هەمیشەیی وەربگریت ئینجا هونەرمەندییەکەت هەمان دەکاتەوە، ئامادەییەکی شاهۆییت پێ دەبەخشێت ئەوانەی کە لە ڕێی بوونەوە دەتوانن بتبینن و بتبیستن ئەوانەی لە ڕێی پیشەوەی هونەرمەندی ئازایەتی تۆ سەرسام دەبن

*ئایا خەڵکی لە کۆمەڵگەدا باسی کەسێک ناکەن کە ئەکتەرێکی مەزنە؟ ئەوان مەبەستیان لەمە ئەو هەستە نییە کە هەیەتی، بەڵکو ئەو ووزانەیە کە تیایدا ڕەسەنایە، ئەگەرچی هەست بە هیچ ناکات.*

*دێنیس دیدرۆ ١٧١٣-١٧٨٤*

## کاملی دەسەڵات

ئەو کارەکتەرەی کە بیدەچێت تۆ لەگەڵیدا هاتبێتە دنیاوە مەرج نییە هی تۆ بێت لەوبیر ئەو هەستانەی کە تۆ بۆت ماوەتەوە، باوانت، هاوڕێکانت و هاوەڵانت یارمەتیدەر بوون بە شکڵ پێدانی کەسایەتیت. ئەرکی پرۆمیسییانەی کەسی بەهێز ئەوەیە کۆنترۆڵی پرۆسەکە بگرێتە دەست، بۆ ڕێگرتن لەوانیتر بە هەبوونی توانای سنووردارکردن و لەقاڵبدانیان. خۆت لە کارەکتەرێکی دەسەڵاتدا لەقاڵب بدەرەوە. دەبێ کارکردن لەسەر خۆت وەکو ئەوی بەکێک لە هەرە گەورەترین و خۆشترین ئەرکەکانی ژیان بێت. ئەمە لە جەوهەردا تۆ دەکاتە هونەرمەند- هونەرمەندێک کە خۆی دروست دەکات

لە ڕاستیدا، بیرۆکەی خۆدروستکردن لە جیهانی هونەرەوە دێت. بۆ ماوەی هەزاران ساڵ، تەنیا پاشاکان و باڵاترین دەرباریەکان ئازادیی ئەوەیان هەبووە وێنەی گشتیی خۆیان لەقاڵب بدەنەوە و شوناسی خۆیان دیاری بکەن. بەهەمان شێوە، تەنیا پاشاکان و دەوڵەمەندترین نۆرەکان توانیوویانە لە وێنەی خۆیان لە هونەردا ڕامێنن و بەشێوەیەکی

ئاگایانە نیگوێن پاشماوەی مرۆڤایەتی ئەو ڕۆڵە سنووردارەی نیمبووە کە کۆمەڵگە دوای لێکردووین و خودناگاییەکی کەمیان هەبووە.

دەشێ وەرچەرخان لەم هەلومەرجە لە تابلۆی (لاس مێنیناس)ی ڤێلاسکێز سۆراغ بکرێت کە لە ١٦٥٦دا دروستکراوە. هونەرمەندەکە لەلای چەپی کانڤاسەکەوە دیارە، لەپێش تابلۆیەک وەستاوە کە ئەو لە پرۆسەی دروستکردنیدایە، بەڵام پشتی لە ئێمەیە– ئێمە ناتوانین ببینین لە تەنیشتیەوە کچە میرێک، دەست و پێوەند و یەکێک لە کورتەباڵاکانی دەربار هەن، هەمووان تەماشای نیشکردنی دەکەن. ئەو حەلکی بۆ نیگارکێشانەکە وەستاون ڕاستەوخۆ دیار نین، بەڵام ئێمە دەتوانین لە وێنەدانەوە بچوکەکان لە ئاوێنەیەکدا بیانبینین کە لەدیوارەکەی پشتەوە هەڵواسراوە– پاشا و شاژنی ئیسپانیا کە دەبێ لە شوێنێک لە پێشەوە دانیشتبن، لە دەرەوەی تابلۆکەدان.

تابلۆیەکە نوێنەری گۆڕانکارییەکی دراماتیکییە لە داینامیکی دەسەڵات و توانای دیاریکردنی پێگەت لە کۆمەڵگەدا بەلای ڤێلاسکیزەوە، شوێنی هونەرمەند زۆر بەرجەستەترە لە هی پاشا و شاژن بەمانایەک لە ماناکان ئەو بەهێزترە لەوان، چونکە ئەو بەرپرسی ئەو کەسەیە وێنەکە کۆنترۆڵ دەکات– وێنەمان ڤێلاسکێز چیتر خۆی وەکو هونەرمەندێکی وابەستە و بەندە نابینی ئەو لە مرۆڤێکی دەسەڵاتداردا خۆی بونیاد نابووە. لە ڕاستیدا یەکەمین حەڵکانێک جگە لە خانەدانەکان لە کۆمەڵگەی خۆرئاواییدا کە بە ئاشکرا یارییان بە وێنەکەیان کرد هونەرمەندان و نووسەران بوون و دوایی شیکپۆشەکان و بۆهیمییەکان بوون. ئەمڕۆکە چەمکی خۆدروستکردن هێور هێور درەی کردووە ناو بەشەکەی تری کۆمەڵگەوە و بووەتە ئایدیاڵێک بۆ ئاوات بۆخواستن. دەبێ وەکو ڤیلاسکیز، تۆ داوای دەسەڵات بکەیت بۆ دیاریکردنی پێگەی خۆت لە تابلۆدا، و بۆ دروستکردنی وێنەی خۆت.

یەکەمین هەنگاو لە پرۆسەی خودروستکردندا خودناگاییە. بەئاگابوون لەخوت وەکو ئەکتەرێک و کۆنترۆڵ گرتنەدەستی ڕواڵەت و هەستەکانی خوت. وەک دیدرۆ وتی، ئەکتەری خراپ ئەوەیە کە هەمیشە سەرڕاستە. ئەو حەلکەی لە کۆمەڵگەدا دڵنیان لەسەر

دەستیان پێیان دەدەن ئاڵەنگەر و هەڕەشەکانی سەرباری سەرڕاستییەکەشیان، فورسە بە شێوەی جددی ڕووبەڕوویان ببنەوە. لەوانەیە ئەوانەی لەناو خەڵکدا هاوار دەکەن بەشێوەیەکی کاتی هاوسۆزی بەدەست بێنن، بەڵام هاوسۆزی بەرزیی دەگۆڕێت بۆ ڕەسوایی و هەڵسانکردن لەبەرانبەر هیچ کردن بەخۆیانەوە. ئێمە هەست دەکەین ئەوان هاوار دەکەن بۆ بەدەستهێنانی سەرنج و بەشێکی کەیبەنامێزی ئێمە دەیەوێ بکرێن لە ناسوودەبوونیان بکات.

هەنگاوی دووەم لە پرۆسەی هۆبدروستکردندا دەستکارییەکە لە ستراتیژی جۆرج سادە دروستکردنی کارەکتەرێکی لەبانەچوو، کارەکتەرێک کە بەکێشکردنی هۆش و سەرنج دەهێنێتە کایەوە، کە لەناو یاریکەرانی تردا لەسەر سەکۆیە زیاتر دەردەکەوێت. ئەمە ئەو کەسەیە بوو ئەبراهام لینکۆڵن کردی. ئەو دەیزانی کەسی سادەی دیهاتی، ئەو جۆرە سەرۆکەیە کە ئەمریکا قەت نەیبوو بەڵام بە هەڵبژاردنی دڵخۆش دەبوو. هەرچەندە زۆرێک لەم خەسڵەتانەی بەشێوەیەکی سروشتی بۆ دەهاتن، ئەو یاری پێدەکردن- کڵاو و پۆشاکە ریش (هیچ سەرۆکێکی پێش ئەو ریشی نەهەبوو) لینکۆڵن بەهەمان شێوە یەکەمین سەرۆک بوو فۆتۆ بەکاربهێنێت بۆ بڵاوکردنەوەی وێنەکەی، کە یارمەتیدەر بوو لە دروستکردنی ئایکۆنی "سەرۆکی سادە".

لەگەڵ ئەوەشدا، درامای باش پێویستی بە زیاتر لە ڕواڵەتێکی بەکێشکەر، یان تاکە چرکەساتێکی دیار هەیە. دراما پێ بەپێی کات ڕوودەدات- ئەمە ڕووداوێکە لە دەرکەوتندایە. ریتم و تەوقیت گرنگن. یەکێک لە هەرە گرنگترین توخمەکان بە ریتمی دراماوە هەڵپەساردنە. بۆ نموونە، هۆدینی، هەندێ جار دەیتوانی لە چەند چرکەیەکدا کۆتەرەکانی پاکردنی ئەوار بکات- بەڵام ئەو چەند بۆ چەند خولەکێک درێژی دەکردەوە بۆئەوەی سەیران لە چاوەڕوانیدا بهێڵێتەوە.

کلیلی سەرسام هێشتنەوەی بینەران ئەوەیە لێبگەڕێیت ڕووداوەکان هێواش هێواش ڕووبدەن، پاشان لە ساتی گونجاودا گورجیان بدەیت بە گوێرەی ئەو ڕێنما و ریتمەی کە تۆ کۆنترۆڵی دەکەیت. هەرمانەوەرمانی بەرز لە ناپۆلیۆنەوە تا ماو تسی تۆنگ تەوقیتی

شانۆییان بەکارهێناوە بۆ سەرسامکردن و هۆش پەرتکردنی خەڵک. فرانکلین دیلانۆ رۆزڤێلت لە گرنگی ئاراستەکردنی رووداوە سیاسییەکان لە ڕێتم و ڕێکخستنی دیاریکراودا تێگەیشتبوو.

لە سەروەختی هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکەی ١٩٣٢دا، ئەمریکا لە ناوەندی قەیرانێکی دارایی خەمناکدا بوو. بانکەکان بە ئاستێکی مەترسیدار شکستیان دەهێنا. بەماوەیەکی کورت پاش بردنەوەی هەڵبژاردن، رۆزڤێلت خۆی لە پاشەکشەی کرد. ئەو هیچی دەبارەی پلانەکانی یان پڕکردنەوەی پۆستەکانی کابینەکەی نەوت. تەنانەت ڕەتیکردەوە سەرۆکە هەنوکەییەکە، هێربەرت هوڤەر، ببینێت بۆ قسەکردن لە دەستاودەستکردنی دەسەڵات. بەهاتنی کاتی وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی، وڵات لە حاڵەتێکی شڵەژانی گەورەدا بوو.

لە وتارەکەی دەستپێکردنی سەرۆکایەتیدا، رۆزڤێلت، گێرەکانی گۆڕی. ئەو وتارێکی بەهێزی پێشکەش کرد، ڕوونیکردەوە کە نیازی بە شێوازێکی تەواو نوێ ڕێبەرایەتی وڵات بکات و لە ئاماژە شەرمنەکانی سەرۆکەکانی پێشوو دوور کەوتەوە. لەو کاتە بەدوا، ڕێتمی وتارەکانی و بڕیارە گشتییەکانی- پڕکردنەوەی پۆستەکان، یاسادانانی بوێرانە- بە ڕەیتێکی خێرای باوەڕپێکراو دەرکەوتن. ماوەی پاش دەستپێکردنی سەرۆکایەتی بە "سەد ڕۆژەکە" ناسرا و سەرکەوتنی لە وەرچەرخاندنی میزاجی وڵات تا ڕادەیەک لە ڕێتمی زیرەکانەی رۆزڤێلت و بەکارهێنانی جیاوازی دراماتیکی سەرچاوەی گرت. ئەو خەڵکی لە دۆخێکی هەڵپەسێردراودا هێشتەوە پاشان ڕووبەڕووی زنجیرەیەک ئاماژەی بوێرانەی کردنەوە کە هەمووی چارەنووسساز دیار بوون چونکە ئەمانە ناکاو بوون. تۆ دەبێ فێر بیت بە شێوازێکی هاوشێوە ڕووداوەکان ئاراستە بکەیت. قەت هەموو کارەکانت لە پڕێک دەرمەخەیت، بەڵکو بەشێوەیەک دەریانبخەیت کە کاریگەریی دراماتیکیان بەرز بکاتەوە.

**وێنە:** پرۆمسیۆسی خودای دەریایی یۆنانی دەسەڵاتی بە تواناکەیەوە هات بۆ گۆڕینی شێوە بە ئیرادە، هەر ساتێک کە بیخوازیت. کاتێک مینالاوس، برای ئاگامێمنۆن،

مەولیدا ڕکێفی مکات، پرۆتێس خۆی گۆڕیی بۆ شێر، پاشان مار، پڵنگ، بەراز، ئاوی بەخوڕ و دواجار درەختێکی پڕ گەڵا.

**دەسەڵات:** بزانە چۆن لەسەرلەسەر هەموو کەسێکدا هەموو شتێك بیت. پرۆمتیوسی ئاڵۆز-زانا لەنێو زانایاندا، قەدیس لەنێو قەدیساندا. ئەمە هونەری بزنەوەی هەموان، چونکە وێنکچوو، وێکچوو ڕاکێش دەکات. تێبینی میزاجەکان بکە و خۆت لەگەڵ هەر کەسێکدا بگونجێنە کە چارت پێی دەکەوێت-ببە بە کەسێکی ژڕ پاشان سادە، میزاجی خۆت بەشێوەیەکی نهێنی بگۆڕە

(بالتازار گراسیەن، ١٦٠١-١٦٥٨)

### پێچەوانەبوونەوە

ناشێ هیچ پێچەوانەبوونەوەیەك بۆ ئەم یاسایە هەبێت- شانۆی خراپ، شانۆیەکی خراپە. تەنانەت بەشێوەی سروشتی دەرکەوتن پێویستی بە هونەرە- بە دەربڕینێکی تر، بوواندنە. بوواندنی خراپ تەنیا شەرمەزاری دروست دەکات. بێگومان نابێت تۆ ئەوەندە دراماتیك بیت- خۆت لە ئامازەی هیستریایی بەدوور بگرە.

## یاسای ٢٦

# دەستەکانت بە پاکی بهێڵەرەوە

### حوکم

دەبێ تۆ نموونەی مەدەنیبوون و کارابوون دیار بیت، دەستەکانت قەت بە هەڵەکان و کردارە دزێوەکان خۆڵاوی نابێ. لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەوانیتر وەکو بەردەباز و چنگی پشیلە بۆ داپۆشینی تێوەگلانت، ڕواڵەتێکی وەها بێ لەکە بگرەوت

### بەشی ١: هەڵەکانت بشارەوە – بەردەبازێک پەیدا بکە بۆ ئەوەی تۆباڵەکەی بخەیتە ئەستۆ

ناو و ناوبانگی ئاشمان تا ڕادەیەکی زۆر بەندە بەوەی دەیشارینەوە نەک ئەوەی دەریدەخەین. هەمووان هەڵە دەکەن، بەڵام ئەوانەی کە بە ڕاستی زیرەکن دەتوانن بیشاردنەوە و وامی ئەوە بکەن کەسێکی تر بەرپرسیارێتییەکەی دەکەوێتە ئەستۆ. بۆ ئەو ساتەوەختانە با هەمیشە بەردەبازێکی گونجاوت هەبێت

### پەیڕەویکردن لە یاساکە ١

لە نزیکی کۆتایی سەدەی دووەمی زایینیدا، لەکاتێکدا کە ئیمپراتۆریەتی بەهێزی (هان)ی چین هێواش هێواش دادەڕما، ژەنەراڵی گەورە و وەزیری ئیمپریالی، تساو تساو

وەکو بەهێزترین پیاو لە وڵاتدا سەرپەلدا بە مۆرلەکردنی بۆ ساغەی دەسەڵاتەکەی و هوقونارکردن لە دوایین ڕکابەرەکانی، تساوتساو هەڵمەتێکی هەستەگەر بۆ کۆنترۆڵکردنی (پێدەشتی سێنترال) لەمزگەی ستراتیژییەوە لەماوەی گەمارۆدانی شارە سەرەکییەکەدا، ئەو بە کەمێک جیاوازییەوە ئەوقینتی گەیشتنی دانەوێڵەی لە پایتەختەوە بە هەراپ هەڵمەند لەکاتێکدا کە چاوەڕوانی گەیشتنی بارەکە بوو، سوپا خۆزگی لەبەر دەمرا و تساو تساو ناچار بوو فەرمان بە سەرۆکی کۆمسیاریەت بدات بڕە خۆراکە تەرخانکراوەکان کەم بکاتەوە

تساو تساو خەوی سوپای قایم کرد و تۆڕێکی هەواڵدەری ڕاسپارد سیخوڕەکانی بەرووبی هەواڵی ئەوەیاندا کە پیاوان سکاڵا دەکەن، بۆڵە بۆڵی ئەوەیانە کە ئەم لە کەیفە و خۆشیدا دەژیت و ئەوانیش لوقمەی مەمرە و مەژییان هەیە ئەوانە بە ورتە دەیانگوت لەوانەیە تساوتساو خواردنەکە بۆ خۆی بگێڕێتەوە. ئەگەر ورتەورتەکە بڵاو ببووبایەوە، ئەوا لەوانەبوو تساوتساو تووشی ناهیبوونێک بێتەوە، ئەو سەرۆکی کۆمسیاریەتی بانگ کردە خێمەکەی

تساو تساو بە سەرۆکی کۆمسیاریەتی وت "داوات لێدەکەم شتێکم بە قەرز بدەیتێ و تاییڕەتی بکەیتەوە". سەرۆکەکە وتی "چییە؟" تساوتساو وتی "قەرزی سەری تۆم دەوێ تا پیشانی سەربازەکانی بدەم" سەرۆکەکە هاواری کرد "بەڵام من هیچی هەڵەم نەکردووە!" تساوتساو بە ئاهێکەوە وتی " دەزانم، بەڵام ئەگەر تۆ نەکوژم، ئەوا یاخیبوونێک هەڵدایسێت. خەم مەخۆ- پاش مردنت ئاگام لە خێزانەکەت دەبێت" بەمشێوەیە، داواکارییەکەت هیچی بۆ سەرۆکی کۆمسیاریەت نەهێشتەوە، بۆیە خۆی دایە دەستی جەرەنووس و ئەو ڕۆژە سەری پەڕێنرا بە بینینی سەری کابرا لە پیشاندانێکی گشتیدا، سەربازەکان چیتر بۆڵە بۆڵیان نەکرد هەندێک فووڵایی ئاماژەکەی تساوتساویان تێبینی کرد بەڵام هەر بێدەنگ بوون، لەبەرامبەر توندوتیژییەکەی تساوتساو سەرسامبە و ترسیبوون. زۆربەشیان ویناکەی ئەویان لەمەڕ ئەوەی کە سەرکوتەی کێ بکرێت قبوڵ

کرد، پێتان ناشیر بوو دوا به زیرەکەی و عەدالەتەکەی بکەن، بەڵکو کیمامی و دڵڕەقییەکەی

## لێکدانەوە

تساوتساو لە سەروەختێکی تەواو پەشێودا هاتە سەر دەسەڵات لە ململانێدا بۆ باڵادەستی لە ئیمپراتۆریەتی پووڵەدارمانی (هان)دا، دوژمنان لە هەموو لایەکەوە دەردەکەوتن. هەر بۆ پێدەشتی سێنترال فورستی بوو لەوەی ویناو دەکرد و پارە و پیاوان حەمێکی بەردەوام بوون. سەیر نییە کە لەژێر فشارێکی وەهادا، ئەو میری چووبووەوە لەکاتی هێزیدا داوی دامێکردنی پیناک بکات

هەرکە پێویست بووەوە کە دواجستنەکە هەڵەیەکی گەورەیە و ئەمەی کە سوپا حەریکە بەحیبووبی تێدەژێ، تساوتساو دوو بژاردەی لەبەردەمدا بوو: پۆزش و پاساو هێنانەوە بۆ چیکردنی بەردەمازێک بە نیگەبەشتن لە میکانیکی دەسەڵات و گرنگیی ڕواڵەتەکان، تساوتساو بۆ ساتێک دوودڵ نەبوو، ئەو بەدوای گونجاوترین کەللەسەردا وێڵ بوو و دەستبەجێ بەدەستیهێنا

هەڵەی ناوبەناو حەتمین- جیهان زۆر پێشبینیبەکراوە. لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی دەسەڵاتدار دەکەون بەڵام بەو هەڵانە نا کە دەیکەن بەڵکو بە شێوازی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەو هەڵانەدا وەکو نەشتەرگەرەکان، دەبێ ئەوسش بەخیرایی و بەشێوەی بەکلاکەرەوە وەرەم لابەن. پۆزش و پاساو ئامرازی کوڵن بۆ ئەم نەشتەرگەرییە ناسکە کەسی دەسەڵاتدار خویان لێ لادەدات. بە پۆزش هێنانەوە، تۆ هەموو جۆرە گومانێک بەبارەی پێهاتوویست ، سارەکانت، هەر جۆرە هەڵەیەک کە لەوانەیە دات پێدا نەدەبیت، واڵا دەکەیت. پۆزشەکان مەمانەت بە کەس ناهێن و هەموون ناتسودە دەکەن. هەڵە بە پۆزش لاناچێت، بەڵکو قووڵتری دەکاتەوە. وا باشترە دەستبەجێ سڕیتە سەرنجەکان بەسەر جوت لابەیت و ئەرکیر بخەیتە سەر بەردەمارێکی گونجاو پێش ئەوەی خەڵکی کاتیان هەبیت بو بیرکردن لە بەرپرسیاریتی تو یان لە ئەگەری دەستەوستانیت

*وام پێباشترە ناپاکی بەرانبەر هەموو جیهان بکەم بەڵام نەوەی لێگەڕێم جیهان ناپاکیم بەرانبەر بکات.*

*ژەنەراڵ تساو تساو، سەدەی ١٥٥ – ٢٢ی زایین*

**پەیڕەوکردن لە یاساکە ٢**

بۆ ماوەی چەند ساڵێک قەیسەر بۆرگیا هەڵمەتی سازدا بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچە گەورەکانی ئیتاڵیا بەناوی باوکییەوە، پاپا ئەلێکساندەر. لە ساڵی ١٥٠٠دا ئەو ڕۆماگنای لە باکووری ئیتاڵیا گرت. ناوچەکە چەند ساڵێک بوو لەلایەن زنجیرەیەک گەورەی چەوچنۆک فەرمانڕەوایی دەکران کە سامانەکەیان بۆ خۆیان بەتاڵان بردبوو. بەبێ پۆلیس یان هەر هێزێکی دیسپلینکار، بێ یاسایی هاتبووە کایەوە، هەموو ناوچەکان لەلایەن تاڵانچییان و خێڵە دوژمندارەکان حوکم دەکران. بۆ بونیادنانی سیستەم، قەیسەر ئەفسەرێکی ناوچەکەی دەستنیشان کرد- ڕێمرۆ دی ئۆرکۆ، بە قسەی ماکیاڤیللی "پیاوێکی بەتین و دڵڕەق". قەیسەر دەسەڵاتی تەواوی بە ئۆرکۆ بەخشی.

بە وزە و توندوتیژییەوە، دی ئۆرکۆ دادپەروەرییەکی دڵڕەقانەی لە ڕۆماگنا بونیاد نا و بەزوویی لە تەقریبەن هەموو توخمە نایاساییەکان قوتاری کرد. بەڵام لە تامەزرۆییەکەیدا هەندێ جار زۆر پێی ڕادەکێشا و پاش چەند ساڵێک دانیشتووانی لۆکاڵ کینەیان بەرانبەر هەڵگرت. لە دیسەمبەری ١٥٠٢دا، قەیسەر هەنگاوی یەکلاییکەرەوەی هەڵێنا. یەکەم جار ئەو لێگەڕا بزانرێ کە کردارە توندوتیژ و دڵڕەقانەکانی دی ئۆرکۆی بەدڵ نییە، کە لە سروشتی دڵڕەقانەی ئەفسەرەکەوە سەرچاوەی دەگرت. پاشان، لە ٢٢ی دیسەمبەردا، دی ئۆرکۆی لە شاری سەسێنا بەند کرد و ڕۆژی پاش کریسمەس خەڵکی شار بەرانبەر دیمەنێکی سەیر لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە بێدار بوونەوە. لاشەی بێ سەری ئۆرکۆ، بە جلێکی گرانبەها و کڵاوێکی مۆرەوە، کەللەسەرەکەشی لە تەنیشتییەوە بە ڕمێکەوە کرابوو، چەقۆی خوێناوی بلۆکی جەلاددەکە لەتەنیشت سەرەکە دانرابوو. هەروەک ماکیاڤیللی لەسەر دیمەنەکە تێبینی کردبوو "درندەیی دیمەنەکە خەڵکەکەی لە یەک کاتدا سەرسام و پەژارەمەند کرد"

## لێکدانەوە

ئەیسەر بۆرگا باریکەرێکی گەمەی دەسەڵات بوو. هەمیشە لەپێشدا پلانی چەند جوڵەیەکی دادەنا، ئەو زیرەکانەترین بەڵەی بۆ بەیارەکانی دەنایەوە. لەبەرامبەر ئەمەدا، مەکیاڤیلی لە کتێبی (میر)دا لەچاو هەمووان زۆرترین رێزی لەو ناوە.

ئەیسەر لە رێمانگا بە رووبینییەکی سەرسوڕهێنەرەوە پێشبینی ئایندەی کرد. ئەمیا دادپەروەریی دڵرەقانە سیستەم بۆ ماوچەکە بەرقەرار دەکات. پرۆسەکە چەند ساڵێکی دەخایاند و لە سەرەتادا خەڵکی پێشوازییان لێدەکرد، بەڵام بەرووی لوژمی رقی پەیدا دەکردن هاوڵاتیان کینەیان لەبەرامبەر سەپاندنی دادگەرییەکی وەها توند هەڵدەگرت، بەتایبەت لەلایەن بێگانەکانەوە. پاشان نەدەکرا ئەیسەر خۆی وەکو بکەری ئەم دادپەروەرییە بپیرێت— کینەی خەڵکی کشتەی رقی لە ئایندەدا دەجستنەوە. بۆیە ئەو کە لە پێشدا دەیزانی هەر کە ئەرکەکە جێبەجێ کرا دەبێ کەللە سەری دی ئۆرکۆ بەسەر رمێکەوە بخاتەنمایش، پیاوێکی هەڵبژارد کە دەیتووانی کارە پیسەکە بکات. بەردەبارەکە لەم بارەدا هەر لەسەرەتاوە دەستنیشانکرابوو.

*ئەسیاییەکان زۆرزۆر ژمارەیەک کەسی بێ کەڵک و برسیان لەسەر حسابی گشتی بەخێوەکرد و کاتێک هەر کارەساتێکی وەکو ئافات، وشکی و قات بەسەر شارەکە دەهات (ئەم بەردەبازانە) پەیجەیان بۆ رادەکێشرا. و پاشان، بە شێوەیەکی ئاشکرا بە بەردەبارانکردنیان لە دەرەوەی شار دەکرانە قوربانی*

*لقی ئالتووس، ستیر جەیمز فرەیزەر، ۱۸۵٤ ۱۹٤۱*

## کلیلی دەسەڵات

بەکارهێنانی بەردەبار ئەوەندەی خودی شارستانیەت کۆنە و دەکری نموونەکانی لە کەلتوورەکانی سەرانسەری جیهان بەدی بکرێن. بیرۆکەی سەرەکی لە پشت ئەم

قوربانیدانەوە وەرچەرخانی گوناهە بۆ شتێکی دەرەکی- کەرەستە، ئاژەڵ یان مرۆڤ– کە دوایی دوور دەخرێتەوە و لەنێو دەبرێت. عیبرییەکان ڕاهاتبوون لەسەر ئەوەی بزنێکی ڕیشدرێژ (بەردەبارەکە) ببەن کە قەشە دەستەکانی دەخستە سەر سەری لەکاتێکدا کە دڵی بە گوناهەکانی بەنی ئیسرائیلدا دەدا. لێرەوە پاش ئەوەی گوناهەکانی بۆ دەگوازرانەوە، ئاژەڵەکە ڕێی دەشت و سەحرا دەکرا. لە حاڵەتی ئەسینایییەکان و ئارتیکەکاندا، بەردەبارەکە مرۆڤ بوو، زۆرجار کەسێک بۆ ئەم مەبەستە خۆراکی دەدرایەوە و پەروەردە دەکرا. لەبەرئەوەی وا دادەنرا کە قاتی و ئافات لە سزای کرداری خراپدا لەلایەن خوداکانەوە بۆ مرۆڤ دەنێردرێن، خەڵک خۆیان نەک تەنیا بەدەست قاتی و ئافاتەوە دەیاناڵاند بەڵکو بەدەست سەرکۆنە و گوناهیشەوە هاوارهاواریان بوو. ئەوان لە ڕێگەی گواستنەوەیەوە بۆ سەر کەسێکی بێگوناە خۆیان لە گوناە قوتار دەکرد کە مەبەست ئەوە بوو مردنی ببێتە هۆی ئاسودەبوونی هێزە ئاسمانییەکان و دەربەدەرکردنی ئەهریمەن لە ماڵیان.

ئەوە کاردانەوەیەکی تەواوەتی مرۆڤە کە پاش ئەنجامدانی هەڵە یان تاوان بەپێیتە ناخ، بەڵکو بڕوایە دەرەوەی و تۆماڵەکە یان گوناهەکە بخاتە ئەستۆی کەرەستەیەکی گونجاو. کاتێک ئافات (تێپ) دەگرنەوە، تردیپ بۆ هۆکارەکەی لەهەموو شوێنێک گەڕا، لە هەموو شوێنێک جگە لە ناوەوەی خۆی و گوناهی سەرخێلکردنی لەگەڵ نزیکترین کەسیدا، کە خوێنەکانی زۆر تووڕە کردبوو و ناوبەناو ئافات بڵاو دەبووەوە. ئەم پێویستییە بۆ بەدەرەکیکردنی گوناه، بۆ خستنەملی کەسێك یان کەرەستەیەکی تر، کاریگەری و هێزێکی گەورەی هەیە کە کەسی زیرەک دەزانێت چۆن ڕێکیفی بکات. قوربانیکردن سرووتێکە، لەوانەشە کۆنترین سرووت بێت. سرووتیش سەرچاوەیەکی دەسەڵاتە. بە کوشتنی دی ئۆرکۆدا، تیپیی بەبێشی سرووت ئاسا و پەمریی قەیسەر بکە بۆ جەستەی هاوڵاتیانی ڕۆماکەا دەستنەخێ کاردانەوەیان پیشاندا. لەبەرئەوەی پێوایە بە دەرەوە بێت لە ناخمان ئەوەندە بەشێوەیەکی سروشتی بەسەرمان بێت، دەم و دەست گوناهی بەردەبارەکە قبوڵ دەکەین.

سەرەڕای سیاسەتی گوناه، دەشێ بەردەباز وەکو هۆشدارییەک بەکاربهێنرێت بۆ ئەوانیتر. لە ١٦٣١دا، پیلانێک دارێژرا بۆ لەسەر حوکم لادانی کاردینال ریشێلۆ، پیلانێک کە بە "رۆژی فریودراوەکان" ناسرا. ئەمە تەقریبەن سەرکەوتوو بوو، چونکە کاربەدەستانی سەرەوەی حکومەتی تێوەگلابوون، لەوانەش شاژنی دایک. بەڵام لە رێگەی بەخت و پشتیوانی خۆیەوە، ریشێلۆ بۆی دەرچوو.

یەکێک لە پیلانگێڕە سەرەکییەکان پیاوێک بوو بەناوی ماریلاک، پارێزەری مۆرەکان. ریشێلۆ نەیتوانی بەبێ تێوەگلاندنی شاژنی دایک سزای بدات، تاکتیکێکی بێ رادە ترسناک، بۆیە ئەو برای ماریلاکی کردە ئامانج کە مارشالێک بوو لە سوپادا. ئەم پیاوە لە پیلانەکەوە نەگلابوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ریشێلۆ لە ترسی ئەوەی لەوانەیە پیلانگێڕی تر هەبن، بەتایبەت لەسوپادا، بڕیاریدا کەسێک بکات بە سەرمەشق. ئەو بە تۆمەتی هەڵبەستراو برای کابرای دادگایی کرد کە خۆی پێی وابوو پارێزراوە و هۆشداری دایە هەر پیلانگێڕێکی ئایندە لەمەڕ ئەوەی کە نابڕیسکێنەوە لەوەی بێگوناه بکەنە قوربانی تەنیا بۆئەوەی دەسەڵاتی خۆی بپارێزێت.

لە راستیدا رووبەڕوو کارێکی زیرانەیە بێگوناهترین قوربانی وەکو مرنی قوربانی هەڵبژێریت. خەڵکی لەو جۆرە بایی ئەوەندە بەهێز نین شەڕت لەگەڵ بکەن و لەوانەیە پرۆتێستۆ ساویلکانەییەکانیان وەکو نیشانەی گوناهیان ببینرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، وریا بە، شەهیدێک دروست نەکەیت. گرینگە تۆ وەک قوربانی بمێنێیتەوە، ئەو سەرکردە داماوەی کە بەهۆی بێکەڵکی ئەوانەی دەوروبەری ناپاکی لێکرا. ئەگەر بەردەبازەکە زۆر لاواز دیار نەبێت و سزاکەی زۆر دڵڕەقانە بێت، دەشێ تۆ ببیتە قوربانی ئامرازەکەی خۆت. هەندێ جار دەبێت تۆ بەردەبازێکی زۆر بەهێزتر بدۆزیتەوە- بەردەبازێک کە لە درێژمەودا دا هاوسۆزییەکی کەمتر بەلای خۆیدا بەکێش دەکات.

لەم سۆنگەیەوە، مێژوو ناوەناو بەهای بەکارهێنانی پارێزەری نزیکی وەکو بەردەباز پیشانداوە. ئەمە وەکو "کەوتنی دڵخواز" ناسراوە. زۆربەی پاشاکان کەسێکی دڵخوازیان لە دەربار هەبووە، پیاوێک کە ئەوان جیاییان کردوەتەوە، هەندێ جار لەبەر

هۆکارێکی دیاریش نا، و بێحەمەت و سەرزەنشیان بەسەردا باراندووە. بەڵام لەوانەیە ئەم دڵخوازەی دەربار بەردەبارێکی گونجاویش بووبێت لە حاڵەتی هەڕەشەیەکدا بۆ سەر ناوبانگی پاشا. خەڵکی دەم و دەست باوەڕ بە گوناهی بەردەبارەکە دەهێنن- بۆچی پاشا کەسی دڵخوازی دەکاتە قوربانی ئەگەر ئاراسار نەبێت؟ و هەرچۆنێک بێت دەرباریەکی تر کە ڕقیان لەو دڵخوازەیە، خۆشی لەم کەوتنە دەبینن. لەهەمان کاتدا، پاشا خۆی لە پیاوێک قوتار دەکات کە بەهاتنی ئەو کاتە لەوانەیە زۆری لەبارەوە زانیبێت، لەوانەشە ڕقی لێهەڵگرتبێت و تێڕوانینێکی سووکی لەبەرامبەر کەڵاڵە بووبێت هەڵبژاردنی یاریدەدەرێکی وەک بەردەبار هەمان بەهای "کەوتنی دڵخواز"ی هەیە لەوانەیە تۆ هاوڕێیەک یان یاریدەدەرێک لەدەست بدەیت، بەڵام لە پیلانی دوورمەودای شتەکاندا، زۆر گرنگترە هەڵەکانت بشاریتەوە نەک دەست بەکەسێکەوە بگریت کە لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان لێت هەڵگەڕێتەوە. سەرباری ئەمەش، تۆ هەمیشە دەتوانیت دڵخوازێکی نوێ بدۆزیتەوە کە شوێنی بگرێتەوە

وێنە بزنی بێگوناه لە ڕۆژی ئاشتبوونەوەدا، قەشەی باڵا بزنەکە دەهێنێتە پەرستگە، دەستەکانی لەسەر سەری دادەنێت و دان بەگوناهەکانی هەڵکید دەنێت، گوناهەکە بۆ چوارپێیە بێگوناهەکە دەگوێزێتەوە کە پاشان هەڵوەدای سەحرای دەکات و گوناه و سوچی خەڵکی لەگەڵیدا لەناودەچن.

دەسەڵات حزبە بریتی نییە لە ئەنجامدانی خراپە، بەڵکو بریتییە لە بەتوانایی شاردنەوەی هەموو مرۆڤەکان هەڵە دەکەن، بەڵام کەسی زیرەک ئەو هەڵانە دەشارێتەوە کە ئەنجامیداون بەکاتێکدا کە گەمژە ئاشکرایان دەکات. ناوبانگ زیاتر پەیوەستە بەوەی چ شتێک شاردراوەتەوە نەک چ شتێک دەبینرێت. ئەگەر ناتوانیت باش بیت، وریا بە.

(بالتاسار گراسیەن، ١٦٠١-١٦٥٨)

## بەشی ٢ چنگی پشیلە بەکاربێنە

لە حەکایەتەکەدا، مەیموون چنگی پشیلەی هاورێی دەگرێت و بەکاری دەهێنێت بۆ دەرهێنانی کەستانە لە ئاگر، لێرەوە بەدەستهێنانی ئەو چەرەسەرەی حەزی لێیەتی، بەبێ ئەوەی ئازاری خۆی بدات

ئەگەر شتێکی ناخۆش یان نەخوازراو هەیە پێویستە بکرێت، زۆر سەرکێشانەیە خۆت کارەکە بکەیت. تۆ پێویستت بە بەکارهێنانی چنگی پشیلەیە – کەسێک کە کاری پیس، ترسناک بۆ تۆ ئەنجام دەدات. چنگی پشیلە ئەو شتە بۆ بەدەست دەهێنێت کە پێویستتە، ئازاری ئەو کەسە دەدات کە پێویستە ئازاری بدەیت و لە چاوی خەڵکی بەدوور دەگرێت لەکاتێکدا کە تۆ وەک بەرپرس لەکارەکە دەستنیشان بکرێیت. لێگەڕێ کەسێکی تر جێبەجێکار بێت یان هەڵگری هەواڵی ناخۆش بێت، لەکاتێکدا کە تۆ تەنیا خۆشی و شادی بێنە.

### پەیڕەویکردن لە یاساکە ١

لە ٩٥ی پێش زاییندا، شازنی ئایندەی میسر کلیۆپاترا، کە ئەو کاتە ١٠ ساڵان بوو، سەرنگوون بوون و دەربەدەربوونی باوکی، پتۆلەمی دوازدەهەمی بەدەستی کچە گەورەکانی بینی – واتە خوشکەکانی خۆی. یەکێک لە کچەکان، بێرێنیس، وەکو رێبەری یاخیگەرییەکە دەرکەوت و بۆ زامنکردنی ئەوەی کە ئەو ئێستا بەتەنیا حوکمی میسر دەکات، خوشکەکانی تری زیندانی کرد و مێردەکەی خۆی کوشت. لەوانەیە ئەمە وەکو هەنگاوێکی کرداری بۆ زامنکردنی حوکمڕانییەکەی پێویست بووبێت. بەڵام ئەوەی کە ئەندامێکی خێزانی شاهانە، شازنێک کەمتر نا، وەها بە ئاشکرایی توندوتیژییەکی وەها بەرامبەر خێزانەکەی ئەنجام بدات بووە هۆی تۆقینی رەعیەکانی و نەیارییەکی توندی وروژاند. چوار ساڵ دواتر ئەم نەیارییە کاریگەری ئەوەندە بەهێز بوو کە پتۆلەمی

گەڕاندەوە سەر دەسەڵات و دەستبەجێ بێرێنیسی خوشکە گەورەکانی تری بەسەربڕییدا

لە ٥١ی پێش زاییندا، پتۆلیمی مرد و چوار منداڵی ماوەی وەکو میراتگر بەجێ هێشت هەروەک نەریت لە میسر وەها بوو، گەورەترین کوڕ، پتۆلیمی سیانزەهەم (کە ئەو کاتە تەمەنی تەنیا دە ساڵان بوو) هاوسەرگیری لەگەڵ کلیۆپاترای خوشکە گەورەی کرد (کە ئێستا هەژدە ساڵ بوو) و جووتەکە پێکەوە وەکو پاشا و شاژن لەسەر تەخت دانیشتن هیچ کام لە چوار منداڵەکە لەبەرامبەر یەکەدا هەستیان بە ئاسوودەیی نەکرد، هەموویان، بە کلیۆپاتراشەوە، دەسەڵاتی زیاتریان دەویست. ململانێ لەنێوان کلیۆپاترا و پتۆلیمی سیانزەهەدا کە هەریەکەیان هەوڵیدەدا ئەویتریان بەلاوە بنێت

لە ٤٨ی پێش زاییندا، بە یارمەتی باڵێکی حکومەت کە ترسی بە چاوچنۆکی کلیۆپاترا هەبوو، پتۆلیمی توانی خوشکەکەی ناچار بکات لە وڵات رابکات و خۆی وەک تاکە فەرمانڕەوا بمێنێتەوە. لە ئاوارەیدا، کلیۆپاترا پیلانی داڕشت. ئەو ویستی تاکە فەرمانڕەوا بێت و میسر بگەڕێنێتەوە بۆ شکۆمەندیی ڕابردوو، ئامانجێ کە هەستیکرد هیچ کام لە خوشکەکانی تری لەدەستیان نایەت لەگەڵ ئەوەشدا، تا ئەو جێیەی کە ئەوان ڕێنوێن بوون، ئەو نەیدەتوانی خەونەکەی بهێنێتە دی. نموونەی بێرینیسیش ڕوونیکردبووە کە کەس ناتوانێت وەک شاژنێک حوکم بکات کە پێشتر کەسی خۆی کوشتووە. تەنانەت پتۆلیمی سیانزەهەم جورئەتی ئەوەی نەبوو کلیۆپاترا بکوژێت، هەرچەندە دەیزانی لە ئاوارەیدا هەریەکی پیلانگێڕی دەبێت لە دژی ئەم

لەدوای ساڵێک پاش دەربەدەرکردنی کلیۆپاترا، جولیەس قەیسەری دیکتاتۆری ڕۆم گەیشتە میسر، سوور بوو لەسەر ئەوەی وڵاتەکە بکاتە کۆلۆنیەکی ڕۆم. کلیۆپاترا بە دەرفەتی خۆی گەیشت. ئەو پاش ئەوەی بە پۆشاکێکی نەناسراو داخڵی میسر بوو، چەندەها مایلی بڕی تا گەیشتە قەیسەر لە ئەلیکساندەریە. ئەفسانەی ئەوە لە ئارادا بوو کە ئەو خۆی بەدزییەوە لەناو فەرشێکی لوولدراودا گلۆر بووەتەوە بەردەمی قەیسەر و فەرشەکە کراوەتەوە و شاژنی گەنجی لێ هاتووەتە دەرەوە. کلیۆپاترا دەستبەجێ

دەستیکرد بە کارکردن لەسەر ڕۆمەکان. ئەو دەمەی خەرجەوییسییەکەیدا بۆ نمایش و دیبەهداس بە مێژووی میسر و سەیرە مییەییەکانی بەسەریدا هەڵڕژاند. قەیسەر بەرەوبی ملیدا و کلیۆپاترای گەڕاندەوە بۆ سەر تەخت.

خوشکەکانی کلیۆپاترا هەڵچوون- ئەو پێش ئەمانی داوەوە. پطلیمی سیانزەهەم چاوەڕێی نەدەبوو تا ببینێت دواتر چی ڕوودەدات. لە کۆشکەوە لە ئەلیکساندەریە سوپایەکی گەورەی هێنایە سەر شار و هێرشی کردە سەر قەیسەر. لە وەلامدا، قەیسەر دەستەجێ پتۆلیمی و خانەوادەکەی دەستەزێر پلگرتنی دەرەملێ. بەلام خوشکە بچوکەکەی کلیۆپاترا بەناوی ئارسینۆ لە کۆشک ڕایکرد و خۆی دەستەپێش هێزێکی سەربازی میسری کە لە دریکبرووەوەدا بوو و خۆی وەک شاژنی میسر ڕاگەیاند. ئێستا کلیۆپاترا بۆ دواجار دەرفەتێکی بۆ خۆی بەدی کرد. ئەو قەناعەتی بە قەیسەر هێنا پطلیمی بەرەڵا بکات بەو پێککەوتنەی کە ئەو ئاگربەست ڕابگەیەنێت. بێگومان کلیۆپاترا دەیزانی پێچەوانەکەی دەکات- ئەمەی کە ڕووبەڕووی ئاسینۆ دەبێتەوە لەپێناو کۆنترۆلکردنی سوپای میسردا. بەلام ئەوە لە سوودی کلیۆپاترا بوو، چونکە ئەمە خانەوادەی شاهانەی پەرتەوازە دەکرد. لەوەش باشتر، ئەمە دەرفەتی دەدایە قەیسەر تا بە شەڕدا شکست بە برا و خوشکەکانی بهێنێت و بیانکوژێت.

قەیسەر کە بە هێزی سەربازیی لە ڕۆمەوە پاڵپشتی کرا، بەخێرایی شکستی بە یاخیبووان هێنا. لەکشانەوەی میسرییەکاندا، پتۆلیمی لە ڕووبەری نیلدا نقوم بوو. قەیسەر ئارسینۆی گرت و وەک بەندی ڕەوانەی ڕۆمی کرد. بەهەمان شێوە چەندەها دوژمنی تیرباران کرد کە لە کلیۆپاترا هەڵگەڕابوونەوە و ئەوانەتری زیندانی کرد کە لەدژی بوون. بۆ تەواوکردنی پێگەکەی وەکو شاژنی بێ ڕکابەر، کلیۆپاترا ئێستا هاوسەرگیری لەگەڵ براکە بچووکەکەی کرد، پطلیمی چواردەهەم- کە لەو کاتەدا تەمەنی یانزە ساڵان بوو و لاوەزیش بوو. چوار ساڵ دواتر، پطلیمی بەشێوەیەکی ڕازئامێز بە ژەهر مرد.

له ٤١ی پێش زاینیدا، کلیۆپاترا هەمان تاکتیکەکانی لەبەرامبەر دووەمین سەرکردەی رۆمی بەناوی مارک ئەنتۆنی پیادەکرد که بەسەر قەیسەر جولیەسدا پیادەی کردبوو، پاش مردنی، ئاماژەی بەوەدا که ئارسینۆ هێشتا له رۆم زیندانییه و دەبێ ئەو لەناوی ببات. مارک ئەنتۆنی ماوەی بەم کرد و دەستبەجێ فەرمانی تیربارانکردنی ئارسینۆی دەرکرد و لەوێوه لەتوانای کەسی خۆی قوتاری بوو که هەڕەشەیەکی گەورە بوو لەسەر کلیۆپاترادا

## لێکدانەوە

ئەمسانەیەک لەئارادایه که کلیۆپاترا به جادووی فریودەرانەی خۆی سەرکەوتوو بوو، بەڵام له واقیعدا هێزەکەی له توانایەوه دەهات بۆ مەدانی خەڵک تا به قسەی بکەن بەبێ ئەوەی هەست بکەن بەکاربراون. قەیسەر و ئەنتۆنی نەک تەنیا له مەترسیدارترین برا و خوشکەکانی قوتاریان کرد - پتۆلیمی سیانزەهەم و ئارسینۆ - ئەوان هەموو دوژمنەکانی ئەویان لەنێو برد، هەم له حکومەت و هەم له سوپادا. ئەو دوو کەسه بوونه چنگی پشیلەی ئەو. ئەوان چوونه ناو ئاگر بۆی، کاری پیس بەڵام پێویستیان کرد، لەکاتێکدا که دەرکەوتنی ئەویان وەکو بکوژی خوشک و براکەی و هاوڕێ میسرییەکانی شاردەوه. له کۆتاییشدا، هەردوو پیاوەکه ملیان بۆ ئارەزووەکەیدا تا نەک وەک وەک کۆلۆنییەک بەڵکو وەکو مەملەکەتێکی هاوپەیمانی سەربەخۆ حوکمی میسر بکات. ئەوان هەموو ئەمەیان بۆ ئەو کرد بەبێ ئەوەی پەی بەوه ببەن چۆن بەکاری بردوون. ئەمه راپێکردنێک بوو له بەهێزترین و ئاڵۆزترین جۆریدا.

نابێت شاژن قەت به دەستی پیسەوه بەهۆی ئەرکه دزێوەکان دەرکەوێت نه دەکرێ پاشاش به ڕوخساری خوێناوییەوه دەرکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵات بەبێ پلیشاندنەوەی بەردەوامی دوژمنان بەردەوام نابێت - هەمیشه ئەو ئەرکه بچوکه پیسانه دەبن که دەبێ بکرێن بۆ پاراستنی تۆ لەسەر تەخت. وەکو کلیۆپاترا، پێویستت به چنگی پشیله هەیه.

## پەیڕەویکردن لە یاساکە ٢

لە دەیەکانی ١٩٢٠ەکاندا، شەڕی ناوخۆ لە چین هەڵگیرسا لەکاتێکدا کە حزبە کۆمەنیست و ناسیۆنالیستەکان لەشەڕدا بوون بۆ کۆنتڕۆڵکردنی وڵات. لە ١٩٢٧دا، (چیانگ کای شێک)، سەرکردەی ناسیۆنالیستی سوێندی خوارد دوایین کۆمەنیست لەناو ببات و بەدرێژایی چەند ساڵی دواتر ئەو ئەفریقەی ئەرکەکەی نەچن گەیاند، دوژمنانی بە توندی حستەژێر فشارەوە تا ئەوەی کە لە ١٩٣٤–١٩٣٥، ناچاری کردن بچنە ناو (ڕێ پێشتنی درێژ)، کشانەوەیەکی شەش هەزار مایلی لە باشووری خۆرهەڵاتەوە بۆ باکووری خۆرئاوای لاتەریک بە ڕەوییەکی سەختدا کە تیایدا زۆربەی ئەندامەکانی لەنێو چوون. لە دەیەکانی ١٩٣٦دا، چیانگ پلانی دوا پەلاماری دارشت بۆ ڕامالینیان، بەڵام لە یاخیبوونێکدا گیرا. سەربازەکانی خۆی دەستگیریان کرد و ڕادەستی کۆمەنیستەکانیان کرد. ئێستا جگە لە خراپترین شت چاوەڕێی هیچی نەدەکرد.

لەهەمان کاتدا، ژاپۆنییەکان دەستیانکرد بە داگیرکردنی چین و چیانگ تووشی سەرسوڕمان بوو کاتێك لەبری کوشتنی، سەرکردەی کۆمەنیستی، ماو تسی تۆنگ پێشنیاری سەفقەیەکی کرد. کۆمەنیستەکان لێدەگەڕێن بڕوات و وەکو فەرماندەی هێزەکانی ئەمان و هی حزبیشی دانی پێدا دەنێن، ئەگەر ڕازی بێت شانبەشانی ئەوان لەدژی دوژمنی هاوبەش شەڕ بکەن. چیانگ پێشبینی ئەشکەنجە و تیربارانکردنی کردبوو، ئێستا نەیدەتوانی باوەڕ بەو بەختەی بکات. ئەو سوورانە چەمیك ئیسکیان سوك بوو. نەبێ ئەوەی پێویست بکات شەڕێکی بەرگریکارانە لەدژی کۆمەنیستەکان بکات، ڕێی کە دەتوانێت ژاپۆنییەکان شکست پێ بێنێت و پاشان چەند ساڵێك دواتر لە سوورەکان دەماتە دەست و بەئاسانی تێکیدەشکاندن. ئەو لە ڕازی بوون بە مەرجەکان هیچی نەبوو لەدەستی بدات و زۆر شت هەبوو بەدەستی بێنێت.

کۆمەنیستەکان بەشێوازی باویان، بەباکتیکی گەریلایی لێدە و ڕاکە دەستیانکرد بە شەڕ لەدژی ژاپۆنییەکان لەکاتێکدا کە ناسیۆنالیستەکان شەڕێکی تەقلیدیتریان ئەنجامدا.

پێکەوە بەش چەند ساڵێک، ئەوان سەرکەوتوو بوون لە دەرکردنی ژاپۆنییەکان لەگەڵ ئەوەشدا، ئێستا چیانگ بۆ دووجار بیگەیێنێت کە ماو بە ڕاستی پلانی چی داوە سوپاکەی خۆی کە ڕووبەڕووی بەشی گەورەی ئەرتەشی ژاپۆنی بووەوە، بە ڕادەیەکی زۆر لاواز بوو و چەند ساڵێکی پێدەچوو تا بێتەوە سەر پێکە. لەکاتێکدا کە کۆمۆنیستەکان نەک تەنیا خۆیان لە لێدانی ڕاستەوخۆی ژاپۆنییەکان پاراستبوو بەڵکو کاتیان بەکارهێنابوو تا گوندنشینان بەدەست بێننەوە و بڵاو ببنەوە و خانەکانی کاریگەری لەسەرانسەری چیندا بەدەست بێنەوە. هەر کە جەنگ لەدژی ژاپۆنییەکان کۆتایی هات، شەڕی ناوخۆ جارێکی تر دەستی پێکردەوە— بەڵام ئەمجارە کۆمۆنیستەکان ناسیۆنالیستەکانیان تەرق کرد و بەمیلیۆنی ملیان پێدان، ژاپۆنییەکان ببوونە چنگی پشیلەی ماو تسی تۆنگ، بە ئەنقەست کێڵگەکانیان بۆ کۆمۆنیستەکان دەکێڵا و سەرکەوتنیان بەسەر چیانگ کای شێک ئاسان دەکرد.

## لێکدانەوە

زۆربەی ئەو سەرکردانەی دوژمنی سەرسەختی وەکو چیانگ کای شێکیان بە بەندی گرتبوو، جەختیان لەوە دەکردەوە بیکوژن. بەڵام لەم کردارەبەدا ئەو دەرفەتەیان لەکیس دەچوو کە ماو قۆستبوویەوە: بەبێ چیانگی بەئەزموون وەکو سەرکردەی ناسیۆنالیستەکان، لەوسەرو شەڕ بۆ دەرپەڕاندنی ژاپۆنییەکان زۆر زیاتر بخایەنێت و دەرەنجامی کارەساتاریشی لێبکەوتنەوە. ماو لەوە زیرەکتر بوو بیگەڕێنێت تووڕەیی ناڵی بەسەردا بکشێت و کوشتنی دوژمنێکی دوور بلند بە بەردێک لەدەست بدات. لە بەرامبەردا، ماو ئەو چنگی پشیلەی بۆ ئاسانکاریی بەدەستهێنانی سەرکەوتنی سەراپاگیر بەکارهێنا. یەکەم، ئەو زیرەکانە چیانگی وەکو چەشنە بەکارهێنا بەوەی سەرکردایەتی جەنگ لەدژی ژاپۆنییەکان بگرێتە ئەستۆ. ماو دەیزانی ناسیۆنالیستەکان بە ڕابەرایەتی چیانگ بە سەرسەختترین شێوە دەجەنگن و سەرکەوتوو دەبن لەوەی ژاپۆنییەکان لە چین دەربپەڕێنن ئەگەر لەهەمان کاتدا خۆیان بە شەڕ لەدژی کۆمۆنیستەکان سەرقاڵ نەکەن

بۆیە ئامیۆزالیستەکان بەکەمی چنگە پشیلە بوون، بەکارهێنران بۆ دەربەڕاندنی ژاپۆنییەکان. بەڵام ماو بەهەمان شێوە دەیزانی لە پرۆسەی ڕێبەرایەتیکردنی جەنگ لەدژی داگیرکەران، پاڵپشتی ئاسمانی و تەقەمەنی ژاپۆنییەکان هێزە بەڵێنییەکانی ئامیۆزالیستەکان لەناو دەبات، ئەو زیانەی دەگەیاند کە لەوانەبوو چەند دەیەیەکی پێ بچێت تا کۆمەنیستەکان پێیان دەگەیاندن. بۆچی کات و ژیانی بەفیڕۆ بدەن ئەگەر ژاپۆنییەکان بیانتوانیایە بەخێرایی کارەکە ئەنجام بدەن؟ ئەم سیاسەتە ژیرانەیەی بەکارهێنانی چنگی پشیلە بوو ڕێگەی بۆ کۆمەنیستەکان خۆش کرد سەرکەوتوو بن

دوو بەکارهێنانی چنگی پشیلە هەن: بۆ ڕزگارکردنی وڵات، بەو شێوەیەی کلیۆپاترا کردی و بۆ ڕزگارکردنی وزە و تەقەلا. ئەوەی دووەمیان بەتایبەت پێویستی ئەوەیە تۆ لەپێشدا پلانی چەند جوڵەیەک دابنێیت درک بەوە بکەیت کە جوڵەیەکی کاتی بۆ دواوە (بۆ نموونە لە چیانگ بگەڕێیت بڕوات) دەشێ سەر بکێشێت بۆ بازدانێکی گەورە بەرەو پێشەوە. ئەگەر تۆ بەشێوەیەکی کاتی لاواز بوویت و پێویستت بە کات بوو تا بێیتەوە سەر پێکە، زۆرجار ئەوە بەکەڵک دێت کە ئەوانەی دەوروبەرت وەکو پەردەیەک بەکار بێنیت بۆ شاردنەوەی بیرۆکانت و وەک چنگە پشیلەیەک تا کارەکەت بۆ بکات. سۆراغی لایەنێکی سێیەمی بەهێز بکە کە هەمان دوژمنی تۆی هەیە (ئەگەرچی لەبەر هۆکاری جیاواز) پاشان هێزی باڵایان بخەرەوە بۆ وەشاندنی چەند گورزێک کە وزەیەکی زۆرتری لێ دەبردی، چونکە تۆ لاوازیی. ئەمانەت تۆ دەتوانێیت بە هەستی بەرەو نەیارییەکان ئاراستەیان بکەیت. هەمیشە ئەوانەی بە ئاشکرا شەرانگێزن وەکو چنگی پشیلە سۆراغ بکە. ئەوان زۆرجار ئارەزوومەندن سەر بنێن بە ناو شەڕەوە و تۆ دەتوانیت شەڕە گچکەکە بۆ مەبەستەکانی خۆت هەڵبژێریت

## پەیڕەویکردن لە یاساکە ٣

کوریما دەبێ شارەزایەکی چا-نو-یو بوو (ناوی گەرم بۆ چایی، ئاهەنگی چایی ژاپۆنی) و قوتابی وانەکانی مامۆستای گەورەی چایی، سین نۆ ریکیو بوو لە دەوروبەری

١٦٢٠دا دەیبی بۆی دەرکەوت کە هاوڕێیەکی خۆی بەناوی (هۆشیبۆ سونێمۆن) بڕە پارەیەکی زۆری قەرز کردووە (٢٠٠ ریۆ) بۆ ئەوەی پارمەتی خزمێکی بدات کە کەوتبووە ناو قەرزەوە. بەڵام هەرچەندە سونێمۆن توانیبووی خزمەکەی بە کەفالەت ئازاد بکات، هەرو بە ساماى فورساییەکەی هەستبووە سەر شانی خۆی دەیبی باش سونێمۆنی دەناسی– ئەو نە ئەوەندە کرنگی بە پارە دەدا نە ئەوەندەش لیی بێدەگەبشت و لەوانەبوو لە دەمەرەی قەرزێك کە بازرگانێکی دەوڵەمەند بەناوی (کاواچیا سانێمۆن) داییی دەکرد بەئاسانی بکەوێتە ناو گێرە و کێشەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، دەیبی پێشنیاری یارمەتیدانی سونێمونی کرد بەوەی قەرزەکە بداتەوە، ئەویش بەهۆی لەخۆباییبوونەکەیەوە ڕەتیدەکردەوە و لەوانەش بوو هەست بکات شعوری بریندار کراوە.

ڕۆژێکیان دەیبی سەردانی هاوڕێکەی کرد و پاش پیاسەیەك بەناو باخچەدا و ڕوانین لە گوڵە بەرهەمەکانی سونێمۆن، لە ژووری پێشوازی گیرسانەوە. لێرەدا دەیبی تابلۆیەکی بینی کە لەلایەن ماموستا کانۆ تینیو کێشرابوو دەیبی بە سەرسوڕمانەوە وتی "ئاه، تابلۆیەکی جوانە ..پێم وانییە پێشتر شتێکی لەوە باشترم بینیبێت" پاش چەند ستایشێکی تر، سونێمۆن هیچ بژاردەیەکی تری لەبەردەمدا نەبوو، وتی "باشە، لەبەرئەوەی ئەوەندە حەزت لێیەتی، هیوادارم وەك دیاری قبوڵی بکەیت"

لەسەرەتادا دەیبی ڕەتی کردەوە، بەڵام کاتێك سونێمۆن مکوڕ بوو، قبوڵی کرد. ڕۆژی دواتر سونێمۆن لەبەرامبەر پاکێجێکی لە دەیبی پێگەیشت. ئینجانەیەکی ناسك و جوانی تێدابوو کە دەیبی بە تێبینییەکەوە، داوای لە هاوڕێکەی کردبوو وەکو نیشانەیەکی ستایش بۆ ئەو تابلۆیەی ڕۆژی پێشتر بە ڕێزێکی زۆرەوە پێی بەخشیبوو، قبوڵی بکات ئەو ڕوونیشی کردبۆوە کە ئینجانەکە لەلایەن خودی سێن نۆ ڕیکیو دروستکراوە و دەستنووسێکی ئیمپراتۆر هیدیۆشی لەسەر هەڵکەنرابوو. دەیبی ئاماژەی بەوە دا کە ئەگەر سێنۆمۆن ئینجانەکە فەرامۆش بکات ئەوا لەوانەیە وەك دیاری بیداتە هاموشۆکارێکی (چا نۆ یو)– لەوانەشە کاواچیا سانێمۆنی بازرگان، کە زۆرجار ئارەزووی خۆی بۆ خاوەندارێتی ئینجانەکە دەربڕیبوو. دەیبی بەردەوام بوو "بیستوومە ئەو پارچە

کاغەزێکی جوانی هەیە (بەڵێننامەی ٣٠٠ ڕێز) کە لەوانەیە تۆ کەیفت پێی بێت لەوانەیە بکرێت ئاڵوگۆڕێک ڕێکبخەیت

بە تێککردنی بەوەی هاوڕێ بەڕێزەکەی بەنەمای چییە، سوێمۆن ئیمجامەکەی بۆ لای قەرزدەرە دەوڵەمەندەکە برد. کاتێک سوێمۆن ئیمجامەکەی پیشاندا، مانیمۆن بە سەرسوڕمانەوە وتی "چۆن چۆنی ئەمەت بەدەستهێناوە. من زۆرجار شتم لەبارەی ئەمەوە بیستووە بەڵام ئەمە یەکەمین جار بیبینم. ئەمە گەنجینەیەکە قەت ڕێگە بەدراوە مەرێتە دەرەوەی دەروازەکە!" ئەو دەستبەجێ پێشنیاری ئاڵوگۆڕی کرد، بەڵێننامەیەکی قەرز لەبەرامبەر ئیمجامەکە و لەسەرووی ئەمەشەوە (٣٠ ڕێز) بداتە سوێمۆن. بەڵام سوێمۆن باکی بە پارە نەبوو تەنیا ویستی بەڵێننامەی قەرزەکە وەرگرێت و سایمۆن بە خۆشحاڵییەوە پێیدا. پاشان سوێمۆن دەستبەجێ بە ڕاکردن بۆ لای دەیێن چوو بۆ ئەوەی لەبەرامبەر پشتگیریی زیرەکانەیدا سوپاسی بکات

## لێکدانەوە

گۆریاما دەیەوێ تێبگەیەنێت لەوەی چاکە کردن قەت ئەوەندە ئاسان نییە. ئەگەر بە ئاشکرایی و خۆدەرخستن بکرێت، وەرگرەکەی هەست بە قورسایی ئەرکێک لەسەر شانی دەکات. لەوانەیە ئەمە هێزێکی دیاریکراو بداتە بکەرەکە، بەڵام ئەمە هێزێکە کە زۆرجار خۆوێرانکەرانەیە، چونکە ئەمە کینە و بەرەنگاری دەوروژێنێت. چاکە ئەگەر بە ناڕاستەوخۆیی و بە نەرمی ئەنجام بدرێت دە جار هێزی زیاترە. دەبێ دەیزانی تێککەوتنەوەی ڕاستەوخۆ تەنیا دەبێتە هۆی هەست برینداربوونی سوێمۆن. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر لێگەڕێت هاوڕێکەی تابلۆکەی ساتێ ئەوا وەها لە سوێمۆن دەکات هەست بکات ئەویش بە دیارییەک هاوڕێکەی دڵخۆش کردووە. لەکۆتاییدا، هەر سێ لایەن لە پرۆسەکەدا بەشێوازی خۆیان هەستیان بە ئاسوودەیی کرد

له سەروبەندی شەڕی گرنگی ڕووبار، گەورە ستراتیژیستی چینی سەدەی سێیەم، چوکو لیانگ بەهەڵە تۆمەتبار کرا بەوەی بەنهێنی کار بۆ لایەکەی تر دەکات. وەک بەڵگەی ئەمەکدارییەکەی، فەرماندەکەی فەرمانی پێدا ١٠٠,٠٠٠ تیر بۆ سوپا بەرهەم بهێنێت لەماوەی سێ ڕۆژدا، یان ڕووبەڕووی مەرگ ببێتەوە. لەبری هەوڵدان بۆ دروستکردنی تیرەکان، کە ئەرکێکی ئەستەم بوو، لیانگ دە دوانزە بەلەمی وەرگرت و چەند چەپکە قامیشێکی بەتەنیشتەکانی دانا. لە درەنگانی دوانیوەڕۆدا، کاتێک تەموژ هەمیشە ڕووبارەکەی داپۆشیبوو، ئەو بەلەمەکانی بەرەو کەمپی دوژمن ئاراستە کرد. لە ترسی تەڵەیەک لەلایەن چوکو لیانگی زیرەک، دوژمن بە بەلەمەکانی خۆیان هێرشیان نەکردە سەر ئەو بەلەمانەی بە ئەستەم دیاربوون بەڵکو لە کەناری ئاوەکەوە دایانە بەر لێزمەی تیر. لەکاتێکدا کە بەلەمەکانی لیانگ نزیک بوونەوە، ئەوان تیربارانەکەیان دووقات زیاد کرد کە لەناو قامیشە چڕەکاندا گیر دەبوون. پاش چەند سەعاتێک، ئەو پیاوانەی لەناو بەلەمەکاندا خۆیان حەشاردابوو بەلەمەکانیان بەخێرایی بەرەو خوارەوەی ڕووبارەکە ئاراستە کرد کە لەوێ لیانگ هاتە لایان و ١٠٠,٠٠٠ تیرەکەی کۆکردەوە

چوکو لیانگ ئەو کارێکی نەدەکرد کە ئەوانیتر دەیانتوانی بۆی بکەن- ئەو هەمیشە بیری لە قوڵی لەو جۆرە دەکردەوە. کلیلی پلاندانانی ستراتیژیکی وەها بریتییە لە توانای بیرکردنەوەی دووربینانە، وێناکردنی ئەو شێوازانەی بەهۆیانەوە دەشێ خەڵکی تر بکرێنە چەشتە بۆ ئەنجامدانی کارەکە بۆ تۆ

برگەیەکی هاوهەڕیی بۆ ئەوەی وا لەم ستراتیژییە بکەیت کاریگەر بێت ئەوەیە ئامانجەکەت داپۆشیت، پارنامیری بکەیت، وەکو ئەو بەلەمە نموونەی دوژمن کە بەشێوەیەکی لێل بە ناو تەمومژدا دەردەکەوێ. کاتێک ڕکابەرەکانت نەتوانن دڵنیابن لەوەی تۆ بەدوای چیەوەیت، ئەوان بە شێوازگەلێک کاردانەوە نیشان دەدەن کە زۆرجار لەدوورییەوەدا دا لەدژیان دەشکێتەوە. لە ڕاستیدا ئەوان دەبنە چنگی پشیلەی تۆ. ئەگەر تۆ نیازەکانت ڕووپۆش بکەیت، زۆر ئاسانترە بەرەو ناو ئەو خولانە ڕێنمایان بکەیت کە گونجاوت ئەو شتەی تۆ دەتەوێ ئەنجامی بدەن. بەڵام پێت باشترە خۆت نەیکەیت،

ئەنجامی بدەن. لەوانەیە ئەمە پێویستی بە پلاندانانی چەند هەنگاوێکی لە پێشینە بێت، وەکو ئەو ترێیەی ملیارد کە چەند مەرگەوتمێک بەر لایەکان دەکەوێت بەر لەوەی بچێتە ناو کوێنکی گرنەوە.

ساحتەچی ئەمریکی سەرەتای سەدەی بیستەم، گورە زەردە وەیل دەیزانی گرنگ نییە چەند زیرەکانە کڵاوی ئاپە سەر دەوڵەمەندێکی ساوێلکە، ئەگەر ئەو، واتە هەریمەکە، راستەوخۆ لێی نزیک ببوایەتەوە، ئەوا لەوانەبوو ساوێلکەکە گومانی لا دروست ببێت. بۆیە وەیل کەسێکی دەدۆزییەوە کە ساوێلکەکە مەمکە دەیزانی دەتوانێ چنگی پشیلە بێت– کەسێک کە لە هەرەمەکەدا نزمتر بوو و خۆی ئامانجێکی ناموەکین بوو، و لێرەوە کەمتر گومانی دەچووە سەر. وەیل ئارەزووی ئەو پیاوەی بۆ پیلانێک دەجوڵاند بە بەڵێنی سامانێکی بێ وێنەوە. پاش ئەماعەت هاتن ئەوەی پیلانەکە راستەقینەیە، چنگە پشیلەکە زۆرجار، بەبێ هاندان، ئامادەی ئەوەی دەدا کە دەبێ بەرپرسەکەی یان هاوڕێ دەوڵەمەندەکەشی بەشدار بێ. بە هەبوونی پارەی کاشی زیاتر بۆ سەرمایەگوزاریکردن، ئەم پیاوە قەبارەی مەبجەڵەکەی گەورەتر دەکرد، پارەی زیاتری بۆ کەسانی بەشدار بوو ئامادە دەکرد. پاشان چنگە پشیلەکە ئەو ساوێلکە دەوڵەمەندەی دەهێنایە ناوەوە کە بەدرێژایی ئەو ماوەیە ئامانجەکەی وەیل بوو، بەڵام گومانی تەڵەی بەدەکرد، چونکە ئەوە کارمەندە جی متمانەکەی بوو کە راپکێشابووە ناوەوە. ئامرازی لەم بابەتە زۆرجار باشترین رێگەن بۆ نزیکبوونەوە لە کەسێکی دەسەڵاتدار. یاریدەدەر یان کەسێکی خوار خۆت بەکار بێنە بۆ ئەوەی متمانەیەکت ئامانجە سەرەکییەکە. چنگە پشیلە متمانەی تۆ بونیاد دەنێت و لە رواڵەتی ناشیرینی تەنگاویت لە مجامەلەکردندا، دەپارێزێت.

ئاسانترین و کاریگەرترین رێگە بۆ بەکارهێنانی چنگەپشیلە زۆرجار چاندنی زانیارییە لەوەی، کە دوایی ئەو لای ئامانجە سەرەکییەکەت بڵاوی دەکاتەوە. زانیاری ساختە یان چێنراو ئامرازێکی بەهێزە، بەتایبەت ئەگەر لەلایەن ئەو فریودراوە بڵاو بکرێتەوە کە

کەس گومانی لێناکات. تۆ مەلاتەوە زۆر ئاسان دەبێت کە ڕۆڵی بێگوناه ببینیت و خۆت وەك سەرچاوە پەروەرش بکەیت

چارەسەرکاری ستراتیژی، دکتۆر میلتۆن ئەریکسۆن زۆرجار لەناو ئەخۆشەکانیدا ڕووبەڕووی کەپڵێکی ژن و مێرد دەبووەوە کە تیایدا ژنەکە چارەسەری دەویست بەڵام مێردەکە بەشێوەیەکی ڕەها ڕەتیدەکردەوە. لەبری بەفیڕۆدانی وزە لە هەوڵی مامەڵەکردن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ مێردەکەدا، دکتۆر ئەریکسۆن ژنەکەی بەتەنیا دەبینی و لەکاتێکدا کە ژنەکە قسەی دەکرد دکتۆر هەندێ لێکدانەوەی لەسەر ڕەفتاری مێردەکە دەهێنایە بەر باس کە دەیزانی مێردەکە پێی هەراسان دەبێت ئەگەر بیانبیستێتەوە بەدڵنیاییەوە ژنەکە ئەو قسانەی دکتۆری بۆ مێردەکەی دەگێڕایەوە پاش چەند هەفتەیەك مێردەکە ئەوەندە پەست دەبوو کە سوور دەبوو لەسەر ئەوەی لەگەڵ ژنەکەی بچێتە لای دکتۆرەکە بۆئەوەی قسەکانی ڕاست بکاتەوە.

**وێنە:** چنگی پشیلە چڕنوکی درێژی هەن بۆ گرتنی شتەکان. نەرم و بانە پشیلەکە بگرە و چنگی بەکاربێنە بۆ دەرهێنانی شتەکان لەناو ئاگر، بۆ چڕنوك گرتن لە دوژمن، بۆ یاریکردن بە مشك پێش ئەوەی قوتی بدەیت. هەندێ جار ئازاری پشیلەکە دەدەیت، بەڵام زۆربەی جار هەست بەهیچ شتێك ناکات

**دەسەڵات:** خۆت هەموو شتێکی خۆش بکە، هەموو شتێکی ناخۆش لە ڕێگەی لایەنی سێیەمەوە بکە. بە پەیڕەویکردن لە یەکەمین ڕێڕەو تۆ چاکەیەك بەدەست دێنیت، بە گرتنەبەری دووەمیان، تۆ ئیرادەی خراپ بەلاوە دەنێیت. کاروبارە گرنگەکان زۆرجار پێویستیان بە پاداشت و سزایە، با تەنیا چاکە لە تۆوە و خراپە لەوانیترەوە بێت

(بالتزار گرسیەن، ١٦٠١–١٦٥٨)

**پێچەوانەبوونەوە**

دەبێ چنگی پشیلە و بەردەبار بە وریاییەکی زۆر و هەستیارییەوە بەکار بێنی. ئەمە وەکو دوکەڵێکی تێوەگلانی تۆ لە کاری پیس لە چاوی خەڵکی دەشارێتەوە. ئەگەر لە هەر

ساتێکدا بوکەڵەکە لابچێت و تۆ وەک مەکاریەرێک، وەک مامۆستای بوکەڵەکە، بیبەزێنیت بەولوی دابامیکەکە وەردەچەرخێت– دەستی تۆ لە هەموو شوێنێک دەبێت و تۆ بەمەرامەر ئەو ئەگەتیپانەدا سەرکۆنە دەکرێیت کە لەولەوەر هیچ پەیوەندییەکت پێیانەوە نەمابە مەر کە ڕاستی دەرکەوت، ڕووداوەکان دەبنە تۆپەڵە بەفرێک لەوەبو کۆنترۆڵی تۆوە.

لە ١٥٧٢دا، شاژنە کاسرین دی میدیسی فەرەنسا پیلانێکی گێڕا بۆ لەلاوە نانی گاسپارد دی کۆلیبی، ئەدمیراڵێک لە هێزی دەریایی فەرەنسا و ئەندامێکی پێشەنگی کۆمەڵی هوگینۆت (پرۆتێستانتی فەرەنسی). کۆلیبی لە کوڕی کاسرین، چارلسی نۆیەم نزیک بوو و ئەو لە کاریگەرییە زیادبووەکەی لە سەر پاشای گەنج دەترسا. بۆیە ئەو ئامادەکاری کرد بۆ ئەندامێکی خانەوادەی (گیس)، کەبە بەهێزترین بنەماڵەی شاهانە بوون لە فەرەنسا، تا تیرۆری بکات.

لەگەڵ ئەوەشدا، بەشێوەیەکی نهێنی، کاسرین پلانێکی تری هەبوو. ئەو دەیویست هوگینۆتەکان سەرکۆنەی (گیس)ەکان بکەن لەبەرامبەر کوشتنی یەکێک لە سەرکردەکانیان و تۆڵە بکەنەوە. بە یەک بەرد، ئەو دوو ڕکابەرەی هەڕەشەکەری ڕادەماڵی یان بریندار دەکرد، کۆلیبی و خانەوادەی گیس. لەگەڵ ئەوەشدا، هەردوو پلانەکە بەلارێدا چوون. بکوژەکە ئامانجەکەی نەپێکا، تەنیا کۆلیبی بریندار کرد. ئەو کە کاسرینی وەک دوژمنی خۆی دەناسی، گومانێکی زۆری لادروست بوو کە ئەوە هێرشەکەی بۆ سەری ڕێکخستووە و ئەمەشی بە پاشا وت. دواجار ئەو لە تیرۆرکردنەکە شکستی هێنا و ئەو مشتومڕانەی پەیدابوون زنجیرەیەک ڕووداوی خستەوە کە شەڕی ناوخۆی لەنێوان کاسۆلیکەکان و پرۆتیستانتەکان لێکەوتەوە و سەرەنجام کۆمەڵکوژیی بوقیتەری (سەینت بارتۆلۆمیوس ئیڤ) هاتە ئاراوە، تیایدا هەزاران کەس لە پرۆتێستانتەکان کوژران.

ئەگەر پێویست بکات تۆ چنگی پشیلە یان بەردەباز لە کردارێکدا بۆ لێکەوتەیەکی گەورە بەکار بێنیت، زۆر وریا بە. لەوانەیە ئاستێکی زۆر بەلاڕێداچوونی لێ بکەوێتەوە

زۆرجار وەها زیرەکترە کە ئەو فریودراوانە لە دەستپێشخەریی بێگوناهانەتردا بەکار بێنیت کە تیایاندا هەڵەکان یان خراپ حەملاندنەکان زیانێکی جددی ناهێنەوە.

لە کۆتاییدا، ئەو ساتەوەختانە هەن کە تیایاندا نیوەگلانت یان بەرپرسیارێتیت ئەشاریتەوە، بەڵکو لەبەرانبەر هەڵەیەکدا سەرکۆنەی خۆت مەکەیت. ئەگەر تۆ دەسەڵاتت هەبێت و تیایدا سەلامەت بیت، دەبێت هەندێ جار ڕۆڵی کەسێکی حەمبار ببینیت. بە ڕواڵەتێکی حەمبارەوە، داوای لێخۆشبوون لەو کەسانە دەکەیت کە لەتۆ لاوازترن. ئەوە پیلانی پاشایە کە نمایشێکی قوربانییەکانی خۆی دەکات لە چاکەی خەڵک بەهەمان شێوە، لەکاتی خۆیدا دەشێ تۆ بتەوێ وەکو بکەری سزا دەربکەویت بۆئەوەی ترس و لەرز لەوانەی خوار خۆتدا بچەسپێنیت. لەبری چنگی پشیلە، تۆ توانای خۆت وەکو ئاماژەیەکی هەڕەشەئامێز پیشان دەدەیت. دەستگیرۆیانە کارتەکەت بەکار بێنە. ئەگەر تۆ ڕەوونوو یاری بکەیت، ترس دەگۆڕێ بۆ کینە. ئەمەش ڕاپەڕێك دەتەقێت. بەجۆرە ماو هۆوی بەکارهێنانی چنگی پشیلە- ئەمە زۆر سەلامەتترە

## یاسای ژمارە ٢٧

# یاری بکە بە پێویستیی خەڵک بۆ باوەڕهێنان، بۆ دروستکردنی هاوشێوەی شوێنکەوتووانی دینی

### حوکم

خەڵکی ئارەزوویەکی کاریگەریان هەیە بۆ باوەڕهێنان بە شتێک. ببە بە چەقە حاڵی ئەو ئارەزووە بە ڕێگەی هەستەوەریی تۆزێک، ئیمانێکی نوێ بۆ شوێنکەوتن. قسەکانت تەمومژاوی بەڵام پڕ بکە لە بەڵێن. جەخت لە ئامەزرویی بکەرەوە لەبەرامبەر ئەقڵانییەت و بیرکردنەوەی ڕووندا. هەمدیسان سروت بەخشە بە شوێنکەوتووە نوێکانت بۆ جێبەجێکردن، داوایان لێبکە بەلەبری تۆ هەمدیسان قوربانی بکەن. لە نەبوونی ئایینێکی ڕێکخراو و هۆزێکی مەزندا، سیستەمی باوەڕی تۆ، دەسەڵاتێکی بێ وێنەت بۆ دێنێت

### زانستی شارلاتانیزە

### یان چۆن تایفەیەک لە پێنج هەنگاوی ئاساندا دروست بکەیت

لە گەڕانتدا بەدوای ئەو شێوازانەی زۆرترین دەسەڵاتت بە کەمترین تەقەلا پێ دەبەخشن، تۆ دروستبوونی شوێنکەوتنێکی ئایینی ئاسان بەلاوە دەبینیتە کاریگەرترین. هەبوونی شوێنکەوتەیەکی زۆر، هەموو جۆرە ئەگەرێکی لە خشتەبردن واڵا دەکات،

شوێنکەوتەکانت بەڵام تەنیا دەتپەرستن بەڵکو ئەوان لە بەرانبەر دوژمناندا بەرگریت لێدەکەن و بەشێوەیەکی جەربەزانە کاری هێنانی شوێنکەوتەی تر دەگرنە ئەستۆ تا ئێستە پاش ئەم ئیمزا گەشەکردووە. ئەم جۆرە دەسەڵات بەرەو ئاستێکی تر بەرزت دەکاتەوە. چیتر پێویست ناکات تۆ ململانێ بکەیت یان فڕوفێڵ بەکار بهێنیت بۆ سەپاندنی ئیرادەت. تۆ خۆش دەویسترێیت و ناشێ هەڵە بکەیت.

لەوانەیە تۆ بە ئەرکێکی گەورەی بیبینیت کە شوێنکەوتووانی وەها دروست بکەیت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە ئاسانە. وەکو مرۆڤ، ئێمە پێویستییەکی تینووانەمان بە باوەڕهێنان بە شتێک هەیە، جا هەر شتێک بێت. ئەمە وامانلێدەکات بەئاسانی زاری بین. ئێمە ناتوانین بەرگەی ماوەی درێژی گومان، یان ئەو بەتاڵییە بگرین کە لەنەبوونی باوەڕبوون بە شتێکەوە دێت. دۆزێکی نوێ، ئەلیکسیرێک، پلانێکی خێرادەوڵەمەندبوون یان دوایین تەوژمی تەکنۆلۆژی یان بزاڤی هونەریمان بخەرە بەردەم ئیتر ئێمە ڕاددەکەین بۆ هەڵگرتنەوەی چەشتەیەک. بڕوانە مێژوو: پڕیژمێری تەوژمە نوێکان و ئایینزاکان کە شوێنکەوتەی جەماوەرییان بۆ خۆیان دروستکردووە. پاش چەند سەدەیەک، چەند دەیەیەک، چەند ساڵێک، چەند مانگێ؛ ئەمانە بەگشتی پووچ دێنە بەرچاو، بەڵام لەکاتی خۆیاندا زۆر سەرسەمڕاکێش و ئاسمانی و نایاب دیارن.

ئێمە، هەمیشە لە پەلەی بڕواهێنان بە شتێک، قەدیس و ئیمان لە هیچەوە دەهێنینە کایەوە. ڕێگە مەدە ئەم ئاسان بڕواهێنانە هەروا بەفیڕۆ بڕوات. خۆت بکە بە بابەتێکی پەرستن. وا لە خەڵکی بکە ئایینزایەک لەدەوری تۆدا بهێننەکایەوە.

شارلاتییە ئەورووپییە گەورەکانی سەدەکانی شازدە و حەڤدە وەستای هونەری دروستکردنی ئیمزا بوون. ئەوان هەر بەو شێوەیەی ئێستای ئێمە، لە سەروەختی وەرچەرخاندا ژیان. ئایینی ڕێکخراو پووە لە ئاوابوون بوو، زانست لە ڕابووندا بوو. خەڵکی تینووی کۆبوونەوە بوو لە دەوری دۆزێک یان ئیمانێکی نوێ. شارلاتییەکان دەستیانکردبوو بە ساغکردنەوەی ئەلیکسیری تەندروستی و قەدرە کیمیاگەرییەکان بەرەو سامانی زۆروزەبەند. بە پەڕینەوە بە شارێکەوە بۆ شارێکی تر، ئەوان لەبنەڕەتدا

ئەرکیریان ھەستبووە سەر گروپە بچووکەکان تا ئەوەی کە بە ڕێکەوت، بەسەر ھەقیقەتێکی سروشتی مرۆییدا کەوتن: چەندەی گروپی کۆبووەوەی دەوریان گەورەتر بێت، فریودانیان ئەوەندە ئاسانتر دەبێت.

شارلاتییەکە دەچووە سەر پلاتفۆرمێکی تەختە و ھەشامات لەدەوریان گرد دەبوونەوە. لە فۆرمێکی گروپدا خەڵکی ھەستیان دەبزوا و کەمتر ئەقڵیان دەکەوتە ئیش. کە شارلاتییەکە بەشێوەی تاکەکەسی قسەی لەگەڵ بکردنایە، ئەوا لەوانەبوو بە ھیچ و پووچ بیاسپێنایە، بەڵام بەھۆی ونبوون لەناو ھەشاماتدا، ئەوان کەوتنە ناو میراجێکی بەکۆمەڵی ھۆشی پەرتکراو، بوو بە شتێکی ئەستەم کە دوورابییەك بھێڵنەوە بۆ گومانکردن. ھەر کێماسییەك لە بیرۆکەکانی شارلاتیدا لە ڕێگەی ئامەرزۆیی ھەشاماتەوە شاردرابووەوە. سۆز و ئامەرزۆیی، وەکو پەتا، بەناو قەرەباڵغیدا تەرزمی بەست و ئەوان بەشێوەیەکی توندوتیژانە پەرچەکرداریان بەرانبەر ھەر کەسێك نیشاندا کە جورئەتیانکرد تۆوێکی گومان بڵاو بکەنەوە.

لەوانەیە ئامرزە فریودەرەکانی شارلاتان لەمڕۆشدا بەکێشکەر دیار بن، بەڵام ھێشتا ھەزاران شارلاتی لەنێو ئێمەدا ھەن، ھەمان شێوازی تاقیکراوە و ڕەسەنێتیە بەکاردێنی کە پێشینیانیان پێش چەند سەدەیەک تیایدا شارەزا بوون و تەنیا ناوەکانی ئەلیکسیرەکانیان گۆڕیوە و ڕواڵەتی ئایینزاکانیان مۆدێرنیزە کردووە. ئێمە ئەمڕۆکە شارلاتییانی ئەم دوایییە بە ھەموو بوارەکانی ژیاندا بەدی دەکەین- بزنس، فاشن، سیاسەت، ھونەر. لەوانەشە زۆرێکیان بە نەریتی شارلاتی شوێنکەوتوو بن بەبێ ئەوەی ھیچ ماریفەتێکیان لەمەڕ مێژووەکەی ھەبێت، بەڵام تۆ دەتوانیت سیستەماتیکتر و ڕەمەکیتر بیت. تەنیا ئەو پێنج ھەنگاوەی دروستکردنی ئایینزا پیادە بکە پێشینیانی شارلاتیمان بەدرێژایی ساڵانێک ئەسپی خۆیان تیایدا تاو داوە.

**ھەنگاوی یەکەم- بە ئەبوومزاوی بیھێڵەرەوە، بە سادەیی بیھێڵەرەوە.** بۆ دروستکردنی ڕێبازێك سەرەتا ھۆش و سەرنج ڕابکێشە. نابێ ئەمە لە ڕێگەی کردارەوە ئەنجام بدەیت

که بڵند بێتن و خوێنراوەن، بەڵکو لە ڕێگەی وشەکانەوە کە فریودەر و سەموەزاوین دەبێ قسە سەرەتاییەکانت، وتوێژەکان و گفتوگۆکانت دوور بێ کە بگریتە خۆ لەلایەکەوە بەڵێنی شتێکی گەورە و وەرچەرخێنەر و لەلایەکی ترەوە تەموەزێکی سەراپاگیر. ئەم تێکەڵەیە هەموو جۆرە حەویێکی تەموەزاوی لە گوێگرانتدا بەرجەستە دەکات کە پەیوەندیی خۆیان بەرقەرار دەکەن و ئەو شتە دەبینن کە دەیانەوێ ببینن.

بۆئەوەی تەموەزەکەت سەرنجڕاکێش بکەیت، وشەی گەرم و کاریگەر بەڵام تەموەزاوی بەکار بێنە، وشەگەلێک کە پڕن لە گەرم و گوڕی و نامەرزیی. ناوبێشانە پڕ باق و بریقەکان بۆ شتی سادە یارمەتیدەرن، وەک چۆن بەکارهێنانی ژمارە و دروستکردنی وشەی نوێ بۆ چەمکە ناڵۆزەکان ئەو کاریگەرییەیان هەیە. هەموو ئەمانە وێنای مەعریفەیەکی تایبەتمەند دروست دەکەن و ڕەنگ و ڕوویەکی قووڵبینیت پێ دەبەخشن. بەهەمان شێوە، هەوڵ بدە بابەتی ئایینزاکەت نوێ و تازە بکە، بۆئەوەی خەڵکێکی کەم بیی بیبگەن. کە لە دروستی ئەنجامدا، ناوێتەی بەڵێنە تەموەزاویی بەڵام چەمکە سەرنجڕاکێشەکان و نامەرزیی نەبێ، ڕۆحی خەڵک دەبزوێنن و گرووپێک لە دەورت هەڵدەتۆقێت.

زۆر تەموەزاوی قسە مەکەیت ئیمتیبارت نامێنێ. بەڵام زۆر مەترسیدارە زۆر دیاریکراویش قسە بکەیت. ئەگەر تۆ بە وردی سوودەکانی ئەوەی خەڵک شوێن تۆ بکەون ڕوون بکەیتەوە، ئەوا چاوەڕێی ئەوەت لێدەکرێت سوودەیی و فەنەعەتیان لا دروست بکەیت.

هۆشانی تەموەزاوییبوونەکەی، پێویستە بانگەوازی تۆ سادەش بێت. زۆربەی کێشەکانی خەڵکی هۆکاری ئاڵۆزیان هەیە. دەمرگیری قووڵ، هەکتەرە کۆمەڵایەتییە پەیوەستەکان، ئەو ڕەگ و ڕیشانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ زەمەنێکی دوور و شەڕ و گاو کردنیان قورسە. لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکێکی کەم ئۆمرەی ئەوەیان لەماردانە دەست و پەنجە لەگەڵ ئەمەدا نەرم بکەن. زۆربەی خەڵکی دەیانەوێ گوێبیستی ئەوە بن کە چارەسەرێکی سادە چارەی کێشەکانیان دەکات. توانای پێشکەشکردنی ئەم جۆرە چارەسەرییە هێزێکی زۆرت دەداتێ و شوێنکەوتەت بۆ دروست دەکات. لەبری

ڕووبکرنەوە ئالۆزەکانی ژیانی ڕاستەقینە، بگەڕێوە بۆ چارەسەر بەرایییەکانی پێشبینیمان، بۆ چارەسەرە دێهاتییە کۆنە باشەکان، بۆ دەرمانی هەزار دەردی پارانمێز

**هەنگاوی ٢: لەبەرانبەر ئیکریدا، جەخت لە بینراو و بیستراو بکەرەوە.** هەر کە هەڵکی دەستیامکرد بە کۆبوونەوە لەدەوری تۆ، دوو مەترسی خۆیان دەخەنەڕوو، بێزاری و گومان. بێزاری وا لە هەڵکی دەکات بچنە شوێنێکی تر، گومان وایان لێدەکات مەودایەک لەسەر تۆدا بهێڵنەوە بۆ ئەوەی ئەقڵانیانە لەبارەی هەر شتێک کە تۆ دەیخەیتەڕوو بیر بکەنەوە، ئەو تەمومژە لابەن کە تۆ بەشێوەیەکی ساختە دروست کردووە و ئایدیاکانت بەو شێوەیەی کە هەن ئاشکرا بکەن. تۆ پێویستت بە سەرگەرمکردنی کابرای بێزار و دوورخستنەوەی گومانداره‌کان هەیە.

باشترین ڕێگە بۆ کردنی ئەمە، شانۆ یان ئامرازی تری لەم جۆرەیە. خۆت بە شتی گرلنەی و قەمە دەورە بدە، شوێنکەوتووانت بە باق و بریقی بینراو گێژ بکە، چاویان پڕ بکە لە شتی چاوبەستنەر. ئەمە نەک تەنیا لە بینینی پووچیی ئایدیاکانی تۆ، لە کونەکانی سیستەمی بڕوای تۆ بەدووریان دەگرێت، بەڵکو سەرنجی زیاتر و شوێنکەوتووی زیاتر دەهێنێتە کایە. هانا بۆ هەموو هەستەکان ببە. بۆن بۆ لووت بەکار بێنە، مۆسیقای هێورکەرەوە بۆ بیستن بەکار بێنە، هێلکاریی ڕەنگاوڕەنگ بۆ چاو بەکار بێنە. لەوانەیە تۆ لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئامرازە تەکنۆلۆژییە نوێکانەوە تەنانەت ئەقڵیش ختووکە بدەیت بۆئەوەی ڕووکەشێکی بەهار ڕاستی سەحێنیتە پێنارەکەت- تا ئەو جێیەی کە هیچ کەسێک بە واقیعی ناحەیتە نار بیرکردنەوە. کەلتووره نامۆ-دوورەدەستەکان، نەریتە سەیرەکان بەکار بێنە بۆ دروستکردنی کاریگەرییە شانۆییەکان و بۆئەوەی شتی ئاسایی وەها پیشان بدەیت کە سەرووئاساییین.

هەنگاوی ٣: شێوەکانی بیری ڕێکخراو بەکاربێنەرەوە بۆ ئەوەی بونیادی گرووپەکە دابنێیت. شوێنکەوتنە تایبەتە ئاساکەت گەشە دەکات، ئێستا کاتی ڕێکخستنەتی ڕێگەیەک بدۆزەرەوە بۆ وەرگرتنەوە و ئاسوودەکردنی ئایینە ڕێکخراوەکان لەمێژە دەسەڵاتێکی پرسیارلێنەکراویان بۆ ژمارەیەکی زۆری خەڵکی بونیاد ناوە و لە سەردەمی هەناو سێکولاری ئێمەدا بەردەوامن لەم کارەیان. ئەمانەت ئەگەر ئایینی خۆی تا ڕادەیەک کز بوو بێت، فۆرمەکانی هێشتا دەسەڵاتیان لێوە دەردەچێت. دەشێ ڕێکخراوە قەبە و پیرۆزەکانی ئایینی ڕێکخراو بێ ڕادە بقۆزیتەوە ئەو سروتانە بۆ شوێنکەوتووانت دروست بکە لەناو هەرەمێکدا ڕێکیان بخە، لە چەند ئاستێکی پیرۆزیدا پلەبەندییان بکە و ئەو ناو و نازناوانەیان پێبدە کە ڕەنگ و بۆی ئایینیان هەیە، داوای ئەو قوربانییانەیان لێبکە کە قاسەکانت پڕ دەکەن و دەسەڵاتت زیاد دەکەن. بۆ خەمتکردنەوە لە سروشتی شێوە ئایینی گردبوونەوەکانت، وەکو پەیامبەر بدوێ و ڕەفتار بکە. دواجار تۆ دیکتاتۆر نیت، تۆ قەشەیەکیت، گورویەکیت، حەکیمێکیت، شامانێکیت، یان هەر وشەیەکی تر کە دەسەڵاتی ڕاستەقینەت لە تەمی ئایندا دەشارێتەوە.

هەنگاوی ٤: سەرچاوەی داهاتت ڕووپۆش بکە. گرووپەکەت گەشەی کردووە و تۆ فۆرمێکی کەنیسە ئاساسات تیادا بونیاد ناوە. قاسەکانت خەریکە پڕ دەبن بە پارەی شوێنکەوتووانت لەگەڵ ئەوەشدا نابێ تۆ قەت وەکو برسییەکی پارە و ئەو دەسەڵاتەی کە دەیهێنێت، ببینرێت. لەم ساتەوەختەدایە کە دەبێ سەرچاوەی داهاتت ڕووپۆش بکەیت

شوێنکەوتووانت دەیانەوێ بڕوا بکەن بەوەی ئەگەر شوێنت بکەون هەموو جۆرە شتێکی باش دەکەوێتە ناو کۆشیان. بەوەی کە خۆت بە شتی گرانبەها دەورە بدەیت دەبیتە بەڵگەیەکی زیندووی ڕاستەقینەیی سیستەمی باوەڕت. قەت وا دەرمەخە کە سامانەکەت بە ڕاستی لە گیرفانی شوێنکەوتووانتەوە دێت، لەبری ئەمە وا دەربخە کە لە حەقیقەتی مێتۆدەکانتەوە دێن. شوێنکەوتووانت هەموو جوڵە و هەنگاوێکت کۆپی

دەکەن بەو مرۆڤایەی کە ئێمە هەمان مەسەلەمان بۆ ئەوانیش دێنێت و تامەزرۆیی لاساییکەرەوەیان لەبەرسەر سروشتی شارلاتانانەی سامانەکەت کوێریان دەکات

**هەنگاوی ٥: دڵنیابێکی ئێمە لەبەرانبەر ئەوان بونیاد بنێ** گروپەکە ئێستا گەورە بووە و بەهێز دەبێت، موگناتیسێکە پارچەی زۆر و زۆرتر ڕادەکێشێت لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر وریا نەبیت، داهێزران دێنە کایەوە و کات و بێزاری گروپەکە سارد دەکاتەوە بۆئەوەی شوێنکەوتووانت بە یەکگرتوویی بهێڵیتەوە، دەبێ ئێستا ئەو شتە بکەیت کە سیستەمەکانی سوەڕ و دین کردوویانە دابیاسیکێکی ئێمە لەبەرانبەر ئەوان، دروست بکە

سەرەتا، دڵنیابەرەوە لەوەی شوێنکەوتوولت باوەڕیان بەوە هەیە بەشێکن لە یانەیەکی دوارە، بەهۆی ڕابەڵێکی ئامانجە هاوبەشەکانەوە یەکیانگرتووە. پاشان، بۆئەوەی ئەم ڕابەڵە بەهێز بکەیت، بیرۆکەی دوژمنێکی ئادیار بهێنە کایەوە کە دەیەوێ تێکتان بشکێنێت هێزێکی بێباوەڕان هەیە کە هەرچییەک دەکات بۆئەوەی ساتوەستێنێت هەر بێگانەیەک کە هەوڵ دەدات سروشتی شارلاتی سیستەمی باوەڕی تۆ دەرخات ئێستا دەتووانرێ وەکو ئەندامێکی ئەم هێزە ئادیارە وەسف بکرێت

ئەگەر تۆ دوژمنت نیی، دایبهێنە بە لەبەرچاوگرتنی دامۆڵێک بۆ کاردانەوە لەبەرانبەرید، شوێنکەوتووانت خۆیان تۆکمە دەکەن و بەبا دەبن. ئەوان دۆزی تۆیان هەیە بۆ باوەڕ پێهێنان و بێباوەڕیان هەیە لەنێوی بەن

## پەیڕەویکردن لە یاسا ١

لە ساڵی ١٦٥٣دا، پیاوێکی میلانی تەمەن بیست و حەوت ساڵ بەناوی فرانسیسکۆ گیوسێپ بۆری، دەنگەشەی ئەوەی کرد کە ڕۆشانەکی بینیووە. ئەو بەمار شارە، سووپایەوە و سەهەمووان و بە یەک بە یەکی حەلکی وت کە مانگلی سەرەت فریشتە هاتۆتە بەرچاوی و پەی وتووە کە هەڵبژێردراویت بۆ ئەوەی ببێتە کاپیتانی گشتی سوپای پاپای نوێ و سوپایەک کە جیهانی دەگرێت و دەیبوژێنێتەوە. سەرەک فریشتەکە

قسەی زیاتری کردبوو و وەبووی بۆری کە ئێستا توانای بینینی ڕۆحی خەڵکی هەبوو بەرووبی بەردی فەیلەسوف دەدۆزییەوە– مادەیەکی لەمێژ خوازراو کە دەتوانێ ناسنی ئاسایی بگۆڕێت بۆ ئاڵتون. دۆست و ئاشنایان کە گوێبیستی ڕوونکردنەوەی ڕوونیاکە بوون لەلایەن بۆرییەوە و شایەتی ئەو گۆڕانە ببوون کە بەسەریدا هاتبوو، گاڵتەکراو بوون، چونکە بۆری پێشتر خۆی بۆ ژیانی شەراب، ژنان و قومار تەرخان کردبوو. ئێستا ئەو دەستبەرداری هەموو ئەمە ببوو و خۆی هاویشتبووە ناو بەدوتوێکردنی کیمیاگەری و قسەکردن لەسەر ڕۆحانییەت و فەلسەفەی مادیار

وەرچەرخانەکە ئەوەندە لەپڕ و پەرجوئاسا بوو، و قسەکانی بۆری ئەوەندە پڕبووی لە نامەرووبی کە دەستیکرد بە دروستکردنی شوێنکەوتە. بەداخەوە دادگای پشکنینی ئیسپانیاش پێی زانی– ئەوان هەر کەسێکیان دادگایی دەکرد کە لە بواری نادیارە تێهەڵچوویایە– بۆیە ئەو ئیتاڵیای جێهێشت و بە ئەورووپادا گەڕا، لە ئەمستەردام بۆ هۆڵەندا، و بەهەموواندا دەیگوت کە "هەر کەسێك بەدوای من بکەوێت هەموو خۆشییەکی پێدەدرێت" بۆری لە هەر کوێیەك بمابایەوە، شوێنکەوتەی بەکێش دەکرد. میتۆدەکەی ئەو سادە بوو: باسی ڕوونیاکەی خۆی دەکرد کە تا دەهات تیروتەسەلتر دەبوو و پێشنیاری ئەوەی دەکرد "بڕاشتنە ناو" ڕۆحی هەر کەسێك کە بڕوا بەم دەکات (و ئەوانیش زۆر بوون). لە حاڵەتێکی بەڕواڵەت بێوەهۆشدا ئەو بۆ ماوەی چەند خولەکێك سەرنجی دەدایە شوێنکەوتەی نوێ، پاشان دەنگەشەی ئەوەی دەکرد ڕۆحی کابرا، ئاستێکی ڕۆشنبووەوە و توانای بەرنامەتی ڕۆحی بینیبووە. ئەگەر ئەو شتەی ئەو دەیبینی مژدەبەخش بووایە، ئەو کەسەکەی دەخستە سەر سیستەمی شوێنکەوتووانی، کە لەڕاستیدا شەرەفێك بوو

ڕیسوەکە شەش ئاستی هەبوو کە شوێنکەوتووان بە گوێرەی ئەو شتەی بۆری لە ڕوحیاندا تێبینی دەکرد، پێیان دەبەخشرا بە کار و دڵسۆزیی ئەوانەوە بۆ ئایینەکە ئەوان دەیانتوانی بە بڕوانامەیەکی بەرزەوە تەحەروج بکەن. بۆری– کە ئەوان پێیان دەوت "حەبابیان" و "دکتۆری گەردوونی" داوای نوێنەریی سوێندی هەژاری نەدەکردن

دەبووایە هەموو ئەو کالا و پارەیەی کە ئەوان هەیانبوو رادەستی ئەوی بکەن. بەلام ئەوان لارییان نەبوو لە رادەستکردنی موڵکەکانیان، چونکە بۆری پێی وتبوون "من بەرووبی ئوێزینەوە کیمیاییەکانم دەگەیەنمە ئەنجامگیرییەکی دڵخۆشکەر لە رێگای دۆزینەوەی بەردی فەیلەسوف و لە رێگەی ئەم ئامرازەوە ئێمە هەموومان ئەوەندەی سامانی ئالتوونمان دەبێت"

بە لەبەرچاوگرتنی سامانە کەڵەکەکراوەکەی، بۆری دەستیکرد بە گۆڕینی ستایلی ژیانی. دیارترین شوقەی لە شار بەکرێ دەگرت کە بۆ ماوەیەکی کاتی تیایدا دەمایەوە، بەو مۆبیلیات و کەرەستە نایابانە دەیڕازاندەوە کە کڕی کردبوویەوە. ئەو بەناو شاردا بە ئەسپ و عەرەبانەیەک رێی دەکرد کە پڕ بوو لە حشل. ئەو فەت بۆ ماوەیەکی زۆر سرێژ لە شوێنێک نەدەمایەوە و کاتێک بڕ دەبوو دەیگوت دەچم پێمی زیاتر بۆ ئاو خەڵکەکەم کۆ دەکەمەوە و لێرەوە بە وسوونی، ناوبانگی زیاتریش دەبوو. ئەو بووە کەسێکی بەناوبانگ، هەرچەندە لە راستیدا فەت تاکە شتێکی کۆنکرێتی ئەنجام نەدەبوو

لە سەرانسەری ئەوروپادا، خەڵکانی کەم ئەندام، کوێر و دەستەوەستان دەهاتنە دیدەنی بۆری. لەبەرئەوەی قسەی ئەوە بڵاو ببووەوە کە توانای چاککردنەوەی هەیە ئەو لەبەرانبەر خزمەتگوزارییەکانیدا داوای پارەی نەدەکرد کە ئەمەش دڵگیرتری دەکرد و لەراستیدا هەندێ کەس بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە لەم یان لەو شارەدا پەرجووی چاککردنەوەی ئەنجامداوە. کەسە هەر بەنوایەوە بوو و نە حاسوو و گومڕایی تۆمەتباری دەکرد و کاردانەوەی بۆری لەبەرانبەر ئەمەدا تەنیا بێدەنگی بوو. ئەمەش هەر ناوبانگی زیاتر دەکرد و شوێنکەوتووانی گەرم و گوڕتر دەکرد. دواجار تەنیا پیاوە گەورەکان دەچەوسێنرێنەوە، کێ لەسەردەمی خۆیدا لە عیسا تێدەگەیشت؟ پێویستی نەدەکرد بۆری هیچ شتێک بڵێت— ئێستا شوێنکەوتووانی پاپایان بە دەحاڵ ناودێر دەکرد

ئیتر بەم شێوەیە هێزی بۆری هەر پەرەی دەسەند تا ئەوەی رۆژێک لە پڕاو شاری ئەمستەردامی جێهێشت (کە بۆ ماوەیەک لەوێ نیشتەجێ ببوو)، بە بڕە پارەیەکی زۆری وەرگیراو و ئەڵماسەوە رایکرد کە پێی بەخشرابوون (ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە

دەیتوانیت کیماسییەکانی ئەلماسەکان لە ڕێگەی هێزی بە بەرەکەتی ئەقڵی لاببات)
ئێستا ئەو سەرقاڵی ڕاکردن بوو. دواجار دادگای پشکنین گرتی و بۆ ماوەی بیست ساڵی
موڵتوی ژیانی لە ڕۆم بەند کرا. بەڵام باوەڕ بە تواناکانی ئاپیەزاکەی ئەوەندە بەهێز بوو
کە تا ڕۆژی مردنیشی لەلایەن باوەڕدارانی دەوڵەمەند، لەوانەش شاژنە کریستینای سوید
سەردانی دەکرا. ئەم سەردانکەرانە کە پارە و مادەیان بۆ دابین دەکرد ڕێگەیان پێدەدا
بەردەوام بێت لە توێژینەوەکەی بۆ بەردی بەدووروەی فەیلەسوف.

## لێکدانەوە

پێش ئەوەی ڕێبازەکەی پێکبهێنێت، پێدەچێت بیری ڕێکەوتی تۆزینەوەیەکی گرنگی
کردبێت. پاش ماندوو بوون لە ژیانی سەرەڵایی، بڕیاری داوە وار بێنێت و خوو بداتە بواری
ئادیان، کە هیوایەتێکی ڕاستەقینەی بوو. دەبێ ئەو تێبینی ئەوەشی کردبێت کە کاتێک
ئاماژەی بە ئەزموونێکی ڕۆحانی داوە (نەک بڕست لێبڕانی جەستەیی) وەک
سەرچاوەیەکی گۆڕانەکەی، خەڵکی هەموو چینەکان ویستوویان گوێبیستی زۆرتر بن بە
درککردن بەو دەسەڵاتەی کە ئەو دەیتوانی لەڕێگەی حەزی بینین بە گۆڕان بۆ شتێکی
دەرەکی و پارێنیز بەدەستی بێنێت، بە ڕۆشنیا بەرهەمهێنراوەکانی خۆیەوە دوورتر
ڕۆیشت. چەندەی ڕۆشنیاکە گەورەتر بوو و چەندەی ئەو قوربانیانەی داوی دەکرد زۆرتر
بوو، ئەوەندە چیرۆکەکەی باوەڕپێکراوتر و سەرسوڕهێنەرتر دەبوو.

بیرت بێت، خەڵکی بایەخ بە حەقیقەت لەبارەی گۆڕان نادەن. ئەوان نایانەوێ
گوێبیستی ئەوە بن کە ئەمە لە کاری سەختەوە هاتووە، یان لە هەر شتێکەوە کە سواوە
وەک بڕست لێبڕان، بێزاری یان هەمۆکێ. ئەوان تینووی باوەڕهێنان بە شتێکی
ڕۆمانسیین، ئەوەندیو دنیایی. ئەوان دەیانەوێ گوێبیستی فریشتەکان و ئەزموونەکانی
دەرەوەی هەستەکان بن. خۆشی لێ ببینن. ئاماژە بە سەرچاوەیەکی ڕۆحانی
گۆڕانکارییەکی کەسی بدە، مۆراحی سەروو سروشتی لێ بدە، ئیتر لێرەوە شێوە
ئایینزایەک دروست دەکەیت و شوێنکەوتەت پەیدا دەبن. خۆت لەگەڵ پێویستییەکانی

**لێکدانەوە**

شوپاچ ژیانی پیشەیی خۆی وەکو دکتۆرێکی ئاسایی گوند دەستپێکردبوو. ئەو هەندێ جار لە کارەکانیدا چارەسەری دنهانییانەی بەکاردەهێنا کە لەگەڵیاندا گەورە ببوو و بە پراڵەت هەندێ ئەنجامی بەدی دەکرد، چونکە ئەم تێکەڵانە و فۆرمە سروشتییەکانی چکۆڵەوە بوونە پسپۆڕیی ئەو. لە ڕاستیشدا فۆرمە سروشتییەکی چکۆلەوەی کاریگەریی سایکۆلۆژیی قووڵی لەسەر نەخۆشەکانی هەبووی. لەو شوێنەی کە دەرمانە ئاساییەکانی سەردەم ترس و ئازاریان دروست دەکرد، چارەسەرەکانی شوپاچ ئاسوودەبەخش و ئارامبەخش بوون. باشبوونی سەرەنجام لە میزاجی نەخۆشدا برگەیەکی گرنگ بوو لەو چارەسەرانەی کە ئەو دەیهێنانە کایەوە. نەخۆشەکانی باوەڕێکی قووڵیان بە شارەزایەتییەکانی ئەو هەبوو بەجۆرێک کە حزیان دەدایە دەست ئیرادەی چاکبوونەوە. لەبری گاڵتەکردن بە ڕووبکردنەوەی نائەقڵانییانە بۆ نەخۆشییەکانیان، شوپاچ هاپیزکۆندریای ئەولی بەکارهێنا بۆ ئەوەی وایشان بدات ئەم چارەسەرێکی گەورەی پێشکەش کردوون.

حاڵەتی دکتۆری شاخ وانەیەکی بەرجەمان دەدلێ لەمەڕ دروستکردنی شوێنکەوتنی ئاییزایی. یەکەم، پێویستە تۆ ڕێگەیەک بدۆزیتەوە بۆ هێنانەناوی ئیرادەی خەڵک، بۆئەوەی باوەڕیان بە دەسەڵاتەکانی تۆ بایی ئەوەندە بەهێز بکەیت کە وێنای هەموو جۆرە سوودێک بکەن. باوەڕیان تایبەتمەندییەکی خۆشسودەکەری هەیە، بەڵام دەبێ تۆ هەست بکەیتەوە کە ئەوە تۆیت، نەک ئیرادەی حزبان، کە وەک بکەری وەرچەرخان دەبینرێت. باوەڕەکە، دۆزەکە یان ئەو فەنتازیایە بدۆزەوە کە وایان لێدەکات بە سۆزێکەوە باوەڕ بێنن و ئیتر ئەوان وێنای بەشەکەی تری دەکەن؛ وەکو چارەسەربەخش، پەیامبەر، بلیمەت هەرچییەک حەز بکەیت، دەتپەرستن.

دووەم، شوپاچ هێزی ئاهەنگیی باوەڕمان بە سروشت و بە سادەیی فێر دەکات. لە ڕاستیدا، سروشت پڕە لە برێکی زۆری ئەو شتەی کە تۆقێنەرە — ڕووەکی ژەهراوی،

ئاژەڵە درندەکان، کارەساتە لەناکاوەکان، ئافاتەکان، باوەڕبوون بە چاکبوونەوە، تایبەتمەندیی ئاسودەبەخشی سروشت بە ڕۆڵی ڕۆمانسیەتێك، ئەفسانەیەکی ڕەنگ داکوتاوە. بەڵام هانابردن بۆ سروشت دەسەڵاتێکی گەورەت دەداتێ، بەتایبەت لە سەردەمە پڕ فشار و ئاڵۆزەکاندا.

## پەیڕەویکردنی ٣

لە ١٧٨٨، لە تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵیدا، دکتۆر و زانا فرانز مەسمەر لە دووڕیانێکدا بوو. ئەو پێشەنگ بوو لە توێژینەوەی ماگنەتیزمی ئاژەڵ– ئەو باوەڕەی کە دەڵێت ئاژەڵان مادەی ماگنەتیکیان تێدایە و دکتۆر یان پسپۆڕ دەتوانن چارەسەری پەرجووئاسا لە ڕێگەی کارکردن لەسەر ئەم مادە بارگاوییە بخەنەوە– بەڵام لە ڤیەننا، ئەو شوێنەی ئەو لێی دەژیا، تیۆرەکانی لەلایەن دەزگای پزیشکییەوە پەڵەپەڵەکی سەرکۆنە و سووکایەتی بووبوونەوە. لە چارەسەرکردنی ژنێدا بۆ گەشکە گرتن، مێسمەر بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ژمارەیەك چارەسەری ئەنجامداوە، پڕ شانازی ترین دەستکەوتی، گەڕاندنەوەی بینایی کچێکی کوێر بوو. بەڵام دکتۆرێکی تر کە کچەکەی پشکنی، وتی وەك جاران کوێرە، هەڵسەنگاندنێك کە خودی کچەکە باوەڕی پێبوو. مێسمەر بۆچوونێکی دژی دەربڕی و وتی دوژمنەکانی کەوتوونەتە خۆ تا لە ڕێگەی ڕاکێشانی بەلای خۆیاندا، ناوی بزڕێنن. ئەم بانگەشەیە تەنیا ڕیسواییەکی زۆرتری لێکەوتەوە. بە ڕوونی دیار بوو کە ڤیەننایی هۆشیارەکان شایەتحاڵی خراپ بوون بۆ تیۆرەکانی و بۆیە ئەو بڕیاریدا بچێتە پاریس و سەرلەنوێ دەست پێبکاتەوە

پاش گرتنی شوقەیەك لە شارە نوێکەی، مێسمەر ئەحوالی ڕازاندییەوە. شوقە و خانی پڕ نەخش و نیگار، هەستێکی ئایینی دەبەخشی و ئاوێنەکانی لەسەر هەموو دیوارەکان کاریگەرییەکی هیپنۆتیکی بەرهەم دەهێنا. دکتۆر بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لە شوقەکەیدا نمایشی هێزەکانی موگناتیزمی گیانەوەری دەخاتەڕوو، بانگی نەخۆش و هەمۆکێنەکانی دەکرد هەست بە هێزەکانی ئەو موگناتیزمە بکەن. پاریسییەکانی

هەموو جیبەکان (بەڵام بەتایبەت ژنان کە زیاتر بەلای بیرۆکەکەدا بەکێش دەبوون) بەرووبی پارەیان دەدا بۆ چوون و شایەتحاڵبوونی ئەو پەرجووەی مێسمەر بەڵێنی دەدا

لەناو شوقەکەدا بۆنی شکۆفەی پرتەقاڵ و بۆنی بخوورێ بەناو ژاکەکاندا بڵاو دەبووەوە بەکاتێکدا کە موراجیعەکان دەهاتنە ناو سالۆنەوە کە تیایدا عاپلەکان پرویاندەدا، گوێبیستی مۆسیقای قیسارە و دەنگی خەرمێنەری مێیەیەک دەبوون کە لەژوورێکی تەنیشتەوە بوو. لە ناوەڕاستی سالۆنەکە کۆنتەینەرێکی هێلکەیی درێژ هەبوو ئاوێکی تیا بوو بە قسەی مێسمەر مەگناتیزە بوو. لە کونەکانی قەپاغی کۆنتەینەرەکەوە تووڵی درێژی جولاوی ئاسن هەبوون سەردانکەران ڕێنمایی دەکران کە لەدەوری کۆنتەینەرەکە دانیشن، ئەم تووڵە ماگناتیزەبووانە لەسەر ئەو بەشەی جەستەیان دابنێن کە ئازار یان کێشەی هەبوو و ئەوەندەی دەکرێ لە نزیک یەکتری دانیشن بۆ ئەوەی هێزە موگناتیسییەکە لەنێوان جەستەکاندا گوزەر بکات

مێسمەر ژوورەکەی جێدەهێشت و "هاوکارە موگناتیزەکارەکان" - کە هەموویان پیاوانی قۆز و سەرنجڕاکێش بوون- بە کەمۆڵەی ئاوی موگناتیزەکراوەوە دەهاتنە ناوەوە کە بەسەر نەخۆشەکانیاندا دەپرژاند و شلە سارێژکەرەکانیان بەسەر جەستەیاندا دەهێنا و پاش کەمێک شاگەشکەییەک ژنەکانی دادەگرت، هەندێکیان هەنسکیان دەدا و هەندێکیان قژیان دادەرنی و ئەوانیتر بەشێوەیەکی هیستری پێدەکەنین. لە گەرمەی ئەو هەستانەدا مێسمەر بە ڕۆبێکی ئاوریشمی و بەنەفشێکی گوڵ گوڵاوییەوە و بە تووڵێکی مەگنەتیکەوە دەهاتە ژوورەوە. ئەو کە بەدەوری کۆنتەینەرەکەدا دەهات و دەچوو، بە تووڵەکە بە هێواشی لە جەستەی نەخۆشەکانی دەدا تا هێمنییان بۆ دەگەڕایەوە. دوایی هەندێ لە ژنەکان باسیان لە هێزێکی نامۆ و ڕوانینێکی نامۆ لەو کابرایەدا دەکرد کە هێزە موگناتیسییەکەی لە جەستەی ئەواندا کپ دەکرد

لەپاش چەند مانگێکی گەیشتنی بۆ پاریس، مێسمەر بووە بابەتێکی بەرەودار پشتیوانانی بریتی بوون لە خودی ماری ئەنتوانێتی شاژنی فەرەنسا و ژنی لویسی

شاره هەروەك لە ڤییەنا، لەلایەن دامەزراوەی سەرەكی پزیشكییەوە ئیدانە كرا، بەلام كێشە نەبوو بەخۆشی و خوێندكارانی شوێنكەوتەی پارەی باشیان دەدایە

میسمەر تیۆرەكانی فراوان كرد و گەیشتە ئەو باوەڕەی بلێت دەشێ لە ڕێگەی هێزی ماگنەتیزمەوە هەموو مرۆڤایەتی بخرێتە ناو هارمۆنییەوە، چەمكێك كە كاریگەرییەكی گەورەی لە ماوەی شۆڕشی فەرەنسیدا هەبوو. ژمارەیەكی میسمەریزم لە زۆر شاری وڵاتدا بڵاو بووەوە، "كۆمەڵەكانی هارمۆنی" هەڵتۆقین بۆ ئاشكراكردنەوەی ماگنەتیزم. ئەم كۆمەڵانە دواجار بەدناو بوون؛ ئەوان لەلایەن ئەو چێژگەرایانەوە ڕێبەرایەتی دەكران كە دوایی جەلەسەكانیان دەگۆڕی بۆ جۆرێكی لە سێكسی بەكۆمەڵ.

لە گەرمەی بەرەوداڕێتی میسمەردا، كۆمسیۆنێكی فەرەنسی ڕاپۆرتێكی لەسەر بنەمای ساڵانی تێستكردنی تیۆرەی مەگناتیزمی گیانەوەری بڵاو كردەوە. ئەنجامگیرییەكە ئەمە بوو، كاریگەرییەكانی مەگناتیزم لەسەر جەستە بە ڕاستی لە جۆرێك لە هیستریای گرووپ و پێشنیاری خۆبەخۆ هاتن. ڕاپۆرتەكە بەباشی دۆكیومێنت كرابوو و ناوبانگی میسمەری لە فەرەنسا ڕزاند. ئەو وڵاتەكەی جێهێشت و گۆشەگیر بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، تەنیا پاش چەند ساڵێك، لاساییكەرەوان لەسەرانسەری ئەورووپا و ڕێبازی میسمەریزم جارێكی تر بووژا بووەوە، باوەڕپێراسی لەهەموو كات زۆرتر بوون.

## لێكدانەوە

دەكرێ ژیانی پیشەیی میسمەر بكرێت بە دوو بەشەوە. كاتێك هێشتا لە ڤییەنا بوو، ئەو بەڕوونی باوەڕی بە ڕاستوویی تیۆرەكەی هەبوو، و هەموو ئەوەی لە تواناندا بوو كردی بۆ سەلماندنی. بەلام نائومێدییە زیادبووەكەی و ناڕەزامەندی هاركارەكانی وایلێكرد ستراتیژێكی تر بگرێتە بەر. سەرەتا چووە پاریس، كە لەوێ كەس نەیدەناسی و لەوێ تیۆرە نێروتەسەل و چرپرپەكان باشتر شوێنی خۆیان دەكردەوە. پاشان ئەو هانای بردە بەر خۆشەویستیی فەرەنسی بۆ شانۆ و نمایش، شوێنەكەی كردە جۆرێك لە جیهانی سیحری كە دۆخێكی بارگاویكەری لوت، چاو و گوێچكە، مشەرییەكانی بێهۆش

کرد. ئەمەش زۆر گرنگتر، لە ئێستا نەماوە، ئەو کردارەکەی تەنیا بەسەر گروپدا پیادە دەکرد. گروپەکە ئەو رەسمیەتەی ئامادە کرد کە تیایدا مەگناتیزم کاریگەری گونجاوی دەبوو، باوەڕداریێک ئەویتری تووش دەکرد، هەر تاکێکی گومانداری سەرسام دەکرد.

لێرەوە مێسمەر لە پشتیوانێکی بەکلاییبووەوەی ماگنەتیزم پەرییەوە بۆ ڕۆڵی شارلاتییەک کە هەموو بەڵگەیەک بەکاردەبێت بۆ کارتێکردنی جەماوەر. گەورەترین فێڵی یاریکردن بوو لە سێکسوالیتی کپکراو کە لەژێر ڕواڵەتی هەر گروپ و کۆمەڵەیەکدا بڵق دەدات. لە گروپێکدا تینووێتی بۆ یەکبوونی کۆمەڵایەتی، ئامەزرۆییەک کە بە شارستانیەت کۆنترە، هاوار دەکات بۆ بێداربوونەوە. لەوانەیە ئەم ئارەزووە لەژێر تۆزێکی یەکخەردا هەڵمژرێت، بەڵام لەژێریدا سێکسوالێتەیەک هەیە کە شارلاتی دەزانێت چۆن بەکاریبهێنێت و بۆ مەبەستی خۆی بیقۆزێتەوە.

ئەمە ئەو وانەیەیە کە مێسمەر فێرمان دەکات مەیلمان بۆ گومان، ئەو دووربینییەی کە ڕێگەمان بۆ خۆش دەکات بیر بکەینەوە، دەشکێنرێت کاتێک دەچینە پاڵ گروپێک. گەرم و گوڕی گروپێک تاکەکەسی گومانداز سەرنگوون دەکات. ئەمە ئەو هێزەیە تۆ لە ڕێگەی دروستکردنی ڕێبازێکەوە بەدەستی دێنیت. هەروەها، بە یاریکردن بە سێکسوالیتی کپکراوی خەڵک، تۆ بەرەو ئەوە ئاراستەیان دەکەیت کە هەستە بەجۆش هاتووەکانیان لەگەڵ نیشانەکانی بەهێزیی ڕۆحانیی تۆ تێکەڵ بکەن. تۆ دەسەڵاتێکی بێ وێنە بەرەو بەدەست دێنیت کە کار لەسەر ئارەزووی بەدیبەهاتووی خەڵک بۆ جۆرێک لە یەکبوونی فرەپەیوەندیی سۆزی و نابیی مکەمت.

پێویستە بێت کە کاریگەرترین ڕێبازەکان ئایین و ڕاست تێکەڵ دەکەن. دوینی هیوایەت یان ئاراستەی تەکنۆلۆژی وەربگرە و لەگەڵ تۆزێکی پەیڕەو یان ئیمانێکی ڕۆحەنی، شێوەیەکی نوێی چاککردنەوەی نەخۆشی، تێکەڵی بکە. لێکدانەوەکانی خەڵک بۆ ڕیبارە ئاینەکەی تۆ بڵاو دەبنەوە و ئەوان ئەو دەسەڵات و هێزە بە تۆ دەبەخشن کە قەت بە خۆتەوە نەتبینیووە.

**وێنە:** مرگناتیس. هێزێکی نەبینراو ئەو شتانە بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت کە بەتۆرەی خۆیان دەبنە موگناتیسی و پارچەی تر بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن. بەڵام موگناتیسە

نهێنییەکە لایە و هەموو پەرتەوازە دەبێت. ببە بە مۆرگانتەش، ئەو هێزە بەنیمرازەی کە ویناکانی خەڵک ڕادەکێشێت و پێکەوە گرێیان دەداتەوە، هەر کە ئەوان لە دەوری تۆ کۆ بوونەوە، هیچ هێزێک ناتوانێت دڵیان بڕفێنێت

**دەسەڵات:** شارلاتی دەسەڵاتی مەزنی خۆی لە ڕێگەی والاکردنی ئەگەرێک بۆ مرۆڤەکان بۆ باوەڕهێنان بەو شتەی هەمیشە دەیانەوێ باوەڕی پێ بێنن، بەدەست دێنێت. کەسانی حەزش باوەڕ ناتوانن لە دوور ڕاوەستن، ئەوان لەدەوری کارییەکەری سەیر و سەمەرەکان کۆ دەبنەوە، دەچنە ناو پەرشنگە ڕووناکییە کەسییەکەیەوە، بە سەرپەرزییەکی سەنگینەوە خۆیان دەدەنە دەست وەهم، وەکو مێگەل. (گرێت دی فرانسیسکۆ)

**پێچەوانەبوونەوە**

هۆکارێک بۆ دروستکردنی شوێنکەوتن ئەوەیە زۆرجار فریودانی گروپێک ئاسانترە لە فریودانی تاکەکەسێک و دەسەڵاتێکی زیاترت دەداتێ. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمە مەترسی مەگەڵدایە: ئەگەر لە هەر ساتێکدا هەر گروپێک پێت بزانێ، ئەوا خۆت نەک لەبەرانبەر یەکێکی فریودراو بەڵکو لەبەرانبەر حەشیمەتێکی تووڕەدا دەبینیتەوە کە بە ئامەزرۆیی شوێنکەوتنەکەی پێشوویەوە پارچەپارچەت دەکات. شارلاتییەکان بە بەردەوامی ڕووبەڕووی ئەم مەترسییە بوونەتەوە و هەمیشە ئامادە بوون لە شار دەرچن کاتێک بەشێوەیەکی حەتمی ڕوون بۆتەوە کە ئێلیکسیرەکەیان کار ناکات و بیرۆکەکانیان ساختەیە. ئەگەر لەم دەرچوونەیاندا خاو بوونن ئەوا ژیانیان لەسەر داناوە. لە یاریکردن بە حەشامات، تۆ یاری بە ئاگر دەکەیت و دەبێ بەبەردەوامی چاوێکت لە هەر پریشکێکی گومان، هەر دوژمنێک بێت کە حەشامات ڕووبەڕووی تۆ دەکاتەوە. کاتێک تۆ یاری بە هەستەکانی جەماوەر دەکەیت، دەبێ بزانیت چۆن خۆت بگونجێنیت، دەستبەجێ خۆت لەگەڵ هەموو مەزاجەکان و ئارەزووەکاندا بگونجێنیت کە گروپێک بەرهەمی دێنێت. سیخوڕ بەکار بێنە، لەسەری سەرەوەی هەموو شتێک بە و جانتاکانت پڕ بکە

## یاسای ژمارە ٢٨

# بە بوێرییەوە بچۆرە ناو کردارەوە

**دوکە**

*ئەگەر تۆ لە کردارێک دڵنیا نەبیت، مەڕلی بۆ مەدە. گومانەکان و دوودڵییەکان کار دەکەنە سەر هێنەجێکردنی شەرمی مەترسیدارە. باشترە بە ئازایەتییەوە بچیتە ناو کردار. هەر هەڵەیەک کە لە ڕێگەی بوێرییەوە ئەنجامی دەدەیت بە بوێریی زیاترەوە ڕاست دەکرێتەوە. هەمووان سەرسامن بە ئازا، کەس ڕێز لە دەستەمۆ ناگرێت.*

**ئازایەتی و ڕاڕایی. بەراوردێکی سایکۆلۆژیی کورت**

ئازایەتی و ڕاڕایی کاردانەوەی جیاوازیان بەرامبەر دەکرێت لە ئامانجەکانیاندا. ڕاڕایی تەگەرە لەسەر ڕێگەت دادەنێت، ئازایی ئەبڕیان دەکات. هەر کە تۆ لەمە تێگەیشتیت، بە شتێکی جەوهەری دەزانیت شەرمیی سروشتیی خۆت کۆنترۆڵ بکەیت و پراوەی هونەری ئازایەتی بکەیت. ئەمانەی خوارەوە لە کاریگەرییە سایکۆلۆژییە هەرە دیارەکانی بوێری و شەرمین

**درۆ چەندە بوێرانە بێت باشترە.** ئێمە هەموومان حاڵی لاوازمان هەیە و هەوڵەکانمان قەت پێرفێکت نین. بەڵام بە چوونە ناو کردارەوە بە شێوەیەکی بوێرانە، کاریگەرییەکی جادوویی شاردنەوەی کەماسییەکانی دەبێت. ساختەچییەکان دەزانن درۆ چەندێک

ئازاناماتر بێت، ئەوەندە قەناعەتهێنەر دەبێت. چەندەی چیرۆکەکە نوێتر بێت ئەوەندە حێ متمانەتر دەبێت، هۆش و سەرنج لە ناسیکێری و ناڕێکیەکانی لادەدات کاتێک تەلەکەیەک هەڵدەچنێت یان دەچێتە ناو حوزنێک لە دلۆڤسانەوە، دوورتر لەوەی پلانت بۆ داناوە مرۆ

**شێرەکان دەوری نێچیری شلەژاو دەدەن.** خەلکی هەستی شەشەمیان هەیە بۆ لاوازییەکانی ئەوانیتر. ئەگەر لەیەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەدا، ئامادەییت بۆ سازش و پاشەکشە پیشان بدەیت، ئەوا شێر لەو کەسانەشدا بەهەبەر دێنیت کە هەرج نییە بینووی خوێنیش بن. هەموو شتێک پەیوەستە بە تێڕوانینەوە و هەر کە تۆ وەکو جۆرە کەسێک بیبرابیت کە بەحیرایی دەچێتە حاڵەتی بەرگرییەوە، کە ئامادەیی تیدایە دەستان بکات و رازییە، ئەوا بێ بەزەییانە بیبە و بەردەوام پێدەکرێنت.

**بوێری ترس دەبڕوێنێت، ترسیش دەسەڵات دروست دەکات.** هەنگاوە بوێرەکان بەهێزتر و گەورەترت دەکەن لەوەی کە هەیت. ئەگەر لەپڕێکا بێت، بە پێلەزگێ و بە حیرایی مارێک، ئەمە ترسیکی زۆرتر دەخولقێنێت. بە ترساندن لە ڕێگەی جوڵەیەکی ویرانەوە، تۆ پێشینەیەک بونیاد دەنێیت. لە هەر ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دواتردا، خەڵکی لە ترسی جوڵەی دواتری تودا، لە حاڵەتی بەرگریدا دەبن.

**بڕینی نیوەی ڕێگە بە دوودڵییەوە، هەڵکەندنی قەبرێکی قووڵترە.** ئەگەر تۆ بە دوولەحزبوونێکی کەمتر لە کشنگیرەوە بچیتە ناو کردارەوە، ئەوا بەگەرە دەخەیتە سەر ڕێگەی خۆت. کاتێک کێشەیەک سەرهەڵدەدات ئەوا سەرگەردان دەبیت، لەو شوێنانەی بەدوای بژاردەدا دەگەڕێیت کە هیچ مژارەیەکی لێ نییە و بەردەوام کێشەی زۆرتریش دروست دەکەیت. بە کشانەوە لە ڕاوچی، کەرویشکی ترسنۆک بەشێوەیەکی ئاسانتر دەکەوێتە ناو تەڵەکانییەوە

**ڕاڕایی کەلێن دروست دەکات، بوێری ئاپاهێنێت.** کاتێک تۆ کات بۆ بیرکردنەوە دەگریت، کەلێنێک دروست دەکەیت کە ڕێگە بۆ ئەوانیتر خۆش دەکات کاتی

بیرکردنەوەیان هەبێت. ترسنۆکیی تۆ بە ورەیەکی سەیرەوە تووشی خەڵک دەبێت،
شەرمەزاری دەهێنێتەوە. گومان لە هەموو لایەکانەوە سەرهەڵدەدات

بوێری ئەو کەلێنانە لەناو دەبات. جێگرایی جوڵە و ورەی کردار، هیچ پاشتاییەک بۆ ئەوانیتر ناهێڵێتەوە تا گومان و بێکارلێنیان هەبێت. لە فریودانیدا، ڕاڕایی گوشندەیە- یا لە فریوبازییەکەت دەکات بەئاگا بێت لە نیازەکانت. هەنگاوی بوێرانە تاجی سەرکەوتن لەسەر فریو دادەنێت. کات بۆ تێڕامان ناهێڵێتەوە

ئازایەتی لە مێگەل جیات دەکاتەوە. بوێری، ئامادەبیت پێ دەبەخشێت و وات لێدەکات گەورە دەرکەویت. ترسنۆک دەبێتە ڕەسمی سەر دیوار. ئازا سەرنج ڕادەکێشێت و ئەو شتەی سەرنجڕاکێشە، دەسەڵاتیش ڕادەکێشێت. ئێمە ناتوانین چاومان لەسەر بوێر لابدەین- ئێمە ناتوانین چاوەڕێ بین تا هەنگاوی ئازایانەی دواتر ببینین.

## پەیڕەوی لە پاساکە

### پەیڕەوی ١

لە مایسی ١٩٢٥دا، پێنج لە هەرە سەرکەوتووترین مامەڵەکارانی پیسی سکراپ بۆ کۆبوونەوەیەکی "ڕەسمی" بەڵام تەواو نهێنی" لەگەڵ جێگری بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی پۆستە و تەلەگراف لە هۆتێل کریلۆن، پاشان گرانبەهاترین هۆتێل لە پاریس بانگهێشت کران. کاتێک بزنسمانەکان گەیشتن، ئەوە بەڕێوەبەری گشتی خۆی بوو، مۆنسیۆ لوستیگ، کە لە ژووری سەرەوە بە قاتێکی شیکەوە لەگەڵیاندا کۆبووە

بزنسمانەکان هیچ بیرۆکەیەکیان نەبوو لەمەڕ ئەوەی کە بۆچی لەم کۆبوونەوەیەدا بانگ کراون و ئەوان پرسیارێ تێدایان لا دروست ببوو. پاش چەند خواردنەوەیەک، بەڕێوەبەر ڕوویکردەوە. ئەو وتی "بەڕێزان، ئەمە بابەتێکی گرنگە کە پێویستی بەنهێنیی تەواو هەیە. حکومەت دەیەوێ بورجی ئیفل هەڵوەشێنێت". مامەڵەکاران بە

بێدەنگییەکی سەرسوڕهێنەرەوە گوێیان هەڵخستبوو لەکاتێکدا کە بەڕێوەبەر ڕووی دەکردەوە کە تاوەرەکە، کە بەم دواییانە لە هەواڵەکان باس کراوە، زۆر پێویستی بە چاککردنەوە هەیە. لە سەرەتادا ئەمە بە مەبەستی سترەکتۆرێکی کاتی بووە، تێچووی چاککردنەکەی بەدرێژایی ساڵان بەرز بۆتەوە و ئێستا لە کاتێکی قەیرانی داراییدا، دەبێ حکومەت ملیۆنان دۆلار بۆ چاککردنی سەرف بکات. زۆرێک لە پاریسییەکان تاوەری ئیفلیان بە ترسێک دادەنا و دڵخۆش دەبوون بەوەی نەمێنێت. پێ بەپێی کات، تەنانەت گەشتیارانیش بیریان دەچۆوە- لە وێنەکان و پۆستکارتەکاندا وەک یادگارییەک دەمایەوە. لوستیگ وتی "بەڕێزان، ئێوە هەمووتان بانگهێشت کراون تا ئۆفەرێک بۆ تاوەری ئیفل بخەنە بەردەم حکومەت".

ئەو چەند چەند پەڕەیەکی حکومەتی دایە بزنسمانەکان کە پڕ کرابوو لە فیگەر، وەکو کێشی ئاسنی تاوەرەکە. چاوەکانیان زەق بوو کاتێک حسابیان کرد دەشێ چەنێک قازانج لە سکراپەکە بکەن. پاشان لوستیگ ئەوانی بەرەو سەیارەیەکی لیموزین برد کە چاوەڕێیان بوو تا بەرەو تاوەرەکە بیانبات . بە نیشاندانی باجێکی ڕەسمی، ئەوانی بە دەرچەکەدا ڕێنمایی کرد و لە گەشتەکەیدا قسەی سەرگەرمکەری بۆ گێڕانەوە. لە کۆتایی سەردانەکەدا ئەو سوپاسی کردن و داوای لێکردن لەماوەی چوار ڕۆژدا ئۆفەرەکانیان بکەیەننە شوقەکەی.

پاش چەند ڕۆژێك لە پێشکەشکردنی ئۆفەرەکان، یەکێك لە پێنج کەسەکە، مۆسیۆ (پ) تێبینییەکی پێگەیشت لەمەڕ ئەوەی کە داواکەی ئەو براوەیە و بۆ مسۆگەرکردنی فرۆشەکە، دەبێ لەماوەی دوو ڕۆژدا بێتە شوقەکە و چێکێکی پشتڕاستکراوەی بە بڕی ٢٥٠،٠٠٠ فرەنك (هەرتای ١،٠٠٠،٠٠٠ دۆلاری ئەمڕۆ)ی پێبێنێت- کە چارەکێکی کۆی نرخەکەیە بە گەیشتنی چێکەکە، کابرا ئەو دۆکیومێنتانەی وەردەگرت کە پشتڕاستکەرەوەی خاوەندارێتیکردنی تاوەری ئیفل بوون. مۆسیۆ (پ) دڵخۆش بوو- وەکو وەکو پیاوێك ناوی دەچووە مێژووەوە کە شوێنێکی بەناوی کڕیبوو و هەڵیوەشاندبوو. بەڵام بەهاتنی ئەو کاتەی کە گەیشتە شوقەکە و چێکەکەی بەدەستەوە

بوو، لەبارەی تەواوی مەسەلەکە گومانی پەیدا کرد. بۆچی کۆبوونەوە لە هۆڵەیەکی هۆتێل لەبری بینایەیەکی حکومی؟ بۆچی لە کاربەدەستانی ترەوە گوێبیستی هیچ شتێک نەبوو؟ ئایا ئەمە تەڵەکەبازییەک بوو؟ لەکاتێکدا کە گوێی بۆ قسەکانی لوستیگ هەڵخست لەبارەی ئامادەکارییەکانی سکراپکردنی تاوەرەکە، ڕاڕا بوو و بیری لە کشانەوە کردەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە پڕێکدا درکی بەوە کرد کە بەڕێوەبەر تۆنی دەنگی گۆڕاوە. لەبری قسەکردن لەبارەی تاوەرەکەوە، لەبارەی موچەی کەم و لەبارەی ئارەزووی ژنەکەی بۆ چاکەتێکی کوڵکی، لەبارەی ئەوەی چەندێک ناخۆشە سەخت کار بکەیت و پێی نەزانن سکاڵای بوو. مۆنسیۆ (پ) وای بە خەیاڵدا هات کە ئەم کاربەدەستە باڵایەی حکومەت چاوی لە بەرتیلە. لەگەڵ ئەوەشدا، کاریگەرییەکە لەسەری توڕەیی نەبوو بەڵکو ئاسودەبەخش بوو. ئێستا ئەو دڵنیا بوو لەوەی لوستیگ ڕاستەقینەیە، چونکە لە هەموو ڕووبەڕووبوونەوەکانی پێشووی لەگەڵ بەرزکراوە ڕەسمییەکاندا، ئەوان بەشێوەیەکی حەتمی داوای شتێک بەرتیلیان کردبوو. مۆنسیۆ (پ) کە دڵنیاییەکی بە بەردا هاتەوە، چەند هەزار فرانکێکی هەڵدایە ناو گیرفانی بەڕێوەبەر، پاشان چێکە پشتڕاستکراوەکەی رادەست کرد. لەبەرامبەردا، ئەو دۆکیومێنتەکانی وەرگرت، لەوانەش قانیمەیەکی سەرنجڕاکێشی دەشکاندن. ئەو بە خەونی قازانج و ناوبانگی داهاتوو، لە هۆتێلەکە دەرچوو.

لەماوەی ڕۆژانی دواتردا، لەکاتێکدا کە مۆنسیۆ (پ) چاوەڕێی وەڵامێکی حکومەت بوو، بەرەبەرە درکی بەوە کرد کە شتێک ناتەواوە. چەند پەیوەندییەکی تەلەفۆنی ڕوونی کردەوە کە کەسێک نییە بەناوی جێگری بەڕێوەبەری گشتی لوستیگ و هیچ پلانێکیش بۆ هەڵوەشاندنی تاوەری ئیفل نییە. ئەو بایی ۲۵۰،۰۰۰ فرانک قۆڵی بڕابوو!

مۆنسیۆ (پ) قەت نەچووە پۆلیس. ئەو دەیزانی چ ناوبانگێکی خراپی پێ دەبڕێت ئەگەر قسەی ئەوە بکەوێتە سەر زاران کە بە چ شێوازێکی سەیرانە لەمێژوودا قۆڵیان بڕیووە. سەرباری ریسوایی گشتیش، ئەمە خۆکوژییەکی دارایی دەبوو بۆی.

## لێکدانەوە

ئەگەر کۆنت لوستیگ، ساختەچیی سەرووناسایی، هەوڵی بدایە (ئارک دی ترایەمف)، بردی مەر (سین)، بەیەکەری مالزاك بفرۆشێت، کەس باوەڕی پێیەدەکرد. بەڵام تاوەری ئیفل زۆر گەورە بوو، ڕێی تێبەدەچوو سێبە بەشێك لە هەوڵی ساختەچیتی. لە ڕاستیدا ڕێی تێبەدەچوو لوستیگ بتوانێت پاش شەش مانگ بگەڕێتەوە بۆ پاریس و بورجی ئیفل بە مامەڵەکارێکی تری سکراپ و بە نرخێکی بەرزتر "بفرۆشێتەوە"— بە بڕە پارەیەك کە دەکاتە ١,٥٠٠,٠٠٠ دۆلاری ئەمڕۆ!

گەورەیی فەبارە، چاوی مرۆڤ دەوەستێنێت. ئەمە هۆشمان پەرت دەکات و سەرسامەمان دەکات و ئەوەندە حاشامەڵئەگرە کە ئێمە ناتوانین وێنای ئەوە بکەین وەهمێك یان فریوێك لە ئارادا بێت. خۆت بە گەورەیی و بوێری دەوڵەمەند بکە— فریوەکان بکشێنە تا ئەو جێیەی کە دوور و دوورتر دەڕۆن. ئەگەر هەستت کرد ساوێلکەکە گومانی هەیە، ئەو شتە بکە کە لوستیگی چارەنترس کردی. لەبری کشانەوە یان دابەزاندنی نرخ، نرخەکەی بەرزتریش کردەوە بەوەی کە داوای بڕێك بەرتیلی کرد. داواکردنی زیاتر، کەسەکەی تر دەخاتە حاڵەتی بەرگرییەوە، کاریگەریی دەدەری سارش و گومان دەرەوەستێنەوە و لێواسێو دەمێت لە بوێری.

## پەیڕەوی ٢

لەباو پێشەڵ مەرگدا لە ١٥٣٣، ڤاسیلی سێیەم، دوکی گەورەی موسکۆ و فەرمانڕەوای ڕووسیای نیمچە یەککرتوو، کوڕە تەمەن سێ ساڵەکەی، ئیڤانی چوارەم، وەکو جێگرەوەی خۆی ڕاگەیاند. ئەو ژنە گەنجەکەی، هێلێنا، وەکو جێنشین دیاریکرد تا ئەو کاتەی کە ئیڤان ڕووبەرە بەدەست دەبێت و دەتوانێ خۆی بەتەنیا حوکم بکات. ئەریستۆکرسی، بەهەیبی دڵخۆش نەبوون. بۆ ماوەی ساڵانێك دوکەکانی موسکۆ بە هەوڵی ئەوەدا بوون دەسەڵاتیان بەسەر زەوی و زارەکانیاندا فراوان بکەن. بە مردنی ڤاسیلی،

میراتگرەکەی کە تەنیا سێ ساڵان بوو و ژنێکی گەنج بەرپرسی فەرمانڕەوایی ئەو بوو، خانەدانەکان دەیانتوانی دەسکەوتەکانی دوکەکان پێچەوانە بکەنەوە، کۆنترۆڵی دەوڵەت بگرنە دەست و خانەوادەی شاهانە ڕیسوا بکەن

هێلینای گەنج کە لەم مەترسیانە بەئاگا بوو، ڕوویکردە هاوپەیمانی جێ متمانەی، میر ئیڤان ئۆبۆلێنسکی بۆئەوەی لە حوکمڕانییەکەیدا یارمەتی بدات. بەڵام پاش پێنج ساڵ لە جێنشینی، لەپڕێکدا مرد– لەلایەن ئەندامێکی خانەوادەی شویسکی کە مەترسیدارترین هێزی خانەدانەکان بوون، ژەهرخوارد کرا. میرەکانی شویسکی کۆنترۆڵی حکومەتیان گرتەدەست و ئۆبۆلێنسکیان خستە زیندان کە لەوێ لە برسا مرد. لە تەمەنی هەشت ساڵیدا، ئیڤان ئێستا هەتیوێکی بەفرین ئامێز بوو و هەر ئەندامێکی خانەدانەکان بایەخی پێبدایە دەستبەجێ دەربەدەر دەکرا یان دەکوژرا

بۆیە ئیڤان بەناو کۆشکەکەدا هات و چوو، شوڕە بوو، شەپرێو بوو و زۆرجار خۆی لە شویسکییەکان دەشاردەوە کە کاتێک دەیانبینی بە ڕەقی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد. لە هەندێ ڕۆژدا ئەوان بەدوایدا دەگەڕان و پۆشاکی شاهانەیان لەبەر دەکرد و گۆچانێکیان دەدایە دەست و لەسەر تەخت دایاندەنا– جۆرێک لە سروتی گاڵتەئامێز کەتیایدا ئەوان ئەویشە شاهانەییەکانی ئەویان دەشێواند. پاشان ئەوان دەریاندەپەڕاند. ئێوارەیەکیان هەندێک لەوان میترۆپۆلیتان– سەرۆکی کەنیسەی ڕووسیا– یان بەناو کۆشکەکەدا ڕاوەدوونا و ئەو لە ژووری ئیڤان پەنای گرت. کوڕەکە بە ترس و لەرزەوە دەیڕوانی کاتێک شویسکییەکان هاتنە ژوورەوە، ئیهانەیان کرد و بێ بەرەییانە لە میترۆپۆلیتانەکەیاندا

ئیڤان لە کۆشکدا یەک کێشەی هەبوو، خانەدانێک بەناوی ڤیۆدۆر ڤۆرۆنتسۆڤ کە دڵنەوایی و ئامۆژگاری دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕۆژێکیان لەکاتێکدا کە ڤۆرۆنتسۆڤ و تازەترین میترۆپۆلیتان لە کافتریای کۆشک مشتومڕیان بوو، ژمارەیەک لە شویسکییەکان خۆیانکرد بە ژووردا و بە دڕاندنی ڕۆبەکەی، میترۆپۆلیتانەکەیان ئیهانە کرد. پاشان ڤۆرۆنتسۆڤیان لە مۆسکۆ دوور خستەوە

بەدرێژایی هەموو ئەمە، ئیڤان بێدەنگیی خۆی پاراست. بەلای خانەدانەکانەوە، وەها دیار بوو کە پلانەکەیان کاریگەر بووە. پیاوە گەنجەکە ببووە گەمژەیەکی ملکەچ و ترساو. ئەوان ئێستا دەیانتوانی فەرامۆشی بکەن، تەنانەت بەتەنیای جێ بێلن. بەلام ئێوارەی ٢٩ی دیسەمبەری ١٥٤٣، ئیڤان کە ئێستا سیانزە سالان بوو، داوای لە میر شویسکی کرد بێتە ژوورەکەی. کاتێک میر گەیشت، ژوورەکە پڕ بوو لە پاسەوانانی کۆشک بوو. دواتر ئیڤانی گەنج پەنجەی بۆ ئاندرێی ڕاکێشا و فەرمانی بە پاسەوانەکاندا دەستگیری بکەن، بیکوژن و لاشەکەی فڕێ بدەنە بەر دەم سەگە گۆشتخۆرەکان. بەدرێژایی چەند ڕۆژی دواتر، ئیڤان هەموو هاوەلە نزیکەکانی ئەندرێی بە گرتندا و دەربەدەری کردن. خانەدانەکان کە بە موێژنی لەپڕی ئەو تاسابوون، ئێستا لەبەرانبەر ئەم گەنجەدا ترسیان لێ نیشتبوو، (ئیڤانی خەمناک)ی ئاییندە کە پلانی دانا و پێنج سال چاوەڕێ بوو تا ئەم کردارە بوێرانە و خێرایە جێبەجێ بکات کە دەسەلاتی بۆ چەند دەیەیەکی داهاتوو ڕامی دەکرد.

## لێکدانەوە

جیهان پڕە لەو خانەدانانە — ئەو پیاوانەی ڕقیان لێتە، ترسیان لە چاوچنۆکی تۆیە و بە ئیرەییەوە قەلەمڕەوە بچووکبووەوەکانی خۆیان دەپارێزن. پێویستە تۆ دەسەلاتی خۆت بونیاد بنێیت و ڕێز بەدەست بێنیت، بەلام ئەو ساتەی کە خانەدانەکان هەست بە بوێری گەشەکردنووی تۆ دەکەن، بۆ بەربەستکردنی تۆ هەنگاو دەنێن. بەو شێوەیەی کە ئیڤان ڕووبەڕووی بارودۆخێکی وەها بووەوە: ئەو خۆی مات کرد، نە چاوچنۆکی پیشاندا نە بەرایەتی. ئەو چاوەڕێ بوو، و وەختێک کاتەکە گەیشت پاسەوانەکانی کۆشکی هێنایە بەرەی خۆی. پاسەوانەکان هێنیان نە شویسکییە دلڕەقەکان هەلگرتبوو. هەر کە ئەوان بە پلانەکەی ئیڤان ڕازی بوون، بە خێرایی هار پێوەندی خۆی دەستپێکرد، پەنجەی بۆ شویسکی ڕاکێشا و هیچ کاتێکی بۆ کاردانەوە بۆ نەرەهێشتن.

داموستش لەگەڵ خانەدانێك مكە و شتو تۆ دەرفەتی بۆ دەرەخسێنێت سارهێنکی مچوك دەبیمە پیگەیەك كە ئەو پێویستیەتی تا پارچەپارچەت بكات. هەنگاوێكی بویرانەی لەپڕ، مەیێ مشتومڕ باری هۆشداری، ئەم پێگانە لەنێو دەمات و دەسەڵاتی تۆ بونیاد دەنێت تۆ گومانداران و كمە لە دڵی دەتۆقێنێت و برواپێنەبوونی بلاوێك لەوانە بەدەست دێنێت كە پێت سەرسام و ئەوانە شكۆمەند دەكەیت كە بوێرانە هەنگاو دەنێن

پەیڕەوی ژمارە ٣

لە ١٥١٤دا پیەرۆ ئارێتینۆ وەكو جرمەتكارێكی خانەوادەی دەوڵەمەندی ڕۆم كاری دەكرد. ئەو وەكو نووسەر حەوێی مەزنیەتی هەبوو، بۆئەوەی جیهان بە ناوەكەی گوێ بدات، بەڵام چۆن دەكرا هیوایەكی ناكام حەوێكی وەها بێنێتە دی؟

ئەو ساڵە پاپا لیۆی دەیەم وەدیكی لە پاشای پورتوگالەوە پێشكەشكرا كە دیارییان پێبوو، لەوانەش فیلێكی گەورە كە لە سەروەختی سەردەمانی ئیمپریالییەوە یەكەمین دانە بوو فیلەكەیان ڕازاندبووەوە و جێی سەرنج بوو بەڵام سەرباری خۆشەویستی و چاودێری زۆری، فیلەكە كە ناوی (هانۆ) بوو بە سەختی نەخۆش كەوت. پاپا دكتۆرەكانی كۆ كردەوە، بەڵام هیچ سەركەوتوو نەبوون. فیلەكە مرد و پاپا ماتەمی گێڕا. بۆ دڵنەوایی خۆی، ئەو وێنەكێشی مەزن ڕافائیلی بانگ و فەرمانی پێدا تابلۆیەكی گەورەی هانۆ لەسەر گۆڕی ئاژەڵەكە دروست بكات و لێی بنووسێت "ئەوەی سروشت بردی، ڕافائیل بە هونەرەكەی گەڕاندیەوە"

بەدرێژایی چەند ڕۆژی دواتر، نامیلكەیەك لەسەرانسەری ڕۆم بلاو كرایەوە كە ببووە مایەی پێكەنین و شادی. نامیلكەكە كە ناوی "دوایین ووەسێت و گەواهی هانۆی فیل" تیایدا هاتبوو " بۆ میراتگری من كاردینال سانتاكروس، من ئەژنۆكانم دادەم، بۆئەوەی ئەو بتوانێت لاسایی چۆكدادانم بكاتەوە. بۆ كاردینالی میراتگرم سانتی كواترۆ، من شەویلگەكانی دەدەمێ، بۆئەوەی بتوانێ دەستوبردتر هەموو دەرامەتەكانی مەسیح

قوت بدات  بۆ کاردینال متیبسی میرانگرم، من گوێچکەکانی دەدەمێ بۆئەوەی بتوانێت گوێبیستی کردارەکانی هەمووان بێت ". بۆ کاردینال گراسی کە ناوبانگی بۆ زیدە کرداری سێکسی هەبوو، فیلەکە بەشە زیدە گەورە کردبارەکەی لاشەی خۆی پێ سپاردووە

ئامیلکە ئەناسراوەکە سەمەمووان گەیشت و کەسێکی گەورە لە ڕۆم ئەما پێی نەگات، تەنانەت پاپاش  بۆ هەریەکشیان حاڵ لاوازەکەی دەکردە ئامانج  ئامیلکەکە بە دێڕە شیعرێك کۆتایی دەهات "ئەوە بزانە ئارێتینۆ هاوڕێتە/ چونکە ئەو وەکو دوژمن خراپ دەبێت  تەنیا وشەکانی دەتوانێ هیوای مەرد بورهێنێت/ بۆیە خودایە هەمووان لە زمانی ئەو بپەرێزە"

## لێکدانەوە

بە ئامیلکەیەکی کورت، ئارێتینۆ، کوڕە پێڵاودرووێکی هەژار و خۆبەشی خزمەتکار، ناوبانگی بۆ خۆی پەیدا کرد. هەمووان لە ڕۆم کەوتنە پەلە پەل بۆئەوەی بزانن ئەو گەنجە ئارایە کێیە  تەنانەت خودی پاپا، دڵخۆش بوو بە بوێرییەکەی، بەدوایدا گەڕا و سەرەنجام کارێکی لە خزمەتگوزاریی پاپادا پێبەخشی   سەرەنجام وەکو "بەڵای میرەکان" ناسرا و زمانە زبرەکەی بووە مایەی پەیداکردنی ڕێز و ترسی گەورەکان هەر لە پاشای فەرەنساوە تا ئیمپراتۆری هابسبورگ

ستراتیژی ئارێتینۆ سادەیە. کاتێك تۆ ئەوەندەی داڤید بچوك و شاراوەیت، دەبێ گۆلیاسێك بدۆزیتەوە بۆ هێرشکردن  چەندەی ئامانجەکەت گەورە بێت ئەوەندە سەرنجی زیاتر بەکێش دەکەیت  چەندەی هێرشەکەت بوێرانە بێت، ئەوەندە زۆرتر لەناو هەشامەتدا دەردەکەویت و ئەوەندە زۆرتر سەرسامی بەدەست دێنیت  کۆمەڵگە پڕە لەوانەی بیر بوێرانە دەکەنەوە بەڵام جورئەتی چاپکردن و دەربڕینیان نییە  ئەوەی خەڵك هەستی پێدەکات تۆ دەربەستەی کە-گوزارشتی هەستە شاراوەکان هەمیشە بەهێزە  سۆراخی دەربەستەترین ئامانج بکە و فیشەکی بوێریتی پێوەنێ  جیهان خۆشی

لە نمایشەکە دەبینێت و بە شکۆ و دەسەڵاتەوە ڕێز لە کەسە شاراوەکە دەبێت— کە تۆیت

## کلیلی دەسەڵات

زۆربەمان ترسنۆکین. ئێمە دەمانەوێ خۆمان لە تەنگژە و ململانێ لابدەین و دەمانەوێ هەمووان کەیفیان پێمان بێت. لەوانەیە ئێمە لە کردارێکی بوێرانە ڕابمێنین بەڵام بە دەگمەن دەیهێنینە ژیانەوە. ئێمە لە لێکەوتەکان دەترسین، لەوە دەترسین کە دەبێ ئەوانیتر بیرکردنەوەیان لەبارەی ئێمەوە چۆن بێت، لەو نەیارێتییە دەترسین کە هەڵیدەگیرسێنین ئەگەر جورئەت بکەین بچینە ئەودیو شوێنی ئاسایی خۆمان

هەرچەندە دەولەیە ترسنۆکی خۆمان وەکو نیگەرانی بۆ ئەوانیتر، ئارەزوویەک بۆ ئازارنەدانی ئەوان پەردەپۆش بکەین، لە ڕاستیدا پێچەوانەکەی وایە— ئێمە لە ڕاستیدا بەخۆوە قاڵین، لەبارەی خۆمان و ئەمەی کە ئەوانیتر چۆن دەمانبینن، نیگەرانین. کەچی ئازایەتی، ئاراستەکراوی دەرەوەیە و زۆرجار وا لەخەڵکی دەکات هەست بە ئاسودەییەکی زیاتر بکەن، چونکە ئەمە کەمتر خۆناگایانەیە و کەمتر کپ کراوە.

دەشێ ئەمە بەشێوەیەکی پووختر لە فریودانا ببینرێت. هەموو فریودەرە گەورەکان لە ڕێگەی چەقاوەسوویییەوە سەرکەوتوو دەبن. بوێریی کازانۆڤا لە نزیکبوونەوەی بوێرانە لەو ژنەی ئارەزووی دەکرد یان لە قسەی لووس بۆ هەرایی بۆکردنی بەدەربەخرا، ئەوە توانای بوو بۆ خۆ بەدەستەوەدانی بەشێوەیەکی تەواوەتی و بۆئەوەی وایلێبکات بڕوای وابێت هەموو شتێکی بۆ دەکات، تەنانەت ژیانیشی دەخاتە مەترسییەوە کە لە ڕاستیشدا هەندێ جار هەر ئەمەی دەکرد. ئەو ژنەی کە ئەم هەموو سەرنج و هۆشی لەسەر بوو، تێگەیشت لەوەی ئەم هیچ شتێکی لێ نابڕێت. ئەمە یەکجار زۆر لە گفت و لفتی شیرین سرنجڕاکێشتر بوو. لە هیچ سانیەک لە ساتەکانی بەکێشکردندا ئەو ڕاڕایی یان گومانی پیشان نەدەدا، چونکە قەت هەستی پێنەدەکرد

بەشێك لە سیحری بەكێشبوون ئەوەیە كە وامانلێدەكات هەست نەكەین بەشێوەیەكی كاتی لە دەرەوەی خۆمان و ئەو گومانە ناوبەناوانەی دێنە ناو ژیانمانەوە، تەوق دراوین ئەو ساتەی كە فریودەر ڕاڕا دەبێت، سیحرەكە دەشكێت، چونكە ئێمە لە پرۆسەكە، لە هەوڵی بەدەستهێنانیان بۆ بەكێشكردنمان، لە خودئاگاییان بەئاگا دەبین. بوێری خۆشمان بەرەو دەرەوە ئاراستە دەكات و ڕەهەندەكە بەرپرسیاریی دەهێڵێتەوە، ئەمە قەت ئاڵۆزی یان شەرمەزاری بەرهەم ناهێنێت. بۆیە كاتێكیش ئێمە بوێر ستایش دەكەین و هەر دەكەین لێیەوە نزیك بین، لەبەر ئەوەیە كە بڕوابەخۆبوونیان كارمان تێدەكات و بەرەو دەرەوەی قەڵەمڕەوی ناوەكیبوون و تێڕامانمان بەكێشمان دەكات

خەڵكێكی كەم بە ئازایەتی لەدایك دەبن. ئەلبەتە ناپۆلیۆن دەبوایە خووی شەڕكە پەیدا بكات كە دەیزانی لەوێ مەسەلەكە ژیان و مەرگ بوو. لە ژینگەیەكی كۆمەڵایەتیدا ئەو دەستە و پێ سپی و ترسنۆك بوو، بەڵام بەسەر ئەمەدا زاڵ بوو و لەهەموو بەشێكی ژیانیدا پراوەی بوێری كرد. چونكە دەسەڵاتێكی بێ وێنەی تیادا دەبینی، ئەمەی كە چۆن ئەمە بەمانای وشە مرۆڤ گەورە دەكات (ئەگەرچی كەسێكی وەك ناپۆلیۆن لە ڕاستیدا بەشێوەیەكی بەرچاو لە قەد و قیافەدا بچوك بوو).

پێویستە تۆ پراوەی بوێری بكەیت و پەرەی پێبدەیت. تۆ زۆرجار كەڵك لەمەد دەبینیتەوە. باشترین شوێنیش بۆ دەستپێكردن زۆرجار جیهانی ناسكی دانوستانە، بەتایبەت ئەو مشتومڕانەی تیایاندا داوات لێدەكرێت نرخی خۆت دابنێیت. چەند جار هەبووە بەوەی داوای كەمەمان كردووە خۆمان بچوك كردۆتەوە. كاتێك كریستۆفەر كۆلەمبەس پێشنیاری ئەوەی كرد دەرباری ئیسپانیا دارایی گەشتە دەریاییەكەی بۆ ئەمریكاكان دابین بكات، ئەو بەهەمان شێوە داواكارییەكی بوێرانەی شێتانەی خستەڕوو لەمەڕ ئەوەی كە پێی دەوترێت "ئەدمیراڵی مەزنی ئۆقیانوس" دەربار ڕازی بوو. ئەو نرخەی دانا، ئەو نرخەش بوو كە وەریگرت — ئەو داوای كرد بە ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت، بۆیە ئەوەی لەگەڵ كرا. هێنری كیسینجەریش دەیزانی لە دانوستاندا، داواكارییە

بوێرەکان باشتر کاردەکەن بە بەراورد بە سارشە پارچە پارچەکان و هەوڵدان بۆ ڕێککەوتنە هاوبەشەکان لەگەڵ ئەویتردا بەهای خۆت بە بەرزی دابنێ، و پاشان بەو شێوەیەی کۆنت لوسێنگ کردی، بەرزتری بکەرەوە

لەوە تێبگە کە: ئەگەر ئازایەتی سروشتی نەبێت، ترسنۆکیش سروشتی نییە، ئەمە خوویەکی بەدەستهێنراوە، لە ئارەزووی خۆلادان لە ململانێ وەرگیراوە. ئەگەر ترسنۆکی دەستی بەسەردا گرتوویت، ئەوا ڕیشەکێشی مەکە. ترسەکانی تۆ لە لێکەوتەکانی کرداری ئازایانە زۆر لە واقیعەوە دوورن و لە ڕاستیدا لێکەوتەکانی ترسنۆکی زۆر خراپترن بەهای تۆ نزم دەبێتەوە و تۆ سوڕێکی خۆ تەماعەتهێنی دروست دەکەیت. دیرت بێت ئەو کێشانەی بەهۆی هەنگاوی بوێرانە دروست دەبن دەشێ بە جۆرنەتی زۆرتر و گەورەتر پەرپۆش بکرێن، تەنانەت چارەسەر بکرێن.

وێنە: شێر و کەروێشک. شێر هیچ کەلێنێک لەسەر ڕێگاکەی دروست ناکات- جوڵەکانی زۆر خێران، شەویلگەکانی زۆر خێرا و بەهێزن. کەروێشکی ترساو هەموو شتێک دەکات بۆئەوەی لە مەترسییەکە ڕابکات. بەڵام لە پەلە پەلییەکەیدا بۆ کشانەوە و ڕاکردن، دەکەوێتە ناو تەڵەوە، دەکەوێتە بەر شەویلگەکانی دوژمنەوە.

دەسەڵات بەدڵنیاییەوە من پێم وایە وا باشترە ڕەمەکی بیت نەک وریا، چونکە بەخت ئافرەتە، ئەگەر دەتەوێ بەسەریدا زاڵ بیت، ژن بە هێز بگریت و دەشێ وەها بیبیرێت کە ئەو خۆی بو کەسی بوێر بۆ کۆنترۆڵکردن دەدات بە دەستەوە نەک بۆ ئەوانەی بە ساردییەوە دێنە پێش. بۆیە، وەکو ژن، ئەو هەمیشە هاوڕێی گەنجە، چونکە ئەوان حەزەریان کەمترە، توندترن و بە بوێرییەکی زۆرەوە کۆنترۆڵی دەکەن.

(نیکۆلۆ ماکیاڤیللی، ١٤٦٩-١٥٢٧)

### پێچەوانەبوونەوە

دەبێ بوێری قەت ستراتیژێک بێت لەپشت هەموو کردارەکانتەوە. ئەمە ئامرازێکی تاکتیکییە، بۆئەوەی لە ساتی ڕاستدا بەکار بهێنرێت. لەپێشدا پلان دابنێ و بیر بکەرەوە

و دوایی پێکهاتە مکە بە هوڵەیەکی بوێرانە کە سەرکەوتنت بۆ دەستەبەر دەکات. بە دەربڕینێکی تر، لەبەرئەوەی بوێری کاردانەوەیەکە فێری دەبیت، بەهەمان شێوە کاردانەوەیەکە کە تۆ بە ئیرادەوە فێری دەبیت کۆنترۆڵی بکەیت و بەکاری بهێنیت ئەگەر تەنیا بە چەکی بوێرییەوە بە ژیاندا ڕێ مکەیت، ئاشەتبەر و بەهەمان شێوە کوشندەش دەبێت تۆ هەستی زۆر کەس بریندار دەکەیت، بەو شێوەیەی کە لەلایەن ئەوانەوە سەلمێنراوە کە کە ناتوانن کۆنترۆڵی بوێرییان بکەن کەسێکی لەو جۆرە لۆلا مۆنتێز بوو کە بوێرییەکەی سەرکەوتنی بۆ دەستەبەر کرد و بووەهۆی بەکێشکردنی پەشای باڤاریا. بەڵام لەبەرئەوەی ئەو قەت نەیدەتوانی بوێرییەکەی جڵەو بکات، بەهەمان شێوە بووەهۆی کەوتنی– لە باڤاریا، لە ئینگلتەرە، لە هەر کوێیەک کە ڕووی تێدەکرد. ئەمە سنووری نێوان ئازایەتی و ڕواڵەتی دڵڕەقیتی، ئەمەت شێتی بەی نیڤانی خەمناک هەمان چارەنووسی تووش بوو. کاتێک هێزی بوێری سەرکەوتنی بۆ مسۆگەر کرد، دەستی پێوە گرت، تا ئەو حێیەی کە بووە ڕێسایەکی توندوتیژیی و سادیزم لە ژیاندا ئەو توانای جیاکردنەوەی کاتی بوێری و کاتی سڵکردنەوەی لەدەستدا

ترسنۆکی شوێنی لە هەڵەمرەوی دەسەڵاتدا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ زۆرجار کەڵک لەوە وەردەگریت کە دایپۆشیت. مێکۆمان لەو سانەوەمتەدا، ئەمە جێی ترسنۆکی نییە بەڵکو چەکێکی کاریگەرە تۆ بە نمایشی شەرمنیتی، خەڵکی بەلاڕێدا دەبەیت، چاتیکیش باشتر دەبێ کە دواتر هێرشیشیان بکەیتە سەر

## یاسای ژمارە ٢٩

# بەدرێژایی ڕێگاکە تا کۆتایی، پلان دابنێ

### حوکم

کۆتاییەکە هەموو شتێکە. بەدرێژایی ڕێگاکە پلان دابنێ، هەموو ئەگەرەیەک و ئاڵۆزییەکی مومکین و گۆڕانێکی چارەنووس کە لەوانەیە کۆششی سەختت پووچەڵ بکاتەوە و شکۆ بداتە ئەوانیتر، لەبەرچاو بگرە. بە دانانی پلان بەدرێژایی ڕێگاکە، تۆ کاریگەر نابیت بە بارودۆخەکان و دەزانیت چ کاتێک بوەستیت. بە هێمنی چارەنووست ئاراستە بکە و یارمەتیدەر بە لە بڕیاردان لە چارەنووس لە ڕێگەی بیرکردنەوەی لەپێشدا.

### سەرپێچی لە یاساکە

لە ١٥١٠دا، کەشتییەک لە دوورگەی هیسپانیۆلا (ئێستا هایتی و کۆماری دۆمینیکانە) بەرەو ڤەنزوێلا کەوتە ڕێ کە بەوێ کۆلۆنییەکی گەمارۆدراوی ئیسپانی ڕزگار دەکرد. چەند میلێک لە دەرەوەی بەندەرەکە، خۆحەشاردەرێک لە بۆشایی پیتاکەکە دەرپەڕییە دەرەوە: ڤاسکۆ نونیێز دی بالبوا، ئیسپانییەکی خانەدان کە بەگەڕان بەدوای ئاڵتوندا هاتبووە ناو (جیهانی نوێ) بەڵام کەوتبووە ناو قەرز و قۆڕ و لە ڕێگەی خۆحەشاردان لەناو بۆشاییدا لە قەرزدەرەکانی ڕایکردبوو.

بالبوا ئەوەندەی کۆلەمەس لە گەشتە دەریاییەکانیەوە بە حەکایەتی ناوازە لەبارەی مەمەلەکەتێکی مەزنی زێڕاوەش بەناوی (ئێل دۆرادۆ)، گەڕابووەوە بۆ ئیسپانیا، فرچکی بە ئاڵتونەوە گرتبوو. بالبوا یەکێك بوو لە یەکەمین سەرکێشەکان کە لە سەرزەمینی کۆڵەمەس بەدوای ئاڵتوندا دەگەڕێت و هەر لەسەرەتاوە بڕیاریدابوو یەکێك بێت لەوانەی لە ڕێگەی بوێری چرووپڕ و تەرکیزخستنەسەر، دەیدۆزێتەوە. ئێستا کە ئەو بە قەرزەدەرەکانی ئازاد بوو، هیچ شتێکی نەیدەوەستاند

بەداخەوە، حاوەمی کەشتییەکە، داموەزێکی دەوڵەمەند بەناوی فرانسیسکۆ ئێرناندێز دی ئیسپیسۆ توڕە بوو کاتێك بۆیان باسی خۆحەشاردەرەکە کرد و فەرمانیدا بالبوا لەیەکەمین دوورگە کە ئەوان پێی دەگەن جێ بهێڵرێت. کەچی، پێش ئەوەی بە هەر دوورگەیەك بگەن، ئێنسیسۆ هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کە ئەو کۆلۆنییەی قەرار بوو ئەو ڕزگاری بکات، چۆڵ بووە. ئەمە شانسی بالبوا بوو. ئەو باسی گەشتە دەریاییەکانی پێشووی بۆ دەریاوانەکان کرد بۆ پاناما و لەبارەی ئەو دەمگۆیانەی کە ئەو لەبارەی ئاڵتونەوە لە ناوچەکە گوێبیستی ببوو. دەریاوانە بەجۆش هاتووەکان قەناعەتیان لای ئێنسیسۆ دروستکرد کە دەستەبەرداری بالبوا ببێت و کۆلۆنییەك لە پاناما بونیاد بنێت پاش چەند هەفتەیەك کۆلۆنییە تازەکەیان ناونا "دارین"

یەکەمین حاکمی دارین ئێنسیسۆ بوو، بەڵام بالبوا پیاوێك نەبوو زۆر لەوانیتر بنێت دەستپێشخەرییەکەی بدرێ. ئەو هەڵمەتێکی لەناو دەریاواناندا بەدژی ئێنسیسۆ هەستەگێڕ کە بۆ دوژمان ڕوویان کردەوە کە ئەوان ئەویان وەکو حاکم پێ باشترە ئێنسیسۆ لە ترسی ژیانی خۆی ڕایکرد بۆ ئیسپانیا. پاش چەند مانگێك، کاتێك نوێنەرێکی تەختی ئیسپانیا گەیشت بۆ بونیادنانی خۆی وەکو حاکمی ڕەسمی دارین، ڕەت کرایەوە. لەگەشتی گەڕانەوەیدا بۆ ئیسپانیا، ئەم پیاوە خنکا. حکایەکە ڕێکەوت بوو، بەڵام لەژێر یاسای ئیسپانیدا، بالبوا حاکمی کوشتبوو و پێگەکەی ڕەوتکردبوو. بوێریی بالبوا پێشتر ئەویان لە زیان قوتار کردبوو، بەڵام ئێستا هیواکانی سامان و شکۆ لەنێو چووبوون. بۆئەوەی خۆی بە خاوەنی ئێل دورادۆ بزانێت کاتێك دەیدۆزێتەوە،

پێویستی بە ڕەزامەندی پاشای ئیسپانیا هەبوو– کە، وەکو یاساشکێنێک، قەت وەریمەدەگرت. تەنیا یەک چارەسەر هەبوو. هیندییەکانی پەناما باسی ئۆقیانووسێکی گەورەیان لە لایەکەی تری شریتی ئەمریکای ناوەڕاست بۆ بالبوا کردبوو و وتبوویان بە سەفەرکردن بەرەو باشوور لە ڕێگەی ئەم کەنارەی خۆرئاواوە، دەگاتە سەرزەمینێکی بێ وێنەی ئاڵتوون، کە بەناوێک ناودێر دەکرا ئەو وەکو "پیرو" هاتبووە بەر گوێی. بالبوا بڕیاریدا بە هەنگاوە نادڵنیاکانی پاناما بپەڕێتەوە و ببێتە یەکەمین ئەورووپی کە پێ دەنێتە ناو ئەم ئۆقیانووسە نوێیە. لەوێوە ئەو بەرەو ئێل دۆرادۆ ڕێی دەکرد. ئەگەر ئەو ئەمەی بە لەبری ئیسپانیا ئەنجام بدایە، ئەو سوپاسگوزاریی هەمیشەیی پاشای بەدەست دەهێنا و لێخۆشبوونی مسۆگەر دەکرد– بەڵام دەبوویە بەر لەوەی دەسەڵاتدارانی ئیسپانی دەستگیری بکەن، هەنگاوی بنایە.

پاشان، لە ١٥١٣دا بالبوا بە ١٩٠ سەربازەوە کەوتە ڕێ. لەنیوەی ڕێگەدا لەمبەر بۆ ئەوبەری شریتەکە (کە لەویدا ئەوەند مایلێک پان بوو)، تەنیا شەست سەرباز مابەوە، زۆرێکیان کەوتنە ناو هەلومەرجێکی سەختەوە– مێرووی خوێنمژ، شەستەباران، تا. دواجار، لەسەر شاخێکەوە، بالبوا بوو بە یەکەمین ئەورووپی کە نیگای خستە سەر ئۆقیانووسی هێمن. چەند ڕۆژێک دواتر ئەو بە کەشتییە زرێ پۆشەکەیەوە کە لافیتەی (کاستیل)ی پێوە بوو و بەناوی تاجی ئیسپانیاوە بانگەشەی خاوەندارێتی هەموو دەریاکان، ڕشکانییەکان و دوورگەکانی دەکرد، بەناو ئاوەکاندا کەوتەڕێ.

هیندییەکان لە ناوچەکە بە ئاڵتوون، حشڵ و مرواریی گرانبەها پێشوازییان لە بالبوا کرد کە پێشتر نموونەی ئەوەیان نەبینیبوو. کاتێک پرسیاری کرد ئاخۆ ئەم شتانە لەکوێوە دێن، هیندییەکان پەنجەیان بە ئاراستەی باشوور، واتە بۆ زەوی (ئینکا)یەکان ڕاکێشا. بەڵام بالبوا و ئەوسا ژمارەیەکی کەمی سەربازەکان مابوون. بۆ ساتێک، ئەو بڕیاریدا دەبێ بگەڕێتەوە بۆ دارین، حشڵەکان و ئاڵتوونەکان وەک دیارییەکی ئیرادەی پاک بنێرێت و داوای سوپایەکی گەورە بکات بۆ کۆمەک کردنی تا (ئێل دۆرادۆ) بگرێت.

کاتێک لەبارەی پەڕینەوەی بوێرانەی بالبوا بۆ ماکە شوێنیەکە، دۆزینەوەی ئۆقیانووسی خۆرئاوا و پلانی گرتنی ئێل دۆرادۆ هەواڵ گەیشتە ئیسپانیا، ئاوابارى پێشوو بوو بە پاڵەوان. ئەو دەستبەجێ بە حاکمی ماکە دۆرێکە ڕاگەیەنرا بەڵام پێش ئەوەی پاشا و شاژن هەواڵی دۆزینەوەکەیان پێ بگات، هەمرکە دە دوانزە کەشتییان لە ژێر فەرمانڕەوایی پیاوێک بەناوی پێدرۆ ئاریاس دافیلا (پێدراریاس) ڕەوانە کردبوو و فەرمانی ئەوەی پێدرابوو کە بالبوا دەستگیر بکات و دەست بەسەر کۆلۆنییەکەدا بگرێت. بەدەنی ئەو کاتەی کە پێدراریاس گەشتە پاناما، بۆی دەرکەوتبوو کە دڵتو بتۆشبووتی بۆ دەرکراوە و ئەم لە حاکمێتی شوێنەکەدا لەگەڵ پاساشکێنی پێشوودا هاوبەشە

بەهەمان شێوە، بالبوا هەستی بەنارەحەتی کرد. ئالتوی حەوتی ئەو بوو، ئێل دۆرادۆ ئاکە ئاوارتی بوو. لە گەڕان بەدوای ئامانجەکەیدا، ئەو چەند جارێک حەریک بوو بمرێت و هاوبەشی پێکردنی سامان و شکۆ لەگەڵ تازەهاتوویەکدا قبیلی قبوڵ نییە. ئەو بەهەمان شێوە بەرووبی بۆی دەرکەوت کە پێدراریاس ئیرەیی هەیە، کابرایەکی عەبوسە و بەهەمان شێوە ئەویش بە ناروبۆچەکە دڵخۆش نییە. چارێکی تر، تاکە چارەسەری بالبو ئەوە بوو دەستپێشخەرییەکە فۆرم بکات بەوەی پێشبڕ بکات بە سوپایەکی گەورەترەوە لە جەنگەڵەکە بپەڕینەوە و کەرەستە و ئامرازی بونیادنانی کەشتی بگوازێتەوە. هەر کە دەگەیشتە کەناری ئۆقیانوسی ئارام، ڕەوە کەشتییەکی دروست دەکرد کە بەهۆیەوە (نمسکا)ی دەگرت. حتی سەرسوڕمان بوو کە پێدراریاس بە پلانەکە ڕازی بوو– لەوانەیە هەستی بەوە کردبێت کە پلانەکە قەت سەر ناگرێت. سەدان کەس لەم ڕێکردنەی دووەم بەناو جەنگەڵدا مردن و ئەو دارەی گواستبانەوە لەبەر شەستە بارندا ڕزین. بالبوا، وەکو پێشوو، بووجا– هیچ دەسەڵاتێکی جیهان نەیدەتوانی پلانەکەی بەربەست بکات– و لەگەڵ گەیشتنیدا بە کەناری ئۆقیانووسی هێمن دەستیکرد بە کەرتکردنی درەختەکان بۆ تەختەی نوێ. بەڵام ئەو کەسانەی لەبەردەستی مابوونەوە زۆر کەم و زۆریش لاواز بوون بۆ هێرشبردن و جارێکی تر بالبوا گەڕاپەوە دارین

پێدراریاس لە هەر حاڵەتێکدابێ، مانگێبشتی بالبوای کرد بگەڕێتەوە بۆ گفتوگۆ لەسەر پلانێکی نوێ و لە دەوروبەری نۆردوگابەکەدا، نزرەرەوەکە چاوی بە فرانسیسکۆ پیزارۆ کەوت، هاورێیەکی کۆن کە لەسەکەمێن بەرپیەوەبدا بۆ شرێتەکە لەگەڵیدا بوو. بەڵام ئەمەیان تەڵە بوو. پیزارۆ کە ڕێبەرایەتی سەد سەربازی دەکرد، دەورەی هاورێ کۆنەکەیدا و دەستگیری کرد و گەڕاندیەوە بۆ پێدراریاس کە ئەمیش بە تۆمەتی یاخیبوون دادگایی کرد. پاش چەند ڕۆژێک سەری بالبوا مەگەڵ هی جێ متمانەترین شوێنکەوتووانی حرایە ناو سەبەتەمەک. ساڵانێک دواتر، پیزارۆ خۆی گەیشتە پیرۆ و کردارەکانی بالبو بیر چوونەوە

**لێکدانەوە**

زۆربەی خەڵکی بەدڵ نەک بە ئەقڵ حوکم دەکەن. پلانەکانیان تەمومژاوییە و کاتێک دەگەنە بەربەست چارەیەکی ڕەمەکی بۆ دادەنانش. بەڵام ئەم ڕێگەچارانە تەنیا دەنگەیەسە قەیرانیکی تر و فەت بەدیل بێ بۆ بیرکردنەوەی چەند هەنگاوێک لەپێشدا و پلاندانان تا کۆتایی

بالبوا خەونی بە شکۆ و سامان و پلانێکی تەمومژاوی بۆ گەیشتن پێی، دەبینی. لەگەڵ ئەوەشدا کردارە بوێرانەکەی و دۆزینەوەی ئۆقیانووسی هێمن تا ڕادەیەکی زۆر لەبیر کران، چونکە ئەو پابەند بوو بە شتێک لە جیهانی دەسەڵاتدا کە گوناهێک بوو. ئەو تا بەشێکی ڕێگاکە ڕۆیشت، دەرگاکەی بۆ ئەوانیتر بە ئاوەڵایی هێشتەوە تا ڕاڵ بێ کەسێکی دەسەڵاتداری ڕاستەقینە دووربینی ئەوەی دەبوو مەترسییەکان لە دوورەوە ببینێت — ئەو ڕکابەرانەی کە دەیانەوێ پشکیان لە وڵاتگیرییەکەدا هەبێت، ئەو سیسارکە کەچەڵانەی کە هەر گوێبیستی وشەی ئاڵتوون بێ پەیدا دەبن. دەبووایە بالبوا ڕاسپارییەکەی لەمەڕ (ئینکا) لای خۆی بهێشتایەتەوە تا ئەو کاتەی کە پیرۆی دەگرت تەنیا ئەو کاتە سامانەکەی، و سەری سەلامەت دەبوو. هەر کە پێدراریاس گەیشتە شوێنەکە، کەسی دەسەڵاتدار و دووربین پیلانی کوشتن یان دەستگیرکردنی دادەنا و

بەسەر ئەو سوپایەدا زاڵ دەبوو کە ئەو لەگەڵ خۆیدا هێنابووی بۆ گرتنی پیێز. بەڵام دڵنیا لەو سایەدا گیر نەبوو و هەمیشە هەستیابە پەرچەرکرداری پیشان دەدا و قەت لەپێشدا بیری نەدەکردەوە.

ج کەڵکی هەیە گەورەترین حەوت لە جیهاندا هەبێت ئەگەر نەوابێتر بەر و شکۆکەی بچنیەوە؟ قەت لەسەر خەونێکی ئەفسانەیی بێسنوور سەرت دامەنێ— تاکو کۆتاییەکە پلان دانێی.

### پەیڕەوی لە پلانەکە

لە ١٨٦٢دا سەرۆکی پروسی، ئۆتۆ فۆن بیسمارک ڕووپێوییەکی گۆڕەپانی دەسەڵاتی ئەورووپی کرد. یارییزانە سەرەکییەکان ئینگلیز، فەرەنسا و نەمسا بوون. پروسیا خۆی یەکێک بوو لەو چەند دەوڵەتەی کە لە هاوپەیمانییەکی شلۆقدا بوون لەگەڵ فیدراسیۆنی ئەڵمانیدا. نەمسا، ئەندامی زاڵی فیدراسیۆنەکە، جەختی لەوە کردەوە کە دەوڵەتانی تری ئەڵمانی بە لاوازی بمێننەوە، دابەشبوو و ملکەچ بن. بیسمارک بڕوای وابوو پروسیا چارەنووسی وایە بۆ شتێکی گەورەتر لە ملکەچی بۆ نەمسا بچێت

ئەو شێوەیە بیسمارک یاری کرد. یەکەمین هەنگاوی بۆ هەڵایساندنی جەنگ لەگەڵ دانیمارکی بردا، بۆ ئەوەی زەوییەکانی پێشووی پروسیا (شلێزویگ-هۆڵشتاین) بگەڕێنێتەوە. ئەو دەیزانی سەرەتاتکێنەکانی پروسیا بۆ سەربەخۆیی، دەبێتە هۆی بێگەرانیی فەرەنسا و ئینگلتەرە، بۆیە نەمسای خستە ناو لیستەوە بۆ جەنگ، بانگەشەی ئەوەی کرد کە گەڕاندنەوەی زەوییەکانی پروسیا لە قازانجی ئەوانە. لەماوەی چەند مانگێکدا، پاش ئەوەی بڕیاری جەنگ درا، بیسمارک داوای ئەوەی کرد زەوییە تازە گیراوەکان بکرێنە بەشێک لە پروسیا. بێگومان نەمساییەکان تووڕە بوون، بەڵام ئەوان سازشیان کرد. یەکەم، ئەوان ڕازی بوون بەوەی حاکمی (شلێزویگ) بدەنە پروسییەکان و ساڵێک دواتر (هۆڵشتاین)یان پێ فرۆشتن. جیهان بەبێتا پێیا ئەوەی دەدی دەکرد کە نەمسا لاواز دەبێت و پروسیا لە گەورەبووندایە.

هەنگاوی دواتری بیسمارک، دوبڕلەمێریز بوو. لە ١٨٦٦دا ئەو قەناعەتی بە پاشا هێنا لەدژی خودی نەمسا بچێتە جەنگەوە. ژنی پاشا ویلیام، کوڕە جێنشینەکەی، دژی ئەم جەنگە بوون. بەڵام بیسمارکی چاونەترس، سەرکەوتوو بوو لەوەی جەنگەکە بەدەستبێنێت و سوپای ماڵی پروسیا لە شەڕێکی سەختی کورتخایەنی حەوت هەفتەییدا شکستیان بە نەمساوییەکان هێنا. پاشان پاشا و ژەنەراڵە پروسییەکان ویستیان بەرەو ڤییەنا بجوڵێن و چەندەی دەکرێ زەوی لەژێر دەستی نەمسا دەربێنن. بەڵام بیسمارک ئەوانی وەستاند. ئێستا ئەو خوی وەکو لایەنێکی ئاشتی دەخستەڕوو. ئەنجامەکە ئەوە بوو کە توانی بگاتە پەیمانامەیەک لەگەڵ نەمسادا کە ئۆتۆنۆمی سەرپاکیری دایە دەوڵەتی ئەڵمانیا. بیسمارک ئێستا دەیتوانی پروسیا وەکو هێزی باڵادەست لە ئەڵمانیادا و وەکو سەرۆکی کۆنفیدراسیۆنی ئەڵمانیی باکوور بخاتەڕوو کە تازە پێکهاتبوو.

فەرەنسییەکان و ئینگلیزەکان لێرەوە بیسمارکیان بەراورد کرد بە ئاتیلای (هەن) و ترسی ئەوەیان لێیشت کە ئەو پلانی بۆ هەموو ئەورووپا هەبێت. هەر کە ڕێگەی ولاتگیری بگرتایەتەبەر، کەس نەیدەزانی لە کوێ دەوەستێت. لە ڕاستیشدا، سێ ساڵ دواتر بیسمارک جەنگێکی لەگەڵ فەرەنسا دەوروژاند. یەکەم جار، ئەو وەها دەرکەوت کە مۆڵەت دەدا تا فەرەنسا بلکێنرێت بە بەلجیکاوە، پاشان لە دوا ساتدا بیری گۆڕا. بە یاریکردنی گەمەی مشک و پشیلە، ئیمپراتۆری فەرەنسی، ناپلیۆنی سێیەمی تووڕە کرد و پاشای خۆی لەدژی فەرەنسییەکان وروژاند، جێی سەرسوڕمان بوو کە لە ١٨٧٠ جەنگ هەڵایسا. فیدراسیۆنی تازە دروستبووی ئەڵمانیا بەشێوەیەکی نامەرزیانە چووەپێ جەنگ دژی فەرەنسا و جارێکی تر ماکینەی سوپای پروسی و هاوپەیمانەکانی سوپای دوژمنیان بەدەوەی چەند مانگێکدا تێکشکاند. هەرچەندە بیسمارک دژی گرتنی هەر زەوییەکی فەرەنسا بوو، ژەنەراڵەکان قەناعەتیان پێهێنا کە حاکمی ئالساس لۆرین ببێتە بەشێک لە فیدراسیۆنەکە

ئێستا هەموو ئەورووپا ترسی لە هەنگاوی دواتری دێوەزمە پروسییەکە بوو کە بەلایەن بیسمارک ڕێبەرایەتی دەکرا، "ڕاوێژکاری ئاسنین" لە ڕاستیشدا ساڵێک دواتر بیسمارک

ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی بونیاد نا کە پاشای پروسی بووە ئیمپراتۆری تازە تاج لەسەر نراو و بیسمارک خۆی بوو بە میرێک بەڵام پاشان شتێکی نامۆ ڕوویدا. بیسمارک ڕەمینەساریی جەنگی تری نەکرد، کاتێکیش هێزەکانی تری ئەورووپا لە کیشوەرەکانی تردا زەوییان بۆ کۆلۆنی بەدەستهێنا، بەدەستهێنانە کۆلۆنییەکانی ئەڵمانیای بە توندی سنووردار کرد. ئەو چیتر زەوی بۆ ئەڵمانیا نەویست، بەڵکو ئاسایشی زیاتری ویست. لە پاشماوەی ژیانیدا ئەو لە ململانێدا بوو بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی لە ئەورووپا و ڕێگر بوو لە ڕوودانی جەنگی تر

**لێکدانەوە**

هۆکارێکی سادە هەیە لەمەڕ ئەوەی بۆچی زۆربەی پیاوان قەت ناوەستن کاتێک هێرش دەبەن. ئەوان هیچ ئایدیایەکی کۆنکرێتییان لا دروست نابێت لەمەڕ ئامانجەکانیان. هەر کە سەرکەوتنیان بەدەستهێنا ئەوا تینووی زیاتر دەبن. ڕاوەستان – سنووردارکردنی ئامانجێک و پاشان دەست پێوەگرتنی – تەقریبەن نامرۆیی دیار دێت. لە ڕاستیدا لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێک ئەوەندەی بەرقەرارکردنی دەسەڵات گرنگ نییە. ئەو کەسەی لە سەرکەوتنەکانیدا زۆر دوور دەڕوات پەرچەکردارێک دروست دەکات کە بەشێوەیەکی حەتمی سەر دەکێشێت بۆ ئاوابوون. ئاکە چارەسەر ئەوەیە پلان بۆ دوورمەودا دابنێیت بە ڕوونییەکی زۆرەوە ئەبدە ببە وەکو خوداکانی شاخی ئۆلیمپەس کە پشت هەورەکان و کۆتایی هەموو شتەکان دەبینن.

لە سەرەتای ژیانی پیشەییەوە لە سیاسەتدا، بیسمارک یەک ئامانجی هەبوو: پێکهێنانی دەوڵەتی ئەڵمانیی ڕێبەرایەتیکراو لەلایەن پروسیاوە. ئەو ڕەمینەساریی جەنگی لەگەڵ دانیمارک کرد نەک بۆ گرتنی خاکەکەی بەڵکو بۆ وروژاندنی ناسیۆنالیزمی پروسی و یەکخستنی وڵاتەکە. ئەو جەنگێکی لەگەڵ نەمسا وروژاند تەنیا بۆ ئەوەی سەربەخۆیی پروسیا بەدەست بهێنێت (لەبەرئەوە بوو ڕەتی کردەوە خاکی نەمساوی بگرێت). ئینجا ئەو جەنگی لەگەڵ فرانکۆ وروژاند بۆ ئەوەی مەملەکەتەکانی ئەڵمانیا

بەهێزی دوژمنی هاوبەشی بەکەمبکات و لێرەوە ئامادەکاری بکات بۆ دروستکردنی ئەڵمانیایەکی یەکگرتوو

هەر کە ئەمە بەدیهات، بسمارك وەستا. ئەو قەت رێگەی نەدا سەرکەوتن لە کەللەی بدات. ئەو توند جڵەوەکانی گرت و هەر کاتێك ژەنەراڵەکان یان پاشا، یان خەڵکی پرووسی داوای وڵاتگیری نوێی کرد، پاشەکشەی کردەوە. هیچ شتێکی جوانیی کردارەکەی نەدەشێواند، بەدڵنیاییشەوە شکۆشکەبوونێکی ساختە کە ئەوانەی دەوروبەری پاڵ دەنا بۆ ئەوەی دوورتر لە ئامانجە پلان بۆ داڕێژراوەکەی ئەو بڕۆن.

*ئەزموون پێشانی دەدات کە، ئەگەر کەسێك لە دوورتر لەو پلانانە بڕوانێت کە قەرار وایە بگیرێنە بەر، دەشێ بە خێرایی هەنگاو بنێت کاتێك ئەو ساتە دێت جێبەجێیان بکات*

*کاردینال ریچیلێو، ١٥٨٥–١٦٤٢*

## کلیلی دەسەڵات

بە گوێرەی کۆسمۆلۆجی یۆنانییە کۆنەکان، وا وێنا دەکرا کە خوداکان دونیای تەواویان بۆ ئایندە هەبێت. ئەوان هەموو شتێکی داهاتوویان بە وردەکارییەکەیەوە دەبینی. بەلایەکی ترەوە، مرۆڤەکان وەکو قوربانییانی چارەنووس دەبینران کە لە ساتەکەدا، و لە هەستەکانیاندا گیریان خواردووە، ناتوانن لەودیو مەترسییە راستەوخۆکانەوە ببینن. ئەو پاڵەوانانە، وەکو ئۆدیسیۆس کە توانییان لەودیو ئێستا ببینن و پلانی چەند هەنگاوێکی پێشتر دابنێن، بەرەنگاری چارەنووس بکەن، لەبوایاندا لە خوداکان نزیك ببنەوە بۆ دیاریکردنی ئایندە. بەراوردەکە هێشتا هەیە — ئەوانەی نێو ئێمە کە دەبینن وا بە زۆر لەپێشدا بیر دەکەنەوە و بە ئۆقرەوە پلانەکانیان بە ئاکام دەگەیەنن، دەسەڵاتێکی خوداناسایان هەیە

لە ٤١٥ی پێش زایینیدا، ئەسینایییە دێرینەکان هێرشیان بردە سەر سیسیلی بەو بڕوایەی کە گەشتەکەیان سامان، دەسەڵات و گۆڕینی شکۆمەندانەیان بۆ جەنگی شانزە

ساڵەی پیلوپلوپیری مسوگەر دەکات. ئەوان مەترسییەکانی داگیرکردنیان ئەوەندە بەدوور دەسنی. ئەوان پەشیمیی ئەوەیان نەکرد کە سیسیلیەکان ئەوەندە سەرسەختانە دەجەنگن چونکە شەڕەکان لە نیشتمانی خۆیاند بوو یان هەموو ئەسینایییەکان لەدژیان یەکیاندەگرت یان جەنگ لە چەند بەرەیەکەوە هەڵدەگیرسا و هێزەکانیان زۆر بە تەنکی بڵاو دەکردەوە. گەشتەکەی سیسیلیەکان کارەساتێکی تەواوەتی بوو، سەرەنجامەکەشی بۆ ویرانبوونی گەورەترین شارستانەتەکانی هەموو سەردەمەکان. ئەسینایییەکان لە ڕێگەی دڵەکانیانەوە نەک ئەقڵەکانیان ئاراستەی ناو ئەم کارەساتە کران. ئەوان تەنیا دەرفەتی شکۆمەندییان بینی نەک ئەو مەترسییانەی لەدوورەوە هەڵدەتۆقین.

کاردینال دی ڕێتز، ئەو فەرەنسییەی سەدەی حەڤدە کە شارەزایی بە قووڵبینییەکانیەوە دەکرد لەسەر پیلانەکانی مرۆڤ و ئەمەی کە بۆچی زۆربەیان شکست دێنن، ئەم دیاردەیەی شی کردەوە. لە ڕەوگەی یاخیبوونێکدا کە ئەو پێشڕەوی بوو لەدژی پاشایەتی فەرەنسا، لویسی شازدەی گەنج و دەربارەکەی لە ١٦٥١دا لە پاریس دەرچووبوون و لە کۆشکێک لە دەرەوەی پایتەخت گیرسابوونەوە. ئامادەیی پاشا بەشێوەیەکی زۆر نزیک لە دڵی شۆڕش قورساییەکی گەورە بوو لەسەر شانی شۆڕشگێڕەکان و ئەوان ئامێتێکی پشوویان هەڵگیرسا. ئەمەی دواییان سەلمێنەری هەرەسهێنانیان بوو، چونکە غیابی دەربار بە پاریس بوارێکی زۆرتری بۆ مانۆڕ ڕەخساند. کاردینال دی ڕێتز نووسی "ئاسایترین هۆکاری هەڵەکانی خەڵک ئەوەیە لە مەترسی ئێستا زۆر دەترسن نەک لەوەیەی کە دوورە"

ئەو مەترسییانەی کە دوورن، کە لە دوور دەردەکەون- ئەگەر ئێمە لەکاتێکدا کە ڕوودەدەن بیانبینین، چۆمان لە چەند هەڵە لادەدەین. چەند پلان دەستبەجێ هەڵدەوەشێنینەوە ئەگەر درکمان بەوە کرد کە خۆلادان لە مەترسییەکی بچووک دەبێتە هۆی کەوتنە ناو داوەیەکی گەورەتر. بەشی زۆری دەسەڵات ئەوە نییە کە تۆ ئەنجامی دەدەیت بەڵکو ئەوەیە کە ئەنجامی نادەیت- واتە ئەو کردارە بەپەلە و گەمژانەی کە خۆتانی لێ لادەدەیت بەر لەوەی بتخەنە ناو گیروگرفتەوە. لەپێشدا پلان دانێ

بەرلەوەی هەنگاو بنێیت- ڕێگە مەدە پلانە ئەمومژاوییەکانت بتخەنە داو گرفتەوە. ئایا ئەمە لێکەوتەی ماوبستراوی دەبێ؟ ئایا من دوژمنی نوێ دەوروژێنم؟ ئایا کەسێکی تر کەڵک لە کۆششەکانی من وەردەگرێت؟ کۆتایی ناخۆشەکان زۆرترن لە خۆشەکان- بە خەیاڵی خۆت کۆتاییەکی خۆش ڕامەماڵێت.

هەڵبژاردنە فەرەنسییەکانی ١٨٤٨ ململانێیەکی لەنێوان لویس ئەدۆلف تایەرز، پیاوی سستەم و ژەنەراڵ لویس ئیوجین کاڤاینیاک، پاسترەو و بزوێنەری هەستی خەڵک، هێنایەوە. کاتێک تایەر بۆی دەرکەوت ئەو بەشێوەیەکی نائومێدانە لە پشت ئەم کێبڕکێی هەستیارەوەیە، بەشێوەیەکی دەستەوەستان سۆراخی چارەسەرێکی کرد. چاوی کەوتە سەر لویس بۆناپەرت، نەوەی ژەنەراڵی گەورە ناپۆلیۆن، و ئەندامێکی پێگە نزم لە پەرلەمان. ئەم بۆناپەرتە کەمێک گەمژە دیار بوو، بەڵام ناوەکەی بەتەنیا دەیتوانی هەڵبژێردرانی لە وڵاتێکدا مسۆگەر بکات کە کیوڕاوی فەرمانڕەوایەکی بەهێز بوو. ئەو دەبووە بوکەڵەی دەستی تایەرز و دواجار لەسەر شانۆکەوە بەلاوە دەنرێ. یەکەمین بەشی پلانەکە بەباشی کار کرد و ناپۆلیۆن بە دەنگی زۆرینە هەڵبژێردرا. کێشەکە ئەوە بوو تایەرز پێشبینی فاکتێکی سادەی نەکردبوو. ئەم "گەمژە"یە لە ڕاستیدا پیاوێکی خاوەن ئاواتی گەورە بوو. سێ ساڵ دواتر ئەو پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە، خۆی بە ئیمپراتۆر ڕاگەیاند و بۆماوەی هەژدە ساڵی دواتر حوکمی فەرەنسای کرد، کە بووەهۆی ترسی تایەرز و حزبەکەی.

کۆتاییەکە هەموو شتێکە. ئەوە کۆتایی کردارە کە دیاری دەکات کێ شکۆمەندییەکە، پارەکە، خەڵاتەکە بەدەست دێنێت. دەبێ ئەنجامگیریی تۆ ڕوون بێت و دەبێ تۆ بە بەردەوامی لە مێشکتدا بیهێڵیتەوە. هەروەها دەبێ تۆ بزانیت چۆن ئەو سیسارکە کەچەڵانە دوور بخەیتەوە کە بە دەور و خولتدا دێن، هەوڵ دەدەن لەسەر کەلاکی نێچیرەکەت لەوەڕ بکەن. هەروەها دەبێ تۆ چاوەڕوانیی زۆر قەیرانی مومکین بکەیت کە پەت دەدەن تا ڕێگەچارە پێکەوە بنێیت

**وێنە:** خوداکانی سەر شاخی ئۆلیمپەس لە هەورەکانەوە دەڕوانە کردارەکانی مرۆڤ، ئەوان لە پێشەوە کۆتاییەکانی هەموو هەرنە مەرەکان دەبینن کە سەردەکێشن بۆ کارەسات و تراژیدی. ئەوان بە لاواری ئێمە لە بیینی ئەودیو چرکەسانەکە و مەوەی چۆن ئێمە خۆمان دەخەڵەتێنین، پێدەکەن.

**دەسەڵات:** چەمێك ئاسانترە کە خۆت بخەیتە ناو لەبری ئەوەی خۆت بخەیتە دەرەوە! دەبێ ئێمە بە پێچەوانەی قامیش ڕەفتار نەکەین، کاتێك سەرەتا دەردەکەوێت، قەدێکی بەهێز درێژ هەڵدەدات بەڵام پاشان، وەك بڵێی پرستی لێ براوە چەند گرێیەکی چر بەیدا دەکات، پیشانی دەدات کە چیتر ئەو زیندوویتی و ئەنگێزەیەی پێشووی نییە دەبێ ئێمە بە نەرمی و بەهێمنی دەست پێبکەین، هەناسەمان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەکە و پرستی زیندوومان بۆ کۆتایی هێنان بە کارەکە هەڵبگرین. لە سەرەتاکاندا، ئەوە ئێمەین کە کاروبارەکان ئاراستە دەکەین و لە دەسەڵاتی خۆماندا دمیانهێڵینەوە، بەڵام زۆرجار هەر کە ئەمانە کەوتنە جوڵە، ئەوان ئاراستەمان دەکەن و هەڵماندەگرن

(مۆنتاین، ١٥٣٣-١٥٩٢)

## پێچەوانەبوونەوە

ئەوە شتێکی سووە لەنێو ستراتیژیستەکاندا کە دەبێ پلانەکەی تۆ ئەلتەرناتیف بگرێتەخۆ ئاستێکی نەرمی و گشوکی تێدابێت. بە دڵنیاییەوە ئەمە ڕاستە. ئەگەر تۆ لەو پلانێکدا زۆر بە وشکی گیر بوویت، ئەوا ناتوانیت لەگەڵ وەرچەرخانە لەپڕەکانی چارەنووسدا مامەڵە بکەیت. هەر کەتۆ ئەگەرەکانی ئایندەت پشکنی و بڕیارت لەسەر ئامانجەکەتدا، ئەوا دەبێ ئەلتەرناتیف بونیاد بنێیت و ڕێڕەوی نوێ بەرەو ئامانجەکەت واڵا بکەیت

لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی خەڵکی کەمتر لە زیدە پلانی و ڕەقی لەدەست دەدەن بەبەراورد بە تەمومژاوییبوون هەڵێك بۆ دانانیشیی ڕێگەچارە لەبەرسەر ماروتۆجدا

مەبەستیکی راستەقینە لە تێرامان بۆ پێچەوانەبوونەوەی ئەم باسەیە نییە، چونکە دڵنی
هیچ باشییەك لە ڕەتكردنەوەی بیركردنەوەی لەپێشینە بۆ ئاییندە و پلاندانان تا
كۆتاییەكە، مەبەست ئەگەر تۆ بایی پێویست پووییت و دوور بیر دەكەیتەوە، تێدەگەیت
كە ئاییندە نادڵنیایە و ئەمەی كە دەبێ بۆ خۆگونجاندن كراوە بێت تەنیا هەبوونی
ئامانجی بەرز و پلانی دوور ڕێگەت بۆ ئەو ئازادییە بۆ خۆش دەكات

## یاسای ژمارە ٣٠

# با دەستکەوتەکانت بێ هەوڵ و ماندووبوون دیاربن

### حوکم

دەبێ کردارەکانت سروشتی و وەها دیار بن کە بە ئاسانی جێبەجێ دەبن. دەبێ هەموو ئەو رەنج و ماندووبوونەی کە لێیان سەرف دەکرێت و هەروەها هەموو ئەو فێڵە زیرەکانەی دەهێنرێنە گۆڕ لێیان بشاردرێتەوە. کاتێک تۆ هەنگاو دەنێیت، بێ ماندوویەتی و هەوڵ هەنگاو بنێ، وەک ئەوەی تۆ زیاتریت لە توانادایە. خۆت لەو فریوە لادە کە دەریبخەیت چەنێک سەرسەختانە هەوڵ دەدەیت و کار دەکەیت– ئەمە تەنیا پرسیار دەوروژێنێت. فێڵ و رەنج و بەهاکانت فێری کەس مەکە ئەگینا لەدژی خۆت بەکاری دێنێتەوە.

### پەیڕەوی لە یاساکە ١

مەراسیمی چایی ژاپۆنی کە پێی دەوترێت چانویو (ئاوی گەرم بۆ چایی) مێژوویەکی بە سەردەمانی دێریندا هەیە، بەڵام لە سەدەی شازدەدا لە سایەی پراوەکاری بەناوبانگیدا (سێن نۆ ریکیو) هەرچەندە لە خانەوادەیەکی خانەدان نەبوو، ریکیو گەیشتە دەسەڵاتێکی مەزن، بووە مامۆستای دڵخوازی چایی ئیمپراتۆر هیدیوشی و راوێژکاری

گرنگ لەسەر جوانناسی و تەبایەت بابەتە سیاسییەکان بەلای ریکیو، نهێنی سەرکەوتنی ریتی موو لە دەرکەوتنی سروشتیانە و شاردنەوەی تەقەلا لە پشت کارەکەتەوە.

ڕۆژێکیان ریکیو و کوڕەکەی چوونە ماڵی ناشنایەک بۆ مەراسیمی چایی. لە ڕێگەیاندا، کوڕەکە بینیی ئەوەی کرد کە دەروازە ڕواڵەت کۆنە جوانەکەی ماڵی خانەخوێکەیان ڕووکارێکی تەبایانە دەبەخشێ. ماوکی لە وەڵامدا وتی " پێم وانییە وەها دێتە بەرچاو کە لە پەرستگایەکی شەخەوە هێنرابێتە خوارەوە و وەک بڵێی تەقەلای پێویست بۆ هێنانی، پەرەیەکی زۆری تێچووبێت" ئەگەر خاوەنی خانووەکە ئەو هەموو تەقەلایەی بۆ دەروازەکە سەرف کردبێت، ئەوا لە مەراسیمی چاییەکەی پێشان دەدرێت- و لە ڕاستیدا دەبووایە سێن نۆ ریکیو زوو مەراسیمەکە جێ بهێڵێت و نەیدەتوانی بەرگەی ئەو ستۆر و تەقەلایە بگرێت کە بە مەبەست بەدیار خرا.

لە ئێوارەیەکی تردا، کاتێک ریکیو خەریکی چا لێنان بوو لە ماڵی هاوڕێیەک، خانەخوێکەی بینی کە دەچێتە دەرەوە، فانوسێکی لە تاریکاییدا بەدەستەوەیە، لیمۆ لە درەختێک لێ دەکاتەوە و دەهێنێتە ژوورەوە. ریکیو شڵەشکە ببوو- خانەخوێکە پێویستی بە سەرگەرمییەک هەبوو بۆ ئەو خواردنەی پێشکەشی دەکرد و بەشێوەیەکی ڕەمەکی چووبووە دەرەوە تا بیهێنێت. بەڵام کاتێک کابرا لیمۆی لەگەڵ هەندێ کێکی برنجی ئۆساکای پێشکەش کرد، ریکیو درکی بەوە کرد کە هەر لە پێشدا ئەو پلانی لێکردنەوەی لیمۆی داناوە، بۆئەوەی شانەشانی ئەم خواردنە گرانبەهایە بێت. ئەمازەکە چیتر ڕەمەکی دیار نەبوو- ئەمە ڕێگەیەکی خانەخوێ بوو تا زیرەکی خۆی بسەلمێنێ ئەو بە ڕێکەوت دەریخستبوو کە مەزڵدان چەندێک سەختە. پاش ئەوەی بابی پێویستی بینی، ریکیو بە ئەدەبەوە کێکەکەی ڕەت کردەوە، پۆزشی هێنایەوە و ڕۆیشت.

جارێکیان ئیمپراتۆر هیدیۆشی پلانی دانا بۆ سەرداڵکردنی ریکیو بۆ مەراسیمی چایی لە شەوی پێش هاتنیدا، بەفر باری. ریکیو پاش ئەوەی بەخێرایی دەستیکرد بە بیرکردنەوە، دەستیکرد بە دانانی کۆشنە لە سەر ئەو پلیکانە بەردانەی بەسەر باخچەکە بەرەو ماڵەکەی دەچوون. ڕێک پێش بەرەبەیان، لە خەو هەڵسا، بینی کە چیتر بەفر

مامارێت و بە پووپاییەوە گۆشەکانی لابرد. کاتێک هیدیوتی گەیشت، لەبەرامبەر جوانیی بەمەکەدا سەرسام بوو– ڕێك شوێنی گۆشەکان لەسەر پلێکانە بەردەکان بەفری پێوە بەبوو– و تێبینی ئەوەی کرد کە هیچ کاریگەری بەسەر کارەکەی ڕیکیوە نییە بەڵکو تەنیا ئاماژەیەکی بەڕێزانەی پێوە دیارە

## لێکدانەوە

بەلای سێن نۆ ڕیکیوە، دەرکەوتنی لەپڕی شتێك بەشێوەیەکی سروشتی، تەفریەی بەریکەوت دڵگیر، ترۆپکی جوانی بوو. ئەم جوانییە بەبێ ئاگادارکردنەوە دەهات و بێ تەقەلا دیار بوو. سروشت شتی زۆری بە یاساکان و پرۆسەکانی خۆی دروستکردووە، بەڵام دەبێ مرۆڤەکان کاریگەرییەکانی خۆیان لە ڕێگەی تەقەلا و لێهاتوویی دروست بکەن. کاتێکیش ئەوان تەقەلای بەرهەمهێنانی کاریگەرییەکەیان پێشاندا، کاریگەرییەکە دارِژا، دەروازەکە لە شوێنێکی زۆر دوورەوە هێندرابوو، لێکردنەوەی لیموکە بەمەبەست نیاز بوو

زۆرجار تۆ دەبێ تۆ تەڵەکە و مارەسەی بەکار بێنیت بۆ دروستکردنی کاریگەرییەکانت– گۆشەکان لەناو بەفردا– بەڵام نابێ دەوروبەرت گومان لە کارەکەت یان ئەو بیرکردنەوەیەت کە پشتیەوەیە. سروشت فێڵەکانی دەرناخات و ئەوەی کە لە دەرەنجامی هەوڵ و تەقەلادا لاسایی سروشت دەکاتەوە لە دەسەڵاتی سروشت نزیک دەبێتەوە

## پەیڕەوی لە یاساکە ٢

گەورە هونەرمەندی خۆفرۆشکردن، هاری هودینی، کردارەکەی خۆی وەکو "مومکینی نامومکین"[1] ڕاگەیاند. لە ڕاستیشدا ئەوانەی شایەتی خۆفرۆشکردنە دراماتیکییەکانی بوون هەستیان بەوە کرد کە ئەوەی لەسەر سەنایج کردوویەتی هاوتەرزە لەگەڵ بیروکە باوەکانی توانای مرۆڤ.

ئێوارەیەکی ١٩١٤، نزیکەی ٤٠ هەزاری لەندەنی شانۆیەکیان پڕ کرد بۆ تەماشاکردنی قفڵکردنی ئەحەدسەمەك لەلایەن هۆدینییەوە. ئەو خۆی لە جوتێك کەلەبچەی ئاسن قوتار دەکرد کە وەکو بەهێزترین کەلەبچە تۆمار کرابوون. ئەمانە هەر دانەیەکیان لە شەش سێت قفل و نۆ زەمانە پێکدەهاتن و ئاسنگەرێکی بێرمینگهامی پێنج ساڵی بەسەر بردبوو تا دروستیانکات. ئەو شارەزایانەی کە دەیانپشکنین، وتیان قەت شتی وەها ئاڵۆزمان نەبینیوە و ئەم ئاڵۆزییە وەهای لێدەکردن کابرا نەتوانێ خۆی لێیان دەرباز بکات.

جەماوەر تەماشای شارەزاکانیان دەکرد کاتێك کەلەبچەکانیان لە باسکی هۆدینی دەکرد. ئینجا هونەرمەندەکەی خۆ قوتار کردن لەسەر ستەیجەکە چووە ناو کابینەیەکی رەشەوە. چەند خولەکێك تێپەڕی، چەندەی کات تێپەڕی، ئەوەندە یەقین پەیدا دەبوو لەوەی کە ئەم کەلەبچەیە هۆدینی دەستەوستان دەکەن. لە ساتێك لە ساتەکاندا ئەو لە کابینەکە هاتە دەر و داوای کرد کەلەبچەکان بەشێوەیەکی کاتی لاببرێن بۆئەوەی بتوانێت چاکەتەکەی دابنێت– ناوەوە گەرم بوو. تەحەدیکاران ڕەتیانکردەوە، گومانی ئەوەیان لا دروست بوو کە داواکارییەکە فێڵێك بێت بۆئەوەی بزانێت کەلەبچەکان چۆن چوونە قفڵ کراون. ئەو بێ ئەوەی سڵ بکاتەوە و بەبێ بەکارهێنانی دەستەکانی، تروانی چاکەتەکەی بەسەر شانەکانیدا بەرز بکاتەوە، بەراوەژی بکاتەوە، چەقۆیەك بە ددانەکانی بە گیرفانەکانی سنگی دەربێنێت و بە جوڵاندنی سەری، قۆڵەکانی چاکەتەکەی بێبکاتەوە. پاش ئازادبوونی لە چاکەتەکە، گەڕایەوە بۆ ناو کابینەکەی، ئامادەبووانیش بە سەرسامییەوە لەبەرسەر لێهاتوویی و جوانیی کارەکە هاواریان دەکرد.

لە کۆتاییدا پاش ئەوەی ئامادەبووانی لە چاوەڕوانییەکی زۆردا هێشتەوە، هۆدینی بۆ دووەمین جار لە کابینەکە هاتە دەرەوە، ئێستا دەستەکانی کرابوونەوە و کەلەبچەکانی بەرز کردبوونەوە. تاوەکو ئەمڕۆ کەس نزانێ ئەو کابرایە چۆن خوی قوتار کرد، هەرچەندە نزیکەی سەعاتێکی پێچوو تا خۆی قوتار کرد، قەت بێگەران دیار نەبوو، هیچ نیشانەیەکی گومانیشی پیشان نەدا. لە ڕاستیدا لە کۆتاییدا وەها دەهاتە بەرچاو کە ئەو

هۆقوتارکردنەکەی وەکو ڕێگەیەکی دەربازبوونەوەی دراماکە داڕشتووە، بۆئەوەی ئامادەبووان سەگەران بن- چونکە هیچ نیشانەیەکی تر نەبوو جگە لە ئاسایی کارەکە سکالا لەسەر گەرماش تەنیا بەشێک بوو لە نمایشەکە. هەشەن تەماشاکەرانی ئەمە و نمایشەکانی تری هۆدینی هەستیان بەوە کردووە کە ئەو گەمەیان پێدەکات. پێدەچوو بڵێت ئەم کەلەپچانە هیچ نین، لەمێژە من خۆم لەوەش خراپتر قوتار کردووە

بۆ تەقەلایی هۆدینی لە ڕاکردندا بووەهۆی ئەوەی هەندێ کەس پێیان وابێت ئەو هێزە جادووییەکان بەکار دێنێت، توانا دەروونییە بالاکان کۆنترۆڵێکی تایبەتی بەسەر جەستەیدا دەدەمێ. بەلام هونەرمەندی خۆقوتارکەری ئەڵمانی بەناوی کلێپینی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە نهێنی هۆدینی دەزانێت. ئەو تەنیا ئامرازی زۆر و ورد بەکار دێنێت. کلێپینی بەهەمان شێوە دەیگوت لە تەحەددییەکی کەلەپچەدا لە هۆڵەندە شکستی بەهۆدینی هێناوە

هۆدینی گوێی بەو هەموو دەنگۆیە نەدەدا کە لەبارەی شێوازەکانییەوە لەئارادا بوون، بەلام بەرگەی درۆی شاخداری نەدەگرت و لە ۱۹۰۲دا تەحەدای کلێپینی کرد کە لە شەڕێکی کەلەپچەدا ڕووبەڕووی ببێتەوە. کلێپینی قبوڵی کرد. لە ڕێگەی سیخوڕێکەوە، ئەو وشەی نهێنی بۆ کردنەوەی قفڵی جووتێک کەلەپچەی فەرەنسی بۆ دەرکەوت کە هۆدینی حەزی لە بەکارهێنانیان بوو. پلانەکەی ئەو بریتی بوو لە هەڵبژاردنی ئەم کەلەپچانە بۆ خۆقوتارکردن لەسەر شانۆ. ئەمە بەشێوەیەکی یەکلایی کەرەوە هۆدینی کەشف دەکرد- "بلیمەتی"یەکەی ئەو تەنیا لە بەکارهێنانی ئامێرە میکانیکییەکاندایە

لە شەوی تەحەددییەکەدا، بەو شێوەیەی کلێپینی پلانی دانابوو، هۆدینی پێشنیاری ژمارەی کەلەپچەکانی خستە بەردەم و ئەو، ئەوانەی هەڵبژارد کە قفڵی وشەی نهێنی پێوە بوو. ئەو بەدەبەت نەوانی بەو کەلەپچەوە خۆی بخاتە پشت پەردە بۆئەوەی تاقیکردنەوەیەکی حێزابەی بکات و دوایی دەرکەوتەوە و دڵنیا بوو لە سەرکەوتن

هۆدینی پێش ئەوەی وا ڕەفتاری کرد کە هەستی بە ساختەچێتییەکە کردووە، ڕەتی کردەوە کەلەپچەکان لەدەستی کلێپینی دا قفڵ بکات. دوو پیاوەکە مشتومڕیان کرد و

پێکهەڵپژان، تەنانەت لەسەر شانو ڕووبەڕوویان کرد. پاش چەند خولەکێك، لە ڕواڵەتدا هۆدینی تووڕە و نائومێدانە ملی دا و کەلەپچەکەی خستە دەستەکانی کلێپینی و قفڵی کرد. بۆ ماوەی چەند خولەکی دیکەتر کلێپینی هەوڵ و کۆششی خستەگەڕ بۆ حل فوتار کردن. هەڵەیەك هەبوو- پێش چەند خولەکێك لە پشت پەردە کەلەپچەکانی تاقی کردبۆوە و کردبوونیەوە، ئێستا هەمان کۆد چیتر کاری نەدەکرد. ئەو ئارەقی کردەوە و مشەوەش ببوو. چەند سەعاتێك تێپەڕی، ئامادەبووان ڕۆیشتن و دواجار کلێپینی بێهێز لێبڕاو و ڕیسوا ملی و داوای کردنەوەی کەلەپچەکانی کرد.

ئەو کەلەپچەیەی کە کلێپینی خۆی بە وشەی "ك-ل-ی-ل" لە پشت پەردە کردبوویەوە ئێستا تەنیا بە وشەی "س-ا-خ-ت-ە" دەکرانەوە. کلێپینی قەت بۆی دەرنەکەوت هۆدینی چۆن ئەم فێڵە زیرەکانەیە فێر بووە.

**لێکدانەوە**

هەرچەندە ئێمە بەدڵنیاییەوە نازانین چۆن هۆدینی زۆرێك لە خۆقوتارکردنە لێزانانەکانی ئەنجامداوە، شتێك ڕوونە: ئەمە جادوو نەبوو کە هێزی پێدەدا، بەڵکو کۆششی سەخت و پراوەی بێ ڕادە بوو، کە هەمووی پێکەوە بە وریایانە لە چاوی جیهان دەشاردەوە. هۆدینی قەت هیچ شتێکی بۆ بەخت نەهێشتەوە- ڕۆژ و شەو تاووتوێی کاری قفڵەکانی دەکرد، توێژینەوەی لە دەستەڕێ و فێڵەکانی چەند سەدە کۆن کرد، لاپەڕەی کتێبەکانی لەبارەی میکانیک هەڵدایە و هەر شتێکی تر کەدەیتوانی بەکاری بێنێت. هەر ساتێك کە بە توێژینەوە بەسەر نەبرایە، ئەوا بە جەستەیەوە بەسەری دەبرد، خوی بەشێوەیەکی نازارە کشۆك و نەرم دەهێشتەوە و فێر دەبوو چۆن کۆنتڕۆڵی ماسولکە و هەناسەدانی بکات.

لەسەرەتاکانی پیشەکەیدا، نمایشکارێکی ژاپۆنی کە ئەو سەفەری لەگەڵ کردبوو، فێری مێلێکی کۆنی کرد. چۆن تۆپێك قوت بدەیت پاشان بیهێنیتەوە. ئەو لە ڕێگەی پەتاتەیەکی بچوکی سپی کراوەوە کە بەسترابووەوە بە داوێکەوە بێ ڕادە پراوەی لەسەر

ئەمە کرد. ئەو بە بردنە خوارەوە و هێنانە دەرەوەی پەتانەکە، لە ڕێگەی ماسوولکەکانی قوڕگییەوە یاری پێدەکرد تا ئەوەی کە ماسوولکەکان ئەوەندە بەهێز بوون بەبێ دواوەکە بجوڵێن. ڕێکخەرانی ئەحەدسیەکەی کەلەبچە لە بەندەن، لەپێشدا هەستەی هودینیان پشکنیبوو و کەس نەیتوانیبوو قوڕگی بپشکنێت کە دەیتوانی ئامێری بچوکی تێ بشارێتەوە کە یارمەتیدەری بوون تا ڕایکات. تەنانەت بەو شێوەیەش، کلیلییی نە سەرەتەوە هەڵە بوو. ئەوە ئامرازەکانی هزنیبی نەبوون بەڵکو پراوەکەی، کارەکەی و توێژینەوەی بوو خۆقوتارکردنەکەی سنووگەر کرد.

دەبێ تۆ وەکو کەسێکی دەسەڵاتدار توێژینەوە و پرۆوەی بێ کۆتا بکەیت پێش ئەوەی لەناو خەڵک، لەسەر ستەیج یان لە هەر شوێنێکی تر دەربکەویت. هەت ئارەق کردنەوە و هەمدرووێتی لەپشت دەرکەوتنەوە نەدیار مەهە. هەندێ کەس پێیان وایە دەرکەوتنێکی وەها لێهاتوویی و سەرڕاستیان بەدیار دەهات، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە لاوازتر دەردەبڕدەهات– وەک بڵێی هەر کەسێک کە پراوە و کاری تیا کرد دەیتوانی ئەوە بکات کە کردوویەتی یان وەک بلێی بە ڕاستی دەرەقەتی کارەکە نایەت. هەوڵەکە و قیڵەکانت بۆ خۆت هەڵگرە و بەمشێوەیە جوانی و ئاسانی خوداناسات دەبێت.

*لەوانەیە دێرە شیعرێک چەند سەعاتێکمان ببات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر وەکو ساتێکی بیرکردنەوە دیار نەبێت، ئەو دروومان و هەڵوەشاندنەوەی درووماسان هیچ نەبووە.*

*ئەمریسی ئادەم، ویلیام بەتلەر یەیس،* ١٨٦٥–١٩٣٩

## کلیلی دەسەڵات

یەکەمین بیرۆکەکانی مرۆڤایەتی لەمەڕ دەسەڵات لە ڕووبەڕووبوونەوەکانی هاتووە لەگەڵ سروشتدا– بروسکەی هەور لە ئاسماندا، لافاوی لەپڕ، جیرایی و گورپی گیانەوەی کێوی. ئەم هێزانە پێویستییان بە بیرکردنەوە، پلاندانان نەبووە: ئەمانە بە دەرکەوتنی لەپڕیان، جوانییان و هێزیان لەسەر ژیان و مەرگدا سەرسامیان کردووین. ئەمەش وەک هێزێکی دەسەڵات دەمێنێتەوە کە ئێمە هەمیشە ویستوومانە لاسایی بکەینەوە. لە

ڕێگەی ڕاست و تەکنۆلۆژیاوە ئێمە حیرانی و هێزی داهێنانی سروشتمان دروستکردووەتەوە، بەڵام شتێکی کەمە ماکینەکانمان بڕۆزەژاون و تەواو نین، ئەمانە تەقەلای خۆیان پیشان دەدەن. ئەمانەت داهێنی دروستکراوەکانی تەکنۆلۆژیا داتوانن سەرسامیمان بۆ ئەو شتانە ڕیفەکێش بکەن کە بەئاسایی و بێ تەقەلا دەجوڵێن، هێزی منداڵ بۆ چەماندنەوەمان بۆ ئیرادەیان لە جۆرێک لە سیحری فریودەرانە دێت کە ئێمە بە ئامادەیی گیانەوەرێکی کەم تێزامان و جوانتر لە ئێمە، هەستی پێدەکەین. ئێمە داتوانین بگەڕێینەوە بۆ حاڵەتێکی وەها، ئەلکو ئەگەر شوولیی ڕواڵەتێکی ئەو جۆرە ئاساییە دروست بکەین، ئەوا جۆرە سەرسامییەکی ئەوانی وەها لەوانیترەوە ڕادەکێشین کە سروشت هەمیشە لە مرۆڤدا بڕوانسوویەتی.

یەکێک لە یەکەمین نووسەرانی ئەورووپی کە لەم پرەنسیپە ڕاما، لەو ژینگە هەرە ئاسروشتییەوە هات، دەرباری ڕێنیسانس. لە کتێبی (کتێبی دەرباری) کە لە ١٥٢٨دا بڵاو کرایەوە، بالدەسار کاستیگلیۆن وەسفی ڕەفتارە هەرە نێزیتەسەل و شاراوەکانی هاوڵاتی کامڵی دەربار دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا، کاستیگلیۆن ڕوونی دەکاتەوە کە، دەبێ دەرباری ئەم ئامۆژانە بە شتێکەوە پیادە بکات کە ئەو پێی دەڵێت (سپرێزاتورا) واتە توانای ئاسان پیشاندانی قورس. ئەو هانی دەرباری دەدات تا "سانایی و خاکیبوونێکی دیاریکراو کە هەموو ئەمرینەرێتی دەشارێتەوە وا لە هەر شتێک دەکات کە کەسێک دەیڵێت یان دەیکات بێ هەوڵ و تەقەلا دەرکەوێت" ئێمە هەموومان دەستکەوتی هەندێ تایبەتمەندی نائاساییمان پێ پەسەندە، بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی سروشتی و سانایی بەدەستهات، پەسندکردنەکەمان دە قات زیاد دەکات.

نهێنییەکەی (سپرێزاتورا) گونجاوە بۆ هەموو فۆرمەکانی دەسەڵات، چونکە دەسەڵات بەندە بەو ڕواڵەت و وەهمانەی دروستی دەکەیت. بڵاوکراوەکانی تۆ وەکو کاری هونەری وەهان. ئەمانە دەبێ بەکێشکردنێکی بیانبانەیان هەبێت، دەبێ چاوەڕوانی دروست بکەن و تەمانەت سەرگەرم بکەن. کاتێک تۆ کارکردنە ناوەکییەکانی نیشەکەی خۆت دەردەخەیت، ئەوا دەبیتە مرۆڤێکی تر لەناو ئەوانیتردا. ئەوەی کە قابیلی تێگەیشتنە

سەرسامکەر نییە– ئێمە دەتوانین بەخۆمان بڵێین کە دەمانتوانی ئاوا کاری باش بکەین ئەگەر پارە و کاتمان هەبووایە. خۆت لە فریوی پێشاندانی ئەوەی چەنێك زیرەکیت بپارێزە– زۆر زیرەکانەترە میکانیزمەکانی زیرەکیت بشاریتەوە.

هۆکارێکی تریش هەیە لەمەڕ ئەوەی بۆچی قەدبڕ و فێڵەکانت بشاریتەوە. کاتێك تۆ لێدەگەڕێیت ئەم زانیارییە بچێتە دەرەوە، ئەو بیرۆکانە بە خەڵك دەدەیت کە ئەوانیش دەتوانن لە دژی تۆ بەکاری بێنن. تۆ کەڵکی بێدەنگ مانەوە لەدەست دەدەیت. ئێمە دەمانەوێ جیهان بزانێت چیمان کردووە– ئێمە دەمانەوێ لوتبەرزییەکەمان سوپاسگوزاری بکرێت لە ڕێگەی ئەوەی کاری سەخت و زیرەکیمان ستایش بکرێت و لەوانەیە ئێمە تەنانەت لەبەرامبەر ئەو کاتەی کە پێی چووە بگەینە ترۆپکی لێهاتووییمان، هوسۆزییمان بوێت. فێر بە ئەم مەیلە بۆ قسە دەرپەڕاندن کۆنترۆڵ بکەیت، چونکە کاریگەرییەکەی زۆرجار هاودژە لەگەڵ ئەوەی تۆ پێشبینی دەکەیت. بیرت بێت چەندەی زۆر پڕ لە نهێنی کارەکانت هەبێت، ئەوەندە دەسەڵاتت سەرسامکەرتر دەبێت. وا دیار دەبێت کە تاکەکەس بێت دەتوانێت ئەوە بکات کە دەیکەیت– و ڕواڵەتی هەبوونی بەهرەیەکی نائاسایی زۆر بەهێزە. نواجارە لەبەرئەوەی تۆ بە جوڵەی و ئاسانیی دەستکەوتەکانت بەدەست دێنیت، خەڵکی پێیان وایە تۆ هەمیشە دەتوانیت زیاتر ئەنجام بدەیت ئەگەر سەرسەختانەتر هەوڵت دا. ئەمە نەک تەنیا سەرسامی ڕادەکێشێت، بەڵکو ترسێکیش دروست دەکات. دەسەڵاتەکانت دەستیان بۆ نەبراوە– کەس ناتوانێت سنوورەکانیان بەدی بکات.

وێنە: پێشبڕکێی ئەسپ. لە نزیکەوە ئێمە ماندووبوونییەکە، هەوڵی کۆنترۆڵکردنی ئەسپ، کۆشش، هەناسەدانی پڕ ئازار دەبینین. بەڵام لە دوورەوە لەو شوێنەی کە پێی دادەنیشین و تەماشا دەکەین، جوانی و فڕینە بەناو هەوادا. ئەوانتر لە دوورایبیدا بهێڵەرەوە و تەنیا ئەو ئاساییە بەدی دەکەین کە پێی دەجوڵێت.

دەسەڵات: بۆ هەر کردارێك کە ئاسایی لەگەڵدایە، گرنگ نییە چەنێکیش ناچیزەیە، ئەمە نەک تەنیا شەرمزایەتی ئەو کەسە دەردەخات کە ئەنجامی دەدات، بەڵکو زۆرجاریش

دەبێتەهۆی ئەوەی بە گەورەتر لەوەی کە بە واقیعی هەیە بەدی بکرێت. ئەمە لەبەر ئەوەیە کە، وەها لە تەماشاکەران دەکات موولیان وابێت کەسێک کە بەو هەموو سامانییە نمایش دەکات دەبێ مەنامەت شارەزایەتییەکی گەورەتری لەباردا بێت

(بالداسار کاستیگلیۆنی، ١٤٧٨–١٥٢٩)

## پێچەوانەبوونەوە

با ئەو مەتیبەی کە تۆ بەهۆیەوە کردارەکانت ئەنجام دەدەیت بە ڕۆحیەتدا سادە و ساف دیار بێت. وەرەیەکی زۆر بۆ شاردنەوەی کارەکەت بیۆکەیەکی یادگیر و تەقریبەی شلەژاو دروست دەکات. تۆ کەمەکە زۆر بە جدی وەردەگریت. قەت کارەکەت پیشان مەدە تا ئەوەی کە تەواو دەبێت، بەڵام ئەگەر تەقەلایەکی زۆر بەفیڕۆ بدەیت لە شاردنەوەیدا، ئەوا وەکو پۆستەرەوی وێنەکێش دەبێت کە دوایین ساڵانی ژیانی بە شاردنەوەی وێنەکانی سەر دیوار لە چاوی خەڵک بەسەر برد و تەنیا بە شێتکردنی خۆی بە ئەنجام گەیشت.

هەروەها هەندێ کات هەن کە دەرخستنی میکانیزمەکانی ناوەوەی پڕۆژەکانت دەشێ لەجێی خۆیدا بن. ئەمە هەمووی بەندە بە زەوقی بینەرانی تۆ و بەو کاتەی تۆ دەکاری دەکەیت. پی تی بارنوم دڵی بەوەدانا کە حەمەرەکەی دەیویست هەست بە بەشداری بکات لە نمایشەکانیدا و ئەمەی کە تێگەیشتن لە تەڵەکەکانی ئەو دڵی خۆش دەکردن. لەوانەیە بەشێکی ئەمە پەیوەندی هەبێ بەوەی بەشێوەیەکی شاراوە بەدیارخستنی ئەو حەڵکەی سەرچاوەکانی دەسەڵاتیان لە چاوی خەڵک بە شاراوەیی دەهێشتەوە خێی پەسەندی ڕۆحیەتی دیموکراسی ئەمریکا بوو. خەڵکیش بەهەمان شێوە ستایشی گاڵتە و گەپ و سەرڕاستیی کابرای نمایشکاریان دەکرد. بارنوم ئەمەی گەیاندە ئاستی ئاشکراکردنی ناڕاستییەکانی خۆی لە ئۆتۆبایۆگرافییەکەیدا، کە کاتێک مووسی لە ژیانی پیشەییدا لە لوتکەدا بوو.

تا ئەو جێیەی کە دەرخستنی مەبەستەکیانەی ئەڵەکە و تەکنیکەکان بە وریاییەوە پلانی بۆ دادەڕێژرێت، نەک ئەنجامی پێویستیی کۆنترۆڵنەکراو بۆ درزەپێکردن، ئەمە ڕیزەکییە. ئەمە وەهمێک لەبارەی بالایەتی و بەشداربوون دەداتە جەماوەر، تەنانەت ئەو کاتەش کە بەشی زۆری ئەوەی دەیکەیت بە هەڕاوەیی لە چاوی ئەوان، دەمێنێتەوە.

## یاسای ژمارە ٣١

# بژاردەکان کۆنترۆڵ بکە
# وا لەوانیتر بکە مامەڵە بەو کارتانەوە بکەن کە تۆ بەدەستتەوەن

### حوکم

*باشترین فریوەکان ئەوانەن کە وەها دیارن بژاردە دەدەنە کەسەکەی تر، قوربانییەکانی تۆ هەست بەوە دەکەن کە کۆنترۆڵیان بەدەستە، بەڵام بە ڕاستی بووکەڵەی دەستی تۆن. ئەو بژاردانە بخەرە بەردەم خەڵکی کە لە بەرژەوەندیی تۆ دەشکێنەوە هەر کامێکیان هەڵبژێرن. ناچاریان بکە لەنێوان دوو خراپەدا بچوکترینی هەڵبژێرن، کە هەردووکیشیان لە بەرژەوەندی تۆن. بە توندی تەنگژەیەکیان داکە. ئەوان ڕوو لە هەر کوێیەک بکەن قۆچەکانیان تێیدا چووە*

### پەیڕەوی لە یاساکە ١

لە سەرەتاکانی حوکمڕانییەکەیدا، ئیڤانی چوارەم کە دواتر بە ئیڤانی ترسناک ناسرا، دەبوایە ڕووبەڕووی واقیعی ناخۆش ببێتەوە. وڵات بەشێوەیەکی بە تاسەوە پێویستی بە ڕیفۆرم بوو، بەڵام لە دەسەڵاتی ئەو ئاراستەکردنی کەم بوو. گەورەترین سنوور لەبەردەم دەسەڵاتیدا لە (بۆیار)ەکانەوە بوو، ئەو چینە میرزادەیەی ڕووس کە وڵاتی پەککەوتە کردبوو و جوتیارانیان ترساندبوو

له ١٥٥٣دا، له ته‌مه‌نی بیست و سێ ساڵیدا ئیڤان نه‌خۆش که‌وت. پاش ئه‌وه‌ی به‌باو پێمه‌مدا که‌وتبوو، له سه‌رو به‌ندی مردنیدا، داوای له بۆیاره‌كان كرد سوێندی وه‌فاداری بۆ كوڕه‌كه‌ی وه‌كو سزاری نوێ بخۆن. هه‌ندێكیان ڕازی بوون، هه‌ندێكیان ته‌نانه‌ت ڕه‌تیان كرده‌وه. پاشان له‌وێوه ئیڤان بینی كه ده‌سه‌ڵاتی به‌سه‌ر بۆیاره‌كاندا ناشكێت. ئه‌و له نه‌خۆشییه‌كه‌ی چاك بۆوه، به‌ڵام قه‌ت واده‌كه‌ی بیر نه‌چۆوه. بۆیاره‌كان ئاماده‌بیان تێدابوو تێكیبشكێنن و له ڕاستیدا له ساڵانی دواتردا، زۆرێك له به‌هێزترینی ئه‌وان چوونه پاڵ دوژمنی سه‌ره‌كی ڕوسیا، پۆڵه‌نده و لیتوانیا كه له‌وێ پیلانی گه‌ڕانه‌وه‌یان و سه‌رنگومكردنی سزاریان دانا. ته‌نانه‌ت یه‌كێك له نزیكترین هاوڕێكانی ئیڤان، میر ئاندرێ كوربسكی، له‌پڕێكدا له‌و هه‌ڵگه‌ڕایه‌وه، له ١٥٦٤دا چووه پاڵ لیتوانیا و بووه به‌هێزترین دوژمنی ئیڤان.

كاتێك كوربسكی ده‌ستیكرد به ئاماده‌كردنی سه‌رباران بۆ داگیركردن، له‌پڕێكدا سیلسیله‌ی پاشایه‌تی له هه‌ركاتێكی تر له‌رزۆكتر دیار بوو. له‌كاتێكدا كه جاده‌ساسی كرچكردوو له خۆرئاواوه پیلانیان داده‌ڕشت، (ته‌رته‌ره‌كان) له خۆرهه‌ڵاته‌وه ڕێچكه‌یان به‌ستبوو و بۆیاره‌كان له‌نێو وڵاتدا خه‌ریكی دانه‌وه‌ی پشێوی بوون، قه‌باره‌ی گه‌وره‌ی ڕوسیا مۆته‌كه‌یه‌كی هێنابووه ئاراوه بۆ به‌رگریكردن. ئیڤان له هه‌ر ئاراسته‌یه‌كه‌وه هێرشی ببردایه، له ئاراسته‌كه‌ی تره‌وه حاڵی لاوازی ده‌رده‌كه‌وت. ته‌نیا ئه‌گه‌ر ده‌سه‌ڵاتی ڕه‌های هه‌بووایه ده‌یتوانی ده‌ست و په‌نجه له‌گه‌ڵ ئه‌م هه‌ڕه‌شه چه‌ند سه‌ره‌دا نه‌رم بكات. ده‌سه‌ڵاتێكی وه‌ها ڕه‌هاشی نه‌بوو

ئیڤان تاوه‌كو سه‌ر له به‌یانیی ٣ی دیسه‌مبه‌ری ١٥٦٤ تیمكری، كاتێك هاوڵاتیانی مۆسكۆ له‌به‌رامبه‌ر دیمه‌نێكی سه‌یردا شڵدار بوونه‌وه. سه‌دان حیسكه‌ی سه‌ر به‌فر گۆڕه‌پانی به‌رده‌م كرێملینیان پڕ كرد، كه به گه‌نجینه‌كانی سزر باركرابوون و پیتاكیان به‌ئنی سه‌راسه‌ری وڵات تێدابوو. ئه‌وان به گومانه‌وه ده‌یانڕوانییه ئه‌و دیمه‌نه له‌كاتێكدا كه سزار و ده‌رباره‌كه‌ی حلیسكه‌كانیان پڕ كرد و شاریان جێهێشت. به‌بێ ڕوونكردنه‌وه‌ی بۆچی، ئه‌و خۆی له گوندێكی باشووری مۆسكۆ جێگیر كرد. بۆ ماوه‌ی سه‌رانسه‌ری مانگێك

جۆرێك لە ترس یەخەی پاسەهتی گرت، چونکە مۆسکۆییەکان ترسی ئەوەیان هەبوو ئیڤان لەبەرامبەر ژمارە سنووری خزمەکان دەستبەرداریان ببێت. دوکانەکان داخران و بانقە گیرەشێوییەکان ڕۆژانە کز دەبوونەوە. دواجار، لە کانوونی دووەمی ١٥٦٥دا، نامەیەك لە سوارەوە گەیشت، تیایدا ڕووی کردبووە کە چیتر بەرگەی ناپاکییەکانی بۆیار ناگرێت و بڕیاریداوە بۆ تەواوی دەست لە کار بکێشێتەوە.

نامەکە کە بەدەنگی بەرز لەناو هەڵکدا خوێنرایەوە، کاریگەرییەکی شۆك ئامێزی هەبوو. بازرگانەکان و خەڵکی ئاسایی لەبەرامبەر بڕیاری ئیڤاندا سەرکۆنەی بۆیارەکانیان کرد و ڕژانە سەر شەقامەکان و بەم شۆڕەییە خانەدانەکانیان ترساند. بەڕوویی گرووپێك کە نوێنەرایەتی کەنیسە، میرەکان و خەڵکیان دەکرد گەشتێکیان بۆ گوندەکەی ئیڤان ئەنجامدا و بەناوی خەڵکی پیرۆزی ڕووسیا لە سەری پاڕانەوە بگەڕێنەوە سەر تەخت. ئیڤان گوێی هەڵخست بەڵام ڕای خۆی نەدەگۆڕی. لەگەڵ ئەوەشدا، پاش ڕۆژانێك لە گوێبیستبوونی داوا و تکایان، مەرجێکی خستە بەردەم ڕەعیەکانی: یان ئەوەتا دەسەڵاتی ڕەهای بدەنێ بۆ حوکمڕانی بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت، بەبێ دەستێوەردانی بۆیارەکان، یان ئەوان سەرکردەیەکی نوێ بدۆزنەوە.

بە ڕووبەڕووبوونەوەی مەرجەیەك لەنێوان شەڕی ناوخۆ و قبوڵکردنی دەسەڵاتێکی زۆردارانە، تەقریبەن هەموو سێکتەرێکی کۆمەڵگەی ڕووسی لەگەڵ سزارێکی بەهێزدابوون و داوای گەڕانەوەی ئیڤانیان بۆ مۆسکۆ و گەڕاندنەوەی یاسا و سیستەمیان کرد. لە مانگی شوباتدا، بە شێوەی ئاهەنگێکەوە، ئیڤان گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ. ڕووسییەکان چیتر سکاڵایان نەکرد بەوەی ئاخر دیکتاتۆریانە ڕەفتار دەکات- ئەوان خۆیان ئەم دەسەڵاتەیان پێدابوو.

## لێکدانەوە

ئیڤانی خەمناك ڕووبەڕووی ئەنگژەیەکی توند بووەوە: مندان بۆ بۆیارەکان دەبووە هۆی داڕمانێکی حەتمی، بەڵام شەڕی ناوخۆ جۆرێکی جیاوازی داڕمانی دەهێنایە

کایەوە. تەنانەت ئەگەر ئیڤان لەو جەنگەش سەرکەوتوو بووایە وڵات دادەڕووخا و دامەشبووەکانی لەهەموو کاتێکی تر زیاتر دەبوو. ئەو بژاردەیەی کە لە ڕابردوودا چەکی دەستی بوو ئەوە بوو هەنگاوێکی بوێرانەی توند بنێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێستا ئەو جۆرە جوڵەیە لە دژی دەشکایەوە– چەندە بوێرانە ڕووبەڕووی دوژمنەکانی ببوایەوە، ئەوەندە توندتر پەرچەکرداری دەوروژاندن.

خاڵی هەرە لاوازی نمایشی هێز ئەوەیە کە کینە دەوروژێنێت و دواجار سەر دەکێشێت بۆ پەرچەکردارێک کە دەسەڵاتەکەت هەڵدەلوشێت. ئیڤان بێ ڕادە ئافرێنەر بوو لە بەکارهێنانی دەسەڵاتدا، بە ڕوونی ئەوەی دیبی کە تاکە ڕێگە بەرەو ئەو جۆرەی سەرکەوتن کە دەیویست کشانەوەیەکی ساختەیە. ئەو وڵاتی لەمەڕابەر پۆستەکەیدا ناچار نەدەکرد، ئەو "بژاردەگەلێک"ی دەخستە بەردەمیان: یان ئەوەتا وازبێنێت و ئانارشییەکی حەتمی دروست ببێت، یان دەسەڵاتی ڕەها بگرێتە دەست. بۆئەوەی پاڵپشتی هەنگاوەکەی بکات، ڕوونیکردەوە کە وازهێنانی پێ باشترە "فەرموون تەختی خۆتان بەدەنەڕوو و تەماشا بکەن چی ڕوودەدات" کەس ئەمەدای نەکرد. بە کشانەوە بۆ ماوەی مانگێک، نیمەنێکی مونەکەی پیشانی وڵات دا کە بەدوای وازهێنانیدا دەهات– دەگیرکاری تەرتەر، شەڕی ناوخۆیی، کاولکاری، (هەموو ئەمەش دواجار بە "ڕۆژگاری گیروگرفت"ی بەدناودا بەدوای مردنی ئیڤاندا دەهات)

کشانەوە و ونبوون ڕێگەی کلاسیکی کۆنترۆڵکردنی بژاردەکانە. تۆ هەستێکی ئەوە دەدەیت خەڵک کە شتەکان بەبێ تۆ چۆن چۆنی دادەڕمێن و تۆ "بژاردە"یان دەخەیتە بەردەم: من دوور دەکەومەوە و ئێوە زیانمەندی لێکەوتەکان دەبن یان من لەژێر ئەو بارودۆخەدا دەگەڕێمەوە کە خۆم دەیسەپێنم. لەم شێوازەی کۆنترۆڵکردنی بژاردەکانی خەڵکدا، ئەوان ئەو بژاردەیە هەڵدەبژێرن کە دەسەڵاتت دەداتێ چونکە ئەلتەرناتیڤەکە زۆر ناخۆشە. تۆ زۆرییان لێدەکەیت، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ. پێدەچێت ئەوان بژاردەیەکیان هەبێت. هەرکاتێک خەڵک هەستیان کرد بژاردەیان هەیە، زۆر ئاسانتر دەچنە ناو تەڵەکەتەوە.

پەیوەندیکردن لە پاسلکە ٢

وەکو سۆزانیی فەرەنسی سەدەی حەڤدە، نینۆن دی لێنکلۆس بۆی دەرکەوت کە ژیانی هەندێ خۆشی دیاریکراوی تێدایە. عاشقەکانی لە بنەماڵەی پاشایەتی و ئەریستۆکراسییەوە بوون و ئەوان پارەی باشیان دەدایە، دەیانخستە بەر پێژنەی زیرەکی و فیکری خۆیان، موزیکیان دەکرد نەک ئەوەی داوای پێویستیی سۆزی بکەن و تەقریبەن وەک هاوڕێیەک مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد. ژیانێکی وەها بۆ پادە دڵپەسەندتر بوو لە هاوسەرگیری. لە ١٦٤٣دا، دایکی نینۆن لەپڕ مرد و ئەوی لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا جێ هێشت. ئەو لە جیهاندا بەتەواوی تەنیا مابووە – نە خێزان، نە مارەیی، نە هیچ شتێکی هەبوو پشتی پێ قایم بکات. جۆرێک لە ترس یەخەی گرت و ئەو چووە ناو کەنیسەیەکەوە و پشتی لە عاشقە ناسراوەکانی کرد. ساڵێک دواتر، ئەو کەنیسەی جێهێشت و بەرەو لیۆن ڕۆیشت. کاتێک بۆ دراجار لە پاریس لە ١٦٤٨دا دەرکەوتەوە، عاشقان و داواکارانی بە ئیشتیای زیاتر لە پێشوو بەرەو ماڵەکەی چوون، چونکە ئەو زیرەکترین و ڕێندووترین سۆزانی سەردەمەکەی بوو و زۆر هەست بە خاڵیبوونی شوێنەکەی دەکرا.

هەرچۆنێک بێت شوێنکەوتووانی نینۆن بەخێرایی بۆیان دەرکەوت کە ئەو بەخێرایی شێوازە کۆنەکەی گۆڕیبووە و سیستەمێکی نوێی بژاردەکانی داناوە. دۆکەکان، سپیۆرەکان و میرەکان کە دەیانویست پارەی خزمەتگوزارییەکانی بدەن توانیان لەکارەکانیان بەردەوام بن، بەڵام ئەوان چیتر کۆنترۆڵ بەدەست نەبوون – ئەو کاتەی خۆی بویستایە لەگەڵیاندا دەخەوت. هەموو ئەو شتەی پارەکەیان دەیتوانی بیکڕێت ئەگەرێک بوو

## لێکدانەوە

ژیانی سۆزانی ئەگەری دەسەڵاتێکی بەتوانا دەدات کە لە ژنی هاوسەردار نکوڵی دەکرا، بەڵام بەهەمان شێوە مەترسی ئاشکرایشی بەدواوە بوو. ئەو پیاوەی کە پارەی جرمەنگوراریی دەدایە سۆزانی، لە جەوهەردا هاوەسی بوو، خۆی بڕیاری دەدا چ کاتێک حەوەسیەتی و چ کاتێک نا، توانی دەستبەرداری دەبوو. لەکاتێکدا کە تەمەنی دەچوو، بژاردەکانی بەرتەسک دەبوونەوە، لەکاتێکدا کە پیاوانێکی کەم هەڵیاندەبژارد بۆ خۆلادان لە ژیانێکی هەژاری، دەبوایە سامانەکەی کۆ بکاتەوە لەکاتێکدا کە گەنج بوو، بۆیە چاوچنۆکیی ئەفسانەیی سۆزانییەکە، وێنەدەرەوەی دەروونەتێکی کرداری بوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەرسەختیکیشییەکەی کەم دەکردەوە، چونکە وەهمی دڵخوار بوون بەلای پیاوانەوە گرنگە کە زۆرجار ناموو دەبن ئەگەر هاوەڵەکانیان زۆر بایەخ بە پارەکەیان بدات لەکاتێکدا کە سۆزانییەکە بەتەمەندا دەچوو، ڕووبەڕووی قورسترین چارەنووس دەبووەوە

## کلیلی دەسەڵات

وشەی وەکو "ئازادی" و "بژاردەکان" دەسەڵاتی ئەگەرێک زۆر بەرینتر واتیمی ئەو سنوورانەوە دەبرووینێت کە دەبخەینەوە کاتێک لە ڕێگەوە دەپشکنرێن، ئەو بژاردانەی هەمان- لە بازاڕ، لە هەڵبژاردن، لە کارەکانماندا- سنووربەندیی بەرچاویان دەبێ ئەمانە زۆرجار پەیوەستبوون بە هەڵبژاردنەوە هەیە لەنێوان ئەلف و با دا، لەگەڵ بەشەکەی تری ئەلف بێی وشەکەدا لەگەڵ ئەوەشدا تا ئەو جێیەی کە گرنگترین سەرابی هەڵبژاردن دەدرەوشێنەوە، ئێمە بە دەگمەن ئەرکیز دەخەینە سەر بژاردە ونەکان ئێمە ئاوەرکردن بەرەی گەمەکە عەسبلانەیە و ئەوەی کە ئازادیمان هەبە "هەڵدەبژێرین" ئێمە پێمان ناشێرە زۆر بیر لە قووڵایی ئازادیی هەڵبژاردنمان بکەینەوە

ئەم نائامادەییە بۆ پشکنینی بچوکیی بژاردەکانمان لەو فاکتەوە سەرچاوە دەگرێت کە بڕێکی زۆری ئازادی خۆرێک لە شڵەژانی دروست دەکات، فرەیی "بژاردە بێ سنوورەکان لە ڕاستیدا ئیفلیجمان دەکەن و توانامان بۆ هەڵبژاردن لێڵ دەکەن. پشتی سنوورداری بژاردەکان ئاسوودەمان دەکەن

ئەمە دەرفەتی گەورەی فریودان بۆ کەسی زیرەک دابین دەکات. چونکە ئەو حەڵکەی لەنێوان ئەلتەرناتیڤەکاندا هەڵبژاردن دەکەن، بەلایانەوە فورسە باوەڕیان وابێت کە بەکار دەبرێن یان فریو دەدرێن. ئەوان ناتوانن ئەوە ببینن کە تۆ ڕێگەی بڕێکی بچوکی ئیرادەی ئازادیان بۆ خۆش دەکەیت لەبەرانبەر بڕێکی زۆری سەپاندنی بەهێزی ئیرادەی خۆتدا. کەواتە دەبێ بونیادنانی ڕستێکی بەرتەسکی بژاردەکان هەمیشە بەشێک بێت لە تەڵەکەکانی تۆ. ڕتەیەک هەیە دەڵێت: ئەگەر تۆ بتوانیت وا لە باڵندە بکەیت خۆی بچێتە ناو قەفەسەوە، ئەوا بەو پێیە زۆر جوانتر دەخوێنێت

**بژاردەکان ڕەنگ ڕێژ بکە:** ئەمە تەکنیکێکی دڵخوازی هێنری کیسینجەر بوو. وەک وەزیری دەرەوەی سەرۆک ریچارد نیکسۆن، کیسینجەر خۆی بە ئاگاتر لە سەرۆکەکەی دەزانی و بڕوای وابوو کە لە زۆربەی بارودۆخەکاندا ئەو دەیتوانی باشترین بڕیار بۆ خۆی بدات. بەڵام ئەگەر هەوڵی بدایە بەرنامەیەک دیاری بکات، کەسێکی تەواو نائارامی توڕە یان مریددار دەکرد. بۆیە کیسینجەر سێ یان چوار بژاردەی کرداری بۆ هەر ڕووداوێک گەڵاڵە دەکرد و بەشێوازێک دەیخستنەڕوو کە ئەوەیانی بەلایەوە پەسەند بوو هەمیشە باشترین چارەسەر دیار بوو بە بەراورد بەوانەیتر. چەندین جار نیکسۆن دەکەوتە داوەوە، لەت گومانی ئەوە نەدەکرد بەرەو ئەو شوێنە ڕێ دەکات کە کیسینجەر پاڵی دەنێت. ئەمە ئامرازێکی نایاب بوو بۆ ئەوەی لەبەرانبەر گەورە نائارامەکەی بەکاری بهێنێت

**زۆر لەو کەسە بکە کە بەرەنگاری دەکات:** یەکێک لە کێشە هەرە سەرەکیەکان کە ڕووبەڕووی دکتۆر میلتن ئەریکسۆن ی پیشەنگی چارەسەری هیپنۆسیس لە ۱۹٥۰کان بووەوە، گەڕانەوە بوو بۆ حاڵی پێشوو. لەوانەیە نەخۆشەکانی وەها دیار بوون کە بەخێرایی چاک دەبنەوە، بەڵام گومانی سەرەتاییان بەرانبەر چارەسەرەکە

بەرەنگارییەکی قووڵی دروست کردبوو. ئەوان بەرووی دەگەڕانەوە بۆ حووە کۆمەکانیان،
دکتۆرییان سەرکۆنە دەکرد و چیتر نەدەچوونە لای. بۆ خۆلادان لەمە، ئەریکسۆن
دەستیکرد بە فەرمانکردن بە هەندێ لە نەخۆشەکان بەوەی کە بگەڕێنەوە دۆخی خۆیان،
بۆئەوەی وا لە خۆیان بکەن ئەوەندەی ئەو کاتەی سەرەتا هاتن هەست بە خراپی بکەن—
بگەڕێنەوە چوارگۆشەی یەکەم. لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم بژاردەیە، نەخۆشەکان
زۆربەر خۆلادان لە گەڕانەوە بۆ دۆخی پێشوو "هەڵدەبژێرن".

ئەمە تەکنیکێکی باشە بۆ بەکارهێنان لەسەر منداڵان و خەڵکی ئیرادەتەندی تر کە
حۆشی لە ئەنجامدانی پێچەوانەی ئەو شتە دەبینن کە تۆ داوایان لێدەکەیت. بەد
بزهێنانیان تا ئەو شتە هەڵبژێرن کە تۆ دەتەوێ لە ڕێگەی ئەوەی وا پیشان بدەن کە
پشتگیری پێچەوانەکە دەکەن.

**گۆڕەپانی یاری وەرچەرخێنە.** لە ۱۸٦٠ەکاندا، جێی دی ڕۆکفێلەر دەستیکرد بە
دروستکردنی مۆنۆپۆلێکی نەوت. ئەگەر ئەو هەوڵی بدایە کۆمپانیا نەوتە بچوکەکان
بکڕێت ئەوا ئەوان بۆیان دەردەکەوت مەرێکی چییە و بەرەنگاریان دەبوو. لەبری
ئەمە، ئەو بە نهێنی دەستیکرد بە کڕینەوەی کۆمپانیاکانی سکەی شەمەندەفەر کە
نەوتیان دەگواستەوە. کاتێک ئەو دواتر هەوڵیدا کۆمپانیایەکی دیاریکراو کۆنترۆڵ بکات و
ڕووبەڕووی بەرەنگاری بووەوە، پشت بەستنیان بە سکەی شەمەندەفەر بیر هێنایەوە،
بە ڕەتکردنەوەی گواستنەوەی نەوتیان، یان تەنیا بەرزکردنەوەی کرێکانیان، لەوانەبوو ببێتە
هۆی ڕووخاندنی بزنسەکەیان. ڕۆکفێلەر گۆڕەپانی یارییەکەی گۆڕی بۆئەوەی ئەو تاکە
بژاردەیەی بەرهەمهێنەرە بچوکەکانی نەوت هەیانبوو ئەوانە بن کە ئەو پێی بەخشین.

لەم تاکتیکەدا نەیارانی تۆ دەزانن ڕووبیان لێدەکرێت، بەڵام گرنگ نییە. تەکنیکەکە
لەدژی ئەوانە کاریگەرە کە بەهەموو شێوەیەک بەرەنگاری دەکەن.

**بژاردە بچوک بووەوەکان.** مامەڵەکاری هونەریی فەرەنسی سەدەی نۆزدە ئامبرۆیس
ڤۆلارد لەم تەکنیکەدا لێهاتوو بوو.

مشتەری دەهاتە دوکانی فۆلارد بۆ بینینی هەندێ لە تابلۆکانی ستراین. ئەو سێ تابلۆی پیشانی دەدان، بیری دەچوو نرخێک بڵێت و وا پیشانی دەدا کە خەواڵووە، سەردانکەران دەبووایە بەبێ بڕیاردان بڕۆن. ئەوان ناچار ڕۆژی دواتر دەهاتنەوە بۆئەوەی جارێکی تر تابلۆکان ببینن، بەڵام ئەمجارە فۆلارد کارە کەمتر سەرنجڕاکێشەکانی دەهێنایە دەرەوە، وایدەردەخست کە وەیلنیووە هەر کارەکانی پێشوون. مشتەرییە سەرگەردانەکان دەیانپرسی ئۆفەرە تازەکان، دەیانپشکنی و بیریان دەکردەوە و پاشان دەگەڕانەوە. جارێکی تر هەمان شت ڕوویدەدا: فۆلارد ئەو تابلۆیانەی کوالیتیان نزمتر بوو پیشان دەدا. دواجار کڕیارەکان درکیان بەوە دەکرد کە ئەوان شتێکی باشتریان لەئێستادا لەبەردەستدایە، چونکە سبەی دەمێ بۆ شتێکی خراپتر مل بدەن تەنانەت بە نرخێکی بەرزتریش

لەوانەیە گۆڕانکارییەکی بچوک لەم تەکنیکەدا بریتی بێت لە بەرزکردنەوەی نرخ لە هەرکاتێکدا کە کڕیار ڕاڕا دەبێت و ڕۆژێکی تر تێدەپەڕێت ئەمە پلانێکی دەوستانی نایابە بۆ بەکارهێنانی لەسەر کەسێک کە خۆی ڕاڕایە کە دەکەوێتە داوی بیرۆکەی ئەمەی کە ئەمڕۆ نرخێکی باشتریان دەست دەکەوێت نەک ئەوەی تا سبەی چاوەڕێ بن

**کابرای لاواز لە لیژالیدا**، لاوازەکان ئاسانترین بۆ مانۆڕ لە ڕێگەی کۆنترۆڵکردنی بژاردەکانیانەوە. کاردینال دی ڕێتز، ڕابەری سیاسی، یاریدەدەری ئەرەسمی دوکی ئۆلیێر بوو و لە ڕاپەڕیندا بەدناو بوو. ململانییەکی بەردەوام بوو کە قەناعەت بە دوک بهێنێت بۆ هاوکاریان- ئەو هەر دەهات و دەچوو، بژاردەکانی هەڵدەسەنگاند و چاوەڕێ دەبوو تا دوایین سات و سەرئێشەی بەهەمووان دەبەخشی. بەڵام ڕێتز ڕێگەیەکی دۆزییەوە بۆئەوەی دەست و پەنجەی لەگەڵ نەرم بکات. ئەو هەموو جۆرەکانی مەترسی باس دەکرد، ئەوەندەی بکرایە زیدەڕۆیی تێدا دەکرد، تا ئەوەی کە دوک لە هەموو لایەکەوە یارییەکی بەدی دەکرد جگە لەیەکێکیان. ئەوەیان کە ڕێتز فشاری بۆ دەهێنا تا بیگرێتە بەر.

ئەم تاکتیکە هاوشێوەی "ڕەنگی بژاردەکان"ە، بەڵام لەگەڵ لاوازەکاندا دەبێ توندتر بێت. کار لەسەر هەستەکانیان بکە- ترس و توڕەیی بەکار بهێنە بۆ ئەوەی بیانخەیتە ناو کردارەوە. ئەقڵ بەکار بێنە و ئیتر ئەوان هەمیشە ڕێگەیەک بۆ تەمەڵیکردن دەدۆزنەوە.

**برا لەناو تاواندا.** ئەمە تەکنیکێکی نا هونەرمەندانەی کلاسیکە. تۆ قوربانییەکانت بۆ پیلانێکی تاوان ڕادەکێشیت، پەیوەندییەکی خوێن و گوناه لەنێوانتاندا دروست دەکەیت. ئەوان لە فریوەکەی تۆدا بەشدار دەبن، تاوانێک ئەنجام دەدەن (یان پێیان وایە ئەنجامی دەدەن-) و بە ئاسانی بەکار دەبرێن. سێرج ستاڤیسکی، ساختەچی گەورەی ١٩٢٠ەکان، ئەوەندە حکومەتی گلاندبووە ناو تەڵەکە و فێڵەکانی کە دەوڵەت جورئەتی ئەوەی نەدەکرد دادگایی بکات و "بەرباریدا" وازی لێ بهێنێت. زۆرجار وەها زیرەکترە ئەو کەسە بگلێنیتە ناو فریوەکانت کە ئەگەر شکست بێنێت دەتوانێ زۆرترین زیانت پێ بگەیەنێت، دەشێ تێوەگلانیان ئاڵۆز بێت- تەنانەت سەرەداوێکی تێوەگلانیان بژاردەکانیان بەرتەسک دەکاتەوە مندەکیان مسۆگەر دەکات.

**لۆچەکانی تەنگژە.** سیخوڕەکە بەهۆی پێ ڕێشتنی بەناوبانگی ژەنەراڵ ویلیام شێرمان لە ڕێگەی جۆرجیا و لەماوەی شەڕی ناوخۆی ئەمریکا پیشاندرا. هەرچەندە کۆنفیدراڵەکان دەیانزانی شێرمان بە چ ئاراستەیەک ڕێ دەکات، قەت نەیاندەزانی ئاخۆ ئەو لە ڕاستەوە یان لە چەپەوە هێرش دەکات، چونکە ئەو سوپای دابەشکردبوو بۆ دوو باڵ- و ئەگەر یاخییەکان لە باڵێکەوە بکشابانەتەوە ئەو ڕووبەڕووی یەکێکی تر دەبوونەوە. ئەمە تەکنیکی دادگایی کلاسیکی پارێزەرە. پارێزەر پیسایی شایەتحاڵەکان دەکات تا لەنێوان دوو ڕوونکردنەوەی ئەگەریی ڕووداوێکدا بڕیار بدەن کە هەردووکیان کونێک دەکەنە چیرۆکەکەیان. دەبێ ئەوان وەڵامی پرسیارەکانی پارێزەر بدەنەوە، بەڵام هەرچییەک بڵێن، زیان بەخۆیان دەگەیەنن. کلیلی ئەم هەنگاوە بێدانی خێرایە قوربانییەکە بێبەری بکە لەکاتی بیرکردنەوە لە ڕاکردن. لەکاتێکدا کە ئەوان لەنێوان لۆچەکانی تەنگژەدا دێن و دەچن، ئەوا بەری خۆیان هەڵدەکەن

تێبگە لە ململانێکەتدا لەگەڵ ڕکابەرانت، ڕۆژگار وا پێویست دەکات تۆ ئازاریان بدەیت ئەگەریش بە ڕوونی تۆ بکەری سزاکەبیت، چاوەڕێی دژە هێرشێك بکە- پێشبینی تۆڵە بکە لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر وا دیار بێت ئەوان بکەری ئەگبەتی خۆیانن، ئەوا بە بێدەنگی مل دەدەن. کاتێك ئیڤان مۆسکۆی جێهێشت و چووە دێهاتەکەی، ئەو هاوڵاتیانەی داوایان لێدەکرد بگەڕێتەوە بە دڵڕاکەی بۆ دەسەڵاتی ڕەها ڕازی بوون، بەدرێژایی ساڵانی دواتر، ئەوان ڕقی کەمتریان لەو بوو لەبەرانبەر ئەو ترس و تۆقاندنەی لە وڵاتدا بڵاوی کردەوە، چونکە، دواجار ئەوان خۆیان ئەو دەسەڵاتەیان پێ بەخشیبوو. هەربۆیە هەمیشە وا باشە بژاردەیان بۆ ژەهر بدەیتە دەست خۆیان و ئەوەندەی دەکرێ تێوەگلانی خۆت داپۆشیت لە دابینکردنی بۆیان.

**وێنە:** قۆچەکانی گا. گا بە قۆچەکانی دەتناخێنێتە سوچێکەوە- ئاکە قۆچێك نییە کە لەوانەیە بکرێ لێی ڕابکەیت، بەڵکو جوتێك قۆچە کە دەتخاتە ناو تەڵەزگەیەکەوە- هەرچۆنێك بێت کوناوێنبوت دەکەن و هەڵتدەدرن.

**دەسەڵات:** بۆ بڕین و هەموو هەڵپەیەکی تر کە مرۆڤەکان بەشێوەیەکی ڕەمەکی و بە بژاردەی خۆیان بەسەر خۆیانی دێنن، لە دووڕەوەدا ئازاری کەمترە بەوەی کە ئەوانیتر بەسەری دێنن.

(نیکۆلۆ ماکیاڤێللی، ١٤٦٩-١٥٢٧)

### پێچەوانەوەبوونەوە

کۆنترۆڵکردنی بژاردەکان یەك ئامانجی لە پشتە ڕووپۆشکردنی خۆت وەك بکەری دەسەڵات و سزا. بۆیە تاکتیکەکە بەباشترین شێوە کاردەکات، بۆ ئەوانەی کە دەسەڵاتیان ناسکە و ناتووانن بە ئاشکرا کار بکەن بەبێ ورووژاندنی گومان، کینە و تووڕەیی. تەنانەت وەك ڕێسایەکی گشتی بە دەگمەن ژیرانەیە وەها ببینرێت کە بە ڕاستەوخۆیی و بەزۆر دەسەڵات پیادە دەکەیت، گرنگ نییە چەنێك پارێزراو و

بەهێزیشمت، ئەوجار وەها ڕێکوپێکتر و کاریگەرتریشە کە وەهمی بژاردە بخەیتە بەردەم خەڵك.

لەلایەکی ترەوە، بە سنووردارکردنی بژاردەکانی خەڵك، هەندێ جار تۆ بژاردەکانی خۆت سنووردار دەکەیت. یارودۆخ هەن تیایاندا لە بەرژەوەندیی خۆتە ئاستێکی ئازادی بە ڕکابەرانت بدەیت لەکاتێکدا کە تۆ تەماشای کارکردنیان دەکەیت، دەرفەتی دەوڵەمەند بە خۆت دەدەیت سیخوڕیی بکەیت، زانیاری کۆ بکەیتەوە و پلانی فریوەکانت دابنێیت. بانکداری سەدەی نۆزدە جەیمس ڕۆسچیلد گەیشتە ئەم میتۆدە دەهات: ئەو هەستی کرد کە ئەگەر ئەو هەوڵی بدایە جوڵەکانی نەیارەکەی کۆنترۆڵ بکات، چانسی ئەوەی لەدەست دەدا چاودێری ستراتیژەکەیان بکات و ڕێڕەوێکی کاریگەرتر بگرێتە بەر. چەندەی ڕێی بۆ ئازادیی زۆرتری بۆ ئەوان لە کورت مەودا دا خۆش بکردایە، ئەوەندە بەهێزتر دەیتوانی لە دوورمەودا دا لەدژیان هەنگاو بنێت.

## یاسای ژمارە ٣٢

# بە گوێرەی فەنتازیاکانی خەڵك یاری بکە

### حوکم

*ڕاستی زۆرجار لەمەڕنەوە خۆی لێ لادەدرێت کە درێژە و ناخۆشە. ئەت ڕوو مەکەرە حەقیقەت و واقیع مەگەڕێنەرەوە کە ئامادە ببێت بۆ ئەو تووڕەیییەی کە لە بەهۆش هاتنەوە سەرچاوە دەگرێت. ژیان ئەوەندە سەخت و نارەحەتە کە ئەو خەڵکەی دەتوانێت ڕۆمانسیەت بەرهەم بێنێت یان فەنتازیا بهێنێتە ئارا وەکو پاڵە ئاوێکی لە بیاباندا هەموان لە دەوری خڕ دەبنەوە. دەسەڵاتێکی گەورە هەیە لە خۆراکدانی فەنتازیاکانی حەشامات.*

### پەیڕەویکردن لە یاساکە

دەوڵەتشاری ڤینیسیا بۆ ماوەیەکی درێژ ئەوەندە کامەران بوو کە هاوڵاتیانی هەستیان دەکرد کە کۆمارە بچووکەکەیان چارەنووسی لەبەرزەوەندی خۆیدایە. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا و گەرمەی ڕێنیسانسدا، مۆنۆپۆلییەکەی بەسەر بازرگانیدا لەلای خۆرهەڵاتەوە، کردی بە دەوڵەمەندترین شاری ئەورووپا. لەژێر حکومەتێکی کۆماری بەخشندەدا، ڤینیسییەکان ئازادییەکیان هەبوو کە ژمارەیەکی کەمی ئیتالییەکانی تر پێی شاد ببوون. لەگەڵ ئەوەشدا، لە سەدەی شازدەدا، چارەنووسیان لەپڕێکدا گۆڕا

کردنەوەی (جیهانی نوێ) دەسەڵاتی بۆ لای ئەتلانتیکی ئەورووپا گواستەوە- بۆ ئیسپانییەکان و پورتوگالییەکان و دواتر بۆ هۆڵەندی و ئینگلیزەکان. ڤینیسیا نەیتوانی لەڕووی ئابوورییەوە کێبڕکێ بکات و ئیمپراتۆرییەتەکەی بەرەبەرە بەرەو کزی چوو. دوایین زەبر بریتی بوو لە زیانی کارلێکەری خاوەندارێتییەکی مێدیتەرانەی زۆردارییە، دوورگەی قیبرس، کە لەلایەن تورکەکانەوە لە ١٥٧٠دا لە ڤینیسیا سەندرا.

ئێستا خێزانە خانەدانەکان لە ڤینیسیا مایەپووچ ببوون و بانکەکان هەڵدەگیران. جۆرێك لە خەمساك و ڕەشبینی بەسەر هاوڵاتیاندا زاڵ بوو. ئەوان ڕابردوویەکی درەوشاوەیان دەناسی- یان ئەوەندە پیایدا ڕەت ببوون یان وەك چیرۆك لەلایەن باپیرەکانەوە بۆیان گێڕدرابووەوە. کۆتاییهاتنی ساڵانی شکۆ ڕسوائامێز بوو. ڤینیسییەکان تا ڕادەیەك ئەو باوەڕەیان لا دروست ببوو کە خودلوەندی چارەنووس تەنیا پێیان ڕەدەبوێرێت و بۆ ڕاس کوێن جارێکی تر دەگەڕێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لەکاتی ئێستادا دەیانتوانی چی بکەن؟

لە ١٥٨٩دا، دەنگۆ بلاو بووبەوە لەبارەی گەیشتنی پیاوێکی ڕازئامێز بەناوی "ئیل براگادینو"، مامۆستای کیمیاگەری، پیاوێك کە سامانی زۆری لە ڕێگەی تواناکەیەوە کەڵەکە کردبوو گوایە لە ڕێگەی چەندجارە زیادکردنی ئاڵتوون بە بەکارهێنانی مادەیەکی نهێنی. دەنگۆ بەخێرایی بلاوبوویەوە چونکە پێش چەند ساڵێك خانەدانێکی ڤینیسی کە بە بۆنەیەکدا تێدەپەڕی گوێبیستی پێشگۆیی پیاوێکی خوێندەوار بوو لەمەڕ ئەوەی کە ڤینیسیا دەسەڵات و شکۆی ڕابردووی بەدەست دێنێتەوە ئەگەر بتوانێت پیاوێك بدۆزێتەوە کە لە هونەری کیمیاگەریی بەرهەمهێنانی ئاڵتوون تێبگات. بەمشێوەیە، کاتێك قسە لەمەڕ ئەو ئاڵتوونەی براگادینۆ گەیشتە ڤینیسیا. ئەو بە بەردەوامی سکەی ئاڵتوونی لە دەستەکانی دەڕژان و کەرەستەی ئاڵتوونی کۆشکەکەیان پڕ دەکرد. هەندێکیان دەستیانکرد بە خەون بینین لە ڕێگەی ئەوەوە، شارەکەیان جارێکی تر دەگەیشتەوە کامەرانی.

ئەندامانی حیزانە جانەدانە مەرە دیارەکانی فیبیسیا بەم پێیە پێکەوە چوونە برێسیا که لەوێ براگادیبۆ دەژیا. ئەوان بە کۆشکەکەیدا گەشتیان کرد و بە سەرسامییەوە دەیانڕوانی لە کانیکدا کە نولەکانی دروستکردنی ئالتونی پیشان دەدا، بە ڕواڵەت بڕێک لە کانزای بێ بەهای هەڵدەگرت و دەیگۆڕی بۆ چەند ئۆنسێک لە تۆزی ئالتون. سێنتی فیبیسیا ئامادەکاری کرد بۆ وتوێژ لەسەر ئایدیای بانگهێشتکردنی براگادینۆ بۆ مانەوە لە فیبیسیا لەسەر حسابی شار، کاتێک لە برێنکدا قسەیان پێکەیشت لەبارەی ئەوەی کە ئەوان لەگەڵ دوکی مانتوا لەەرلسەر حرمەتگوراریيەکانی پێشبڕکێ دەکەن. ئەوان گوێبیستی قسە بوون لەبارەی ئاهەنگێکی ناباب لە کۆشکی براگادیبۆ بۆ دوک، کە تیایدا پۆشاک بە دوگمەی ئالتونەوە، سەعاتی ئالتون، پلیتی ئالتون و هیتر دەبوون. بەهۆی نیگەرانی لەمەڕ ئەوەی کە براگادیبۆ بە مانتوا بدۆڕێنی، سینات تەقریبەن بەیەکدەنگی بانگهێشتیان کرد بۆ فیبیسیا و بەڵێنیان پێدا شاحیك لەپارەی بۆ دابین بکەن بۆئەوەی بەردەوام بێت لە ستایلی ژیانی کامەران و گرنبەها- بەڵام ئەگەر بێتو ڕاستەوخۆ بێت بۆ لایان.

دەرگاکانی ئەو ساڵە براگادیبوی لەرنامبر گەیشتە فیبیسیا. بەر چاوە تاریکە تیژەکەیەوە لەژێر حوتێک بڕۆی ئەستوور و دوو سەگی رەشی (ماستیف) کە بۆ هەموو شوێنێک لەگەڵیدا بوون، ئەو کاریگەر و هەرەشەئامێز بوو. ئەو لە کۆشکێکی خۆشگوزەرێن لە دوورگەی (گدیکا) گیرسایەوە لەکاتێکدا کە کۆمار دابینی خواسەکانی، پۆشاکی گرانبەهای و هەموو ئارەزووەکانی بۆ دابین دەکرد. خورێك بە ناوی کیمیاگەری بەناو فیبیسیبدا بڵاو بووەوە. لەسەر سوچی شەقامەکان، دەستگیرەکان، هەڵوژ، ئامێری پالاوتن، کتێبی شرەرابەتی لەسەر نامەبکیان دەفرۆشت. هەمووان دەستیانکرد بە پڕۆەکردنی کیمیاگەری- هەمووان جگە لە براگادیبو.

پێدەچوو کیمیاگەرەکە هیچ پەلەی نەبێت بۆ دەستکردن بە بەرهەمهێنانی ئاڵتون کە فیبیسیای لە دارمان دەپاراست. شتێکی نامۆیە کە ئەمە هەر برەوداریيەکەی و شوێنکەوتوولی زیاد دەکرد. خەڵکی لە هەموو ئەورووپاوە، تەنانەت لە ئاسیاشەوە

دەمانی بۆ بیبینی ئەم پیارە بێ وێنەیە. چەند مانگێک تێپەڕی و دیاریی بە هەموو لایەکەوە هەڵدەڕژانە کۆشی براگادینۆ لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هیچ ئاماژەیەکی پەرجوی نەدا. کە ڤینیسییەکان بە ئاسودەییەوە چاوەڕوانی بەرهەمهێنانیان دەکرد. دواجار، هەوڵتیان بەرەبەرە ئۆقرەیان لەبەر برا، بیریان لەوە دەکردەوە ئاخۆ ئەو تاهەتایە چاوەڕوان دەبێت. سەرەتا سیناتۆرەکان هۆشداریان بە هەڵکدا پەلەی لێ نەکەن- ئەو ئەمریمەنێکی میزاجی بوو، کە پێویستی بە مەرایی بۆکردن بوو.

براگادینۆ تەنیا دەستوولی سەرکۆنەی کوماندارەکان بکات، بەڵام وەڵامگۆ بوو بۆیان ئەو وتی هەنوکە لە شوێنی دروستکردنی پارە لە شار، مادەیەکی پارئامێزی داناوە کە بەهۆیەوە ئاڵتون چەند جارە زیاد دەکرێت. بەڵام پرۆسەکە جاو بێت بەرهەمی باشتر دەبێت. ئەگەر لێبگەڕێن بۆ حەوت ساڵ، بچێتە ناو کاسکێتێکەوە، مادەکە لە ئامێری درووا ئاڵتونەکە سی قات زیاد دەکات. زۆربەی سیناتۆرەکان کۆک بوون لەسەر ئەوەی چاوەڕێ بن بۆ بەدەستهێنانی ئەو کانە ئاڵتونەی براگادینو بەڵێنی دابوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوانیتر تورە بوون. کابرا بۆ حەوت ساڵی تر لەسەر حسابی خەڵک ژیا! و زۆرێک لە هاوڵاتیانی ئاسایی ڤینیسیا هاوسۆزی بوون. دواجار مۆزەمانی کیمیاگەرەکە داوایان لەو کرد بەڵگەیەک لە هونەرەکانی پیشان بدات. بریکی بەرچاوی ئاڵتون و بەهێزبیش

براگادینۆ کە وا دیار بوو خۆی بۆ هونەرەکەی تەرخان کردووە، لە وەڵامدا وتی ڤینیسیا لە بێ ئۆقرەییەکەیدا ناپاکی بەرامبەر دەکات و بۆیە حرمەتگوزارییەکانی لەدەست دەدات. ئەو شاری جیهێشت، سەرەتا چووە دەوروبەری پادو، پاشان لە ١٥٩٠دا چووە میونخ، لەسەر بانگهێشتی دوکی باڤاریا کە وەکو سەراپای شاری ڤینیس کە سامانێکی گەورەی هەبوو بەڵام لە ڕێگەی دەست بڵاویی ساکانەوە مایەپووچ بوو و هیوادار بوو لە ڕێگەی حرمەتگوزارییەکانی کیمیاگەرە بەناوبانگەکەوە سامانەکەی بەدەست بهێنێت. بۆیە براگادینۆ ئەو ڕێککەوتنە ئاسودەبەخشەی دەستپێکردەوە کە لە ڤینیسیا پێی ئاشنا بوو و هەمان ڕێسا خوی جەندبارە کردەوە

**لێکدانەوە**

ماموگای قیرسیی گەنج ساڵێک لە فینیسیا ژیا و پێش ئەوەی خۆی وەک براگادسۆی کیمیاگەر بناسێنێت. ئەو سەبووری چۆن جەماکی ناڵی بەسەر شارد کێشاوە، چۆن هەمووان هیواخوازی پرگاریین لە سەرچاوەیەکی بێ کۆتا. لەکاتێکدا کە شارلاتییەکانی تر لەسەر بنەمای دەست تەڕی لە تەڵەکەبازیی ڕۆژانەدا لێهاتوو بوون، ماموگنا لە سروشتی مرۆییدا لێهاتوو بوو. لەکاتێکدا کە فینیسیا هەر لە سەرەتاوە ئامانجی ئەو بوو، سەفەری دەرەوەی کرد، لە ڕێگەی تەڵەکەی کیمیاگەرییەوە هەندێ پارەی بەدەستهێنا و گەڕایەوە بۆ ئیتاڵیا، دوکانێکیشی لە برێسیا دانا. لەوێ ئەو ناوبانگەی دروستکرد کە دەیزانی بۆ فینیسیا بڵاو دەبێتەوە. بەراستیدا، لە دوورەوە پڕشنگی دەسەڵاتەکەی کاریگەرتر دەبوو.

لەسەرەتادا ماموگنا نمایشی فێرەونی بەدەستپوو بۆئەوەی لەمەڕ شارەزاییەکانی کیمیاگەری قەناعەت بە خەڵك بێنێت. کۆشکە گەورەکەی و پۆشاکە گرانەکەی ئەرگومێنتێکی بالایان بۆ هەر شتێکی ئەقڵانی دابین کرد ئەمەش ئەو سوپەی بونیادنا کە بەردەوامی بەودا سامانە بیارەکەی ئەو، پاڵپشتی ناوبانگەکەی بوو وەکو کیمیاگەر، بۆیە پاڵپشتە داراییەکانی وەکو دیوکی مانتوا پارەیان دایە، ئەمەش ڕێگەخۆشکەر بوو بۆی تا بە دەوڵەمەندی بژیت و ناوبانگی وەك کیمیاگەر بچەسپێت. هەر کە ئەم ناوبانگە چەسپا و دوك و سیناتۆرەکان شەڕیان لەسەر ئەو کرد، پەنای بردە بەر ڕەووڕەتی ئاچیرەی نمایشێك. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتە سەر خەڵك فریودان ئاسان بوو، ئەوان دەیانویست باوەڕ بێنن. سیناتۆرە فینیسیەکان کە سەیان ئەو ئاڵتونی چەندجارە زیاد دەکات، ویستیان لەسەری ئەوەندە زیادبکرد کە نەیانتوانی سەیری بۆتیی شوشە لەسەر دەستی تێبینی بکەن کە ئەو تۆزی ئاڵتونی بوو دەخستە نێوان سەر پەنجە کانزاییەکەی. ئەو کە بیهاتوو و میراتی بوو، کیمیاگەری مەتارپاکی ئەوان بوو–

لەپرینگدا ئەو بریشکێکی لەو جۆرەی دروستکردبوو، کەس فریوە مادەکەی دیقەت نەدابوو

ئەمەیە هێزی فەسارپاکان کە رەنگ لەبار ئێمەدا دادەکوتێت، بەتایبەت لەکاتەکانی دەگمەنی و ئاوابوونیدا. هەڵك بەدەگمەن باوەڕیان وایە کە کێشەکانیان لە هەڵەکرداریی و گەمژەییەوە سەرهەڵدەدات. کەسێك یان شتێك هەبە سەرکۆنە بکرێت- ئەویش جیهان، خوداکان- و بۆیە پڕگاری لە دەرەوەشڕانێت. ئەگەر براکاسۆ بە شیکردنەوەیەکی تیروتەسەل لەبارەی هۆکارەکانی پشت ئاوابوونی ئابووریی شار و لەبارەی هەنگاوە واقیعییەکانی گۆڕینی شتەکان بگەیشتایەتە فینیسیا ئەوا ریسوا دەکرا. واقیع زۆر درێژ بوو و چارەسەر زۆر ئازاربەخش بوو- بەزۆری ئەو جۆرە لە کاری سەخت بوو کە پێشبینی هاوڵاتیان حستبوویانەکەر بۆ دروستکردنی ئیمپراتۆریەتێك. لەلایەکی ترەوە ئەلتاریا- لەم حاڵەتەدا پڕۆسەی کیمیاگەری- تێگەیشتنی ئاسان و ئەبەدیەت ئامکردنی خۆش بوو

بۆ بەدەستهێنانی دەسەلات، دەبێ تۆ سەرچاوەی خۆشی بیت بۆ ئەوەی دەوروبەرت- و خۆشی لە یاریکردن بە ئەلتارپاکانی هەڵك دێت. قەت بەڵێنی باشبوونێکی پەیتا پەیتا لە رێگەی کاری سەختەوە مەدە، بەڵکو بەڵێنی مانگ، وەرچەرخانی لەپڕ، مەنجەڵێك ئالتون بدە.

*پێویست ناکات کەسێك نائومێد بێت لە بەدەستهێنانی وەرگەڕاوان بۆ سەر نامۆترین گریمانە ئەگەر بایی پێویست هونەری هەبێ تا لە رەنگی دڵخوازدا بیانڕێنێت*

*دافید هیوم ١٧١١-١٧٧٦*

## کلیلی دەسەڵات

ئەلتاریا قەت ناتوانێت بەتەنیا کار بکات. ئەمە پێویستی بە باکگراوندێکی تەمومژ و ژاوەژاو هەیە. ئەمە سەرکوتگەرێتی واقیعێکە کە زەمینەسازی ئەلتارپیە بۆ رەنگ داکوتان و شکۆفە کردن. لە فینیسیای سەدەی شانزەدا، واقیع لە ئاوابوون و

لەدەستدانی شکۆدا بوو. ئەمتریای ئارایشتەکراو وەسفی بوژانەوەیەکی شکۆکانی ڕابردووی دەکرد لە ڕێگەی پەرجووی کیمیاگەرییەوە. لەکاتێکدا کە واقیع هەر خراپتر دەبوو، لیبیسیەکان حیهشکی هەوسی شاشیەحشیان بۆ مایەوە کە تیایدا شارەکەیان سامان و دەسەڵاتە بێ وێنەکەی لە شەوڕێژێکدا بە گۆڕینی تێز بۆ ئاڵتون گەڕاندەوە.

ئەو کەسەی دەتوانێت ئەمتاریا لە واقیعی سەرکوتکەر هەڵبچنێت، دەستی بە دەسەڵاتی بێ وێنە دەگات. لەکاتێکدا کە تۆ بەدوای ئەو ئەمتاریایەدا وێڵیت کە حەشامات کۆنترۆڵ دەکات، ئەوا باشان جاوت بخەرە سەر ئەو ڕاستییە ناچیرانە کە قورس دەکەونە سەر شانی هەمووسان. فەت بە بێزترینە دروەشاوەکانی خەڵکی لەمەڕ خۆیان و ژیانیان بەکیش مەبە. سزراحی ئەو شتە بکە کە بە ڕاستی بەسدیان دەکات. هەر کە تۆ ئەمەت دۆزییەوە، ئەوا ئەو کلیلە سیحرییەت هەیە کە دەسەڵاتێکی گەورەت دەخاتە ناو دەستان.

هەرچەندە کات و خەڵک دەگۆڕێن، چەند واقیعێکی سەرکوتکەر هەن کە درێژە دەکێشن و دەرفەت بۆ ئەو دەسەڵاتەی کە داسی دەکەن.

*واقیع کرێرار هێواش و پەیتا پەیتایە. ئەمە پێویستی بە کاری سەخت، بڕێک لە بەخت، بڕێکی عاسیلانەی خۆقوربانیکردن و ئۆقرەیەکی زۆر هەیە.*

*ئەمتاریا وەرچەرخانێکی لەپڕ گۆڕانکارییەکی سەراپاگیر لە چارەنووسدا دێنێتە کایە و کار، بەخت، خۆقوربانیکردن و کات بە یەک چاوتروکانی حەماڵی دەبوێرێت.*

بێگومان ئەمە ئەمتاریای لێهاتوویی شارلاتیبەکانە کە ماوەکو ئەمڕۆ بە پێ درکێ لەبیر نێمەدا دەخولێن و کلیلی سەرکەوتنی براگادیۆ موو بەلیسی گۆڕانێکی گەورە و سەراپاگیر بوە — لە هەژارەوە بۆ دەوڵەمەند، بەخۆشی بۆ تەندروستی، نەگبەتی بۆ شاگەشکەیی — و ئیتر تۆ شوێنکەوتەت دەبن.

لیۆنارد توینسەری ئەڵمانی سەدەی شانزە کە شارلاتیبەکی بەناوبانگ بوو چۆن بوو بە پزیشکی دەربار بۆ ئەرماندەوای براندینبیرگ بەبێ ئەوەی پزیشکی بخوێنێت؟ لەبری پێشنیارکردنی بڕینی پەلەکان، گرمە خوێنمژەکان و موسەهیلی تام ناخۆش

(دەرمانەکانی ئەو سەروەختە)، نووسەر شلیکسپیری تام هێریبی پێشکەش کرد. بەڵێنی چاکبوونەوەی خێرایدا دەرمارییە دیار و کەشفەکان بەتایبەت چەرەسەری "ئاڵتوس موراوە"یان دەویست کە تێچووەکەی سامانێک بوو. ئەگەر نەخۆشییەکی ناڕوون تووشت ببووایە، نووسەر پارێزی بە بورحەکان دەکرد و ڕەچەتەی سیحری کاریگەری پێشکەش دەکرد. کێ دەیتوانی بەرەنگاری فەنتازیایەکی وەها بکات- تەندروستی و کامەرانی بەبێ قوربانی و ئازار!

*واقیع: قەڵەمڕەوی کامەڵایەتی سنوور و کۆدی چەسپێنراوی هەن. ئێمە لەم سنوورانە تێدەگەین و دەزانین کە دەبێ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەناو هەمان ئەو بازنە بجوڵێین.*

*فەنتازیا: ئێمە دەتوانین بچینە ناو جیهانێکی سەراپا نوێی کردە جیاوازەکان و بەڵێنی سەرکێشی.*

بە سەرەتاکانی ١٧٠٠ەکاندا، هەموو لەندەن سەرقاڵی قسە وباس بوو لەبارەی غەریبەیەکی پاڕانمێژ، پیاوێکی گەنج بەناوی جۆرج سالمەنازر. ئەو لە شوێنێکەوە هاتبوو کە بەلای زۆربەی ئینگلیزەکان سەرزەمینێکی نایاب بوو: دوورگەی فۆرمۆسا (ئێستا تایوانە) لە کەناری چین. زانکۆی ئۆکسفۆرد سالمەنازاری بەشدارکرد بۆ وتنەوەی زمانی دوورگەکە. چەند ساڵێک دواتر کتێبی پیرۆزی بۆ (فۆرمۆسان) وەرگێڕا. پاشان کتێبێکی نووسی- کە لەپڕێکدا بووە پڕ فرۆشترین- لە جیۆگرافیا و مێژووی فۆرمۆسادا پاشایەتی ئینگلیز شەراب و خواردنی دانە کابرای گەنج و بۆ هەر شوێنێک دەچوو بە چیرۆکە نایابەکانی لەمەڕ ڕیتی خۆی و نەریتە سەیرەکانی خانەخوێکانی سەرگەرم دەکرد. پاش مردنی سالمانازار، وەسیەتەکەی دەریخست کە ئەو بە ڕاستیدا تەنیا فەرەنسییەك بوو بە وێنایەکی دەوڵەمەندەوە. هەموو ئەو شتەی لەبارەی فۆرمۆسا وتووی- ئەلفبێیەکەی، زمانەکەی، ئەدەبیاتەکەی، سەراپای کەلتوورەکەی- دایهێنابوو. ئەو لەسەر بەرانبی حەمارەری ئینگلیز شوێنێکی بونیادنابوو بۆ هەڵچینی چیرۆکی تێروتەسەلی وەها کە ئارەزووی ئەوانی بۆ شتی سەیر و نامۆ تێر دەکرد. کۆنترۆڵی

بریتانیی ڕەق بەسەر حەوبە مەترسیدارەکانی حەلکدا دەرنەبی ئەواری بەودا تا فەنتاریایەکەیان بەکاربیات.

بێگومان فەنتاریای شتی سەیر و نامۆ بەهەمان شێوە دەتووانێت لە دەوروبەری بابەتی سێکسیش بێت و بچێت. بەڵام نابێ زۆر نزیک بێتەوە، چونکە شتی فیزیکی بەربەست دەخاتە بەردەم هێزی فەنتاریا. ئەمە دەتوانرێ ببیمرێت، ترك بکرێت و پاشان بڕست ببڕێت– چارەنووسی زۆربەی سۆزانییەکانی دەربار. سیحرە هەستەییەکانی مەعشوق تەنیا شەمیەی گەورە بۆ چێژی زۆرتر و جیاوازتر، جوانییەکی نوێ بۆ خۆشویستی واڵا دەکات. بۆ هێنانی دەسەڵات، دەبێ فەنتاریا تا ئاستێك بەدیبەهێنراو و بە مانای وشە ناواقیعی بێت.

فەنتارییەکی تری شتی نامۆ و سەیر، هیواخواستنە بۆ تونار بوون لە بێزاری ساختەچییەکان حەز دەکەن یاری لەسەر سەرکوتکەرێتی جیهانی کار و بەبوونی سەرکێشی تیایدا، بکەن. لەوانەیە ساختەچێتییەکەیان، بۆ نموونە گەڕاندنەوەی گەنجینەی ئیسپانیا بگرێتەخۆ بە بەشدارییەکی مومکینی حامێکی سەرنجڕاکێشی مەکسیکی و پەیوەندییەك بە سەرۆکی وڵاتێکی ئەمریکای باشوور بگرێتەخۆ– هەرشتێك کە پێشنیازی تونارێوی لە ڕۆتین دەکات.

*واقیع: کۆمەڵگە پارچەپارچەیە و پڕە لە ململانێ*

***فەنتازیا:*** *خەڵکی دەتوانن لە یەکێتییەکی ڕۆحانییانەی ڕاحەکاندا پێکەوە کۆ ببنەوە*

لە ١٩٢٠ەکاندا (ئۆسکار هارتزیل)ی ساختەچی سامانێکی حێزای لە فریوی سێر فرانسیس دریك بەدەستهێنا– لە سەرەتادا بە هەر ساویلکەیەك کە ناریاوەکەی "دریك" بووایە بەڵێنی پشکێکی بەرچاوی لە "گەنجینەی دریك"ی لەمێژە ونبوو دەدا، کە هارتزیل دەستی پێدەگەیشت. هەزاران کەس لە سەراسەری ناوەڕاستی خورئاوا کەوتنە داوی ئەڵەکەوە کە هارتزیل ریرەکانە گۆڕی بۆ هەڵمەتێك لەدژی حکومەت و هەموو کەسێکی تر کە هەوڵی دەدا سامانی دریك لە دەرەوەی دەستە حەقەکانی

میراتگرەکانی بهێڵێتەوە. لەویوە یەکبوونێکی پڕجاس دروستکەکە سەرکوتکراوەکان بە گردبوونەوەی هەستیبایە هاتەکایەوە. بەڵێنی یەکبوونێکی وەها بدە و ئیتر تۆ دەتوانیت دەسەڵاتێکی زۆر بەدەست بێنیت، بەڵام ئەوە دەسەڵاتێکی مەترسیدارە کە دەشێ بەئاسانی لەدژی تۆ بشکێتەوە. ئەمە فەنتازیایەکە بۆ نیماگۆگەکان تا یاری لەسەر بکەن.

*واقیع: مەرگ مرۆوان ناگەڕێنێتەوە، رابردوو ناگۆڕدرێت.*

*فەنتازیا: کەرانەوەیەکی لەپڕی ئەم ماکتە تەحەمولەکراوە.*

ئەم شەڵەکەیە زۆر جۆری هەن، بەڵام پێویستی بە شارەزایەتی و لێزانییەکی زۆر هەیە جوانی و گرنگی هونەری (فێرمیر) لەمێژە دانی پێدانراوە، بەڵام تابلۆکانی لە ژمارەدا کەمن و زێدە دەگمەن. کەچی لە ١٩٣٠یەکاندا، فێرمیرەکان بەرەبەرە لە بازاڕی هونەردا دەرکەوتن. شارەزایان بانگ کران بۆئەوەی پشتڕاستیان بکەنەوە و پەسەن لەقەڵەمیاندان حاوەندارێتیکردنی ئەم تابلۆ نوێیانەی (فێرمیر) تاجێک بوو بۆ ژیانی پیشەیی کۆکەرەوەی هونەری. ئەمە وەکو زیندووکردنەوەی لازاروس بوو: بەشێوەیەکی نامۆ، فێرمیر گەڕێنرابووەوە بۆ ناو ژیان، رابردوو گۆڕابوو.

تەنیا دوایی دەرکەوت کە تابلۆ فێرمیرە نوێکان بەرهەمی ساختەچییەکی هۆڵەندیی ئامەن ناوەند بوو بەناوی هان ڤان میگێرین. ئەو فێرمیری بۆ شەڵەکەی هەڵبژاردبوو چونکە ئەو لە فەنتازیا تێگەیشتبوو: تابلۆکان دەفاردەق بەبەرئەوە واقیعی دیار بوون چونکە خەڵکی و شارەزایانیش دەستەوستانانە دەیانویست باوەڕ بکەن کە واقیعین.

بیرت بێت: کلیلی فەنتازیا دوورییە. دووری، سیحری تێدایە و بەڵێن سادە و بێ کێشە دیارە. بۆیە ئەوەی کە پێشکەشی دەکەیت دەبێ تامێلی درک نەبێت. قەت مەهێڵە ببێتە شتێکی تەواو ئاشنا. ئەمە سەرابە لە دوورایيدا، لەکاتێکدا کە ساوێنکەکە نزیک دەکەوێتەوە، ئەم دوور دەکەوێتەوە. قەت لە وەسفکردنی فەنتاریاکەدا ڕاستەوڕاست مەبە— بە تەمومژاوی بیهێڵەرەوە. وەک هەڵچنێکی فەنتازیاکان، با قوربانییەکەت

ئەوەندە نزیک بێت کە ببیبنێت و فریو بخوات، بەڵام بابی ئەوەندە دوور بیهێڵەرەوە کە حەون ببیبنێت و ئارەزوو بخولرێت.

**وێنە**: مانگ، بەدەست نایەت، هەمیشە شێوەی دەگۆڕێت، پڕ دەبێت و دەردەکەوێتەوە. ئێمە لێی دەڕوانین، وێنا دەکەین، بیر دەکەینەوە و ئارەزوو دەکەین- بروێنەری بەردەوامی خەونەکان بە شتی ڕوون و ئاشکرا مەخەرە ڕوو. بەڵێنی مانگ بدە

**دەسەڵات**: درۆ بەکێشکەرێکە، هەڵچنراونکە کە بکرێتە فەنتازیا. دەشێ ئەمە پۆشاکێکی ڕۆحانی بە بەردا بکرێت. ڕاستی سارد، فاکتێکی ئاگایانەیە و هەڵمژینی ئاسودەبەخش نییە. درۆ خۆشترە. قێزەونترین مرۆڤ لە جیهاندا ئەو کەسەیە کە هەمیشە ڕاستی دەڵێت، کە قەت گلتەوۆشی ناکات. من هەمیشە بەلامەوە خۆشتر و قازانجبەخشتر بووە کە گلتەوۆشی بکەم نەك ڕاستی بڵێم

(جۆزێف وەیل "کورە زەردە"، ١٨٧٥-١٩٧٦)

درا شت قەت هەڵەی ئەوە مەکە وا وێنا مکەیت فەنتازیا هەمیشە نایابە. بەدڵنیاییەوە لە واقیع جیاوازە، بەڵام واقیع خۆی هەندێ جار ئەوەندە شەنۆیی و بەستایلکراوە کە فەنتازیا دەبێتە ئارەزوو بۆ شتە سادەکان. بۆ نموونە، ئەو وێنەیەی ئەبراهام لینکۆلن لەخۆی دروستکرد وەك پارێزەرێکی دیهاتی بە ڕیشیکەوە، ئەوی کردە سەرۆکێکی سادە. بەڵام ئەو دوورایی خۆی پارلست. ئەگەر بێتو بە فەنتازیایەکی وەها باری مکەیت، دەبێ بە وریاییەوە دوورییەك دروست بکەیت و ڕێگە مەدەیت کەسایەتیە "ئاسایی"یەکەت ئەوەندە ئاشنا بێت ئەگینا مەنتازیا بەرهەم ناهێنێت.

## یاسای ژمارە ٣٣

# خاڵی لاوازی کەسەکە بدۆزەرەوە

### حوکم

*هەر کەسێك خاڵێکی لاواز، کەلێنێك لە دیواری قەڵاکەیدا هەیە. زۆرجار ئەو لاوازییە نائەمنییەکە، هەستێکی کۆنترۆڵنەکراو یان پێویستییەکە. دەشێ ئەمە بەهەمان شێوە خۆشییەکی شاراوەی بچوك بێت. هەر چۆنێك بێت، هەر کە دۆزرایەوە، ئەمە خاڵێکی لاوازە کە دەتوانی لە بەرژەوەندیی خۆت بیگۆڕیت.*

### دۆزینەوەی لاوازییەکە: پلانێکی ستراتیژی کردار

ئێمە هەموومان بەرەنگاریمان هەیە. ئێمە بە زرێیەکی بەردەوام بە دەوری خۆمەوە دەژین بۆئەوەی لەبەرانبەر گۆڕان و کردارە دەستتێوەردانەکانی هاوڕێیان و ڕکابەران بەرگری بکەین. ئێمە هیچمان ناوێ جگە لەوەی وازمان لێبێنن شتەکان بەشێوازی خۆیان بکەین. بە بەردەوامی وەستان لەبەرانبەر ئەم بەرەنگارییانەدا وزەیەکی زۆری دەوێت. یەکێك لە شتە هەرە گرنگەکان بۆ درکپێکردن لەبارەی خەڵکەوە ئەوەیە کە ئەوان هەموویان خاڵی لاوازیان هەیە، بەشێکی نەرمی سایکۆلۆژییان کە بەرەنگاری ناکات، کە لەبەرامبەر ئیرادەتدا دەچەمێتەوە ئەگەر بیدۆزیتەوە و فشاری بۆ بێنیت. هەندێ خەڵك خاڵە لاوازەکانیان بە ئاشکرا دیارە، ئەوانیتر دەیشارنەوە. ئەوانەی کە دەیانشارنەوە

زۆرجار ئەوانەن کە بەشێوەیەکی کاریگەر لە ڕێگەی ئەو سروەی ئاو بەرێکەیان هەڵدەموەشێن.

لە پلاندانانی هێرشەکەتدا، ئەم پرەنسیپانەی خوارەوەت لەبیر بێ:

سەرنج بدەرە ئاماژەکان و نیشانە نائاگاکان. هەروەک سیگمۆند فرۆید وتی "هیچ کەس لەمەرێك ناتوانێت نهێنییەك بپارێزێت. ئەگەر لێوەکانی بێدەنگ بن، ئەوا بەگەڵ سەرە پەنجەکانی دەدوێ؛ لە هەر کونێکەوە ناپاکی دەردەقولێت" ئەمە چەمکێکی گرنگە لە سۆراغکردنی لاوازیی کەسێکدا- ئەمە لە ڕێگەی بەرواڵەت ئاماژە ناگرنگەکان و وشە ڕاگوزەرەکان دەردەکەوێت.

کلیلەکە تەنیا ئەو شتە نییە کە تۆ بۆی دەگەڕێیت بەڵکو ئەوەیە لە کوێ و چۆن بۆی دەگەڕێیت. وتووێژی ڕۆژانە دەوڵەمەندترین کانگەی خاڵە لاوازەکان دابین دەکات، بۆیە خۆت بۆ گوێگرتن ڕابێنە. بەوە دەست پێبکە کە هەمیشە جێی بایەخ دیار بێت- ڕواڵەتی گوێچکەیەکی هاوسۆز وەها لەهەموو کەسێك دەکات بدوێت. فێڵێکی زیرەکانە کە زۆرجار لەلایەن دەوڵەتمەداری فەرەنسی سەدەی نۆزدە تالیراند بەکارهێنراوە ئەوەیە کە بەرامبەر کەسەکەی تر بکرێیتەوە، نهێنییەکی لەگەڵ باس بکەیت. دەکرێ ئەمە تەواو هەڵبەستراو بێت یان دەشێ ڕاستەقینە بێت بەڵام ئەوەندە بەلای تۆوە گرنگ نەبێت-گرنگ ئەوەیە تۆ وەها دیار بیت کە لەناخی دڵتەوە قسە دەکەیت. ئەمە زۆرجار کاردانەوەیەك دەوروژێنێت کە نەك تەنیا ئەوەندەی هی تۆ ڕاشکاوانەیە بەڵکو ڕەسەنترە- کاردانەوەیەك کە خاڵێکی لاواز بەدیار دەخات

ئەگەر پێت وابێت کەسێك خاڵێکی لاوازی دیاریکراوی هەیە، ناڕاستەوخۆ تاوتوێی بکە. ئەگەر، بۆ نموونە هەست بەوە کرد کە ئەو کابرایە پێویستی بەوەیە خۆش بویسترێت، بەگرنەبی مجامەلەی بکە. ئەگەر گشتخۆشیبەکانی تۆ بە ئامەزرێیەوە وەربگرێت، گرنگ نییە چەندێك ڕوونە، ئەوا تۆ لەسەر ڕێڕەوە ڕاستەکەیت. چاوت بۆ وردەکارییەکان ڕابێنە- چۆن کەسێك بەخشش دەداتە کارگوزارێك، چ شتێك کەسێك شاد دەکات، پەیامە شاراوەکان لە جلوبەرگدا. ئەو شت و کەسانە بدۆزەرەوە کە جەڵکی

دەبیەرستن و شەیدایی و هەڕەشتیان دەکەن بۆ ئەوەی پێی بکەن- لەوانەیە تۆ بتوانیت دابینکەری ئەنتازیاکانیان بیت یەرت بێت. لەبەرئەوەی ئێمە هەموومان هەوڵ دەدەین لاوازییەکانمان بشارینەوە، شتێکی کەم هەیە لە ڕەفتاری ئاگاییانەمانەوە فێری بین. ئەوەی کە لە شتە بچوکەکانی دەرەوەی کۆنترۆڵی ئاگاییانەمانەوە دەردەکەون ئەوەیە کە تۆ دەتەوێ بیزانیت.

منداڵە دەستەوەستانەکە بدۆزەرەوە. زۆربەی لاوازییەکان لە منداڵیدا دەستپێدەکەن، پێش ئەوەی خود بەرگرییەکانی قەرەبووکردنەوە بونیاد بنێت. لەوانەیە منداڵ لە بارێکی دیاریکراودا نازی پێدرابێت یان لەوانەیە پێویستییەکی هەستیی دیاریکراو تێر نەکرابێت لەکاتێکدا کە گەورە دەبێت، لەوانەیە نازەکە یان کێماسییەکە بچێتە ژێر خاکەوە بەڵام لەت ون نابێت. زانین لەبارەی منداڵێتی، کلیلێکی بەهێزت بۆ لاوازیی کەسێک دەداتێ.

نیشانەیەکی ئەم لاوازییە ئەوەیە کە کاتێک تۆ دەستی بۆ دەبەیت کەسەکە زۆرجار وەکو منداڵ ڕەفتار دەکات بۆیە ئاگادار بە بەرامبەر هەر ڕەفتارێک کە لە ئەستی خۆی تێپەڕیوە.

**بەدوای جیاوازییەکاندا بگەڕێ.** زۆرجار تایبەتمەندییەکی ئاشکرا پێچەوانەکەی دەشارێتەوە. ئەو خەڵکەی سنگی خۆیان دەردەبەڕێن زۆر جار ترسنۆکی گەورەن. لەوانەیە ڕواڵەتێکی وریایانە بەرامبەر سێکس ڕۆحێکی شەهوەتبازی شاردبێتەوە زۆرجار ڕێک و ڕەوایی ئامەرزۆی سەرکێشیی شەرمەکان ئامەزرۆی سەرنجن بە سۆراخکردنی ئەودیو ڕواڵەت، زۆرجار خاڵە لاوازەکانی خەڵک لە تایبەتمەندیی پێچەوانەی ئەوەی دەریدەخەن دەدۆزیتەوە

**ڕابەڵە لاوازەکە بدۆزەرەوە.** هەندێ جار لە گەڕانت بەدوای لاوازییەکاندا، ئەت چی بەڵکو کێ گرنگە. لە ڤێرزنەکانی ئەمڕۆی دەرباردا، زۆرجار کەسێک لەپشت پەردەوەیە کە دەسەڵاتێکی زۆری هەیە. ئەم مامەڵەکارانەی پشت پەردەی دەسەڵات ڕابەڵی لاوازی گروپەکەن ڕەزامەندییان بەدەست بێنە و ئیتر تۆ بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاریگەری دەخەیتە سەر پاشا بەشێوەیەکی ئەلتەرناتیڤ، تەنانەت لە گروپێکی خەڵکدا کە بە

ڕواڵەتی یەك ئیرادە ڕەفتار دەكەن– هەروەك كاتێك گرووپێكی زۆر هێرش بەكەدەگرن بۆ بەرەنگاری لەبەرانبەر بێگانەیەك– هەمیشە پاپەڵێكی لاواز لە زنجیرەكەدا هەیە، ئەو كەسە بدۆزەرەوە كەلەژێر فشاردا دەچەمێتەوە.

بۆشاییەكە پڕ بكەرەوە، دوو بۆشایی هەستیی سەرەكی بۆ پڕكردنەوە بریتین لە مانەمی و دڵتەنگی، كەسە نائەمەكان بۆ هەر جۆرە پشتڕاستكردنەوەیەكی كۆمەڵایەتی سارپێكەن، هەرچی پەیوەندی بە كەسێكەوە هەیە كە بەشێوەیەكی درێژخایەن دڵتەنگ، بڕوانە ڕەنگ و ڕیشەی دڵتەنگییەكەی كابرای مانەمن و كەسی دڵتەنگ ئەو كەسانەن كە بەكەمترین شێوە دەتوانن ڕووپۆشی حاڵە لاوازەكانیان بكەن، توانای پڕكردنەوەی بۆشاییە هەستییەكانیان سەرچاوەیەكی گەورەی دەسەڵاتە و بێزترین تایبەتی هەیە درێژە بكێشێت

كەڵك لە هەستە كۆنترۆڵنەكراوەكان وەربگرە، دەشێ هەستی كۆنترۆڵنەكراو ترسێكی بێ بنەما بێت– ترسی ناپەیوەندیدار بە بارودۆخەكەوە– یان هەر ئەنگێزەیەكی تری وەكو شەهوەت، چاوچنۆكی، لوتبەرزی یان كینە ئەو خەڵكەی بێزار لەگەڵ ئەم هەستانەدا دەرگیرن ناتوانن خۆیان كۆنترۆڵ بكەن و تۆ دەتوانی كۆنترۆڵكردنەكەیان بۆ ئەنجام بدەیت

## پەیڕەویكردن لە یاساكە I

لە ١٦١٥دا ئوسقوف ئەمەن سی ساڵەی لوچۆن، كە دوایی بە كاردینال ریچیلۆ ناسرا، لەبەردەم نوێنەرانی سێ توێژی هەرەسادا– پیاوانی ئایینی، خانەدان و خەڵكی ئاسایی وتارێكی پێشكەش كرد. ریچیلۆ وەك ڕاسپاردەی پیاوانی ئایینی هەڵبژێردرابوو– كە بەرپرسیارێتییەكی گەورە بوو بۆ كەسێك كە هێشتا گەنج بوو و بەشێوەیەكی دیاریكراو ناسراو نەبوو. لە هەموو پرسەكانی ڕۆژدا، وتارەكە شوێن هەتی كەنیسەی هەڵدەگرت، بەڵام لە نزیكی كۆتاییەكەیدا، ریچیلیۆ شتێكی كرد كە هیچ پەیوەندی بە كەنیسەوە نەبوو و هەموو پەیوەندییەكی هەبوو بە ژیانی پیشەییەوە. ئەو ڕوویكردە تەختی پاشا

لویسی سێزدەی گەنج و شاژنی دایک، ماری دی مێدیسی کە وەکو جێنیشینی حوکمڕانی فەرەنسا لە تەمبەشت لویس دانیشتبوو تا ئەو کاتەی کە کوڕەکەی دەگەیشتە تەمەنی یاسایی. هەموو کەسێك پێشبینی ئەوەی دەکرد ریچیلیۆ هەر قسەی ئاسایی بۆ پاشای گەنج بکات لەبری ئەمە، ئەو ڕاستەوخۆ ڕووانییە شاژنی دایك. لەڕاستیدا وتارەکەی ئەو بە ستایشێکی بەرزی ئەو کۆتایی هات، ستایشێك ئەوەندە درەوشاوە کە لە ڕاستیدا بریندارکەری هەندێ کەس بوو لە کەنیسەدا. بەڵام بڕەی سەر ڕەحساری شاژن کاتێك گفتوگۆشیی ریچیلیۆی بە تامەزرۆییەوە قبوڵ کرد، لەبیرنەکراو بوو.

ساڵێك دواتر شاژنی دایك ریچیلیۆی کردە وەزیری دەرەوە، کە کودەتایەکی بێ وێنە بوو بۆ ئوسقوفی گەنج. ئەو ئێستا دەچووە ناو بازنەی ناوەوەی دەسەڵات و ئەو ناووتوێی کردارەکانی دادگای کرد وەك بڵێی ماکینەی سەعاتێك بوون. کۆنسینۆ کۆنسینی، دڵخوازی شاژنی دایك بوو یان بڵێی عاشقی بوو، ژنێك کە لەوانەبوو بەهێزترین پیاو بێت لە فەرەنسا کۆنسینی زۆر لەخۆبایی و لوتبەرز بوو و ریچیلیۆ بەشێوەیەکی تەواوەتی یاری پێدەکرد — وەها لێی نزیك دەکەوتەوە وەك بڵێی پەشا بێت. لەماوەی چەند مانگێکدا ریچیلیۆ سووە بەکێك لە دڵخوازەکانی کۆنسینی. بەڵام شتێك لە ١٦١٧دا ڕوویدا کە هەموو شتێکی لنگە و قوچ کردەوە. پاشای گەنج کە تا ئەو کاتە هەموو نیشانەیەکی گەمژەبوونی پیشاندابوو، کۆنسینی بە کوشتدا و گرنگترین باریدەدەرەکانیشی بەندکردندا. لەم کردارەیدا لویس بە بەك لێدان فەرمانڕەوایەتی وڵاتی گرتە دەست و شاژنی دایکی بەلاوە نا.

ئایا ریچیلیۆ بە هەڵە یاری کردبوو؟ ئەو لە کۆنسینی و ماری دی مێدیسی نزیك کەوتبووەوە کە ڕاوێژکارەکانیان و وەزیرەکانیان ئێستا لەبەر دڵان نەمابوون، تەنانەت هەندێکیان دەستگیر کران. شاژنی دایك خۆی لە (لۆڤەر) بەند کرا کە تەقریبەن بەندیخانەیەك بوو بۆ خۆی. ریچیلیۆ هیچ کاتی بەفیڕۆ نەدا. ئەگەر هەمووان دەستەبەرداری ماری دی مێدیسی دەبوون، ئەو لەتەکیا وەستابوو. ئەو دەیزانی لویس ناتوانێت خۆی لەو قوتار بکات، چونکە پاشا هێشتا زۆر گەنج بوو و لە هەر حاڵەتێکدا

بێت هەمیشە پێیەوە لکابوو. وەکو تاکە هاوڕێی بەمێزی ماوەی ماری، ڕیچیلیۆ، لینکی گرنگی نێوان پاشا و دایکی پڕ کردەوە. لە بەرامبەردا، ئەو پارێزگاری ئەو ژنەی بەدەستهێنا و تووانی لە کودەتای کۆشک قوتار بێت، تەنانەت گەشەش بکات. بەدرێژایی چەند ساڵی دواتر شاژنی دایک تەنانەت زیاتر بەوەوە وابەستە بوو و لە ١٦٢٢دا ئەو پاداشتی وەفاداری ئەوی دایەوە. لە ڕێگەی هێنانە ناوەوەی هاوپەیمانەکانی خۆی لە ڕۆم، ڕیچیلیۆ بۆ پلەی بەهێزی کاردینال بەرز بووەوە.

بە هاتنی ١٦٢٣ پاشا لویس گرفتار بوو ئەو ئەو کەسی نەبوو متمانەی پێبکات بۆ ئامۆژگاریکردنی و هەرچەندە ئەو ئێستا پیاوێکی گەنج بوو نەک کوڕێک، لە ڕۆحدا هێشتا منداڵانە بوو و کاروباری دەوڵەت سەخت بوون بۆی. ئێستا کە ئەو تەخت و تاجی گرتبووە دەست، ماری چیتر جێنشین نەبوو و لە تیۆرەدا دەسەڵاتی نەبوو، بەڵام ئەو هێشتا گرنیچکەی کوڕەکەی بوو و بەردەوام بەوی دەوت کە ڕیچیلیۆ تاکە ڕزگارکەری مومکینی ئەوە. لەسەرەتادا لویس هیچ کامیکیاسی نییە– ئەو بە سۆزێکەوە ڕقی لە کاردینال بوو، تەنیا لەبەر خۆشەویستیی ماری لەگەڵیدا هەڵیدەکرد. هەرچۆنێک بێت، لەکۆتاییدا، لە دەربارد گۆشەگیر بوو و بە ڕاڕاییەکەی ئیفلیج بوو، ملی بۆ دایکیدا و ڕیچیلیۆی سەرەتا کردە ڕاوێژکاری سەرەکی و دواتریش سەرۆک وەزیران.

ئێستا ڕیچیلیۆ چیتر پێویستی بە ماری دی مێدیسی نەبوو. ئەو چیتر سەردانی نەکرد و مەرایی بۆ نەکرد، چیتر گوێی لە ڕاکانی نەگرت و تەنانەت مشتومڕی لەگەڵدا دەکرد و دژی هیواکانی بوو. لەبری ئەمە، ئەو تەرکیزی خستە سەر پاشا، خۆی کردە پێویستییەکی حەتمی بۆ گەورە مونکە. هەموو سەرۆکەکانی پێشوو، بە تێکەبشتن لە منداڵێتی قاشە، هەوڵیاندابوو لە گێروگرفت دووری بخەنەوە. ڕیچیلیۆی لیژن بەشێوەیەکی هاواو باری لەسەر ئەو دەکرد، بە ئەنقەست بۆ ناو پڕۆژە لەدوای پڕۆژەی ئومێدبەخش پاڵی دەنا، بۆ نموونە هەڵمەت لەدژی هوگنۆتەکان و دواجاریش جەنگێکی درێژخایەن لەگەڵ ئیسپانیا. گەورەیی ئەو پڕۆژانە تەنیا پاشای وابەستەتر بە سەرۆکە بەهێزەکەی دەهێشتەوە. تاکە کەس کە توانی سەلامەتی لە قەڵەمڕەوەکەدا بپارێزێت

بەمشێوەیە، بۆ ماوەی هەژدە ساڵی دواتر، ڕیچیلیۆ بە فێرخشکردنی لاوازییەکانی پاشا، حوکمی فەرەنسای کرد و بەگوێرەی حەوتی خۆی لەقاڵبیدا، وڵاتی یەکخست و بۆ سەدەکانی داهاتوو کردی بە دەسەڵاتێکی ئەورووپیی بەهێز .

**لێکدانەوە**

ڕیچیلیۆ هەموو شتێکی وەک هەلمەتی سەربازی دەبینی و هیچ هەنگاوێکی ستراتیژی لەوە گرنگتر نەبوو کە حاڵی لاوازی دوژمن بدۆزێتەوە و فشاری لەسەر دابنێ. لەسەروبەندی وتارەکەیدا لە ١٦١٥دا، ئەو سۆزداخی ڕابەڵی لاوازی دەکرد بە زنجیرەی دەسەڵاتدا و بۆی دەرکەوت ئەوە شاژنی دایکە. ئەوە مەبێت کە ماری بە ئاشکرا لاواز بووبێت– ئەو حوکمڕانی فەرەنسا و کوڕەکەشی دەکرد. بەڵام ڕیچیلیۆ ئەوەی بینی کە ئەو ژنە بە ڕاستی ژنێکی نائەمنە کە پێویستی بە بایەخ و ئاگاداریی بەردەوامی نێرینە هەیە. ئەوی دایە بەر شەپۆلی هەست و سۆز و ڕێز، تەنانەت مەراییکردنی بۆ کەسە دڵخوازەکەی، کە کۆنسینی بوو. ئەو دەیزانی ڕۆژێک دێت کە پاشا زاڵ دەبێت، بەڵام بەهەمان شێوە زانی کە لویس دایکی زۆر خۆش دەوێت و هەمیشە لەبەرامبەریدا وەک منداڵێک دەمێنێتەوە. بۆیە ڕێگەی کۆنترۆڵکردنی لویس بەدەستهێنانی پەزامەندی ئەو نەبوو، کە دەکرا لە شەووڕۆژێکدا بگۆڕێت، بەڵکو لە ڕێگەی بەدەستهێنانی کاریگەری بوو لەسەر دایکی، کە سۆزی بۆی قەت نەدەگۆڕا

هەر کە ڕیچیلیۆ ئەو پێگەیەی بەدەستهێنا کە ئارەزووی دەکرد– سەرۆک وەزیران– دەستبەرداری شاژنی دایک بوو، بەرەو ڕابەڵی لاوازی دواتر لە زنجیرەکەدا هەنگاوینا کارەکتەری خودی پاشا. هەشێک هەبوو لەو کە هەمیشە منداڵێکی دەستەوستان بوو و پێویستی دەسەڵاتی باڵا بوو. لەسەر ماعەی لاوازیی پاشا بوو کە ڕیچیلیۆ ناوبانگ و دەسەڵاتی خۆی بونیاد نا

بیرت بێت لەکاتی چوونە ناو دەربار، ڕابەڵی لاواز بدۆزەرەوە. کەسی باڵادەست بەردەوام پاشا یان شاژن نییە، ئەوە کەسێکە لەپشت پەردەوە– کەسی دڵخواز، مێرد یان

ژن، تەنانەت دەبەنگی ناو دەربار. لەوانەیە ئەم کەسە حاڵی لاواری زیاتری لە خودی پاشا هەبێ، چونکە دەسەڵاتی ئەو بەندە بە هەموو جۆرەکانی فاکتەرەگۆڕاوەکانی دەرەوەی کۆنترۆڵەکەی.

لە کۆتاییدا، کاتێک مامەڵە لەگەڵ میالانی دەستەوەستاندا دەکەیت کە ناتوانن بڕیار بدەن، یاری لەسەر حاڵە لاوازەکانیان مەکە و بەرەو سەرکێشی بوێرانە پاڵیان مەنێ. دەبێ ئەوان تەنانەت زیاتریش پشت ئەستوور بن بە تۆ، چونکە تۆ دەبیتە ئەو فیگەرەی پێگەیشووەی کە ئەوان پشتی پێدەبەستن بۆئەوەی لە کاولاش بیانهێنێتە دەرەوە و بەرەو سەلامەتی بیانبەیت

## پەیڕەوی لە یاساکە ٢

لە ساڵی ١٥٥٩دا، پاشای فەرەنسی، پاشا هێنری دووەم کۆچی دوایی کرد. کوڕەکەی تاجەکەی لەسەر نا و بووە فرانسیسی دووەم، بەڵام لە باکگراوند دە شاژن و خێزانی هێنری، کاسرین دی مێدیسی کاریان دەکرد، ژنێک کە پێش ماوەیەکی درێژ شارەزایەتی خۆی لە کاروباری دەوڵەتدا سەلماندبوو. کاتێک لە ساڵی دواتردا فرانسیس مرد، کاسرین کۆنترۆڵی وڵاتی وەکو جێنشینی کوڕی دواتر لە سیلسیلەکەدا گرتە دەست، واتە چارلسی نۆیەم کە ئەو کاتە تەمەنی تەنیا دە ساڵ بوو

هەڕەشە سەرەکییەکانی سەر دەسەڵات شازی مریتی بوون لە ئەنتوان دی بۆربۆن، پاشای نافار و براکەی، لویس، میری بەهێزی کۆندەی، کە هەردووکیان دەیانتوانی دەنگەشەی مافیان بکەن بۆ حوکمەتکردن وەک جێنشین لەبری کاسرین، کە ئیتالی بوو. بیانییەک بوو کاسرین بەخێرایی ئەنتوانی کردە ئەفسەری گشتی مەملەکەت، نازناوێک کە پێدەچوو چاوچنۆکییەکەی تێر بکات. ئەمە بەهەمان شێوە ئەو مانایە بوو کە دەبووایە لە دەربردا بمێنێتەوە، کە لەوێ کاسرین دەیتوانی چاوی لەسەر بێت. هەنگاوی دواتری تەنانەت زیرەکانەتریش بوو. ئەنتوان لاوازییەکی بەدەوی هەبوو بۆ ژنانی گەنج، بۆیە یەکێ لە بەردەستە هەرە سەرنجڕاکێشەکانی خۆی بەناوی لویس دی ڕوێت دانا بۆ

فریودانی. ئێستا کە پەیوەندییەکی گەرم و گوڕی لەگەڵ ئەنتوان دا هەبوو، لویس لەبارەی هەموو کردەوەکانیەوە ڕاپۆرتی دەدایە کاترین. ئەم هەنگاوە ئەوەندە لێهاتووانە بەئەنجام گەیشت کە کاترین یەکێکی تر لە بەردەستەکانی خستە حەرەمەت مێر کۆن و لێرەوە "هێزی فڕیو"ی خۆی لە کچانی گەنج پێکهێنا کە ئەو بەکاریهێنان بۆ ئەوەی نێرینە سارێلکەکانی دەربار لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا بهێڵێتەوە.

لە ١٥٧٢دا، کاترین، کچەکەی بەناوی مارگەرێت دی ڤالۆیس لە هێنری، کوڕی ئەنتوان و پاشای نوێی ناڤار، مارە بڕی. ئەمەی کە خانەوادەیەک زۆر لە دەسەڵات نزیک دەکاتەوە کە هەمیشە لەدژی ئەم لە ململانێدا بوون، هەنگاوێکی مەترسیدار بوو، بۆیە بۆ دڵنیابوونەوە لە وەفاداری هێنری، ئەو خۆشەویستترین ئەندامی "هێزی فڕیو"ی، شارلۆت دی بۆن سێمبلانچەی، لەو نزیک کردەوە کە بارۆنێسی (سۆڤێس) بوو. کاترین ئەمەی کرد ئەگەرچی هێنری مارەبڕاوی کچەکەی خۆی بوو. لەماوەی چەند هەفتەیەکدا، مارگرێت دی ڤالۆیس لە یادداشتەکانیدا نووسی، "مەدام دی سۆڤێس وەها بەتەواوی مێردەکەی منی وەها گرفتار کرد کە ئێمە چیتر پێکەوە نەخەوتین، تەنانەت قسەشمان نەکرد".

بارۆنێس سیحربکی لێهاتوو بوو و یارمەتیدەر بوو بۆئەوەی هێنری لە ژێر چەپۆکی کاتریندا بهێڵێتەوە. کاتێک گەنجترین کوڕی شاژن، دوکی ئالێنچۆن، ئەوەندە لە هێنری نزیک کەوتەوە کە ئەو ترسی ئەوەی لێ نیشت ئەو دووانە لەدژی پیلان بگێڕن، ئەو بارۆنێسی لەویش نزیک خستەوە. ئەم ئەندامە بەدناوەی هێزی فڕیو بەهێزایی ئالێنچۆنیان نزیودا و ئەو دوو پیاوە گەنجە بەزوویی لەسەری بوو بە شەڕیان و هاوڕێیەتییەکەیان بەخێرایی کۆتایی هات، شانبەشانی هەر مەترسییەکی پیلانگێڕی.

لێکدانەوە

کاترین هەر زوو ئەو کاریگەرییەی بینیبوو کە مەعشوقەیەک لەسەر پیاوێکی دەسەڵاتدار هەیەتی. مێردەکەی، هێنری دووەم، یەکێک لە مەعشوقە هەرە بەناوەکانی،

دیانی دی پۆیتیەر، لای خۆی هێشتبووەوە. ئەوەی کە کاسریں لە ئەزموونەکەوە فێری بوو ئەوە بوو کە پیاوێکی وەکو مێردەکەی دەبوویست را هەست بکات کە دەتوانێت ژنێک بەدەست بێنێت بەبێ ئەوەی پێویست بکات پشت بە پێگەکەی ببەستێت، کە ئەم بۆی هاتبووەوە تاک ئەوەی بەدەستی بێنێتر پێویستییەکی وەهاش خاڵێکی لاوازی گەورەی دەگرتەخۆ. تا ئەو جێیەی کە ژنەکە دەستیگرد بە پەیوەندی سۆزداری لە ڕێگەی ڕەفتارکردنێکی وەها وەک ملێی ئەو بەدەستهێنراوە، پیاوەکە نەیدەتوانی تێبینی ئەوە بکات کە پێ بە پێی کات مەعشوقەکە بەسەر ئەودا زاڵ دەبوو، وەک چۆن دیان دی پۆیتەرز ئەمەی لەبەرامبەر هێنریدا ئەنجامدا. ئەوە ستراتیژی کاسریں بوو کە ئەم لاوازییەی لە بەرژەوەندیی خۆی شکاندەوە، وەک ڕێگەیەک بەکاریهێنا بۆ گرتن و زاڵبوون بەسەر پیاواندا. هەموو ئەوەی دەبووایە بیکات ئەوە بوو کە دڵگیرترین ژنانی دەربار، "هێری فریوو"ەکەی بەسەر پیاواندا بەرەلا بکات کە ئەم پێی وابوو هەمان حاڵی لاوازی مێردەکەی ئەمیان هەیە.

بیرت بێت: هەمیشە بۆ ئەو سۆز و مرجککرتانە بڕوانە کە کۆنترۆڵ ناکرێن. چەندەی سۆز بەهێزتر بێت، ئەوەندە کەسەکە لاوازتر دەبێت. لەوانەیە ئەمە سەرسوڕهێنی دیار بێت، چونکە خەڵکی بەسۆز بەهێز دیارن. لە ڕاستیدا، هەرچۆنێک بێت، ئەوان تەنیا بە شێوازی شانۆیی ستەیجەکە پڕ دەکەنەوە، هۆشی خەڵک لەبەرامبەر ئەوەی چەنێک لاواز و دەستەوەستان پەرت دەکەن. پێویستی پیاو بۆ زاڵبوون بەسەر ژن، بە ڕاستی دەستەوەستانییەکی گەورە دەردەخات کە بەدرێژایی هەزاران ساڵ ئەوانی کردووە بە ساوێلکە. بڕوانە ئەو بەشەی کەسەکە تا زۆرترین ئاست بەدەرەوەیە— چاوچنۆکییان، شەهوەتیان، ترسی زۆریان. ئەمانە ئەو هەستانەن کە ئەوان ناتوانن بیشارنەوە و کەمترین کۆنترۆڵیان بەسەریدا هەیە. ئەو شتەشی کە خەڵکی ناتوانن کۆنترۆڵی بکەن، تۆ دەتوانیت بۆیان کۆنترۆڵ بکەیت.

## پەیڕەویکردنی پلسلکە ٣

ئارلێنلا هونتینگتۆن، ژنی بڕتسمانی گەورەی سکەی شەمەندەفەری ترەنگانی سەدەی نۆزدە، کۆلیس پ هەنتینگتۆن، لە بنەچەیەکی سادەوە هاتبوو و هەمیشە ملانێی بوو بۆ پێزانینی کۆمەلایەتی لەنێو هاوتا دەوڵەمەندەکانیدا. کاتێک لە ماڵەکەیدا لە سان فرانسیسکۆ ئاهەنگێکی گێڕا، ژمارەیەکی کەم لە دەستەبژێری کۆمەلایەتی هاتن، زۆربەیان وەها تەماشایان دەکرد کە بەسەر کەتیبەیەکی ئامادەدا کەوتووە، لە جۆری ئەمان نییە. بەهۆی سامانە قەبەکەی مێردەکەیەوە، مامەڵەکارانی هونەری هەراییان بۆ دەکرد، بەلام بە چاوێکی سرکەوە وەکو تارەکارێک دەیانبینی. تەنیا یەک پیاوێکی چارەنووسساز بەشێوەیەکی جیاواز مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، جۆزێف دوقین مامەڵەکار،

لەماوەی یەکەمین سالانی پەیوەندی دوقین لەگەڵ ئارابێلادا، ئەو هیچ هەوڵێکی نەدا بۆ فرۆشتنی هونەری گرانبەها بەو. لەبری ئەمە، ئەو بۆ فرۆشگا گەورەکان هاوەڵێتی دەکرد، بێ ڕادە لەبارەی ئەو شاژن و میرانەی دەیبینین دەمەتەقێی دەکرد. دواجار، ئەو پێی وابوو، پیاوێک هەیە کە وەک هاوتایەک، تەنانەت بالاتریش، لە کۆمەلگەی بالادا مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. لەهەمان کاتدا، ئەگەر دوقین هەوڵی نەدا بەرهەمی هونەری پێو بفرۆشێت، ئەوا بەشێوەیەکی شاراوە بە بیروکە حواساسییەکانی پەروەردەی کرد— واتە، ئەمەی کە باشترین هونەر گرانبەهاترینە. پاش ئەوەی ئارابێلا لە شێوازی ئەودا بۆ بینینی شتەکان نوقم ببوو، دوقین وەها ڕەفتاری کرد وەک بلێی ئەو هەمیشە زەوقێکی بالای هەبووە، ئەگەرچی پێش ئەوەی ئەو بناسێ، حولماسییەکەی کارەساتبار بووە.

کاتێک کۆلیس هەنتینگتۆن لە ١٩ دا مرد، ئارابێلا بەسەر سامانێکەوە گیرسایەوە ئەو لەپڕێکدا دەستیکرد بە کڕینی تابلۆ گرانبەهاکان، هی ڕامبرانت و هی ڤێلازکیس، بۆ نموونە— و هەمیش لە دوقینیش. سالانێک دواتر، دوقین (گورە شمەکە)ی کەیسبێرزی بە بەرزترین نرخی سەردەمەکە فرۆشت کە بۆ خانەوادەیەک کە پێشتر مایەیەکی کەمی بە کۆکردنەوەی بەرهەمی هونەری دەدا سەرسووڕهێنەر بوو

**لێکدانەوە**

جۆزێف دوقین دەستبەجێ لە ئارابێلا هونیگتۆن و ئەمەی کە چ شتێك خەتوکەی دەدات تێگەیشت. ئەو دەیویست هەست بکات گرنگە، لەناو کۆمەڵگەدا ئاسودە بێت. ئەو کە بێ پارە لەبارەی باکگراوندی چینە نزمەکەی نائاسودە بوو، پێویستی بە پێزانینی پێگە کۆمەڵایەتییە نوێکەی بوو. دوقین چاوەڕێ بوو. لەبری پەلەکردن بۆ هەوڵدان تا رازی بکات بەرهەمی هونەری کۆ بکاتەوە، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پرۆژەیە کار کردن لەسەر لاوارییەکانی ئەو وایلێکرد هەست بکات شایستەی سەرنج و بایەخی ئەمە نەك لەبەرئەوەی ژنی یەکێکە لە دەوڵەمەندترین پیاوانی جیهان بەڵکو لەبەر کارەکتەرە تایبەتەکەی‌ـ و ئەمە بەتەواوی تواندیەوە. دوقین قەت ملی بۆ ئارابێلا نەدا، بەڵکو محازەرەی بۆ دادا، ئەو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بیرۆکەکانی لە مێشکیدا ئەو چەسپاند ئەنجامەکە بریتی بوو لە دروستکردنی دڵفراوانترین و باشترین مشتەری و بەهەمان شێوە فرۆشتنی ئالۆزی (کڕە شیەکە)

پێویستی خەڵك بۆ پێزانین و سەنگ پێدانان، پێویستییان بۆ ئەوەی هەست بکەن گرنگن، باشترین هوری لاوازییە بۆ فێڵسەوە. یەکەم ، ئەمە تەقریبەن شتێکی گەردوونییە، دووەم، فێڵستنەوەی زۆر ئاسانە. هەموو ئەوەی کە پێویستە بیکەیت دۆزینەوەی ئەو ڕێگایانەیە کە وا لە خەڵك دەکات هەست بە باشتر بکەن لەبارەی ڕەوشیانەوە، پێگەی کۆمەڵایەتییان و هۆشمەندییانەوە. هەر کە ماسییەکان بیوە بوون، دەتوانیت چەند جاری تر بەکێشیان بکەیتەوە. لەوانەیە ئەوان قەت باکیان نەبێت، چونکە تۆ وایانلێدەکەیت هەست بە باشتر بکەن لەبارەی خۆیانەوە و ئەمەش شایستەی هەر نرخێکە

**وێنە:** حاڵی لاواز تەیارەکەت هەندێ نهێنی هەن کە پارێزگارییان لێدەکات، بیر لە هەندێ بیرۆکە دەکاتەوە کە دەریاساخات بەڵام بە شێوازگەلێك دەردەکەون کە لەدەرەوەی کۆنترۆڵی خۆیدایە پەڵەمەکی لاواری لەسەر سەریەتی، لە دڵیدایە، بەسەر

سکیلەوەیەتی. هەر کە تۆ پەڵەکەت دۆزییەوە، پەنجەتی لەسەر دابنێ و بە کەیفی خۆت ئەو هەڵسوڕێنە.

**دەسەڵات:** خاڵی لاوازی هەر کەسێک بدۆزەرەوە. ئەمە بریتییە لە هونەری دەکارکردنی ئیرادەکانیان. ئەمە پێویستی بە شارەزایەتی هەیە زیاتر لە مکوڕی. دەبێ تۆ لەکوێوە بۆ کەسێک بچیت. هەر ئیرادەیەک ئەمگیرەیەکی تایبەتی هەیە کە بەگوێرەی رەوق دەگۆڕێت. هەموو پیاوان سەرسامن، هەندێکیان بە ناوبانگ، هەندێکی تر بە بەرژەوەندیی خۆیی، زۆربەشیان بە چێژ. شارەزاییەکە بریتییە لە زانینی ئەم شتە پەسەندانەیان بزنەوەی بیانخەیتە سەما. بە زانینی کانگەی پاڵنەری هەر کەسێک، کلیلی ئیرادەکەیت دەست دەکەوێت.

(بالتاسار گراسیان، ١٦٠١–١٦٥٨)

**پێچەوانەبوونەوە**

یاریکردن لەسەر خاڵی لاوازی خەڵک مەترسییەکی گرنگی هەیە. لەوانەیە تۆ کردارێک بوروژێنیت کە نەتوانیت کۆنترۆڵی بکەیت.

لە گەمەکانی دەسەڵاتدا، هەمیشە چەند هەنگاوێک لەپێشدا ببینە و بەو پێیە پلان دابنێ. ئیمما تۆ ئەو فاکتە دەدۆزیتەوە کە خەڵکی تر هەستیێ و ناتوانن ئەوەندە دوور بەردەم خۆیان ببینن. بەڵام کاتێک تۆ یاری لەسەر لاوازییەکانیان دەکەیت، ئەو رووبەرانەی کە کەمترین کۆنترۆڵیان بەسەردا هەیە، تۆ دەتوانیت ئەو هەستانە بەرەڵا بکەیت کە پلانەکانت تێکدەدەن. خەڵکی دەستەمۆ بەرەو ناو کردارە بوێرەکان هان بدەیت. لەوانەیە زۆر دوور بڕوا. وەڵامگۆی پێویستییان بێت بۆ سەرنج و بایەخ پێدران بێ پێزانین لەوانەیە پێویستیان زۆر لەوە زیاتر بێت کە تۆ پێیان دەدەیت. ئەو پێکهاتە ساڵانەیە دەستەوستانەی کە تۆ یاری لەسەر دەکەیت، دەشێ لەدژی بەرژەوەندیت بشکێتەوە.

چەندەی لاوازییەکە هەستپێکراوتر بێت، مەترسییەکە ئەوەندە مومکینتر دەبێت، سنوورەکانی ئەم پارییە بزانە و قەت مەکەوە ژێر کاریگەریی دەسەڵاتت بەسەر قوربانییەکانتدا، تۆ بەتوانای دەسەڵاتەوەبیت نەک لەژێر گەشکەی کۆنترۆڵکردندا،

## یاسای ژمارە ٣٤

# لە بەرگی خۆتدا پاشا بە: وەک پاشا ڕەفتار بکە تا وەک پاشا مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت

### حوکم

*ئەو شێوازەی بەهۆیەوە ڕەفتار دەکەیت زۆرجار ئەوە دیاری دەکات کە چۆن مامەڵەت لەگەڵدا دەکرێت. لەدوورمەودادا، ئەگەر بێڕەفتار یان ئاسایی دەرکەویت، خەڵکی ڕێزت ناگرن. چونکە پاشا ڕێز لە خۆی دەگرێت و ئیلهامبەخشی هەمان هەستە لەوانیتردا. بە ڕەفتارکردنێکی شاهانە و بڕوابوون بە هێزەکانت، خۆت دەبەستینەوە بە چارەنووسی لەسەرنانی تاج*

### سەرپێچی لە یاساکە

لە مانگی حەوتی ١٨٣٠دا شۆڕشێک لە پاریس هەڵایسا کە پاشا چارڵزی ١٠ی ناچار کرد وازبهێنێت. کۆمسیۆنێکی سەرترین دەسەڵاتەکان لە مەملەکەتەکە کۆبووەوە بۆ هەڵبژاردنی جێگرەوەیەک و ئەو کەسەی هەڵیانبژارد لویس فلیپ، دوکی ئۆرلێنز بوو

لە سەرەتاوە ڕوون بوو کە لویس فیلیپ جۆرێکی جیاوازی پاشا دەبێت و نەک تەنیا لەبەرئەوەی ئەو لە لقێکی جیاوازی خانەوادەی شاهانەوە دەهات یان لەبەرئەوەی ئەو تاجی بۆ نەمابووەوە بەڵکو پێیدرابوو و لە ڕێگەی کۆمسیۆنەکەوە ڕەوایەتییەکەی

دەخرایە بەر پرسیار. هۆکارەکە زیاتر ئەوە بوو کە ئەم کەیفی بە ئاهەنگ و تەڵەرگەکانی شاهانە نەدەهات. ئەو لەناو بانکدارەکان هاوڕێی زۆرتری هەبوو لەچاو خانەدانەکان و ستایلی ئەو دروستکردنی جۆرێکی نوێی حوکمی شاهانە نەبوو، بەو شێوەیەی کە ناپۆلیۆن کردبووی، بەڵکو سووککردنی پێگەکەی بوو، باشتر بوو لەگەڵ دەسمایەکان و خەڵکی چینی ناوەند تێکەڵ بێت کە داوایان لێکردبوو ڕێبەرایەتی بکات. بێرەوە ئەو ڕەمزانەی کە بە لویس فیلیپ گرێ دەدرانەوە نە گۆچانی سەڵتەنەتی بوو نە تاج بوو، بەڵکو کڵاوی حۆڵەمێشی و چەتر بوو کە ئەو بە شانازیەوە بەهۆیەوە بە ڕێگاکانی پاریسدا ڕێی دەکرد وەک بڵێی بۆرجوازییەک بۆ پیاسە لە دەرەوەیە. کاتێک لویس فیلیپ بانگهێشتی جەیمس ڕۆسچیلدی ناسراوترین بانکداری لە فەرەنسا کرد بۆ کۆشکەکەی، ئەو وەک هاوتایەک مامەڵەی لەگەڵدا کرد. بە پێچەوانەی هەر پاشایەکی پێش ئەمیش، ئەو نەک تەنیا باسی بزنسی لەگەڵ مۆسیۆ ڕۆسچیلد کرد بەڵکو ئەمە هەموو باسەکەی بوو، چونکە کەیفی بە پارە دەهات و سامانێکی زۆری هەبوو.

لەکاتێکدا کە حوکمی "پاشای بۆرجوازی" درێژەی هەبوو، خەڵکی بەرەبەرە ڕقیان لێ هەڵگرت. ئەریستۆکراسی نەیدەتوانی بەرگەی بینینی پاشایەکی ناپاشایانە بگرێت و بەماوەی چەند ساڵێک ئەوان پشتیان تێی کرد. لەهەمان کاتدا چینی گەشەکردووی هەژاران، بەو رادیکاڵانەشەوە کە چارلسی دەیەمیان وەدەرنابوو، ڕەزامەندییان پەیدا نەکرد بەرانبەر فەرمانڕەوایەک کە نە وەک پاشایەک ڕەفتاری کرد نە وەک پیاوێکی خەڵک فەرمانڕەوایی کرد. ئەو بانکدارانەی کە فیلیپ لویس لەبەرچاوی دەگرتن بەڕووبی بۆیان دەرکەوت کە ئەمە ئەوان وڵاتیان کۆنترۆڵ کردووە، نەک ئەم، و ئەوان پەیتا پەیتا زیاتر بە چاوی سوک سەیریان دەکرد. ڕۆژێکیان، لە سەرەتای گەشتیکی شەمەندەفەردا کە بۆ خانەوادەی شاهانە ڕێکخرابوو، جەیمز ڕۆسچیلد بە ڕاستی- و لەبەرچاوی خەڵک- سەرکۆنەی کرد لەبەرامبەر دواکەوتنیدا. هەر کە پاشا لە مامەڵەکردنی هاوتایانە لەگەڵ بانکدارەکەدا دەنگ و باسی بڵاو بۆوە، ئێستا بانکدارەکە بە چاوی سوک دەیڕوانییە پاشا

بەکۆشسد ، یاحیبوونەکانی کرێکاران کە کەسی پێش لویس فیلیپیان هێنابووە خوار ، بەرە بەرە سەرپەهەڵدایەوە و پاشا بە رەبری هێز هێنایە خوار بەڵام ئەو وەها دڵڕەقانە بەرگری لە کێ دەکرد؟ دامەرراوەی پاشایەتی نەبوو کە ئەم زۆر بە سوك لێی دەڕوانی، کۆماری دیموکراتیش نەبوو کە حوکمڕانییەکەی ڕێگری بوو. ئەو شتەی کە ئەو بەراستی داکۆکی لێ دەکرد سامانەکەی خۆی و سامانی بانکدارەکان بوو – کە شێوازێك نەبوو بۆ ئیلهامبەخشین بە پاشایەتی لەنێو هاوڵاتیاندا

لە سەرەتاکانی ١٨٤٨دا، نەرەسمییەکانی هەموو چینەکان دەستیانکرد بە خۆپیشاندان بۆ ریفۆرمەکانی هەڵبژاردن کە وڵاتیان بە ڕاستی دەکردە دیموکراتیك. بەهاتنی مانگی شوبات خۆپیشاندانەکان توندوتیژییان بەخۆوە گرتبوو بۆ هێورکردنەوەی جەماوەر، لویس فیلیپ سەرۆك وەزیرەکەی لەسەر کار لادا و لیبراڵێکی لە شوێنی دانا بەڵام ئەمە پێچەوانەی ئەو لێکەوتەیەی دروستکرد کە ئەم دەیویست خەڵکی هەستیانکرد کە دەتوانن فشار لە پاشا بکەن خۆپیشاندانەکان گۆڕان بۆ شۆڕشێکی تەواوەتی لەمارێکدا کە تەق و تۆق و سەنگەربەندی لەشەر شەقامەکان دروستبوون.

لە شەوی ٢٣ی شوباتدا، قەرەباڵغییەکی پاریسییەکان دەوروەی کۆشکیاندا بە نکاوییەکەوە هەمووی تووشی سەرسوڕمان کرد، لویس فیلیپ هەر ئەو ئێوارەیە دەستبەرداری دەسەڵات بوو و بۆ ئینگلتەرە رایکرد. ئەو هیچ جێگرەوەیەکی جێ نەهێشت، نە پێشنیاری کەسیکیشی کرد – تەواوی حکومەتەکەی پێچرایەوە و وەکو سێرکێکی سەفەری کە شارۆچکەیەك جێدەهێڵێت هەڵوەشا

### لێکدانەوە

لویس فیلیپ بەشێوەیەکی ئاگایانە ئەو پرشنگەی بەهێشت کە بەشێوەیەکی سروشتی دەوری پاشا و سەرکردەکان دەدات بە سووککردنی سمبۆلیزمی مەزنایەتی، ئەو باوەڕی بە جیهانێکی تازە هێنا کە تیایدا دەبێ مەزنایەتییەکان وەك هاوڵاتییانی ئاسایی بن و

ڕەفتار بکەن، ئەو ڕاست بوو جیهانێکی نوێ بەبێ پاشا و شازادەکان؛ بە ڕێگەوە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بە قووڵی لەهەڵەدا بوو لەوەدا کە پێشبینی گۆڕانێکی لە داینامیکی دەسەڵات دەکرد.

چەتر و کڵاوی پاشای بۆرژوازی لە سەرەتادا جێی شانازیی فەرەنسییەکان بوو، بەڵام بەزوویی هەراسان بوون. خەڵکی دەیانزانی لویس فیلیپ بە ڕاستی وەک ئەوان نەبوو— ئەمەی کە کڵاو و چەتر لە حەوەمەردا جۆرێک بوو لە مێڵ بۆ ماملیان لەو فەنتازیایەدا کە وڵات لەپڕێکدا یەکسانتر بیوو. لەگەڵ ئەوەشدا، دابەشبوونەکانی سامان قەت ئەوەندە گەورە نەبوون. فەرەنسییەکان پێشبینیی ئەوەیان دەکرد کە فەرمانڕەواکەیان شەکەرێک بێت، بزنەوەی ئامادەییەکی هەبێت. تەنانەت کەسە ڕادیکاڵەکانی وەک ڕۆبسپێر کەبێش پەنجا ساڵ لەماوەی شۆڕشی فەرەنسیدا بۆ ماوەیەکی کورت دەسەڵاتی گرتە دەست، لەمە تێگەیشتبوو و بەدڵنیاییەوە ناپلیۆنیش کە کۆماری شۆڕشگێڕانەی گۆڕیبوو بۆ ڕژێمێکی ئیمپریالی، باش ئەمەی دەزانی. لە ڕاستیدا هەر کە لویس فیلیپ ستەیجەکەی جێهێشت، فەرەنسییەکان ئارەزووی ڕاستەقینەی ئەوێن بۆ دەرکەوت: ئەوان نەوەی ناپلیۆنیان بە سەرۆک هەڵبژارد. ئەو بە ئەستەم ناسراو بوو، بەڵام ئەوان هیوادار بوون ئەو پرشنگی بەهێزی ژەنەراڵە گەورەکە دروست بکاتەوە و یادەوەریی ئامۆی "پاشای بۆرجوازی" بسڕێتەوە.

لەوانەیە خەڵکی بەهێز فریوی ئەوە بخۆن کە کاریگەری دەخەنە سەر پرشنگی مرۆڤی ئاسایی، لە هەوڵی ئەوەدا کە وەهمێک دروست بکەن لەمەڕ ئەوەی ئەمن و ڕەعیەکانیین یان ئەولەی خوار خۆیان لەبنەڕەتدا هاوتان. بەڵام ئەو خەڵکەی ئەم ئاماژە هەڵەیەیان ئاراستە دەکرێت بۆ سەرسامکردن، بەزوویی بۆیان دەردەکەوێت. ئەوان تێدەگەن لەوەی ئەوێن دەسەڵاتی زێبێریان نادرێتێ— ئەمەی کە تەنیا وەها دەردەکەوێت کە ئەوان لە چارەنووسی کەسە بەهێزەکەدا هاوبەشن.

تاکە شێوەی ناو کە کاریگەرە لەو جۆرەیانە کە فرانکلین ڕۆزفێلت هەیبوو، ستایلێک کە گوزارشتی لە بەها و ئامانجە هاوبەشەکانی سەرۆک دەکرد لەگەڵ خەڵک تەنانەت ئەو

کاتەش کە لە ناخی دڵەوە هەر ئەریستۆکرات بوو. ئەو قەت وەها پیشانی نەدا کە نووزانییەکەی لە حەشامات دەسپێنەوە.

## پەیڕەویکردن لە پاسکە

کاتێک کریستۆفەر کۆلەمبەس هەوڵی دەدا سپۆنسەری دارایی بۆ گەشتە دەریاییە داستان ئامێزەکەی بدۆزێتەوە، زۆرێک لەوانەی لە دەوری بوون پێیان وابوو ئەو لە ئەریستۆکراتی ئیتاڵیەوە هاتووە. ئەم دیدە لە ڕێگەی بایۆگرافییەکەوە کە پاش مردنی کۆلەمبەس لەلایەن کوڕەکەیەوە نوسرابوو چووە مێژووەوە، کە وەکو وەچەی کۆنت کۆلۆمبۆی قەڵای کوکارۆ لە مۆنتفێرات وەسفی دەکات. کۆلۆمبۆ بە نۆرەی خۆی دەوترێ کە لە ژەنەراڵی ڕۆمانی کۆلۆنیوسی ئەفسانەییەوە دابەزیووە و گوایە دووان لە ئامۆزا یەکەمینەکانی وەچەی ڕاستەوخۆی ئیمپراتۆری قوستەنتینیەن. لە ڕاستیدا ئەمە باکگراوندێکی شەرەفهەڵگرە. بەڵام ئەمە هیچ نەبوو جگە لە فەنتازیایەکی پڕ شەرەف، چونکە لە ڕاستیدا کۆلۆمبەس کوڕی دۆمینیکۆ کۆلۆمبۆ بوو، فەرش چنێکی سادە کە دوکانێکی شەرابی کردبۆوە کاتێک کریستۆفەر گەنج بوو و پاشان بە فرۆشتنی پەنیر بژێوی خۆی پەیدا کردبوو.

کۆلۆمبەس خۆی ئەفسانەیەکی لەمەڕ باکگراوندە خانەدانەکەی هەڵچنیبوو، چونکە هەر لە سەرەتاوە هەستی کردبوو کە چارەنوس بۆ شتی گەورە جیای کردۆتەوە و ئەمەی کە جۆرێک لە خوێنی شاهانە لە دەمارەکانیدایە. بەم پێیە ئەو وەها ڕەفتاری کرد کە لە ڕاستیدا لە بنەچەیەکی خانەدانییەوە دێت. پاش بەسەربردنی ژیانێکی پیشەیی بێتام وەک بازرگان لە بەلەمێکی بازرگانیدا، کۆلەمبەس کە لە بنەڕەتدا خەڵکی (جینوا) بوو، بوو بە زاوای خانەوادەیەکی سەنگینی لیسبۆن کە پەیوەندیی توندوتۆڵیان لەگەڵ تەختی پورتوگالیدا هەبوو.

لە ڕێگەی ماڵە خەزوورانییەوە، کۆلەمبەس بە فێڵ دیدارێکی لەگەڵ پاشای پورتوگال، جوانی دووەم دەستەبەر کرد کە ئەو یادداشتێکی پێدابوو تا دارایی گەشتێکی خۆرئاوا

بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەکی قەدبڕ بۆ ئاسیا دڵنیا بکات. لە بەرانبەر ڕاگەیاندنی ئەوەی کە هەر دۆزینەوەیەک کە بەدەستی بهێنێت بەناوی پاشاوە بێت، کۆلەمبەس کۆمەڵێک مافی دەویست: نازناوی ئەدمیراڵی مەزنی دەریای ئۆقیانوس، نووسینگەی بریکاری لە سەر هەر خاکێک کە دەیدۆزێتەوە و ١٠٪ لەسەدی داهاتی بازرگانی لەگەڵ ئەو سەرزەمینانە بەندرێت. هەموو ئەم مافانە بۆماوەیی و بۆ هەموو کاتێک دەبوو. کۆلەمبەس ئەم داوایانەی ئاراستە کرد ئەگەرچی ئەو پێشتر تەنیا بازرگانێک بوو، ئەو تەقریبەن هیچی لەبارەی دەریاوانی نەدەزانی، ئەو نەیدەتوانی چارەکێک ئیش بکات و قەت ڕێبەرایەتی گرووپێکی پیاوانی نەکردبوو. سەرباری ئەمەش، یادداشتەکەی هیچ وردەکارییەکی نەدەگرتەخۆ لەسەر ئەوەی کە چۆن پلانەکانی جێبەجێ دەکات، تەنیا بەڵێنی ئەم و مژاری دەدا.

بە دڵنیابوون لەوەی کە داواکارییەکانی وەڵام دەدرێتەوە، کۆلەمبەس لە ١٤٩٢دا کەوتەڕێ بۆ گەڕان بەدوای ڕێڕەوێک بۆ ئاسیا (پێش ئەوەی بڕوات وریا بوو لەوەی باشترین دەریاوان بدۆزێتەوە بۆئەوەی یارمەتیدەری بێت لە کارە ئەوی). گرووپەکە ڕێڕەوێکی ڕەهای نەدۆزییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێک کۆلەمبەس یادداشتی ئاراستەی شاژن کرد بۆ داپێکردنی دارایی گەشتێکی دەریایی نەبەت تامەزرۆیانە لە ساڵی دواتردا، ئەو پاری بوو بەدەستی ئەو کانە، شاژن کۆلەمبەس بە چارەنووسێکی گەش بینیبوو بۆ ئەو شتە مەزنانە

تێکدانەوە

وەکو دۆزەرەوەیەک کۆلەمبەس لە باشترین حاڵەتدا کەسێکی سادە و ئاسایی بوو. ئەو لە دەریاوانێکی ئاسایی کەمتری لەبارەی کەشتییەکانیەوە دەزانی، قەت نەیدەتوانی پێوەری بەرزایی و درێژایی گەشتەکانی دیاری بکات، دووڕگەکانی لەگەڵ کیشوەرە گەورەکانی لێ تێکدەچوو و بەخراپی مامەڵەی لەگەڵ ستافەکەیدا دەکرد. بەڵام لە بوارێکدا ئەو بلیمەت بوو: دەیزانی چۆن خۆی ساغ بکاتەوە. چۆنیتر پووڵی بکاتەوە

چۆن كوڕی پەنیر فرۆشێك، بازرگانێكی دەریایی ئاست نزم، دەتوانی خۆی لە دەزگەی خێزانە شاهانە و ئەریستۆكراتەكان نزیك بكاتەوە؟

كۆلەمەس هێزێكی نایابی هەبوو لە خاڵدۆزینەوەی خانەدانەكان و هەموو شتی پەیوەندی بە شێوازی ڕەفتارەكەیەوە هەبوو. ئەو هەستێكی بروابەخۆبوونی بەرجەستە دەكرد كە بەتەواوی لەگەڵ ئاستەكانیدا ناكۆك بوو. لە ڕاستیدا ئەم بروابەخۆبوونە هەر ئەوە بوو كە زۆرجار خانەدانەكان لەخۆیان پیشان دەدا. ئەریستۆكراتە ستایلێ كۆنە بەهێزەكان پێویستیان بە سەلماندنی نەبوو بۆئەوەی خۆیان بسەلمێنن. بەهۆی ئەوەی خانەدان بوون، دەیانزانی هەمیشە شایستەی زۆرترین و زۆرتریان دەویست. بۆیە لەبەرامبەر كۆلەمبەسدا هەستیان بە نزیكایەتییەكی ڕاستەوخۆ دەكرد، چونكە ئەو ڕێك بەشێوازی ئەوان ڕەفتاری دەكرد- نەك لەسەروو هەشاماتەوە، چارە نووسراو بۆ مەزنایەتی.

تێبگە: لەناو دەسەڵاتی تۆدا نرخی خۆت دابنێیت. ئەمەی كە چۆن ڕەفتار دەكەیت پێشاندەری بیركردنەوەتە بەخۆت. ئەگەر داوای كەم بكەیت، بە پێ بزگێ پێ بكە و سەرت نزم بكەرەوە، خەڵكی پێیان وایە ئەمە پێشاندەری كارەكتەری خۆتە. بەڵام ئەم ڕەفتارە تۆ نییت- ئەمە تەنیا هەڵبژاردنی خوتە بۆ خۆ پیشاندانت بەرامبەر خەڵك. تۆ دەتوانیت وەك كۆلەمەس ئاسان بخەیتەڕوو ڕاقی، بروابەخۆ و هەستكردنی ڕكماكیت بەوەی بۆ لەسەرنانی تاج لەدایك بوویت.

*بۆ هەموو نرییەدەرە مەزنەكان، ڕووداوێكی شایستە هەیە كە ئەوان دەسەڵاتی خۆیانی لێوە بەدەست دەهێنن. لە كرداری واقیعیی نرییەدانا ئەوان دەكەونە ژێر كۆنترۆڵی باوەڕبەخۆبوون، ئەمەیە كە توانی وەها بەرجوتاسا و كاریگەر لەگەڵ ئەوانەی دەوروبەریان دەدوێت.*

*فریدریك نیچە، ١٨٤٤–١٩٠٠*

کە منالین، ئێمە بە شاگەشکەییەکی زۆرەوە دەژین، چاوەڕێی هەموو شتێک و داوای هەموو شتێک لە جیهان دەکەین. ئەمە بەشێوەیەکی گشتی لە یەکەمین هێزەکانماندا بۆ ماو کۆمەڵگە دەردەکەوێت، لەکاتێکدا کە ئێمە ژیانی پیشەییمان دەست پێدەکەین، بەڵام کاتێک گەورە دەبین شکست و سکۆڵکانمان سنوور دادەنێن و پێ بەپێی کات توندتر و ڕەقتر دەبن. بە گەیشتنە ئەو ئاستەی کە کەمتر لە جیهان چاوەڕێ بکەین، ئەو سنووربەندییانە قبوڵ دەکەین کە زیاتر خۆمان سەپاندووماس. ئێمە دەست دەکەین بە مل دانەواندن و پچڕین و پۆزش هێنانەوە بۆ سادەترین داواکانمان. چارەسەر بۆ بچووکبوونەوەیەکی لەو جۆرەی ئاسۆکان ئەوەیە بە مەبەستەوە خۆمان ناچاری ئاراستەیەکی پێچەوانە بکەین- شکستەکان بە بچووک بگرین و سنووربەندییەکان فەرامۆش بکەین، وەها لە خۆمان بکەین ئەوەندەی منال داوا و پێشبینی بۆ بەدەستهێنانی ئەمە، پێویستە ئێمە ستراتیژێکی دیاریکراو بەسەر خۆماندا پیادە بکەین دەتوانیت پێی بڵێیت ستراتیژی تاج.

ستراتیژی تاج لەسەر بنەمای سادەی زنجیرەی هۆکار و ئەرەنجام بونیاد نراوە: ئەگەر ئێمە باوەڕمان وابێت چارەنووسمان بۆ شتە مەزنەکان نوسراوە، باوەڕمان بۆ دەرەوە تیشک دەداتەوە، وەک چۆن تاج پرشنگێک بە دەوری پاشادا دروست دەکات. ئەم تیشکدانەوەیەی دەرەوە خەڵکی دەوروبەرمان تووش دەکات، کە پێیان وادەبێت دەبێ ئێمە هۆکارمان هەبێ بۆ ئەوەی هەست بە دڵنیاییەکی وەها بکەین. پێدەچێ ئەو خەڵکانەی تاج لەسەر دەنێن هەست هەستی ناوەکی سنوورەکان نەکەن بۆ ئەو شتەی کە دەتوانن داوای بکەن یان بەدەستی بێنن. ئەمەش بۆ دەرەوە تیشک دەداتەوە، سنوورەکان ون دەبن. ستراتیژی تاج بەکاربێنە و ئیتر تۆ سەرت دەسوڕمێنێت کە چەند جار بەرهەمی دەبێت. ئەو منالە دڵخۆشانە بە نموونە وەربگرە کە هەرچییەکیان بوێت داوای دەکەن و بەدەستیشی دێنن. چاوەڕوانییە بەرزەکانیان جادووەکەیانە.

پێگەیشتووان خۆشی لەوە دەبینن کە ئارەزووەکانیان بەجێ بێنن– وەک چۆن ئیزابێلا خۆشی لەوە بینی کە هیواکانی کۆلەمبەس بەدی بێنێت.

لەوانەیە تاج لە خەڵکی ترت جیا بکاتەوە، بەڵام دەکەوێتە سەر خۆت کە ئەم جیابوونەوەیە بکەیتە واقیع: دەبێ تۆ بەشێوەیەکی جیاواز هەنگاو بنێیت، دووریی خۆت لەوانەی دەوروبەرت بپارێزیت. ڕێگەیەک بۆ جەختکردنەوە لە جیاوازییەکەت ئەوەیە کە هەمیشە بە شکۆوە ڕەفتار بکەیت، گرنگ نییە بارودۆخەکە هەرچۆنێک بێت. لویس فیلیپ هیچ هەستێکی نەدایە خەڵک لەمەڕ ئەوەی کە جیاواز بێت لەوانیتر– ئەو پاشایەکی بانکدار بوو. هەر کە ساتی ئەوەش هات ڕەعیەکانی هەڕەشەی لێبکەن، ملیدا. هەمووان هەستیان بەمە کرد و باریاندا. بە نەبوونی شکۆی شاهانە و مکوڕیی لە مەبەستدا، لویس فیلیپ وەکو ساختەیەک هاتە بەرچاو و تاجەکەی بە ئاسانی لەسەر بەریزوە.

هەیل سێلاسی فەرمانڕەوای ئەسیوپیا بۆ ماوەی چل ساڵ لە سەرەتاکانی ۱۹۰۳یەوە، هێشتا کە جاران گەنجێک بوو بەناوی (لیج تافاری). ئەو لە خانەوادەیەکی خانەدانەوە دەهات، بەڵام چانسێکی واقیعی نەبوو لەمەڕ ئەوەی دەسەڵات بگرێتە دەست، چونکە ئەو زۆر لە سیلسیلەی پاشا و تاج، مێنیلیکی دووەم، دوور بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لە تەمەنێکی زووەوە بڕوابەخۆبوونێک و ڕەفتارێکی شاهانەی پیشاندا کە بووە جێی سەرسوڕمانی ئەوانەی دەوروبەری.

لە تەمەنی چواردەساڵیدا، تافاری چووە دەربار تا لەوێ بژیت کە لەوێ دەستبەجێ کاریگەری لەسەر مینیلیک دانا و بووە دڵخوازی ئەو. شکۆی تافاری لەژێر ئاگردا، ئۆقرەییەکەی و لەخۆدڵنیاییە هێمنەکەی کاری کردە سەر پاشا. خانەدانەکانی تر، لوتبەرز، حۆ بەزلزان و ئیرەیی بەر بوون و فشاریان بۆ ئەم هەرزەکارە کتێب خوێنە دەهێنا. بەڵام ئەو قەت توڕە نەبوو– ئەمە دەبووە نیشانەیەکی مانەمنی و نەلایدا نەدەچوو. هەروکە خەڵکێکی لە دەور هەبوون کە هەستیان دەکرد ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو دەگاتە ترۆپک، چونکە ئەو وەها ڕەفتاری دەکرد کە هەروکە لە ترۆپکە.

ساڵێك دواتر، لە ١٩٣٦دا، فاشیستە ئیتالیەكان دەستیان بەسەر ئەسیوپیا دا گرتبوو و ئافاری، كە ئێستا پێیان دەوت هەیل سێلاسی، لە تاراوگە بوو، ئەو موحاكەمەی كۆمەڵەی نەتەوەكانی كرد تا پشتیوانی كەیسی وڵاتەكەی بكەن. ئیتالیەكان لەناو ئامادەبووانیدا بە جاڕیكی سوك و قیزەون لەویان دەڕوانی، بەڵام ئەو ڕەفتاری شكۆمەندانەی خۆی پاراستبوو، وەك بڵێی هیچ باكی بەوان نییە. ئەم بووە هۆی بەرزبوونەوەی لەكاتێكدا كە مەیارەكانی ئەنانەت دزێوتر دیاربوون. لە ڕاستیدا شكۆمەندی بەشێوەیەكی بۆ چەشنوچوون دەمامكێكە بۆئەوەی لە بارودۆخە سەختەكاندا بچیتە ژێر باری؛ وەك ئەوە وایە كە هیچ شتێك كارت تێنەكات و تۆ تەواوی كاتت لە جیهاندا لەبەردەستدایە تا كاردانەوەت هەبێت. ئەمە مانیشێكی یەكجار بەهێزە.

ڕەفتاری شاهانە بەكارهێنانی تریشی هەیە. ساختەچییەكان لەمێژە بەهای پەیڕەوی ئەریستۆكراتانەیان زانیووە. ئەمە یان ئەوەتا هەڵكی دەستەمۆ دەكات و وایان لێدەكات كەمتر گومانیان هەبێت یان ئەوەتا دەیانترسێنێت و دەیانخاتە حاڵەتی بەرگرییەوە– و هەروەك گۆنت لیكتۆر لوستیگ دەیزانی، هەر كە تۆ ساویلكەیەك بخەیتە حاڵەتی بەرگری، ئەوا پەكی كەوتووە.

بیرت بێت دەكەوێتە سەر خۆت نرخی خۆت دابنێیت. داوای كەم بكەیت هەر كەمت دەست دەكەوێت. داوای زۆر بكە و ئاماژەی ئەوە بكەیەنە كە تۆ شایستەی نرخ و بەهای پاشاییت. تەنانەت ئەولەش كە ڕەتت دەكەنەوە، لەبەرانبەر متمانەبەخۆبوونەكەتدا ڕێزت دەگرن و ئەو ڕێزە بۆ دواجار بە شێوازگەلێك كە وێنای ناكەیت، كەڵكی دەبێت.

**وێنە:** تاج. لەسەر سەری خۆتی دابنێ ئەوا بەشێوازێكی جیاواز دەردەكەویت– هێمنیت بەڵام دڵنیاییەك تیشك دەدەمێتەوە. قەت گومان پیشان مەدە، قەت شكۆمەندی لەژێر تاجەوە لەدەست مەدە ئەگینا بۆت نابێت. تاج چارەنووسی كەسێكی شایستەتر دەبێت. چاوەڕێی تاج لەسەرنان مەكە، گەورەترین ئیمپراتۆرەكان تاج لەسەر سەری خۆیان دادەنێن.

دەسەڵات: دەبێ هەموو کەسێک لە بەرگی خۆیدا شاهانە بێت. با هەموو کردارەکانت ئەگەرچی هی پاشایەکیش نەبن، لە ناو فەرزی خۆیاندا، شایستەی پاشایەک بن. لە کردارەکانتدا بەرز بە، لە بیرکردنەوەکانتدا قەبە بە و لە هەموو کارەکانتدا پیشانی بدە کە تۆ شایستەی ببیتە پاشایەک ئەگەرچی لە واقیعیشدا پاشایەک نەبیت

(بالتاسار گراسیەن، ١٦٠١–١٦٥٨)

## پێچەوانەبوونەوە

ئایدیای پشت گریمانەی شاهانە ئەوەیە خۆت لە خەڵکی تر جیا بکەیتەوە، بەڵام ئەگەر لەمەدا قاچت زۆر ڕاکێشیت ئەوا کۆتاییت پێ دێت. قەت هەڵەی ئەوە مەکە پێت وابێت تۆ بە ڕیسواکردنی خەڵکی بەرز دەبیتەوە. هەروەها، قەت ئایدیایەکی باش نییە زۆر بەسەر جەماوەردا بەرز بیتەوە– تۆ دەبیتە ئامانجێکی ئاسان. کاتیش هەن تیایاندا خۆدەرخستنێکی ئەریستۆکراتیانە بێ ڕادە مەترسیدارە

چارلسی یەکەم، پاشای ئینگلتەرە لە ماوەی ١٦٤٠ەکاندا ڕووبەڕووی ناڕەزاییەکی گشتی قووڵ بەرامبەر دامەزراوەی پاشایەتی بووەوە. یاخیبوونەکان لە سەرتاسەری وڵاتدا تەقینەوە کە لەلایەن ئۆلیڤەر کرۆمویل ڕێبەرایەتی کرا. ئەگەر چارلز بە قووڵبینییەوە کاردانەوەی بەرامبەر بزووتنەوەکە پیشان بدایە، پشتگیری ڕیفۆرمی بکردایە و سازشێکی قوربانیی بەشێک لە دەسەڵاتەکەی خستبایەڕوو، ئەوا ئەبوو مێژوو جیاواز بووایە. لەبری ئەمە، ئەو پۆزێکی شاهانەی زۆرتر خستەڕوو، وا بشایەندا کە ئەم هێرشە بۆ سەر دەسەڵاتەکەی و دامەزراوەی خودایی پاشایەتی توڕەیە. پاشایەتیگەراییە ڕەق و وشکەکەی بووە مایەی ترسداربوونی خەڵک و گڕی بەردایە یاخیبوونەکەیان. دواجاریش چارلز سەری درا، بەمانای وشە

تێبگە: تۆ بڕوابەخۆبوون تیشک دەدەیتەوە، نەک لوتبەرزی و بە سووک سەیرکردن

دواجار، ڕاستە تۆ هەندێ جار دەتوانیت لە ڕێگەی جۆرێک لە خستنەڕووی بێتامیی ڕەمیی دەسەڵات بەدی بکەیت، بەڵام خۆجیاکردنەوەت لە خەڵک و بێتامتر دەرکەوتن

## یاسای ژمارە ٣٥

## وەستای کات دانان بە

### حوکم

*ئەوە بزانە کە پەلە — پەلەکردن ناپاکی لە نەبوونی کۆنترۆڵ بەسەر خۆت و کاتدا دەکات. هەمیشە بەئۆقرە دیاربە، وەک بڵێی دەزانیت دواجار هەموو شتێکت بۆ دێت. ببە بە سیخوڕی کاتی گونجاو، بۆنی ڕۆحی کات بکە، واتە ئەو تەوژمانەی بەرەو دەسەڵات دەتگوازنەوە. فێربە بکشێیتەوە دواوە کاتێک کات هێشتا نەگەیشتووە و بە توندی لێیدەیت کاتێک بەری گرتووە*

### پەیڕەوی لە یاساکە

جۆزێف فۆچێ کە ژیانی وەکو مامۆستایەکی نەناسراوی قوتابخانەی سیمینار دەستپێکرد، لە بەشی هەرە زۆری دەیەی ١٧٨٠کان لە شارۆچکەیەکەوە دەچووە شارۆچکەیەکی تر و وانەی ماتماتیکی بە کوڕانی گەنج دەگوتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قەت بەتەواوی خۆی پابەند نەکرد بە کەنیسەوە، قەت وەک قەشەیەک سوێندی نەخوارد— ئەو پلانی گەورەتری هەبوون. ئەو بە ئۆقرەوە چاوەڕێی دەرفەتی خۆی بوو، ئەو بژاردەکانی بە کراوەیی هێشتەوە. کاتێکیش شۆڕشی فەرەنسی لە ١٧٨٩دا هەڵایسا، فۆچێ چیتر چاوەڕێی نەبوو: ئەو خۆی لە دەرپۆشە درێژەکەی قوتار کرد، قژی درێژ کرد و

بووە شۆڕشگێڕ چونکە ئەمە ڕێحیەتی سەردەمەکە بوو لەوانەبوو لەکیسچوونی بەڵەمەکە لەو ساتەوەختە گرنگەدا کارەساتبار بووایە فۆچێ بەڵەمەکەی لەکیس خۆی نەدا بە هاوڕێیەتیکردنی ڕۆبسپێر، بەخێرایی لەپلەکانی پاهیگەری بەرز بووەوە لە ١٧٩٢دا، شارۆچکەی ناسێس فۆچێی وەکو نوێنەری کۆنڤانسیۆنی نەتەوەیی هەڵبژارد (ئەو ساڵە دروستبوو بۆئەوەی دەستوورێکی نوێ بۆ کۆماری فەرەنسا داڕێژێت).

کاتێک فۆچێ گەیشتە پاریس بۆئەوەی شوێنی خۆی لە کۆنڤانسیۆنەکە بگرێت، شەڕێکی توندوتیژانە لەنێوان میانڕەوەکان و جاکۆبیە ڕادیکاڵەکان دروست ببوو فۆچێ هەستی بەوە کرد کە لە دوورمەودا دا هیچ کامێکیان سەرکەوتوو نابن. دەسەڵات بەدەگمەن لە دەستی ئەوانەدا دەگیرسێتەوە کە شۆڕش دەستپێدەکەن، یان تەنانەت ئەوانەش کە درێژەی پێدەدەن. دەسەڵات دەکەوێتە لای ئەوانەی کە دەیگەیەننە ئەنجام، ئەمەش ئەو لایەنە بوو کە فۆچێ ویستی لەگەڵیدا بێت

هەستی بۆ کات گرتنەوە زۆر زیرەکانە بوو. وەکو میانڕەو دەستپێکرد، چونکە میانڕەوەکان زۆرینە بوون. کاتێک کاتی ئەوە هات بڕیار لەسەر ئەوە بدات ئاخۆ لویسی شانزە لەسێدارە دەدرێت، ئەوەی بینی کە خەڵکی تینووی سەری پاشان، بۆیە ئەو دەنگی بە بڕیارەکەدا– بۆ گیلۆتین. ئێستا ئەو ببووە ڕادیکاڵێک. لەگەڵ ئەوەشدا، لەکاتێکدا کە ئەنگژەکان لە پاریس توند بوون، مەترسیی زۆر نزیکبوونی لە هەر لایەنێک لەلایەنەکان بینی، بۆیە پۆستێکی لە ناوچە پەراوێزەکان قبوڵ کرد کە لەوێ دەیتوانی بۆ ماوەیەک بە نەبینراوی بمێنێتەوە چەند مانگێک دواتر پۆستی پرۆکۆنسوڵی لە (لیۆن) پێدرا کە لەوێ سەرپەرشتی لەسێدارەدانی دە دوانزە ئەریستۆکراتی کرد لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا، ئەو داوای وەستاندنی کوشتارەکەی کرد، هەستکرد کە میزاجی وڵات لەگۆڕاندایە– سەرباری ئەوەی هەموکە دەستەکانی خوێناوی بوون، هاوڵاتیانی لیۆن وەکو ڕزگارکەرێک لەو شتە بینیان کە وەک تیرۆر ناسیبوویان

بۆیە فۆچێ زیرەکانە یاری بە کارتەکانی کردبوو، بەڵام لە ١٧٩٤دا ڕۆبسپێری کۆنە هاوڕێی بانگی کردەوە بۆ پاریس بۆئەوەی ڕێکوردی کردارەکانی لە لیۆن بخاتەڕوو

ڕۆبسپێر هێزی پاڵنەر بوو لە پشت تیرۆرەوە. ئەو چەند کەللە سەرێکی بەلای ڕاست و بەلای چەپیشدا گلۆر کردبووەوە و بێدەچوو فۆچێ کە ئەو چیتر متمانەی پێنەدەکرد، کەللەسەرێکی تر بێت گلۆربوونەوەکەی مسۆگەر بێ. بەدرێژایی چەند هەفتەیەک، ململانێیەکی توند ڕوویدا لەکاتێکدا کە ڕۆبسپێر بە ئاشکرا لەدژی فۆچێ وەستابووەوە و تۆمەتباری دەکرد بەوەی بەشێوەیەکی مەترسیدار چاوچنۆکە و داوای دەستگیرکردنی کرد، فۆچێی لێزان بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆتر کاری کرد، بە بێدەنگی دەستیکرد بە بەدەستهێنانی پشتیوانی لەنێو ئەوانەی کە بەرەبەرە لە کۆنترۆڵی دیکتاتۆریانەی ڕۆبسپێر بێتاقەت دەبوون. ئەو دەیزانی چەندەی زۆرتر زیندوو بمێنێت، ئەوەندە دەتوانێ ژمارەیەکی زۆرتری خەڵک لەدژی ڕۆبسپێر سەر بدات. ئەو هەم لەنێو میانڕەوەکان و هەم لەنێو جاکۆبینەکاندا خەڵکی ساردا و لەسەر ترسی بەربڵاوی ڕۆبسپێر یاری کرد- هەمووان لەوە دەترسان ئەو کەسەی دواتر بن کە سەری دەچێتە بەر گلۆتین. هەمووی لە ٢٧ ی جولای دا بە ئاکام گەیشت کۆنڤانسیۆن لە ڕۆبسپێر هەڵگەڕایەوە و بە هاوار وتارە درێژە ئاساییەکەی ئەویان بڕیەوە. ئەو بەخێرایی دەستگیر کرا و پاش چەند ڕۆژێک سەری ڕۆبسپێر نەک فۆچێ خرایە ناو سەبەتەوە

کاتێک فۆچێ پاش مردنی ڕۆبسپێر گەڕایەوە بۆ کۆنڤانسیۆن، چاوەڕوانەکراوترین هەنگاوی نا: پاش ئەوەی پیلانەکەی لەدژی ڕۆبسپێر بەگەڕ خست، چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرا لەگەڵ میانڕەوەکان دابنیشێت، بەلام جارێکی تر لایەنگیری خۆی گۆڕی و چووە پاڵ جاکۆبینەکان لەوەبوو ئەمە یەکەمین جاری ژیانی بێت کە بچێتە پاڵ کەمینە بوون بوو کە ئەو هەستی دەکرد پەرچەکردارێک دەوروژێنێت: ئەو زانی ماڵی میانڕەوەکان کە ڕۆبسپێریان لەناوبردبوو و ئێستا خەریک بوو دەسەلاتیان دەگرتە دەست دەستنەسازیی گەڕێکی نوێی تیرۆریان دەکرد، ئەمجارەش لەدژی ڕادیکاڵەکان. لە بوون بە لایەنگیری جاکۆبینەکاندا، فۆچێ لەگەڵ شەهیدانی ڕۆژانی دواتردا دانیشتبوو- ئەو خەڵکەی کە بە تۆمەتبار لەقەڵەم دەدران لەو گێژاوەی کە لە ڕێگەیاندا بوو لایەنگیریکردنی ئەو لایەنەی کە دەبووە سیمی دۆڕاو، قومارێکی مەترسیدار بوو، بەلام

دەتوانێ فوچی هەڵاتنی بۆ ئەوە بکات کە دەتوانێت تا ئەو ماوە زۆرە سەری خۆی بپارێزێت کە بە بێدەنگی خەڵکی لەدژی میانڕەوەکان هان بدات و تەماشایان بکات کە لە دەسەڵات بەر دەبنەوە. لە ڕاستیشدا، هەرچەندە میانڕەوەکان لە دیسەمبەری ١٧٩٥دا داوای دەستگیرکردنیان کرد و ڕەوانەی بەر گولۆتینیان دەکرد، کاتێکی زۆر تێپەڕیبوو جەلادەکان لای خەڵک ناشیرین ببوون و فوچێ جارێکی تر لە قەنارەی کات دەرباز بوو.

حکومەتێکی نوێ پێکهات، (دایرێکتەری)، هەرچۆنێک بێت ئەمە حکومەتی هاوپەیمانەکان نەبوو بەڵکو هی میانڕەوەکان بوو- زۆر میانڕەوتر بوو لەوەی تیرۆری سەپاندبووەوە. فوچێی ڕادیکاڵ سەری خۆی پاراستبوو، بەڵام ئێستا دەبووایە بەبێزار بێت. ئەو بە تۆمەتەوە بۆ ماوەی ساڵانێک لە قەراغەکاندا چاوەڕێ بوو، لێدەگەڕا کات هەموو هەستە تاڵەکان لەدژی ئەو نەرم بکات، پاشان لە (دایرێکتەری) نزیک کەوتەوە و ڕازیکردن بەوەی کە ئەم ئامەرزییەکی نرخی هەیە، کۆکردنەوەی زانیاری. ئەو بووە سیخوڕێکی بەکرێ بۆ حکومەت، لە کارەکەدا لێهاتوویی پەیدا کرد و لە ١٧٩٩دا بە بوون بە وەزیری پۆلیس پاداشت کرا. ئێستا ئەو نەک تەنیا توانای پێدرابوو بەڵکو پێویست بوو سیخوڕییەکەی بۆ هەموو سوچێکی فەرەنسا فراوان بکات- بەرپرسیارێتییەک کە بەشێوەیەکی بەرچاو توانا سروشتییەکەی بۆ بۆنکردنی ئەو شوێنەی بای لێوە هەڵدەکرد تۆکمە بکات. یەکەمین تەوژمی کۆمەڵایەتی کە ئەم هەستی پێکرد لە ڕاستیدا لە کەسی ناپلیۆنەوە هات، ژەنەراڵێکی گەنجی سەرکێش، کە ئەو ڕای چارەنووسی ڕاستەوخۆ بەندە بە ئایندەی فەرەنساوە. کاتێک ناپلیۆن لە ٩ی نۆڤەمبەر ١٧٩٩دا کودەتایەکی هەڵگیرساند، فوچێ وای نیشاند کە خەوتووە. لە ڕاستیدا ئەو بەدرێژایی ڕۆژەکە خەوتبوو بۆ ئەم هاوکارییە ناڕاستەوخۆیە- لەوانەیە ناوەڕ وابووبێت کە کاری ئەو دواجار ڕێگرییە لە کودەتای سەربازی- ناپلیۆن لە ڕژێمی نوێدا ئەوی وەک وەزیری پۆلیس هێشتەوە.

بەدرێژایی چەند ساڵی دواتر، ناپلیۆن زۆر و زۆرتر پشتی بە فوچێ بەست. ئەو تەنانەت تایتڵە شۆڕشگێڕییەکەی پێشووی، دوکی ئۆترانتۆ، بەو بەخشی و سامانێکی زۆر دایە. لەگەڵ ئەوەشدا، بەهاری ١٨٠٨، فوچێ، کە هەمیشە لەگەڵ ڕۆژگارەکاندا

دەهاتەوە، هەستیکرد ناپلیۆن پرو لە ئاوابوونە. جەنگە بێ ئاکامەکەی لەگەڵ ئیسپانیا، وڵاتێک کە هیچ ڕیایی بۆ فەرەنسا نەبوو، نیشانەی ئەوە بوو کە ئەو هاوسەنگی لەدەست دەدات. فۆچێ کە لەوانە نەبوو لە کەشتییەکی پڕو لەنوقمبووندا گیر بخوات، لەگەڵ تالیراند گەفتوگۆمەکێی کرد بۆ بەگژچوونی کەوتنی ناپۆلیۆن. هەرچەندە پیلانەکە شکستی هێنا — تالیراند دەرکرا و فۆچێ مایەوە، بەڵام لەسەر پەتەکە — ناڕەزایەتییەکی بەرچاو لەبەرامبەر ئیمپراتۆر بڵاو بووەوە کە پێدەچوو کۆنترۆڵ لەدەست بدات. لە هاتنی ١٨١٤ دەسەڵاتی ناپۆلیۆن دارمابوو و هێزەکانی هاوپەیمانان گرتیان.

حکومەتی دواتر بریتی بوو لە گەڕانەوەی پاشایەتی لە فۆرمی پاشا لویسی هەژدەدا کە برای لویسی شازدە بوو. فۆچێ کە هەمیشە بۆنی کەش و هەوای وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی دواتری دەکرد، ڕای لویس زۆر ناحەزی بوو؛ ئەو لێهاتووییەی ناپۆلیۆنی نەبوو. فۆچێ خەریکی تر گەمەی چاوەڕوانییەکەی کردەوە، خۆی نەبیراو کرد، لە ڕۆشنایی دوور کەوتەوە. کە تەواو دڵنیا بوو، ناپۆلیۆن لە شوباتی ١٨١٥دا لە دوورگەی ئێلبا ڕایکرد کە نەوێ نەفی کرابوو. لویسی هەژدە تۆقی. سیاسەتەکانی ببوونە مایەی دابڕانی هاوڵاتیان کە ئەمەرووی گەڕانەوەی ناپۆلیۆن بوون. بۆیە لویس ڕوویکردە ئەو تاکە پیاوەی کە دەوانەبوو بتوانێت لەو مەترسییە ڕزگاری بکات: فۆچێ ڕادیکاڵی پێشوو کە برکەی ئەوی، واتە لویسی شازدە، بریبووە بەر گیلۆتین، بەڵام ئێستا یەکێک بوو لە سیاسەتمەدارە هەرە بەسەمەدەکان لە فەرەنسا. لەگەڵ ئەوەشدا، فۆچێ لایەنگیری دۆڕاوی نەدەکرد. ئەو داوای لویسی بۆ یارمەتیدانی ڕەتکردەوە نەوەی وا خۆی پیشان بدات کە یارمەتییەکەی پێویست نییە — نە سوێندخواردن نەوەی کە ناپۆلیۆن قەت نەگەڕێتەوە بۆ سەر دەسەڵات (هەرچەندە دەیزانی پێچەوانەکەی ڕاستە). کاتێکی کەم دواتر ناپۆلیۆن و سوپای نوێی هاوڵاتیانی بە پاریس نزیک دەبوونەوە.

پاش سەبری ئەوەی کە حوکمڕانییەکەی بەرەو هەرەس سەر دەنێت، بە هەستکردن بەوەی کە فۆچێ ناپاکی بەرامبەر ئەو کردووە و دڵنیایە کە ئەم پیاوە نەهێڕ و نەتوانایەی لە تیمی ناپۆلیۆندا ناوێت، پاشا لویس فەرمانیدا دەستگیرکردن و سێداری وەزیری دا. بە

١٦ی مارسی ١٨١٥دا، پۆلیس لە شەقامی پاریس دەوری عەرەبانەکەی فۆچێیان دا. ئایا ئەمە کۆتایی بوو؟ لەوانەیە، بەڵام ڕاستەوخۆ نا. فۆچێ بە پۆلیسی وت کە ناکرێ ئەندامێکی پێشووی حکومەت لەسەر شەقام دەستگیر بکرێت. ئەوان باوەڕیان بە چیرۆکەکە کرد و ڕێگەیاندا بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. کاتێکی تری ئەو ڕۆژە، ئەوان هاتنە ماڵەکەی و جارێکی تر ڕایانگەیاند کە دەبێ دەستگیر بکرێت. فۆچێ سەری لەقاند- بەڵام ئایا ئەفسەرەکان ئەوەندە میهرەبان دەبوون ڕێگە بە جێنتڵمانێک بدەن بچێت خۆی بشوات و جل بگۆڕێت پێش ئەوەی بۆ دواجار لە ماڵ دەرچێت؟ ئەوان مۆڵەتیاندا، فۆچێ ژوورەکەی جێهێشت و چەند خولەکێک تێپەڕی. فۆچێ نەگەڕایەوە. دواجار پۆلیسەکان چوونە ژوورەکەی ئەویشت- کە لەوێ پەیژەیەکیان بینی بە پەنجەرەیەکی گرتووە هەڵپەسێردراوە و بەرەو باخچێک لەخوارەوە شۆڕ بووەوە.

ئەو ڕۆژە و ڕۆژی دواتر پۆلیس سەرانسەری پاریس بەدوای فۆچێ دا گەڕا، بەڵام بەهاتنی ئەو کاتە ئیتر دەنگی تۆپخانەی ناپلیۆن لە دوورەوە دەبیسترا و دەبوویە پاشا و هەموو دەست و پێوەندەکانی لە شار ڕابکەن، هەر کە ناپلیۆن داخڵی پاریس بوو، فۆچێ لە حەشارگە هاتە دەرەوە. ئەو جارێکی تر جەلادەکەی هەڵتەکاندبوو. ناپلیۆن سڵاوی لە وەزیری پێشووی پۆلیس کرد و بە خۆشحاڵییەوە گەڕاندیەوە بۆ سەر پۆستە کۆنەکەی. لەماوەی ئەو سەد ڕۆژەدا کە ناپلیۆن لە دەسەڵاتدا بوو، تا واتەرلوو، لە هەوبەردا فۆچێ بوو حوکمی فەرەنسای دەکرد. پاش کەوتنی ناپلیۆن، لویسی هەژدە گەڕایەوە سەر تەخت و وەک پشیلەی تر ڕۆژ، فۆچێ مایەوە بۆ ئەوەی لە حکومەتێکی تر خزمەت بکات- بە هاتنی ئەو کاتە دەسەڵات و کاریگەری ئەو ئەوەندە گەشەی کردبوو کە تەنانەت پاشاش جورئەتی نەبوو تەحەدای بکات.

### لێکدانەوە

لەماوەیەکی بەشێوەی بێ پێشینە، جۆزێف فۆچی لە ڕێگەی وەستایەتی لە هونەری کات گرتنەوەدا گەشەی کرد. ئەو چەند وانەیەکمان فێر دەکات

یەکەم، گرینگە ڕۆحی کاتەکان بناسیتەوە. فۆچی هەمیشە دوو هەنگاو لە پێش خۆی دەیڕوانی، ئەو شەپۆلانەی دەدۆزییەوە کە بەرەو دەسەڵات هەڵیدەگرتن و سواریان دەبوو. دەبێ تۆ هەمیشە لەگەڵ ڕۆژگاردا تێش بکەیت، چاوەڕێی گۆڕان و وەرچەرخانەکان بیت و قەت بەلەمەکەت لەبن دەست دەرنەچێت. هەندێ جار ڕوحیەتی کاتەکان نەمومژاوییە؛ بەو شتەدا مەیناسەرەوە کە بە دەنگەدەمترین و ئاشکراترینە، بەڵکو ئەوەی کە شاراوە و مت بیناسەرەوە. بۆ ناپۆلیۆنەکانی داهاتوو بڕوانە نەک ئەوەی دەست بە کاولاشی ڕابردووەوە بگریت.

دووەم، مەرج نییە ناسینەوەی با ڕاڵەکان مەعانای ئەوە بێت لەگەڵیدا بڕۆیت. هەر ڕاڤێکی کۆمەڵایەتی بەپێت پەرچەکردارێکی بەهێز دروست دەکات و ژیرانەیە چاوەڕێی ئەوە بکەیت پەرچەکردارەکە چۆن دەبێت، هەروەک فۆچێ لە پاش لەسێدارەدانی ڕۆبسپێر کردی، لەبری سواربوونی شەپۆلە پڕ باق و بریقەکانی ساتەوەختەکە، چاوەڕێی ئەو شەپۆلانە بە کە بەرەو دەسەڵات دەتگەڕێنەوە. لە کاتی خۆیدا گرەو لەسەر ئەو پەرچەکردارە بکە کە لە ساربوونەدایە و خۆت بخەرە پێشەوەی.

لە کۆتاییدا، فوچێ تۆقرەیەکی بەرچاوی هەبوو، بەبێ تۆقرەگرتن وەک شمشێر و قەڵغانەکەت، کات گرتنەوەکەت شکست دێنێت و تۆ بەشێوەیەکی حەتمی خۆت وەک دۆڕاوێک دەبینیتەوە. کات ڕۆژگار لەدژی فوچێ بوو، ململانێی نەدەکرد، هەڵنەدەچوو، یان سەرشێتانە ڕەفتاری نەدەنواند. ئەو ئارام بوو و بە بەپیرێوە دەمایەوە، بە تۆقرەوە پشتیوانی لەنێو هاوڵاتیاندا بونیاد دەنا، کە سەنگی مەحەکی ڕابوونی دواتری بوو لە دەسەڵاتدا. هەر کاتێک خۆی لە پێگەیەکی لاوازدا بینیبایەتەوە، بۆ کات یاری دەکرد کە ئەو دەیزانی هەمیشە هاوپەیمانێتی ئەگەر تۆقرە بیت. کەواتە؛ ساتەکە بناسەرەوە، بزنەوەی لەناو گژوگیادا خۆت مشاریتەوە یان مجرێنێنە ژێر مەرد، هەروەها ئەو ساتەش کە چرپۆکەکانت دەرخەست و هێرش بێست.

*دەتوانی پاشایی بەدەست بێنیتەوە، بەڵام کات هەرگیز نا*

*ناپۆلیۆن بۆناپەرت،* ١٧٦٩ – ١٨٢١

## کلیلی دەسەڵات

کات چەمکێکی ساختەیە کە ئێمە خۆمان دروستمانکردووە تا مێشکمان ئەبەدیەت و گەردوونی بەهەمووکراوتر بێت، مرۆییتر بێت. لەبەرئەوەی ئێمە چەمکێکی کاتمان بونیاد ناوە، بەهەمان شێوە دەتوانین لەقاڵبی بدەین و تا ئاستێک چەند فێڵێکی لێ بکەین. کاتی منداڵ درێژ و خاوە و پانتایی هەیە. کاتی پێگەیشتوو بەشێوەیەکی تۆقێنەر خێرا ڕەت دەبێت. بۆیە کات نەمدە بە پەی پێبردنەوە کە ئێمە دەزانین دەشێ بە پێی ئیرادە وەرچەرخێنرێت. ئەمە یەکەمین شتە لە وەستایەتی هونەری کات گرتنەوەدا لێی تێبگەیت. ئەگەر بەشێوەی ئارەزووی دروستبوو بەهۆی کاردانەوە هەستییەکانمان بەرامبەر ڕووداوەکان را لە کات بکات خێراتر بڕوات، لەئەنجامدا ئەمە کە کۆنترۆڵی کاردانەوەی هەستیەکانمان بەرامبەر ڕووداوەکان گرتە دەست ئەوا کات زۆر هێواشتر دەڕوات. ئەمە شێوازە وەرچەرخاوەی مامەڵەکردن لەگەڵ شتەکان درکمان بۆ کاتی ئایندە درێژ دەکات، ئەو ئەگەرتە واڵا دەکات کە ترس و توڕەیی دادەخرێن و ڕێگەی ئەو ئۆقرەمان بۆ خۆش دەکات کە مەرجی بنەڕەتییە هونەری کات گرتنەوەدا.

سێ جۆری کات هەن کە ئێمە دەست و پەنجەیان لەگەڵدا نەرم بکەین. هەریەکەیان کێشەگەلێک دەخەنەڕوو کە دەشێ بە شارەزایەتی و پڕوە چارەسەر بکرێن. یەکەمیان بریتییە لە کاتی درێژ ئەو جۆرە درێژبووەوەی کات کە دەبێ بە ئۆقرە و ڕێنمایی نەرم و نیانەوە بەڕێوە ببرێت. مامەڵەکردنمان لەگەڵ کاتی درێژ دەبێ بەڕۆژی بەرگریکارانە بێت- ئەمە هونەری پێشان نەدانی کاردانەوەی هەڵچووانە و بەپەلەیە و چاوەڕوانکردنی دەرفەتە. پاشان کاتی *زۆرهێنان* هەیە، ئەو کاتە کورت مەودایەی کە ئێمە وەک چەکێکی شەڕانگێزانە دەیقۆزینەوە و کات گرتنەوەی نەیارەکانمان تێکدەدەین. ئینجا کاتی *کۆتایی* هەیە، کاتێک دەبێ پلانێک بە خێرایی و بەهێزەوە جێبەجێ بکرێت. ئێمە چاوەڕێ بووین، ساتەکەمان دۆزییەوە و نابێ ڕاڕا بین.

**وڵته:** هەڵۆ بە تۆقرە و بەشێنەیی بە ئاسماندا دەسوڕێتەوە، بەرز دەفڕێ و بە چاوە تیژەکانی هەموو شتێک دەبینێت، ئەوڵتەی زۆر هۆی هۆشیاریی ئەوەیان نییە کە شوێن پێیان هەڵدەگیرێت لەپڕێکدا، کاتێک ساتەکە دەگات، هەڵۆکە بەسێزی شۆڕ دەبێتەوە، بە خێرایییەک کە هیچ بەرگری ناکرێت. پێش ئەوەی نێچیرەکە بزانێت چی ڕوویداوە، چنگی باڵندەکە هەڵیگرتووە بۆ ئاسمان

**دەسەڵات:** تەوژمێک لە کاروباری مرۆڤەکاندا هەیە کە، ئەگەر سواری بی ، بەرەو سامان و بەختەوەری دەمانبات، ئەگەر بکەویتە ژێری، بەرەو نەگبەتی ئاراستەمان دەکات

جولیەس قەیسەر، ویلیام شەیکسپیەر ١٥٦٤–١٦١٦

## پێچەوانەبوونەوە

هیچ دەسەڵاتێک نییە لەوەدا بەدەست بهێنرێت کە هەوسار وڵ بکەی و لەگەڵ شتێکدا هومەن بگوسجێنیی کە کات دەیهێنێت تا ئاستێک لە ئاستەکان، دەبێ تۆ کات ئاراستە بکەیت ئەگینا دەبیتە قوربانیی بەرەیی پێدا هەاتووەوەی ئەم پێیە پێچەوانەبوونەوەیەک لەم یاسایەدا نییە.

## یاسای ژمارە ٣٦

# ئەو شتانە ڕیسوا بکە کە ناتوانیت هەتبن: فەرامۆشکردنیان باشترین تۆڵەیە

### حوکم

بە گرنگیدان بە کێشەیەکی ناچیزە، تۆ بوون و سەنگی دەدەیتێ. چەندەی سەرنج بخەیتە سەر دوژمنێک، ئەوەندە بەهێزتری دەکەیت و زۆرجار هەڵەیەکی بچووک بەهێزتر و خراپتر دەبێت کاتێک هەوڵ دەدەیت چارەسەری بکەیت. هەندێ جار باشترین شت ئەوەیە شتەکان وەک خۆیان واز لێبهێنیت. ئەگەر شتێک هەبێت تۆ حەزی پێ بکەیت بەڵام نەتوانیت هەتبێت، بە چاوی سووک سەیری بکە. چەندەی بایەخی پێ دەربخەیت، ئەوەندە باڵاتر دیار دەبێت.

### سەرپێچی لە یاساکە

سەرکردەی یاخیی مەکسیکی، پانچۆ ڤیلا وەکو سەرکردەی باندی چەتەکان دەرکەوت، بەڵام پاش هەڵگیرسانی شۆڕش لە مەکسیک لە ساڵی ١٩١٠، ئەو بووە جۆرێک لە پاڵەوانەی خەڵک — شەمەندەفەری تاڵان دەکردن و پارەی دەدایە هەژاران، ڕێبەرایەتی پەلامارە پڕ سەرکێشییەکانی دەکرد و لە ڕاکردنی ڕۆمانسییانەدا ئاسانی بەلای خۆیدا ڕاکێش دەکرد. کردارەکانی دەبوونە مایەی سەرسامکردنی ئەمریکییەکان — پێدەچوو

ئەو پەناوی سەردەمێکی تر ببێت، ئەشکی پڕی خود و ئەشکی دڵی خوان مێب پێش چەند ساڵێکی شەڕی تاڵ، ژەنەراڵ کارانزا وەکو سەرکەوتوویەک لە شەڕێکدا دەرکەوت ڤیلای شکستخواردوو و سەربازەکانی گەڕانەوە ماڵەوە بۆ ویلایەتی (چیهواهو)ی باکوور سوپاکەی بەرەو کری چوو و هاڕێکی تر گەڕایەوە ناو بەندەکە و ریانی مە ماوبانگەکەی گەیاند دواجار، لەوانەیە بەهۆی ناتومێنییەوە بووبێت کە ئەو دەستیکرد بە سەرکۆنەکردنی ئەمریکا، بێگانەکان، کە ئەو لەبەرانبەر گیروگرفتەکانیدا لۆمەی کردن

لە مارسی ١٩١٦دا، پانچۆ ڤیلا هەڵیکوتایە سەر کۆلەمبەس، نیو مەکسیکۆ بە پەلامارەنی سەرانسەری شار، ئەو باندەکەی حەڤدە مەدەنی و سەربازی ئەمریکییان کوشت سەرۆک ویدرۆ ویلسن، کە وەکو زۆرێک لە ئەمریکییەکانی تر سەرسامی ڤیلا بوو، ئێستا دەبووایە باندەکە سزا بدرێت پارێزکارانی ویلسن ئەویان هاندا تا سەربازەکانی بۆ مەکسیکۆ بنێرێت بۆ گرتنی ڤیلا بە بۆچوونی ئەوان، بۆ هێزێکی گەورەی وەک ئەمریکا، لێنەدانی سوپایەک کە خاکەکەی داگیرکردبوو خراپترین ئاماژە بوو سەرباری ئەمەش، زۆرێک لە ئەمریکییەکان ویلسۆنیان وەکو ئاشتیخوازێک دەبینی، پرەنسیپێک کە خەڵک گومانیان لێی هەبوو وەک کاردانەوە بەرانبەر توندوتیژی، دەبوو ئەو بوێری و پیاوەتی خۆی لە ڕێگەی فەرمانکردن بە هێز بسەلمێنێت

فشار لەسەر ویلسۆن بەهێز بوو و پێش ئەوەی مانگەکە تەواو بێت، بە ڕەزامەندی حکومەتی کارانزا، ئەو سوپایەکی دە هەزار سەربەری ڕەوانە کرد بۆ گرتنی پانچۆ ڤیلا سەرکێشییەکە بە گەشتی سزادەر ناودیر کرا و سەرکردەکەی ژەنەراڵ جۆن جەی پێرشینگ بوو کە لە فیلیپین گەریلاکان و لە باشووری خۆرئاوای ئەمریکا، ئەمریکایە ڕەسەنەکانی شکست پێهێنابوو بەدڵنیاییەوە پێرشینگ توانی پانچۆ ڤیلا بدۆزێتەوە و بەسەریدا زاڵ بێت

گەشتی سزادەر بووە چیرۆکێکی هەست ئامێز و چەندەها ڕیپۆرتەر بەدوای پێرشینگ کەوتن ئەوان وینا، کەمپەینەکە سەنتک دەبێت بۆ هێزی ئەمریکا سەربازان دوایی

خۆی چەکیان پێبوو، بە ڕادیۆ پەیوەندییان دەکرد و لە ڕێگەی پشکنینی ئاسمانی پاڵپشتی دەکران

لە یەکەمین مانگەکاندا، سەربازان نائەشنوون بۆ یەکەی بچوک بۆ گەڕان لەناو ناوچە کێوییەکانی ناکووری مەکسیک. ئەمریکییەکان ٥٠,٠٠٠ دۆلاریان خستەڕوو وەك پاداشت بۆ ئەو زانیارییانەی دەبانگەیەنێتە دەستگیرکردنی ڤیلا. بەڵام خەڵکی مەکسیك کە بەرامبەر ڤیلا بەئاگا هاتبوونەوە پاش ئەوەی گەڕابووە ناو نامەدەکە، ئێستا پێی سەرسام بوون لەبەرامبەر ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم سوپا بەهێزەی ئەمریکا. ئەوان دەستیانکرد بە پێدانی زانیاری درۆیە بە پێرشینگ. پێدەچوو باندە زیرەکەکە هەمیشە هەنگاوێك لە پێش سوپای ئەمریکییەوە بێت

بەهاتنی هاوینی ئەو ساڵە، تیمە سەربازییەکە گەیشتبووە ١٢٣,٠٠٠ کەس. ئەوان بەدەست گەرما، مێشوولە و خاکە سەختەکەوە دەیانناڵاند. ئەوان پاش ئەوەی پێیان نابووە ناو نێهاتێکی سەخت کە هەموکە ڕقیان لێ دەبۆوە، کەبەیی بەرامبەر خەڵکی لۆکاڵ و حکومەتی مەکسیکیش هەڵگرت. لە ساتێك لە ساتەکاندا، پانچۆ ڤیلا بە ئەشکەوتێکی شاخدا خۆی شاردەوە بۆ ئەوەی لەو برینی تەقەیە چاك بێتەوە کە لە پێکدادانێکدا لەگەڵ سوپای مەکسیك پێکرا، ئەو ئاگادار بوو کە چۆن پێرشینگ سەرکردایەتی سوپایەکی ئەمریکی بێ‌سنوور لێبڕاو دەکات و بەناو شاخەکاندا دێت و دەچێت و قەت لە ئامادیەکەی نزیك نابێتەوە،

تاوەکو زستان، ڤیلا لە گەمەی مشك و پشیلەکەی خۆی بەردەوام بوو. ئەمریکییەکان وەك شانۆییەکی کۆمیدی سەیری ئەمەیان دەکرد-- لە ڕاستیدا ئەوان ئەوە بەرە سەرسامی ڤیلا بووبەوە، ڕێزیان لە توانەکەی نا لە گومراکردنی هێزێکی ماڵا. لە کانوونی دووەمی ١٩١٧دا، ویلسن بۆ دوجار فەرمانی کشانەوەی پێرشینگی دا. لەکاتێکدا کە سەربازەکان ڕێگەی گەڕانەوەیان بۆ ئەمریکا گرتە بەر، هێزە یاخییەکان شوێنیان کەوتن، سوپای ئەمریکایان ناچار کرد فڕۆکە بەکار بێنێت بۆ پاراستنی پاشەڵی خۆی. تیمە سەربازییە سزادەرەکە خۆی سزا درا-- بە ڕیسواترین شێوە پاشەکشەی کرد

### لێکدانەوە

ویرو ویلسن تیمە سەربازییەکەی (سزادەر) وەک سەربازانی هێرشبەر بەکار هێنا بەر ولەیەکی دادەدلیە پانچو ڤیلا و لە پرۆسەکەدا پەیامی جیهانی دەدا کە کەس، گەورە و بچووک، ناتوانن هێرش بکەنە سەر ئەمریکای بەتوانا و بۆی دەرچن. گەشتی تیمەکە لەماوەی چەند هەفتەیەکدا بەکۆتا دەگەیشت و ڤیلاش بیر دەچووە.

ویلسون دەیتوانی چ شتێک بەجیاوازی ئەنجام بدات؟ ئەو دەیتوانی فشار بخاتە سەر حکومەتی کارانزا بۆ گرتنی ڤیلا بۆ ئەو لەلایەکی ترەوە، لەبەرئەوەی زۆرێک لە مەکسیکییەکان پێش ئەوەی گەشتی سەربازیی سزادەر دەست پێبکات لەدەست ڤیلا بێتاقەت ببوون، ئەو دەیتوانی بەهێمنی کاریان لەگەڵدا بکات و پشتیوانییان بۆ پەلامارێکی بچووکتر بۆ گرتنی پیاوەکە بەدەست بهێنێت. ئەو دەیتوانی لە دیوی سنووری ئەمریکاوە تەڵەیەک ڕێکبخات و پێشبینیی هێرشەکە بکات یان دەیتوانی تەواوی بابەتەکە بۆ ئەو کاتە پشتگوێ بخات و چاوەڕوانی مەکسیکییەکان بێت خۆیان بەشێوەی خۆیان مامەڵە لەگەڵ ڤیلادا بکەن.

بیرت بێت: تۆ خۆت بڕیار دەدەیت شتەکان بێزارت بکەن. تۆ تەنیا دەتوانیت ئەنقەستی هێرشکەری هەراسانکەر پشتگوێ بخەیت، بابەتەکە بە بچووک و ناشایستەی دیبێ و سەرنجت لەقەڵەم بدەیت. ئەمە هەنگاوە بەهێزەکەیە. ئەوەی کە تۆ بەرجەکرداری بەرامبەر پیشان دەدەیت، دەتوانێت لە دەرگیربوونێکی بێ کەڵکدا ڕاتکێشێتە خوارەوە. باشترین وەڵام کە تۆ بتوانیت بیدەیتە مێشولەیەکی هەراسانکەر ئەوەیە لە ڕێگەی هەڵوەشکردنەوەی خۆیەوە تاریکی بکەیت. ئەگەر ئەستەم بێت فەرامۆش بکەیت (پانچو ڤیلا بە [illegible] هەڵای ئەمریکی کوشتبوون)، ئەو بە نهێنی بیلانگێڕی بکە بۆ خۆفەوتاندنی [illegible] بەڵام هەرگیز سەرنج بەلای ئەو مێشولە هەراسانکەرەدا ڕامەکێشە کە خۆی [illegible] ئەگەر [illegible] لە دەرگیربوونێکی وەهادا [illegible]

ریسواکردنی نەکەیت و پشت نەکەیتە ئەو شتەی کە ناتوانیت لە سووریەوەدادا ریایەت پێی نەکەیەیت

*ئەمیا مبر ئەکەرەوە- ١٢ ملیۆن دۆلار مێچووی حکومەتەکەی تۆیە تا من نەگریت من بە شاهە گردایە رەلەکاندا بریمی هەمدێ هار بۆ پەنجا مالێی رێگە تاوبان پێی نەبوو. تەوان هەموبان مەبوو حکە لە هۆز و منێشتروله و هیچ شتێک بەدەست نەهات*

پاسچل لیلا، ١٨٧٨–١٩٢٣

## پەیرەوی لە یاسلکە

لە سالی ١٥٢٧دا، پاشا هێنری هەشتەمی ئینگلتەرە بڕیاری ئەوەیدا کە دەبێ رێگەیەک بدۆزێتەوە بۆ قوتاربوون لە ژنەکەی، کاسرینی ئەراگۆن. کاسرین نەیتوانیبوو کوڕێک، میراتگرێکی نێرینە بێنێتە دنیاوە کە بەردەوامی بەماڵەکە مسۆگەر بکات و هێنری پێی رابوو دەرازێ بۆچی. ئەو لە کتێبی پیرۆزدا پارچەکەی خوێندبووە: "ئەگەر پیاوێک ژنی براکەی هەڵبگرێت، شتێکی ناپاکە. ئەو رووتی براکەی دەرخستووە. ئەوان بێ منداڵ دەبن" پێش هاوسەرگیری لەگەڵ هێنری، کاسرین هاوسەرگیری لەگەڵ براگەورەکەی کردبوو، ئارسەر، بەڵام ئارسەر پێنج مانگ دوای مردبوو. هێنری چاوەڕێی کاتێکی گونجاو بوو، پاشان هاوسەرگیری لەگەڵ بێوەژنەکەی برکەی کردبوو

کاسرین کچی پاشا فێردیناند و شاژنە ئیزابێلای ئیسپانیا بوو و بە هاوسەرگیری کردن لەگەڵ هێنری هاوپەیمانێتیی بەنرخی رسدوو هێشتبووەوە. ئێستا، دەبووایە کاسرین ئەو دڵنیا بکاتەوە لەوەی هاوسەرێتییە کورتخایەنەکەی لەگەڵ ئارسەر هەرگیز تەواو نەبووە. ئەگینا هێنری پەیوەندییەکەیانی بە مەحرەم و هاوسەرگیرییەکەیانی بە بەتاڵ لەقەڵەم دەدا. کاسرین سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لە رێگەی هاوسەرێتییەکەی لەگەڵ ئارسەردا بە پاکیزەیی ماوەتەوە کە ئەو بەیدەکرد ئەگەر بە مەحرەم بەقەڵەمی ندابە. لەگەڵ ئەوەشدا پاش ساڵانێکی هاوسەرێتی لەگەڵ هێنری، کاسرین نەیتوانیبوو کوڕێ بەرهەم

بیبێت و لە سەرەتاکانی ١٥٢٠دا کەوتبووە حاڵەتی بێ خوێنییەوە. بەڵام پاشاوە ئەمە بەتیا بە مانای یەك شت بوو، ئەو لەبارەی پاکرەییەکەیەوە درۆی کردبوو، یەکگرتنەکەیان مەحروم بوو و خودا سزای دابوون.

هۆکارێکی تریش هەبوو کە بۆچی هێنری دەیویست لە کاسرین قوتار ببێت. ئەو کەوتبووە داوی خۆشەویستی ژنێکی گەنجتر، ئان بولین. بەك بەتیا خۆشی دەویست، بەڵکو ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ بکردایە ئەوا منداڵی دەبوو، ئەمەی هیوای ئەوەی هەبوو کوڕێکی شەرعی بخاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هاوسەرگیری لەگەڵ کاسرین دەبووایە هەڵوەشێنێتەوە. لەبەر ئەمە، هێنری دەبووایە داوا لە قاتیکان بکات. بەڵام پاپا کلیمێنت بەت هاوسەرێتییەکەی هەڵنەوەشاندەوە.

بەهاتنی هاوینی ١٥٢٧، دەنگۆ بە سەراسەری ئەوروپادا بڵاو بووبەوە کە هێنری هەوڵێك هەوڵی بەدەست دەدات - هاوسەرگیرییەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە ئەگەرچی پاپا کلیمێنتیش ڕازی نەبێت. کاسرین قەت ڕازی نەدەبوو، چ جای ئەوەی خوبەخشانە بچێتە کەنیسە، هەروەك ە هێنری هایدابوو. بەڵام هێنری ستراتیژی خوی هەبوو. ئەو چیتر لەگەڵ کاسرین لەناو جێگەدا نەدەخەوت، چونکە ئەو ئەمی بە ژن خوشك لەقەڵەم دەدا نەك ژنی بەسایی خۆی. ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی مێرەکەی خوی بە بێوەژنی وەبیرە ئینێڵەکەی وەکو بێوەژنی ئارسەر، لەقەڵەم بدات. لە کۆتاییدا، لە ١٥٣١، ئەوی لە دەربار دوور خستەوە و بۆ قەڵایەکی دوور گواستیەوە. هێنری هەڕەشەکانی پاپای فەراموش کرد و نەك هەر ئەمە، بەڵکو سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هاوسەرێتییەکەی لەگەڵ کاسرین هەڵوەشێندوتەوە و لە ١٥٣٣دا هاوسەرگیری لەگەڵ ئان بولین کرد.

کاسرینیش هەستی بە ئازاری ڕسواکردنەکەی هێنری کرد. ئەو هەوڵیدا بەرەنگاری بکات، بەڵام لەبەرامبەر هێزدا هیچی بێ نەکرا بەرووبێ خەڵکی تریش گوێی لەم شتە کەڕ کرد. کاسرین کە لە دەربار دابڕا، لەلایەن پاشاوە فەراموش کرا و بێوەڵبو بوو بە نائومێدی و نورەبی، بەبێنا بەبێنا دوخی تێچکوو و دواجار لە شوباتی ١٥٣٦دا بە زەرەمێکی شێرپەنجەیی لەسەر دڵی مرد.

**لێکدانەوە**

کاتێک تۆ نابەرد بە کەسێک دەدەیت، ئەو بووەتانی دەستە هاوەڵ، هەریەکەتان بەرەو گرتن و پەرچەکرداری ئەویتر هەنگاو دەنێن. لە پرۆسەکەدا تۆ دەستپێشخەریی خۆت لەدەست دەدەیت. ئەمە داینامیکی هەموو کارلێکەکانە بە پێرانیی حەڵکی تر، ئەگەرچی تەنیا شەڕیان لەگەڵ بکەیت، ئەوا بە ڕووی کاریگەرییەکەیاندا دەکرێیتەوە. ئەگەر هێنری لەگەڵ کاسرینی ململانێی بکردایە ئەوا لەناو مشتومڕی بێ کۆتاییدا دەچەقی کە مکوڕییەکەی لەق دەکرد و دواجار بڕستی لەبەر دەبڕا (کاسرین بەهێز و توکمە بوو). ئەگەر ئەو بڕیارە بدابایەتە سەر ڕاڕیکردنی کلێمێنت بۆ گۆڕینی فەرمانەکەی لەمەڕ ڕەوایەتیی هاوسەرگیرییەکە، یان هەوڵی بدایە سازش و دۆستایەتی لەگەڵ بکات، ئەوا لە تاکتیکە بێحوارەکەی کلێمێنتدا گیر دەبوو. یاریکردن بۆ کات، بەڵێندانی کشۆکی و نەرمی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی دەکرد کە پاپا دەیویست - شێوازی ئەوان.

هێنری هیچ کام لەمانەی نەبوو. ئەو گەمەیکی هێزی کارلێکەری ئەنجامدا - ڕێسوایییەکی سەراپاگیر. بە فەرامۆشکردنی هەڵک تۆ کاریگەرییەکەیان کەم دەکەیتەوە. ئەمە ناجێگیر و تووڕەیان دەکات - بەڵام لەبەرئەوەی ئەوان هیچ مامەڵەیان لەگەڵ توودا نییە، هیچ نییە بتوانن بیکەن.

ئەمە دیوی توندی یاسایە. یاریکردن بە کارتی ڕیسواکاری زۆر بەهێزە، چونکە ئەمە ڕێگەت بۆ خۆش دەکات تا بڕیار لە مەلومەرجی ململانێکە بدەیت. تۆ پاشایت و تۆ ئەو شتە فەرامۆش دەکەیت کە بێبەدارت دەکات. تەماشای ئەوە بکە کە چۆن ئەم تاکتیکە هەڵکی پەست دەکات - بیرەی ئەوەی کە دەبێکەن بۆ ڕاکێشانی سەرنجە و کاتێک تۆ لێیان دەگریتەوە، لە هەراسانوودا ململانێ دەکەن.

*پیاو تیبی هەڵدە - ئەو لێت دەبوورێت. هەرایی بۆ بکە - لەوانەیە و لەوانە نییە دەرکت پێ بکات، بەڵام فەرامۆشی بکە ڕقی لێت دەبێت.*

ئیدریس شا، کاروانی خەونەکان، ١٩٦٨

## کلیلی دەسەڵات

زۆرجار ئارەزوو کاریگەریی ناکۆک ئامێز دروست دەکات. چەندەی زۆر شتێکت بوێت، ئەوەندە زۆرتر بەدوایدا وێڵ دەبیت، ئەوەندەش زۆرتر خۆت لێ لادەدات. چەندەی نیەحی بۆ پیشان بدەیت، ئەوەندە بەرەنگاری دەکات. هۆکارەکەش ئەوەیە کە بابەخدانەکەت زۆر بەهێزە- ئەمە خەڵک نامۆ دەکات و تەنانەت دەترسێنێت. ئارەزووی کۆنترۆڵ نەکراو لاوازت ناشایستە و جێ بەرەیی دەردەخات.

دەبێ پشتت بکەیتە ئەو شتەی دەتەوێ، پیسوایی و سوکیبی خۆتی بۆ پیشان بدەیت. ئەمە ئەو جۆرە کاردانەوە بەهێزەیە کە ئامانجەکانت شێتگیر دەکات. ئەوان بە ئارەزووی خۆیانەوە وەڵامگۆ دەبن، کە هەبووی کاریگەرییە لەسەر تۆ- لەوانەیە بۆئەوە بێت ببنە خاوەنت، یان لەوانەیە بۆ ئەوە بێت ئازارت بدەن. ئەگەر ئەوان بیانەوێ ببنە خاوەنت، ئەوا تۆ بە سەرکەوتوویی یەکەمین هەنگاوی فریودانت تەواو کردووە. ئەگەر ئەوان بیانەوێ ئازارت بدەن، ئەوا تۆ ناجێگیرت کردوون و وەهات لێکردوون بە ڕێساکانی تۆ یاری بکەن.

پیسواکردن مافی پاشایە. بۆ هەر کوییەک چاوەکانی بسوڕێن، ئەوەی کە بڕیار دەدات ببینێت، ئەوەیە کە واقیعییە. ئەوەی کە فەرامۆشی دەکات و پشتی تێدەکات ئەوەندەی مردوو باشە. ئەمە ئەو چەکە بوو کە پاشا لویسی شازدە بەکاریهێنا- ئەگەر ئەو کەیفی بە تۆ نەهاتبایە، وەها ڕەفتاری دەکرد کە تۆ لەوێ نیت، بالابەتی خۆی لە ڕێگەی بڕینی دایناميکی کارێک بەرقەرار دەکرد. ئەمە ئەو هێزەیە کە تۆ هەتە کاتێک یاری بە کارتی پیسواکردن دەکەیت، ناوبەناو پیشانی خەڵکی دەدەیت کە تۆ دەتووانیت بەبێ ئەوی بەڕێوە بچیت.

ئەگەر بڕیاردانی فەرامۆشکردنی دەسەڵاتەکەت زیاد بکات، ئەوان سەرەنجام ئاراستەگیرییە پێچەوانەکە- پابەندی و دەرگیرەوی- زۆرجار لازارت دەکەن بە بابەخدانێکی بێ ڕادە بە بوژمنی بچوک، ئەوا بچوک دەردەکەویت و چەندەی کات

دەبێت تا ئەم دوژمنە تێکشکێنی ئەوەندە دوژمنەکەت گەورەتر دیار دەبێت. کاتێک ئەسینایەکان لە ٤١٥ی پێش زاییندا بڕیاریاندا سەرگرتنی دوورگەی سیسیلی، هێزێکی زەبەلاح هێرشی دەکردە سەر هێزێکی بچووک. لەگەڵ ئەوەشدا بە گێژدەکردنی ئەسینایەکان لە ململانێیەکی درێژخایەن، سیراکوس، گرنگترین دەوڵەتشاری سیسیلی تووڵی لە شان و شەوکەت و بڕوابەخۆبوونیدا گەورە دەبێت. دواجار بە شکستی پێهێنانی ئەسینایەکان، بۆ ماوەی چەندین سەدەی دواتر خۆی بەناوبانگ کرد. لەکاتێکی دواتردا، سەرۆک جۆن ئێف کەنەدی هەڵەیەکی هاوشێوەی لە تێپەڕاندن، بۆ فیدل کاسترۆی کوبا ئەنجامدا. داگیرکردنە شکستخواردووەکەی لە کەنداوی بەرازەکاندا لە ١٩٦١، وەهای لە کاسترۆ کرد ببێتە پاڵەوانێکی نێودەوڵەتی.

مەترسی دووەم: ئەگەر تۆ سەرکەوتوو بوویت لە ڕووخاندنی هەراسانکەرەکەت، یان ئەوەت ئەگەر تەنیا بریندارت کرد، ئەوا هاوسۆزی بۆ لایەنە لاوازترەکە دروست دەکەیت. ڕەخنەگرانی فرانکلین دی ڕۆزڤێلت بە داخ لەدڵییەوە سکاڵایان لەبارەی ئەو پارەیە کرد کە ئیدارەکەی لە پڕۆژەکانی حکومەت خەرجی کرد، بەڵام هێرشەکانیان بەدڵی خەڵک نەبوو کە پێیان وابوو سەرۆک کار بۆ کۆتاییهاتنی بە داتەپینی گەورەی ئابووری دەکات. بەیارەکانی ئەو پێیان وابوو ئەوان نموونەیەکیان هەیە کە پیشانی دەدات چەنێک بووەتە بەفیڕۆدەر: سەگەکەی، فالا، کە پارە و خەرجییەکی زۆری بۆ تەرخان کردبوو. ڕەخنەگران هەستیارییان تەواو کردە ئامانج— خەرجکردنی پارەی باجدەران لە سەگێک لەکاتێکدا، کە زۆرێک لە ئەمریکییەکان هێشتا لە هەژاریدا دەژیان. بەڵام ڕۆزڤێلت وەڵامێکی هەبوو: ڕەخنەگرەکانی چۆن جورئەت دەکەن هێرش بکەنە سەر سەگێکی بچکۆلە کە ناتوانێ بەرگری بکات؟

وتارەکەی ئەو لە بەرگریکردن لە فالا یەکێک بوو لە وتارە هەرە سەرکەوتووەکانی. لەم حاڵەتەدا، ئەو لایەنە لاوازەی کە دەرگیر بوو، سەگەکەی سەرۆک بوو و هێرشەکە کاردانەوەی لێ کەوتەوە— لە دووڕمەوتا دا، ئەمە سەرۆکی هاوسۆزتر کرد، چونکە زۆرێک

له‌ خه‌ڵکی به‌شێوه‌یه‌کی سروشتی له‌گه‌ڵ "لوریانی"دان، هه‌روه‌ها چۆن خه‌ڵکی ئه‌مریکا بوونه‌ هاوسۆزی لیئرا و ویره‌گه‌که‌، به‌ڵام ژماره‌یان له‌ په‌نجا قیلا زۆرتر بوو

له‌بری ئه‌وه‌ی به‌ ڕێکه‌وت ئه‌رکێر بخه‌یته‌ سه‌ر کێشه‌یه‌ك به‌وه‌ی که‌ ڕایبێنیکه‌یت له‌ ڕێگه‌ی بڵاوکردنه‌وه‌ی ئه‌مه‌ی که‌ چه‌نێك مایه‌ی خه‌م و نیگه‌رانینه‌، خراپتر ده‌ر ده‌بێت، زۆرجار ژیرانه‌تر ئه‌وه‌یه‌ که‌ ڕۆڵی ئه‌ریستۆکراته‌ سوکبینه‌که‌ ببینیت، نه‌ك ئه‌وه‌ی دان به‌ قورسایی کێشه‌که‌دا بنێیت

بیرت بێت: کاردانه‌وه‌ به‌هێزه‌کان به‌رابه‌ر ڕه‌خنه‌، هه‌رلسانکردنه‌ ناچیزه‌کان ڕیسوایی به‌دواوه‌یه‌. قه‌ت وه‌ها پیشان مه‌ده‌ که‌ شتێك کارت تێده‌کات، یان تۆ بریندار بوویت - ئه‌مه‌ ته‌نیا پیشانی ده‌دات که‌ تۆ دانت به‌کێشه‌که‌دا ناوه‌. ڕیسوایی ژه‌مێکه‌ که‌ ئه‌گه‌ر سارد و بێ سۆز بێت به‌ باشترین شێوه‌ پێشکه‌ش ده‌کرێت

وێنه‌: برینه‌ بچوکه‌که‌. زۆر بچوك به‌ڵام ئازاربه‌خش و هه‌راسانکه‌ره‌، تۆ هه‌موو جۆره‌ ده‌رمانێك به‌کار دێنیت، سکاڵا ده‌که‌یت، ده‌یخورێنیت و قه‌تماغه‌که‌ هه‌ڵده‌که‌نیت. دکتۆره‌کان خراپتری ده‌که‌ن، برینه‌ بچوکه‌که‌ ده‌که‌نه‌ مه‌سه‌له‌کی زۆر گه‌وره‌. ئه‌گه‌ر تۆ وازت له‌ برینه‌که‌ بهێنایه‌ و لێتگه‌ڕابتایه‌ تا کات چاکی بکاته‌وه‌ و خۆت له‌ نیگه‌رانی ده‌رباز بکه‌یت، وه‌ها نه‌ده‌بوو.

ده‌سه‌ڵات: بزانه‌ چۆن یاری به‌ کارتی ڕیسواکردن ده‌که‌یت. ئه‌مه‌ سیاسیترین جۆری تۆڵه‌یه‌. چونکه‌ زۆر که‌س که‌ ده‌بووایه‌ هیچیان له‌باره‌وه‌ نه‌زانین ئه‌گه‌ر نه‌یاره‌ به‌ربه‌سته‌کانیان به‌دییان نه‌کردایه‌. هیچ تۆڵه‌یه‌ك وه‌کو بێ هه‌ستی و ساردوسڕی نییه‌، چونکه‌ ئه‌مه‌ له‌گۆڕنانی ناشایسته‌یه‌ له‌ تۆڕی پوچێتی خۆیدا

(بالتاسار گراسیه‌ن، ١٦٠١–١٦٥٨)

## پێچه‌وانه‌بوونه‌وه‌

ده‌بێ تۆ به‌ ئاسکی و به‌ وریاییه‌وه‌ یاری به‌ کارتی ڕیسواکردن بکه‌یت، زۆربه‌ی کێبڕکێکه‌ره‌ بچوکه‌کان حه‌زیان نامێنێ ئه‌گه‌ر تۆ لێیانگه‌ڕێیت. به‌ڵام هه‌ندێکیان گه‌شه‌

دەکەن ویلّو دەبنەوە ئەگەر تۆ گرنگییان پێ بدەیت. کەسێکی ئاست نزم فەرامۆش بکە و کاتێکی زیاتر دەبینیت کە بووەتە رکابەرێکی جدی و ریسواکردنەکەت بۆی، تۆڵەشی لا دروست کردووە. مێژە گەورەکانی رێنیسانسی ئیتالیا، بڕیاریاندا لەبەر هۆرگیا لە سەرەوبەندی پیشەکەیدا. وەک زەنەرالی کەمێ لە سوپاکەی باوکیدا، پاپا ئەلێکساندەری شەشەم، فەرامۆش بکەن. بە هاتنی ئەو کاتەی کە ئەوان مایەخ و سەرنجیاندا زۆر درەنگ بوو. فەرەنەکە ئێستا شێرێک بوو، پارچە پارچە ئیتالیای دەخوارد. زۆرجار کاتێک تۆ بە ئاشکرا ریسوایی پیشان دەدەیت ئەوا بەهەمان شێوە پێویستە بە نهێنی چوێکت لەسەر کێشەکە بێت، چاودێری دۆخەکەی بکەیت و دڵنیا بیتەوە ئەوەی نامێنێ، مەهێڵە ببێتە هاتەیەکی شێرپەنجەیی.

شەرمزایەتی هەستکردن بە کێشەکان پەیدا بکە کاتێک ئەوان هێشتا بچوکن و گرنگیان پێدە پێش ئەوەی ببنە رەبەلاحێک. فێر بە جیاوازیی بکەیت لەنێوان کارەساتێکی لەلایەکەوە و هەراسانکەری بچوک لەلایەکی ترەوە کە جۆبەجێ و بە بێدەنگی لەنێو دەچێت. لە هەر حاڵەتێکیشدا بێت، قەت بەتەواوی چاوی لەسەر لا مەبە. تا ئەو جێیەی کە ریشووە دەتوانێت بگەشێتەوە و بێتەوە ناو ژیان.

# یاسای ژمارە ٣٧

# نمایشی کاریگەر دروست بکە

### جوکە

*وێنەی کاریگەر و ئاماژە ڕەمزییە مەزنەکان پرشنگی دەسەڵات دروست دەکەن- هەمووان وەڵامگۆ دەبن بەرانبەری. نمایش گەلێک بۆ ئەوانەی دەوروبەرت دەکەر بخە کە پڕ بن لە دیمەن و ڕەمزی کاریگەر کە ئامادەییت بەرز دەکاتەوە. بەهۆی کارتێکران بە ڕواڵەتەکان، کەس تێبینی ئەوە ناکات کە بە ڕاستی هەریکی چیت*

### پەیڕەوی لە یاسلکە

لە سەرەتاکانی ١٧٨٠کاندا، دەنگۆی کرداری پزیشکی سەیر و نامۆی دکتۆر وەیسمیدەر لە بەرلین بڵاو بووە. ئەو بەرهووەکەی لە هۆڵێکی بزە هیبەجێ کرد کە لە دەرەوەیەوە بەرلینییەکان ڕیزی درێژی هەڵکیان تێبینی کرد- کوێر، شەل و هەر کەسێک کە نەخۆشی چارەسەرنەکراوی بە دەرمانی ئاسایی، هەبوو. کاتێک هەواڵی ئەوە درەی کرد کە دکتۆر بە حستنەبەر میشکی مانگ، نەخۆشەکە چارەسەر دەکات، بەرووبی ناوی وەک دکتۆری مانگی بەرلین ناوی دەرکرد.

لە کاتێکی ١٧٨٣دا، ڕاپۆرتی ئەوە گەیشت کە دکتۆر وەیسلێدەر ژنێکی چارەسەرکردووە کە نەخۆشی قورسی هەبووە. ئەو نەپڕێکدا بووە نەستبرەیەک. پێشتر

ئەمما بەرلیبییە هەژارەکان بە جلە شڕەکانیانەوە دەبینران کە ڕێیان دەبەست بۆ سەردانی دکتۆر، ئێستا خەڵکی ڕاقی بە ئەسپ و عەرەبانە نایابەکانیانەوە دەهاتن و هێنتڵمان و خانمان بە پۆشاکی جوانەوە دەبینران. تەنانەت مەحزفی حاڵەتی مولد هەر بۆ ڕامین دەهاتن بۆ دیداری دکتۆرەکە. زۆرێکیان دەیانوت لەسەر ڕێنمایی ئەو هەموکە خۆیان دووەتە بەر تیشکی مانگ. تەنانەت ئەوانەش کە هەستیان دەکرد چاک بوونەتەوە دەهاتنەوە و دیار بوو کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەو ئەزموونە بەهێزە.

هەر کە دەگەیشتنە قاتی سەرەوە، ڕیزی خەڵکەکە بە نوور ئاراستەدا دەڕۆیشتن، بەرەو باکووری ژوورەکە بۆ لای دکتۆر، ئەوانەی بۆ لای باشووریش دەچوونە لای ژنەکەی کە تەنیا ئێشی لەسەر ژنان دەکرد. لەکۆتاییدا، پاش چەند سەعاتێک لە چاوەڕوانی لە ڕیزەکەدا، نەخۆشە بەڕێزەکان بەرەو لای خودی دکتۆرە سەرسوڕهێنەرەکە ئاراستە دەکران، پیاوێکی بەتەمەن بە چەند موویەکی سپی و وزەیەکی دەمارگیرانەوە. ئەو نەخۆشەکەی دەبرد، ڕووبەڕووی تورشبووی جەستەی دەردەهست و بۆ لای پەنجەرەکە بەرێی دەکردەوە کە ڕووی لە ڕووناکایی مانگ بوو. ئەو بەدەم کارەکەوە ورتە ورتێکی دەکرد کە کەس لێی تێنەدەگەیشت و پاشان، دوای وەرگرتنی حەقدەستەکەی، نەخۆشەکەی دەنارده ماڵەوە. لەهەمان کاتدا، لەژووری لای باشوور، ژنی دکتۆر هەمان شتی لەگەڵ خانمەکاندا دەکرد– کە بە ڕاستی سەیر بوو، چونکە باشترین مانگ لەیەک کاتدا لەدوو لاوە دەرکەوێت، بەدەرپێچێکی تر مەدەکرا دیار بێت و بەڵام ڕەمزی مانگ بەس بوو، چونکە خانمەکان سکاڵایان نەدەکرد و دوایی بە دڵنیاییەوە باسی ئەوەیان دەکرد کە ژنی دکتۆریش مانگ هەمان هێزی چارەسەرکەری مێردەکەی هەیە

## لێکدانەوە

لەوانەیە دکتۆر وەیسلێندەر هیچی لەبارەی پزیشکییەوە نەزانیبێت، بەڵام ئەو لە سروشتی مرۆڤ تێدەگەیشت. ئەو زانی خەڵک هەمیشە قسە، یان ڕووبەڕووکردنەوەی ئەقڵانی یان پیشاندانەکانی هێزی زانستیان ناوێت. ئەوان کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان دەوێت

لەسەر هەستەکانیان، ئەمەیان بەمرێ و بەشەکەی تری خۆیان دەبکەن– بۆ نموونە وێناکردنی ئەوەی کە دەتوانن لەبەر ڕووناکیی پارچە بەردێك کە ملیۆنان مایل دوورە چاك ببنەوە. دکتۆر رەیسلیدەر پێویستی بە حەب یان مجارەرەی درێژ نەبوو لەبارەی هێزی مانگ، یان هێزی پوچی ئامرازێك بۆ گەورەکردنی نیشکەکان. ئەو تێگەیشت کە چەندەی نمایشەکە بچوکتر بێت باشترە– تەنیا ئەو ڕوناکییەی مانگ کە لەلایەکەوە بڵاو دەبووەوە جار ڕاستەوخۆ بووایە یان نا، بەس بوو. هەر کاریگەرییەکی ڕێدکراو بۆی دەبووە مایەی دروستبوونی گومان لەمەڕ کاریگەری بەهێزی مانگ بەتەنیا. مانگیش مایی پێویست بەهێز بوو– ئەمە موگناتیسی ئەتتارنیاکان بوو، وەك چۆن بەدرێژایی مێژوو وەها بووە. تەنیا بە ڕایەلکردنی خۆی بە وێنەی مانگەوە، دکتۆر دەسەڵاتی بەدەستهێنا

بیرت بێت: گەڕلت بەدوای دەسەڵاتدا بەندە بە قەدیرەکانەوە. دەبێت تۆ هەمیشە گومانەکانی خەڵك، ئارەزوویان ڕۆژیان بۆ بەرەنگاریکردنی ئیرادەت، تێپەڕێنێت. وێنەکان قەدیری ئەواو کاریگەرن. وێنەکان تا ڕادەیەکی زۆر قەدیری کاریگەرن: ئەقڵ کە شوێنی گومان و بەرەنگارییە دەبڕن و ڕاستەوخۆ دەچنە دڵەوە. ئەمە چاوەکان سەرسام دەکەن، پەیوەندیی بەهێز دروست دەکەن، خەڵکی پێکەوە کۆ دەکەنەوە و هەستیان دەبزوێنن. کاتێك ڕووناکیی سپی مانگ لە چاوەکانیاندایە، ئامانجەکانت بەرامبەر فریوەکانی پرارەی تۆ کوێرن.

## کلیلی دەسەڵات

بەکارهێنانی وشە بۆ گەیاندنی کەیسەکەت، کارێکی مەترسیدارە: وشەکان ئامرازی مەترسیدارن و زۆرجار بەلاڕێدا دەچن. ئەو قسانەی خەڵکی بەکاریدەهێنن بۆ ڕازیکردنمان، تەقریبەن بانگهێشتمان دەکەن بۆ ئەوەی بە وشەکانی خۆمان لێیانەوە ڕابمێنین. ئێمە تێیانڕادەمێنین و زۆرجار دەگەینە باوەڕهێنان بە پێچەوانەکەی. (ئەمە بەشێکە لە سروشتمان) هەروەها ڕێدەکەوێت کە وشەکان بریندارمان بکەن، ئاماژەگەلێك بورووژێنن کە قسەکەر مەبەستی نەبووە.

لەلایەکی ترەوە، ئەو شتەی کە بیمراوە، قسەکان دادەپۆشێت. وێنە کاریگەرییەکی هەستی دادەنێت کە هیچ کەلێنێک بۆ نیگەرانی و گومان ناهێڵێتەوە. وەکو مۆسیقا، بەسەر بیرکردنەوە ئەقڵانی و لۆژیکییەکاندا بەرز دەبێتەوە. وێنای دکتۆری مانگ بکە کە هەوڵیدا کرداره پزیشکییەکەی بسەلمێنێت، هەوڵیدا خەڵکی ئاسایی بە هێزە سارێژکەرەکانی مانگ و هەروەها لەبارەی پەیوەندیی تایبەتی خۆی بە پارچە بەردێکی دوور لە زەوییەوە قەناعەت پێ بێنێت. خۆشبەختانە، ئەو توانی مەبەستێکی سەرسامکەر بێنێتە کایە کە وشەکانی ناپێویست دەکرد. ئەو ساتەی کە نەخۆشەکانی چوونە هۆڵی بیرە، وێنەی مانگ بایی پێویست بە ڕەوانی دەدوا.

بەکارهێنانی ڕەمزەکانیش بەهەمان شێوە کاریگەری هەیە، چونکە ئەمانە زۆرجار نەرمتر لە وشە ڕەقەکان. پزیشکی دەروونی، دکتۆر میلتن ئەریکسن هەمیشە هەوڵیدا ئەو ڕەمز و وێنانە بدۆزێتەوە کە پەیوەندی لەگەڵ نەخۆشدا دروست دەکەن بە شێوازگەلێک کە وشەکان ناتوانن ئەمە بکەن. لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵ نەخۆشێک کە حاڵەتەکەی توندە، ئەو ڕاستەوخۆ پرسیاری لێنەدەکرد بەڵکو لەبارەی شتێکی ناپەیوەندیدارەوە قسەی دەکرد، بۆ نموونە لێخوڕینی سەیارە بەناو بیابانی ئەریزۆنا کە خۆی لەوێ لە ١٩٥٠ەکاندا موومارسی بوو. لە وەسفکردنی ئەمەدا دواجار ئەو دەگەیشتە سەر ڕەمزێکی گونجاو بۆ ئەو شتەی کە ئەو پێی وابوو کێشەی نەخۆشەکەیە. ئەگەر هەستی بکردایە نەخۆشەکە گۆشەگیرە، دکتۆر ئەریکسن باسی تاکە درەختێکی (ئایرۆنوود)ی سەحرای دەکرد و ئەمەی کە چۆن گۆشەگیرییەکەی وایلێکردووە بەهێزی باوە شەپرێو ببێت. بە دروستکردنی پەیوەندییەکی هەستی لەگەڵ درەختدا وەک ڕەمز، نەخۆشەکە ئامادەتر بە ڕووی پشکنینی دکتۆردا دەکرایەوە.

هێزی ڕەمزەکان وەک ڕێگەیەک بۆ ساردان، پەیوەندیکردن و یەکخستنی سەربازەکان یان تیمێک بەکار بێنە. لەماوەی یاخیبوونیدا بەدژی تاجی فەرەنسی لە ١٦٨٤دا، ئەوانەی بەرابەر پاشا وەفادار بوون، یاخیبووەکانیان لەرێگەی بەراوردکردنیان بە داربوولک (کە منداڵ بۆ هاویشتنی بەرد بەکاریاندەهێنا) بچووک کردەوە. کاردینال دی ڕێتز بڕیاریدا ئەم

زاراوەیەی بچوك کردنەوە بگۆڕێ بۆ ڕەمزی یاخیبووەکان، ڕاپەڕینەکە ئێستا بە داربولك ناسرابوو و یاخیبووەکان داربولك بەدەست بوون، ئەوان دەستیانکرد بە دنانی شێوەی داربولك لەناو کڵاوەکانیاندا کە و وشەکە بووە هوتافیان، بەبێ ئەمە ئەوانەبوو یاخیبووەکان بەرەبەرە لاواز دەبوون، هەمیشە ڕەمزێك بدۆزەرەوە کە نوێنەرایەتی تۆرەکەت بکات — چەندەی ڕایەڵەکانی ئەو ڕەمزە هەستیتر بن، باشترە

تێبگە، وشەکان دەتخەنە حاڵەتی بەرگرییەوە، ئەگەر پێویست بکات خۆت ڕوون بکەیتەوە ئەوا هەرکە دەسەڵاتەکەت لەژێر پرسیاردایە. کەچی وێنە، وەکو پێدراوێك، خۆی دەسەپێنێت، ئەمە پرسیار دەڕەوێنێتەوە، دەستبەجێ پەیوەندی دروست دەکات و ڕایەڵەکانت وەها بەهێز دەکات کە چینە سەروو ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەوە. وشەکان مشتومڕ و ناکۆکی دەورووژێنن، وێنەکان خەڵکی پێکەوە کۆ دەکەنەوە، ئەمانە ئامرازی جەوهەریین بۆ دەسەڵات

**وێنە:** خاچ و خۆر، خاچ و تیشکدانەوەی سەراپاگیر، هەر کە یەکێکیان بەسەر ئەویتریاندا دەسەپێنرێت، واقیعێکی نوێ فۆرمولە دەبێت — دەسەڵاتێکی نوێ سەرهەڵدەدات، ڕەمز — هیچی تر پێویست نابێت.

**دەسەڵات:** خەڵکی هەمیشە کارتێکراو دەبن بە ڕواڵەتی ساختەی شتەکان، دەبێ میر لە کاتە گونجاوەکانی ساڵدا هەوڵ بدات خەڵکی لە ڕێگەی نمایشەکانەوە بە سەرقاڵی و هۆش پەرشبوو بهێڵێتەوە.

(نیکۆلۆ ماکیاڤیللی، ١٤٦٩–١٥٢٧)

## پێچەوانەبوونەوە

هیچ دەسەڵاتێك لە ڕێگەی فەرامۆشکردنی وێنەکان و ڕەمزەکان دەستەبەر نابێت ئەم یاسایە پێچەوانەبوونەوەی نییە.

## یاسای ژماره ٢٨

# چۆنت دەوێ وەها بیر بکەرەوە، بەڵام وەکو ئەوانیتر ڕەفتار بکە

### دوکە

*ئەگەر تۆ نمایشێکی ڕازیشتن بە بێ ئاراستەی کات بخەیتەڕوو، بیرۆکە نائەقلیدییەکان و شێوازە ناباوەکانت پیشان بدەیت، خەڵکی پێیان وادەبێت کە تۆ تەنیا دەتەوێ سەرنجیان ڕابکێشیت و لەسەرەوەڕا لێیان بڕوانیت. ئەوان ڕێگەیەک دەدۆزنەوە تا سزات بدەن لەبەرانبەر ئەوەی وانیشانکردووی هەست بە نزمی بکەن. زۆر سەلامەتترە کە مۆرکێک و شێوازێکی باو پەیڕە پێبدەیت. تەنیا لەگەڵ هاوڕێ بەتەحەمولەکانت و ئەوانەی کە بەدڵنیاییەوە هاوڕەیی تۆ ستایش دەکەن ڕەسەنایەتی خۆت دەربخە.*

### سەرپێچی لە یاساکە

لە دەوروبەری ساڵی ٤٧٨ای پێش زایین، شاری سپارتا تیمێکی نارده فارس کە لەلایەن پۆزنیاسی جانەدلی سپارتایی گەنج ڕێبەرایەتی دەکرا. دەوڵەت شارەکانی یۆنان بەو دواییانە ڕووبەڕووی داگیرکارییەکی بەهێز بوونەوە لەلایەن فارسەوە و ئێستا پۆزانیاس شانبەشانی کەشتییەکانی هاوپەیمانانی لە ئەسینا، فەرمانیان پێبوو بۆ سزادانی داگیرکەران و بەدەستهێنانەوەی دوورگەکان و شارۆچکەکانی کەنار کە فارسەکان

داگیریان کردبوو. هەم ئەسینایییەکان و هەم سپارتاکان ڕێزێکی زۆریان بۆ پۆزانیاس هەبوو– ئەو وەکو جەنگاوەرێکی بێ ترس خۆی سەلماندبوو.

بە هێزایییەکی بێ وێنەوە، پۆزانیاس و سەرپارەکانی قیبرسیان گرت، پاشان بەرەو حاکی ئاسیای بچوک بەڕێکەوتن کە بە هێلێسپۆنت ناسرابوو و بیزەنتیەمیان گرت (کە دەکاتە ئیستەمبوڵی ئەمڕۆ). ئێستا کە گەورەی بەشێکی ئیمپراتۆریەتی فارس بوو، پۆزانیاس دەستیکرد بە پیشاندانی نیشانەکانی ڕەفتارێك کە لەسەروو شێوازی ئاسایی خۆیەوە بوو. ئەو بە پۆشاکی فارسی و پۆشاکی خەلکی ئاسایی دەرکەوت و پاسەوانی میسری لەگەڵدا بوون. ئەو خوانی گەورەی ساردان کە تیایاندا بە شێوازی فارسی بلاەبیشت و داوای دەکرد ستایش و سەرگەرمی بۆ سار بدرێت. ئەو چیتر هاوەڵ کۆنەکانی نەبینی، چونە ناو پەیوەندی لەگەڵ پاشای فارس، کورەش و بە گشتی کاریگەری خستە سەر شێوازی دیکتاتۆری فارس.

بە ڕوونی دیار بوو دەسەلات و سەرکەوتن لە کەللەی پۆزانیاسی داوە. سوپاکەی ئەو– ئەسیناییەکان و سپارتاییەکان وەك یەك– سەرەتا پێیان وابوو ئەمە هەرێکی ڕاگوزەرە ئەو هەمیشە لە ئامازەکانیدا دریزدادری دەکرد. بەلام کاتێك ئەو بە چاوی سوك ڕوانییە شێوازی ژیانی سادەی یۆنانییەکان و نیهانەی سەرماری ئاسایی یۆنانی کرد، ئەوان هەستی ئەوەیان لابرست بوو کە ئەو زێدەڕۆیی دەکات. هەرچەندە بەلگەیەکی کۆنکریتی لەمبارەیەوە نەبوو، دەنگۆ بلاو بوونەوە کە ئەو چووەتە بەرەکەی ئەولا و هەوێ بە بوون بە جۆرێك لە کورەشی یۆنانییەوە دەبستێت. بۆ ڕەواندنەوەی ئەگەری پاهیبوون، سپارتاییەکان پۆزیاسیان لە فەرماندەیی وەلانا و بانگیانکردەوە بۆ وڵات

لەگەڵ ئەوەشدا، پۆزیباس بەردەوام بوو لە پۆشینی ستایلی فارسی، تەنانەت لە سپارتاش. پاش چەند مانگێك ئەو بەشێوەیەکی سەربەخۆ کەشتییەکی بەکرێ گرت و گەڕایەوە بۆ هێلسپۆنت، بە هاوپشتمانییەکانی وت ئەو بەردەوام دەبێت لە شەڕ لەدژی فارسەکان لە ڕاستیدا، ئەو پلانی جیاواری هەبوون– بۆئەوەی خۆی بکاتە فەرمانڕەوای هەموو یۆنان، بە هاوکاری خودی کورەش. سپارتاکان ئەوەی بە لوژمی گشتی ڕاگەیەند

و کەشتییەکان ئارە بۆ گرتنی پۆزبیاس تەسلیم بوو، دڵنیا بوو لەوەی کە دەتوانێت خۆی لە تۆمەتەکانی خیانەت بێبەری بکات. لەبارەی دادگایید دەرکەوت کە لەماوەی حوکمڕانییەکەیدا وەك فەرماندە چەند جارێك بووەتەهۆی هەڵسانکردنی هاوپەیمانییە یۆنانییەکانی، بۆ نموونە مۆنۆمێنتی بەناوی خۆیەوە قوت کردووەتەوە نەك بەناوی ئەو سەربازانەی شانەشانی ئەو جەنگاون، هەروەك چۆن نەریتەکە وەهابوو. لەگەڵ ئەوەشدا پۆزبیاس ڕاست بوو؛ سەربازی بەڵگەی چەندەها پەیوەندی لەگەڵ دوژمندا، سپارتاکان ڕەتیانکردەوە پیاوێك بەند بکەن کە لە بنەچەیەکی وەها خانەدان بوو و ئیتر وازیان لێهێنا.

ئێستا پۆزبیاس کە خۆی وەها دەبینی دەستی بۆ نابرێت، نامەبەرێکی بەکرێ گرت تا نامە بۆ کورەش ببات، بەڵام نامەبەرەکە لەبری ئەوە نامەکەی بۆ دەسەڵاتدارانی سپارتا برد. ئەم پیاوانە دەیانویست زانیاری زیاتریان دەسکەوێت ، بۆیە بە نامەبەرەکەیان وت سەردانێك بۆ لای پۆزبیاس ڕێکبخات لە پەرستگە کە لەوێ ئەوان توانیان خۆیان لە پشت بەربەستێکەوە بشارنەوە. ئەوەی پۆزبیاس وتی، بووە مایەی شۆك بوونیان. ئەوەی کە پۆزبیاس وتی و بووە مایەی شۆك بوونیان— ئەوان قەت گوێبیستی یەکێك لەخۆیان نەبووبوون کە وەها بە سوکی قسەیان لەسەر بکات— و ئەوی ئامادەکارییان کرد بۆئەوەی دەستبەجێ بیگرن

لە ڕێگەیدا لە پەرستگەوە بەرەو ماڵەوە، پۆزبیاس قسەی ئەوەی پێگەیشت کە چی ڕوویداوە ئەو چووە پەرستگەیەکی تر تا خۆی بشارێتەوە، بەڵام دەسەڵاتداران شوێنی گەڕتن و پاسەوانیان لەهەموو لایەکەوە دانا. پۆزبیاس ڕەتی کردەوە مل بدات دەسەڵاتداران کە ئارەزوومەند نەبوون مەزۆر لە پەرستگا پیرۆزەکە دەربێنن، لەناوەوەدا لەژێر حەرەمسیاتدا هێشتیانەوە تا ئەو کاتەی کە سواجار لە برسا مرد.

## لێکدانەوە

لەوانەیە لە یەکەم سەرنجدا وا دیار بێت کە پۆرانیاس کەوتبێتە ناو داوی خۆشەویستی لەگەڵ کەلتوورێکی تردا، کە دیاردەیەکی کۆنە بەقەد کات. ئەو کە لەت بە ئاسێنشینی سپارتاکان ئاسوودە نەبوو، خۆی لەخۆشەویستی بۆ کامەرانی و خۆشیی دەستیانەی فارسدا دۆزییەوە. ئەو پۆشاکی فارسی پۆشی و بۆنی فارسی لەخۆیدا و هەستێکی ڕزگاربووی لە سادەیی و دیسپلینی یۆنانی ٧ دروست بوو

بەو شێوەیە کە کاتێک خەڵکی کەلتوورێکی تر بەرەوڕوو دەکەن کە تیایدا پەروەردە نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆرجار بەهەمانشێوە شتێکی تریش ڕوو دەدات: ئەو خەڵکەی خۆیان بە کەلتوورێکی ترەوە پیشان دەدەن، بە چاوێکی سووکەوە دەڕواننە ئەوەی خۆیان. ئەوان پوالەتی نامۆی دەرەوەیان بەکار دێنن بۆ خۆجیاکردنەوەیان لە خەڵکی ئاسایی کە بەبێ پرسیار پەیڕەوی لە نەریت و یاسا تۆکاڵەکان دەکەن و هەستێکی بالایی لەخۆیان پیشان دەدەن. بە پێچەوانەوە، ئەوان بە شکۆمەندییەکی زۆرترەوە ڕەفتاریان دەکرد، ڕێزیان بۆ ئەوانە پیشان دەدا کە لەناو ڕووەکانیاندا ناوبەش بین. لەڕاستیدا پێویستییان بۆ پیشاندانی جیاوازییان وەها بەشێوەیەکی ڕۆمانتیکی، زۆرجار وایانلێدەکات ئەو خەڵکە ڕقیان لێهەڵبگرن کە ئەوان ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ تەحەددی باوەڕەکانیان دەکەن.

زۆرێک لە ئێمە، وەک پۆرانیاس، هەست بە بەکێشبوونێک بەرەو بیانی و نامۆ دەکەین. پیشاندانی کەیف هاتنت بە شێوەی سەرکردنەوە و ڕەفتاری نامۆ ئەنگیزەیەک دەردەخات — پیشاندانی بالایست بەسەر هاوڵاتیاندا!

## پەیڕەویکردن لەیاساکە

لەماوەی نیوەکانی سەدەی شازدەدا، پەرچەکردارێکی توندوتیژانە لەدژی ڕیفۆرمی پرۆتێستانتی لە ئیتالیا هەڵایسا. دژە ڕیفۆرم، هەروەک وەها ناودێر دەکرا، ئیرۆژێکی

خۆی لە پشکنین دەگرتەخۆ بۆ ریشەکێش کردنی هەموو لادانەکان لە کەنیسەی کاسۆلیکی لەنێو فوربابییەکانیدا، گالیلۆی رابا هەبوو، بەڵام بیرمەندێکی گرنگ کە تەنانەت بە رادەیەکی زۆرتر چەوسایەوە، راهیبی دۆمینیکی و فەیلەسوف، تۆماسۆ کامپنیلا بوو

کامپانیلا کە شوێنکەوتەی دۆکترینی مەتریالیستی فەیلەسوفی رۆمانی، ئەپیکوروس بوو، باوەڕی بە پەرجووەکان، یان بەهەشت و دۆزەخ نەبوو، ئەو نوسیبووی، کەنیسە برەوی بەو جۆرە خورافیاتە دەدا بۆ کۆنترۆلکردنی خەڵکی ئاسایی لە رێگەی هێشتنەوەیان لە ترسدا. ئەو بیرۆکانە لە ئاتەییم (بێباوەڕگەرایی) نزیک بوون و کامپانیلا بێباکانە دەریدەبڕین. لە ١٥٩٣دا، لیژنەی پشکنین فرێی دایە ناو زیندان لەبەرانبەر باوەڕە گومڕاکانیدا. شەش ساڵ دواتر، وەکو شێوەیەکی ئازارکردنی رێژەیی، ئەو خرایە پەرستگەیەکەوە لە ناپۆلی

لەو سەروەختەدا باشووری ئیتالیا لەلایەن ئیسپانیارە کۆنترۆڵ کرا و کامپنیلا لە ناپۆلی بوو بەشداری لە پیلانێک کرد بۆ شەڕ لەدژی ئەم داگیرکەرانە و دەرپەڕاندنیان، هیوای ئەو بونیادنانی کۆمارێکی سەربەخۆ بوو لەسەر بنەمای ئایدیاکانی خۆی لەمەڕ یوتۆپیا. سەرکردەکانی پشکنینی ئیتالیا، بە کارکردن لەگەڵ هاوتا ئیسپانییەکانیان، جارێکی تر خستیانەوە ناو زیندان.ئەمجارە ئەوان ئەشکەنجەشیاندا بۆئەوەی سروشتی راستەقینەی بیباوەڕییەکانی بزانن

لەماوەی ئەو ساڵانەدا کامپانیلا شتێک لەبارەی دەسەڵاتەوە فێر بوو، بە رووبەڕووبوونەوەی ناسۆی لەسێدارەدان لەبەرانبەر بێباوەڕیدا، ئەو ستراتیژەکەی گۆڕی ئەو دەستبەرداری باوەڕەکانی نەدەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی دەمێ رووی دەرەوەیان رووپۆش بکات

بۆ رزگارکردنی ژیانی، کامپانیلا خۆی بە شێت پیشاندا. ئەو لێگەڕا تا پشکنەران وێنای ئەوە بکەن کە باوەڕەکانی لە مەساغی کۆنترۆڵنەکراوی ئەقڵەوە سەرچاوە دەگرن. بۆ ماوەیەک ئەشکەنجە بەردەوام بووە بۆ زانینی ئەوەی ئاخۆ مەساغییەکەی ساختە

نییە، بەڵام لە ١٦٠٢دا کەمکرایەوە بۆ ژیان لە زینداندا. یەکەمین چوار ساڵی بەشێوەیەکی زنجیرکراو بە دیوارەوە لە زیندانێکی ژێر زەمینیدا بەسەر برد. سەرباری ئەو هەلومەرجە، ئەو بەردەوام بوو لە نووسین- هەرچەندە چیتر ئەوەندە گەمژە نەبوو ئایدیاکانی بەشێوەی ڕاستەوخۆ دەربېڕێت.

بە ماوەیەکی کەم پاش بەدەستهێنانی ئازادی، کامپانێلا کتێبی (ئاتەیزمی گیراو)ی نووسی کە تیایدا هێرشی کردە سەر بیرمەندانی ئازاد، مەکیاڤیلییەکان، کالڤینیستەکان و لادەرەکانی دین. کتێبەکە لەشێوەی دیبەیتدا نووسرا کە تیایدا لادەرانی دینی مارەپەکانیان دەردەبڕن و ڕووبەڕووی ئەرگومێنت بۆ باڵایی کاسۆلیسیزم دەبنەوە. کامپانێلا بەڕوونی دیار بوو چاکسازی کردووە- کتێبەکە زۆر ڕوون کرابۆوە. بەڵام وەها بوو؟

ئەرگومێنتەکان لە زاری لادەرە دینییەکانەوە قەت وەها بەو ئازادیی و ئامەڕزێییەوە دەربەبڕدرابوو- بە وەها دەرخستنی ئەوەی کە لای خۆی دەردەخست ئەگەرچی دەیپووچاندن، کامپانێلا لە ڕاستیدا ئەرگومێنتی خۆی لەدژی کاسۆلیسیزم بەشێوەیەکی کاریگەرەوە خستەڕوو.

ئەو کاسۆلیکانەی کتێبەکەیان دەخوێندەوە، بەلایانەوە ئالۆز و سەرلێ شێوێنەر بوو، بەڵام نەیاندەتوانی بانگەشەی ئەوە بکەن کە لادانی دینی تێدابێت، یان ئەمەی کە دەبێ کامپانێلا بگەڕێنرێنەوە زیندان. لە بەرگریکردنەکەی لە کاسۆلیسیزم، هەمان ئەو ئەرگومێنتانەی بەکارهێنابوو کە ئەوان خۆیان بەکاریانهێنابوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ساڵانی دواتردا، (ئاتەیزمی گیراو) بووە ئینجیلی ئاتەیستەکان، مەکیاڤیلییەکان و ئازادیخوازەکان کە ئەو ئەرگومێنتانەیان بەکارهێنا کە کامپانێلا خستبوویە زاریانەوە بۆ بەرگریکردن لە ئایدیا مەترسیدارەکانیان. بە لێکدانی نمایشێکی ڕواڵەتیانەی خۆگونجاندن لەگەڵ گوزارشتێکی باوەڕە ڕاستەقینەکانی بە شێوازێک کە هاوسۆزەکانی لێی تێدەگەیشتن، کامپانێلا پیشانیدا کە وانەکەی فێر بووە.

**لێکدانەوە**

لە ڕووی چەوساندنەوەیەکی کاریگەردا، کامپانێلا سێ هەنگاوی ستراتیژی ئامادە کرد که ژیانی ڕزگار کرد، لە زیندان ڕزگاری کرد و ڕێگەی بۆ خۆشکرد تا بەردەوام بێت لە دەربڕینی بیروڕاکانی. یەکەمیان خۆی وەك شێت نواند– هاوتای سەدەکانی ناوەڕاست بۆ دەستبەرداربوونی لە بەرپرسیاریتی کردارەکانی کەسێك، وەك لۆمەکردنی باوانی کەسێك لەمڕۆدا. پاشان کتێبێکی نووسی کە دەقاودەق پێچەوانەی باوەڕەکانی خۆی دەردەبڕی. لە کۆتاییدا ئەو ئایدیاکانی ڕووپۆش کرد لەکاتێکدا و لەهەمان کاتدا بڵاوی پێدەدان. ئەمە فێڵێکی کۆن بەڵام بەهێزە. تۆ وا دەردەخەیت ناکۆکیت لەگەڵ ئایدیا مەترسیدارەکاندا، بەڵام لە ماوەی ناکۆکیتدا، ئەو ئایدیایانە دەردەبڕیت و بەرجەستە دەکەیت. وا دیار دەبێت کە تۆ لەگەڵ ئەرتەدۆکسی باو هاوڕایت، بەڵام ئەوانەی کە دەزانن، تێدەگەن کە ناکۆك هاتنەوەیەك لەئارادایە، تۆ پارێزراو دەبیت.

شتێکی حەتمییە لە کۆمەڵگەدا کە هەندێ بەها و نەریتی سپاردراو تریکیان لەگەڵ ئەگێڕن، ڕەسەنەکانیان لەدەست دەدەن و دەبنە سەرکوتگەر. هەمیشەش ئەو کەسانە دەبن کە لە سەرکوتگەرییەکی وەها یاخی دەبن، ئەو ئایدیایانەیان دەبێت کە زۆر لە پێش سەردەمی خۆیانەوەن. لەگەڵ ئەوەشدا هەروەك کامپانێلا ناچار بوو درکی پێبکات، پیشاندانی ئایدیا مەترسیدارەکانت کەڵکی نییە ئەگەر تەنیا ئەشکەنجە و ئازارت بۆ دەستەبەر بکەن. شەهادەت حرمەت بە هیچ ئامانجێك ناکات. باشترە لە جیهانێکی سەرکوتگەردا بژیت، تەمامەت تیایدا گەشە بکەیت. لەهەمان کاتدا، ڕێگەیەك بدۆزینەوە بۆ دەربڕینی ئایدیاکانت بەشێوەیەکی شاراوە بۆ ئەو کەسانەی کە لێت تێدەگەن.

*بۆ ماوەیەکی درێژ من ئەو شتانەم دەرنەبڕیوە کە باوەڕم پێ بووە، نە قەتیش باوەڕم بەو شتە هەیە کە دەیڵێم و ئەگەر لە ڕاستیدا هەندێ جار ڕاستی دەڵێم، لەنێو چەندەها درۆدا دەیشارمەوە بەشێوەیەك کە پەیداکردنی قورسە*

*نیکۆلۆ ماکیاڤیلی، نامەی ١٥٢١*

## کلیلی دەسەڵات

ئێمە هەموومان ڕێز دەگرین و هەستی ڕاستەقینەمان دەشارینەوە، چونکە دەربڕینی تەواو ئازاد، مەحاڵێکی کۆمەڵایەتییە. لە تەمەنێکی زووەوە ئێمە فێر دەبین بیرکردنەوەمان بشارینەوە و بە وریاییەوە ئەو قسانە بکەین کە لەوانەیە ببنە هۆی بریندارکردنی ئەوان. بۆ زۆرێك لە ئێمە، ئەمە شتێکی سروشتییە — مرۆڤ و بەها هەن کە زۆربەی خەڵکی قبوڵی دەکەن و مشتومڕکردن لەسەری بێکەڵکە. ئێمە باوەڕ بەو شتە نیین کە دەمانەوێت، بەڵام لە دەرەوەڕا دەمامك دەپۆشین.

لەگەڵ ئەوەشدا، خەڵك هەن کە ئەم کۆت و بەندانە وەك پێشێلکردنی تەحەمولنەکراوی ئازادییەکەیان دەبینن و پێویستیان بە سەلماندنی باڵایی بەهاکان و باوەڕەکانیان هەیە. لە کۆتاییشدا، باوەڕەکانیان تەنیا خەڵکێکی کەم قەناعەت پێدەهێنێت و خەڵکێکی زۆر بریندار دەکات. هۆکاری ئەمەی ئەرگومێنتەکان کرداری نین ئەوەیە کە زۆربەی خەڵکی ئایدیا و بەهاکانیان بەبێ بیرکردنەوە هەڵگرتووە. ناوەرۆکێکی هەستییانەی بەهێز لە باوەڕەکانیاندا هەیە: ئەوان بە ڕاستی نایانەوێت دەستکاری هزر و بیرکردنەوەیان بکەن و کاتێك تۆ تەحەدایان دەکەیت، چ ڕاستەوخۆ بێت لە ڕێگەی ئەرگومێنتەکانتەوە یان ناڕاستەوخۆ بێت لە ڕێگەی ڕەفتارتەوە، هەر دوژمنکارانەیە

خەڵکی ژیر و زیرەك لە زووەوە دەزانن کە ئەوان دەتوانن ڕەفتاری تەقلیدی پیشان بدەن و ئایدیا تەقلیدییەکان بەبێ ئەوەی پێویست بکات باوەڕیان پێی بێت، دەربڕن. ئەو دەسەڵاتەی ئەم خەڵکە لەم تێکەڵکردنە بەدەستی دێنن ئەوەیە کە دەتوانن دەست بەو بیروباوەڕانەیانەوە بگرن کە هەیانە و بەرامبەر ئەو کەسانەی کە حەزیان دەیانەوێ دەریببڕن بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی گۆشەگیری و دەربەدەربوون ببنەوە. هەر کە جێیان لە پێگەی دەسەڵاتدا جێگیر کرد، دەتوانن هەوڵ بدەن قەناعەت بە ژمارەیەکی فراوانتری ڕاستی ئایدیاکانیان بێنن

**دەسەڵات:** ئەو شتە مەدەرە سەگەکان کە پیرۆزە و مرواری فڕێ مەدەرە بەردەم قاز، نەوەک پێی پێ بنێن و هێرش بکەنە سەر تۆ (عیسای مەسیح، ماتێیۆ ٦ ٧)

**وێنە:** مەڕی ڕەش. مێگەل مەڕی ڕەش دەردەکات چونکە دڵنیا نییە ئاخۆ سەر بەوانە. تۆیە مەڕەکە خۆی دوا دەخات یان لە مێگەل دوور دەکەوێتەوە کە لەڕێوە لەلایەن گورگان دەورە دەدرێت و دەستبەجێ لوت دەدرێت. لەگەڵ مێگەل بمێنەرەوە، لەناو ژمارەدا سەلامەتی هەیە. جیاوازییەکانت لە بیرکردنەوەکانتدا بپارێزە نەک لە خوورییەکەتدا

**پێچەوانەبوونەوە**

ئەو ئاکە کاتەی تیایدا دەربکەویت ئەو کاتەیە کە تۆ هەموکە دەردەکەویت— کاتێک پێگەیەکی لەق نەبووی دەسەڵاتت بەدەستهێناوە و دەتوانیت جیاوازییەکانت لەوانیتر وەک نیشانەیەکی دووریی نێوانتان پیشان بدەیت. وەک، سەرۆکی ئەمریکا، لیندۆن جۆنسن هەندێ جار کۆبوونەوەی ئەنجام دەدا لەکاتێکدا کە ئەو لەسەر تەوالێت دانیشتبوو. لەبەرئەوەی کە بانگەشەی "ئیمتیاز"ێکی وەهای نەدەکرد، جۆنسن پیشانی خەڵکی دەدا کە پێویست ناکات ئەو چاودێریی پرۆتۆکۆڵەکان و ڕێکوپێکی ئەوانیتر بکات. ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی (کالیگولا) هەمان یاری کرد. ئەو خۆی ماڵەوەی ژنی یان ڕۆبی هەمانی لەبەر دەکرد بۆ پێشوازی لە میوانە گرنگەکان. ئەو تا ئەو شوێنەش ڕۆیشت کە ئەسپەکەی بە کونسول هەڵبژێرێت. بەڵام ئەمە پەرچەکردای هەبوو، چونکە خەڵکی ڕقیان لە کالیگولا بوو و دواجار ئاسەزەکانی بوونە هۆی سەرنگوونبوونی. ڕاستییەکە ئەوەیە کە تەنانەت ئەوانەش کە دەگەنە ترۆپکی دەسەڵات حاڵیان باشتر دەبێت کە لە مۆرکی گشتی لا نەدەن، چونکە لە ساتێک لە ساتەکاندا پێویستیان بە پشتگیریی گشتی دەبێت

## یاسای ژمارە ٣٩

# ئاوەکان بشڵەقێنە، بۆئەوەی ماسی بگریت

### حوکم

تووڕەیی و هەست لە ڕووی ستراتیژییەوە دژە بەرهەمهێنن. دەبێ تۆ هەمیشە هێمن و بابەتی بمێنیتەوە. بەڵام ئەگەر بتوانیت دوژمنانت تووڕە بکەیت لەکاتێکدا کە خۆت هێمنیت، ئەوا کاریگەرییەکی بڕیار لێدراو بەدەست دێنیت. دوژمنەکانت ناهاوسەنگ بکە: درزێک لە لووتبەرزییاندا بدۆزەرەوە کە بتوانیت لە ڕێگەیەوە بیانهەژێنیت و تۆ هەوسارەکە بگریتە دەست

### سەرپێچی لە یاساکە

لە کانوونی دووەکی ١٨٠٩دا، ناپلیۆنی شڵەژاو بە پەلە لە جەنگەکانی ئیسپانیاوە گەڕایەوە. سیخوڕەکان و هەواڵدەرەکانی دەنگۆیەکیان پشتڕاستکردبووەوە کە وەزیری دەرەوەی، واتە تالیراند لەگەڵ فۆچێ ی وەزیری پۆلیس لەدژی ئەو گەلەکۆمەکێیان کردووە. لەگەڵ گەیشتنیان بۆ پایتەخت، ئیمپراتۆری شۆکبوو وەزیرەکانی لە کۆشک کۆ کردەوە. دەستیکرد بە پیاسە کردن و ئەشتوەیەکی تەمومژاوی لەبارەی پیلانگێڕان و کارکردنیان لەدژی ئەم، بڵاوکەرەوەی دەنگۆکان، مارای پشك دادەمەزێنن، یاسادانەران بەرنامەکانی ئەو پەك دەخەن- و وەزیرەکانی، بیکوڵی دەکەن.

لەکاتێکدا کە ناپۆلیۆن قسەی دەکرد، تالیراند بەسەر ئاگردانەکەدا شۆڕ بووەوە، سەولز بێباک دیار بوو. ناپۆلیۆن ڕاستەوخۆ ڕوانییە تالیراند و ڕایگەیاند "بۆ ئەم وەزیرانە، خیانەت کارێک دەستپێنەکراوە کە ڕێگەی گومان بەخۆیان دەدەن". لە وشەی "خیانەت"دا فەرمانڕەوا پێشبینی ئەوەی کرد وەزیرەکەی دەترسێنێت. بەڵام تالیراند تەنیا بزەیەکی کرد، کپ و بێزار.

ئەم ئیمەیەی بەرپرسی حوارەوە کە بە ڕواڵەت هێمن بوو لەبەرانبەر ئەو تۆمەتانەی کە درووستەبوو ڕووبەڕووی سێدارەی بکاتەوە، ناپۆلیۆنی خستە سەر لێوار. ئەو وتی، وەزیر هەن کە دەیانەوێ ئەم بمرێ و هەنگاوێک لە تالیراند نزیکتر کەوتەوە— کە ئەویش بێ ئەوەی خۆی تێکبدات سەربجی دەدایە. دواجار ناپۆلیۆن تەقییەوە. بەسەر تالیراند دا قیراندی و وتی "تۆ ترسنۆکیت. باوەڕت لەدڵدا نییە. هیچ شتێک ناتترسێنێت. تۆ باوکی خوت دەفرۆشیت. من سامانم بەسەردا باراندوویت لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێک ناکەیت ئازارم نەدات". وەزیرەکانی تر بە باوەڕنەکردنەوە لەیەکتریان دەڕوانی— ئەوان قەت ژەنەڕاڵێکی وەها چنەترس، ڕاکێشەری ئەورووپایان بە شلوشۆقی نەبینیوو.

سەرباری تووڕەییەکەی، ناپۆلیۆن وەزیری دەرەوەی دەستگیر نەکرد. ئەو تەنیا ئەرکەکانی لێ سەندەوە و لە دەربار دەریکرد، بەو بڕوایەی کە ڕیسوایی، سزاییەکی بەسە بۆی. ئەو درکی بەوە نەکرد کە قسە و دەنگوباس بەخێرایی بڵاوبوونەتەوە— لەمەڕ ئەوەی چۆن ئیمپراتۆر بەتەواوی کۆنترۆڵی لەدەستداوە و چۆن تالیراند بەجەوهەرد ئەوی ڕیسوا کردووە بەوەی کە شکۆ و شەوکەتی خۆی پاراستووە و هیچ خۆی تێکنەداوە. لاپەڕەیەکی نوێ هەڵدرایەوە: بۆ یەکەمین جار خەڵک بینیوویان کە چۆن ئیمپراتۆری مەزن هاوسەنگی لەدەستداوە. هەستێک بڵاو بووەوە کە ئەو لە هەڵدێردایە. لەکاتێکدا کە تالیراند دوایی وتبووی "ئەمە دەستپێکی کۆتاییە".

## لێکدانەوە

لە ڕاستیدا ئەمە دەستپێکی کۆتایی بوو. واتەرلوو هێشتا شەش ساڵی مابوو، بەڵام ناپۆلیۆن لە لێژبوونەوەیەکی مێژووییدا بوو بەرەو شکست کە لە ١٨١٢دا لەگەڵ داگیرکردنی کارەساتباری ڕووسیا بەرجەستەبوو. تالیراند یەکەمین کەس بوو نیشانەکانی ئاوابوونی بەدی بکات، بەتایبەت لە جەنگی نائەقڵانییدا لەگەڵ ئیسپانیا. لەکاتێکی ١٨٠٨دا، وەزیری بڕیاریدا کە بۆ ئاشتی ئایندەی ئەورووپا، ناپۆلیۆن دەبێ بڕوات. بۆیە ئەو لەگەڵ فۆچێ دا گەلەکۆمەکێیان کرد.

ئەمەیە کێشەی کاردانەوەی تووڕەیی. لەوانەیە لە سەرەتادا ترس و تیرۆر دروست بکات، بەڵام تەنیا لە چەند کەسێکدا و لەکاتێکدا کە ڕۆژان تێدەپەڕن و ڕەوان دەبێت، کاردانەوەی تریش سەرهەڵدەدەن — شەرمەزاری و نارەحەتی لەبارەی توانای ناوبراوەوە بۆ دەرچوون لە کۆنترۆڵ و کینەی ئەوەی کە وتراوە بە لەدەستدانی میزاجت، هەمیشە تۆمەتی زێدەڕەوانە و نادادپەروەرانە دەمەحشێتەوە. پەخشەگرایێک و خەڵکێکی کەمی وەها ڕۆژان دەژمێرن تا ئەوەی کە تۆ نامێنیت.

ژمارەیەک شت هەبوون ناپۆلیۆن دەیتوانی لەم بارودۆخەدا بیانکات. ئەو دەیتوانی بیر لەو فاکتە بکاتەوە کە دوو کەسی زۆر مەعقول هۆکاریان هەیە بۆئەوەی پێی هەڵگەڕێنەوە و دەکرا گوێی لێ بگرن و لێیەوە فێر بن. ئەو دەیتوانی هەوڵ بدات بەدەستیان بهێنێتەوە. ئەو تەنانەت دەیتوانی خۆیان بێ قوتار بکات، بەندکردنیان یان کوشتنیان بکاتە نمایشێکی گەورەی دەسەڵاتەکەی.

بیرت بێت گەشکە گرتن نە ترسێنەرە و نە دەبێتە مایەی دروستکردنی وەفاداری، ئەمانە تەنیا گومان و نارەحەتی لەبارەی دەسەڵاتی تۆوە دروست دەکەن. بە دەرخستنی لاوازییەکەت، ئەم هەڵچوونە ڕیاناوییانە زۆرجار کەوتنێکیان بەدواوە دەبێت

## پەرەوپێکردن لەپلەکە

بەماتی ١٩٢٠ەکان، هەیل سێلاسی تەقریبەن ئامادەکەی بۆ گرتنەدەستی تەواوەتیی کۆنترۆڵ بەسەر ئەسیوپیادا بەدەست هێنابوو. وەک جێنشینی ئیمپراتۆرە زۆدیتو (رێکچی شازی کۆچکردوو) و میراتگری تاج، سێلاسی چەند ساڵێکی لە لاوازکردنی دەسەڵاتی چەندەها جەنگاوەری ئەسیوپی بەسەربردبوو. ئێستا تەنیا یەک مەزیەستی راستەقینە لەبەردەمیدا هەبوو، ئیمپراتۆرە و مێردەکەی، راس گوگسا. سێلاسی دەیزانی هاوسەری شاهانە رقیان لێیەتی و دەیانەوێ لێی قوتار بن، بۆیە بۆئەوەی پلانەکەیان بڕێت، گوگسای کردە حاکمی ناوچەی باکووری بەگەمێدەر، ناچاری کرد پایتەخت جێ بێڵێت کە ئیمپراتۆرەی لێ دەژیا.

بۆ ماوەی چەند ساڵێک گوگسا رۆڵی بەڕێوەبەرێکی نەمەکداری دەبینی، بەڵام سێلاسی متمانەی پێنەکرد. ئەو دەیزانی گوگسا و ئیمپراتۆرە پلانی تۆڵە دادەڕێژن، لەگەڵ تێپەڕینی کات و نەبوونی هیچ هەنگاوێک لەلایەن گوگساوە، هەلی پیلان زیاد و زیاتر بوو. سێلاسی زانی کە دەبێ چی بکات. گوگسا بهێنێتە دەرەوە، بچێت ژێر پێستییەوە و فشاری بۆ بێنێت تا هەنگاو بنێت بەر لەوەی ئامادە بێت.

بۆ ماوەی چەند ساڵێک، مۆرێکی باکوور، (ئاریمو گالاس) لە یاخیبوونێکی بریکەبیی بوو لەدژی تاج، گوندە لۆکاڵەکانی تاڵان دەکرد و رەتی دەکردەوە باج بدات. سێلاسی هیچ حەقی بەسەر ئەوەوە نەبوو بیوەستێنێت و لێدەگەڕا بەهێزتر بێ. لەکۆتاییدا، لە ١٩٢٩، فەرمانی بە راس گوگسا کرد ڕێبەرایەتی سوپایەک بکات لەدژی ئەم هێڵکییە لاسارانە. گوگسا رازی بوو، بەڵام لەناخدا دەکوڵی — ئەو هیچی لەدژی ئەرییو گالاس نەبوو و داواکاری بۆ جەنگان لەدژیان، شعووری بریندار کرد. ئەو نەیتوانی ملکەچی فەرمانەکە نەبێت، بەڵام لەکاتێکدا کە کاری کرد بۆ پێکەوەنانی سوپاکە، دەستیکرد بە

بلاوکردنەوەی دەنگۆیەک- ئەمەی کە سێلاسی لەگەڵ پاپا کاثیکی لێک گرێداوە و پلان دادەنێت بۆ وەرگەڕاندنی وڵات بۆ رۆمان کاسۆلیسیزم و کردنی بە کۆلۆنییەکی ئیتالیا سوپای گوگسا هەڵئاوسا و هەندێ لەو هۆزانەی سەربازەکانی لێوە هاتبوو بەزێرەوە پاڵی بوون لەدژی سێلاسی بجەنگن. لە مارسی ۱۹۳۰دا هێزێکی گەورەی ۳۵،۰۰ سەربازی کەوتنە جوڵە، نەک بۆ ئەریبۆ گالاس بەڵکو بەرەو باشوور، بەرەو پایتەختی ئەدیس ئەبابا. گوگسا کە بەهۆی توانای گەشەکردنییەوە بڕوابەخۆبوونی بەدەستهێنابوو، ئێستا بە ڕاشکاوی هەنگێکی پیرۆزی هەستبووەگەڕ بۆ سەرنگوون کردنی سێلاسی و گەڕاندنەوەی وڵات بۆ ناو دەستی مەسیحییە ڕاستەقینەکان.

بەڵام، ئەو شتەی کە نەیدەزانی ئەوە بوو کە سێلاسی پێش ئەوەی فەرمان بە گوگسا بدات بۆ شەڕکردن لەدژی ئەریبۆ گالاس، ئەو پشتگیری کەنیسەی ئەسیوپی بەدەستهێنابوو. پێش ئەوەی یاخیبوونیش بکەوێتە سەر سکە، ئەو بەرتیلی دابووە ژمارەیەک لە هاوپەیمانە سەرەکییەکانی گوگسا بۆئەوەی نەچنە شەڕ. لەکاتێکدا کە سوپای یاخی بەرەو باشوور دەڕۆیشت، فڕۆکەکان بە ئاسماندا فڕین و بڵاوکراوەیان بەردایەوە کە تیایدا هاتبوو کە بەرزترین کاربەدەستانی کەنیسە وەکو سەرکردەی ڕاستەقینەی مەسیحی ئەسیوپیا دانیان بە سێلاسیدا ناوە و گوگسایان شاربەدەر کردووە لەبەرانبەر ورووژاندنی شەڕی ناوخۆ. ئەم بڵاوکراوانە هەستی پشت خاچپەرستیی پیرۆزیان شل کردەوە. کاتێکیش کە شەڕ توند بوو و ئەو بەڵێنی پشتیوانییەی هاوپەیمانانی گوگسا بەرییاندا بوو بێ ئاکام بوو، سەربازان ڕایانکرد یان جیابوونەوە.

کاتێک شەڕ دروستبوو، سوپای یاخیبوو بە خێرایی دارما. بە ڕەتکردنەوەی ملدان، ڕاس گوگسا لە شەڕدا کوژرا. ئیمپراتۆرە زور بە مەرگی مێردەکەی نیگەران بوو، و پاش چەند رۆژێک مرد. لە ۲ی نیساندا، سێلاسی بەیانێکی ڕەسمی دەرکرد و تیایدا ناونیشانەکەی ڕاگەیاند: ئیمپراتۆری ئەسیوپیا

**لێکدانەوە**

هەبل سیلاسی هەمیشە چەند هەنگاوێکی لە پێش خۆیەوە دەبینی. ئەو دەیزانی ئەگەر لێبگەڕێ ڕاس گرگاس بڕیار لە کات و شوێنی یاخیبوون بدات، مەترسییەکە گەورەتر دەبێ لەوەی ئەگەر گرگسا ناچار بکات بەگوێرەی قەید و مەرجی سیلاسی هەنگاو بنێت. بۆیە ئەوی تووشی یاخیگەری کرد لە ڕێگەی بریندارکردنی شکۆی سێرسەییەکەی، داوای لێکرد شەڕ لەگەڵ خەڵکێک بکات کە هیچ ناموشی لەگەڵیاندا نەبوو و ئەمە مەلەری پیاوێک بوو کە ئەم ڕقی لێی بوو. بە بیرکردنەوەی پێشینە لەهەموو شتێک، سیلاسی دڵنیا ببووەوە لەوەی کە یاخیگەرییەکەی گرگاس بەهیچ کرێیەک ناکات و ئەم دەتوانێ بەکاری بهێنێت بۆ لەناو بردنی دوایین دوو دوژمنەکەی

ئەمەیە جەوهەری یاساکە. کاتێک ئاوەکان مەنگن، نەیارەکانت کات و شوێنیان هەیە پیلانی ئەو کردارانە دابنێن بۆ ڕەمبەسازی و کۆنترۆڵکردن. بۆیە ئاوەکان بشڵەقێنە، ماسییەکان ناچار بکە بەسەر ئاو بکەون، وایانلێبکە هەنگاو بنێن بەرلەوەی ئامادە بن، دەستپێشخەرییەکە بۆ خۆت بقۆزەرەوە. باشترین ڕێگە بۆ کردنی ئەمە، یاریکردنە بە هەستە کۆنترۆڵنەکراوەکان-شانازی، لوتبەرزی، خۆشەویستی، ڕق. هەر کە ئاوەکە شڵەقا، ماسی بچوک ناتوانێت هیچ بکات جگەلە ڕۆیشتن بەرەو چەشنەکە. چەندەی تووڕەتر بن، ئەوەندە کەمتر کۆنترۆڵیان دەبێت و دواجار ئەوان لەو گێژەڵوکەیەدا گیر دەبن کە دروستتکردووە و نوقم دەبن

*نابێ پاشا قەت سوپایەک لە تووڕەییەوە دەکار بکات، سەرکردە نابێ قەت جەنگێك لە کینە و ڕقەبەرە بخاتە جوڵە.*

سون تزو، سەدەی چوارەمی پێش زایین

## کلیلی دەسەڵات

خەڵکی تووڕە زۆرجار سەرەنجام دەبەنگ دەردەکەون، چونکە کاردانەوەیان ناهاوسەنگ دیار دەبێت بەرامبەر ئەوەی کە بووەتە هۆکاری. ئەوان شتەکانیان زۆر جدی وەرگرتووە، زیادەڕەوییان کردووە بەرامبەر ئەو ئازارەی پێیانگەیەنراوە. ئەوان ئەوەندە بەرامبەر ئیهانەکە هەستیارن کە دەبێتە کۆمیدی چۆن شتەکەیان بەجدی وەرگرتووە ئەوەش کۆمیدیتر باوەڕیانە بەوەی کە تووڕەبوونیان نیشانەی دەسەڵاتە. ڕاستییەکە پێچەوانەیە. بەدڕەفتاری دەسەڵات نییە، ئەمە نیشانەی دەستەوەستانییە. لەوانەیە خەڵک بەهۆی گەشکە و هەڵچوونەکەت بەشێوەیەکی کاتی بترسێنەوە، بەڵام لە کۆتاییدا ئەوان ڕێزی تۆ لەدەست دەدەن. ئەوان بەهەمان شێوە درک بەوە دەکەن کە دەتوانن کەسێک کە خۆکۆنترۆڵکردنێکی وەها کەمی هەیە بە ئاسانی لاواز بکەن.

وەڵامەکەش ئەوە نییە کە کاردانەوە هەستی و تووڕەییەکانمان سەرکوت بکەین، چونکە سەرکوتکردن وزەمان لێ دەبڕێت و دەمانخاتە ناو ڕەفتارێکی نامۆوە. لەبری ئەمە، دەبێ ئێمە ڕوانگەمان بگۆڕین: دەبێ ئێمە درک بەوە بکەین کە هیچ شتێک لە بواری کۆمەڵایەتی و لە گەمەی دەسەڵاتدا شەخسی نییە.

وێنە، حەوزی ماسی. ئاوەکان ڕوون و هێمن و ماسییەکان زۆر لەژێر ڕووی ئاوەکەوەن. ئاوەکان بشڵەقێنە و دەردەکەون. کەمێک زیاتر بیشڵەقێنە ئەوا تووڕە دەبن، دێنە ڕووی ئاوەکە، قەپ لە هەر شتێک دەگرن نزیک بێتەوە، بە چەشنەی قولابەکەشەوە

دەسەڵات: ئەگەر نەیارەکەت بەدمیزاج نییە، هەوڵ بدە هەراسانی بکەیت. ئەگەر توڕە بێت، هانی خوپەرستییەکەی بدە. کەسێک کە لە جوڵاندنی دوژمندا لێهاتووە بە ڕێگەی دروستکردنی بارودۆخێک ئەمە دەکات کە بەهۆیەوە دوژمن هەنگاو دەبێت. ئەو بە شتێک دوژمن بەکێش دەکات کە ئەو دڵنیایە وەریدەگرێت. ئەو لە ڕێگەی ڕاگرتنی چەشتەکەوە دوژمن لە جوڵەدا دەهێڵێتەوە و پاشان بە سەربازی هەڵبژاردە هێرش دەکاتە سەری. سون تزو، سەدەی چوارەمی پێش زایین

**پێچەوانەبوونەوە**

کاتێك یاری بە هەستەکانی خەڵك دەکەیت دەبێ زۆر وریا بیت. لەپێشدا تاووتوێی بۆشی بکە: و باشترە هەندێ لە ماسییەکان لە بەرەی حەوزەکەدا وازیان لێ بهێنیت.

سەرکردەکانی شاری تایەر، پایتەختی فینیقیای کۆن دڵنیابوون لەوەی دەتوانن بەرەنگاری ئەلێکساندەری مەزن بکەن کە خۆرهەڵاتی گرتبوو بەڵام هێرشی نەکردبووە سەر شارەکەی ئەوان، کە کەوتبووە سەر ئاو و باش پارێزراو بوو. ئەوان نوێنەریان نارد بۆ لای ئەلێکساندەر و وتیان هەرچەندە ئەوان وەك ئیمپراتۆر دانی پێدا دەنێن، رێگەی نە بە خۆی و نە هێزەکانی نادەن بێنە ناو تایەر. بێگومان ئەمە تووڕەی کردن و لەو دەستبەجێ گەمارۆیەکی خستەگەڕ. بۆ ماوەی چوار مانگ شار بەرەنگاری ئەوی کرد و لە کۆتاییدا ئەو بڕیاریدا کە ململانێکە ئەوە ناهێنێت و ئەو لەگەڵ تایەرییەکان رێکدەکەوێت بەڵام ئەوان هەنوکە هەستیانکردبوو کە ئەلێکساندەریان خستۆتە دواوە و بێ ئوتار بوون و دڵنیابوون دەتوانن بەرەنگاری بکەن و دانوستانیان رەتکردەوە- لە راستیدا نامەبەرەکانی ئەویان کوشت.

ئەمە ئەلێکساندەری پەست کرد. ئێستا گرنگ نەبوو گەمارۆکە چەند دەخایەنێت یان چ سوپایەکی گەورە پێویست، ئەو سەرچاوەی هەبوو و هەموو شتێکی دەکرد. ئەو پەلامارەکەی ئەوەندە مکوڕانە دەستپێکردەوە کە لەماوەی چەند رۆژێکدا تایەری گرت، سووتاندی و خەڵکەکەی وەك کۆیلە فرۆشت.

تۆ دەتوانیت دەسەڵاتدار بخەیتە دواوە و وای لێبکەیت پابەند بێت و هێزەکانی دابەش بکات، بەڵام سەرەتا تاقی بکەرەوە. بزانە تواناکەیان بدۆزەرەوە. ئەگەر درز بووەی نەبوو- ئەگەر ئەوان بێ رادە بەهێزن- ئەوا بە وروژاندنیان هیچ شتێك نییە بەدەستی بێنیت و شتی زۆر هەیە لەدەستی بدەیت. بە وریاییەوە بڕیار بدە کە چەشنە بۆ کێ دەمێنێتەوە و قەت فرشەکان مەوروژێنە.

## پاسای ژمارە ٤٠

# قیز لە ژمنی خۆڕایی بکەرەوە

**هۆکە**

ئەوەی کە بە خۆڕایی پێشکەشت دەکرێت مەترسیدارە–ئەمە یان فێڵێکی تێدایە یان ئەرکێکی شاراوەی بەدواوەیە. ئەو شتەی کە شایستەیە، شایستەی ئەوەیە پارەی پێبدەیت. بە دانی پارە بە شێوازی خۆت ئەوا لە سوپاسگوزاری، منەت، گوناه و فریو قوتار دەبیت. بەهەمان شێوە زۆرجار ئەوە ژیرانەیە کە تەواوی نرخەکە بدەیت: بۆ گەیشتن بە لێهاتوویەتی و ئاوڕدانی ئەسپەکەت قەدبڕ بوونی نییە. لەپارەکەتدا دەست بڵاو بە و دەستی پێوە مەگرە، چونکە بەخشندەیی نیشانە و موگناتیسی دەسەڵاتە.

**پارە و دەسەڵات**

لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتدا، دەبێ هەموو شتێک بە بنچووکەی خوکمی لەسەر بدرێت و هەموو شتێک نرخی هەیە. ئەو شتەی بە بەلاش یان بە نرخی کەم پێشکەش دەکرێت زۆرجار باجێکی سایکۆلۆژی لەگەڵدایە– هەستی ئاڵۆزی ئەرک، سازش بە کوالیتییەوە، ئەو نائەمنییەی ئەم سازشانە دەیهێنن و هیتر. کەسی بەهێز زوو فێری ئەوە دەبێت پاریزگاری لە سەرچاوە هەرە بەنرخەکەی بکات: سەربەخۆیی و بوار بۆ مەوزن. بە دانی نرخی تەواوەتی، ئەوان خۆیان دوور لە نیگەرانی و گیژدەمووبی مەترسیدار دەپارێزن

ئاوەڵابوون و كشۆك بوون لەبواری پارەدا بەمەمان شێوە بەهای بەخشندەیی سترانیزیمان فێر دەكات، وەك ئەوەی كە دەڵێت "بەخشین كاتێك تۆ شتێك وەردەگریت" بە پێدانی دیارییەكی گونجاو، تۆ وەرگرەكە دەخەیتە حاڵەتی بەرپرسیارێتییەوە بەخشندەیی، خەڵك شل دەكات- بۆ لەخشتەبردن بە بەدەستهێنانی ئاریانگ بۆ بەخشندەیی و دەستبڵاوی، سەرسامی خەڵك بەدەست بێنیت لەكاتێكدا كە هۆشیان لە گەمەكانی دەسەڵاتت پەرت دەكەیت بەوەی كە بەشێوەیەكی ستراتیژی سامانەكەت بڵاو بكەیتەوە، سیحر لە دەرباریەكان دەكەیت، خۆشی دەهێنیتە كایە و هاوپەیمانی بەنرخ دروست دەكەیت

ماسیی چاوچنۆك. ماسی چاوچنۆك دیوە مرۆییەكە لە پارە دەردەهێنێت، ئەوان كە سارد و دڵڕەق، تەنیا قائیمەی حساباتی بێ گیان دەبینن، ئەولیتر تەنیا وەك چەك دەبینن بۆ بەدەستهێنانی سامان، ئەوان پێ بە سۆزەكانی خەڵكدا دەنێن و هاوپەیمانە بەنرخەكان گۆشەگیر دەكەن، كەس نایەوێ لەگەڵ ماسییە چاوچنۆكەكاندا كار بكات و بەدرێژایی ساڵان، ئەوان بە گۆشەگیری دەمێننەوە و زۆرجار لەتێكچوونی خۆیان جار دەدەن

ماسییە چاوچنۆكەكان ئان و كەرەی ساختەچییەكانن، بەهۆی بەكێشبوون بەرەو پارەی ئاسان، ئەوان قوڵایی فریو فێڵ دەدەن و موقم دەبن، ئەوان بۆ فریودانی ئاسانی، چونكە كاتێكی ئەوەندە زۆر بە مامەڵەكردن لەگەڵ ژمارەكاندا بەسەر دەبەن (نەك لەگەڵ خەڵك) كە بەرانبەر سایكۆلۆژیا كوێر دەبن، نە هی خۆشیانەوە یا خۆیان لێ بەدوور بگرە نەر لەوەی بەكارت ببەن یان یاری لەسەر چڵێسییەكەیان بكە بۆ هەبوونی دەستكەوتێ

دێوەرمەی سەقلە خەڵكی بەمیر لە رێگەی تێچووەكەیەوە حوكم لەسەر هەر شتێك دەدەن نەك تەنیا لە سۆنگەی پارەوە بەڵكو لە سۆنگەی كات، شكۆ و ئارامی ئەقڵ، ئەمەش كتومت ئەو شتەیە كە دێوەرمەكانی سەقلە ناتووانن بیكەن ئەوان بە بەفیڕۆدانی كاتی بەنرخ، سۆراحكردنی سەقلەكان، بێ رادە لەبارەی ئەو شتە بیگەران دەبن كە

دەیتوانی بە پارەیەکی کەمتر بەدەستی بێنی لەسەروو ئەمەشەوە، ئەو مرگەبەی سەفقە کە ئەوان دەیکەن زۆرجار کەموکورییە و لەوانەیە پێویستی بە چاککردنەوەی گرانبەها هەبێت. پێدەچێت ئەمانە ئەوبا ئازاری هزیان بدەن، بەڵام تێڕوانینەکانیان بڵاو دەبێتەوە. ئەگەر تۆ بەرەنگاریان نەکەیت ئەوا هەستی نائارامت تووش دەکەن لەمەڕ ئەوەی کە دەبووایە تۆ سەختتر کۆشش بکەیت تا مرجێکی هەرزانترت دەستکەوێت. مشتومڕیان لەگەڵ مەکە و هەوڵیش مەدە بیانگۆڕیت.

ساندیست. ساندیستە داراییەکان گەمەی دەسەڵاتی خراپەکارانە بە پارە ئەنجام دەدەن وەک ڕێگەیەکی سەرکردنی دەسەڵاتەکەیان. بۆ نموونە لەوانەیە ئەوان وات لێبکەن چاوەڕوانی ئەو پارەیە بیت کە قەرزتە لەسەریان، بەڵێنی ئەوەت بدەن کە چێکی پارەکە لە پۆستەکەدایە. یان ئەگەر گرێبەستت لەگەڵ بکەن تێشیان بۆ بکەیت، بەدەموی هەموو لایەنێکی کارەکە بکەن و تووشی سەرئێشەت بکەن. پێدەچێت ساندیستەکان پێیان وابێت کە پارەدان بە شتێک ماف ئەوەمان دەداتی ئازاری فرۆشیار بدەن و بەکاری ببەن. ئەگەر تۆ بایی ئەوەندە بەگبەت بوویت کە لەگەڵیاندا دەرگیر بوویت، ئەو لەوانەیە زیانی دارایی لە دووڕیەوەدا باشتر بێت لەوەی بکەویتە بەر گەمەی وێرانکەری دەسەڵاتیان.

بەخشندەی ڕەمەکی. بەخشندەیی کردارێکی دیاریکراوی لە دەسەڵاتدا هەیە. خەڵکی بەکێش دەکات، شلیان دەکات، دەیانکاتە هاوپەیمان. بەڵام دەبێ ستراتیژییانە بەکار بێت، بە ئامانجێکەوە لە ئەقڵدا. کەچی بەخشندە ڕەمەکییەکان بەخشندەن لەبەرئەوەی دەیانەوێ خۆش بویسترێن و بەرامبەر سەرسام بکەن. بەخشندەییەکەیان ئەوەندە ڕەمەکییانە و داسوانەیە کە لەوانە نییە ئەسحاسی دڵخوازی هەبێت. ئەگەر ئەوان بدەنە یەکێك و هەمووان، بۆچی دەبێ وەرگرەکە هەست بەتایبەتبوون بکات؟ کاتێك تووشی بەخشندەیی کەسێکی وەها دەبیت، زۆرجار هەست بە قورساییەك لەسەر شانت دەکەیت بەرامبەر پێویستییە هەستیە تێربەبووەکەیان.

## سەرپێچی ئەمریکا

پاش ئەوەی فرانسیسکۆ پیزارۆ لە ١٥٣٢دا پیرۆی گرت، ئالتونی لە ئیمپراتۆریەتی ئینکا هەڵرژایە ناو ئیسپانیا و ئیسپانییەکانی هەموو چینەکان خەونیان بە سامانی دەستنەهێنراو نیی لە جیهانی نوێوە. چیرۆکی سەرکردەیەکی هیندی دەستپەچێ بەلای خۆرهەڵاتی پیرۆدا ڵاو بووە کە جارێک لە جاران هەر ساڵە وەک سروتێک خۆی بە تۆزی ئالتون دادەپۆشی و دەچووە ناو دەریاچە. بەرووبی قسەی زاران (ئیل دۆرادۆ)، "پیاوی ئالتون"ی، وەرچەرخاند بۆ ئیمپراتۆریەتێک بەناوی "ئێلدۆرادۆ"، دەوڵەمەنتر لە ئینکا کە تیایدا شەقامەکان بە ئالتون داڕێژران و بینایەکان بە ئالتون داوپۆش کران. ئەم چیرۆکە مەحاڵ دیار نەبوو، چونکە بەدڵنیاییەوە سەرکردەیەک کە دەیتووانی تۆزی ئالتون لەناو دەریاچەدا بەفیڕۆ بدات دەبووایە حوکمی ئیمپراتۆریەتێکی ئالتونی بکات. ئیسپانییەکان بەرووبی گەڕانە سوورخکردنی ئێل دۆرادۆ لەسەرانسەری باکووری ئەمریکای باشوور.

لە شوباتی ١٥٤١دا گەورەترین تیمی سەرباری لەم سەرکێشییەدا بە ڕێبەرایەتی گۆنزالۆی برای پیزارۆ (کوێتۆ)یان لە ئێکوادۆر جێهێشت. ٢٤٠ ئیسپانی بە ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگ ڕێکابیەوە شانەشانی ٤٠٠٠ هیندی وەک دیلەوان، بەرەو خۆرهەڵات بەرێکەوتن. ئەوان ٤٠٠٠ ئار، دە تولێرە لاما و مریکەی ١٠ سەگیشیان پێبوو. بەڵام تیمەکە بەرووبی کەوتە بەر شەستە بارانی کە پێتاکەکەی داڕماند و خۆراکەکەی گەناند. لەهەمان کاتدا، کاتێک کە گۆنزالۆ پیزارۆ هیندییەکانی خستە ژێر پرسیارەوە کە بەدرێژایی ڕێگاکە دیسیبان، ئەوانەی کە بیدەچوو زانیاری بشارنەوە، یان ئەمانەت هیچیان لەبارەی مەملەکە ئاوارەکە نەبیستبوو، ئەو ئەشکەنجەی دەدان و دەرخواردی سەگانی دەدا. دەنگۆی کوشتارچیتی ئیسپانییەکان بەخێرایی لەنێو هیندییەکاندا ڵاو بووە کە بۆیان دەرکەوت تاکە ڕێگەی خۆلادان لە کینەی گۆنزالۆ هەڵبەستنی چیرۆکە لەبارە (ئێل دۆرادۆ) و ڕەوانەکردنییەتی بۆ شوێنێکی زۆر دوور. لەکاتێکدا گۆنزالۆ و پیاوەکانی شوێنی سەرەداوەکانی هیندییەکان کەوتن، ئەوان بەرەو قووڵایی جەنگەڵ ئاراستە دەکران

باران بەردەوام بوو. پیزارۆی گۆنزالۆ شەکەت و برست لێبڕاو بوون. ئێل دۆرادۆیان بیر چووەوە، ئەوان دەیانویست بگەڕێنەوە بۆ کویتۆ. دواجار لە ئۆگەستی ١٥٤٢دا، کەمێک زیاتر لە سەد کەس لە تیمەکە کە لەسەرەتادا هەزاران کەس دەبوون، توانیان ڕێگەی گەڕانەوەیان بدۆزنەوە بەلای دانیشتووانی کویتۆ، پێدەچوو ئەمانە لە دۆزەخەوە هاتبن، جەستەکانیان هەڵدڕاو بوو و پارچە پێستیان لەخۆیانەوە وەرپێچابوو، جەستەیان ئاوسابوو و نەدەناسرانەوە. بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵ و نیوێک ئەوان بەشێوەیەکی نائاسایی گەورە دوو هەزار مایلیان بە پێ بڕیبوو. پارەی زۆری سەرمایەگوزاریکراو لە گەشتەکەدا هیچ ئاکامێکی نەبوو- هیچ نیشانەیەکی ئێل دۆرادۆ و هیچ نیشانەیەکی ئاڵتون نەبوو.

## لێکدانەوە

ئەمابەت پاش کارەساتی گۆنزالۆ پیزارۆ، ئیسپانییەکان گەشت لە دوای گەشتیان ئەنجامدا بۆ دۆزینەوەی ئێل دۆرادۆ. وەکو پیزارۆ، وڵاتگرەکان گوندەکانیان دەسوتاند و تاڵان دەکرد، هیندییەکانیان ئەشکەنجە دەدا، مەرگەی سەختیی وێرانەکراویان دەگرت و بە ئاڵتون برێک نەدەکەوتنەوە. ئەو پارەیەی لەو جۆرە گەشتانە سەرفیان دەکرد نازمێردرێت، لەگەڵ ئەوەشدا سەربارى مەرجەمداریی گەڕانەکە، سیحری فەنتازیاکە بەردەوام بوو.

نەک تەنیا گەڕان بۆ ئێل دۆرادۆ مەرگی ملیۆنان کەسی بەدواوە بوو- هەم هیندی و هەم ئیسپانی- بەڵکو باریدەدەر بوو لە ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ئیسپانی. ئیسپانیا مرجکی بە ئاڵتونەوە گرت. ئەو ئاڵتونەی کە ڕەوانەی ئیسپانیا کرا- و برێکی زۆر بوو لە گەشتی تردا پاش لە کڕینی کەرەستە گرانبەهاکاندا سەرمایەگوزاری کرایەوە نەک بە کشتوکاڵ یان هەر دەستپێشخەرییەکی بەرهەمهێنی تردا. هەموو شارۆچکە ئیسپانییەکان چۆڵ بوون لەکاتێکدا کە خەڵکیان بەرەو دۆزینەوەی ئاڵتون دەڕۆیشتن. کێڵگەکان داڕمان و سوپ سەربازی نەمابوو بۆ جەنگەکانی ئەوروپا. بە کۆتایی هاتنی سەدەی حەڤدە، تەواوی وڵات بە ڕادەی برێکەی میوەی دانیشتووان کەم بووەوە. شاری مەدرید

له دانیشتووانی ٤٠٠٠٠ەوە کەم ببووەوە بۆ ١٥٠٠٠ به کەمبوونەوەی بازرگانی هەوڵەکان بەدرێژایی ساڵان، ئیسپانیا کەوتە ناو ئاولیبوونێک کە گەڕانەوەی نەبوو

دەسەڵات پێویستی بە خۆدیسپلین هەیە ئاسۆی سەمان، بەتایبەت سامانی ئاسان و ناکاو، هەستەکان دەشێوێنێت. دەوڵەمەندانی لەپڕ و ناکاو باوەڕیان وایە کە هەمیشە زۆرتر موسکینە. زەمی بەلاش، ئەو پارەیەی کە دەکەوێتە کۆشی تۆ، هەر لەم نزیکانەیە

لەم وەحصەدا، خەڵکی چاوچنۆک هەموو ئەو شتە فەرامۆش دەکەن کە دەسەڵات بە ڕاستی پێنەوە نەدەن: خۆکۆنترۆڵکردن، ئیرادەی باشی ئەوسیتر و هیتر. تێبگە بە حاڵەتێکی ئاوارتەوە– مردن– هیچ گۆڕانکارییەکی چارەنووس بەخێرایی نایەت. سامانی لەپڕ بەدەگمەن بەردەوام دەبێت، چونکە لەسەر بناغەیەکی سەو بونیادی نەگرتووە قەت مەهێڵە شەهوەت بۆ پارە بۆ دەرەوەی قەڵای پارێزەر و بەرگەگری دەسەڵاتی واقیعی بەکێشت بکات. دەسەڵات بکەرە بە ئامانج و پارە ڕێگەی خۆی بەرەو تۆ دەدۆزێتەوە. نێل بزرانو بۆ گەمژە و ساویلکەکان واز لێبێنە

**پەیڕەوی لە پاساکە**

بەماوەیەکی زوو پاش ئەوەی بارۆن جەیمز ڕۆسچیلد لە ١٨٢٠ەکاندا سامانەکەی لە پاریس پێکەوە نا، ئەو ڕووبەڕووی کێشە بێ چەندوچوونەکەی بووەوە: چۆن دەشێ جوولەکە و ئەڵمانییەت، بێگانەیەکی تەواو بۆ کۆمەڵگەی فەرەنسی، ڕێزی چینە باڵا لەبێگانەترسەکانی فەرەنسا بەدەست بێنێت؟ ڕۆسچیلد پیاوێک بوو لە دەسەڵات تێدەگەیشت– ئەو زانی سامانەکەی پێگەی پێدەبەخشێت، بەڵام ئەگەر لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەر گۆشەگیر بووایە نە پێگەکەی نە سامانەکەی درێژەی نەدەبوو. بۆیە ئەو ڕوانییە کۆمەڵگەی ئەو سەروەختە و پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ چ شتێک دڵی ئەوانی پێ دەبەخشێت

خێر و سەدەقە؟ فەرەنسییەکانی گرنگییەکی کەمیان پێ نەدەدا. کاریگەریی سیاسی؟ ئەو هەنوکە هەیبوو و ئەمە تەنیا خەڵکی گومانایتر دەکرد لەبەرانبەریدا. ئەو

چەندین سەدە کۆن بوو، بیرۆکەی ئەمەی کە پارە دەسەڵات دەکڕێت لەدژی هەموو بنەما دیموکراتییە باڵنوارەکانی شار بوو. کۆسیمۆ دی مێدیسی، یەکەمین کەسی خانەوادەکە کە ناوبانگی بەدەستهێنا، بە مانەوە بەشێوەی نەناسراوی و نەبینراوی، لەسەر ئەمە کاری کرد. ئەو تەنانەت سامانەکەی دەرنەخست. بەڵام بەهاتنی ئەو کاتەی کە لۆرێنزۆی نەوەی گەورە بوو، لە ١٤٧٠کاندا سامانی خانەوادەکە زۆر گەورە بوو و کاریگەرییەکەی زۆر بەرچاو بوو و چیتر نەدەشاردرایەوە.

لۆرێنزۆ بە شێوازی خۆی کێشەکەی حەل کرد بەوەی کە ستراتیژی هۆش پەرتکردن پەیڕەو بکات کە لەو سەروەختەوە حورمەتی خەڵکی سامانداری کردبوو. ئەو بووە دیارترین پاڵپشتی ئەو هونەرمەندانەی کە مێژوو ناسیوونی. ئەو نەک تەنیا پارەیەکی زۆری لە تابلۆکانی سەرفکرد، بەڵکو باشترین شاگردی قوتابخانەکانی بۆ هونەرمەندانی گەنج دروستکرد. لە یەکێک لەم قوتابخانانەدا بوو کە مایکل ئەنجیلۆ بۆ یەکەمین جار سەرنجی لۆرێنزۆی راکێشا کە بانگهێشتی هونەرمەندەکەی کرد بێت و لەماڵەکەیدا بژیت. ئەو هەمان شتی لەگەڵ لیۆناردۆ دا ڤینچی کرد. هەر کە کەوتنە ژێر باڵی ئەو، مایکل ئەنجیلۆ و لیۆناردۆ بەوەی کە بوونە هونەرمەندی بەئەمەک بۆی پاداشتی بەخشندەییەکەیان دایەوە.

## لێکدانەوە

بێگومان لۆرێنزۆ کەیفی بە هونەرەکان دەهات، بەڵام پاڵپشتییە داراییەکەی بۆ هونەرمەندی دەلالەتێکی پراکتیکیشی هەبوو کە خۆی باش لێی بەئاگا بوو. لە فلۆرێنسی ئەو سەروەختەدا، کاری بانکی شێوازێکی پارە پەیداکردن بوو کەمترین رەغبەتی لەسەر بوو و بەدڵنیاییەوە سەرچاوەیەکی بەرزی دەسەڵات نەبوو. هونەرەکان لەسەرێکی ترەوە بوون، جەمسەری شێوە دینییانەی بەرزبوونەوە. بە سەرفکردنی پارە لە هونەرەکان، لۆرێنزۆ راوبۆچوونی خەڵکی لەمەڕ سەرچاوەی نزیکی سامانەکەی لاواز کرد و خۆی لە خانەدانیدا رووپۆش کرد. بەکارهێنانێکی ستراتیژی بەخشندەیی لەوە باشتر

نییە کە هۆش و سەرنج لەم واقیعە ناخۆشە پەرت نەکەیت و خۆت لە بەرگی هومەر یان نایمیدا بپێچیتەوە.

وێنە رووبار بۆنەوەی خۆت بپارێزیت یان سەرچاوەکە پڕگار نەکەیت، ملۆکی نەکە ئاوەکان سارد و کوشندە دەبن تەنیا خراپترین زیندەوەرەکانی ژیان دەتوانن لەو ئاوە چەقەبەستووانەدا بژین هیچ شتێک گەشتنان پیدا ناکت، هەموو بازرگانی دەوەستێت کاتێك ئاو دەڕژێت و لە جوڵەدایە، زۆرووبەندی، سامان و دەسەلات لە بارەی گەورە و گەورەتردا بەرهەم دێنێت دەبێ رووبارە ناوبەناو لافاو هەڵستێنێت بۆئەوەی شتە ناشەکان پەیدا نەبن

دەسەلات مرۆڤی چووك و بەریل، گەمژەیەکی گەورەیە و کەسێك کە لە پێگە بەرزەکاندایە هیچ کام لە خراپەکانی ئەوەندەی چارچێوکییەکەی ریابەخش نیی کەسی چووك نە دەتوانێ رەوی داگیر بکات نە پێگەی گەورەیی بگریت، چونکە ئەو هێندە هاوڕێی نیی کە بتوانێ ئیرادەی لەگەڵیاندا بکاتە کرداری هەر کەسێك بیەوێ هاوڕێ بەدەست بێنێت نابێ مومتەلەکاتەکەی هۆش بوێت بەڵکو دەبێ بە ڕێگەی دیارییە گرنجاوەکان هاوڕێ بەدەست بێنێت چونکە بەهەمان شێواز کە موگناتیس ئاسن بەلای خودا بەکێش دەکات، ئەو ئاڵتون و زیوەی مرۆڤ دەیبەخشێت، دڵی مرۆڤەکان رادەکێشێت

(دی لۆریس، ١٢٠٠–١٢٣٨)

**پێچەوانەبوونەوە**

دەسەڵاندار قەت بیری ناچێت کە ئەو شتەی بە بەلاش پێشکەش دەکرێت بەشێوەیەکی حەتمی فێڵە ئەو هاوڕێیانەی کە چاکەیەك دەکەن بەبێ ئەوەی داوای کرێ بکەن ئەوا دوایی شتێکی زۆر گەورەتر لەو پارەیە داوا دەکەن کە تۆ پێت دەبەخشن سەفقەکە کێشەی شاراوەی هەن، هەم مادی و هەم سایکۆلۆژی، فێر بە پارە بدەیت و پارەی باش بدەیت

لەلایەکی ترەوە، ئەم یاسایە دەرفەتی گەورە دەڕەخسێنێت بۆ فریودان ئەگەر لەلاکەی ترەوە پیادەی نەکەیت پیشکەشکردنی ژەمی بەلاش پشکی ساختەچییە لە بازرگانیدا

# یاسای ٤١

## خۆت لە پێ خستنە ناو پێڵاوی کەسی گەورە بەدوور بگرە

### حوکم

ئەوەی کە یەکەم جار ڕوودەدات هەمیشە باشتر و ڕەسەنتر دیارە لەوەی کە دوایی دێت. ئەگەر تۆ لە کەسێکی بەناوبانگەوە بێیت یان باوانێکی بەناوبانگت هەبێ، دەبێ دووقاتی دەستکەوتی ئەوانت هەبێت بۆئەوەی لەوان تێپەڕبیت. لە سێبەری ئەواندا بزر مەبە، ئەگینا لە ڕابردوویەکدا گیر دەخۆیت کە دەستکردی خۆت نییە. ناو و شوناسی خۆت بونیاد بنێ لە ڕێگەی گۆڕینی ڕێڕەوەکەوە. باوکی زاڵ لەنێو ببە، میراتەکەی بچووک بکەرەوە و بە شێوازی خۆت دەسەڵات بەدەست بێنە.

### سەرپێچی لە یاساکە

کاتێک لویسی شانزە مرد، لە ١٧١٥دا، پاش حوکمڕانییەکی پەنجاوپێنج ساڵی، هەموو چاوەکان لەسەر نەوەکەی و جێگرەوە هەڵبژێردراوەکەی بوون، واتە لویسی پانزەی نەبیرە. ئایا کوڕەکە، کە ئەو کاتە تەمەنی تەنیا پێنج ساڵان بوو، وەکو پاشای خۆر مەزن دەبوو؟ لویسی شانزە وڵاتی لە لێواری شەڕی ناوخۆوە وەرچەرخاندبوو بۆ دەسەڵاتێکی مەزن لە ئەورووپا. دوا ساڵانی حوکمڕانی قورس بووە - ئەو پیر و ماندوو

بوو– بەڵام هیوای ئەوە هەموو ساڵەکە ببێتە فەرمانڕەوایەکی بەهێز کە خاکەکە دەبوژێنێتەوە و ئەو سافەیە مسۆگەر دەکات کە لویسی چواردە دایبوو.

بەدبەختانە ساڵەکە باشترین ئەقڵەکانی فەرەنسای وەکو مامۆستا بۆ دیاریکران، واتە ئەو پیاوانەی کە لە هونەرەکانی دەوڵەتمەداریدا پێشەنگییان دەکرد، لەو مێتۆدانەی کە پاشای خۆی پێی پەسەند بوون. هیچ شتێک لە پەروەردەکەیدا فەرامۆش نەکرا. بەڵام کاتێک لویسی پانزە لە ١٧٢٦دا هاتە سەر تەخت، گۆڕانکارییەکی لەپڕی بەسەردا هات: ئەو چیتر نەدەیویست بخوێنێت، یان ئەوانیتر دڵخۆش بکات یان خۆی بسەلمێنێت. ئەو لە ترۆپکی وڵاتێکی گەورەدا بەتەنیا وەستا، سامان و دەسەلات لەژێر فەرماندەیی ئەودا بوون، ئەو دەیتوانی ئەوە بکات کە دەیەوێت.

لە ساڵانی یەکەمی حوکمڕانییەکەیدا، لویس خۆیدایە چێژ و خۆشی، حکومەتی خستە ناو دەستانی وەزیرێکی متمانەپێکراو، ئاندرێ هێرکیول دی فلێوری. ئەمە بێکەڕلییەکەی کەمی لێکەوتەوە، چونکە ئەو گەنجێک بوو کە پێویستی بەوە بوو خۆشی و ڕابواردنی خۆی بکات و دی فلێری وەزیرێکی باش بوو. بەڵام بەرە بەرە ڕوون بووەوە کە ئەمە تەنیا قۆناغێکی تێپەڕ نییە. لویس هیچی بایەخی بە حوکمڕانی نەدەدا. بێکەڕلیی سەرەکی ئەو دارایی فەرەنسا یان جەنگێکی مومکین نەبوو لەگەڵ ئیسپانیا، بەڵکو بێزاری بوو. ئەو نەیدەتوانی بەرگەی بێزاری بگرێت و کاتێک خەریکی ڕاوە ئاسک نەبوو یان دوای کچانی گەنج نەدەکەوت، ئەوا کاتی لەسەر مێزەکانی قومار بەسەر دەبرد و پارەیەکی زۆری لە تاکە شەوێکدا دەدۆڕاند.

دەربار، وەک هەمیشە، لە ڕەوقی فەرمانڕەواوە ڕاما. قومار و ئاهەنگەکانی پارە بەفیڕۆدان بوونە خوویەک. دەرباریبەکان هیچ خەمی ئایندەی فەرەنسایان نەبوو. ئەوان وزەی خۆیان بۆ پاشای سەنجڕاکێش تەرخان کرد، هەڵپەی ئاستی و موچەی خانەنشینی و پۆستی کابینەیان دەکرد. مشەخۆر ڕژانە ناو کۆشک و قەرزەکانی دەوڵەت کەڵەکە بوون.

له ١٧٤٥دا كەوتە داوی خۆشەویستی مەدام دی پۆمپادۆر، ژنێکی سەر بە چینی دەوڵەمەند کە لە ڕێگەی سیحری جوانییەکەیەوە بیووە مەعشوقەی شاهانە. ئەو بەهەمان شێوە بووە داوەری فەرەنسا بۆ ڕەونەق و شانس. بەڵام مادەم ئامادەیی سیاسیشی هەبوو، و ئەو دواجار وەک سەرۆک وەزیرانی نارەسمی وڵات دەرکەوت- ئەو بوو، نەک لویس، کە دەسەڵاتی دەرکردن و دانانی پۆستە گرنگەکانی وڵاتی بەدەستەوە بوو.

لەکاتێکدا کە بەتەمەنداچوو، لویس تەنیا پێویستی بە لاداتی تر هەبوو. ئەو لەسەر زەوی ڤێرسای سەرای خانەیەکی بونیادنا کە هەندێ لە جوانترین کچە گەنجەکانی فەرەنسای دەگرتەخۆ. پێڕەوی زنجیرەییتی بەردەوام ڕێگەی بۆ لویس خۆش دەکرد، پاش مردنی مادەم پۆمپادۆر لە ١٧٦٤دا، مادەم دو باری وەکو مەعشوقەی شەهانە شوێنی ئەوی گرتەوە کە بەڕووی مەسەر دەربارەدا زاڵ بوو و وەکو پۆمپادۆر دەستیکرد بە تێکەڵبوون بە کاروباری سیاسیی دەوڵەت. ئەگەر وەزیرێک بەدڵی ئەو کاری نەکردایە ئەوا هۆی بەدەرکردنی دەدا.

ئەو دروشمەی کە لێکرا بە حوکمڕانی لویسەوە ئەمە بوو، "پاش من لافاو" یان، با فەرەنسا لە پاش من بڕوات. لە ڕاستیشدا لویس ڕۆیشت. لە ١٧٧٤دا پاش ئەو هەموو گەندەڵی و داوێن پیسییە، وڵاتەکەی و داراییەکانی لە پەرتەوازەییەکی تەواودابوون. نەوەکەی ئەو، لویسی شازدەی دووهەم تەخت و تاراجێکی بۆ مایەوە کە پێویستی بڕێکی بە ڕیفۆرم و سەرکردەیەکی بەهێز هەبوو. بەڵام لویسی شازدە لاوازتریش بوو لە باپیرەی و تەنیا دەیتووانی تەماشا بکات لەکاتێکدا کە وڵات خرایە ناو شۆڕشەوە. لە ١٧٩٢دا ئەو کۆمەڵەی لەلایەن شۆڕشی فەرەنسییەوە دامەزرا کۆتایی پاشەیەتی ڕاگەیاند و ناوێکی نوێی بەخشییە پاشا "دوا لویس". چەند مانگێک دواتر ئەو ئەژنۆی بەبەردەم گیلۆتینی دادان، ئەو کەللە سەرەی کە بەڕووی دەپەڕێنرا هەموو تێشک و پووچکیی دەسەڵاتی بێدەرچوو کە پاشای خۆر لە ناحەکەدا سەرمایەگوزاری کردبوو

**لێکدانەوە**

لە وڵاتێکەوە کە لە دەیەکانی ١٦٤٠ەکاندا کەوتبووە ناو شەڕی ناوخۆ، لویسی شانزە بەهێزترین فەرمانڕەوای لە ئەورووپادا هێنابووەکایەوە. ژەنەراڵە گەورەکان لە ئامادەیی ئەودا دەلەرزین. خارجیان چێشتلێنەرێک لە ئامادەکردنی چێشتێکدا هەڵەی کرد و خۆی کوشت تەنیا بۆئەوەی ڕووبەڕووی ڕق و تووڕەیی پاشا نەبێتەوە. لویسی شانزە زۆر مەعشوقەی هەبوو، بەڵام دەسەڵاتی ئەوان لە ژووری خەوتندا کۆتایی دەهات. ئەو دەرباری پڕ کرد لە بێهاتووترین ئەقڵەکانی سەردەمەکە. ڕەمزی دەسەڵاتەکەی بریتی بوو لە ڤێرسای. بە ڕەتکردنەوەی قبوڵکردنی کۆشکی باپیرانی، لۆڤەر، کۆشکی خۆی بونیادنا کە ڕەمزێک بوو بۆئەوەی کە ئەمە سیستەمێکی نوێیە بونیاتی ناوە و پێشینەی نییە. ئەو ڤێرسای کردە سەنتەری حوکمڕانییەکەی، شوێنێک کە هەموو بەهێزەکانی ئەورووپا ئیرەییان پێدەبرد و بە هەستێکی سەرسامییەوە سەردانیان دەکرد. لە جەوهەردا، لویس بۆشاییەکی گەورەی گرت– پاشایەتی داڕزاوی فەرەنسا– و بە دەسەڵاتی درەوشاوە و ڕەمزی خۆی پڕی کردەوە.

کەچی لویسی پانزە ڕەمزی چارەنووسی هەموو ئەوانەیە کە شتێکی گەورەیان بۆ دەمێنێتەوە یان کە شوێنپێی کەسێکی گەورە هەڵدەگرن. ئاسان دەبێ بۆ کوڕێک یان جێگرەوەیەک کە نیش لەسەر بناغەیەکی گەورە بکات کە بۆی جێهێڵراوە، بەڵام لە فەرمانڕەوای دەسەڵاتدا پێچەوانەکەی ڕاستە. کوڕە بەنازەکە تەفرەبەر هەمیشە میرات بەفیڕۆ دەدات، چونکە ئەو بە پێویستی بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەک دەست پێناکات. وەک مەکیاڤیلی دەڵێت زەروورەت ئەو شتەیە کە پیاوان ناچار دەکات هەنگاو بنێن و هەر کە زەروورەت نەما، تەنیا داڕزان و گەمین دەمێنێتەوە.

لویسی پانزە تەنیا یەک ڕێگەی دەرچوونی لەو تەڵەیە هەبوو کە چاوەڕێی کرد یان جێگرەوەی پیاوێکی وەکو پاشای خۆری دەکرد. ئەمەی کە لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە لە هیچەوە دەست پێبکات، ڕابردوو و میراتەکەی بەدناو بکات و بە ئاراستەیەکی تەواو نوێدا

پەرە بکات، جیهانی خۆی بخولقێنێت. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە تۆ بژاردەیەکت هەیە، باشتر دەبێت بەئەولوی خۆت لەبارودۆخێك بەدوور بگریت. خۆت بخەیتە ئەو شوێنەی بۆشایی دەسەڵات هەیە کە تیایدا دەشێ تۆ ئەو کەسە بیت کە سیستەم لە پەشێوی دروست دەکات بەبێ ئەوەی پێویست بکات کێبڕکێ لەگەڵ ئەستێرەیەکی تر بکەیت لە ئاسماندا. دەسەڵات بەمە بەرەی گەورەتر لە خەڵکی تر دەربکەویت و کاتێك لە سێبەری باوکدا، پەشا، بیر دەبێت لەوانە نییە بتوانیت ئامادەییەکی وەها بەرجەستە بکەیت.

*بەڵام کاتێك ئەوان دەستیانکرد بە بۆماوەسکردنی سەروەری، منداڵەکان بەخێرایی لە باوکیان خراپتر بوون و زۆر دوور لە هەوڵدان بۆ یەکسانبوون بە فەزیلەتەکانی باوکیان، وەهایان دانا کە لەگەڵ میر هیچ پەیوەستییەکی تریان نییە جگە لەوەی لە تەمەڵی، سەرەڕایی و هەموو جۆرە چێژێکی تردا لەوانیتر باشتر بن*

**میکۆلۆ ماکیاڤیللی ١٤٦٩–١٥٢٧**

## پەیرەوبکردن لە پاسکە

ئالێکساندەری مەزن وەك پیاوێکی گەنج سۆزێکی زاڵی هەبوو–رقێکی چڕ لەبەرامبەر باوکی، پاشا فیلیپی مەسەدۆنیا. ئەو رقی لە ستایلی حەرمزنامێزی ریرەکانەی فیلیپ بۆ فەرمانڕەوایی، وتارە توندەکانی، خواردنەوە و داوێن پیسی و شێوازی تری بەفیڕۆدانی کات بوو. ئالێکساندەر زانی کە دەبوایە خۆی بکاتە دژی باوکە باڵادەستەکەی. ئەو خۆی ناچار دەکرد بوێر و بێباك بێت، ئەو زمانی کۆنترۆڵ دەکرد و دەبووە پیاوی چەند وشەیەك و ئەو کاتی مەترحی بە سۆزاهکردنی ئەو خۆشییانە بەسەر نەدەبرد کە هیچ شکۆیەکیان پێوە نەبوو. ئالێکساندەر بەهەمان شێوە رقی لەو ڕاستییە بوو کە فیلیپ زۆربەی یۆنانی گرتبوو. جارێکیان وتی: "باوکم بەردەوام دەبێت لە وڵات گرتن تا ئەو کاتەی کە هیچ شتێکی سەرووئاسایی نامێنێ من بیکەم". لەکاتێکدا کە کوڕەکانی تری پیاوە بەهێزەکان بەقەناعەت بوون بەرامبەر بە میرات خستنەوە و بەسەر بردنی ژیانێکی

خۆشگوزەرانی، ئالێکساندەر تەنیا دەیویست پێشی باوکی بداتەوە، لە ڕێگەی تێپەڕاندنی دەستکەوتەکانی، ناوی فیلیپ لە مێژوو بسڕێتەوە.

ئالێکساندەر سەری دەخورا بۆ ئەوەی پیشانی ئەرایبێزی بدات کە چەندێک لە باوکی باشترە. بازرگانێکی ئەسپی خەڵکی تێسالیا جارێکیان ئەسپێکی جەلاتی بەناوی (بوسیفالوس) هێنا بۆ فرۆشتنی بە فیلیپ. هیچ کام لە لە دەست و پێوەندەکانی پاشا نەیاندەتوانی لە ئەسپەکە نزیک ببنەوە -زۆر دڕندە بوو- و فیلیپ سەرکۆنەی بازرگانەکەی کرد لەبەرامبەر هێنانی جوانوویەکی وەها بێ کەڵک. ئالێکساندەر هاتە دەنگ و وتی "چ ئەسپێک لەدەست دەدەن لەبەرامبەر ویستی لێهاتوویی و بوێریەت بۆ بەڕێوەبردنی!" کاتێک ئەو چەند جارێک ئەم قسانەی کردبوو، فیلیپ تەحەدای کردبوو و پێی وتبوو سواری ئەسپەکە بێت. ئەو بانگی بازرگانەکەی کردەوە، بەهیبی هیوای ئەوەی حواست کوڕەکەی بە پیسی بەر بێتەوە و وانەیەکی تاڵ فێر بێت. بەڵام ئالێکساندەر ئەو کەسە بوو وانەکەی دادەدا؛ نەک تەنیا سواری بوسیفالوس بوو، ئەو توانی لێیخوڕێت و دەستەمۆی بکات. دەرباریەکان چەپڵەیان بۆ لێدا بەڵام فیلیپ لەناخەوە دەکوڵا، ئەو کوڕێکی نەدەبینی بەڵکو ڕکابەرێکی بەدی دەکرد.

**لێکدانەوە**

ئالێکساندەر نوێنەرایەتی جۆرێکی بێ ڕادە نائاسایی دەکرد لە مێژوودا. کوڕی پیاوێکی سەرکەوتوو و بەناوبانگ بوو کە دەیتوانی لە شکۆ و دەسەڵاتدا تێپەڕێنێت. هۆکاری ئەم جۆرە سادەیە. زۆرجار باوک دەتوانێ سامانەکەی کەڵەکە بکات، چونکە ئەو بە هیچ یان بە شتێکی کەم دەستپێدەکات. پاڵنەرێکی بێ چەندوچوون ناچاری دەکات سەرکەوتوو بێت- ئەو هیچی نییە بە تەڵەکەبازی و لاساری لەدەستی بدات. و باوکێکی بەناوبانگی خۆی نییە ڕکابەرێتی لەدژ بکات. ئەم جۆرە پیاوە هۆکارێکی هەیە بۆ باوەڕهێنان بەخۆی- باوەڕهێنان بەوەی کە شێوازی ئەنجامدانی شتەکانی باشترینە، چونکە دواجار بۆ ئەم کردارە بووە.

کاتێک پیاوێکی وەک ئەمە کوڕێکی هەیە، دەبێتە باڵادەست و سەرکوتکەر، ولەکاتی بەسەر کوڕەکەیدا دەسەپێنێت کە ژیانی لە بارودۆخێکی جیاواز لەو بارودۆخانە دەست پێدەکات کە تیایدا باوک خۆی دەستپێکردبوو.

لەبری ئەوەی ڕێگە بدات کوڕەکە بە ئاراستەیەکی نوێدا بڕوات، باوک هەوڵ دەدات بیخاتە شوێنی خۆی، لەوانەشە لەژێرەوە هیواخواز بێت کوڕەکەی شکست بێنێت، وەک چۆن فیلیپ تا ڕادەیەک دەیویست ئالیکساندەر لە ئەسپەکە بەر بێتەوە. باوکان نیرەیی بە زیندوویتی و گەنجێتی کوڕەکانیان دەبەن و ئارەزوویان کۆنترۆڵکردنیانە. کوڕانی ئەو پیاوانە دەستەمۆ و بەحەزەر دەبن، ترسی ئەوەیان لا پەیدا دەبێت ئەوە لەدەست بدەن کە باوکانیان بەدەستیانهێناوە.

## کلیلی دەسەلات

لە زۆرێک لە مەملەکەتە دێرینەکاندا، بۆ نموونە بەنگال و سوماترا، پاش ئەوەی پاشا بۆماوەی چەند ساڵێک فەرمانڕەوایی کردبوو ڕەعیەکانی لەسێدارەیان دەدا. ئەمە تا ڕادەیەک وەک سروتێکی نوێبوونەوە دەکرا، بەڵام بەهەمان شێوەش بۆ ڕێگرتن بوو لە بەهێزبوونی زۆر- لەبەرئەوەی پاشا بەشێوەیەکی گشتی هەوڵی دەدا سیستەمێکی جێگیر بونیاد بنێت لەسەر حسابی خێزانەکانی تر و کوڕەکانی خۆی. لەبری پارێزگاری لە هۆزەکە و ڕێبەرایەتیکردنی لە کاتەکانی جەنگدا، ئەو هەوڵیدەدا بەسەریدا زاڵ بێت. بۆیە ئەو ئامردن لێی درا، یان لەسروتێکی تیرۆتەسەلدا لەسێدارەیاندا. ئێستا کە ئەو چیتر بوونی نەبوو، دەکرا وەک خودا بپەرسترێت. لەهەمان کاتدا ڕێگە بۆ سیستەمێکی گەنجانە و نوێ خۆش ببوو بۆئەوەی خۆی بونیاد بنێت.

رابردوو ڕێگرە لەوەی پاڵەوانی گەنج جیهانی خۆی دروست بکات- دەبێ ئەو شتە بکاتە کە باوکی کردی، مەمانەت پەش ئەوەش کە باوک مردووە یان بێ دەسەڵاتە. دەبێ پاڵەوان بچەمێنەوە و لەپێش پێشینیەکەی چۆک دابدات و ملکەچی بەریت بێت. ئەوەی کە لە ڕابردوودا شکست بووە دەبێت بگوازرێنەوە بۆ ئێستا، ئەگەرچی بارودۆخیش تا

ڕادەیەکی زۆر گۆڕانێت ڕابردوو بەهەمان شێوە فورسایی ئەو پاڵەوانە بەو مەرجانە کەم
دەکاتەوە کە ئەو دەترسێت لە لەدەستدانی و ئەم دەستەمۆ و بەهەرەو دەکات

دەسەڵات بەندە بە توانای پڕکردنەوەی بۆشایی، گرنتی بوارێك کە لە فورسایی مردووی ڕابردوو پاك کراوەتەوە. تەنیا پاش ئەوەی فیگەری باوك بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ڕێك کرا تۆ پاشاییەکی پێویستت هەیە بۆ دروستکردن و بونیادنانی سیستەمێکی نوێ. ژمارەیەك ستراتیژ هەن کە تۆ دەتوانیت بۆ بەدەستهێنانی ئەمە پەیڕەوییان بکەیت لەوانەیە ئاسانترین ڕێگە بۆ ڕاکردن لە سێبەری ڕابردوو بریتی بێت لە بچووککردنەوەی، یاری کردن لەسەر دژایەتی ناڕەحەتییانە لەنێوان نەوەکاندا، وروژاندنی گەنج لەبەرانبەر پیردا بۆ ئەمە پێویستت بە فیگەرێکی بەتەمەنتر هەیە بۆ هێرشکردنە سەر. ماو تسی تۆنگ بە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کەشوورێکدا کە بەتوندی بەرەنگاریی گۆڕانکاری دەکرد، یاری لەسەر کینەی کپکراو کرد لەدژی ئامادەیی هۆسەپێنانەی کۆنفوشیوسی ڕێزلێنراو لە کەلتووری چینیدا. جۆن ئێف کەنەدی مەترسییەکانی بریبوون لە ڕابردووی دەولی ئەو بەشێوەیەکی ڕیشەیی سەرۆکایەتی خۆی لەوەی پێشینەکەی، دوایت ئایزنهاوەر و هەروەها لە دەیەی پێشتر، ١٩٥٠کان جیا کردەوە کە ئایزنهاوەر نوێنەرایەتی دەکرد. بۆ نموونە کەنەدی گەمەی بێتام و باوکانەی گۆلفی نەدەکرد- ڕەمزی حاسەنشینی و ئیمتیاز و سۆزی ئایزنهاوەر لەبری ئەمە، ئەو لە سەر فریزی کۆشکی سپی یاری فوتبۆلی کرد. لە هەموو ڕوویەکەوە ئیدارەکەی ئەو نوێنەری ڕیسەرویتی و گەنجێتی بوو. گەنج بە ئاسانی ڕووبەڕووی پیر دەکرێتەوە، چونکە ئەوان ئامەزرۆی ئەوە شوێنی خۆیان لە جیهاندا بکەنەوە و ڕقیان لە سێبەری باوکانیانە

وێنە باوك. ئەو سێبەری خۆی بەسەر مناڵەکانیدا ڕادەکشێنێت، زۆر پاش ئەوەی کە ڕۆیشتووە، لە حاڵەتێکی کۆنترۆڵدا دەیانهێڵێتەوە، ڕۆحییەتی گەنجانەیان دەکوژێت و ناچاریان دەکات هەمان ئەو ڕێچکە سواوە بگرنە بەر کە خۆی گرتوویە بەر. فێڵەکانی زۆرن. لە هەر دووڕیانێکدا دەبێ تۆ باوك لەناوبەریت و لە سێبەرەکەی بچیتە دەرەوە.

دەسەڵات بەناگا بە لەوەی پێ بنێیتە پێڵاوی پیاوە گەورەکان– دەبێ تۆ جووڵانی ئەوان بەدی بێنیت بۆ ئەوەی لێیان تێبەڕیت ئەوانەی کە شوێنیان دەکەون وەک لاسایییکەرەوە دەبینرێن گرنگ نییە چەندێک ماندوو دەبیت ئەوان قەت ئەو لووتکەیە داناین. شارەزابەتییەکی ناوازەیە ڕێگەیەکی نوێ بۆ لێهاتوویی بدۆزیتەوە، ڕێبەرێکی مۆدێرن بۆ دەرکەوتنی بونیاد بنێیت. ڕێگەی زۆر هەن بۆ ناوازەیی، هەموویان ڕێگەی باش نین بۆ پیاوانیش. نازەترینیان دەشی سەخت بێت، بەڵام ئەمانە زۆرجار لەدیدی بەرەو مەزنایەتی

(بالتاسار گراسیەن، ١٦٠١–١٦٥٨)

## پێچەوانەبوونەوە

دەشێ سێبەری گەورەیەکی پێشوو بەکار بێت بۆ کەڵک لێوەرگرتن ئەگەر وەک هێڵێک، وەک تاکتیکێک هەڵبژێردرا کە بکرێت هەڵوەبڕێت هەر کاتێک دەسەڵاتی بۆ تۆ مسۆگەر کرد. ناپۆلیۆنی سێیەم ناو و ئەفسانەی ناپۆلیۆن بۆناپەرتی مامەگەورەی بەکارهێنا بۆئەوەی یارمەتی بدات تا ببێتە یەکەمین سەرۆک و پاشان ئیمپراتۆری فەرەنسا. لەگەڵ ئەوەشدا، هەر کە گەیشتە سەر تەخت، بەحیزایی پیشانیدا کە حوکمڕانییەکەی چەندێک جیاواز دەبێ و وریا بوو لەوەی وا لەخەڵکی نەکات چاوەڕێ بێت ئەو بەرولییانە بگرێت کە بۆناپەرت پێیان گەیشتبوو.

زۆرجار ڕابردوو هەندێ ڕێگەی تێدایە، هەندێ تایبەتمەندی هەن کە فۆرستەوەیان شایستەیە کە گەمژانە دەبێت ڕەتیان نەکەینەوە تەنیا بۆئەوەی خۆت جیا بکەیتەوە. ئەمانەت ئەلیکماندەری مەرسێش دانی بە شارەزایەتی مۆکندا نابوو لە ڕێکخستنی سوپادا و ئەم شارەزایەتییەی بەکاریش هێنایەوە. وا خۆنواندن کە شتێ جیاوار لە کەسی پێش خۆت دەکەیت زۆر منداڵانەیە و لە ڕاستیدا لەکۆنتڕۆڵ دەرچوونە، مەگەر ئەوەی خۆت لۆژیکی تایبەت بە خۆت نەبێت

ئولجار، زۆرجار کارێکی ژیرانەیە چاوێکت لەسەر گەنج بێت، واتە ڕکابەرانی ئایندەت لە دەسەڵاتدا! وەک چۆن تۆ هەوڵ دەدەیت لە باوکت فورتارت بێت، ئەوانیش بەرووی هەمان فێڵ لە تۆ دەکەن، هەموو ئەو شتەی بەدەست هێناوە بەلاوە دەنێن، وەک چۆن تۆ بە یاخیبوون لە ڕابردوو بەرز دەبیتەوە، چاوێکیشت لەوانە بێت کە لە خوارەوەڕا بەرز دەبنەوە و نەدەیت شانسی ئەوەیان هەبێت هەمان شت بەرامبەر تۆ بکەن.

## یاسای ژمارە ٤٢

# لە شوانی بدە و مەڕەکان خۆیان بلاو دەبن

### حوکم

دەشێ گێروگرفت زۆرجار بگەڕێنرێتەوە بۆ تاکەکەسێکی بەهێز– بزوێنەر، کەسی هوارەوەی خۆبەزلزان و لوتبەرز، بەندی ئیرادە باشی. ئەگەر تۆ بوار بە خەڵکی وەها بدەیت مانۆڕ بکەن، ئەوانیتر دەکەونە ژێر کاریگەرییان. چاوەڕێ مەبە ئەو گێروگرفتەی دەبنە هۆکاری، چەند هەر زیاد بکات، هەوڵ مەدە دانوستانیان لەگەڵ بکەیت– ئەوان کەڵلەڕەقن. لە ڕێگەی گۆشەگیرکردن و دوورخستنەوەیان، کاریگەرییان پووچەڵ بکە. لە سەرچاوەی کێشەکە بدە و مەڕەکان بلاو دەبن.

### پەیڕەوی لە یاساکە

نزیکی کۆتایی سەدەی شەشی پێش زایین، دەوڵەت شاری ئەسینا زنجیرەیەک زۆرداری ناچیزەی سەرنگون کرد کە چەند دەیەیەک بوو سیاسەتەکەیان ڕکێف کردبوو لەبری ئەمە، دیموکراسییەکی بونیاد نا کە سەدەیەکی دەخایاند، دیموکراسییەک کە بووە سەرچاوەی دەسەلاتەکەی و جێ شانازیترین دەستکەوتی. بەلام لەگەڵ گەشەی لەسەرخۆی دیموکراسیدا، کێشەیەکیش پەیدا بوو کە ئەسینایییەکان قەت ڕووبەڕووی نەبووبوونەوە: چۆن مامەڵە بکەن لەگەڵ ئەوانە کە خۆیان لە تەبایی شارێکی بچوکی

دەورە درابو بە دوژمن نەدەگەیاند، کەکاریان بۆ شکۆ گەورەکەی نەدەکرد، بەڵکو تەنیا میریان نەحزیان و چارچنۆکیان و هیولەتی ناچیزەمان دەکردەوە؟ ئەسپاسییەکان تێگەیشتن لەوەی ئەم حەڵکانە، ئەگەر لێیانبگەڕێت، مەیاری دەبزوێنن، شار دابەش دەکەن بۆ چەند باڵێک و شلەژان دەمێننەکایەوە کەدەشێ هەمووی سەر بکێشێت بۆ وێرانبوونی دیموکراسییەکەیان

سزای ئوستوتزانە چیتر بۆ سیستەمی شارستانییووی مرۆ گونجاو نەبوو کە ئەسپاسییەکان دروستیانکردبوو لەبری ئەمە، هاوڵاتییان شێوازێکی تری باوەڕهێنی کەمتر دڵڕەقانەیان دۆزییەوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ حزبپەرستانی لەمێژینە هەموو ساڵێک ئەوان لە بازاڕ کۆ دەبوونەوە و ناوی ئەو کەسەیان لەسەر کەرەستەیەکی گڵ دەنووسی کە دەیانەویست بۆ ماوەی دە ساڵ شار بەدەر بێت، پێیان دەوت (ئۆستراکۆن) ئەگەر ناوێکی دیاریکراو لەسەر شەش هەزار کاغەزی دەنگدان دەربکەوتایە، ئەو کەسە دەستبەجێ شاربەدەر دەکرا ئەگەر کەس شەش هەزار دەنگی نەهێنایە، ئەو کەسەی زۆرترین ناونووسینی بەرکەوتبوو ڕووبەڕووی دەربەدەرکردن دەبووەوە. ئەم دەرکردنە سروت ئامێزە بووە جۆرێک لە فێستیڤاڵ — خۆشییەکە بتوانێت ئەو کەسە هەراسانکەرە شڵەژەرانە دەربکەیت کە دەیانەوێ بەسەر ئەو گرووپەدا بەرز ببنەوە کە قەرار وابووە حرمەتیان بکات

لە ٤٩٠ی پێش زایینیدا، ئاریستیدیس کە یەکێک بوو لە جەنەراڵە گەورەکانی مێژووی ئەسینا، یارمەتیدەر بوو لە شکستپێهێنانی فارسەکان لە شەڕی ماراسۆن. لەهەمان کاتدا، بە دەرەوەی شەڕگە، دادپەروەرییەکەی وەکو دادوەر نازناوی "دادپەروەری" پێبەخشیبوو. بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی ساڵان، ئەسینایییەکان ڕقیان لێداگرت ئەو زۆر لای لەسەرحەقبوونی ئێدەدا و بە بۆچوونی ئەوان، ئەمە هەستەکانی باڵابوون و پیسوایی بۆ خەڵکی ئاسایی پووپۆش دەکرد ئامادەیییە سەرووئاساییەکەی لە سیاسەتی ئەسینایدا بووە شتێکی تەواو بەحوازراو، هاوڵاتیان بێتاقەت بوون لەوەی گوێبیستی نازناوی ئەو، "دادپەروەری"، بن ئەوان ترسی ئەیان هەبوو ئەم کابرایە تەنیا کەسێکی حوکمدەر و

خۆبەزلزان- بێت کە دواجار دابەشبوونێکی توندی لەنێویان دروست دەکرد. لە ٤٨٢ ی پێش زایینەدا، سەربازی شارەزایەتی مەعابدی ئاریستیدس لە دوژمنانی جەنگ لەگەڵ فارسەکاندا، ئەوان (ئۆستراکا)یان کۆ کردەوە و دەربەدەریان کرد.

پاش دەربەدەرکردنی ئاریستیدس، ژەنەراڵی گەورە تیمیستۆکلس وەک ڕێبەری سەرەکی شار دەرکەوت. بەڵام شەرەف و سەرکەوتنە زۆرەکانی چووە ناو کەللەیەوە و ئەویش بووە کەسێکی لەخۆبایی و فشەکەر، بە بەردەوامی ئەوەی بیر ئەسینایییەکان دەهێنایەوە کە چەند سەرکەوتوو بوو لە شەڕدا، چەند پەرستگەی بونیاد ناوە و چەند مەترسی بەربەرچ داوەتەوە. پێدەچوو ئەو ملێی بەبێ ئەو شار دادەڕمێت. بۆیە، لە ٤٧٢ ی پێش زایینەدا، ناوی تیمیستۆکلس خرایە سەر ئۆستراکا و شاری خۆی لە ئامادەییە ژەهراوییەکەی قوتار کرد.

گەورەترین فیگەری سیاسی لە ئەسینای سەدەی پێنجەم، بێگومان پێریکلس بوو. هەرچەندە چەند جارێک هەڕەشەی دەربەدەرکردنی لێکرا، ئەو بە بەرقەرارکردنی پەیوەندی توندوتۆڵ لەگەڵ خەڵکدا خۆی لەو چارەنووسە بوارد. لەوانەیە ئەو کە منداڵ بووە وانەیەکی لە مامۆستا منداڵەکەیەوە وەرگرتبێت، واتە دامۆنی بەناوبانگ، کە لە هۆشمەندیدا لە هەموو ئەسینایییەکان لێهاتووتر بوو. ئەوە دامۆن بوو پێریکلیسی لە بواری هونەر و فەرمانڕەواییدا ڕاهێنا. بەڵام ئەویش لەبەرانبەر کەش و فش و شێوازی ئیهانەئامێزی بۆ خەڵکی ئاسایی و پەیوەندیی بۆ؛ ڕووبەڕووی دەربەدەرکرن بووەوە.

## لێکدانەوە

ئەسینایییەکان ئەو جەربەزە کۆمەڵایەتییەیان هەبوو کە ئەمڕۆدا ونبووە - تێپەڕینی سەدەکان ئەوانی کردووە خەڵکێکی مەدەنیتر. ئەسینایییەکان کە هاوڵاتیانێکی بوون بە مانا ڕاستەقینەکەی، هەستیان بەو مەترسییە کرد کە ڕەفتاری کۆمەڵایەتی دەیخستەڕوو و بینییان کە چۆن ڕەفتارێکی وەها زۆرجار خۆی لە فۆرمی ترد ڕووپۆش دەکات. چاوچنۆکی لەسەرحسابی چاکەی گشتی، ملبشی بالایی، پیلانی نهێنی و

کەمەئامێری کرشدە. هەندێ لەم ڕەفتارانە ڕیاسبەخش بوون بۆ تەبایی شار لە ڕێگەی دروستکردنی بالْ و چاندنی بەباری، ئەوانەیتر لەشێوەیەری پارچەیەتی دیموکراتی بوون لە ڕێگەی ئەوەی کە وەهایان لە هاوڵاتی ئاسایی دەکرد هەست بە ترس یان تجرەیی بکات. ئەسیمابیەکان هەوڵیان ئەدا ئەو خەڵکە پەروەردە بکەنەوە کە بەم شێوازانە ڕەفتاریان دەنوواند، یان بەشێوەیەك لە شێوەکان لە گروپێکدا هەڵیانمژی، یان سزایەکی توند بسەپێنن کە تەنیا کێشەی تری دروست دەکرد. چارەسەرەکە خێرا و کاریگەر بوو؛ هێزیان لێ قوتار دەکرد.

## پەیڕەوی لە پاساکە ٢

له ١٢٩٦دا کاردیناڵەکانی کەنیسەی کاسۆلیکی لە ڕۆم کۆبوونەوە بۆئەوەی پاپایەکی نوێ هەڵبژێرن. ئەوان کاردینال گەیتانییان هەڵبژارد، چونکە ئەو تا بڵێی لێهاتوو بوو، پیاوێکی وەها ڤاتیکانی دەکردە دەسەڵاتێکی مەزن. بە وەرگرتنی ناوی (بۆنیفەیسی هەشتەم)، گایتانی بەرووبی ئەوەی سەیماند کە شایستەی ڕای پێزەتیفی کاردیناڵەکانە لەبەرانبەر حوریدا ئەو لە پێشدا هەنگاوەکانی ڕێکخست و لە هیچ شتێك سڵی نەکردەوە کە ڕێگەی دەگرت هەر کە گەیشتە دەسەلات، بۆنیفەیس بەخێرایی ڕکابەرەکانی تێشکاند و دەوڵەتە پاپاییەکانی یەکخستەوە هێزە ئەورووپیەکان بەرەبەرە ترسیان بەرانبەر ئەو لێ نیشت و وەفدی ناردن بۆ دانوستانکردن لەگەڵیدا پاشای ئەڵمانی، ئەلبرێختی ئەمسا ئەمانەت بەشێکی لە خاکەکەی سپاردەی بونیفەیس کرد لەگەڵ ئەوەشدا پارچەیەك شوێنی خۆی نەگرت، ئەویش توسکانی بوو کە دەوڵەمەنترین بەشی ئیتالیا بوو ئەگەر بۆنیفەیس بیتوانیایە فلۆرێنس بگرێت کە دەهێزترین شاری توسکانی بوو، ئەوا ناوچەکە هی خۆی دەبوو بەڵام فلۆرێنس کۆمارێکی سەربەرز بوو و شکستپێهێنانی قورس دەبوو، دەبووایە پاپا لێهاتووانە یاری بە کارتەکانی بکات

فلۆرێنس دابەش بوو بۆ دوو ڕکابەر، ڕەشەکان و سپییەکان سپییەکان هێزانی بازرگان بوو کە بەم دواییە و بەخێرایی سامان و دەسەڵاتیان گرتبووە دەست، بەڵام

ڕەشەکان کۆمتر بوون. بەهۆی ناوبانگیان لەگەڵ هەڵکردا سپییەکان کۆنترۆڵی شاریان بەدەست هێنایەوە، ئەمەش بووە مایەی کینە و ڕقی ڕەشەکان. ناکۆکییەکان زۆر بەخێرایی پەرەی سەند.

لێرەوە بۆنیفەیس دەرفەتی قۆستەوە. ئەو پلانی دادەنا بۆ یارمەتیدانی ڕەشەکان تا شارەکە بگرن و فلۆرێنس دەچووە گێژاوییەوە. لەکاتی ئاژاوەنانەوەکەشیدا ئەرکیری حسنە سەر یەک کەس، دانتێ ئالیگیری، نووسەر و شاعیری بەناوبانگ و پشتیوانی سەرسەختی سپییەکان. دانتێ هەمیشە کەیفی بە سیاسەت دەهات. ئەو بڕوای بەتیبی بە کۆمارەکە هەبوو، ئەو بەهەمان شێوە وتاربێژێکی بەتوانای شار بوو. لە ١٣٠٠دا، ئەو ساڵەی کە بۆنیفەیس دەستیکرد بە پیلانگێڕی بۆ گێڕانەوەی توسکانی، هاوڵاتیانی دانتێ دەنگیان پێدابوو بۆ لە بەرزترین پۆستی فلۆرێنس و ئەویان کردە یەکێک لە شەش کەسە پێشەنگەکەی فلۆرێنس. لەماوەی حوڵی شەش مانگە لەو پۆستەدا، ئەو توند دژی ڕەشەکان و هەوڵەکانی پاپا وەستایەوە بۆ چاندنی تۆوی پەشێوی.

بەهاتنی ١٣٠٠، بۆنیفەیس پلانێکی نوێی هەبوو. ئەو بانگی چارلس دی ڤالۆیس، برای پاشای فەرەنسا، کرد تا یارمەتیدەر بێت لە هێنانە کایەی سیستەم بۆ توسکانی. کاتێک چارلس بەناو باکووری ئیتالیادا ڕێی کرد و فلۆرێنس پڕ بوو لە شڵەژان و ترس، دانتێ بەخێرایی وەکو ئەو پیاوە سەرپەڵدا کە شوانی حەلکی کۆ دەکاتەوە و ڕووبەڕووی سەرش بێتەوە و بەوپەڕی ئەقڵاوە هاوڵاتیان ئاگادار بکات بۆ ڕێکخستنی بەرەنگاری بەدژی پاپا و میرە فەرەنسییە بووکەڵە ناساکەی. بۆنیفەیس هەرچۆنێک بێت دەبووایە کاریگەریی دانتێ بەهێڵێت. بۆیە لەکاتێکدا کە بە چارلس دی ڤالۆیس هەڕەشەی لە فلۆرێنس دەکرد، بەلایەکی ترەوە چلە ڕەیتووی هەڵگرتبوو، بۆ ئەگەری دانوستان بەو هیوایەی کە دانتێ بکەوێتە داوەوە. لە ڕستیدا فلۆرێنسییەکان بڕیاریاندا وەفدێک بنێرنە ڕۆم و هەوڵ بدەن دانوستانی ئاشتی بکەن. چاوەڕوانکراو بوو کە بۆ سەرۆکایەتی وەفدەکە دانتێ هەڵبژێرن.

هەندێ کەس هۆشدارییان دایە هایمرۆکە لەبەرامبەر ئەگەری بانەوەی تەڵە لەلایەن باپای چاوچنۆکەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێت دانتێ چووە ڕۆم لەکاتێکدا کە سوپای فەرەنسی لەبەردەم دەروازەی فلۆرێنس وەستابوو. ئەو دڵنیابوو ئەوەی ڕەوانبێژییەکەی و ئەقڵانەکەی دەبێتە هۆی برینەوەی دڵی باپا و ڕزگارکردنی شار. کەچی لەگەڵ گەیشتنیان بۆ لای باپا، ئەو دەستبەجێ هەڕەشەی لە دانتێ و وەفدەکەی کرد. لە یەکەمین دیداردا وتی "ملم بۆ بدەن! لە ناخی دڵمەوە پێتان دەڵێم هیچم نییە بۆ ئێوە جگە لە برەودان بە ئاشتی!" بۆنیفەیس وەفدەکەی بەڕێکرد و داوای کرد دانتێ بمێنێتەوە. ئەو بەڕێبەری ئەدەنەوە لەگەڵی دوا، بەڵام لە حەوەمەردا فەرمان بوو.

بۆیە دانتێ لە ڕۆم مایەوە. لەکاتێکدا کە ئەم و پاپا بەردەوام بوون لە قسەکردن، فلۆرێنس داڕما. لەکاتێکدا کە کەس نەبوو بەدەنگ سپییەکانەوە بێت و لەبارێکدا کە چارلس دی ڤالۆیس پارەی پاپای بەکاردێنا بۆ بەرتیل و چاندنی نەیاری، سپییەکان پەرتەوازە بوون، هەندێکیان لە دانوستان دەکرد و ئەوسێتر دەچوونە بەرەکەی ترەوە. بە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دۆزینێکدا کە ئێستا دەبەشبوو بوو و لەحۆی دڵنیا نەبوو، ڕەشەکان بە ئاسانی لەماوەی چەند هەفتەیەکدا تۆڵەیان لێکردنەوە و نەفیویان بردن. هەر کە ڕەشەکانیش تونددەسەڵاتیان گرتە دەست، دواجار پاپا دانتێ لە ڕۆم نێردا.

ڕەشەکان فەرمانیان بە دانتێ کرد بگەڕێتەوە ماڵەوە و ڕووبەڕووی تۆمەتەکانی بێتەوە و بێتە دادگا. کاتێك شاعیر ڕەتیکردەوە، ڕەشەکان هەڕەشەی حوکمی سوتاندنی بەزیندوویان لێکرد ئەگەر جارێکی تر پێ بنێتەوە فلۆرێنس. بەم شێوەیە دانتێ ژیانێکی نەگبەتانەی لە ئاوارەگە بەسەر برد، لە ئیتالیادا سوڕایەوە، لەو شارەی سوك بیوو کە ئەو خۆشی دەویست و تەنانەت پاش مردنیشی نەگەڕێنرایەوە فلۆرێنس

## لێکدانەوە

بۆیەیەیس دەیزانی ئەگەر تەنیا میانویەکی هەبووایە بۆ مەلاوەماسی دانش، فلۆرێنس دادەرما. ئەو پاری بە کۆنترین کارتی ناو کتێبەکە کرد- هەڕەشە کردن بە دەستنک و بەدەستەوەگرتنی چلە رەنتوون بەدەستەکەی نرەوە- دلنتیش تێکەوت. بۆیەیەیس لە یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی گەمەی دەسەڵات تێدەگەشت. کەسێکی مکوڕ، یۆخێکی ملکەچ، دەتوانێ رامەمەرێك بخاتە ناو بێشەی شێرانەوە. بۆیە ئەو گرەت حولقێنەکەی گۆشەگیر کرد. نەبێ بڕبڕەی شار بۆنەوەی بەیەکگرتوویی بیانهێڵێتەوە، مەڕەکان بڵاو و پەرتەوازە بوون.

وانەکە فێر بە: کاتی هۆت بەوە بەفیڕۆ مەدە لەهەموو ئاراستەیەکەوە پووبەڕوو بیتەوە بەرانبەر شتێك کە لە دوژمنێکی فرە سەر دەچێت. ئەو سەرە بدۆزەرەوە کە گرنگە- کەسی خاوەن ئیرادەی دەسەڵات، یان زیرەکەکان یان لەهەمووی گرنگتر ئەوەیان کە کاریزمای هەیە. شێرپەنجە لە خانەیەکەوە دەست پێدەکات، بیبڕە بەر لەوەی لەودیو چارەسەرەوە بڵاو بێتەوە.

## کلیلی دەسەڵات

لە رابردوودا، وڵاتێکی تەواو لەلایەن پاشایەك و چەند وەزیرێکیەوە حوکم دەکرا. تەنیا نوخبەیەك یاری بە دەسەڵات دەکرد. بەدرێژایی چەند سەدەیەك، دەسەڵات پەیتا پەیتا بڵاو بووەوە و دیموکراتیزە بوو. ئەمەش خراپ تێگەیشتنێکی دروستکردبوو لەمەڕ ئەوەی گرووپەکان چیتر سەنتەری دەسەڵاتیان نیە- ئەمەی کە دەسەڵات لەبری چەندەها خەڵك بڵاو دەبێتەوە. لە ڕاستیدا ئەگەرچی دەسەڵات لە ژمارەکانیدا گۆڕاوە، بەڵام لە جەوهەردا نەگۆڕاوە. دەشێ ژمارەیەکی کەمتری زۆردار هەن کە تواناس دەسەڵاتی ژیان و مردن بەسەر ملیۆنان کەسدا بسەپێنن، بەڵام هەزاران زۆردەری

ناچیرەش دەسپێ کە حوکم بەسەر قەڵەمڕەوە بچووکەکاندا دەکەن و ئیرادەیان لە ڕێگەی گەمە ڕاستەوخۆکانی دەسەڵاتدا دەسەپێنن. لە هەر گرووپێکدا، دەسەڵات لە دەستەکانی یەک دوو کەسدا چڕ دەبێتەوە، چونکە ئەمە ڕووبەڕێکە تیایدا سروشتی مرۆڤ قەت ناگۆڕێت. خەڵکی لە دەوری کەسایەتییەکی بەهێز وەکو هەسارە سووڕاوەکانی دەوری خۆر کۆ دەبنەوە.

بڕگەیەکی سەرەکی لە گەمەکانی ستراتیژدا گۆشەگیرکردنی دەسەڵاتی دوژمنە. لە شەترەنجدا تۆ هەوڵ دەدەیت پاشا گۆشەگیر بکەیت. لە گەمەی چینی (گۆ)دا تۆ هەوڵ دەدەیت هێزەکانی دوژمن لە خانەی بچووکدا گۆشەگیر بکەیت، نەجووڵاو و ناکاریگەریان بکەیت. زۆرجار وا باشترە دوژمنانت گۆشەگیر بکەیت نەک تێکیانبشکێنیت- بەمشێوەیە تۆ کەمتر دڕندە دەردەکەویت. ئەنجامەکەش هەمان شتە، چونکە لە گەمەی دەسەڵاتدا گۆشەگیری واتە مەرگ.

غیاب و دەرکەوتن لە گەمەی دەسەڵاتدا زۆر گرنگن بۆ فریودان، بەتایبەت لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا، پێویستە بە بەردەوامی ئامادەییت هەبێت یان هەستێکی لەو جۆرە دروست بکەیت کە تۆ ئامادەییت هەیە. سەرۆک وەزیرانی شاژنە ئەلیزابێس، ڕۆبەرت سەسیل دوو ڕکابەری سەرەکی هەبوون: کەسی دڵخوازی شاژن، ئێرلی ئێسیکس و دڵخوازی پێشووی، سێر واڵتەر ڕاڵە. ئەو هەردووکی ڕەوانەی ئەرکێک کردن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئیسپانیا. کاتێکیش کە ئەوان دیار نەبوون، ئەو توانی خۆی بە شاژن نزیک بخاتەوە، پێگەی خۆی وەک گەورە ڕاوێژکاری ئەو مسۆگەر بکات و سۆزی بۆ ئەو دووانە لاواز بکات. وانەکە لێرەدا دوو بەشە. یەکەم، غیابی تۆ لە دەربار مەترسییە بۆ سەر تۆ و نابێ قەت لە کاتی پەشێویدا چۆڵ بکەیت، چونکە نەبوونی تۆ دەتوانێ ڕەمزی لەدەستچوونی دەسەڵات بێت. دووەم، دوورخستنەوەی دوژمنانت لە دەربار لە ساتە هەستیارەکاندا پلانێکی زیرەکانەیە.

گۆشەگیرکردن بەهەمان شێوە بەکارهێنانی ستراتیژی تری هەیە. کاتێک هەوڵ دەدەیت هۆشی خەڵک پەرت بکەیت، زۆرجار کارێکی زیرانەیە کە لە ڕێگەی کۆمەڵایەتیی

ئاسایی خۆیان دووریان دەخەینەوە. هەر کە گۆشەگیر بوون، بەرانبەر تۆ لاواز دەبن و ئامادەیی تۆ گەورە دەبێت. بەهەمان شێوە، زۆرجار ساختەچییەکان بۆ ڕێگاگەلێک دەگەڕێن تا نیشانەکانیان لە ژینگەی کۆمەڵایەتیی ئاساییاندا گۆشەگیر بکەن، بەرەو ئەو ژینگە نوێیانە ئاراستەیان بکەن کە تیایاندا چیتر ئاسودە نین. لێرەوە هەست بە لاوازی دەکەن و ئاسانتر مل بۆ فریو دەدەن. بۆیە گۆشەگیری دەشێ ڕێگایەکی بەهێزی هەستەوژێر جادوو بێت بۆ بەلاڕێدا بردن.

**وێنە:** ڕانەمەڕێکی قەڵەو کاتی گرانبەها بەوە بەفیڕۆ مەدە هەوڵ بدەیت مەڕێک یان دووان بدزیت. بەوە ژیان و پەلەکانی خۆت مەخەرە مەترسییەوە کە تەڵە بۆ سەگە پارێزەرەکانی مەڕەکان بنێیتەوە. شوانەکە بکەرە ئامانج. دووری بخەرەوە و سەگەکانیش بەدوای دەکەون. لێی بدە و ڕانەمەڕەکە بڵاو دەبێت—تۆ دەتوانیت یەک لەدوای یەک هەڵیانبگریت.

**دەسەڵات:** ئەگەر کەوان ڕادەکێشیت، بە بەهێزترین شێوە ڕایکێشە. ئەگەر تیر دەهاوێژیت، درێژترینیان بهاوێژە. ئەگەر تیر دەگریتە ئەسپ سوارێک، سەرەتا لە ئەسپەکەی بدە. ئەگەر باندێکی چەتە دەگریت، سەرەتا سەرکردەکەی بگرە. وەک چۆن وڵات سنووری هەیە، کوشتنی کەسانیش سنووری هەیە. ئەگەر هێرشی دوژمن بتوانرێ بوەستێنرێت، بۆچی لەو هەموو کوژراو و بریندارە زورتر هەبێت کە پێویست دەکات؟

(شاعیری چینی تو فو، سیلسیلەی تانگ، سەدەی هەشتەم)

### پێچەوانەبوونەوە

مەکیاڤێللی دەنووسێت "هەر زیانێک کە بەکەسێکی دەگەیەنیت دەبێ بە شێوەیەک بێت کە پێویست نەکات لە تۆڵەسەندنەوەی بترسیت" ئەگەر ئیش لەسەر گۆشەگیرکردنی دوژمنەکەت دەکەیت دڵنیا بەرەوە لەوەی ئەو ئامرازەکانی

تۆڵەکردنەوەی مبن. ئەگەر ئەم یاسایە پیادە بکەیت، ئەوا لە پێگەیەکی بالاوە پیادەی بکە، بۆئەوەی هیچ شتێك نەبێت لێی بترسیت لە کینە و ڕقەکەی.

ئەندرو جۆنسن، جێگرەوەی ئەبراهام لینکۆلن وەك سەرۆکی ئەمریکا، (یولیسیس گرانت)ی وەکو ئەندامێکی کێشەدروستکەری حکومەت بینی. بۆیە گرانتی گۆشەگیر کرد، وەك ڕەمیەحۆشکردنێك بۆ دەربەڕاندنی. ئەمەش تەنیا بووەهۆی تووڕەکردنی ژەنەراڵی گەورە کە لای خۆیەوە بە دروستکردنی ساعەیەکی پشتیوانی لە نێو حزبی کۆماریدا و بوون بە سەرۆکی دواتر، وەڵامی دایەوە. زۆر ژیرانەتر دەبوو کە کەسێکی وەك گرانت لە شوێنی خۆی بهێڵرایەتەوە کە لەوێ نەیدەتوانی هیچ زیانێك بگەیەنێ نەك ئەوەی کە هەستی تۆڵەی لا دروست بکەیت. تۆش لەوانەیە ڕۆژجار وا باشتر بێت خەڵکی لە بەرەی خۆت بهێڵیتەوە کە لەوێوە دەتوانیت چاودێرییان بکەیت نەك ئەوەی سەرکێشی دروستکردنی دوژمنێکی سەرسەخت بکەیت.

## یاسای ژمارە ٤٣

# کار لەسەر دڵەکان و ئەقڵەکانی ئەوانیتر بکە

### پوختە

*زۆرداری پەرچەکردارێک دروست دەکات کە دواجار لەدژی تۆ کار دەکات. دەبێ تۆ ئەوانیتر بەکێش بکەیت بۆ ڕیەحتی جوڵان بە ئاراستەی تۆ. کەسێک کە تۆ فریوت داوە دەبێتە چەنگی وەفاداری تۆ. شێوازی فریودانی ئەوانیتریش کارکردنە لەسەر سایکۆلۆژیی و لاوازیی تاکەکەسییان. کەسی سەرەکار شل بکەرەوە بەوەی کە کار لەسەر هەستەکانیان بکەیت، یاری لەسەر ئەو شتە بکەیت کە بەلایانەوە ئازیزە و ئەو شتەش کەلێیی دەترسن. ئەگەر دڵ و ئەقڵەکانی ئەوانیتر فەرامۆش بکەیت ئەوا ڕقت لێ دادەگرن.*

### سەرپێچی لەیاساکە

لە دریکی کۆتایی حوکمڕانی لویسی پانزە، هەموو فەرەنسا تامەزرۆی گۆڕانکاری بوو. کاتێک نەوەی پاشا و جێگرەوەی هەڵبژێردراو، لویسی شازدەی ئایندە، هاوسەرگیری لەگەڵ کچی پانزە ساڵەی ئیمپراتۆرەی نەمسا کرد، فەرەنسییەکان گەشبین بوون و هیوادار دیار بوون. بوکی گەنج، ماری ئەنتوانێت، جوان و پڕ وزە بوو. ئەو دەستبەجێ میزاجی دەرباری گۆڕی کە بەهۆی بەدڕەوشتییەکانی لویسی پانزە کز و کپ ببوو. تەنانەت خەڵکی ئاسایی کە هێشتا ئەویان نەبینیبوو، بە خۆشەوە باسی ماری

ئەنتوانێتیان دەکرد. فەرەنسییەکان قێزیان لەو زنجیرە مەعشوقەیە ببووەوە کە لویسی پانزەیان ڕکێف کردبوو و ئەوان چاوەڕێی حورمەتی شاژنی نوێیان بوون. لە ١٧٧٣دا کاتێک ماری ئەنتوانێت بۆ یەکەمین جار بە ئاشکرا بە جادەکانی پاریسدا ڕۆیشتبوو، خەڵک بە چەپڵە ڕێزانەوە دەورەی گالیسکەکەیان دابوو. ئەو لە نامەیەکیدا بۆ دایکی نووسیبووی "چەند بەختەوەرییە بە تێچوویەکی وەها کەم ئەو هەموو سۆزە بەدەست بێنیت".

لە ١٧٧٤دا لویسی پانزە مرد و لویسی شانزە هاتە سەر تەخت. هەر کە ماری ئەنتوانێت بووە شاژن، خۆی دایە ئەو چێژ و خۆشییانەی کە دڵی پێوە بوون - پۆشینی خشڵ و درێسە گرانبەهاکان، پۆشینی قژی پڕ و ساردانی ئاهەنگی مەسکی بەردەوام - هەموو ئەم خەرجانەی بە قەرز رادەپەڕاند، قەت حەمی ئەوەی نەبوو تێچووی چەندە یان کێ پارەکەی دەدات.

لەگەڵ هەر خەرجێکی تازەدا، تێچووی شاهانە بەرزتر دەبووەوە. لەهەمان کاتدا، فەرەنسا خۆی بارودۆخی خراپ و خراپتر دەبوو؛ وشکی و قاتی و ناڕەزایەتی بەربڵاو لەئارادا بوو. تەنانەت ئەو دەربارییە کۆمەڵایەتییەکانیش پڕ ببوون لە کینە - شاژن وەک منداڵ مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن. تەنیا دڵخوازەکانی گرنگ بوون و ئەمانە کەم و کەمتر دەبوونەوە. بەڵام ماری ئەنتوانێت خۆی بەمەوە خەریک نەکرد. قەت جارێکیش ڕاپۆرتی وەزیری نەخوێندەوە. بۆ جارێک لە جاران گەشتی بەناوچەکانی دەوروبەردا نەکرد تا خەڵک بۆ لای خۆی ڕاکێشێت. تەنانەت بۆ جارێکیش لەگەڵ پاریسییەکان تێکەڵ نەبوو و پێشوازی لە وەفدیشیان کرد. ئەو هیچ لەمانەی نەکرد چونکە وەک شاژن هەستیکرد کە خەڵکی منزری ئەویان بەدەستهێناوە و پێویست ناکات لەبەرامبەردا ئەوانی خۆش بوێتەوە.

لە ١٧٨٤دا شاژن ناوی کەوتە ناو سکاندەڵێکەوە. وەک بەشێک لە تەڵەکەیەک، گرانبەهاترین ملوانکەی ئەڵماس لە ئەورووپا بەناوی ئەوەوە کڕدرابوو و لە کاتی دادگاییکردنی تەڵەکەبازەکاندا، شێوازی ژیانی بڕخەرجی ئەو ئاشکرا بوو؛ خەڵکی شتی

نقەیان لەبارەی خەرجکردنی پارە لە درێس و حشل و ئاهەنگ بیستەوە، ئەو ناوی نرا "خاتوو کورتهێنان" و لەوە بەدوا تەرکیزی کینەی خەڵکی کەوتە سەر.

پێنج ساڵ دواتر، لە ١٧٨٩دا، پووداوێکی بێ وێنە پوویدا: دەستپێکی شۆڕشی فەرەنسا. شاژن هیچ خۆی تێکەڵ نەکرد – با خەڵکی پاسبووبی بچوکی خۆیان هەڵایسێنن پێی وابوو بەرووبی دۆخەکە دادەمرکێتەوە و ئەویش دەست دەداتەوە پابوواردن و خۆشییەکانی خۆی، ئەو ساڵە خەڵکی هەڵیانکوتایە سەر (ڤێرسای)، خانەوادەی شاهانەیان ناچار کرد لە کۆشک دەرچن و لە پاریس بگیرسێنەوە. ئەمە سەرکەوتنێک بوو بۆ یاخییەکان، بەڵام ئەمە دەرفەتێکیشی بۆ شاژن پەخساند تا بوونەکان سارێژ بکات و لەگەڵ خەڵکیدا پەیوەندی بکات. بەڵام شاژن پەندی وەرنەگرتبوو، لەماوەی مانەوەیدا لە پاریس بۆ جارێکیش پاریسی جێ نەهێشت. دەکرا ڕەعیەکانی لە دوورەوەدا ببینن لەبەرانبەر ئەو شنانەی قرچکی پێوە گرتبوو.

لە ١٧٩٢ هاوسەری شاهانە لە کۆشکەوە گوازرانەوە بۆ زیندان لەکاتێکدا کە شۆڕش بە ڕەسمی کۆتایی پاشایەتی ڕاگەیاند. ساڵی دواتر لویسی شازدە دادگایی کرا، تۆمەتبار کرا و سەری پەڕێنرا. لەکاتێکدا کە ماری ئەنتوانێت چاوەڕێی هەمان چارەنوس بوو، بە ئەستەم گیان لەبەرێک هەبوو بەزەیی لێ بکات. ئەو ببووە ئاوارەی خیمەن، لە ئۆکتۆبەری ١٧٩٣دا بۆ دواجار چۆکی لەبەردەم گیلۆتین دادا و سەری پەڕێنرا.

## لێکدانەوە

هەر لەسەرەتاوە، ماری ئەنتوانێت مەترسیدارترین نێرواسییەکانی پەید کرد کە مێرێکی گەنج بوو لە ئەمسا بەشێوەیەکی ناکۆتا مەرایی بۆ دەکرا. وەکو شاژنی ئایندەی دەربەری فەرەنسا سەنتەری سەرنج بوو. ئەو قەت فێری ئەوە نەبوو حەنوو لە خەڵک بکات یان دڵخۆشیان بکات. بریتەوەی لەگەڵ سایکۆلۆژیی ئەواندا هەماهەنگ بێت. وەکو هەر کەسێک کە لەسەرەتای تەمەنییەوە خو دەداتە چێژ و پابوواردن، بوو بە دێوەزمەیەکی بێ هەستی. کاتێک وەک منداڵ نازیان دەدرێتێ و خوو دەدەنە خۆشی و

چونکە گەورەش دەبن هێشتا باوەڕیان وایە کە دەبێ هەموو شتێك بۆ لای ئەوان بێت، ئەمانەشیان بە کاریگەری خۆیان هەیە و هیچ تەقەلایەك ناخەنەگەڕ بۆ پاراستنی کاریگەری جادووگەری، سەرنجڕاکێشان و پاکرکردنی نەرم و نیان.

بەبڕوای دەسەڵاتدار، ئەو تێڕوانینە کاریەسانیانەن، لە هەموو وەختێکدا دەبێ ڕوو بکەیتە ئەوانەی دەوروبەرت، سایکۆلۆژی دیاریکراویان پێزانە بکەیت، قسەکانت بەو شێوەیە هەڵبژێریت کە پێت وایە کاریان تێدەکات. ئەمە پێویستی بە وزە و هونەر هەیە چەندەی پێگەکەت بەرزتر بێت، ئەوەندە زیاتر پێویستت بەوە دەبێت کە لەگەڵ دڵ و ئەقڵی ئەوانەی ژێر خۆت هەماهەنگ بیت، بناغەیەکی پشتیوانی دروست بکەیت تا لە شوێنی خۆت بە قایمی بتهێڵێتەوە. بەبێ ئەو بناغەیە، دەسەڵاتت دەکەوێتە لێژی و گلۆسکارییەکی بچوکی چارەنووس پارچەپارچەت دەکات بۆ خوارەوە.

### پەیڕەوی‌کردن لە یاساکە

لە ٢٢٥ی زاییندا، چوکۆ لیانگ، گەورە ستراتیژیست و وەزیری پەرەکی فەرمانڕەوایی (شو) لە چینی کۆن، ڕووبەڕووی بارودۆخێکی ترسناك بووەوە. مەملەکەتی (وەی) لە باکوورەوە هێرشێکی گەورەی بۆ سەر (شو) ساردابوو. لەوەش ترسناکتر ئەوە بوو کە (وەی) هاوپەیمانێتییەکی لەگەڵ دەوڵەتە دڕندەکانی باشووری (شو) بە ڕێبەرایەتی پاشا مێنگ پێکهێنابوو. دەبووایە چوکۆ لیانگ لە باشوورەوە دەست و پەنجە لەگەڵ ئەم هەڕەشەیە دووەمدا بکات بەر لەوەی بتوانێت هیوای ئەوەی هەبێت (وەی) لە باکووردا بەربەست بکات

لەکاتێکدا کە چوکۆ لیانگ خۆی ئامادە کردبوو لەدژی بەربەرییەکان بەرەو باشوور بجوڵێت، پیاوێکی ژیر لە کەمپەکەی پێشنیاری ئامۆژگاری کرد. ئەم پیاوە وتی، ئەستەمە بە زەبری هێز ناوچەکە ئارام بکەیت. لەوانەبوو لیانگ مێنگ بەزێنێت بەلام هەر کە جارێکی تر بەرەو باکوور دەجوڵا بۆئەوەی مامەڵە لەگەڵ (وەی)دا بکات، مێنگ داگیری دەکردەوە. کابرای ژیر وتی "باشترە دڵەکان بەدەست بهێنی نەك شارەکان،

باشترە بە دڵەکان شەڕ بکەین نەک بە چەکەکان. هیوادارم دڵی ئەم خەڵکانە بەدەست بێنیت" چوکۆ وتی "تۆ بیرکردنەوەکانم دەخوێنیتەوە"

هەر وەک ئەوەی لیانگ پێشبینی کرد، مێنگۆ هێرشێکی گەورەی هەستەگەڕ. بەڵام لیانگ تەڵەیەکی نابەوە بۆ گرتنی بەشێکی گەورەی سوپای مێنگۆ، بە خودی پاشاشەوە. لەبری سزادان یان لەسێدارەدانی ڕەدانییەکانی، ئەو سەربازەکانی لە پاشاکەیان جیاکردەوە، گرێ و بەندەکەی لە پەلەکانیان لابرد، خواردن و شەرابی بۆ دانان و پاشان قسەی لەگەڵ کردن، "ئێوە هەموتان پیاوێکی تەواون. من باوەڕم وایە هەموتان باوکن، ژن و منداڵتان هەیە چاوەڕێن ئێوە بگەڕێنەوە ماڵەوە. گومانی تیا نییە ئەوان فرمێسکی تاڵ بۆ چارەنوسی ئێوە دەڕێژن. من دەمەوێ بەرەڵاتان بکەم، بۆئەوەی بتوانن بگەڕێنەوە ماڵەوە بۆ ناو کەس و کارتان و ناسودەیان بکەن" پیاوەکان بە چاوی پڕ فرمێسکەوە سوپاسی لیانگیان کرد. پاشان ناردی بە شوێن مێنگۆدا. لیانگ لێی پرسی "ئەگەر بەرەڵات بکەم چی دەکەیت؟" پاشا لە وەڵامدا وتی "جارێکی تر سوپاکەم پێکەوە دەنێمەوە و لە شەڕێکی یەکلاییکەرەوەدا ڕووبەڕووی تۆی دەکەمەوە. بەڵام ئەگەر جاری دووەم بمگریتەوە، ئەوا مل بۆ باڵادەستی تۆ دادەنەوێنم" لیانگ نەک تەنیا فەرمانی بەرەڵابی مێنگۆی دا، بەڵکو ئەسپێک و ڕێبکێشی بە دیاری پێدا. کاتێک ئەفسەرە تورەکان پرسیان بۆچی ئەمەی کرد، لیانگ پێی وتن "دەتوانم کارا ئەوەندەی دەرهێنانی شتێک لە گیرفانم بە ئاسانی بگرمەوە. دەمەوێ دڵی بەدەست بێنم کاتێک ئەمە دەکەم، ئاشتی خۆبەخۆ دێتە ئێرە لە باشوور"

هەروەک مێنگۆ وتبووی، جارێکی تر هێرشی کردەوە، بەڵام ئەفسەرەکانی، کە لیانگ بەباشی مامەڵەی لەگەڵ کردبوون، لێی هەڵگەڕانەوە، گرتیان و ڕادەستی لیانگیان کرد کە جارێکی تر هەمان پرسیاری پێشووی لێکردەوە. مێنگۆ وتی بەشێوەیەکی عادیلانە نەبەزیندراوم، بەڵکو تەنیا لەلایەن ئەفسەرەکانی خۆمەوە ناپاکیم بەرانبەر کراوە، جارێکی تر شەڕ دەکەمەوە، بەڵام ئەگەر بۆ سێیەمین جار بمگریتەوە ئەو، لەبەردەم باڵادەستی لیانگدا چۆک دادەدەم

بۆ ماوەی مانگەکانی دواتر لیانگ پێش ریزەکیی مێنگۆی دەدایەوە و هەر دەگیرا و دەگیرایەوە و لیانگ هەمان پرسیاری لێدەکردەوە و سەربازەکانی مێنگۆش ماندووتر دەبوون و مێنگۆ دەیگوت تۆ فێڵم لێدەکەیت و یان پۆزشێکی تری دەهێنایەوە و هەمان سیناریۆ چەندبارە دەبووەوە.

کاتێک بۆ شەشەمین جار مێنگۆی گرتەوە، جارێکی تر هەمان پرسیاری لەپاشا کردەوە پاشاش لە وەڵامدا گوتی "ئەگەر بۆ حەوتەمین جار من بگریتەوە ئەوا وەفاداری حوکمت بۆ دەبوێتم و قەت جارێکی تر یاخی نابمەوە". لیانگ وتی "زۆر باشە بەڵام ئەگەر دیسان بتگرمەوە ئەوا ئەمجارە بەرت نادەم".

ئێستا مێنگۆ و سەربازەکانی رایانکردبوو بۆ سوچێکی دووری مەمبەکەتەکەیان، هەرێمی (وگ). ئەو کە چەند جارێک شکستی هێنابوو، تەنیا یەك هیوای مابوو ئەو داوای یارمەتی پاشا (وتوگۆ)ی (وگ)ی کرد کە سوپایەکی گەورە و دڕندەی هەبوو. بە گەیشتنیان، لیانگ پاشەکشەی کرد، بەڵام ئەو (وتوگو) و مێنگۆی بەرەو ناو تەڵەیەك دەبرد ئەو پێبوێتی پاشای لەناو دۆڵێکی تەسکدا گەمارۆدا، پاشان چواردەوری کردن بە ئاگر. کاتێك ئاگر گەیشتە سەبارەکان، تەواوی سوپای وتوگو گڕی گرت. هەموویان لەنێو چوون

لیانگ توانیبووی مێنگۆ و جەماعەتەکەی لە کوشارەکەی ناو دۆڵەکە جیا بکاتەوە و پاشا بۆ حەوتەمین جار بووەوە بە بەندی. پاش ئەم کوشتارە، لیانگ نەیتوانی تەحەمولی رووبەڕووبوونەوەی دیندلییەکەی بکات نامەبەرێکی نارده لای پاشای گیراو و ئەویش پێی وت. "ئەو رایسپاردووم بەرەڵات بکەم. لەشکرێکی تر لەدژی ئەو سەر بدە ئەگەر دەتوانیت و جارێکی تر بیبەزێنە". پاشا بە دەم هەنسکدانەوە، لەسەر ئەژنۆکانی بە گاگۆڵکێ بەرەو لای لیانگ ڕۆیشت و لەبەردەمیدا فڕێ بووەوە. وتی "ئای وەزیری مەزن، شکۆمەندی ئاسمان هی تۆیە ئێمە پیاوانی باشوور قەت جارێکی تر سەرەنگاری فەرمانڕەوایەتی تۆ ناکەین" لیانگ پرسی "تەواو ملتدا؟" ئەویش لەوەڵامدا وتی "من و

کوڕەکانم و نەوەکانم بە قووڵی کارتێکراو بووین بە مەرەیی بێ سنووری جەنابتان. چۆن دەمووانین مل نەدەین؟[٣]

لیانگ بە خوانێکی گەورە ڕێزی لە مێنگو نا، لەسەر تەختی شاهانە دایبانەوە، ڕەوییە گیراوەکانی گەڕاندەوە بۆ فەرمانڕەوایەتییەکەی، پاشان بە سوپاکەیەوە گەڕایەوە باکوور و هیچ هێزێکی داگیرکەری جێ نەهێشت. لیانگ قەت جارێکی تر نەگەڕایەوە — پێویستی نەدەکرد ئەمە بکات. مێنگو ببووە دڵسۆزترین و جێگیرترین هاوپەیمانی.

## لێکدانەوە

چونکە لیانگ دوو بژاردەی لەبەردەمدا بوو: هەوڵ بدات لە باشوور بە ڕەبرێکی شکیەر نەریەرییەکان ببەزێنێت، یان پێ بەپێی کات بە نۆتەرە و بەهێواشی بەلای خۆیاندا ئەکێشین بکات. زۆربەی خەڵکی بەهێزتر لە دوژمنەکانیان، بژاردەی یەکەم هەڵدەبژێرن و قەت بە لای دووەمدا ناچن، بەڵام کەسانی بە ڕاستی بەهێز زۆر دووربینانە بیر دەکەنەوە: لەوانەیە بژاردەی یەکەم خێرا و ئاسان دیار بێت، بەڵام پێ بەپێی کات هەستی درێژ لە دڵی تێکشکێنراودا دروست دەکات. کینەیان دەگۆڕێت بۆ ڕقێکی گەورە، ئەم ئەیارییە لەسەر لێوار دەتهبڵێتەوە — تۆ وزەت بە پاراستنی ئەوەی بەدەستتهێناوە بەفیڕۆ دەدەیت، ترس لەدڵ دەبیت و دەکەویتە حاڵەتی بەرگرییەوە. ئەگەرچی بژاردەی دووەم قورسترە، نەک تەنیا ئارامی ناحت بۆ دێنێت، بەڵکو دوژمنێکی ئەگەری دەگۆڕێت بۆ کۆڵەکەیەکی پشتیوانی.

حکومەتەکان پیاوەکانیان تەنیا بەکۆمەڵ بینی. بەڵام پیاوانی ئێمە، بەهۆی ئەوەی پارتیزان بوون، تۆپەڵ نەبوون بەڵکو تاکەکەس بوون. مەملەکەتەکانی ئێمە لەناو ئەقڵی هەریەکێک لە پیاوەکاندایە

حەوت کۆڵەکەی ژیری، (تی ئی لۆرێنس ١٨٨٨–١٩٣٥)

## کلیلی دەسەڵات

لە گەمەی دەسەڵاتدا تۆ بەو خەڵکە دەورە دراویت کە بەشێوەیەکی ڕەها هیچ پاساوێکیان نییە بۆ یاریبەتبدانی مەگەر ئەوەی لەبەرژەوەندییان بێت. ئەگەر تۆش هیچت نەبێ بۆ بەرژەوەندیی خۆییان پێشکەشیان بکەیت، ئەوا لەوانەیە بیانکەیتە دوژمن، چونکە ئەوان تەنیا ڕکابەرێکی تر، بەهەدەردەرێکی تری کات لەتۆدا دەبینن. ئەوەی کە ئەم ساردییە زاڵە کۆنترۆڵ دەکەن ئەوانەن ئەو کلیلە دەدۆزنەوە کە دڵ و ئەقڵ بێگانەکە دەکاتەوە، بەرەو سۆچەکەمان بەکێشیان دەکات و ئەگەر پێویستبێت شلیان دەکات بۆ لێدان. بەڵام زۆربەی خەڵکی لەت ئەم بەشەی گەمەکە فێر نابن. کاتێک ئەوان کەسێکی نوێ دەبینن، لەبری گفتەوە و تاوتوێکردن بۆ بینینی ئەوەی چ شتێک ئەم کەسە دەکاتە ناوازە، باسی خۆیان دەکەن و ئامەزرۆیان لوتبەرزی و ئیرادەی هێزی خۆیان بسەپێنن. ئەوان شاناری دەکەن، پێز پێدەدەن و نمایشێکی دەسەڵاتی خۆیان دەکەن لەوانە ئەوان ئەمە نەزانن، بەڵام بەبێدەنگی دوژمنێک، بەرەنگارێک دروست دەکەن، چونکە هیچ هەستێک ئەوەندە توڕەبر و کینە دروستکەر نییە کە تاکیتیت لەرامۆش بکرێت، سایکۆلۆژیات پێی بەرانرێت. ئەمە بێ گیان و کینەئامێزت دەکات.

بیرت بێت: کلیلی ڕاڕیکردن بریتییە لە شلکردنی خەڵک و هارپیان؛ بە نەرمی بە شێوازێکی دوو سەرە لێیان نزیک بکەوە: کار لەسەر هەستەکانیان بکە و یاری لەسەر لاوازیی فیکرییان بکە. وریا بە لەبەرانبەر ئەو شتەی کە لە هەر کەسێکی تر جیایان دەکاتەوە (سایکۆلۆژیی تاکەکەسییان) و ئەو شتەی لەگەڵ هەموو کەسێک تیایدا هاوبەشن (کاردانەوە هەستییە بنچینەییەکانیان). هەستە سەرەکییەکانیان بکە ئامانج – خۆشەویستی، ڕق، غیرەیی. هەر کە هەستە سەرەکییەکانیان بجوڵێنیت، ئەوا کۆنترۆڵیانت کەم کردۆتەوە، لەبەرانبەر ڕازیبوونیدا نەرمترت کردوون.

بەکۆتاییدا فێر بە گەمەی ژمارەکان بکەیت. چەندەی بناغەی پشتیوانیت فراوانتر بێت ئەوەندە دەسەڵاتت بەهێزتر دەبێت. بە شێوەیش لەوەی کە دەشێ کەسی گۆشەگیر،

پۆخی نارەزای دەشێ پزیشکی بەرەڵستی بهاوێت، لەبری ئەمە هەختی کردەوە لەوەی کە خۆی لای نزیکترین ئەندامانی ستافەکەی خۆشەویست بکات تۆش پێویستە بە بەردەوامی بلندترین هاریکاریمان لەهەموو ئاستەکاندا بەدەست بێنیت– کاتێک دێت کە پێویستت پێیان دەبێت

**وێنە:** کونی کلیل، خەڵکی دیوار بونیاد دەنێن بۆنەوەی دوورت بخەنەوە ئەت بەزۆر خۆتی پیا مەکە– تۆ تەنیا دیواری تکر و تۆزترت دێتە پێش. ئەم دیوارانە دەرگایان هەن مەرەو دڵ و ئەقڵ و کونی بچوکیان تێدان. لە کونەکەوە سەرنج بدە، ئەو کلیلە بدۆزەرەوە کە دەرگاکە دەکاتەوە و ئیتر تۆ دەستت بە ئیرادەیان دەگات بەبێ هیچ نیشانەیەکی چووەژوورەوەی بەزۆر.

**دەسەڵات:** ئەگەرەکانی ڕێگەی ڕازیکردن لە ئاسیمدایە بۆ دڵی کەسی ڕاڕەوی بۆنەوەی لێرەوە ڕشەی گونجاو بۆی دەرمەوە ..لەبەر ئەم هۆکارە، هەرکەسێک هەوڵی ڕازیکردن بدات لەبەردەم ئەمندا، پێویستە بە وریاییەوە چاودێری هەستەکانی پاک بکات لەمەڕ خۆشەویستی و ڕق، نهێنیی هیوا و ترسەکانی، پێش ئەوەی بتوانێت دڵی بگرێت.

(هان فێی تزو، فەیلەسوفی چینی، سەدەی سێیەمی پێش زایین)

**پێچەوانەبوونەوە**

ئەم یاسایە ئەگەری پێچەوانەبوونەوەی نییە

## یاسای ژماره ٤٤

# به کاریگەریی ئاوێنە، کەسەکە دەستەوستان و تووڕە بکە

**جوکە**

*ئاوێنە وێنەدەرەوەی واقیعە، بەڵام بەهەمان شێوەش ئامرازێکی تەواوە بۆ فریودان؛ کاتێک تۆ ئاوێنەی دوژمنەکەتی، کتومت ئەو شتە دەکەیت کە دەیکەن، ئەوان ناتوانن لە ستراتیژەکەت تێبگەن. کاریگەریی ئاوێنە دەیانکاتە گاڵتەجاڕی، وایانلێدەکات زیدەکاردانەوە پیشان بدەن. بە پیشاندانی ئاوێنە بە دەروونیان، بەو وەهمە فریویان دەدەیت کە تۆ لە بەهاکانی ئەواندا هاوبەشیت. بە پیشاندانی ئاوێنە بە کردارەکانیان، وانەیەکیان فێر دەکەیت. کەسانێکی کەم دەتوانن بەرەنگاریی هێزی کاریگەریی ئاوێنە بکەن.*

**کاریگەرییەکانی ئاوێنە جۆرپەندیی پێشەکی**

ئاوێنەکان هێزی ئەوەیان هەیە هەراسانمان بکەن. بە ورتبوونەوەمان لە ئاوێنە، زۆرجار ئەو شتە دەبینین کە دەمانەوێ بیبینین — ئەو وێنەی خۆمان کە بەرزترین ئاست پێی ئاسودەین. ئێمە زۆر لە نزیکەوە ناڕوانین، چرچی و لۆچی و پەڵەکان فەرامۆش دەکەین. بەڵام ئەگەر بە کۆششەوە بڕوانینە وێنەی ئاوێنەکە ئەوا هەندێ جار هەست دەکەین خۆمان بەو شێوەیە دەبینین کە ئەوانیتر دەمانبینن، وەک کەسێک لەنێو کەسانی

تردا، بابەتێك نەك بكەرێك. ئەو هەستە لەزمان لیببێت-ئێمە خۆمان دەبینین، بەڵام لەدەرەوەڕا، بەبێ بیرکردنەوەکان و ئەو ڕاڵەی ئاگاییمان پڕ دەکات. ئێمە شتێکین.

لە ڕێگەی بەکارهێنانی کاریگەریی ئاوێنە، ئێمە بەشێوەیەکی پەنەی دەسەڵاتی هەراسانکەر دروست دەکەینەوە، لە ڕێگەی وێنەدانەوەی کردارەکانی خەڵکی تر، لاسایکردنەوەی جوڵەکانیان بۆ ماجیگیرکردن و توڕەکردنیان. بەڕەی کە هەست بە گاڵتەپێکردن، بە کەرەستەبوون و وێنەیەکی بێ ڕۆح دەدەکەن، توڕە دەبن. یان هەمان شت بکە بە کەسێك جیاوازییەوە و لەوانەیە هەست بە دەستەوەستانی بکەن- بۆ بەشێوەیەکی کامڵ هیواکانیان و ئارەزووەکانیانت پیشان داوەتەوە. ئەمە هێزی سرسیستبانەی ئاوێنەکانە. لە هەر حاڵەتێکدا بێت، کاریگەریی ئاوێنە ئامانجەکانی ماجیگیر دەکات، چ ئەوەی توڕەیان بکەیت یان کاریگەرییان بخەیتە سەر و لەم بارەدا تۆ دەسەڵاتی بەکاربردن یان بەکێشکردنیانت هەیە. کاریگەرییەکە بریتییە لە هێزێکی گەورە چونکە کار لەسەر بەراییترین هەستەکان دەکات.

### پەیڕەوی لە یاساکە

لە ١٦٥٢دا، بارۆنێس ماسیتی کە تازە بێوەژن کەوتبوو خێزانەکەی لە ڕۆمەوە گواستەوە بۆ پاریس کە لەوێ توانی پشت بە کاریگەری و پارێزگاری کاردینال مازارینی برای ببەستێت کە سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا بوو. لە پێنج کچەکەی بارۆنێس، چوریان بە خوشکەکانیان کاریگەرییان لەسەر دەربار دانا. ئەم خوشکەرا بێ ڕادە جوانەی کاردینال مازارین بە مازارینێتیس ناسران و بەرووی بۆ ئەرکە هەرە گرنگەکانی دەربار بانگهێشت کران. یەکێك لە کچەکان، ماری ماسینی، ئەو جوانی و شکۆیەی نەبوو- و خوشکەکانی و دایکی و تەنانەت کاردینال مازارینیش ڕقیان لێی بووەوە لەبەرئەوەی هەستیانکرد ویەی جانەوادەکەی شێواندووە. ئەوان هەوڵیاندا ڕازی بکەن بچێتە کەنیشە کە لەوێ کەمتر دەبووە مایەی شەرمەزاری، بەلام ئەو ڕەتی کردەوە، لەبری ئەمە پڕۆانە سەر سەعی و دەرس، فێربوونی لاتینی و یونانی و باشکردنی فەرەنسییەکەی و

پرلوەکردنی خارەرابەتییەکانی میرویك. لە بونە دەگمەنەکاندا کاتێك حێزانەکە ڕێگەی دەدا بەشداری کاروباری دەربار بێت، خۆی ڕامێنابوو کە گوێگرێکی لێزان بێت، حەلکی لە حالە لاوازەکانیان و نارەرووە شاراوەکانیاندا بگرێت. کاتێکیش کە بۆ دواجار لە ١٦٥٧ چاوی بە پاشای داماتوو لویسی شانزە کەوت (لویس حەفدە سالان و ماری هەژدە سالان بوو)، بڕیاریدا حامەوادەکەی و حالی هەراسان بکات، ئەو ڕێگەیەکی دەدۆزییەوە تا والەم گەمەجە بکات بکەوێتە داوی خۆشەویستییەوە

ماری بۆی دەرکەوت کە کلیل بۆ دڵی لویس ئەوەیە ئاوێنەیەك بونیاد بنێت کە پیشاندەری فەنتازیاکان و ئاواتە گەنجییەکانی بێت بۆ شکۆ و ڕۆمانسیەت. لەسەرەتادا ئەو خۆی لە ڕۆمان، شیعر و شانۆییە ڕۆمانسییەکاندا نوقم کرد کە ئەو دەیزانی پاشای گەنج بە ئەمەرووییەوە دەیانخوێنێتەوە. کاتێك لویس دەستیکرد بە وتوێژ لەگەڵیدا، لویس شاد بوو کە بۆی دەرکەوت ئەو شتانەی ڕۆحی دەجوڵێنێت، ئەو کچە باسیان دەکات– باسی فاشن و ڕەمکردن نەبوو، بەڵکو باسی خۆشەویستی دەربار و کردارەکانی سوارچاکە مەربەکان و حانەدانێتی پاشا و پاڵەوانەکانی ڕابردوو بوو. ئەو تێبوێتی ئەوی بۆ شکۆ شکاند لە ڕێگەی دروستکردنی وێنەی پاشایەکی بالا کە ئەم دەیتوانی پارمەتیدەر بێ پێی بگات. ئەو وێناکەی جولاند.

لەکاتێکدا کە پاشای خۆری داهاتوو کاتی زۆر و زۆرتری لەگەڵ ماری بەسەر برد، سواجار بەبێ بزوە کە کەوتۆتە داوی خۆشەویستی کچێکی دەربارەوە کە کەمترین ڕێی تێدەچوو. هۆش و ئەرکێری زۆری خستە سەر ئەم کچە و خوشکەکانی و دایکتی ترسیان لێ نیشت. ئەو بەڵێنی بە ماری دا کە هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات و دەیکاتە شاژنی خۆی

لەگەڵ ئەوەشدا مرازین قەت ڕێگەی نەدەدا پاشا هاوسەرگیری لەگەڵ خوشکەزاکەیدا بکات، ژنێك کە نەیدەتوانی هاوپەیمانی شاهانە و دیپلۆماسی بۆ فەرەنسا مسۆگەر بکات. دەبووایە لویس هاوسەرگیری لەگەڵ میرێکی ئیسپانیا یان نەمسا بکات. لە ١٦٥٨دا لویس پەنای بردە بەر گوشار و چاوچنۆکی بوونەوەی یەکەمین پەیوەندی

ڕۆماسی ژیانی نشکێنێت. ئەو بە پەشیمانییەکەی ڕێزەوە نەمەی کرد و لەکۆتایی ژیانیدا دانی بەوەدانا کە قەت کەسی ئەوەندەی ماری ماسیبی خۆش نەویستووە

## لێکدانەوە

ماری ماسیبی کەمەی فریودەری بەوپەڕی لێهاتووییەوە ئەنجامدا سەرەتا هەنگاوێک چووە دواوە بۆئەوەی تاوتوێی نێچیرەکەی بکات. زورجار فریودان ناتوانن یەکەمین هەنگاو ببڕێت چونکە زۆر توندە، یەکەمین هەنگاو دەبێ هەمیشە کشانەوە بێت پاش تاوتوێکردنی پاشا بە دوورەوە، ماری ئەو شتەی بینی کە پاشا لەواستر جیا دەکاتەوە- ئایدیالە بەرزەکانی، سروشتە ڕۆمانسییەکەی و لوتبەرزی و سوکبینی بۆ سیاسەتی ناچیزە هەنگاوی دواتری ماری دروستکردنی ئاوێنەیەک بوو بۆ ئەم هیوایەتە شاراوانەی لویس، پیشاندانی نیمەتێکی ئەوەی کە دەکرێ ئەم پیاوە کێ بێت- پاشایەکی خوداناسا!

ئەمەیە هێزی ئاوێنەی فریودەر بەدرووقات زیادکردنی ڕەوق و ئایدیالەکانی نامانجەکە، ئەرکیری تۆ بۆ سایکۆلۆژییەکەی پیشان دەدات، تەرکیرێک کە زۆر کاریگەرترە لە هەر سۆزاحکردنێکی شەڕانگیزانە. بزانە چ شتێک ئەو کەسە جیا دەکاتەوە، پاشان ئاوێنەیەک بە دەستەوە بگرە کە وێنەدەرەوەیەتی و لیباس دەردەبیت. بە وێنەدانەوەی ئایدیالەکانیان فەنتازیاکانی مەرمایەتی و دەسەلاتیان بەبێت و دەرلەمەند بکە و ئەوانیش مل دەدەن

## پەیڕەوی لەپاساکە ٢

مامۆستای گەورەی مەراسیمی چایی ژاپۆنی سەدەی شانزە (تاکینۆ شۆ) جارێکیان بەلای مالێکدا تێپەڕی و تێبینی ئەوەی کرد کە گەنجێک لەمرێک دەرواەکەوە خەریکی ئاودانی گوڵانە دوو شت سەرنجی ئەوی ڕاکێشا- یەکەمیان، ئەو شێوازە جوانەی کە

بەهۆیەوە پیاوەکە ئەرکەکەی بەجێ دەگەیاند و دوودەم، ئەو گوڵە ڕەزە جوانەی شارۆن کە لەناو باخەکە شکۆفەیان دەکرد. ئەو وەستا و خۆی بە پیاوەکە ناساند کە ناوی (سێن نۆ ریکیو) بوو، (شۆ) ویستی ببینێتەوە، بەڵام کاری پێشینەی هەبوو و دەبووایە بەڵە بکات. پێش ئەوەی بڕوات، ریکیو بانگهێشتی کرد بۆ خواردنەوەی چایی لەگەڵیدا لە بەیانیی دواتردا. (شۆ) بە خۆشحاڵییەوە قبوڵی کرد.

کاتێک (شۆ) ڕۆژی دواتر دەروازەکەی کردەوە، ئەو سەری سوڕما لەوەی تاکە گوڵێک نەماوە. زیاتر لە هەر شتێکی تر، ئەو دەبووایە ئەو شکۆفانە ببینێت کە کاتی خۆی ڕۆژی پێشتر ستایشیان بکات، ئێستاش چیتر نەمابوون. ئەو هەنگاویدا بۆ پێشەوە، بەڵام لە دەروازەکە وەستا و بڕیاریدا بچێتە ژووری چایی (سێن نۆ ریکیو). هەر کە لەناوەوە بوو، لە ڕێڕەوەکاندا وەستا و بە سەرسامییەوە سەرنجیدا: لەپێشەوە ئینجانەیەک لە بنمیچەکەوە هەڵواسرابوو و لە ئینجانەکەدا تاکە گوڵەباخێکی شکۆفەی (شارۆن) هەبوو کە جوانترین گوڵی باخەکە بوو. بەشێوەیەک لە شێوەکان سێن نۆ ریکیۆ بیرکردنەوەی میوانەکەی خوێندبۆوە و بەم ئاماژە ڕەوانە، ئەوەی پیشاندابوو کە ئەم میوان و خانەخوێیە لەهەماهەنگییەکی باشدان

سێن نۆ ریکیو بووە بەناوبانگترین مامۆستای مەراسیمی چایی و مارکە بازرگانییەکەی ئەم توانا زیرەکانەیە بوو بۆ هارمۆنیزەکردنی خۆی لەگەڵ بیرکردنەوەکانی میوانەکانیدا و بیرکردنەوەی هەنگاوێک لەپێشتر و جادووگەری لە ڕێگەی خۆگونجاندن لەگەڵ ڕەوتیاندا

ریکیو نە جادووگەر بوو و نە خاسەی شەشەمی هەبوو- ئەو بە وردی دەیڕوانیە کەسانی دەوروبەری، ئاماژە وردەکانی دەخوێندەوە و ئارەزووە شاراوەکانی دەردەهێنا، پاشان وێنەی ئەو ئارەزووەی بەرهەم دەهێنا. هەرچەندە شۆ قەت باسی ئەوەی نەکرد کە کەوتۆتە ژێر سیحری شکۆفەکانی (شارۆن)، ریکیو ئەمەی لە چرچەکانیدا خوێندەوە. ئەگەر وێنەدانەوەی ئارەزووەکانی کەسێک بەمانای کەوتنە ناو چاڵێک بێت، با وابێت. هێزی ریکیو لە بەکارهێنانی لێهاتووانەی (ئاوێنەی دەرباری)دا بوو کە ڕواڵەتی توانایەکی نائاسایی پێدا بۆ بینینی ناخی خەڵک

فێر بە ئاوێنەی دەرباری بڕوانیتەوە، چونکە ئەمە دەسەڵاتێکی بەهێزت دەداتێ، چارەکانی خەڵک بخوێنەرەوە، شوێنی ئامانجەکانیان بکەوە- پێوەری دڵنیایەختی ئازار و خۆشی بە بەراورد بە هەر وەهمەیەکی ونراو تێبینی وردەکاری بکە و ببیت بێت- پاشاکە، هەڵفڕاندنی دۆستان، خووی بڕۆڵە- کە ئارەزووی شاراوە دەردەخەن. ئەمەیە کلیلی دەسەڵات: ئەوێتر داوای تێبینیکردنی لەلایەن تۆوە نەکردووە، هیچ خۆشی بینینی لە گوڵەکان باس نەکردووە و کاتێک تۆ ئارەزووەکەی خۆی بۆ باس دەکەیتەوە، ئەوا ئارەزووەکەی زیاتر دەبێت چونکە پرسیاری لێ نەکراوە پەیوەستبکردنی بێ وشە، گشتخۆشیی ناڕاستەوخۆ، زۆرترین دەسەڵات دەگرێتەخۆ. کەس ناتوانێت بەرگەی جادووی (ئاوێنەی دەرباری) بگرێت

**دەسەڵات:** ئەرکی تۆپەراسپۆنی سەرباری بریتییە لە دەست و پەنجە نەرمکردن لەگەڵ نیارەکانی دوژمن ..سەرەتا وەلامگۆ بوون بۆ ئەو شتانەی کە دەیانەوێت، چارەپێکردنی شاراوە دیسپلین بەرقەرار بکە و لەگەڵ دوژمن خۆت بگونجێنە ..ئیترەوە سەرەت تۆ وەک کارگوزارێک وەهایت، بۆئەوەی دوژمن دەرگاکەی بکاتەوە، پاشان وەک کەروێشکێکی بەپەلا وەهایت، بۆئەوەی دوژمن نەتوانێ ئتکاتە دەرەوە. (سون تزو، سەدەی چوارەمی پێش زایین).

**وێنە:** ئەڵەمی پیرسیوس وەک ئاوێنەیەکی وێنەدەرەوە پۆلش کراوە میدوسا ناتوانێ بتبینێت، تەنیا دزێوییەکەی خۆی لێوە وێنەدەدرێتەرە لە پشت ئاوێنەیەکی وەهاوە تۆ دەتوانیت فریو بدەیت، گاڵتە پێبکەیت و تووڕە بکەیت بە یەک لێدان سەری بێ ئاگای میدوسا دەپەڕێنیت

## وریاکردنەوە بەئاگابە لە بارودۆخە وێنەدراوەکان

ئاوێنەکان دەسەڵاتێکی گەورە دەگرنەخۆ بەلام بەهەمان شێوە هەڵدێری مەترسیداریشن، بە بارودۆخی وێنەدراوەشەوە- بارودۆخێک کە پێدەچێ وێنەدەرەوە یان

موولنمیکی مریکی ئەوەی پێشوو بێت، زۆرجاریش لە ستایل و ڕواڵەتی دەرەوەدا تۆ دەتوانیت زۆرجار بگەڕێیتەوە ناو ئەو ماوەیەی بەبێ ئەوەی بەتەواوی تێیبگەیت لەکاتێکدا کە ئەزموونەی دەوروبەرت بەباشی لێی ئاگادەکەی و بەراوردی ئەمە و تۆ بە هەر شتێک دەکەی کە پێشتر ڕوویداوە، زۆرجار تۆ بە دەست ئەو بەراوردەوە ئازار دەچێژیت، یا لاوازتر دیار دەبیت لە شوێنگری پێشووت یان ئەوەتا زەمراوی بوویت بە هەر ڕاپەڵێکی هەڵسانکەر کە ئەو کەسە جێی هێشتووە.

خۆت لە کاریگەریی ڕاپەڵ بووبەرە لادە وەک ئەوەی کە بەڵایەک بێت. لە باروودۆخێکی وشەیەرلوەدا هیچ کۆنترۆڵێک یان کۆنترۆڵێکی کەمت هەیە بەسەر وێنەدانەوە و یادەوەرییەکاندا کە دەبەسترێنەوە بە تۆ و هەر باروودۆخێکی ئەوەیش کۆنترۆڵی تر مەترسیدارە ئەنانەت ئەگەر کەسەکە یان ڕووداوە ڕاپەڵی پۆزەتیڤیشی هەبن، ئازار دەچێژیت کە ناتوانیت لە ئاستیاندا بیت، چونکە ڕابردوو بەشێوەیەکی گشتی گەورەتر لە ئێستا دیارە. ئەگەر تۆ تێبینی ئەوە بکەیت کە خەڵکی ڕاپەڵت دەکەنەوە بە ڕووداوێک یان کەسێکی ڕابردوو، هەموو ئەو شتە بکە کە دەتوانیت بۆئەوەی خۆت لەو یادەوەرییە جیا بکەیتەوە و وێنەدانەوەکە بشکێنیت

## یاسای ژمارە ٤٥

# لەسەر پێویستیی گۆڕان وتار دابدە، بەڵام قەت ڕیفۆرمی زۆر لە پڕێکدا ئەنجام مەدە

### حوکم

*لە ئەبستراکتدا هەموو کەسێک لە پێویستی بۆ گۆڕان تێدەگات، بەڵام لە ئاستی ڕۆژ لەدوای ڕۆژدا خەڵکی بەندەوەری خوون. تازەگەریی زۆر زیانبەخشە و سەرئێشەت بۆ پەیدادەبێت. ئەگەر تۆ لە پێگەیەکی دەسەڵاتدا نوێیت، یان شکانەیەکیت و دەتەوێ سامانەیەکی دەسەڵات بونیاد بنێیت، نمایشێکی ڕێزگرتن لە شێوازی کۆنی ئەنجامدانی شتەکان بکە. ئەگەر گۆڕان پێویست بێ، وا بکە هەست بکرێت کە باشکردنێکی نەرم و نیانی ڕابردووە.*

### سەرپێچی لە یاساکە

لە کاتێکی ١٥٢٠ەکاندا، پاشا هێنری هەشتەمی ئینگلتەرە بڕیاریدا ژنەکەی تەڵاق بدات، واتە کاترینی ئەراگۆن، چونکە ئەو نەیتوانیبوو کوڕێکی بۆ بهێنێتە دنیاوە و لەبەرئەوەی خۆی عاشقی کەسێک ببوو بەناوی ئان بۆلین. پاشا کلێمێنتی حەوتەم، دژی تەڵاقدانەکە بوو و هەڕەشەی دەربەدەرکردنی لە پاشا کرد. وەزیری هەرە بەهێزی

پاشاش، کاردینال زلسی هیچ پێویستییەکی نەبینی لە تەلاقدانی ئەو ژنەدا– و پشتیوانیی نابەدڵانەی بۆ پاشا بووە هۆی بەندکردنی و دوایی مەرگیشی لەسەر دەستا

پیاوێک لە کابینەکەی هێنری بەناوی تۆماس کرۆمویل نەک تەنیا پشتگیری پاشای کرد بەڵکو بیرۆکەی بەنیوەباپیشی هەبوو بۆی دابڕانێکی تەواوەتی لە رابردوو. ئەو پاشای رازیکرد تا بە برینی پەیوەندییەکان لەگەڵ رۆم و کردنی خۆی بە سەرۆکی کەنیسەی ئینگلیزی تازەپێکهاتوو، کاسرین تەلاق بدات و هاوسەرگیری لەگەڵ ئان بکات. بەهاتنی ١٥٣١، هێنری ئەمەی بە تاکە چارەسەر بینی. بۆ پاداشت دانەوەی کرۆمویل لەبەرسەر ئەم بیرۆکە لیهاتووانەیە، کوڕی ئاسنگەرێکی بەرز کردەوە بۆ پۆستی راوێژکاری شاهانە بەهاتنی ساڵی ١٥٣٤ کرۆمویل کرابووە سکرتێری پاشا و وەکو دەسەڵاتی پشت تەخت ببووە بەهێزترین پیاو لە ئینگلتەرە

بۆ ئەوەی پاساوی پلانەکەی بدات، کرۆمویل هەندێ چیرۆکی بڵاو کردەوە لەبارەی گەندەڵی لە پەرستگاکانی ئینگلیز و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتیان و بەکاربردنی ئەو خەڵکەی کە قەرار وابووە خزمەتیان بکات. پاش ئەوەی پشتیوانیی پەرلەمانی بەدەستهێنا بۆ داخرانی پەرستگاکان، ئەو دەستیکرد بە زەوتکردنی موڵک و ماڵەکانیان و لەنێوبردنیان. لەهەمان کاتدا، دەستیکرد بە سەپاندنی پرۆتێستانتیزم، گەڵاڵەکردنی ریفۆرم لە سروتی دینی و سزادانی ئەوانەی کە دەستیان بە کاسۆلیسیزمەوە گرتبوو کە ئێستا بە لادەری دینی داوەنیر دەکران. تەقریبەن بە شەو و رۆژێکدا، ئینگلتەرە بۆ دینێکی رەسمیی نوێ وەرگەڕا

ترس بەرۆکی وڵاتی گرت. هەندێ لە خەڵکی بەدەست کەنیسەی کاسۆلیکی ئازاریان چەشتبوو کە پێش ئەوەی ریفۆرمەکان بێن و کاریگەری پەیدا بکەن، بەڵام زۆربەی بریتانییەکان پەیوەندیی بەهێزیان بە کاسۆلیسیزم و سروتە ئاسودەبەخشەکانیەوە هەبوو. ئەوان دەیانبینی چۆن کەنیسە، دێر و پەنجەرەکانی و گەنجینەکەی زەوت دەکرێن. لە ساڵی ١٥٣٥دا، یاخیبوونی بەهێز لە باکووری ئینگلتەرە هەڕەشەیان بۆ مانەوەی هێنری لەسەر تەخت دروستکرد. بەهاتنی ساڵی دواتر ئەو یاخیبوونەکانی

سەرکەوت کردبوو بەڵام بەهەمان شێوە بەرەبەرە باجی ڕیفۆرمەکانی کرۆمویلی دەبینی پاشا خۆی قەت نەیدەویست ئەوەندە پێ لەبەرەی تێپەڕێنێت. ئەو تەنیا دەیویست تەڵاقدانەکە مەیسەر ببێت. ئێستا نۆرەی کرۆمویل بوو تا بە نارەحەتییەوە بڕوانێت لەکاتێکدا کە پاشا بەرەبەرە دەستیکرد بە هەڵوەشاندنەوەی ڕیفۆرمەکانی، دانانەوەی پیرۆزییەکانی کاسۆلیک و ئەو سروتانەی کە کرۆمویل قەدەغەی کردبوون.

هەر کە هەستیکرد لە شکڵ دەکەوێت، لە ١٥٤٠دا کرۆمویل بڕیاریدا پەیوەندی هێنری بەدەست بێنێتەوە بەوەی کە پلانێکی تری بۆ داڕێژێت: ئەو ژنێکی نوێی بۆ پاشا دەدۆزییەوە. ژنی سێیەمی هێنری، جەین سەیمۆر پێش چەند ساڵێک مردبوو و ئەویش بەدوای شاژنێکی گەنجی نوێدا دەگەڕا. ئەوە کرۆمویل بوو دانەیەکی بۆ دۆزییەوە، ئانی کلیڤ، میرێکی ئەڵمانی و لەهەموویشی گرنگتر بۆ کرۆمویل ئەوە بوو کە پرۆتێستانت بوو. بە ڕاسپاردەی کرۆمویل هۆلبینی وێنەکێش وێنەیەکی ئانی کێشا و کاتێک هێنری وێنەکەی بینی عاشقی بوو و ڕازی بوو هاوسەرگیری لەگەڵ بکات. پێدەچوو کرۆمویل گەڕابێتەوە ناو دڵی پاشا

لەگەڵ ئەوەشدا، بەداخەوە، وێنەکەی هۆلبین زۆر لە سووری خۆی جوانتر کێشرابوو و کاتێک بۆ دووجار پاشا میری بینی، بەهیچ شێوەیەک نەچووە دڵیەوە. تووڕەییەکەی لەبەرانبەر کرۆمویل– سەرەتا لەبەرئەو ڕیفۆرمە ئەنجام خراپەکان و ئێستاش لەبەر هەوڵی قەناعەتپێهێنانی لەبەرسەر هاوسەرێکی پرۆتێستانتی ناشیرین– چیتر بەری پێ نەدەگیرا. لە مانگی شەشی ئەو ساڵەدا، کرۆمویل دەستگیر کرا، تۆمەتی بەرگیری پرۆتێستانتی و لادانی دینی خرایە پاڵ و نێردرا بۆ تاوەر. شەش هەفتە دواتر، لەبەردەم جەماوەری تامەزرۆ، جەلادی گشتی سەری پەڕاند

## لێکدانەوە

تۆماس کرۆمویل بیرۆکەیەکی سادەی هەبوو: ئەو دەسەڵات و سامانی کەنیسەی دەشکاند و بناغەی پرۆتێستانتیزمی لە ئینگلتەرە دادەنا. ئەمەشی لە ماوەیەکی کورتی

خۆی دەبەستەوە بە بیرۆکەی فەلسەفی ناسراو بە (یاساگەرایی) کە نووسینەکانی هان فەی تزو نوێنەری بوو. یاساگەراکان ئیتیکی کۆنفۆشیوسیان سووک کرد و باوەڕیان بە پێویستی توندوتیژی هەبوو بۆ دروستکردنی سیستەمێکی نوێ: دەسەڵاتیان دەپەرست. بۆئەوەی لە ململانێکەدا قورسایی بداتە خۆی، ماو هەڵمەتێکی پروپاگەندەی لەسەرانسەری چیندا لەدژی کۆنفۆشیوس بلاو کردەوە و کەوتە جولاندنی باخیگەرێتی لەدژی ئەوەی کۆن.

**لێکدانەوە**

هیچ گەلێک ئەوەندەی چینییەکان پەیوەست نەبوون بە ڕابردووەوە لەبەرامبەر ئەگەرەی گەورەی بەردەم پڕۆژەکەیدا، ستراتیژی ماو سادە بوو: لەبری ململانێ لەگەڵ ڕابردوودا، ئەو لەبەرژەوەندیی خۆی شکاندییەوە، کۆمەبیستە ڕادیکاڵەکانی گرێ دایەوە بە کەسایەتیە ڕۆمانسیەکانی مێژووی چین. پاش ئەوەی کە هەڵەیەکی گەورەی بە (بازدانی مەزن بەرەو پێشەوە) ئەنجامدا لە هەوڵی ئەوەی مۆدێرنیزەکردن بەسەر وڵاتدا بسەپێنێت و بە توندی شکستی هێنا، جارێکی تر هەڵەکەی دووبارە نەکردەوە. لەو کاتە بەدوا، دەبووایە گۆڕانکاریی ڕادیکاڵ بە پۆشاکی ئاسودەبەخشی ڕابردوو داپۆشرێت.

وانەکە سادەیە: ڕابردوو بەهێزە. ئەوەی کە پێشتر ڕوویداوە مەزنتر دیارە. خوو و مێژوو قورسایی دەدەنە هەموو شتێک. ئەمە لە بەرژەوەندیی خۆت بەکار بێنە. کاتێک تۆ شتێکی ئاشنا تێکدەشکێنیت، بۆشاییەک دروست دەکەیت، خەڵکی لەو پەشێوییە دەترسن کە وەک لافاو دێت بۆ پڕ کردنەوەی. دەبێ بەهەموو تێچوویەک خۆت لە وروژاندنی ئەو ترسە بپارێزیت.

*دەبێ ئەوە ڕەچاو بکرێت کە هیچ شتێک قورستر نییە بۆ جێبەجێکردن، هیچ شتێک گومانلێکراوتر نییە بۆ سەرکەوتن، مەترسیدارتر نییە لە دەست و پەنجە نەرمکردن لەگەڵیدا، لەوەی کە زەمینەسازیی سیستەمێکی نوێی شتەکان بکەیت.*

*نیکۆلۆ ماکیاڤێلی،* ١٤٦٩–١٥٢٧

## کلیلی دەسەڵات

سایکۆلۆژیای مرۆڤ زۆر دوفاقیتی هەڵدەگرێت، یەکێکیان ئەوەیە کە لەکاتێکدا کە خەڵکی لە پێویستی بۆ گۆڕانکاری تێدەگەن، دەزانن چەندێک گرنگە بۆ دامەزراوەکان و تاکەکان کە تازەباو نوێ ببنەوە، ئەوان بەهەمان شێوە هەراسان و نارەحەت دەبن بەو گۆڕانکارییەی بەشێوەیەکی شەخسی کاریان تێدەکات. ئەوان دەزانن گۆڕان پەروورە و تازەیی قوتاربوونێک لە بێزاری دابین دەکات، بەڵام لەقووڵایی ناخیاندا دەست بە ڕابردووەوە دەگرن. گۆڕانی ڕووکەش ئارەزوو دەکەن، بەڵام گۆڕانکارییەک کە خووە جەوهەرییەکانیان و ڕۆتینەکانیان بە قووڵی دەشڵەقێنێت، دەبێتە مایەی هەراسانبوونیان.

تێبگە ڕاستی ئەوەی کە ڕابردوو مردووە و لەگۆڕنراوە، ئازادیی ئەوەت دەداتێ تەرجەمەی بکەیتەوە بۆ پشتیوانی لە دۆزەکەت، فاکتەکان دەستکاری بکە. ڕابردوو تێکستێکە کە تێیدا دەتوانیت بە سەلامەتی دێڕەکانی خۆت دابنێیت

ئەگەر تۆ لە سەردەمێکی پەشێودا کار بکەیت، دەسەڵاتێک هەیە کە بەوتاردان لەمەڕ گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، بۆ ئاسوودەیی بۆ نەریت و سروت بەدەست بێت. کەچی لەماوەی چەقبەستندا، یاری بە کارتی ریفۆرم و شۆڕش بکە- بەڵام ئاگاداری ئەو شتە بە کە دەیوروژێنیت. ئەوانەی شۆڕشێک تەواو دەکەن بە دەگمەن ئەوانەن کە دەستی پێدەکەن تۆ لەم گەمە ترسناکەدا سەرکەوتوو نابیت ئەگەر ئامادەنیت نەبیت بەرچەکرداری حەشی لەدژی بەربەست بکەیت لە ڕێگەی یاریکردن بە ڕواڵەتەکان و بونیادنان لەسەر ڕابردوو.

**دەسەڵات**: ئەو کەسەی ئارەزوو دەکات یان هەوڵ دەدات ریفۆرمی حکومەت بکات و هیوادارە قبوڵ بکرێت، دەبێ لانی کەم هاوشێوەییەک لەگەڵ فۆرمە کۆنەکان دروست بکات بۆئەوەی وا دیار بێت بەلای خەڵکییەوە کە گۆڕانکاری لە دامەزراوەکاندا

ڕووبەداوە، ئەگەرچی لە ڕاستیدا سەرلیا جیاوازن لە کوێەکان چونکە زۆربەی هەرە زۆری مرۆڤایەتی بە پوڵەتەکان ئاسودەن، وەک بڵێی ئەمانە واقیعن

(نیکۆلۆ ماکیاڤیللی)

**وێنە:** پشیلە ڕیسەمۆرەی هووە، هەری لە گەرم و گوڕیی ئاشنایە ڕێتیبەکانی تێکدەدا، پەستاییەکەی لێ شێوێنە و نیتر دەرووی تێکدەچێت هێوری مکە مەوەی کە پشگیریی سروتەکانی مکەیت ئەگەر گوڕان پێویستە، پشیلەکە فریو مدە مەوەی بۆیی ڕابردوو مە ڕیسوێتی مهێلەتەوە، ئەو شتانەی بەلایەوە ئاشنان لە شوێنە ستراتیژییەکان دابنێ

**پێچەوانەکەی**

ڕابردوو لاشەیەکە بۆ بەکارهێنان بەو شێوەیەی کە تۆ مەگونجاوی دەبینی ئەگەر ئەو شتەی لە ڕابردووی ئەم دواییە ڕوویدا ئازارمەخش و توند بوو بێت، حۆ ویرانکەرانەیە خۆتی پێوە پەیوەند مدەیتەوە ئەرکیر مخەرە سەر کاتەکان بەلام تێنگە ئەگەر تۆ گۆڕانکارییەکی مویرسە مکەیت لە بەرامبەر ڕابردوو، دەبێ بە هەموو ماسێک خۆت لە ڕوالەتی بەتاڵی لامدە ئەگینا ترس دروست دەکەیت تەنانەت مێژوویەکی ئارەی دڕێویش پەمەستر نیارە لە پانتایی بەتاڵ ئەو پانتاییە دەستەجێ بە سروت و فۆرمی نوێ پڕ بکەرەوە ئاشنایەتی هێمن بەخش و زیادبوو، لەنێو حەشامەتدا پێگەکەت مسۆگەر دەکەن

# یاسای ژمارە ٤٦

## قەت ئەوەندە کامڵ دەرمەکەوە

### حوکم

*باشتر دەرکەوتن لەوانیتر هەمیشە مەترسیدارە، بەڵام لەهەمووی مەترسیدارتر ئەوەیە وا دەرکەویت هیچ هەڵە و کێماسیت نییە. ئیرەیی، دوژمنی کپ دروست دەکات. کارێکی زیرەکانەیە کە ناوبەناو کەموکوڕی خۆت پیشان بدەیت و دان بە خراپە بێ زیانەکانت دابنێیت، بۆئەوەی ئیرەیی بەلاوە بنێیت و مرۆڤانەتر و دۆستانەتر دەربکەویت. تەنیا خودا و مردووەکان دەتوانن بە پارێزراوییەوە کامڵ دیار بن.*

### سەرپێچی لە یاساکە

جۆ ئۆرتن لە ئەکادیمیای شاهانەی هونەرە دراماییەکان لە لەندەن چاوی بە کێنیس هالیوێڵ کەوت لە ساڵی ١٩٥٣دا کە لەوێ هەردووکیان وەک خوێندکاری ئەکتەر تەقدیمیان کردبوو. ئەوان بەزوویی بوونە خۆشەویستی یەکتری و پێکەوە ژیشتن. هالیوێل کە ئەو کاتە بیست و پێنج ساڵان بوو حەوت ساڵ لە ئۆرتن گەورەتر بوو و پێدەچوو باوەڕبەخۆتر بێت، بەڵام هیچ کامیان وەک ئەکتەر بەهرەیان نەبوو و پاش دەرچوون پێکەوە لە شوقەیەکی لەندەندا نیشتەجێ بوون. ئەوان بڕیاریاندا واز لە نواندن بهێنن و لەبری ئەمە وەک نووسەر هاوکار بن. میراتی هالیوێل بەس بوو بۆئەوەی پێویست نەکات

تا چەند ساڵێك كار مەزرەمەوە و لە سەرەتادا ئەویش هیری بروپیەر بوو لە پشت ئەو چیرۆك و رۆمانامەی دەیاسوومس ئەم هەوڵە سەرەتاییەیان سەرنجی بریكارە ئەدەبییەكانی راكیشا، بەڵام ئاكامی نەبوو

نوسار میراتەكە تەرلو بوو و دەبیووایە ئەو دووانە بەدوای كاردا بگەڕێن هاوكارییەكەیان كەمتر نامەرزیانە و رووبوو نەبوو ئاییندە نادیار بوو

لە ١٩٥٧دا ئۆرتۆن دەستیكرد بە نووسین بە تەنیا، بەڵام ئەمە پێنج ساڵی دواتر بوو كە دەنگی خۆی دۆزییەوە، كاتێك خۆشەویستەكان بۆ ماوەی شەش مانگ بەند كران لەبەرامبەر شێواندنی دە دوانزە كتێبی ئەدەبی ئەو لە زیندان هاتە دەرەوە و سوور بوو لەسەر ریسواكردنی كۆمەڵگەی ئینگلیزی لە شێوەی شانۆیی كۆمیدی ئەو و هالیوێل پێكەوە گەڕانەوە، بەڵام ئێستا ڕۆڵەكان پێچەوانە بوونەوە ئۆرتۆن دەینووسی و هالیوێل كۆمێنت و پێزكەی دەردەبڕی.

لە ١٩٦٤دا جۆ ئۆرتۆن یەكەمین شانۆیی دریژی بەناوی (سەرگەرمكردنی بەڕێز سلۆن)ی نووسی شانۆییەكە گەیشتە (وێست ئێند)ی لەندەن و رەخنەی جوانی لەسەر نووسران نووسەرێكی نوێی مەزن لەپڕێكا دەركەوتبوو ئێستا سەركەوتن لەدوای سەركەوتن دەهات لە ١٩٦٦دا ئۆرتۆن بە شانۆیی (تاڵان) بەرەوداریەكەی زۆر زیادیكرد بەرووبی لەهەموو شوێنێكەوە راسپاردەی بۆ هات

لەگەڵ سەركەوتنی ئۆرتۆندا، كێشەكانی دوو هاوسەرەكە خراپتر دەبوو، میزاجی هالیوێل ژیانی ئەو دووانەی ئەستەم كرد ئۆرتۆن بانگەشەی ئەوەی كرد كە دەیەوێ بەجێی دەهێڵێت و پەیوەندی سێكسی سوورداریی وڵێی هەبوو، بەڵام هەمیشە دەگەڕایەوە لای خۆشەویست و هاوڕێ كۆنەكەی دەیویست بە دەستپێكردنی پیشەیەك وەك هونەرمەند یارمەتی بدات. لە ڕواڵەتدا هالیوێل وەك ئۆرتۆن بەختەوەر دیار بوو لەناوەوەدا دەكوڵا؟ دوو مانگ دواتر، لە بەرەبەیانی ١٠ی ئۆگەستی ١٩٦٧دا، تەنیا چەند ڕۆژێك پاش یارمەتیدانی ئۆرتۆن تا یەكێ لە شاكارەكانی تەواو بكات، سەری كێنیس هالیوێل جۆ ئۆرتۆنی دایە بەر چەكوش تا مرد پاشان خۆیشی بیست و یەك حەبی خەوی خوارد و

مرد و لەدوای خۆی تێبینییەکی هێشت "ئەگەر تۆ یادداشتی ئۆرتۆن بخوێنیتەوە هەموو شتێک ڕوون دەبێتەوە"

## لێکدانەوە

کێنیس هالیوێل هەوڵیدابوو خراپبوونی حاڵی وەک نەخۆشییەکی دەروونی بخاتەڕوو، بەڵام ئەوەی کە یادداشتەکانی جۆ ئۆرتن دەریخست ڕاستی بوو: ئیرەییەکی بێگەرد بوو کە لە چەقی نەخۆشییەکەیدا بوو. یادداشتەکان گێڕەرەوەی ڕۆژانی دوو هاوسەرەکە بوو وەک هاوڕێ و ململانێکەیان بۆ پێزانین. پاش ئەوەی ئۆرتۆن سەرکەوتنی بەدەستهێنا، یادداشتەکان پڕانە سەر ڕەشبینییەکەی هالیوێل، قسە ڕەقەکانی لە نامەکەکان و هەستکردنی بەرەبەرە زیادبووی بە ترس. ئۆرتۆن هەموو ئەم شتانەی بە هەستێکی سرکێنەوە گێڕاوەتەوە.

یادداشتەکان پەستبوونی هالیوێلیان لەبەرامبەر سەرکەوتنی ئۆرتۆن ڕوون کردەوە سەبارەت تاکە شتێک کە دڵی ئاسودە دەکرد ئەوە بوو ئۆرتۆنیش شکستێک بێنێت، بۆ نموونە شانۆییەکی سەرنەکەوتوو بنووسێت، بۆئەوەی بکرێ هەردووکیان لە ئاستێکدا هاوبەش بن وەک چۆن پێشتر لە حاڵەتی وەهادا ڕەت ببوو. کاتێکیش پێچەوانەی ئەمە ڕوویدا و ئۆرتۆن هەر بەردەوام بوو لەسەرکەوتن، هالیوێل تاکە شتێکی کرد کە جارێکی تر هەردووکیانی یەکسان دەکردەوە. ئەو هەردووکیانی لە مردندا یەکسان کرد. پاش ئەوەی ئۆرتۆنی کوشت، ئەویش هەمان ناوبانگی ئەوی پەیدا کرد. بەڵام ئیتر هەردووکیان مردبوون

تەنیا کەمینەیەک دەتوانێت لە گەمەی ژیاندا سەرکەوتوو بێت و ئەو کەمینەیە بەشێوەیەکی حەتمی ئیرەیی ئەوانەی دەوروبەر دەجوڵێنێت. هەر کاتێک کە سەرکەوتن بە شێوازی خۆت ڕوودەدات، ئەو خەڵکەی زیاتریان ترسیان لێ دەیێشێت ئەوانەن کە لە بەرەی تۆدان، ئەو هاوڕێ و ئاشنایانەی لەدوای خۆت جێت هێشتوون. هەستی ئیرەیی دەیانجوڵێتەوە. بیرکردنەوە لە سەرکەوتنی تۆ تەنیا هەستیان بە چەقبەست زیاد دەکات

ئیرەیی کە کێرکەکاردی فەیلەسوف پێی دەڵێت "سەرسامبوونی دابەدڵ" شوێنی خۆی دەگرێت ئەولەیە نەبینیت بەلام رۆژێك لە رۆژان هەستی پێدەکەیت– مەگەر ئەوەی تۆ ستراتیژییەکانی ملدان و قوربانی لەبەردەم خواکانی سەرکەوتن فێر بیت

## بەرەوپیرۆزکردن لەپاسلکە

چینی بازرگان و گروپە پیشەگەرەکان کە کامەرانی فلۆرێنسی سەدەکانی ناوەڕاست قەرزداریان بوو کۆماریکی بونیاد نەبوو کە لە سەرکوتکەریی خانەدانان دەیانپاراست. لەبەرئەوەی پۆستی بالا تەنیا بۆ چەند مانگێك وەردەگیرا، کەس نەیدەتوانی بالادەستیی تەواو بەدەست بێنێت و هەرچەندە ئەمە بەو مانایە بوو کە لایەنە سیاسییەکان ململانێی بەردەوامیان دەکرد بۆ کۆنترۆلکردن، سیستەمەکە زۆرداران و دیکتاتۆرە ناچیزەکانی بەلارە نا. خانەوادەی مێدیسی بۆ ماوەی چەند سەدەیەك لەژێر ئەم سیستەمەدا ژیا بەبێ ئەوەی شوێن پەنجەیان دیار بێت. ئەوان بنەچەیەکی سادەیان هەبوو و هاوڵاتیانی ئاسایی چینی ناوەند بوون. کەچی لە دەرەکانی سەدەی چواردەدا کاتێك جیۆڤانی مێدیسی سامانێکی لە بانك پێکەوە نا و وەکو هێزێك دەرکەوتن.

لەگەڵ مردنی جیۆڤانی، کۆسیمۆی کوڕی برسی خانەوادەکەی گرتە دەست و بەهرەی خۆی بەجێزایی لەم بوارەدا نیشاندا. برسی لەژێر کۆنترۆلی ئەودا گەشەی کرد و مێدیسییەکان وەك خانەوادەی بانکیی بالادەستی ئەوروپا دەرکەوتن. بەلام ئەوان لە فلۆرێنس رکابەریکیان هەبوو. سەرباری سیستەمی کۆماریی شارەکە، خانەوادەیەك، ئالبیزی، بەدرێژایی سالانێك کۆنترۆلی حکومەت، هاوپەیمانییەکی کردبوو کە رێگەی پێ خۆش دەکردن تا بە بەردەوامی پۆستە گرنگەکان پڕ بکەنەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا دواجار سامانی مێدیسی نەدەکرا فەرامۆش بکرێت و لە ١٤٣٣دا بە هەستکردن بەرەی هەڕەشەی ئەو خانەوادەیەی لەسەرە، ئالبیزی ئامرازی حکومەتی بەکارهێنا بۆ دەستگیرکردنی کۆسیمۆ بە تۆمەتی گەلەکۆمەکێ بۆ سەرنگونکردنی کۆمارەکە. هەندێ کەس لە کوتلەی ئالبیزی ویستیان کۆسیمۆ لەسێدارە بدرێت، ئەوانیتر

ترسیان هەبوو ئەمە شەڕی ناوخۆی لێ بکەوێتەوە. لە کۆتاییدا ئەوان لە فلۆرێنسیان وەدەرنا. کۆسیمۆ بەرەنگاری حوکمەکەی نەکرد و بە بێدەنگی ڕۆیشت. هەندێ جار دەیراس وا زیرانەترە کە چاوەڕوان بیت و بەدی نەکرێیت

هەڕێژایی سالێ دواتر ئالبیزی دەستیانکرد بە ووڕاندنی ترسی ئەوەی کە ئەوان دیکتاتۆریەت بونیاد دەنێن. لەهەمان کاتدا کۆسیمۆ سامانەکەی بەکاردەهێنا بۆ کاریگەری خستنە سەر کاروباری فلۆرێنس تەنانەت لە ئاراوگەش. شەڕی ناوخۆ هەڵایسا و لە سێپتێمبەری ١٤٣٤دا ئالبیزی لەسەر حوکم لادرا و ڕەوانەی ئاراوگە کرا. کۆسیمۆ دەستبەجێ گەڕایەوە فلۆرێنس و پێگەکەی بەدەست هێنایەوە. لە ماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا، کۆسیمۆ بە شێوەیەکی هاکی و سادە بە جادەکانی فلۆرێنسدا پیاسەی دەکرد سەری ڕێزی بۆ پیاوانی ئایینی و بەتەمەنەکان دادەنەواند. بە سواری ئیستر نەک ئەسپ دەڕۆیشت و قەت باسی بابەتەکانی کاروباری خەلکی نەدەکرد ئەگەرچی بۆ ماوەی زیاتر لە سی ساڵ کۆنترۆڵی هەموو کاروبارێکی کردبوو. ئەو بارەی دەبەخشییە سەدەقە و خێرات و پەیوەندی باشی لەگەڵ چینی بازرگاندا هەبوو

پاش فەرمانڕەوایەتییەکی سی ساڵی، کۆسیمۆ لە ١٤٦٤دا مرد. هاوڵاتیانی فلۆرێنس ویستیان مەزارێکی دیاری بۆ بونیاد بنێن و مەراسیمێکی شایستەی بۆ بکەن. بەڵام بەسەرەمەرگییا داوای کردبوو هیچ ساپشیکی ئەوەی بۆ نەکەن. شەست ساڵێک دواتر، مەکیاڤیللی ستایشی کۆسیمۆی کردبوو بەوەی کە زیرترینی میرەکانە "چونکە دەیزانی چۆن ئەو شتە سەرووئاساییانەی لە هەر کاتێکدا دەردەکەون و دەبیزنی مرۆڤەکان پڕ ئیرەییتر دەکەن لە چاو ئەو شتانەی کە بە ڕاستی کراون بە شایستەیی پووپۆش کراون"

### لێکدانەوە

هاوڕێیەکی مریکی کۆسیمۆ، ڤێسپاسیانۆ دا بیستیچی، جارێکیان لەبارەی ئەوەوە نوسیبووی "هەر کاتێک ئەو هەواخواز بوو شتێک بەدەست بێنێت، ئەنجامی دەدا، بۆئەوەی ئەوەندەی دەکرێ لەدەست ئیرەیی ڕابکات، کە دەستپێشخەرییەکە را

دەردەکەوت لەواسیترەوە بیت بەك لەوەوە". یەکێك لە دەربڕینە دڵخوازەکانی کۆسیمۆ ئەمە بوو "نیرەیی گیاکەڵەیەکە کە نابێ ئاو بدرێت" کۆسیمۆ خۆی لە نمایشی مەزنایەتی پاراست. ئەمە بەو مانایە نییە کە دەبێ مەزنایەتی بشکێنرێت، یان تەنیا کەسانی ئاسایی بمێنن، بەڵکو تەنیا دەبێ گەمەی پاڵەتەکان یاری بکرێت ئیرادەی ریانبەخشی حەشامات بە ئاسانی دەکرێ تەمبڵرێت. وەکو یەکێك لەوان دەرکەوە لە ستایل و بەهاکاندا. لەگەڵ ئەوانەی خوار خۆت هاوپەیمانی بکە و بۆ پێگەی دەسەڵات بەرزیان بکەرەوە بۆ راکردنی پشتگیرییان لەهەموو کاتێکی پێویستیدا قەت سامانەکەت دەرمەحە و ئاستی کرینەوەی کاریگەری بەم سامانە بشارەوە. نمایشی رێزگرتن لەوسیتر بکە، وەك بڵێی ئەوان زۆر بەهێزترین لەتۆ. کۆسیمۆی مێدیسی لەمە گەمەیەدا شارەزایەتی پەیدا کرد، ئەو ساختەچییەکی پاڵەتەکان بوو کەس نەیتوانی ئاستی دەسەڵاتی ئەو بزانێت= پاڵەتە سادەکەی، حەقیقەتی شاردەوە

*لەهەموو پەرەوارەییەکانی رۆح، نیرەیی یەکێکە لەوانەی کەس دەرینابرێت.*

پلوتارك ٤٦–١٢٠ی زایین

## کلیلی دەسەڵات

گیانەوەری مرۆڤ بەکاتێکی سەختی دەست و پەنجە نەرمکردن لە سوکی و نرمیدا رەت دەبێت لەمەرانبەر شارەزایەتی، بەهرە یان دەسەڵاتدا، ئێمە زۆرجار هەراسان و نارەحەت دەبین. ئەمە لەبەرئەوەیە کە زۆربەمان هەستێکی خۆبیمان هەیە و کاتێك ئێمە خەڵك دەبینین کە لە ئێمەیان تێپەڕاندووە رووبی دەکەنەوە بۆمان کە ئێمە لەئاستێکی ئاساییداین یان لانی کەم ئەوەندە لێهاتوو نین کە پێمان وابوو ئەم هەراسانییە لە وێنەی خۆمان ناتوانێت زۆر مرێژە بکێشێت بەبێ وروژاندنی هەستە درێژەکان. سەرەتا ئێمە هەست بە نیرەیی دەکەین. ئەگەر تەنیا ئەو مایەتمەندییە یان شارەزایەتییەی کەسە باڵاکەمان هەبوایە، ئەوا بەختەوەر دەبووین. بەڵام نیرەیی نە ئاسودەییمان بۆ دەبێت نە لە یەکسانیش نزیکمان دەکاتەوە. نە دەشتوانین دان بەو

هەستەدا بنێین، چونکە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە ناپەسەندە– دەرخستنی ئیرەیی وەک ئەوە وایە دان بە هەستکردنت بە نزمیت دابنێیت. لەوانەیە لای هاوڕێ و کەسی نزیک باس لە ئازەرووی بەدینەهاتوو بکەین، بەڵام ئێمە هەرگیز دان بە هەستی ئیرەییدا نانێین. بۆیە هەر بە نهێنی دەمێنێتەوە. ئێمە بە چەند شێوازێک ڕووپۆشی دەکەین، وەک دۆزینەوەی پاساو بۆ ڕەخنەگرتن لەو کەسەی ئەو هەستەمان لا دروست دەکات. لەوانەیە ئەو لە من زیرەکتر بێت بەڵام ویژدان یان ئاکاری نییە. لەوانەیە بەدەسەڵاتتر بێت لە من بەڵام بەهۆی فێڵەکانییەوەیە.

دواجار وێنە لەبەرانبەر ئەو ژینگانەی کە ئیرەییان زیاتر تێدا بەرجەستە دەبێت کاریگەرییەکانی ئیرەیی لەنێو هاوەڵاندا زۆر جددیترن کە زیاتر یەکسانی پیشان دەدرێت. ئیرەیی بەهەمان شێوە لە ژینگە دیموکراتییەکاندا وێرانکەرترە کە تیایدا نمایشە دیارەکانی دەسەڵات سەیر دەکرێت. لە ژینگەی ئەسینا زیدە هەستیار بە ئیسگمار بیرگەلی فیلەسار لەلایەن دەسەڵاتدارانی باجی سوید سزادا دەکرا چونکە لە وڵاتێکدا دەرکەوت کە تیایدا دەرکەوتن لەنێو جەماوەردا ناپەسەند بوو. تەقریبەن ئەستەمە لە حاڵەتی وادا خۆت لە ئیرەیی لادەیت و شتێکی کەم هەیە بیکەیت مەگەر سەربەرزانە قبوڵی بکەیت و بەشەخسی وەرینەگریت، هەروەک سورە جارێکیان وتی "ئیرەیی باجێکە کە دەبێ هەموو ئەوانەی جیاوازن دەبێ بیدەن".

**وێنە:** باجی گیاکەڵەکان. لەوانەیە تۆ ئازاریان نەدەیت بەڵام کاتێک باخەکە ئاو دەدەیت هەر ملکۆ دەبنەوە. لەوانەیە نەزانیت چۆن، بەڵام زاڵ دەبن، دڕێژ و درێژ دەبن، ڕێگر دەبن لەوەی هەر شتێکی جوان گەشە بکات. پێش ئەوەی زۆر درەنگ بێت، ئاودانەکەت با بێ جیاوازی نەبێت. گیاکەڵەکانی ئیرەیی لەنێو ببە بەوەی کە هیچ نەبێ گەشەی لەسەر بکەن.

**دەسەڵات:** ناوبەناو، کەموکورتییەکی بێ زیانی خۆت لە کارەکتەرتدا دەربخە. چونکە کەسی ئیرەیی بەر کابرای کامڵ تۆمەتبار دەکات بە ئاواتی ئەمرویی تاوان. ئەوان دەبنە (ئارگوس)، هەموو چاوەکانیان بۆ دۆزینەوەی کێماسییە بەشێوەیەکی لێهاتووانە– ئەمە

تاکە دڵنەواییانە رێگە مەدە ئیرەیی ژەهری خۆی بڕێژێت– ترسێک لە بوێریت یان هێکرتدا دروست بکە، بۆئەوەی لەهێنجدا ئیرەیی پەک بخەیت. (بالتاسار گراسیەن، ١٦٠١–١٦٥٨)

هۆکاری وریابوون لەمەڕ ئیرەیی بەر ئەوەیە کە ئەوان زۆر ناڕاستەوخۆن و چەندەها رێگە دەدۆزنەوە بۆئەوەی بسکوڵت بکەن. بەڵام بە وریاییەوە بەدەوریاندا هاتن و چوون زۆرجار ئیرەییەکەیان خراپتر دەکات. ئەوان هەست بەوە دەکەن کە تۆ بە هەرمەریت و ئەمەش نیشانەیەکی تری باڵاییت تۆمار دەکات. بۆیە دەبێ بەر لەوەی ئیرەیی رەگ داکوتێت هەنگاو بنێیت.

لەگەڵ ئەوەشدا کاتێک ئیرەییەکە هەیە، جا لە هەڵەی خۆتەوە بێت یان نا، باشترین شت ئەوەیە تارادەی پێچەوانە بگریتە بەر: ئەوپەڕی سوکبیس و پیسوایی پیشان بدەیت بەرامبەر ئەوانەی ئیرەییت پێ دەبەن. لەبری شاردنەوەی کامڵێتی خۆت، بە ئاشکرا دەریخە. هەر سەرکەوتنێکی نوێ بکە دەرفەتێک بۆ ئەوەی ئیرەیی بەر خۆی بخولقەوە، سەلمان و ئارامگت دەبنە نۆرەخی ئەو. ئەگەر تۆ پێگەیەکی قایمی دەسەڵات بەدەست بێنیت ئەوا ئیرەییەکەیان لەسەر تۆ کاریگەری نابێت و تۆ باشترین تۆڵەت دەبێت: ئەوان لە ئیرەییدا گیریان خواردووە لەکاتێکدا تۆ لە دەسەڵاتتدا ئازادیت.

## یاسای ژمارە ٤٧

# لەو نیشانەیە تێمەپەڕە کە ئامانجت بوو لەسەرکەوتندا فێربە لە کوێ بوەستیت

### حوکم

*ساتەوەختی سەرکەوتن زۆرجار گەورەترین مەترسی هەیە. لە گەرمەی سەرکەوتندا، لوتبەرزی و زیادە بڕوابەخۆبوون دەتوانن لەو ئامانجەت لابدەن کە تۆ بەدوایدا وێڵ بوویت و بە زۆر دوور پاڵپشتن تۆ دوژمنی زۆر لەوە زیاتر پەیدا دەکەیت کە بتوانیت شکستیان پێ بهێنیت. ڕێگە مەدە سەرکەوتن لە کەللەت بدات. هیچ جێگرەوەیەک بۆ ستراتیژ و پلاندانانی وریایانە نییە. ئامانجێک دابنێ و کاتێک پێی گەیشتیت، بوەستە.*

### سەرپێچی لە یاساکە

لە ٥٥٩ی پێش زایینیدا، گەنجێک بەناوی کورشە سوپایەکی گەورەی لە هۆزە پەرت و بڵاوەکانی فارس کۆ کردەوە و لەدژی ئیشتوویگووی باپیرەی کەوتە ڕێ کە پاشای میدییەکان بوو. ئەو شکستی بە ئیشتوویگوو هێنا و تاجی پاشای میدیا و فارسی لەسەر نا و دەستیکرد بە بونیادنانی ئیمپراتۆرییەتی فارس. سەرکەوتن لە سەرکەوتنی بەخێرایی بەدەستهێنا. کورەش شکستی بە (کرۆیسەس) فەرمانڕەوای لیدیا هێنا و

پاشان نووزگەکانی (ئاوبیان) و مەملەکەتە بچوکەکانی تری گرت ئەو بەرەو دبل کەوتەڕێ و ئینکیشکاند ئیستا ئەو بە کورەشی مەزن، پاشای جیهان ناسرابوو

پاش گرتنی سامانی بابل، کورەش چاوی بڕیە خۆرهەڵات، هۆزە ئیوە بەربەرییەکانی (ماساگێتای)، ئەلەمرەوی گەورە لە دەریای کاسپیان. جەنگاوەرێکی توند شازنە تیمۆریس ڕێبەرایەتی ماساگێتای دەکرد کە ئەو سامانەی بابلی نەبوو؛ بەلام کورەش هەرچۆنێك بوو بڕیاریدا هێرشی بکاتە سەر بەو بڕوایەی کە زۆ سوپەرمرۆڤەوە قەبیلی شکست نیە ماساگێتای بە ئاسانی دەکەوێتە بەر سوپا مەزنەکەی ئیمپراتۆریەتە رەیەلاحەکەی

لە ٥٢٩ی رابیدا کورەش بەرەو ڕووباری فراوانی ئاراس کەوتەڕێ کە دەرەوارەی ماساگێتای بوو لەکاتێکدا کە کەمپی لەسەر کەناری خۆرئاوا بونیادنا، پەیامێکی لە شازنە تۆمیریس پێگەیشت "پاشای میدییەکان، من ئامۆژگاریت دەکەم واز لەم دەستپێشخەرییە بێنیت، چونکە تۆ ناتوانیت بزانیت لەکۆتاییدا هیچ سوودێکی بۆ تۆ دەبێت فەرمانڕەوایی خەلکی خۆت بکە و هەوڵ مەدە لنگەڕێیت منیش فەرمانڕەوایەتی ئەوەی خۆم بکەم بەلام بەدڵنیاییەوە ئامۆژگاریی من ڕەت دەکەیتەوە چونکە دوایی هت کە تۆ هیواخوازیت تیایدا بژیت ئاشتییە" تۆمیریس کە دڵنیا بوو بە توڕەی سوپاکەی و هیواخوار نەبوو شەڕە حەتمییەکە دوا بخات، پێشنیاری کرد سەربازەکانی لە لا ڕووباری خۆی بکشێنێتەوە و ڕێگە بە کورەش بدات بە سەلامەتی بە ئاوەکانی بپەڕێتەوە و لەلای خۆرهەڵاتەوە شەڕی سوپاکەی بکات، ئەگەر ئەمە ئارەزووی بوو بێت

کورەش ڕازی بوو بەلام لەبری ڕووبەڕووبوونەوەی ئۆزمن بەشێوەی ڕاستەوخۆ، بڕیاریدا فێلێك بکات ماساگێتای خۆشییەکی کەمی ژیانیان بینیبوو هەر کورەش لە ڕووبارەکە پەڕیەوە و کەمپەکەی لە لای خۆرهەڵات بونیادنا، مێزێکی دانا بۆ خوانێکی تێروتەسەل، پڕ لە گۆشت و شیرینی و شەرابی مەهیر پاشان لاوازترین سەربازەکانی لە کەمپ هێشت و پاشماوەی سوپاکەی بۆ ڕووبارەکە کشاندەوە فیرقەیەکی گەورەی ماساگێتای بەڕوویی هێرشیان کردە سەر کەمپەکە و هەموو سەربازانی فارسیان لە

شەڕێکی توندوتیژدا کوشت. پاشان بەهۆی کەوتنە ژێر کاریگەری ئەو خولیە دڵڕفێنەی مێ هێنرابوو، دەستیانکرد بە خواردن و خواردنەوە بە دڵی خۆیان. پاشان خەویان پێدا کەوت. سوپای فارس ئەو شەوە گەڕانەوە بۆ کەمپەکە، زۆرێک لە سەربازە خەوتووەکانیان کوشت و ئەوانەیتریشیان گرت. ژەنەراڵەکان، گەنجێک بەناوی سپارگاپیسس، کوڕی شاژن تۆمیریس لەناو زیندانییەکاندا بوو.

کاتێک شاژن بەمەی زانی، نامەیەکی بۆ کورەش نارد و تیایدا لەبەرامبەر فێڵەکەیدا سەرکۆنەی کرد. ئەو بۆی نووسی "ئێستا گوێم لێ بگرە، لەبەر چاکەی خۆت ئامۆژگاریت دەکەم: کوڕەکەم بۆ بگەڕێنەوە و وڵاتەکەم جێ بێڵە و بە هێزەکانت بە سەلامەتی بچەوە. ئەگەر ڕەتی بکەیەوە، سوێند دەخۆم بە خۆر خوێنی زۆرتر لەوەت بدەمێ کە بتوانیت بیخۆیتەوە" کورەش هیچ گوێی بە قسەکان نەدا. کوڕەکەی ئەو بەدەدا ئەو ئەم بەربەربانەی تێکدەشکاند.

کوڕی شاژن کە زانی بەر نادرێت، بەرگەی ئەو هەموو ریسواییەی نەگرت و خۆی کوشت. هەواڵی مردنی کوڕەکەی زۆر کاری کردە سەر تۆمیریس. ئەو هەموو ئەو هێزەی مەملەکەتەکەی کۆ کردەوە کە لەتوانایدا بوو و لە شەڕێکی خوێناوی و توندوتیژدا ڕووبەڕووی هێزەکانی کورەش بووەوە. دوای ماساگێتای سەرکەوتوو بوو. لە تووڕەیی زۆریدا، سوپای فارسیان لەنێو برد و خودی کورەشیان کوشت.

پاش شەڕ، تۆمیریس و سەربازەکانی لە شەڕگەدا بەدوای لاشەی کورەشدا گەڕان. کاتێک دۆزییەوە، سەری لە لاشەی جیا کردەوە و هەڵیدایە ناو کیسە چەرمێکی شەراب کە پڕ بوو لە خوێن و هاواری کرد "هەرچەندە من بەسەر تۆدا سەرکەوتم، بەڵام تۆ من بە بڕینی ناپاکانەی کوڕەکەم ویران کرد. ئێستا ببینە- هەڕەشەکەم جێبەجێ دەکەم تۆ پڕیت لە خوێن" پاش مردنی کورەش ئیمپراتۆریەتی فارس بەخێرایی هەڵوەشایەوە کردارێکی لرتەرزی هەموو کارە باشەکەی کورەشی هەڵوەشاندەوە

### لێکدانەوە

هیچ شتێک ئەوەندەی سەرکەوتن مەستت ناکات و لەوەش مەترسیدارتر نییە. کوورەش ئیمپراتۆرییەتە مەزنەکەی لەسەر کاولاشی ئیمپراتۆرییەتێکی پێشوو بونیادنا ئیمپراتۆرییەتی بەهێزی ئاشوورییەکان مەتەرازی لەمێوبرابوو کە جارێک لە هاران پایتەختەکەی، نەینەوا، دەدرەوشایەوە بەڵام وێران بوو. ئاشوورییەکان بەهەمان جارەسووس گەیشتن لەبەرئەوەی پێی خۆیان زۆر ڕاکێشا و ئامانجەکەیان ون کرد. کوورەش وڵاتی ئاشووری لەبیر کرد. بێباک بوو لەبەرامبەر هۆشداریی فالگرەوە و ڕاوێژکارەکان. ئەو هیچ ئیگەران نەبوو لەبەرانبەر ئیهانەکردنی شاژن. سەرکەوتنەکانی پێشووی لە کەللەی دابوون و ئیتر هەر بەردەوام بوو

تێبگە. لە بواری دەسەڵاتدا، دەبێ بە ئەقڵ ڕێنمایی بکرێیت. ئەگەر ڕێگە بدەیت شادیی کاتی یان سەرکەوتنی هەستیارانە کاریگەری بخاتە سەر هەنگاوەکانت، ئەمە کوشندەیە. کاتێک تۆ سەرکەوتن بەدەست دێنیت، بوەستە. وریا بە. کاتێک سەرکەوتن بەدەست دێنیت، لەو بارودۆخە دیاریکراوە تێبگە کە بوونە هۆکاری و قەت هەمان کردار چەندین جارە مەکەرە. مێژوو پڕە لە ڕیز و ماڵاشی ئیمپراتۆرییەتە سەرکەوتووەکان و لاشەکانی ئەو سەرکردانەی نەیانتوانی فێر بن بوەستن و دەستکەوتنەکانیان قایم بکەن

### پەیڕەوی لە یاساکە

هیچ کەسێک ئەوەندەی مەعشوقەی پاشا پێگەیەکی ناسکتر و هەستیارتری نەگرتووە لە مێژوودا. ئەو بافەیەکی ڕەوا یان ڕاستەقینەی دەسەڵاتی نەبووە لە کاتی تەنگانەدا پشتی پێ ببەستێت. ئەو بە کۆمەڵێک دەرباریی ئیرەییبەر دەورەدراوە کە ئامەزرۆیانە چاوەڕێ بوون لە سەنگ و شکۆ بکەوێت و دواجار لەبەرئەوەی سەرچاوەی دەسەڵاتەکەی زۆرجار جوانیە جەستەییەکەی بووە، بۆ زۆربەی مەعشوقەکانی شاهانە ئەو کەوتنە حەتمی و ناخۆش بووە.

پاشا لویسی پانزە هەر لەسەرەتای حوکمڕانییەکەیەوە مەعشوقەی ڕەسمی هەبوون؛ بەختی باشی هەر کام لە ژنەکان بەدەگمەن زیاتر لە چەند ساڵێکی دەخایاند. بەڵام دوایی مادەم دی پۆمپادۆر هات کە کاتێک منداڵێکی چیبی ناوەندی نۆ ساڵان بوو ناوی ژا جێی پۆیسۆن لەلایەن فالگرێکەوە پێی وترا کە ڕۆژێک دەبێتە دڵخوازی پاشا

جێی پۆیسۆن بووە هاوڕێی نزیکی ڤۆڵتێر، مۆنتسکیۆ و ئەقڵە گەورەکانی تری ئەو کاتە، بەڵام قەت چاوی لەسەر ئامانجەکەی سەردەمی کچێنی لا نەبرد. بەدەستهێنانی دڵی پاشا. مێردەکەی لە دارستانی سێنار خانوویەکی هەبوو کە لەوێ پاشا زۆر جار دەچووە ڕاو و ئەو ئیتر بەرەبەرە کاتی زۆری لەوێ بەسەر برد. ئەو وەک مەلۆ هەموو جوڵەکانی تاوتوێ کرد و جەختی لەوە کردەوە کە بەو پۆشاکە جوانەی لەبەری کردبوو بەشێوەیەکی سروشتی ڕێکەوتی پاشا بکات. پاشا ئەوی بەرچاو کەوت و بەرهەمەکانی ڕاوەکەی پیشکەش بەو کرد.

پاشا کەسێک بوو کە بچووکترین هەستی بێزاری، هاوسەنگی تێکدەدا. مادەم پۆمپادۆر دەیزانی کە هێشتنەوەی ئەو لەژێر سیحری خۆیدا بەمانای ئەوە بوو لە هەستێکی خۆشدا بیهێڵێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە ئەو بەردەوام نمایشی شانۆیی بەرهەم دەهێنان کە خۆی تیایدا ڕۆڵی دەگێڕا. ئەو ئاهەنگی ڕێکردن، ئاهەنگی دەمامکی ڕێکدەخستن و هەر شتێکی تریش کە ببوایەتە هۆی ئەوەی پاشا لە دەرەوەی ژووری خەوتن بهێڵێتەوە، لەگەڵ هەر سەرکەوتنێکیدا، دوژمنانی مادەم دی پۆمپادۆر لەناو دەرباردا زیادیان دەکرد و بەتایبەت بەرامبەر سەرچاوە سادە و ناخانەدانییەکەی کینەئامێز بوون. لەهەمووی نائاساییتر ئەو بووە هاوڕێی ژنەکەی و سوور بوو لەسەر ئەوەی لویسی پانزە تەرکیزی زۆرتر بخاتە سەر ژنەکەی و میهرەبانانەتر مامەڵەی لەگەڵدا بکات

لە ساڵی ١٧٥١دا مادەم دی پۆمپادۆر لە لووتکەی دەسەڵاتیدا بوو، خراپترین قەیرانەکانی ئەزموون کرد. لەڕووی فیزیکییەوە بەهۆی بەرپرسیارێتی پێگەکەی لاواز بوو، بەرەبەرە زیاتر بەلایەوە قورس دەبوو کە لەناو پێخەفدا پێویستییەکانی پاشا جێبەجێ بکات. ئەمە زۆرجار ئەو ساتە بوو کە تیایدا مەعشوقەکان کۆتاییان پێدەهات و

پەلەقاژێیان دەکرد تا پێگەی خۆیان بپارێزن لەکاتێکدا کە جۆسێفینەکەیان مەدەما. بەڵام مادام دی پۆمپادۆر ستراتیژێکی هەبوو: ئەو هانی پاشای دا تا جۆرە سۆزانیخانەیەک لەسەر ڕەوی فێرسای بونیاد بنێ. لەوێ پاشای تەمەن ناوەند دەیتوانی پەیوەندی لەگەڵ جوانترین کچانی گەنجی دەربار هەبێت. تەندروستی مادام پۆمپادۆر هەمیشە لاواز بوو و ئەو لەتەمەنی چل و سێ ساڵیدا مرد. دەسەڵاتی ئەو وەک مەعشوقە بیست ساڵی بێ وێنەی هایاند. دوک دو ڕۆی نووسیبووی "هەمووان لەبارەیەوە پەشیمان بوونەوە، چونکە ئەو بە بەزەییانە و یارمەتیدەر بوو بەرامبەر هەر کەسێک کە لێی نزیک دەکەوتەوە"

**لێکدانەوە**

سەرکەوتن فێڵی سەیر لە ئەقڵ دەکات. واتلێدەکات هەست بکەیت لاواریت، بەکاتێکدا بەهەمان شێوە شەڕانگیزتر. هەستیارت دەکات کاتێک حەلک تەحەدای دەسەڵاتت دەکەن. ئەمە وات لێدەکات بێتواناتر بیت بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ باروودۆخدا. تۆ دێیتە سەر ئەو بڕوایەی کە کارەکتەری تۆ زیاتر بەرپرسە لە سەرکەوتنەکەت نەک ستراتیژدانان و پلاندانانەکەت. وەک مادام دی پۆمپادۆر، پێویستە درک بەوە بکەیت کە ساتەوەختی سەرکەوتنت بەهەمان شێوە ساتێکە تیایدا دەبێ ئاستێکی زۆرتر پشت بە ئیراس و ستراتیژ ببەستیت، ئاخەی دەسەڵاتت قایم بکەیت و ڕۆڵی بەخت و باروودۆخ لە سەرکەوتنەکەتدا بناسیتەوە و چاودێر بیت لەبەرامبەر هەر گۆڕانکارییەک لە بەختی باشتدا. ئەوە ساتەوەختی سەرکەوتنە کە پێویستە یاری گەمەی دەرباری بکەیت و تەرکیزی زۆرتر بخەیتە سەر بناغاکانی دەسەڵات

*گەورەترین مەترسی لە ساتەوەختی سەرکەوتندا ڕوودەدات*

ناپۆلیۆن بۆناپەرت، ١٧٦٩-١٨٢١

## کلیلی دەسەڵات

دەسەڵات ڕیتم و ڕیسای خۆی هەیە. ئەوانەی لە گەمەکەدا سەرکەوتوو دەبن ئەوانەن کە ڕیساکان کۆنترۆڵ دەکەن و بە ئیرادەی خۆیان دەیانگۆڕن، خەڵکی بەناهاوسەنگ دەهێڵنەوە لەکاتێکدا کە ئەوان ڕیتمەکە دادەنێن. جەوهەری ستراتیژ کۆنترۆڵکردنی دواترە و لەوانەیە خۆشیی سەرکەوتن توانات بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەوەی دواتر دێ لەق بکات.

وانەکە سادەیە. کەسی بەهێز ڕیتم و ڕیساکانیان، ڕەوگەیان دەگۆڕن، خۆیان لەگەڵ بارودۆخ دەگونجێنن و فێری ڕووبەڕووبوونەوەی ناکاو دەبن. لەبری ئەوەی قاچە سەماکردووەکانیان بەرەو پێش بیانبات، دەوەستن و دەڕوانن بزانن بۆ کوێ دەڕۆن. ئەوان خۆیان قایم دەکەن و پشوویەک دەدەنە خۆیان تا لەوەی کە ڕوویداوە ڕابمێنن، ڕۆڵی بارودۆخ و بەخت لە سەرکەوتنیاندا دەپشکنن. دواجار ئەو ساتەی کە تۆ دەوەستیت گرنگییەکی دراماتیکی هەیە. ئەوەی کە دوایی دێت وەک جۆرێک لە نیشانەی سەرسوڕمان لە ئەقڵدا دەمێنێتەوە. کاتێکی باشتر لە پاش سەرکەوتن بۆ وەستان نییە. ئەگەر هەر بەردەوام بیت ئەوا سەرکێشی بە کەمکردنەوەی کاریگەرییەکە دەکەیت، تەنانەت شکستیش دێنیت. هەروەک پارێزەرەکان دەڵێن "هەمیشە بە سەرکەوتنەوە بوەستە"

دەسەڵات: دەبێ میرەکان و کۆمارەکان بە سەرکەوتن هەتاهەتا بەختیار بێن، چونکە کاتێک ئەوان بۆ زۆرتر دەڕوانن، هەڵگەڕانەوە دەنوێنن. بەکارهێنانی ڕەسی ئیهانە بەرامبەر دوژمن لە بێ ئۆقرەیی سەرکەوتنەوە سەرهەڵدەدات یان لە هیوای ساختەی سەرکەوتنەوە سەرهەڵدەدات کە ئەوەی دوڵمان مرۆڤەکان ئەوەندەی ڕشەکانیان لە کردارەکانیاندا گومڕا دەکات، چونکە کاتێک ئەم هیوا ساختەیە ئەقڵ داگیر دەکات، وا لە مرۆڤەکان دەکات بچنە ئەودیو نیشانەکەیان و دەبێتە هۆی ئەوەی ناشەیەکی دیار بکەنە قوربانیی باشترێکی نادیار

## پێچەوانەبوونەوە

هەندێ کەس هەن کە لەهەموو کات زیاتر پاش سەرکەوتن بەهەرەدر دەبن چونکە پێیان وایە هەنگەڵتکیان بۆ دەبەخشێت کە دەبێ لەبارەیەوە نیگەران بن و بیپارێزن، نابێت ئەت هەرەری تۆ پاش سەرکەوتن وڕات مکات یان گوێ و تین لەدەست بدەیت، بەڵکو دەبێ وریا بیت لە منی هەنگاری پەمەکیانە. لەلایەکی ترەوە، تۆ سەرکەوتنی خۆت بەدەست دێنیت و ئەگەر ئەم سەرکەوتنانە یەک لەدوای یەک بێن، ئەوا لە کردەی خۆتە باوەڕبوون بە گوڕ و تین ئەسپا هەستبەرت دەکات و لە هەنگاوبانی ستراتیژی سوورت دەمێنێتەوە و ئەگەری ئەوە دەبێت هەمان ئەو شێوازانە چەند بارە بکەیتەوە

## یاسای ژمارە ٤٨

# شێوەیەکی دیارینەکراو مەگرە خۆت

### دوکە

بە وەرگرتنی شێوەیەک، بەهەبوونی پلانێکی دیار، خۆت بۆ هێرش واڵا دەکەیت لەبری ئەوەی فۆرمێکی دیارینەکراو بجەیتەڕووی دوژمنەکەت، بە بەردەوامی خۆت بگونجێنە و لە گۆڕاندا بە. ئەو ڕاستییە قبوڵ بکە کە هیچ شتێکی تێدا بوونی دیارینەکراو نییە و هیچ یاسایەک جێگیر نییە. باشترین ڕێگە بۆ پارێزگاری لەخۆت ئەوەیە شل و بێ شێوە بیت وەک ئاو. قەت گرەو لەسەر سەقامگیریی یان سیستەمێکی درێژخایەن مەکە. هەموو شتێک دەگۆڕێت

### سەرپێچی لە یاساکە

بەهاتنی سەدەی هەژدەی پێش زایین، دەوڵەت شارەکانی یۆنان ئەوەندە گەورە و کامەران نەبوون کە ڕەوییان نەمابوو بەشی دانیشتووانی فراوانبوویان بکات، بۆیە ڕوویانکردە دەریا، کۆلۆنییان لە ئاسیای بچوک، سیسیلی، نیمچە دوورگەی ئیتالیا و تەنانەت ئەفریقا بونیاد نا. دەوڵەت شارەکانی سپارتا، تەوق بوون و بە شاخ دەورە درابوون. بەهۆی نەبوونی ڕێڕەو بۆ مێدیتەرانە، سپارتاکان قەت نەبوون گەلانی دەریایی، بەڵکو ڕوویان دەکردە شارەکانی دەوریان و لە زنجیرەیەک ململانێی توندوتیژانەدا کە

زیاتر لە سەد ساڵی هاتنە توانیبان ڕووبەڕێکی گەورە بگرن کە بەشی پێویست ڕەوی بۆ هاوڵاتیانیان دابین دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، چارەسەر بۆ ئەم کێشەیە کێشەیەکی تری گەورەی هێنابووە بوون. چۆن بتوانن ڕەوییە گیراوەکانیان پاسەوانی بکەن؟ ئێستا ئەو گەلانەی کە ئەوان حوکمیان دەکەن ژمارەیان لەمان بە ڕادەی دە بۆ یەک زیاترە، بەدڵنیاییەوە ئەم میگەلە تۆڵەیان لێ دەسەندەوە.

چارەسەری سپارتاکان دروستکردنی کۆمەڵگەیەک بوو تایبەت بە هونەری جەنگ. سپارتاکان سەرسەختتر، بەهێزتر و توندتر دەبوون لە دراوسێکانیان. ئەمە تاکە ڕێگە بوو بتوانن سەقامگیری و مانەوەیان مسۆگەر بکەن. تاکڕەوێتی سپارتاکان ڕێگەیانی بۆ خۆش کرد تا بەهێزترین هێزی پیادەڕەو لە جیهاندا دروست بکەن. ئەوان بە سیستەمێکی ڕێکوپێک بەڕێوە دەچوون و بە بوێرییەکی بێ وێنە دەجەنگان. هەستیلەیەکی سپارتایی ترس دەخستە دڵی دوژمنەوە و بیبەدەچوو تاکە حاڵێکی لاوازیان تێدا بەدی بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا سپارتاکان خۆیان جەنگاوەری بتوانا بوون و چاویان لە بونیادنانی ئیمپراتۆریەتێک نەبو. ئەوان تەنیا دەیانویست ئەوەی کە تارە بەدەستیانهێناوە بیپارێزن و بەرگری لێبکەن لەبەرامبەر داگیرکەرندا. چەند دەیەیەک تێپەڕیبوو بەبێ ئەوەی تاکە گۆڕانکارییەک لەو سیستەمەدا بکرێت کە باش سەرکەوتوو بوو لە پاراستنی دۆخی هەنوکەیی سپارتادا؟

لەو کاتەدا کە سپارتاکان کەلتوورێکی جەنگاوەرانەیان گەشە پێدەدا، دەوڵەتشارێکی تر لە سەرهەڵدادابوو کە لە باڵادەستیدا یەکسان بوو. ئەسینا بە پێچەوانەی سپارتاکان، ئەسینابییەکان دەریایان بڕیبوو و زیاتریش بۆ مەبەستی بازرگانی نەک دروستکردنی کۆلۆنی. ئەسیناییەکان بوونە بازرگانی گەورە، دراوەکەیان بەسەرانسەری مێدیتەرانەدا بڵاو بۆوە. بەپێچەوانەی سپارتا ڕشک و چەقبەستووەکان، ئەسیناییەکان بە چالاکییەکی نێروتەسەل ڕووبەڕووی کێشە دەبوونەوە و خۆیان لەگەڵ بارودۆخ دەگونجاند و فۆرمی کۆمەڵایەتی نوێ و هونەری نوێیان بە خێراییەکی بێ وێنە دەهێنایە کایەوە.

کۆمەڵگەکەیان بەردەوام لە گۆڕاندا بوو و کاتێك دەسەڵاتەکەیان گەورە بوو، بوونە مایەی هەڕەشەی سپارتا ئەقڵ بەرگریکارەکان

لە ٤٣١ی پێش زایینیدا، جەنگ لەنێوان ئەسینا و سپارتادا هەڵگیرسا و بەهۆی گەڕێکی بەختەوە سپارتاکان لەو جەنگە درێژەدا سەرکەوتوو بوون کە ٢٧ ساڵی خایاند. ئێستا سپارتاکان ئیمپراتۆریەتیکیان بەڕێوە دەبرد و ئەمجارە بەیانتوانی لە قاوغی خۆیاندا بمێننەوە. ئەگەر وریایی لەوە بهێنایە کە بەدەستیانهێناوە ئەوا ئەسینایییە شکستخواردووەکان هەڵدەستانەوە، یەکیاندەگرتەوە و ڕووبەڕوویان دەبوونەوە. پاش جەنگ، پارەی ئەسینایییەکان هەڵڕژایە ناو سپارتا. سپارتاکان لە جەنگدا پەروەردە بوون نەك سیاسەت و ئابووریدا، لەبەرئەوەی لەگەڵیدا ڕاینەهاتبوون، سامان و شێوازەکانی ژیانی پەیوەست بە سامان ئەولی فریودا و کاری تێکردن. سپارتاکان ڕەوانەی ئەو شوێنانە کران کە پێشتر ڕەوپی ئەسینایییەکان بوو و زۆر نوێد بوو بە ڕێگەی خۆیان. سپارتا شکستی بە ئەسینا هێنابوو، بەڵام شێوازی شلی ئەسینایی بۆ ژیان بەخێرایی دیسپلینەکەی دەشکاند و سیستەمە ڕەقەکەی شل دەکردەوە. لەهەمان کاتدا ئەسینا خۆی لەگەڵ لەدەستدانی ئیمپراتۆریەتەکەیدا دەگونجاند و لێرەوە وەك سەنتەرێکی ئابووری و کەلتووری لە بووژانەوە و گەشەدابوو.

بەهۆی سەرکەردانی بەرانبەر ئەم هەموو کەییە گۆڕاوەکەی خۆی، سپارتا لاواز و لاوازتر بوو. سی ساڵێك پاش شکستپێهێنانی ئەسینا، شەڕێکی گرنگی لەگەڵ دەوڵەت شاری ثیب دۆڕاند. تەقریبەن لە شەوورۆژێکدا ئەم گەلەی کە جارێك لە جاران بەهێز بوو، داڕما و قەت چاك نەبووەوە.

## لێکدانەوە

لە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەیەکی حەیدا- کۆنترۆڵکردنی ژمارە بالاکان- سپارتا وەك گیانەوەرێك پەرچەکرداری پیشاند کە قاوغێك دروست دەکات بۆئەوەی خۆی لە ژینگە بپارێزێت. بەڵام وەك کیسەڵ، سپارتاکان جوڵانیان کردە قوربانی سەلامەتی ئەوان

توانیان بۆ ماوەی سێ سەد ساڵێک جێگیریی خۆیان بپارێزن، بەڵام باجی ئەمە چی بوو؟ لە جەنگ زیاتر هیچ کەلتوورێکی تریان نەبوو، بە هۆیەوە هەبوو بزنەرەی بە تەنگژە ماترەوێنێتەوە و لە شڵەژانێکی بەردەوامدابوون نەکا دۆخی هەرکەییان بشێوێت. لە حاڵەتی سپارتادا، ئەوە سوپای ئەسینا نەبوو شکستی پێهێنان، بەڵکو پارەی ئەسینایی بوو. پارە ڕژایە هەموو شوێنێک و کۆنترۆڵ نەدەکرا و بە ملکەچی ڕێسایەکی موڵەتپێدراویش دەبوو. لە دووڕمەودا دا پارە ئەسینایەکانی زاڵ کرد لە ڕێگەی چوونە ناو سیستەمی سپارتایی و بڕینی ڕێی پارێزەرەکەی. لە شەڕی نێوان دوو سیستەمدا، ئەسینا بایی پێویست شل و شۆق و ئەفرێنەر بوو تا شێوەی خۆی بگۆڕێت لەکاتێکدا کە سپارتا هەر ڕەقتر دەبوو تا ئەوەی کە درزی تێکەوت.

### پەیڕەویکردن لە پاسکە

کاتێک دووەم جەنگی جیهانی کۆتایی پێهات و ژاپۆنییەکان، کە چینیان لە ١٩٢٧دا داگیر کردبوو، بۆ دواجار دەرکران، ناسیۆنالیستە چینییەکان بە ڕێبەرایەتی (چیانگ کای شێک) بڕیاریاندا کاتی هاتووە کۆمەنیستە چینییەکان بنبڕ بکەن کە ڕکابەری سەرسەختیان بوون. لە ١٩٤٥ و ٤٦دا پلانەکەیان بەباشی کاری کرد: ناسیۆنالیستەکان بە ئاسانی شارە گەورەکانی مانچوریدا گرت. لەبەرامبەر ئەم هەڵمەتە گرنگەدا، ستراتیژی کۆمەنیستەکان هیچ مانایەکی نەبوو. کاتێک ناسیۆنالیستەکان هەنگاوی خۆیانیان نا، کۆمەنیستەکان بەسەر سوچ و گۆشە لاتەریکەکانی مانچوریادا بڵاو بوون. یەکە بچوکەکانیان، سوپا ناسیۆنالیستەکانیان هەراسان کرد و بۆسەیان بۆ نانەوە، بەشێوەی چاوەڕوانەکراو لەوێ کشانەوە، بەڵام ئەم یەکە بڵاوانە قەت یەکیان نەدەگرتەوە، بەمەش هێرش بۆ سەریان سەخت بوو. ئەوان شارۆچکەیان دەگرت و پاش چەند هەفتەیەک وازیان لێدەهێنا. بە پاسەوانی پێشڕەو بە پاسەوانی پشتەوەیان هەبوو، وەکو جیوە دەجوڵان و قەت لە شوێنێک نەدەمانەوە.

ناسیۆنالیستەکان ئەمەیان گەڕاندەوە بۆ دوو شت: ترسنۆکی لەبەرانبەر هێزە باڵاکان و نەبوونی ئەزموون لە ستراتیژدا. ماو تسی تۆنگ ی سەرکردەی کۆمەنیستی زیاتر شاعیر و فەیلەسوف بوو نەک ژەنەراڵ، لەکاتێکدا کە چیانگ لە خۆرئاوا لەبارەی جەنگ خوێندبووی و شوێنکەوتەی نووسەری سەربازیی ئەڵمانی، کارل ڤۆن کلاوسویتز بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ دواجار ڕێسایەک لە هێرشەکانی ماودا سەرییەڵدا. پاش ئەوەی ناسیۆنالیستەکان شارەکانیان گرت، کۆمەنیستەکانیان جێهێشت ئەو شوێنە بگرن کە بە پاناییەکی بێ کەڵک مانچوریا لەقەڵەم دەدرا. کۆمەنیستەکان دەستیانکرد بە بەکارهێنانی ئەو پانتاییە گەورەیە بۆ تەوقکردنی شارەکان. ئەگەر چیانگ لەشکرێکی لە شارێکەوە بناردایە بۆ پاڵپشتکردنی ئەوێتر، کۆمەنیستەکان لەشکری ڕزگاربوونیان تەوق دەکرد. هێزەکانی چیانگ بەهێواشی دابەش بوون بۆ یەکەی بچوک و بچوکتر کە لەیەکتری دادەبڕان و هێڵی دابینکردنی پێداکیان پچڕا. ترسێکی زۆر چووە دڵی سەربازانی ناسیۆنالیست. شارە گەمارۆدراوەکانیان دادەڕما تەنانەت پێش ئەوەی ڕاستەوخۆش هێرشیان بکرێتە سەر و یەک لەدوای یەک کەوتن.

### لێکدانەوە

لەکاتێکدا کە گەمەی شەترەنج ڕێک و ڕاستەوخۆیە، گەمەی کۆنی (گۆ) کە سوپای چینی تا ڕادەیەکی زۆر بۆ تاکتیکی سەربازی پشتیان پێدەبەست، لەو جۆرە ستراتیژەوە نزیکە کە گونجاوە بۆ جیهانێک کە تیایدا شەڕەکان بە ناڕاستەوخۆیی و لە ناوچە ناپەیوەستەکان دەکرێن. ئەمە فرە ڕەهەند، ئەبستراکت و لەودیو کات و شوێنەوەیە: ئەقڵی ستراتیژیست. هیچ شتێکی ڕەق مەدە بە نەیارەکەت هێرشی بکاتە سەر، تەماشا بکە لەکاتێکدا کە لە ڕاکردن بەدوای تۆدا برستیان لەبەر دەبڕێت و هەوڵ بدە لەگەڵ گۆڕاوییەکەت بگونجێت. تەنیا بێ شێوەیی ڕێگەت بۆ خۆش دەکات تا بە ڕاستی نەیارەکەت سەرگەردان بکەیت- بەمانای ئەو کاتەی کە ئەوان بۆیان دەردەکەوێت لە کوێیت و بە نیازی چیت، زۆر درەنگ بووە.

**کایلی دەسەلات**

گیانەوەری مرۆڤ بە دروستکردنی بەردەوامی شێوە و فۆرمەکان دەناسرێتەوە، بەدەگمەن هەستەکانی بەشێوەی ڕاستەوخۆ دەردەبڕێت، لە ڕێگەی زمانەوە یان لە ڕێگەی سرووتە کۆمەڵایەتییە فۆلکلۆرەکانەوە فۆرمیان پێدەبەخشێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو فۆرمانەی ئێمە دروستیان دەکەین بە بەردەوامی دەگۆڕێن-- لە شێوەدا، لە ستایلدا، لەهەموو ئەو دیاردە مرۆییانەدا کە نوێنەرایەتی میزاجی سانتومەنتەکە دەکەن. لە ڕاستیدا ئەو شتانەی کە ناگۆڕێن، ئەو فۆرمانەی کە ڕەق دەبن، وەك مەرگ دێنە بەرچاومان و ئێمە لەتێیان دەبەین. گەنج ئەمە بە ڕوونترین شێوە پیشان دەدات: بەهۆی نائاسودەبوونی بەو فۆرمانەی کۆمەڵگە بەسەریدا دەسەپێنێت، بەهۆی نەبوونی شوناسێکی دیاریکراو، ئەوان یاری بە کارەکتەری خۆیان دەکەن، هەوڵ دەدەن چەندەها دەمامك و فۆرمیان هەبێت و گۆڕانێکی بەردەوام لە ستایلدا دروست دەکەن. دەسەڵات تەنیا ئەو کاتە گەشە دەکات کە فۆرمە کشۆکەکانیدا بێت. بۆ شێوەیی دەسەڵات زیاتر وەکو شێوەی ئاو یان جیوە وەهایە، شێوەی هەر شتێك دەگرێتە خۆی کە لە دەوریەتی. بەهۆی گۆڕانی بەردەوامەوە ئەت پێشبینی ناکرێت. کەسی بەهێز بە بەردەوامی شێوە دروست دەکات و دەسەڵاتی لە خێرایی گۆڕانیەوە دێت.

دواجار، فێربوونی گونجان لەگەڵ هەر بارودۆخێکی نوێدا واتە بینینی ڕووداوەکانی بە چاوەکانی خۆت و زۆرجار فەرامۆشکردنی ئامۆژگاریی ئەو کەسانەی بەردەوام دێنە ڕێگەت. ئەمە بە واتای ئەوەیە کە سەرەنجام دەبێ تۆ ئەو یاسایانە تور هەڵدەیت کە ئەوانیتر بەسەرتدا دەسەپێنن و ئەو کتێبانەش کە پێت دەڵێن دەبێ چی بکەیت. ناپلیۆن دەیگوت " ئەو یاسایانەی حوکمی بارودۆخەکان دەکەن بەهۆی بارودۆخی نوێوە هەڵدەوەشێنەوە".

**دەسەڵات:** تەواوکردنی پێکهێنانی سوپایەک ئەوەیە بکەینە ئاستی بێ شێوەیی، سەرکەوتن لە جەنگدا چەندبارە نییە، بەڵام بەشێوەیەکی ناکۆتا فۆرمەکەی دەگونجێنێت... هێزێکی سەربازی فۆرمێکی بەردەوامی نییە، ئاو شێوەیەکی جێگیری نییە: توانای بەدەستهێنانی سەرکەوتن لە ڕێگەی گۆڕان و گونجان بەم پێیە لەگەڵ نەیاردا پێی دەوترێت بلیمەتی.

(سون تزو، سەدەی چوارەمی پێش زایین).

**پێچەوانەبوونەوە**

بەکارهێنانی پانتایی و دروستکردنی ڕێسایەکی ئەبستراکت نابێ بە مانای دەستبەرداربوون بێت لە تەرکیزی دەسەڵاتت کاتێک بۆ تۆ بەنرخە. بێ شێوەیی وا لە دوژمنەکانت دەکات سەراپا شوێن تۆ بکەون، هێزەکانیان بڵاو بکەنەوە و لەبەدی دەروونی و چ لە ڕووی جەستەییەوە. کاتێک تۆ بۆ دواجار ڕووبەڕوویان دەبیتەوە، بە زەبرێکی چڕبووەوەی بەهێز لێیان بدە. کاتێک تۆ یاری بێ شێوەبوون دەکەیت، ستراتیژە دووڕمەوداکەت لەبیر بێت، تەرکیز، خێرایی و هێز بەکار بێنە. وەک ماو وتی "کاتێک ئێمە لە دژی تۆ دەجەنگین، جەخت دەکەینەوە لەوەی تۆ بۆی دەرنەچیت".

# The 48 LAWS OF POWER

Robert Greene

Translator: Karzan Kawsin

٤٨ یاسای دەسەڵات، کە پرفرۆشترین کتێبە، بۆ ئەو کەسانەیە کە خوازیاری دەسەڵاتن یان دەیانەوێ خۆیان لەبەرانبەر دەسەڵاتی ئەوانیتردا ئامادە بکەن.

کتێبی ٤٨ یاسای دەسەڵات، فێرت دەکات چۆنچۆنی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەدەسەڵات بیت.

ڕۆبەرت گرین، ئەم بەرهەمەی لە ساڵی ١٩٩٨دا بڵاو کردەوە و پاش ماوەیەکی کورت بووە بەشێک لە پرفرۆشترین کتێبەکانی جیهان. ڕۆبەرت گرین، نزیکەی بیست ساڵ لەبارەی دەسەڵات لێکۆڵینەوەی بەرفراوانی ئەنجام داوە و هەموو ئەنجامەکانی لە بەرگی چەندین کتێبدا بڵاو کردووەتەوە.

ئەو لە هەموو لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارەدا وێڵ بووە کە بۆچی هەندێ کەس بەدرێژایی مێژوو دەگەنە دەسەڵات و چارەنووسی خۆیان و ئەوانیتر وەردەچەرخێنن.

ڕۆبەرت گرین، لە کتێبی ٤٨ یاسای دەسەڵاتدا پوختەیەکی لە مێژووی سێ هەزار ساڵەی دەسەڵاتی کەسایەتییە مێژووییە گەورەکانی وەکو((نیکۆلۆ ماکیاڤیلی، سون تزو، شازادە ئەلیزابێس یەکەم، هێنری کیسینجەر)) و کەسایەتییە بەناوبانگەکانی تر لە قاڵبی ٤٨ بەشدا خستووەتەڕوو، وە هەر بەشێک لە بەشەکانیشی بۆ یاسایەک تەرخان کردووە.